پرۆفیسۆر
د. ئاراس زەینەڵ

# مێژووی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا



2024

پرۆفیسۆر
د. ئاراس زەینەڵ

# مێژووی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

٢٠٢٤ زایینی/ ٢٧٢٤ کوردی

ئەم کتێبە
لەسەر ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیریی چاپکراوە

ناوی کتێب:

# مێژووی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

- بابەت: مێژوو
- نووسەر: پرۆفیسۆر د. ئاراس فەریق زەینەڵ
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد
- تایپ: ئالان وەلی
- تیراژ: ١٠٠٠دانە
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٤
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار

پرۆفیسۆر
د. ئاراس زەینەڵ

# مێژووی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

٢٠٢٤ زایینی/ ٢٧٢٤ کوردی

# پێڕست



## بەشی یەکەم

## بەشی دووەم



## بەشی سێیەم

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم



## بەشی شەشەم

## بەشی حەوتەم



## بەشی هەشتەم

## بەشی نۆیەم

## بەشی دەیەم



## بەشی یازدەیەم



## بەشی دوانزەیەم

## بەشی سیازدەیەم



## بەشی چواردەیەم

## بەشی پازدەیەم

## بەشی شازدەیەم



## بەشی حەڤدەیەم

## بەشی هەژدەیەم



## بەشی نۆزدەیەم

# مێژووی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاست

سەدەکانی ناوەڕاست لەنێوان سەدەکانی (٥-١١ ز) بەردەوام بوو، پێش ئەوە ئەو قۆناغەی ئەورووپا بەشێک بوو لە (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی)، مێژوونووسان ئەو قۆناغەیان بە (سەردەمی تاریکی) لەقەڵەمداوە، بە هۆی ئەوەی ئاستی خوێندن و ڕۆشنبیری زۆر دواکەوتوو بوو، زۆربەی بیروباوەڕەکان پشتیان دەبەست بە ئەفسانە و چیرۆکی ئەفسووناوی، سەدەکانی ناوەڕاست بە کۆتایی (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی) دەست پێ دەکات کە مەزنترین هێز بوو لەسەر زەوی کە فەرمانڕەواییەکەی لەنێوان ساڵانی (٥٠٠-١٤٠٠ یان ١٥٠٠ ز) بوو.

هەندێک لە مێژوونووسان گومانیان هەبوو لەسەر سەرەتا و کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست کە ورد نەبوو و ناتوانرێت لە ساڵێکدا یان لە سەدەیەکدا دیاری بکرێت، هەندێک لە زانایان داوایان کرد سەردەمە دێرینەکان بۆ سەدەی دەیەمی زایینی درێژ بکرێتەوە یان زیاتر.

هەندێک کەس پێیان وایە سەدەکانی ناوەڕاست (١٠٠٠-١٨٠٠) ساڵی خایاندووە، هەندێکی دیکە داوایان کرد کە (سەردەمی دێرین و چاخەکانی ناوەڕاست و ڕێنسانس) لە یەک سەردەمدا کۆ بکرێتەوە کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی دێرینەوە دەست پێ بکات هەتا نیوەی دووەمی سەدەی شازدە.

ئەم ماوەیە سەرەڕای ئەوەی بە سەردەمێکی تاریک لەقەڵەم دەدرێت و ستەمی کۆمەڵایەتی تێدا ئەنجام دەدرێت؛ بەڵام لە ئێستادا وەکوو قۆناغێکی دینامیکی لەقەڵەم دەرێت کە تێیدا بیرۆکەی ئەورووپا دەرکەوت، وەکوو یەکەیەکی ڕۆشنبیری دیاریکراو. لە کۆتایی چاخی دێرین و سەرەتای چاخی ناوەڕاستدا دووبارە سیستمی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی قووڵ داڕێژرایەوە.

شێوازی فەرمانڕەوایی (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی) ڕێگاخۆشکەر بوو بۆ (گەلە جەرمانییەکان) کە شانشین دابمەزرێنن لە شوێنی ئیمپراتۆرییەتی خۆرئاواییە دێرینەکان و شێوازی نوێ لە سەرکردایەتی ڕامیاری پەیڕەو دەکرا؛ بە شێوەیەکی قۆناغ بە قۆناغ ئەورووپا بەرەو مەسیحییەت دەڕۆیشت.

ئەم بەرەوپێشچوونانە لە سەدەی نۆزدەی زایینییەوە گەیشتە لووتکە و بە دیاریکراوی لە سەردەمی (شارڵمان) و ژمارەیەک لە فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی (کارۆلینیجی) کە سەرپەرشتی بەرەوپێشچوونێکی ڕۆشنبیریان کرد کە بە

(ڕێنیسانسی کارۆلینجی) ناسرا و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا گەشەیەکی زۆر مەزن ڕوویدا و ئەو سەردەمە بە گەشەیەکی ئابووری و هەرێمی و دیمۆگرافی و ژیاری ناسرا و دەرکەوتنی ناسنامەی نیشتمانی و دووبارە دارشتنەوەی دامەزراوە علمانی و کڵێساییەکان و تێیدا سەردەمی جەنگی خاچییەکان و هونەری گووتی و ئەندازیاری تەلارسازی و (شانشینی پاپاوی) دروست بوو و دروست بوونی زانکۆ و گەشەکردنی هزری (یۆنانی دێرین) و بەدەستهێنانی هزریە مەزنەکانی (قەدیس تۆماس ئەکوینی ١٢٢٤-١٢٧٤ ز).

کەسە دیارەکانی سەردەمی ڕێنیسانسی پێیان وا بوو سەردەمی ئەوان زێڕین و سەردەمی پێشوویان تاریک بوو بە بەراورد لەگەڵ خویان و سەردەمی گوازراوە بووە، چونکە سەدەکانی ناوەراست لەنێوان سەردەمی دێرین و نوێ کە خاوەن سیستەمی دەرەبەگایەتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەرەبەگایەتی بوو کە بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی نێوان لۆرد و پاشکۆکانیان نیشان دەدا؛ ئەمە بەدەر لە فۆڕمی کۆمەڵایەتی و ئابووری نوێ و شێوازی نوێ لە کشتوکاڵدا.

٢٠٢٤/٣/٢٤

سلێمانی

# بەشی یەکەم

- ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی
- کۆمەڵگاکانی سەدەکانی ناوەڕاست
- کۆمەڵگەی بیزەنتی`
- چینی ئازادەکان
- چینی کۆیلەکان
- کۆمەڵگەی ئیسلامی
- سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست
- قۆناغە سەرەکییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و تایبەتمەندییەکانیان
- کۆتاییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست

## ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی

پێش ئەوەی بمانەوێت قسە لەسەر مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست بکەین لە ئەورووپادا؛ پێویستە پێشوەختە توێژینەوە و ڕوانینێکمان هەبێت بۆ ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی و لایەنەکانی بەهێزی و لاوازی ئەو ئیمپڕاتۆرییەتە بخەینە بەرباس، هەتا بزانین مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا لەسەر چ بنەمایەک دامەزراوە، ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی کە بەرفراوانترین ئیمپڕاتۆرییەت بووە و لە سەردەمی (ئیمپڕاتۆر تراجان ٩٨–١١٧ ز) گەیشتبووە لوتکەی فراوانخوازی؛ هەر لە زەریای ئەتڵەسییەوە هەتاوەکوو ڕووباری فوراتی لەخۆ گرتبوو، بەمەش چەندین گەل و نەتەوەی جیا جیای لەژێر ڕکێفدا بووە، بۆیە پێویستیش بوو ئەو یاسایانەی دایەنان لەبار بن بۆ ئەوەی لە لایەن هەموو ئەو گەلانەوە پەیڕەو بکرێن. ڕێگە ئاوییەکان هۆکارێکی گرنگ بوون بۆ پێکەوەبەستنی بەشەکانی ئیمپڕاتۆریەتەکە هەر وەک پەیڕەوی دەسەڵاتی ناوەندیش لە لایەن ئیمپڕاتۆرەکانەوە هۆکارێک بوو بۆ مانەوەی یەکڕیزی ئەو ئیمپڕاتۆرییەتە[1].

ماوەی نێوان هاتنی (ئۆگستس) بۆ مەرگی (ماکۆس ئۆرلیۆس) ساڵانی نێوان (٢٧ پ. ز–١٨٠ ز) ماوەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئاشتی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی بوو[2].

سەرەتای دامەزرانی ڕامیاری (ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی) لەسەر بنەمای پاشایەتی بوو، هەر چەندە پارێزگارییەکی زۆری هەبوو بۆ هەندێک لە بنەماکانی سیستەمی کۆماری پێش خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەردەمی (دیکلیدیانووس) بە شێوەیەکی بەرچاو چاکسازی ئەنجام درا لە زۆربەی بوارەکاندا[3].

دەسەڵاتی ڕاستی ناو ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی بەدەست چینی دەوڵەمەندی خاوەن زەوییەوە بوو، دەوڵەتەکە مۆرک و ڕەنگێکی ڕوونی سەربازی هەبوو، ئەوەی (ئۆگستس) کردی بریتی بوو لە سنووردانانی هەریەک لە سیستەمەکان بە

---

(١) عصام یوسف: تاریخ اوروبا في العصور القدیمة والوسطی والحدیثة، الطبعة الاولی، الدار العالمیة للکتب والنشر، الجیزة، ٢٠١١م، ص٦٧.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، مکتبة الانجلو المصریة، القاهرة، ١٩٧٥، ص١١.

(٣) محمد رفعت ومحمد احمد حسونة: معالم تاریخ العصور الوسطی، الطبعة الرابعة، مصر، ١٩٢٧م، ص٩–١٠.

سیستمه نەیارەکەی، واتە ڕێکخستن لەنێوان ڕەوتی سەربازی و بۆچوون زۆری و فرەیی ناو دەوڵەت؛ ئەوەی گرنگتر بوو ئەوە بوو (ئۆگستس) دەسەڵاتی سەربازی لە زۆرینەیەکی خاوەن دەسەڵاتەوە بەرتەسک کردەوە بۆ تاکی ئیمپراتۆر، واتە سەرکردەی سەربازی وڵات خودی ئیمپراتۆر بوو[1].

لە سەدەی سێیەمی زایینیەوە بەرە بەرە لاوازی لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا دەرکەوت؛ ئەمەش پاش ئەوەی ئیمپراتۆر دەسەڵاتی سەربازی خۆی بەسەر هێزە سەربازییەکاندا لەدەستدا، چیدی دەستە و یەکە سەربازییەکانی ناوچەکان لەبری ملکەچبوونیان بۆ ئیمپراتۆر؛ ملکەچی بڕیار و فەرمانی سەرکردەی سەربازی ناوچەیی خۆیان دەبوون، ئەمەش ناکۆکی و دووبەرەکییەکی زۆری دروست کرد لەنێوان سەرکردە سەربازییەکانی ناوچەکاندا، بۆیە دواجار لەبری یەکڕیزی و پشتگرتنی یەکدی؛ دژایەتی و دووبەرەکی بەشەکانی ئیمپراتۆرییەتی گرتەوە[2].

هەروەک لە سەدەی سێیەمی زایینییدا خێزانێکی دەسەڵاتدار دەرکەوتن کە تا ساڵی (٢٣٥ ز) خاوەن دەسەڵات بوون و هەندێکییان کەسایەتی سەربازی بوون؛ وەک (سبتیمیۆس سیفرۆس ١٩٣-٢١١ ز)ی دامەزرێنەری خێزانەکە، کە دوا گوتەی ژیانی لە سەرەمەرگیدا ئەوە بوو کە پاداشتی چاکی سەربازان بکەن و گرنگی بە کەسانی دیکە نەدرێت. هەندێ دیکەیان زیاتر لە لایەنی ڕامیاریدا بوون؛ وەک (کاراکلا ٢١١-٢١٧ ز) کە ڕەگەزنامەی ڕۆمانی بەخشی بە هەموو هاوڵاتیانی ئازادی ناو ئیمپراتۆرییەتەکە[3].

لە سەردەمی ئیمپراتۆر (دکیوسدا) (٢٤٥-٢٥١ ز) زنجیرەیەکی پاشایەتی خۆسەپێنی توندی سەربازی دەبینین، کە سیستمی کۆمارییان کرد بە ڕەوتێکی سەربازیی ڕەهای توند، ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە وڵات لە ناوخۆدا تەواو پێویستی بە چاکسازی ئابووری و کارگێڕیش هەبوو. لەسەر ئاستی دەرەکیش پێویستی بەوە هەبوو بەرەنگاری دوو مەترسی ببێتەوە[4]، کە بریتی بوون لە:

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، دار الثقافة العربية، بيروت، ص١٦.

(٢) س. ورن. هلستر: اوروبا في العصور الوسطى، ت: محمد فتحي الشاعر، مكتبة الانجلو، القاهرة، ص٥١.

(٣) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا، ص١٩.

(٤) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص١٥.

**یەکەم:** مەترسی جەرمانەکان بوو لە هەردوو بەرەی ڕایین و دانووبەوە.

**دووەم:** مەترسی ئیمپراتۆرییەتی ساسانییەکان بوو، کە بەردەوام مەترسی بۆ سەر ڕۆمانەکان ڕووی لە زیادبوون بوو[1].

لەو سەروبەندەدا (دیکلیدیانووس) دەرکەوت کە پێشتر سەربازێکی (دەلماشی) بوو، ئەم کەسە توانی بگاتە دەسەلات و ببێت بە ئیمپراتۆر، لەگەڵ ئەوەشدا توانی شکۆمەندییەک بگەڕێنێتەوە بۆ ئیمپراتورییەتەکە و چاکسازی ڕیشەیی ئەنجام بدات لە سیستمی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانیدا، چونکە بارودۆخی ناوخۆیی و دەرەکی ئیمپراتۆرییەت لەوپەڕی لاوازی و مەترسیدا بوون. دەبوو ئیمپراتۆرییەت هەوڵ بدات یەکێتی خۆی بە تەواوەتی بپارێزێت؛ چونکە ویستەکان بۆ جیابوونەوە ڕوو لە زیادبوون بوو. بۆ چارەسەری ئەمەش؛ فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانی ڕامیاری بەش بەش کردنی گرتەبەر بەرامبەر بەو ناوچانەی تیایاندا ئارەزووی جیاخوازی هەبوو، بۆیە فەرمانڕەوایەتییەکەی دابەش کرد بەسەر چەند یەکەیەکی جیا جیادا، هەتا هەم نەتوانن یەکبگرن بۆ هەوڵی جیابوونەوە، هەم بتوانێت ئاسانتر زاڵ بێت بەسەر ویستە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو ناوچەدا، بە هۆی ئەم جۆرە ڕامیارییەوە بارودۆخ گەیشتە ئەوەی ویلایەتەکان ژمارەیان لە (٤١) ویلایەتەوە بگات بە (٣٢٧) ویلایەت[2].

کاتێک ئەم ڕامیارییە گیرایەبەر؛ فەرمانڕەواکانی هەریەک لەو ناوچانە دەکەوتنە ململانێ، بۆیە لەپێناو خۆبەهێزکردندا باجەکانیان چەند بەرامبەر دەکردن لەسەر خەڵکی هەرێمەکەیان، ئەمەش ناڕەزاییەکی زۆری لێ دەکەوتەوە، ناچار هەندێک ئیمپراتۆر کەوتنە دیاریکردنی هەندێک چاودێر بۆ هەرێمەکان، هەتا بەربگرن لەو ڕامیارییە توندوتیژییەی کە سەرکردەی هەرێمەکان پیادەیان دەکرد، هەر چەندە لەوەشدا سەرکەوتوو نەبوون[3].

هاوکات باجەکان لەسەر بازرگانی بەردەوام زیاد دەکرا، هەتا کار گەیشتە ئەوەی لە ڕێژەی (٢%) زیاد بکرێت بۆ ڕێژەی (١٢%)، تەنانەت وای لێ هات باجی

---

(١) جاك لوكوف: هل ولدت اوروبا في العصر الوسيط، ت: محمد حناوي ويوسف نكادي، الطبعة الاولى، ٢٠١٥م، ص٢٦-٢٨.

(٢) سعيد عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص١٦.

(٣) عبدالامير محمد امين ومحمد توفيق حسين: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، الكتاب الاول، د. ت، ص١٩.

قـورس دادەنـرا لەسـەر خـواردەمەنییە جۆراوجۆرەكـانی وەک میـوە و گۆشـت. بەوەشەوە نەدەوەستان؛ بەڵكوو زێڕ یان زیویـان وەردەگرت، ئەمە لە لایەكەوە هەم باری سەرشانی بازرگانەكانی گرانتر دەكرد، لە لایەكی دیكەشەوە بـاری سەرشانی خـاوەن مـوڵكە مەزنەكانی گرانتـر كـرد، هەتـا وای لـێ هـات ئەوانیش فشـار لەسـەر جووتیارەكـان دروسـت بكەن، بەم جۆرە دۆخەكە لە هەمـوو لایەكەوە نارەزایی لـێ دەكەوتەوە و یەک پـارچە خۆخـۆری و یەكـدی چەوسـاندنەوە وڵاتـی گرتبـوویەوە، بۆیە بە شێوەیەكی بەرچاو بەرهەمی ناو وڵاتی كەمكردەوە[1].

بـارودۆخەكە بە جۆرێک بوو تەنـانەت دراوی وڵات سـاختە دەكرا، ناچـار دراوە چـاكەكەی وڵات لە بـازاڕدا نەدەمـا و لە ترسـی فەوتـانی لای تـاكە دەوڵەمەنـدەكان هەڵدەگیرا، ئەمەش جموجووڵی ئابووری دەوەستاند، ئەمە لە ئاستی ناوخۆی وڵاتدا. سـەبارەت بە ئاسـتی دەرەكـی وڵاتـیش؛ بـارەكە زۆر مەترسـیدارتر بـوو، چـونكە لە لایەكەوە جەرمانەكـان هێرشـیان دەهێنـایە سـەر وڵات، ئەوە بـوو لە سـاڵی (٢٣٥ و ٢٥٦ ز)دا هێرشیان بردە سەر ناوچەكانی ڕایین (زەوییە نزمەكانی ڕایین)، لە لایەكی دیـكەوە گووتەكـان هەرێمـی (داشـیا)یان بەزانـدبوو؛ ئەوەش دوای ئەوەی لە سـاڵی (٢٥١ ز) هێرشـــیان بــردە ســـەر و لەوێ مـــانەوە هەتـــا ســـاڵی (٢٩٨ ز) لە لایەن كلۆدیۆســـەوە دەركـران، لە مـــاوەی (٢٥٣-٢٦٠ ز)یشــدا كە ســەردەمی ئیمپڕاتـــۆر (ڤالیریـــان) بـــوو؛ خـێڵە دەشـتەكییەكان و بەربەرەكـــان هێرشـــیان دەبـــردە ســـەر ناوچەكانیـان لە ئەفریقـا، ئەمە وێـڕای مەترسـی ئیمپراتـۆڕییەتی ساسـانییەكان، كە بەتەواوەتی مەترسییەكی گەورە بوو بۆ سەر ڕۆمەكان[2].

بە شـــێوەیەكی گشـــتی هەریەک لە هۆكارەكـــانی (لاوازی ڕامیـــاری، گەنـــدەڵی كـارگێڕی، خراپبـوونی بـاری ئـابووری، تێكچـوون و نالەبـاری بـاری كـۆمەڵایەتی، لاوازی سەربازی، مەترسییە دەرەكییەكانی گووتەكان و ساسانییەكان، دارمـانی نـاخ و كەسـێتی تـاكی ڕۆمـانی) گرنگتـرین ئەو هۆكـارانەن كە لە سـەرچاوەكاندا وەک هۆكـاری ڕووخـانی ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـــانی باســـكراون، ســـەبارەت بە بـــارە

---

(١) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا العصور الوسطى الباكرة، الطبعة الاولى، الدار الثقافية للنشر، ٢٠١٤ م، ص٢٠.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص١٢-١٣.

ئایینییەکەی وڵات دەبینین دیاردەی بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت لە سێ سەدەی کۆتایی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا دیاردەیەکی زەق و بەرچاوە، هەتا ئەوەی دەبینین دواجار کڵێسای مەسیحی بوو بە جێگرەوەی تەخت و دەسەڵاتی دەوڵەتی ڕۆمانی[1].

## کۆمەڵگەکانی سەدەکانی ناوەڕاست

سێ کۆمەڵگای سەرەکی لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوون و ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو، ئەوانیش کۆمەڵگاکانی (بیزەنتی، ئەورووپای خۆرئاوا و کۆمەڵگای ئیسلامی) بوون.

## کۆمەڵگای بیزەنتی

لە ڕووی ئاینەوە سەر بە ڕێبازی ئۆرتۆدۆکسی مەسیحی و لە ڕووی ڕەگەز و نەتەوایەتیشەوە بە ڕەگەزی جیاواز و جۆراوجۆر جیا دەکرێتەوە، هەندێک لەو ڕەگەزانە لە بنەڕەتدا یۆنانین و هەندێکی دیکەشیان لە بنەڕەتی جیاوازن، وەک سلاڤەکان[2].

کۆمەڵگای ئەورووپای خۆرئاوایی: بە میللەتە ڕۆمانی و جەرمانییە ڕەسەنەکانییەوە دەناسرێتەوە، لە ڕووی ئایینیشەوە لەسەر ڕێبازی کاسۆلیکی مەسیحی بوون و زۆربەی کات شوینکەوتووی تەواوی پاپا بوون کە لە ڕۆما دادەنیشت[3].

کۆمەڵگەی ڕۆمانی کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بووە و چینەکانی لێکدابڕاوبوون بە شێوەیەکی بیردۆزی و بە لایەنی کەمەوە ئەم کۆمەڵگەیە پێکدەهات لە دوو چینی سەرەکی: (چینی ئازاد، چینی کۆیلە). چینی ئازاد هەموو مافیک و ئیمتیازاتێکی هەبوو، بەڵام چینی کۆیلە هیچ مافێک و ئیمتیازاتێکی نەبوو و وایان لێ دەڕوانین کە

---

(١) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، مؤسسة الشباب الجامعة الاسكندرية، ١٩٨٤ م، ص١٣.

(٢) ئاراس فەریق زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠١١ ز، ل٢٩.

(٣) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، تر: علي السيد علي، المجلس الاعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٤ م، ص١١-١٢.

بەشێکن لە ئاژەڵی کێوی و مکلەچن بۆ ویستی گەورەکانیان کە دەیانتوانی بە ویستی خۆیان کەسانێک بکوژن و خزمەتی کەسانێکی دیکە بکەن.

### چینی ئازادەکان

بریتی بوون لە هۆز؛ ئەوەش ڕۆڵێکی گرنگی دەبینی لە کۆمەڵگەی ڕۆمانی، هەر هۆزێک کۆمەڵێک خێزانی لەخۆدەگرت، هەموو خێزانێک لەم هۆزانە ڕێوڕەسمی ئایینی (الطقوس الدينية) تایبەت بە خۆیان و پیرۆزی خۆیان هەبوو، هۆزی بۆرژوازی شانازی دەکرد بە نەژادی خۆیەوە، ئیدی چ مرۆڤ بووایە یان خوداوەند، بۆ نموونە هۆزی (یۆلیوس) کە (یۆلیوس قەیسەر) سەر بەو هۆزە بوو؛ دەگەڕێتەوە سەر خوداوەندی (ڤینۆس) لە ڕێگەی (ئینیاس) و (بیریامی) پاشای تەڕوادەوە[1].

(یۆلیوس) لە سەردەمی کۆماریدا یاسا ئازادەکانی دەکردە دوو بەشی جیاوازەوە؛ کە ئەوانیش خانەدان و خەڵکی گشتی بوون، خانەدانەکان بریتی بوون لە پیرانی ڕۆما و سوارچاکەکان لەگەڵ خێزانەکانیان، هەروەها سەربازەکان لەگەڵ منداڵەکانیان و ئەو پیاوانەی کە هەڵدەستان بە کاری شارستانی لەگەڵ منداڵەکانیاندا لە شار و لادێکانی دەرەوەی ڕۆمادا؛ جگە لەمانە ئەوانی دیکە سەر بە چینی گشتی بوون[2].

خانەدانەکان ئیمتیازاتێکی زۆریان هەبوو لە کاتی پێشێلکردنی یاساکاندا، یان لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا لە سزا بەدوور دەبوون، چونکە سزادانی هەر یەکێک لە خانەدانەکان؛ بێڕێزیکردن بوو بەرامبەر بە هەموو چینەکە، توندترین سزاش بۆ خانەدانەکان ئەگەر بەرامبەریان ئەنجام بدرابایە؛ بریتی بوو لە دوورخستنەوەیان لە ڕۆما بەرەو دەرەوەی ئیتاڵیا، یان دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانیاندا. لە کاتێکدا ئەگەر یەکێک لە چینی گشتی سەروەت و سامانی پێکەوە دەنا؛ یان فرمانێکی دەوڵەتی دەگرتە دەست، ئەوکات بەرز دەبووەوە بۆ چینی خانەدان، چینی گشتی بێبەش بوون لە زۆرینەی مافەکان کە چینی خانەدان هەیان بوو، بۆیە لە کاتی

---

(١) عبداللطيف احمد علي: التاريخ الروماني، تح: حسان حلاق، دارالنهضة العربية، بيروت، ص٩٤-١٠٠.

(٢) محمد السيد محمد عبدالغني: التاريخ السياسي للجمهورية الرومانية، جامعة الاسكندرية, ٢٠٠٦ م، ص١٩٩.

سەرپێچیکردنی یەکێک لە چینی گشتی لە یاسا یان تاوانکردن تووشی سزای توند و دڵڕەقانە دەبووەوە، هەندێک جاریش دەنێردرا بۆ ئیشکردن لە خانەکاندا[1].
نازانین ئەم جیاوازییە چینایەتییە چۆن لەناو ئازادەکانی ڕۆما سەریهەڵدا؟ ئایا خەڵکی گشتی لە بنەڕەت و ڕەگەزەوە جیاوازبوون لە خانەدانەکان؛ یان خانەدانەکان دانیشتووانی ڕەسەنی ڕۆمان و ئەم جیاوازی چینایەتییە بە شێوازێکی پلەبەندی بە هۆی بارودۆخی ئابووری و کارگێڕییەوە دەرکەوتووە، خەڵکی گشتی هۆزی خۆیان و ڕێوڕەسمی ئایینی تایبەت بە خۆیان هەبوو، هەر وەک چۆن خانەدانەکانیان بەو شێوە بوون، هەروەها ژن و ژنخوازی و تێکەڵاوی لە ساڵی (٤٥٠ پ. ز) لە نیوانیاندا حەرام کرا[2].

## چینی کۆیلەکان

ئەم چینە لە کۆمەڵگەی ڕۆمانیدا بریتیی بوون لەوانەی کە لە ماڵ و کێڵگەکاندا کاریان دەکرد، هەندێکیان لە ئەنجامی شەڕەوە بەدیل دەگیران؛ یان لە ڕێگەی فرۆشتنەوە ئازادەکان دەبوون بە کۆیلە ئەگەر نەیانتوانیبایە قەرزەکانیان بدەنەوە. کۆمەڵگەی ڕۆمانی هەر لە سەرەتاوە کۆیلەی هەبوو؛ بەڵام هۆکاری ڕاستەوخۆی زیادبوونی ئەم کۆیلانە دەگەڕایەوە بۆ هێرشی ڕۆمەکان بۆ سەر ناوچەکانی دیکە، کە بووە هۆی هێنانی ڕێژەیەکی زۆری کۆیلە بۆ ڕۆما، هەموو خێزانێک ژمارەیەک کۆیلەی هەبوو بەپێی پێویست؛ کە بەکاریان دەهێنان بۆ ئەنجامدانی کاری جۆراوجۆر، تەنها بۆ ئەو کارانە بەکاریان نەدەهێنان کە پەیوەست بوو بە هێزی بازوویانەوە؛ بەڵکوو زۆرجار کۆیلەکان لە خاوەنەکانیان ڕۆشنبیرتر بوون، بۆیە دەبوونە پارێزەری نهێنییەکانیان و کاروباری نووسینیان بۆ جێبەجێ دەکردن و لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا دەستێکی باڵایان هەبووە، لە هەمان کاتدا کاری پیشەسازیشیان دەکرد[3]. بارودۆخی ژیانی ئەو کۆیلانە کە لەناو ماڵەکاندا کاریان دەکرد زۆر باشتر بوو، یاسای ڕۆمانی کۆیلەی بە بەشێک لە خاوەنداریتی

---

(١) عبد اللطيف احمد علي: تاريخ الروماني، ص٢٢٢-٢٢٣.

(٢) محمد السيد محمد عبدالغني: التاريخ السياسي للجمهورية الرومانية، ص١٩٩-٢٠١.

(٣) محمود ابراهيم السعداني: حضارة الرومان منذ نشاة روما وحتى نهاية القرن الاول الميلادي، الطبعة الاولى، عين للدراسات والبحوث، الزقازيق، ١٩٩٨ م، ص٦٣.

گەورەکەی دەزانی، گەورەکانیشیان زۆرجار بەپێی ئارەزووی خۆیان یاساکانی خۆیان بەسەر کۆیلەکانیاندا دەسەپاند کە سزای دڵرەقانە بوون، سزاکان بریتی بوون لە لێدانی کۆیلە بە دار یان بە قامچی یان سووتاندن یان لەخاچدان و ...هتد، کۆیلە دەیتوانی خۆی بکڕێتەوە بەو پارەیەی کە لەدەستیدابوو، مافی هاوڵاتی تەواویی دەدرایە دوای ڕزگاربوونی، لە سەردەمی ئیمپڕاتۆرییەتدا مامەڵە لەگەڵ کۆیلەدا بەرەوباشتر دەچوو، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسحییەت[1].

## کۆمەڵگای ئیسلامی

به دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام؛ شارستانێتی خۆی لەسەر چەمکەکانی ئیسلام پێکهێنا و بەخێرایی بە ناوچەکانی باکوور و خۆرهەڵات و خۆرئاوای نیمچەدوورگەی عەرەبدا بڵاو بووەوە. ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە و دەمانەوێت توێژینەوەی لەبارەوە ئەنجام بدەین؛ کۆمەڵگای ئەورووپای خۆرئاوایە، یاخود مێژووی ئەورووپایە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا[2].

سەدەکانی ناوەڕاست سەردەمێکی دابڕاو نییە لە سەدەکانی پێش و پاش خۆی لە مێژوودا؛ بەڵکوو یەکێکە لە قۆناغە مێژووییەکان کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێدا تێپەر بووە، لەم قۆناغە مێژوویەدا دیاردە کۆنەکان لە بزوتنەوەیەکی هێواش و لەسەرخۆدا بەرەو نەمان چوون، گۆڕانکارییەکان لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی ئەم قۆناغە مێژووییە ڕوویانداوە، بە شێوەیەکی شارستانی نوێ لە سەردەمەکانی پێشتر یان دواتر خۆی جیا دەکاتەوە، مێژوونووسان سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا لەنێوان مێژووی دێرین و مێژووی نوێدا دادەنێن و ماوەکەی بەنزیکەی هەزار ساڵ زیاتر دەخەملێنرێت، ئەم ماوە مێژووییە لە سەدەی چوارەمی زاینییەوە دەست پێ دەکات و هەتا سەدەی پازدەهەمی زایینی بەردەوام دەبێت. کۆمەڵێک ڕووداوی گرنگ و مێژوویی لەخۆ دەگرێت؛ وەک (ڕووخان و لەناوچوونی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی لە سەدەی چوارەم، هێرشی میللەتانی بەربەری بۆ سەر ئەورووپا، بڵاو بوونەوە و سەقامگیربوونی ئایینی مەسیحی لە ئەورووپا، دروست

---

(١) ئاراس فەریق زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٩.

(٢) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١-١٢.

بوونی چەندین دەوڵەتی بچووک) کە هەموو ئەمانە گۆڕانێکی زۆریان بەسەر وڵاتانی ئەورووپادا هێنا[1].

مێژوونووسان بۆچوونێکی یەکگرتوویان نییە لەبارەی ئەوەی چ ساڵێک بە ساڵی دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دابنرێت، بەڵام تێکڕایان لەسەر ئەوە کۆکن کە سەدەکانی ناوەڕاست دەکەوێتە نێوان سەردەمی دێرین و نوێوە، واتە لە سەدەی چوارەمەوە هەتا سەردەمی ڕێنیسانس. سەدەکانی ناوەڕاست بە سەدە تاریکەکان بەناوبانگن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە لەو ماوە مێژوویییەدا شەڕ و کوشتار و وێرانکاری گەیشتبووە لوتکە، بایەخێکی ئەوتۆ بە گەشەپێدانی زانست و هونەر نەدەدرا[2].

دەستنیشانکردنی ساڵی دەستپێک و کۆتاییەکەی و هاتنی هەر قۆناغێکی مێژوویی کە سەدان ساڵی لەخۆ گرتبێت؛ کارێکی سادە و ئاسان نییە و بۆ کەسانی تایبەتمەند زۆرترین مشتومڕ دروست دەکات، مێژوونووسانی تایبەتمەندیش بەم قۆناغە مێژوویییە بەپێی شارەزایی و بۆچوونی خۆیان سەرەتا و کۆتایی ئەم قۆناغە مێژوویییە دیاری دەکەن. قۆناغەکانی پێش مێژوو بەپێی وشە و لیکۆڵینەوەی زاناکان باس لە بوونی مرۆڤ دەکەن کەوا زیاتر لە یەک ملیون ساڵ پێش ئێستا لە ئەورووپادا ژیاون و گرنگترین شێوە و دیمەنی ناسراو لەپێش مێژوودا بریتی بوون لە مرۆڤی (نیاندەرتاڵ و کرۆمانیۆن). لە ڕاستیدا سەرچاوە مێژووییەکان ئەوەمان بۆ دەگێڕنەوە کەوا مرۆڤی نیاندەرتاڵ لە دەورووبەری (١٠٠,٠٠٠-٣٥,٠٠٠) پێش ئێستا ژیاون، مرۆڤی کرومانیۆنی لە (٤٠,٠٠٠-١٠,٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا ژیان. ژیانی ئەم مرۆڤانە لە سەر ڕاو و شکار و کۆچەری بەند بووە لە پیناو دابینکردنی بژیوی ژیانیاندا، ئەوەی جیگەی ئاماژە بۆ کردنە؛ مرۆڤی ئەورووپی لە باشوور و خۆرهەڵاتی ئەورووپا لە (٦٠٠٠ پ. ز) توانای دابینکردنی خۆراکی خۆی هەبووە بە کشتوکاڵ کردنی زەوی، ئەم پێشکەوتنە زەمینەی ڕەخساندووە و ڕێگەخۆشکەر بووە بۆ سەرەتای پێشکەوتن و دەرکەوتنی سیمای ژیاری، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆکاری جێگیربوون و نیشتەجێبوونی مرۆڤ بووە لەپای گەڕان بە دوای خواردن

---

(١) عبد القادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية ٤٧٦-١٥٠٠، الطبعة الاولى, المؤسسة اللبنانية للكاتب الاكاديمي، بيروت، ٢٠١٤ م، ص١٣-١٥.

(٢) نور الدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، الطبعة الاولى, دار الفكر، دمشق, ١٩٦٧ م, ج١/ ص١١.

و دابینکردنی ژیانیان، ئەو جێگیربوونە لە جێگای دیاریکراو گوندی لێ پەیدا بوو و پاشان ببووە ناوڕۆکی سەرهەڵدانی شارە سەرەتاییەکانی ئەورووپا.

سەدەکانی ناوەڕاست بەو قۆناغە مێژووییە دەگوترێت لە ئەورووپادا کەوا دەکرێت بە سێ سەردەمی دیار لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپادا و دابەشکارییەکەش بەمشێوەیەی لای خوارەوەیە:

**یەکەم:** سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست.

**دووەم:** قۆناغە سەرەکییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و تایبەتمەندییەکانیان.

**سێیەم:** کۆتاییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست.

## سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست

بێگومان ئەم قۆناغە مێژووییە لە کۆتاییەکانی رووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی خۆرئاوا لە دەورووبەری سەدەی پێنجەمەوە دەست پێ دەکات هەتا سەرهەڵدان و دامەزراندنی دەوڵەتی پاشایەتی و سەرەتاکانی دەستپێکی بزوتنەوە جوگرافییەکان و گەڕانەوەی خواست و ئارەزووی مرۆڤایەتی و بزوتنەوەی چاکسازی ئایینی لە سەرەتای ساڵی (١٥١٧ ز). ئەم ڕووداوانە بوونە هۆکاری وەرچەرخان لە مێژووی ئەورووپادا کە بە قۆناغی نوێبوونەوە و بووژانەوە دادەنرێت، چونکە بەدوایدا قۆناغی شۆڕشی پیشەسازی هات، هەروەها ئەم سەردەمە بە سەردەمێکی تاریک ناوزەند دەکرێت، بەتایبەتی لە سەدەی پێنجەمی زایینییەوە هەتا کۆتایی سەدەی دەیەمی زایینی، چونکە ژیاری ئەورووپی دووچاری ئیفلجی و وەستان هات، ئەوەی مایەوە لەم ژیارە یاخود لە پاشماوەی ژیاری ڕۆمانی؛ تەنها چەند قوتابخانەیەک و (الدیر والکاتدرائیە) و کۆشکی پاشایەتی بوو. بەڵام ئەو زانستانەی، کە لە یۆنانییەکانیان وەرگرتبوو؛ هەتا ڕادەیەک لەناوچوو، ئەوەی توانی هەندێک زانست و زانیاری فێر ببێت؛ ژمارەیەکی زۆر کەم بوون، هاوکات زۆریک لە هونەر و تەکنیکە دێرینەکان لەناوچوون. زاناکانی ئەو سەردەمە تووشی سەرسوڕمان هاتن؛ بە شێوەیەک گوێگر و گوێبیستی چیرۆک و ئەفسانە و پڕوپاگەندەکان دەبوون لەسەر بنەمای ئەوەی کەوا ڕاستییە[1].

---

(١) سعید عبد الفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا في العصور الوسطى، ص١٣-١٤.

زاراوەی سەدەکانی ناوەڕاست، لەپاش تەواوبوونی ئەو سەردەمە بە ماوەیەکی زۆر ئەو ناوەی لێ نرا، سەیر لەوەدا بوو خەڵکی ئەو سەردەمە خۆیان ئەو زاراوەیان نەدەزانی! ئەمە جگە لە هەستنەکردنیان بەو سەردەمە تاریکەی کەوا لێی دەژیان و پێی دەگوترا سەدەکانی ناوەڕاست یاخود (تاریک)، چونکە پێیان وا بوو ئەو سەردەمەی ئەوان تێیدا دەژیان؛ قۆناغێکی پێشکەوتووە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا و مرۆڤ گەیشتووتە لوتکەی داهێنانەکان. بەڵام ئەم زاراوەیە بۆ خۆی تەنها قۆناغێکە لەنێوان دوو قۆناغی مێژووییدا دیکەدا؛ ئەویش ڕەسەنایەتی و ژیاری دێرین و مەزن و گەورەیی ئێستا، ڕەنگە پاش ماوەیەک یاخود سەردەمێکی دیکە؛ ناوێکی سەیر لە مێژووی ئێستامان بنرێت! کێ دەزانێت ناوی چی قۆناغێکی مێژوویی پێی دەگوترێت؟ بێگومان سەدەکانی ناوەڕاست سەردەمێکی بەردەوام بوو بۆ ڕۆمانی دێرین لە ڕووی (مرۆڤایەتی، زمان، دەزگاکان، یاسا، وێژە، هونەر، کەلتوور و ژیار) ئەمە بەدەر لە ڕۆشنبیرییە سەربەخۆکانی دیکەی ڕۆما، چونکە گەلانی دیکەی وەک (یۆنان و سەکسۆن و فەرەنگ و گەلانی خۆرهەڵات) بەشدار بوون لەم ژیارە لەو قۆناغە مێژووییەدا[1].

لەم پەرتووکەدا ئاماژەمان بە هۆکارەکانی ڕووخاندنی ڕۆما کرد و هەندێک وای بۆ دەچن کە ڕووخاندنی ڕۆما بەهۆی لایەنی بەها و ڕەوشتەوە بووە کە لە لای ڕۆما ئەو بەها و ڕەوشتە بەرزانە کز ببوون و نەمابوون، وەکوو هەندێک لە مێژوونووسەکانی ڕۆما ئەوانەی کە لە کۆتا سەدەکانی ئیمپراتۆرییەتدا ژیاون، هەندێکی دیکە لە مێژوونووسانی ڕۆما دەڵێن: "ئەوەی بەسەر ڕۆمادا هات؛ ڕق و توڕەیی خودای ڕۆمانییەکان بووە، لەبەر ئەوەی ئەوان بەرەو ئایینی مەسیحی ڕۆیشتن و ملکەچی مەسیحییەت بوون." بەڵام ئەمانە ڕاستەوخۆ ئایینی مەسیحیان تاوانبار نەکرد؛ بەڵکوو دەیانگوت مەسیحییەت چەند بیروبۆچوونێکی هەیە کە دژە لەگەڵ بۆچوونی ڕۆمانییەکاندا، ئەو شتانەی بوونەتە هۆکاری دوست بوونی ئەو بۆچوونانەی لەناو کۆمەڵگەی ڕۆمانیدا هاتوونەتە کایەوە، ئەوە بووەتە هۆی ڕووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی[2]. ئەمە پاڵنەربوو بۆ ڕووناکبیر و زانا مەسیحییەکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە (قەدیس ئۆگستین) کە وەڵامێکی

---

(١) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ص٧-٨

(٢) عبد الامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤-١٥.

توندیان بدەنەوە، ڕۆڵی خۆیان ڕوون کردەوە و گوتیان ئەمە ویستی خودایە و مرۆڤ بێتوانایە لە بەرامبەر تێگەیشتن لێی، هەندێکیش وای بۆ دەچوون ئەوەی کە بەسەر ڕۆمادا هات؛ بە هۆی جەرمانییەکانەوە بووە، هۆزە جەرمانی و دڕندەکان ئیشیان تەنها ئەو ویرانکاری بووە، لە کاتێکدا خەڵکی خۆیان (ڕۆمانییەکان) بە کەسانێکی شارستانی و ڕۆشنبیر دەزانی، هەر بۆیە تووشی توندڕەوی بوون و بێسەرووبنیان کردن و هێرشە یەکدوایەکەکان و هەڕەشەکانی جەرمانییەکان؛ هەموو ئەمانە هێزی ڕۆمانییەکانی نەهێشت و هەر بەم هۆکارەش بە دەستی ئەوان ڕووخان نەک هیچ هێزێکی دیکە[1].

هەرچەندە سەدەکانی ناوەڕاست قۆناغێکی مێژوویی دوورو درێژە؛ بەڵام ناکرێت بڵێین لەگەڵ تەواو بوونی ئەم قۆناغە گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر هەموو بیروباوەڕ و لایەنەکانی (ئابووری، زانست، ئایین و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان) هاتووە و لە شەو و ڕۆژێکدا دەوڵەتێکی شێوە نوێ لەدایکبووە، زۆرێک لە مێژوونووسان ڕوداوێکی گرنگی ئەم قۆناغە کە بووەتە هۆی وەرچەرخانێکی مێژوویی وەردەگرن و دەیکەن بە خاڵی دەستپێک یان کۆتایی ئەو قۆناغە، ئێمەش هەندێک لەو دید و بۆچوونە جیاوازانەی مێژوونووسان لە بارەی سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست بە نموونە دەهێنینەوە، هەوڵیش دەدەین بە شێوەیەکی گونجاو و ڕێکوپێک بەراوردیان بکەین، بۆ ئەوەی بە ئاسانی تێیان بگەین:

### یەکەم/ کار و کردەوەکانی هەندێک لە ئیمپراتۆرەکان

بەشێک لە مێژوونووسان ساڵی (٢٨٤ ز) وەک سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دەستنیشان دەکەن، چونکە لەم ساڵەدا ئیمپراتۆرێکی بەهێز و جیاواز لە ئیمپراتۆرەکانی پێش خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست؛ کە ئەویش (دیوکلدیانوس) (٢٨٤-٣٠٥ ز) بوو[2]. ئەم ئیمپراتۆرە سەرلەنوێ لە ڕووی کارگێڕی و بەڕێوەبردنەوە وڵاتەکەی ڕێکخست؛ بە جۆرێک کە جیاوازی هەبوو لەگەڵ سیستەمەکانی پێش خۆی[3]. (دیۆکلدیانۆس) ئیمپراتۆرێکی دووبارەبووی ڕۆمانی

---

(٢) عبدالامير محمد امين و: هـ س، ج١/ ص٢١.

(٢) ه. ا. ل-فشر: تاريخ اوربا العصور الوسطى، تر: محمد مصطفى زيادة والباز العريني، ١٩٥٠ م، ج١/ ص١.

(٣) فشر: تاريخ اوربا العصور الوسطى، ج١/ص٢؛ موسوعة الاديان في العالم (المسيحية)، دار كريس، ٢٠٠٠ م، ص٣٠.

نەبوو؛ زیاتر خۆی بە پاشاکانی ساسانی دەچواند و خۆی لە یاسا بەرزتر دەزانی، هەروەها زیاتر خۆی بە خودا دەچواند نەک بە مرۆڤ، (دیۆکلدیانۆس) بە دژایەتیکردنی ئایینی مەسیحی ناوبانگی دەرکردبوو، بە جۆرێک سەردەمی ئەو بە ئەشکەنجە و ئازاردانی مەسیحییەکان بەناوبانگە کە پێی دەگوترا سەردەمی شەهیدان[1].

بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان سەردەمی ئیمپراتۆر (کوستەنتینی یەکەم) بە سەرەتای دەستپێکی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنێن[2]. بەتایبەت سالّی (٣٢٣ ز) کە لەم ساڵەدا شەڕی ناوخۆیی لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا کۆتاییهات و (کوستەنتین) بوو بە فەرمانڕەوای بێرکابەر، لە سەردەمی ئەم ئیمپراتۆرەدا گۆڕانکاری هەمەلایەنە بەسەر بوارە جیاوازەکانی ژیان لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا هات، لەوانە ناسینی ئایینی مەسیحی وەک ئایینێک لەناو ئیمپراتۆرییەتدا. هەروەها لە سالّی (٣١٣ ز) پەیمانی میلانی دەرکرد، کە بەپێی ئەم پەیمانە بەناوبانگە ڕێگە بە هاوڵاتیان درا بچنە سەر ئایینی مەسیحی[3]. کارێکی دیکەی ئیمپراتۆر (کۆستەنتین) دروستکردنی شاری (قوستەنتینە) بوو، کە بەم هەنگاوەی تەختی ئیمپراتۆری لە ڕۆما چۆڵ کرد[4]. دوای ئەم هەنگاوەی (کۆستەنتین)؛ پاپای ڕۆما دەسەڵاتی دونیایی و ئایینی مەسیحییەکانی خۆرئاوای گرتەدەست، جگە لەو هەنگاوانەی لە سەرەوە باسمان کرد؛ (کۆستەنتین) هەندێک یاسای نوێی بۆ بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەتەکە دەرکرد و لە بوارەکانی سەربازی و ئایینیشدا چاکسازی و گۆڕانکاری کرد[5].

بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان سەردەمی ئیمپراتۆر (جۆستینیان) (٥٢٧-٥٦٥ ز) بە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دادەنێن؛ چونکە سەردەمی ئەو دەکەوێتە نێوان کۆتایی مێژووی دێرین و سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست، ئەم مێژوونووسانە پشت دەبەستن بە شیکردنەوەکانیان لەبارەی هەوڵەکانی (جۆستینیان)، کە دەیویست بە زەبری هێزی سەربازی جارێکی دیکە هەردوو

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢١-٢٢.

(٢) د. حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٠ م، ص٢٤-٢٥.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٠.

(٤) فشر: تاريخ اوربا العصور الوسطى، ج١/ ص١٠-١١.

(٧) رون هلستر: اوروبا في العصور الوسطى، ص٤١.

ئیمپڕاتۆرییەتی خۆرهەڵات و خۆرئاوای ڕۆمانی بکات بە یەک. ئەمە جگە لە جەنگەکانی لەگەڵ (ڤەندالەکان) لە خۆرئاوای ئەفریقا و گووتەکانی خۆرهەڵات لە ئیتالیا و گووتەکانی خۆرئاوا لە ئیسپانیا[1].

**دووەم/ هۆکارە ئایینییەکان**

هەندێک لە مێژوونووسان سەردەمی ئیمپڕاتۆری (جۆلیان) کە ساتی هەڵگەڕاوەی بوو لە مەسیحییەت (٣٦١-٣٦٣ ز) بە سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا دادەنێن، چونکە ئەم ئیمپڕاتۆرە لە ئایینی مەسیحی هەڵگەڕایەوە و چووە سەر باوەڕی بتپەرستی و جارێکی دیکە بتپەرستی کردەوە بە ئایینی فەرمی دەوڵەت[2]، بەڵام لەم کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو و شکستی هێنا و سەرلەنوێ ئایینی مەسیحی بە فەرمی کرایەوە بە ئایینی دەوڵەت، ئەم ئایینە بوو بە خەسڵەتی ژیانی خەڵکی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، هەندێک لە مێژوونووسان لە ڕووی ئایینییەوەساڵی (٣٧٦ ز) دەکەن بە سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست، لەم ساڵەدا گووتە خۆرئاواییەکان لەسەر دەستی (مسیۆنێری ئاریۆسی ئۆلفیلاس) (٣١٠-٣٨٣ ز) وازیان لە ئایینی دێرین هێنا و چوونە سەر ئایینی مەسیحی، باوەڕهێنانی گووتەکان بە ئایینی مەسیحی و لەسەر ڕێبازی ئاریۆسی وای لە ئیمپڕاتۆرییەتە خۆرهەڵاتییەکان کرد کە مۆڵەتیان پێ بدەن، لە ڕووباری دانووبەوە بپەڕنەوە و لە ناوەڕاستی ئیمپڕاتۆرییەتەکانیان نیشتەجێ ببن، ئەم گۆڕانە مەزنەش سەرەتای داگیرکردنی ئەورووپا بوو لە لایەن بەربەرییەکانەوە[3].

هەر لە ڕووی ئایینییەوە هەندێک مێژوونووسی دیکە دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆر (سیۆدۆسیۆسی یەکەم) (٣٧٩-٣٩٥ ز) دەکەن بە خاڵی پەڕینەوە لە مێژووی دێرینەوە بۆ مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەم کۆمەڵە مێژوونووسە بە دیاریکراوی ساڵی (٣٧٩ ز) دەکەنە سەرەتای ئەم گۆڕانکارییە، چونکە لەم ساڵەدا

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، ٢٠٠٦م، ص١٦-١٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٣٧.

(٣) عبد الامير محمد امين: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٤-٥٥.

دوای ئەوەی (سیۆدۆسیۆسی یەکەم) دەسەڵاتی دەگرێتە دەست، لە کۆبوونەوەی (کۆستەنتینیە)دا بڕیاری کۆتایی لەسەر ناشەرعیتی و کۆتایی هێنان بە ڕێبازی ئاریۆسی درا، بەو هۆیەوە لایەنگران و باوەڕدارانی ئەم ڕێبازە تووشی سزای قورس بوون، هەروەها هەموو پەرستگاکانی بتپەرستان داخران و سووتێنران و پەرتووکەکانیان قەدەغەکران و لەناوبران، هاوکات ڕێگەنەدرا بەو کەسانەی سەر بەو ڕێبازە بوون و درێژە بە پەرستنی ئایینەکانیان بدەن، تەنانەت لەناو ماڵەکانیشاندا ئەم پەرستانەیان لێ قەدەغەکرا[1].

### سێیەم/ هۆکارە سەربازییەکان

بەشێک لە مێژوونووسان پێیان وایە کە جەنگی (ئەدریانۆپڵ) کە لە ساڵی (٣٧٨ ز) ڕوویدا؛ دەکرێت بە کۆتایی مێژووی دێرین و سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا دابنرێت، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کاتێک کە گووتە خۆرئاواییەکان لە ڕووباری دانووب پەڕینەوە لە ناوچەکانی (مواشیا و تراکیا) نیشتەجێ بوون، پاش ماوەیەک بە بیانووی تەنگەبەری ناوچەکەیان؛ کەوتنە شەڕ فرۆشتن بە ئیمپڕاتۆر (ڤالێنز) (٣٦٤-٣٧٨ ز) و شەڕێکی مەزن لەنێوان هەردوولا هەڵگیرسا، لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا سێ بەشی لەشکری ئیمپڕاتۆر کوژران و ئیمپڕاتۆر دووچاری شکستێکی ترسناک بووەوە[2].

### چوارەم/ سیستمی بەڕێوەبردن

بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان ساڵی (٣٩٥ ز) بە کۆتایی مێژووی دێرین و سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستیشی دەزانن، لەم ساڵەدا ئیمپڕاتۆر (سیۆدۆسیۆس) کۆچی دوایی کرد، هەر لەم ساڵەدا ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی بوو بە دوو بەشی سەربەخۆ و جیاواز لە یەکدی، نەک وەک سەردەمی (دیۆکلدیانۆس)؛ چونکە دابەشبوونی ئەوکات تەنها دابەشبوونێکی ڕووکەشی بوو، (سیۆدۆسیۆس) بەشی خۆرهەڵاتی بەخشی بە (ئەرکادیۆس) (٣٩٥-٤٠٧ ز) و لە هەمان کاتدا بەشی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٨.

(٢) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا (العصور الوسطى الباكرة)، ص١٣.

خۆرئاوای بەخشی بە (هوندریۆس) (٣٩٥-٤٢٣ ز) کە هەردووکیان کوڕی خۆی بوون. بەمشێوەیە هەردوو بەشی خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئیمپڕاتۆرییەتەکە بوون بە دوو دەوڵەتی سەربەخۆ، دەوڵەتی بەشی خۆرهەڵات هەتا ساڵی (١٤٥٣ ز) مایەوە، بەڵام دەوڵەتی بەشی خۆرئاوای بەدەستی جەرمەن و بەربەرییەکان کۆتایی پێ هێنرا[1].

**پێنجەم/ ئەو بیروڕایانەی کە پەیوەندییان بە ڕۆماوە هەیە**

هەندێک لە مێژوونووسان لەسەر ئەو باوەڕەن کە مێژووی دێرین کاتێک کۆتایی هات کە شاری ڕۆما لە ساڵی (٤١٠ ز) بە دەستی گووتە خۆرئاواییەکان بە سەرۆکایەتی (ئەلاریک) داگیرکرا و بەمەش کۆتایی بە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمای خۆرئاوا هات، دواتر ئیمپڕاتۆر (مۆنۆریۆس) شاری (ڕاڤنا)ی کرد بە پایتەختی خۆی لە دوای شاری ڕۆما[2].

**شەشەم/ بیروڕای دیکە لەسەر کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرەکانی خۆرئاوا**

زۆرێک لە مێژوونووسان باوەڕیان وایە ساڵی (٤٧٦ ز) سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستە لە ئەوروپادا، لەم ساڵەدا سەرۆکی (هرول و ئۆدواکر) کە یەکێک لە توخمە جەرمەنییەکانی خۆرهەڵات بوو، توانی شاری (ڕاڤنا) داگیر بکات و ئیمپڕاتۆری خۆرئاوا (ڕۆمۆلووسی ئاوگوسترلوس) (٤٧٥-٤٧٦ ز) لەسەر دەسەڵات لابەرێت و دووری بخاتەوە بۆ ناوچەکانی باشووری ئیتالیا، دواتر مووچەیەکی مانگانەی گونجاوی بۆ بڕییەوە، ئەوەی شایەنی باسە ئەم ئیمپڕاتۆرە تەمەنی دوازدە ساڵ بوو[3].

**حەوتەم/ بیروڕای دیکە لەمەڕ تاجلەسەرنانی شارلەمان**

ئەگەر بەشێک لە مێژوونووسان ساڵی (٤٧٦ ز) دەکەن بە سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست؛ لەبەر ئەوەی ئەم ساڵە ساڵی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆڕەکانی

---

(١) ه. سانت ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، تر: عبد العزيز توفيق جاويد، الناشر عالم الكتب، القاهرة، ١٩٦٧ م، ص١٠.

(٢) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٣.

(٣) فشر:تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ص٢٢-٣٣؛ نعيم فرح: الحضارة الاوروبية في العصور الوسطى، ط٢، دمشق، ٢٠٠٠ م، ص٧.

ڕۆمای خۆرئاوا بوو، ئەوا هەندێک لە مێژوونوسانی دیکە باوەڕیان وایە ساڵی (٨٠٠ ز) سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستە، چونکە لەم ساڵەدا شارلەمان) تاجی ئیمپراتۆرییەتی لەسەرنا و دەستی کرد بە زیندووکردنەوە و ژیاندنەوەی ناوی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، دوای ئەوەی کە خۆرئاوا بەدرێژایی ساڵانی نێوان (٤٧٦-٨٠٠ ز) بەبێ ئیمپراتۆر بوون[١].

هەموو ئەو بۆچوونە جیاوازانەی کە باسمان کرد لەبارەی دەستنیشانکردنی مێژووی دەستپێکی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا؛ هێمان بۆ کۆتایی هاتنی مێژووی دێرین. ئەمەش بۆ چەندین هۆکاری ناوەکی و دەرەکی دەگەڕێتەوە کە زەمینەیان خۆش کرد بۆ لەدایکبوونی سەدەکانی ناوەڕاست، چونکە ئەم قۆناغە لە شەو و ڕۆژێکدا لەدایک نەبوو، یان زادەی چەند ساڵێک نەبوو. هەڵبەتە سەدەی چوارەم کە پڕ بوو لە ڕووداوی گرنگ و گۆڕانکاری کاریگەر، ڕۆڵی هەبوو لە گۆڕانکاری و کۆتایی پێ هێنانی مێژووی دێرین. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک لە تایبەتمەندییەکانی چەرخی دێرین بۆ ماوەیەکی درێژ لەناونەچوون و تێکەڵ بە خەسڵەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بوون. سەدەی چوارەم بە سەدەی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمای خۆرئاوا هەژمار دەکرێت، هەر چەندە ئیمپراتۆرەکان هەوڵێکی زۆریان بۆ مانەوەی بە خەرجدا، هەر لەم سەدەیەدا ئایینی مەسیحی بوو بە ئایینی فەرمی ئیمپراتۆرییەتەکە و جێگای بە ئایینە دێرینەکان لێژ کرد.

لە لایەکی دیکەوە هەر لەم سەدەیەدا جەرمەنەکان بە زەبری هێز خزانە ناو ئیمپراتۆرییەتەکەوە و تێیدا نیشتەجێ بوون و لە دواییشدا ڕۆڵێکی باڵایان هەبوو لە لاوازکردن و ڕووخاندنیدا. جەرمەنەکان بە تووخمێکی سەرەکی دروستکەری مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا دادەنرێن، هەر لەم سەردەمەدا ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی بوو بە دوو بەشی (خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی). ئیمپراتۆرییەتی دێرینی خاوەن هێز و ژیاری ڕۆمانی وەک خۆی نەما و ئەم دوو بەشییە زیاتر لاوازی کرد، ئەنجامەکەشی لەناوچوونی بەشە خۆرئاواییەکەی بوو، لەبەر ئەم هۆیانە دەکرێت سەدەی چوارەمی زایینی بە سەرەتای دەستپێکی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپای دابنێین.

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩.

## قۆناغە سەرەکییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و تایبەتمەندییەکانیان

ئەو قۆناغانەی کە پێی دەڵێن سەدەکانی ناوەڕاست؛ مەودایەکی دوورودرێژە و نزیکەی یازدە سەدە دەبێت، لەو ماوەیەدا ئەورووپا لەنێوان دروستبوون و پێگەیشتندا بوو، بەڵام ناکرێت وا تێبگەین کە ژیانی خەڵک و کۆمەڵگای ئەوکاتە لە یەک ئاستدا بوون؛ بەڵکوو ژیان و ژیاریان بە شێوازی جۆراوجۆر گۆڕانی بەسەردا دەهات، گۆڕانەکەش گەلی لاواز و هێواش و لەسەرخۆ گەشەی دەکرد، بە نموونەی ئەو بارودۆخەی خەڵکی فەڕەنسا لە سەردەمی (شارلەمان) لە کۆتایی سەدەی هەشتدا لێی دەژیان، جیاواز بوو لەو سەردەمەی ئینگلتەرا کە (هێنری سێیەم) (١٢١٦-١٢٧٢ ز) تێیدا دەسەڵاتدار بوو لە سەدەی سیازدەی زایینیدا[١].

مێژوونووسان مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا دابەش دەکەن بەسەر سێ قۆناغدا؛ هەر قۆناغێک لەو مێژووە کۆمەڵێک تایبەتمەندی خۆی هەیە، کە لە قۆناغەکانی دیکە جیای دەکاتەوە.

ئەوەی شایەنی باسە ئەم دابەشبوونە زیاتر دابەشکردنێکی ساتییە و هەندێک زیادەڕەوی ساتی و جێگایی تێدایە، چونکە ناوچەکانی ئەورووپای خۆرئاوا لە گەشەکردن و پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکانیان یەکسان نەبوون؛ بەکورتی ئەم دابەشکردنە یارمەتیمان دەدات بۆ دەستنیشانکردنی هێڵە گشتییەکان، بەبێ ئەوەی بەوردی و دوورودرێژی بچینە ناو گێتی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپای خۆرئاوادا.

### قۆناغی یەکەم

ئەم قۆناغە لە سەدەی چوارەمی زایینییەوە دەست پێ دەکات و هەتا کۆتایی سەدەی دەیەم بەردەوام دەبێت، تێیدا ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی لە سەدەی چوارەم هەرەسی هێنا و میللەتانی دیکەی جۆراوجۆر گۆڕانیان بەسەر گێتی ڕۆمانیدا هێنا، ڕەگەزی ئەم میللەتانەش بریتی بوون لە (گووت و هۆن و ڤەنداڵ و بورگوندیا و سەکسۆن و لۆمباردییەکان).[٢]

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٨-٢٩.

(٢) نورمان كنتور: التاريخ الوسيط-قصة الحضارة البداية والنهاية، تر.قاسم عبده قاسم، دار العين للدراسات، الجيزة، ٢٠٠٩ م، ص٢٠.

جگە لەمانە موسڵمانەکانیش لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمدا لە ڕێگای فراوانخوازییە مووسڵمانەکانەوە بەشێک لە خاکی ڕۆمانییەکانیان داگیر کرد، لە سەدەکانی نۆیەم و دەیەمیشدا هەندێک لە میللەتانی باکووری ئەورووپا لە (سوید، نەرویج، دانیمارک و هەنگاریا) خزانە ناو ناوچەی ڕۆمانییەکان، هەموو ئەوەی باسمان کرد بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە گێتی ڕۆمانییەکان بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئارامی بە خۆیەوە نەدی و بەردەوامیش لە گیروگرفتی جۆراوجۆردا بوو. هەر چەندە هەندێک لە خەڵکی دەیانویست درێژە بە نەریت و بیر و ژیانی ڕۆمانی بدەن؛ بەلام بۆیان نەکرا، چونکە بە پێچەوانەی ئاراستەی مێژووی ئەوکاتەوە بوو کە زاڵ بووبوو بەسەر کۆمەڵگادا، شاری ڕۆماش ئەگەرچی پێشتر مەڵبەندی ژیار و ڕێکخستن و پێشکەوتن بوو؛ وردە وردە ئەو تایبەتمەندییانەی لەدەستدەدا[١].

ئەم ڕووداوانە ئەگەرچی بۆ ئەو سەدانەی باسمان کردن گرنگی خۆیان هەیە؛ بەلام لەژێر پەردە و بە شاراوەیی شانبەشانی پرۆسەیەکی دیکە دەڕۆیشت، کە ئەویش تێکەڵبوونی ئەو بیر و ژیارییە بوو کە لە ڕۆمانییەکانەوە مابووەوە لەگەڵ بیروباوەڕ و نەریتی نوێی ئەو میللەتانە کە تازە تێکەڵی ڕۆمانییەکان ببوون، ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەڵگای ئەورووپی مەسیحی بوون و بەرەو مەسیحییەت دەڕۆیشتن، کڵێساش لە ڕووی یاسا و سیستمەوە باڵادەست بوو[٢].

**قۆناغی دووەم**

ئەم قۆناغە لە سەدەی یازدەهەمەوە دەست پێ دەکات و هەتا سەدەی سیازدەهەم بەردەوام دەبێت، لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم قۆناغە دروست بوونی ئارامی ڕێژەییە لە ژیانی خەڵک بە بەراورد لەگەڵ سەدەکانی پێشووتر، هەر لەم قۆناغەدا سیستمی دەرەبەگایەتی چەسپاو بوو بە سیستمی ڕامیاری، ڕۆشنگەری (تنویر) و بڵاو بوونەوەی بیری سەدەکانی ناوەڕاست پێشکەوتووتر بوو لە سەدەکانی پێشووتر لە خەسڵەتەکانی دیکەی ئەم قۆناغە کە بریتین لە ئەنجامدانی خوێندنەوە بۆ یاسای ڕۆمانی و ئەو بنەمایانەی کە لەسەری دروست

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوربا العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ص٣٠.
(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، ص٢٧-٢٨.

ببوو، دانانی یاسای مەسیحی لە لایەن پیاوانی ئایینی مەسیحییەوە، دروستکردنی پەرستگای مەسیحی گەورە و پێشکەوتوو کە ئەندازیاری بیناسازی ئەو سەردەمەی پێوە دەبینرا، لەگەڵ توێژینەوەی فەلسەفەی (ئەرستۆ) و یۆنانی دێرین[1].

هەر لەم قۆناغەدا سیستەمی بەڕێوەبردنی شارەکان و کۆمۆنەکان بەرەسمی کران و سەندیکاکان دامەزران، کە هەتا ئەمڕۆ ئەم سیستەمە بە هەندێک دەستکاری و گۆڕانکارییەوە بوونی هەیە، هەروەها ئاوەزی سیستەمی پەرلەمانی هاتە گۆڕێ، پیشەسازی پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوەدی و بازرگانی لە ئەورووپا و وڵاتانی خۆرهەڵات دەستی پێ کرد. جێی وەبیرهێنانەوەیە کۆمەڵگای ئەورووپا لەو سەردەمەدا زیاتر کشتوکاڵی بوو، سیستەمی ڕامیاری دەرەبەگی کۆمەڵگای ئەورووپیش کە لەسەر بنەمای دەرەبەگی دامەزراو بوو، دەبوو تەواوی چینەکانی کۆمەڵگا پێوەی پابەند ببن. لە دەرەوەی ئەورووپاش؛ لەو میرنشینە بچووکانەی کە خاچییەکان لە خۆرهەڵاتدا دروستیان کردبوون؛ کار بە هەمان سیستەمی ڕامیاری دەرەبەگایەتی ئەورووپی دەکرا[2].

لە لایەکی دیکەوە بیری ئەورووپای یەکگرتوو هاتەکایەوە کە پاپا ڕێبەرایەتی کاروباری ئایینی تێیدا بکات و ئیمپڕاتۆریش لێپرسراوییەتی کاروباری دونیایی تێدا لەئەستۆ بگرێت، هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئەم بیرە؛ هێرشی خاچییەکان بوو، کە ئەمەش تەنها لە ئەورووپای خۆرئاوا بوو؛ نەک لە هەموو ئەورووپادا[3].

### قۆناغی سێیەم

سەدەی چواردەهەم بە سەرەتای لەناوچوونی ئەو ژیارەی لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو دادەنرێت، ئەو ژیارە هاوشێوەی هەموو ئەو ژیارانەی کە پێشتر هەبوون و لەناوچووبوون گەشتبووە لوتکە، بێگومان ژیارەکان لەسەر یەک شێوە بیرکردنەوە زۆر بەردەوام نابن، لەم چوارچێوەیەشدا بیری سەدەکانی ناوەڕاست کە دووچاری بیروبۆچوونی نوێی علمانیەت ببوویەوە توایەوە، واتە بە تێپەڕبوونی سەدەکانی چوارده و پازده ئەو بیروباوەڕەی لە سەدەکانی پێشووتر

---

(١) محمد زاید عبدالله: مدخل الى تاریخ اوروبا، ص١٧.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاراس فەریق زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان.

(٣) نورمان کانتور: التاریخ الوسیط، ص٣١.

هەبوون گۆڕانیان بەسەردا هات و بەسەرچوون[1]. بەنموونە تێڕوانینی خەڵکی بۆ پاشا گۆڕانکاری بەسەردا هات؛ پێشتر لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی ئەوەبوو کە وەک پاشا سەیری سەرۆکی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی دەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا ئەم تێڕوانینە گۆڕانی بەسەردا هات و لەبری پاشا وەک سەرۆکی دەوڵەت لێیان دەڕوانین، دەسەڵاتی پاشا پەرەیسەند و زیاتر بوو، شێوەی دەوڵەتەکەشی گۆڕا بۆ شێوەی دەوڵەتی نوێ، گۆڕان بەسەر دەزگاکانی خوێندندا هات و لە جاران زیاتر بێبایەختر بوو لە ڕووە دووبارەکەی، هاوکات لەبری زمانی لاتینی؛ زمانی نەتەوەیی بەکار دەهات، بەنموونە: (دانتی) بە ئیتاڵی دەینووسی، (فرنسۆ ڤیلۆن)ی هۆنەری فەرەنسی (١٤٣١- ١٤٦٣ز) بە فەرەنسی و (چۆسین) (١٣٤٠-١٤٠٠ ز) بە ئینگلیزی دەیاننوسی[2].

لەم قۆناغەدا کەنیسە تووشی لاوازی هات و هەژموونی جارانی نەما، دووچاری دووبەرەکی و پارچە پارچە بوون و ڕەخنەی توند بوویەوە، ناکۆکی نێوان دەسەڵاتی دونیایی و ئایینی گەشتبووە لوتکە، بەکورتی ژیاری مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست وەک بەشێک لە مێژووی مرۆڤایەتی لە کۆتایی سەدەی پازدەهەم ئەو ڕۆڵەی پێشتری نەما و دەتوانین بڵێین بەرەو نەمان دەچوو، لە بەرامبەردا سەدەی نوێ بە کۆمەڵێک بیروباوەڕی نوێ و داهێنان و پێشکەوتنی زانستییەوە شوێنی گرتەوە[3].

## کۆتاییەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست

لەمەو پێش باسمان لە بیروبۆچوونی جیا جیا کرد لەبارەی دیاریکردنی سەرەتای مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا، بە هەمان شێوە باس لە بیروبۆچونی جیا جیا دەکەین لەبارەی کۆتایی هاتنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەگەر گەشەکردن و گۆڕانکارییەکانی سەدەی چوارەمی زایینی بووە هۆی گۆڕینی ناوی کۆمەڵگای ڕۆمانی بۆ کۆمەڵگای چەرخەکانی ناوەڕاست؛ بە هەمان شێوە کۆمەڵێک گۆڕانکاری ڕوویاندا، لە ئەنجامدا کۆمەڵگای سەدەکانی

(١) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا، ص٣٢.
(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣١-٣٢.
(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا، ص٣٦-٤٠.

ناوەڕاست گۆڕانی بەسەرداهات و بوو بە کۆمەڵگایەکی نوێ، کە پێی دەڵێن سەدەکانی نوێ، لەبارەی ئەو گۆڕانکاری و ڕووداو و هەلومەرجەی کە دووچاری سەدەکانی ناوەڕست ببوون بیروبۆچوونی جیا جیا هەن بۆ دەستنیشانکردنی کۆتایی مێژووی ئەم چەرخە، یەکێک لەو گۆڕانکاری و ڕووداوانە دەگەڕێتەوە بۆ هونەرمەندان و زانایان؛ کە لە توانایاندا نەمابوو زیاتر وابەستە و ملکەچی ئایینی مەسیحی بن لە داهێنانەکانیاندا، چونکە دەبووایە بەرهەمەکانیان ڕەنگدانەوەی تەواوی ئایینی مەسیحەت بیت و پێ لەو سنوورە هەڵنەبڕن کە قەشە و پیاوانی ئایینی بۆیان دیاریدەکردن[1]، بەڵام هونەرمەندان ئیدی خورپەیان لەو کە تواره وەرگرت کە تێیدا دەژیان و دەستیانکرد بە زیندووکردنەوە و ژیاندنەوەی کەلتوور و بەرهەمەکانی گریکی و ڕۆمانی دێرین، بەمشێوەیە هونەرێکی بەرزی مرۆڤایەتی سەریهەڵدا لە بوارەکانی نیگارکێشان و هەڵکۆڵیندا کە گوزارشتیان لە زۆر شتی نوێ دەرکرد لە کاتێکدا لە لایەن کەنیسەوە قەدەغە کرابوون. وێژە و زانایانیش خۆیان ڕزگار کرد لە کۆتوبەندی بیروباوەڕەکانی سەدەکانی ناوەڕاست. لە ئیتاڵیا یەکەم کەس کە دەستی کرد بە بیرکردنەوەی نوێ (دانتی ئەلیجیری) (١٢٦٠-١٣٢١ ز) بوو، کاکڵی بیری نوێی دامەزراند و بەرهەمەکانی خۆی لە جیاتی بە لاتینی بنوسێ بە ئیتاڵی نووسی و بڵاوی کردەوە، هەر چەندە هێشتا ئەو پاشماوەی بیری سەدەکانی ناوەڕاستی هەر پێوە دیار بووە و لە تەک ئەو (بترارک ١٢٠٤-١٣٧٤ ز) هەوڵیدا کۆتی بیری سەدەکانی ناوەڕاست بپچڕێنێت، هەروەها (بۆکاشیۆ ١٣١٣-١٣٧٥ ز) کە هێرشی سەختی کردە سەر پیاوانی ئایینی. لەتەک ئەمانەدا زۆری دیکەش هەبوون کە داوای ئازادی و بەختەوەریان دەکرد لە ژیاندا، بیروباوەڕی ئەم هونەرمەند و زانایانە بووە هەوڵێکی ڕیشەیی بۆ گۆڕینی سەدەکانی ناوەڕاست بەرەو قۆناغێکی نوێی سەردەمی[2].

کۆمەڵێک لە زانایان توانیان لە بوارەکانی زانستدا شتی نوێ بدۆزنەوە و داهێنان بەدەست بهێنن، کە ئەمەش کاریگەرییەتی خۆی هەبوو بۆ لەناوبردنی بنەمای سەدەکانی ناوەڕاست و هێنانەدی سەردەمێکی نوێی دیکە، هەر ئەو سەردەمە خولی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢١-٢٢.

(٢) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ص٣٧.

سوڕانی خوێن و تویکڵی لەشی مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەک دۆزرایەوە و ئاشکرا کران، هەروەها قیبلەنما و تەلیسکۆب دۆزرانەوە بۆ گەشتی دەریایی، لەتەک ئەمانەشدا تیۆریای (گالیلۆ ١٥٦٤-١٦٤٢ ز) لە بواری زانستی گەردوون (ئەسترۆنومیا) هاتە ئاراوە کە دەڵێت زەوی شتێک نییە جگە لە ئەستێرەیەکی ئاسمان، کاغەز و چاپ و پەرتووک هاتنە ناو کۆمەڵگا و لە جیاتی زمانی لاتینی ئیتر خەڵک بە زمانی ناوچەیی و نەتەوەیی خۆیان کەوتنە نووسین، جگە لەمانەش تۆپ و بارووت دۆزرایەوە، کە دواتر قەڵا و کۆشکی دەرەبەگەکانی ئەورووپای پێ ڕووخێنرا، یەکێک لە خەسڵەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ئایین بوو؛ هەتا ئەو کات ئەوەی لە ڕێبازی کەنیسە لایبدابا ئەوە بە بێباوەر لەقەڵەم دەدرا و سزای سووتاندنی بەسەردا دەدرا[١].

دیارە ئەو بوارەش وەک خۆی نەمایەوە، بەڵکوو چاکسازییەکی ئایینی چڕ و خەستی تێدا ئەنجامدرا، کە تێیدا (تاکە کەس بوێری دەکرد کە لێدوان لەسەر بابەتە ئایینییەکان بدات و ڕەخنەش لە نەریتی پاپا و کەنیسە بگرێت)، ئەوانەی بەم کارە هەستان (جۆن ویکلفی بەریتانی ١٣٢٠-١٣٨٤ ز) و (جۆن هنس ١٣٦٩-١٤١٥ ز)، جگە لەمانەش دەرکەوتنی ئایینزای پرۆتستانت بوو لە سەدەکانی شازدەدا کە لە لایەن (مارتن لۆسەر ١٤٨٣-١٥٤٦ ز) بڵاو کرایەوە لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا، ئەنجامەکەشی لەناوچوون و کزبوونی کەنیسەی لاتینی بوو، ئەو کەنیسەیەی کە کۆڵەکەی ژیاری سەدەکانی ناوەڕاست بوو[٢]. خەسڵەتەکانی دیکەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا بوارە ڕامیارییەکانە، پێش هەموو شتێک پەیدابوونی میللەتێکی نوێ بوو لە ئەورووپا؛ کە لە ڕووی ئایینی و جیاوازی نەتەوەییان لەگەڵ میللەتانی ئەورووپا هەبوو، ئەویش تورکە عوسمانییەکان بوون، کە لەساڵی (١٤٥٣ ز) هێرشیان بردە سەر قوستەنتینە و داگیریان کرد، دواتر هێرشیان بردە سەر ئەورووپای خۆرهەڵات و بەمەش کۆتاییان بە دەوڵەتی بیزەنتی هێنا لە ئەورووپادا، ئیدی وردە دەوڵەت پەیدا بوون و پاشا بوونە فەرمانڕەوا، هەندێکیش هەر لە ڕووی ئایینییەوە سەر بە پاپای ڕۆما مانەوە[٣].

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسيط، ص٢٣.

(٤) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ص٤٢.

(٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: (عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، ج٢/ ص٣٩٥-٤٠٥).

لەگەڵ پەیدا بوونی دەوڵەتی نوێدا، لە ئینگلتەرا گەشەکردنی دەستوور بەرچاو دەکەوێت، کە ئەنجامی خەباتی دووردوورودرێژی بەردەوامی نێوان پاشا و گەل بوو لەو کاتەوەی کە نۆرمانییەکان پەیدا بوون. دەستووری ئینگلتەرا بە بناغەی زۆربەی دەستوورەکانی گێتی دادەنرێت، گەلی ئینگلیزیش لە ئەنجامی خەباتی بێوچان لە سەدەی سیازدەهەمدا بەدەستیانهێنا، ئەمە لە کاتێکدا بوو ئیدی بیروباوەڕ و فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست ڕوویان لە هەرەسهێناندا بوو، گەلی ئینگلیز چەندین شۆڕش و ڕاپەڕینیان کرد هەتا بناغەکانی هزری سەدەکانی ناوەڕاستیان لە وڵاتی خۆیان هەڵکەند. ناکرێت ڕۆڵی گرنگی هەندێک لە زانایان و فەیلەسووفانی دیکەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا باس نەکەین کە کاریگەری خۆیان هەبوو لەسەر لاوانی ئەو سەردەمە لەوانە (بێتر ئەبێلارد ١٠٧٩-١١٤٢ ز) و قەشە (بێرنارد من کلیرفو١٠٩٠- ١١٥٣ ز) کە کاریگەری مەزنیان لەسەر گۆڕانی هزر هەبوو و چەندین کەس لەسەر دەستی ئەوان مەشخەڵی بیری نوێیان هەڵگرت، لە ئەنجامدا هەموو تواناکان توانیان بەسەر ئاوەز و بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ ببن، هەر ئەمانیش بوون زەمینەیەکیان خۆش کرد بۆ ئەوەی ئەورووپا گۆڕانکاری ڕیشەیی و گرنگی تێدا بەدی بکرێت و ڕۆشنبیری و زانستی علمانیەت تێدا گەشە بکات، دوای ئەم کورتە باسەی سەرەوە لەمەڕ کۆتایی هاتنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست؛ چەند بیروبۆچوونێکی دیکە هەن کە ڕووداوێک، گۆڕانکارییەک، خاڵێکی گرنگ یا هەرشتێکی دیکە دەکەن بە کۆتایی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست[1].

بۆیە بە پێویستم زانی ئەم بیروبۆچوونانە بکەم بە چوار گرووپەوە:

**یەکەم/ هەندێک بیروڕا لەبارەی لایەنە جەنگییەکان:**

هەندێک مێژوونووس پێیان وایە کە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا لە ساڵی (١٤٥٣ ز)ەوە دەست پێ دەکات، ئەم بۆچوونەشیان بە دوو هۆکار شی دەکەنەوە؛ لەو ساڵەدا شاری قوستەنتینییە کەوتە ژێر دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان وەک باسمان کرد. کۆمەڵگای ئەورووپیش پێکهاتبوو لە سێ گرووپ:

---

(١) جوزیف نسیم یوسف: تاریخ العصور الوسطى الاوربية وحضارتها، ص٣٨.

کۆمەڵگای ئیسلامی، کۆمەڵگای ئەورووپایی خۆرئاوا، کۆمەڵگای ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی). لەگەڵ ڕووخانی قوستەنتینییە کە دوایین دەزگای ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی ـەگەڵیدا ڕووخا بە هەموو ناوەڕۆکە فەلسەفی و هزرییەکەیەوە، لەگەڵ ئەمەشدا کۆمەڵگای سەدەکانی ناوەڕاست کۆتایی پێ هات و تورک هاتنە ناو خاکی فراوانی ئەورووپاوە. هەر لەو ساڵەدا (١٤٥٣ ز) شەڕی سەد ساڵەی نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرا کۆتایی هات، کە ئەمە بە یەکێک لە شەڕەکانی سەدەکانی ناوەڕاست هەژمار دەکرێت، وەکوو شەڕ و هەڵمەتەکانی خاچییەکان بۆ سەر گێتی ئیسلامی، ئەمەش گۆڕانکاری بەسەر سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئایینی و جوڵانەوەکانی دیکەی وەک کەنیسە و دەرەبەگایەتی و سوارچاکیدا هێنا.

**دووەم/ بیروڕا لەبارەی زانستی ڕێنیسانسەوە:**

لایەنگرانی ئەم گرووپە لە زانایان و بیرمەندان بەو جۆرە بوون، (دانتی) لە بەرهەمەکەیدا کە (کۆمیدیای خودایی)یە، یەکەم کەس بوو لەبری زمانی لاتینی بە زمانی ئیتاڵی نووسینی بڵاو کردەوە لە سەدەی چواردەیەمدا؛ بەمەش تۆوی بیری نوێی چاند، بەڕای مێژوونووسانی ئەم گرووپە دەکرێ ئەم کارەی دانتی بە سەرەتای کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دابنرێت و سەرەتایەکیش بێت بۆ مێژووی سەردەمی نوێ؛ چونکە ئەم پرۆسەیەی ڕێنسانس درێژەی هەبوو، هەتا لە سەدەی شازدەدا گەیشتە لوتکە[1].

**سێیەم/ بیروڕا لەبارەی چاکسازی ئایینی:**

گرووپێک لە مێژوونووسان بۆچوونیان بەو جۆرەیە، کە لەگەڵ دەستپێکی چاکسازی ئایینیدا لە سەدەی چواردەهەم و ڕەخنەگرتن لە کەنیسە و پاشان چاکسازی دەزگای پاپایی و دورکەوتنەوە لە زانستە مەسیحییەکان بە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنێن، چونکە لەمەودوا ئیدی پاپا و کەنیسە ئەو شکۆ و

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٦.

دەسەڵاتەیان نەما کە پێشتر هەیانبوو، ئەم سیستم و بیروباوەڕەی پێشتر بوونی هەبوو؛ ئیدی برەوی نەما و پوکایەوە[1].

## چوارەم/ بیروباوەڕ لەبارەی دۆزینەوەی جوگرافییەکان:

کۆمەڵێک مێژوونووس بۆچوونیان بەو جۆرەیە کە ساڵی (١٤٩٢ ز) ساڵێکی ئاشکرا و ڕوونە و کۆتایی هاتنی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستە لە ئەورووپا، واتە ئەو ساڵەی کە (کریستۆفەر کۆلۆمبس ١٤٥١-١٥٠٦ ز) ئەمریکای دۆزییەوە[2]، هەروەها دۆزینەوەی (رأس الرجاء الصالح) گرنگی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی گێتی بە شێوەیەکی فراوان هەبوو.

ناکرێت بەتەنها و بە یەک بڕیار یەکێک لەو خاڵانەی باسمان کرد بیکەین بە خاڵی وەرچەرخان؛ بەڵکوو گشتیان بەیەکەوە بوون بە خاکبەری گۆڕانێکی لەسەرخۆی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ سەردەمی نوێ، واتە بریتی بوون لە پرۆسیستێکی لەسەرخۆی گشتلایەنە کە ناکرێت یەک ڕووداو یان بابەتێکی تایبەتی بکرێت بە خاڵی سەرچاوەگیری وەرچەرخانەکە؛ بەتایبەتی لە سەدەکانی چواردە و پازدە و شازدە کە ژیان و ژیاری لەگەڵ سەدەکانی ڕابردوودا تەواو جیاواز بوون، بەڵام زۆربەی مێژوونووسان سەدەی چوارەم بە سەرەتا و سەدەی پازدەهەم بە کۆتایی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا دادەنێن[3].

---

(١) موريس كين: حضارة اوروبا العصور الوسطى، تر: قاسم عبده قاسم، عين للدراسات، القاهرة، ٢٠٠٧، ص٢٦١-٢٦٥.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاراس زەینەڵ: مێژووی ئەمریکا، چاپخانەی تاران، ٢٠١٩، ل١٢-١٧.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج٢/ ص٤٢٠-٤٢٣.

# بەشی دووەم

- ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی خۆرئاوا و هۆکارەکانی ڕووخاندنی
- هۆکاری ڕامیاری و سەربازی
- هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی
- هۆکاری کارگێڕی
- بیردۆزەکانی ڕووخاندنی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی
- گەشەکردنی ڕۆشنبیری و ئاستی بیرکردنەوە لە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا
- لەناوچوونی ژیارە دێرینەکان
- کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی

## ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی خۆرئاوا و هۆکارەکانی رووخاندنی

توێژەران و مێژوونووسان؛ سەردەمە رامیارییەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانییان بەسەر سێ قۆناغی جیاوازدا دابەش کردووە:

**قۆناغی یەکەم/ سەردەمی پاشایەتی:** لە ساڵی (٧٥٤ پ. ز)ەوە دەست پێ دەکات و لە ساڵی (٥٠٩ پ. ز) بە دەستپێکی سەردەمی کۆماری کۆتایی پێ دێت.

**قۆناغی دووەم/ سەردەمی کۆماری:** لە ساڵی (٥٠٩ پ. ز)ەوە دەست پێ دەکات و لە ساڵی (٢٧ پ. ز) بە دەستپێکی قۆناغی ئیمپراتۆری کۆتایی پێ دێت.

**قۆناغی سێیەم/ سەردەمی ئیمپراتۆرییەت:** لە ساڵی(٢٧ پ. ز)ەوە دەست پێ دەکات و بە کەوتنی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی خۆرئاوا لە ساڵی (٤٧٦ ز) بە دەستی هۆزە جەرمەنییەکان کۆتایی هات و مەشخەڵی ئیمپراتۆرییەتی بۆ قوستەنتینیە گواسترایەوە، ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی قوستەنتینەش لە ساڵی (١٤٥٣ ز) بە دەستی تورکە عوسمانییەکان رووخا[١].

مێژوونووسان فەرمانرەوایی (ئۆگستس ٢٧پ. ز/ ١٤ ز) بە کۆتایی سەردەمی کۆماریی و سەرەتای سەردەمی ئیمپراتۆری لە رۆما دادەنێن، فەرمانرەوایی (ئۆگستس) شێوەیەکی لێکدراو بوو لە سیستمی پاشایەتی و کۆماری و لەمەشدا سەرکەوتوو بوو، دەوڵەت بە هێشتنەوەی ئەنجوومەنی پیران (سینات)؛ پارێزگاری لە رووکارە کۆمارییەکەی کرد[٢]. لە هەمان کاتدا (ئۆگستس) خاوەن دەسەڵاتێکی بەرفراوان بوو، جگە لەوەی سەرۆکی باڵای سوپای رۆمانی بوو؛ دەستی بەسەر زۆربەی کاروبارە گرنگەکانی دەوڵەتیشدا گرتبوو، بەنموونە توانای هەڵوەشاندنەوەی هەر بریارێکی ئەنجوومەنی پیرانی هەبوو، هەروەها توانای جڵەوگیری کردنی هەبوو بە ئەندامێتی ئەنجوومەنی پیران، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا مافی دیاریکردنی تێکرای فەرمانرەواکانی هەرێمە جیاوازەکانی دەوڵەتی رۆمانی لەژێر رکێفدا بوو، ئەوانیش راستەوخۆ بەرپرسیار بوون لە بەرامبەر (ئۆگستس)[٣].

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر بروانە: (رونالد. ر. رودلي: الحضارة الرومانية، تر؛ احمد لطفي عبدالسلام، الطبعة الاولى، مكتبة النافذة، ٢٠١١ م، مصر).

(٢) عباس العبودي: تاريخ القانون، دار الثقافة للنشر والتوزيع، ص١١٤.

(٣) عصام يوسف: تاريخ اوروبا، الدار العالمية للكتب والنشر، الطبعة الاولى، الجيزة، ٢٠١١، ص٦٣.

ئەنجــوومەنی پیــران بە شــێوەیەکی دادپەروەرانە دەســەڵاتی بەڕێــوەبردنی هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیان بەڕێوەدەبرد؛ جگە لە هەرێمە سنوورییەکان کە لەبەر گرنگیان لەڕووی سەربازییەوە بەڕێوەبردنیان ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی (ئۆگستس)دا بوو[1].

(ئۆگستس) بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکەی؛ هەوڵیدا کە گیانێکی نوێ بەبەر ئایینی ڕۆمانی دێرینـدا بکـات و سـەرلەنوێ بیبـووژێنێتەوە، ئەو ئـایینەی کە جۆرێـک لە خوداوەنـدێتی و پیـرۆزی بە فەرمانڕەواکـان دەبەخشـی، هاوکـات (ئۆگســتس) ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر بڕیاری ئەنجوومەنی پیران بە بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی خەسـڵەتە خوداوەنـدییەکان، هەروەهـا هـۆنەری ڕۆمـانی (ڤیرجل)یشـی هانـدا کە هۆنراوەیەکی کاریگەر دابڕێژێت کە تایبەت بێت بە پیاهەڵدان بە (ئۆگستس) و ئەو دەستکەوتانەی کە خێزانەکەی بەدەستیانهێناوە[2]. ئامانجی (ئۆگستس) لەم کارانەیدا تەنها بەدەستهێنانی شکۆمەندی بۆ خۆی نەبوو؛ بەڵکوو دەیوست پیرۆزییەک بە پۆستی ئیمپراتۆر ببەخشێت، بەمشێوەیە (ئۆگستس) سەرکەوتوو بوو لە چەسپاندن و جێگیرکردنـی بنەماکـانی ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمـانی، مـانەوەی ئیمپراتـۆرییەت بـۆ مـاوەی چـوار سـەدە لەدوای (ئۆگسـتس)، سـەرباری بـوونی چەنـدەها ئاسـتەنگ و گیروگرفتـی ئـاڵۆز کە ڕووبەرووی ئیمپراتـۆرییەت ببـوویەوە، بـۆ خـۆی نیشـانەی ســـەرکەوتنی (ئۆگســـتس)ە لە کارەکانیـــدا. لە مـــاوەی ئەو چـــوار ســـەدەیەدا ئیمپراتۆرییەت پارێزگاری لە هەواداری هێزی دەوڵەت کرد، ئەمەش لە ڕێـی سـوپا گەورە و بەردەوامەکەیەوە بـوو؛ کە بە شـێوەیەکی جـوان مەشـقیان پـێ دەکـرا و پڕچەک دەکران، لەگەڵ بەهێزی دامودەزگای کـارگێڕی و ڕێکخسـتنی ئامڕازەکانی گەیاندن و ڕێگاوبان[3].

لە سەدەی پێنجەمی زایینیدا؛ ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمـانی ئەو سیمایانەی لەدەسـتدا کە (ئۆگسـتس) لە سـاڵی (١٤ پ. ز) بەجێیهێشـت، لەمـاوەی سـێ سـەدەی کۆتاییـدا؛ پشـێوی ڕامیـاری و تێکچـوونی بـارودۆخی ئـابووری بـووە سـیمایەکی بەرچـاوی ئیمپراتـۆرییەت، زۆربەی هەرێـمە گرنگەکـانی وەکـوو: (ئیسـپانیا و وڵاتـی گـاڵ و

---

(١) بهنام محمد پناە: نهێنییەکانی شارستانییەتی ڕۆمـای کۆن، و: ڕەحمـان ئەمیری، چـاپی دووەم، چاپخـانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٥، ل٥٧.

(٢) مصطفى العبادي: الامبراطورية الرومانية، دار النهضة العربية، بيروت، ص١٩.

(٣) بهنام محمد پناە: نهێنییەکانی شارستانییەتی ڕۆمای کۆن، ل٥٧.

ـەریتانیـا)ی لەدەسـتدا، ئەم رەوشـە زیـاتر بەشـی خۆرئـاوای ئیمپراتـۆرییەتەکەی گرتەوە، بەپێچەوانەوە هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆرییەت توانیان پارێزگاری لە گەشاوەیی و پرشنگداری خۆیان بکەن[1].

بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە بەشە جیاوازەکانی ئیمپراتـۆرییەتی رۆمانیدا رووبەکی دیکەی دیمەنە گرنگەکانی مێژووی ئەم ئیمپراتـۆرییەتە دەردەخـات لە سێ سـەدەی کۆتاییدا، کلێسـەی مەسـیحی وەک شـوێنگرەوەی ئیمپراتـۆرییەتی رۆمـانی توانی سـەرکەوتن بەدەستبهێنێت لە پارێزگاری کردن لە یەکێتی ژیاری ئەورووپا؛ بەتـایبەت کاتێـک تـوانی بیروبـاوەڕی خـۆی لەنێـو هـۆزە جەرمانەکانـدا بڵاوبکـاتەوە، ئەمە یارمەتی ئەو هۆزانەیدا، کە لەو ژیارە تێبگەن و وەریبگرن[2].

لە سـەدەی سـێیەمی زاییندا؛ کۆتـایی بەو سیسـتەمە هـات کە ئیمپراتـۆر (ئۆگستس) دایمەزراندبوو، شڵەژاوی و نائارامی رامیاری رێگای بـۆ سـەرهەڵدانی سیسـتەمی دیکتـاتۆرییەتی خـۆش کـرد، هاتنەکـایەی چەنـد دیکتـاتۆرێکی سـەربازی بووە هۆی هەڵوەشانەوەی سیستەمی (ئۆگستس) کە بەگشـتی رووکـارێکی کۆمـاری هەبوو، لە ئەنجامدا سیستەمێکی سەرکوتکەر لەسەر شێوەی سیستەمی خـۆرهەڵاتی شوێنی گرتەوە، ئەوەش لەسەردەستی ئیمپراتۆر (دیۆکلدیانۆس)دا روویدا[3].

لاوازی و کەوتنـی رۆمـا لە گرنگتـرین ئەو رووداوە گرنگـانەی مێـژووە کە سـەرنجی لێکـۆلەران و مێژوونووسـانی راکێشـاوە و لە هەمـوو سـەردەمەکاندا لێکدانەوە و راڤەی زۆر و جۆراوجۆری بۆ کراوە، کە سەرجەمیان جەختیان لەسـەر هۆکاری رامیاری و کاریگەری هۆکارەکانی دیکەی وەک: (ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاکـاری) کـردووەتەوە، بێگومـان تەنهـا هۆکارێـک نەبـووەتە هـۆی رووخـانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی؛ بەڵکوو کۆمەڵێک هۆکار بە تێپەڕبوونی کات بوون بە هـۆی لاوازبـوون و لە کۆتاییشـدا رووخـانی ئیمپراتـۆرییەتی رۆمـانی کە خـۆی لە هۆکـارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان دەبینییەوە.

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ج١/ص١٣-١٥.

(٢) سعید عبد الفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا في العصور الوسطی، دار النهضة العربیة، بیروت، ص١٤-١٥.

(٣) سعید عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ص٢٠-٢١.

## هۆكاری ناوخۆیی

### هۆكاری ڕامیاری و سەربازی

دەتوانین بڵێین لە سەدەی سێیەمی زایینییەوە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی ڕووبەڕووی قەیرانی گەورە و توند بووەوە؛ كە بووە هۆی هەژاندنی قەوارە ڕامیارییەكەی، یەكێك لەو قەیرانانە بریتی بوو لە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لە هەموو بوارەكانی ژیاندا، ئەمە و جگە لە زۆربوونی هێرش و پەلامارەكان بۆ سەر سنوورەكانی؛ بەتایبەت هێرشی بەربەرییەكان بۆ سەر سنووری ڕووباری (دانووب)، جگە لە مەترسی (ساسانییەكان) لە بەشی خۆرهەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەت؛ بەمەش مەترسی ڕووخاندن بەرۆكی ئیمپڕاتۆرییەتی گرتەوە و سەرەتای لاوازی و ڕووخاندنی ئەو ئیمپڕاتۆرییەتە مەزنە دەركەوت، كە خۆی لە دوو هۆكاری سەرەكی دەبینێتەوە؛ ئەویش هۆكاری ناوخۆ و دەرەكی دەگرێتەوە[1].

یەكێك لەو هۆكارە سەرەكیانەی كە بەردەوام دەبووە هۆی پشێوی ڕامیاری لە تێكڕای ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا؛ كێشەی جێگرەوەی تەختی ڕۆمانی بوو، كە بەدرێژایی مێژووی ئیمپڕاتۆرییەت سیستمێكی جێگیر بۆ ئەم مەبەستە گەڵاڵە نەكرابوو، لە دوای مردنی هەر ئیمپڕاتۆرێك؛ ململانێ لەنێوان ڕكابەرەكاندا دووبارە دەبوویەوە، ئەم كێشەیە نەك شتێكی نوێ نەبوو؛ بەڵكوو یەكێك بوو لە دیارترین تایبەتمەندییەكانی مێژووی ئیمپڕاتۆرییەت[2].

پشێوی ڕامیاری ناوچە جیاوازەكانی ئیمپڕاتۆرییەت ڕێگای بۆ سوپا خۆش كرد دەست لە كاروباری ڕامیاری وەربدات، بە جۆرێك ڕۆڵی لە دیاریكردنی ئیمپڕاتۆریشدا هەبوو، ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی زنجیرەیەك شەڕی ناوخۆ كە بوونە هۆی وێرانبوونی وڵات و تاڵان كردنی شارەكان و تێكچوونی گوندەكان، بەمەش زیانێكی زۆر بەر بەرهەمهێنەرە كشتوكاڵی و پیشەسازییەكان و ژیانی گشتیش كەوت[3]:

١. گرتنەدەستی دەسەڵات بە میراتی لە باوكەوە بۆ كوڕ لە هۆكارە گرنگەكانی نائارامی و شپرزەیی ڕامیاری بوون لە هەموو بەشەكانی ئیمپڕاتۆرییەت.

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٧.

(٢) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٩-١٠.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦.

٢.  هەمــوو جارێــک لایەنــی ســەربازی دەســتیان لەو کاروبــارە وەردەدا؛ بە شێوەیەک جار لە دوای جار زیاتر دەرکەوت، بەتایبەت لە ژیانی ڕامیاری وڵاتدا، بە شێوەیەک کە لایەنی سەربازی تەواو دەستی خستە لایەنی ڕامیاری وڵاتەوە[1].

سوپای ڕۆمانی کە لە هاونیشــتیمانیانی ڕۆمـانی پێکهـاتبوو؛ وەک خوێنـدنگایەک تاکە ئەرک و وانەکـانی هاونیشـتمانێتی تێدا فێردەبـوون، ئەم خوێنـدنگایەش چەنـد ئەفســەرێکی ڕۆمـانی کە لە چەنـد هەرێمێکـی خـاوەن مـۆرکی ڕەســەنی ڕۆمـانییەوە هاتبوون سەرکردایەتی دەکرا، گۆڕانکارییەکی بنچینەیی لە پێکهاتەی سوپادا ڕوویدا؛ بە شـێوەیەک کە ئەوەی بهاتـایەتە نـاو سـوپاوە لە ئەفســەر و ســەرباز دەبـوو بە هاولاتییەکی بەڕێز و لە دوای بیست ساڵ خزمەت خانەنشین دەکرا بە مووچەیەکی بــاش یــاخود بە پــارچە زەویــیەک درێــژەی بەو تەمەنە دەدا کە مــابووی، وەک هـاولاتییەکی بـاش و کـارا لە ژیـانی گشـتی کـۆمەڵگەی ڕۆمـانی. بـۆیە سـوپا ببـووە ئامرازێــک بــۆ تــاکی ڕۆمــانی؛ لەپێنــاو جێبەجێکردنــی ئامــانجە ئــابووری و کومەلایەتییەکانیدا، ئەمەش گرنگترین هۆکـار بـوو بۆ ڕاکێشـانی باشـترین هـاولاتی ڕۆمانی؛ بە شێوەیەک گەنجـان خۆیـان تەرخـان دەرکرد بۆ خزمەتـی سـەربازی، لە کاتێکدا جەنگاوەرە دێرینەکان خـاوەن ڕێز و سـتایش بـوون لەنـاو ئیمپراتۆرییەتدا، سـوپای ڕۆمـانی لە سـەرەتاکانی سـەدەی دووەمـدا بەم شێوازە نەمـایەوە، ڕەگەزی ڕۆمـانی چیـدی تـاکە ڕەگەزی پێکهێـنەری سـوپا نەبـوو، چەنـد ڕەگەزێکـی دیـکەی ناڕۆمانی چوونە ناو سوپاوە، ئەو ڕەگەز ڕۆمانییانەش کە تێیدا مابوونەوە؛ لە چەند نـاوچەیەکی کەنـار و دەشـتەکییەوە هـاتبوون، لەبەرئەوە نـامۆ نییە کە بە شـێوەکی سنووردار ژیاری ڕۆمانی کاریـان لـێ بکـات و نەتـوانن لە بەهـا و سیسـتمی ڕامیـاری ڕۆمانی بەتەواوی تێبگەن[2].

ئاشـتی و خۆشـگوزەرانی، کە لە سـەدەی یەکەمـی پێش زایینەوە بـاڵی بەسـەر ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمانیـدا کێشـابوو، ئەمەش وای لە دانیشـتووانی ڕۆمـانی کـرد کە ژیانی جێگیر و خۆشگوزەرانی هەڵبژێرن و دەستبەرداری ژیانی سـەربازی ببن، کە ژیانیــانی دەخســتە مەترســییەوە، وازهێنــانی ڕۆمانییەکــان لە ســەربازی وای لە

(١) سعيد عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٥.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦.

دەوڵەتی ڕۆمانی کرد دەرگا بۆ هەرکەسێک بکاتەوە، کە بیەوێت ببێت بە سەرباز، بەمشێوەیە سوپای ڕۆمانی بەهێواشی پەیوەندی لەدەستدا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە مۆرکێکی ڕۆمانیان هەبوو، دەمارگیری و ناوچەگەرێتی شوێنی گیانی هاونیشتمانێتی ڕۆمانی گرتەوە[1].

هەموو ئەو ڕووداوانە کاتێک ڕوویاندا کە گرنگی سوپا زیادی کرد، بەتایبەت دوای ململانێ و جەنگی ناوخۆ لە لایەک و زیادبوونی مەترسییە دەرەکییەکان لە لایەکی دیکەوە، لەوانە دەرکەوتنی هێزی ساسانی لە ساڵی (٢٢٦ ز) لە خۆرهەڵات کە ئەنتاکیایان داگیر کرد و هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی دیکەی بەشی خۆرهەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتەکە، ئەمە جگە لە هێرشی (جەرمانییەکان) لە خۆرئاواوە بۆ سەریان.[2]

ئیمپڕاتۆرەکان هەستیان بە گرنگی سوپا دەکرد، بۆیە هەموو ڕێگایەکیان بۆ دروستکردنی سوپایەکی تۆکمە و بەهێز گرتەبەر، بەمەش ئیمپڕاتۆرییەت ئەو مۆرکە دەستورییەی کە لەسەر دەسەڵاتی دوالیزمی (السلطة الثنائية)، واتا دەسەڵاتی ئەنجوومەنی پیران و دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆر ڕاوەستابوو لەدەستدا. پشتبەستنی ئیمپڕاتۆرەکان بە سوپا بۆ مانەوەیان لە دەسەڵات، پاڵپێوەنان بۆ ڕازیکردنی سوپا لە لایەک و هاندانیان بۆ پێشێلکردنی یاسا و مافی هاونیشتمانییە ڕۆمانییەکان، لە کۆتاییشدا سەرکوتکردنی دەزگا دەستوورییەکان لە لایەکی دیکەوە[3]. پاشان وردە وردە شێوەی سوپا گۆڕا و خەڵکی لادێ و هەرێمەکانی دەوروبەر هاتنە ناو سوپا و پلەوپایەی بەرزیان لە سوپادا وەرگرت و ئەمانە لایەنی ڕۆشنبیریان کەمتر بوو لە هاوڵاتییە ڕەسەنەکانی دیکە، ئەمانیش وەکوو پێویست خۆشەویستی و گوێڕایەڵیان بۆ پلەوپایەی خۆیان نەبوو، لە ئاستی ئەو ئەرکە قورس و مەترسیدارە نەبوون بۆ پاراستنی ئیمپڕاتۆرەتەکان، بەشێک لە مێژوونووسان ئەم گۆڕانکارییانەی کە بەسەر سوپادا هات بە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دادەنێن کە

---

(١) کرسیتوفر داوسن: تکوین اوروبا، ت: محمد مصطفى زيادة وسعيد عبدالفتاح عاشور، مصر، ١٩٦٧ م، ص١٤-١٦.

(٢) عبدالامير محمد امين و: سەرچاوەی پێشوو، ج١/ص١٦.

(٣) ه. سانت ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، ص٢٣.

گوندنشینەکان و ڕەگەزە ناڕۆمانییەکان لە ڕێگەی سوپاوە هەڵیانگیرساند دژی دانیشتووانی شارە ڕۆمانییە خۆشگوزەران و ژیارمەندەکان[١].

### هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی

لەوانەیە هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی زیاتر هەست بە ئاڵۆزییەکەی بکرێت و ڕوون بکرێتەوە لەچاو هۆکارە ڕامیاری و سەربازییەکان کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، هەر چۆنێک بێت چەند پێشکەوتنێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی دیار هەبوون، بەڵام ئەو شەڕە ناوخۆییانە و ئەو بێسەرەوبەرییە ڕامیارییە بووە هۆی دابەزینێکی بەرچاو لە ڕێژەی دانیشتوواندا و ئەم هۆکارەش کاریگەری سەرەکی هەبوو لە دابەزینی بەروبوومی کشتوکاڵی و بەرهەمی پیشەسازیدا[٢].

جەنگی ناوخۆیی و پشێوی ڕامیاری لە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا بووە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری دانیشتووان، ئەمەش کاری لە ئاستی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کشتوکاڵی کرد و ڕووبەرێکی فراوانی زەوی بە بەیاری مایەوە، فەرمانڕەوایی ناوەندی هێندە لاواز بوو نەیدەتوانی زاڵ ببێت بەسەر بارودۆخەکەدا، ئاسایشی ڕێگاوبانەکان وەک پێشتر نەمابوون و کەوتبوونە بەر شاڵاوی جەردە و ڕێگرەکان، هاوکات کەشتیوانی ڕۆمانیش لە دەریای ناوەڕاستدا ڕووبەڕووی مەترسی دوژمنانی بوویەوە، ئەو هۆکارانەی کە ئاماژەمان پێدان؛ پێکەوە بوون بە هۆکاری لاوازبوونی جموجوولە بازرگانییەکان هەتا ئاستێکی کارەساتبار[٣]، داتەپینی ئابووری کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر هەرێمەکانی خۆرئاوای ئیمپڕاتۆرییەتدا بەجێهێشت و قەیرانی ئابووری لە شارەکاندا دەرکەوت، لەو بارودۆخە ئابوورییە سەختەدا کە ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی تێکەوتبوو، بەردەوامی فەرمانڕەوایی لە کۆکردنەوەی باج لە دانیشتووان؛ بووە هۆی داتەپینی چینی ناوەڕاست، کە لە چالاکترین چینەکانی کۆمەڵگای ڕۆمانی بوون، ئەم بارودۆخە بووە پاڵنەرێکی بەهێز و وای لە ڕۆڵەکانی ئەم چینە (بازرگان و خاوەنپیشەکان)

---

(١) عبدالامير محمد امين و: سەرچاوەی پێشوو، ج١/ص١٧.

(٢) س. ورن هليستر: اوروبا في العصور الوسطى، ص٥١.

(٣) عبد القادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ج١/ ص١٨-١٩.

کرد شارەکان بەجێبهێڵن و ڕوو بکەنە دەشتەکان و سەرقاڵی کاری کشتوکاڵ بن. لە گوندەکانیشدا جووتیار و خاوەنکارە بچووکەکان ڕووبەڕووی هەمان ژیانی چینی ناوەڕاستی شارەکان بوونەوە، لە ئەنجامی توندوتیژی دەسەڵاتی ناوەندی و زۆری باج، هەژاری و نەبوونی سەریهەڵدا و هەژارانی بە شێوەیەکی قۆناغبەندی بردە ئاستی کۆیلەکانەوە، ئەم ڕەوشە نالەبارەی کە بەسەر چینی ناوەڕاستی شارەکان و جووتیار و خاوەندارە بچووکەکانی دەشتەکاندا هات، چینی خاوەنکارە گەورەکان سوودیان لێی وەرگرت[1]، چینی خاوەنکارە گەورەکان لە ڕێگەی ئەو هەرێمە کشتوکاڵییە فراوانانەی کە لە باوانیانییانەوە بۆیان مابووەوە، لەگەڵ پلە و شوێنی کۆمەڵایەتی باڵایان لە کۆمەڵگادا، نەک تەنها لەو تەنگژە ڕامیاری و ئابووریانەی کە ڕووبەڕووی ئیمپڕاتۆرییەت دەبوویەوە پارێزراو دەبوون؛ بەڵکوو ڕێی بۆ خۆشکردن کە دەسکەوتی ڕامیاری و ئابووری نوێ بەدەستبهێنن لەسەر هەژماری فەرمانڕەوایی ناوەندی لە لایەک و چینەکانی دیکە لە لایەکی دیکەوە[2].

چینی خاوەندارە گەورەکان سەرپێچی دەسەڵاتی ناوەندیان دەکرد کە لەو کاتەدا لاواز بوو، یەکەم هەنگاویشیان نەدانی باج بوو بە دەوڵەتی ناوەندی، لەم بارودۆخەدا خاوەنکارە بچووک و جووتیارە ئازادەکان دەستەوسان بوون لە ئەنجامدانی کێبڕکێ لەگەڵ خاوەندارە گەورەکاندا، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ توانای پێدانی باجیان کەم دەبووەوە، لە کۆتاییدا ناچاربوون لە بەرامبەر بەدەستهێنانی پارێزگاری و دابینکردنی بژێویان کە واز لە زەوییەکانیان بهێنن بۆ خاوەندارە گەورەکان، بەمشێوەیە ئەو چینە چالاکەی کۆمەڵگای ڕۆمانی بەرەو لەناچوون چوون، تاکەکانیشی گۆڕان بۆ چینی کۆیلە[3].

### هۆکاری کارگێڕی

لە گەرمەی ئەم پشێوییە ڕامیاری و ئابوورییە داتەپیوەدا؛ دامودەزگای کارگێڕی ئیمپڕاتۆرییەتیش بەرەو لاوازبوون و لێکهەڵوەشان چوو، ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی کە لە چەندەها ناوچە و هەرێمی جیاواز لە کیشوەرەکانی ئەورووپا و ئاسیا و ئەفریقا

---

(١) جفری برۆن: پوختەی مێژووی ئەوروپا، و: نهاد جلال، ل٣٣.

(٢) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩.

(٣) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٨-٩.

ێکهاتبوو، زۆربەیان پێشینەیەکی ڕۆشنبیری جیاواز و سیستمی کارگێڕی جۆراوجۆریان هەبوو، فەرمانڕەوایی ڕۆمانی لە سەردەمی بەهێزیدا توانیبووی لە ڕێگەی دامودەزگای کارگێڕییەوە زۆر بەوردی و بەهێزەوە کارەکانی بەڕێوەبەرێت، بە شێوەیەک کە لە مێژووی دێرینـدا بە نـاوازەترین و بەتوانـاترین شـێوازی بەڕێوەبردن دادەنرێت[1]. کاتێک ئیمپراتۆرییەت بەرەو لاوازی چووبوو؛ لاوازی لە دامودەزگای ڕامیای و سیستمە ئابوورییەکاندا دەرکەوت و نەسازی و دژکارییەکان لە سیستمە کارگێڕییەکانیشدا دەرکەوت، کارمەندە کارگێڕییەکان ئەم بارودۆخەیان قۆستەوە و زیاتر دەزگای کارگێڕییان تووشی گەندەڵی و ئیفلیج بوون و خراپ بوون کرد، لە ئەنجامدا دامودەزگای کارگێڕی ئیمپراتۆرییەت بەگشتی تووشی ئیفلیجبوون و لاوازی هات و بەهێزی و تۆکمەییەکەی پێشووی لەدەستدا[2].

### هۆکارە دەرەکییەکان

هۆکارە دەرەکییەکانیش لە دوو بواردا خۆیان دەنواند:

١. مەترسی ساسانییەکان: کە ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندا بوو، شکستی گەورە و کاریگەرییان دووچاری سوپای ڕۆمانی کردبوو لە بەری خۆرهەڵاتدا.

٢. لە بەرەی خۆرئاواشدا بارودۆخەکە لە بەرەی خۆرهەڵات چاکتر نەبوو، چونکە هۆزە (بەربەرییەکان) لەپشت ڕووبارەکانی (دانووب و ڕایین) بە ژمارەیەکی یەکجار زۆرەوە بڵاوببوونەوە و هێرش و پەلاماریان بۆ سەر ئیمپراتۆرییەتەکە بەردەوام لە زیادبووندا بوو، مەترسییەکان بە ئەندازەیەک گەورە و ترسناک بوون کە لە توانای ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا نەبوو بیانوەستێنێت و ژیانێکی ئارام بۆ دانیشتووانەکەی لەسەر سنوورەکانی دابین بکات[3].

### بیردۆزەکانی ڕووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی

ئیمپراتورییەتی ڕۆمانی لە خۆرئاوادا هەرەسی هێنا، جیاوازی لە بۆچوونی مێژوونووسەکاندا دروست بوو دەربارەی ئەم شکستە، هەر لەم سۆنگەیەشەوە

---

(١) سعید عاشور: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠؛ عبدالامیر محمد امین و: س. پ، ج١/ ص٢٠.

(٢) ە. و. دیفز: اوروبا في العصور الوسطی، تر: عبدالحمید حمدی محمود، الاسکندریة، ١٩٥٨ م، ص١٤.

(٣) جفری برۆن :پوختەی مێژووی ئەوروپا، ل٣٤.

جیاوازیـان تـێکەوت لە دیـاریکردنی هۆکارەکـانی و یەکەم شـتیش پرسـیاریان لە ڕێکەوتی هەرەسهێنانەکە دەکرد؛ ئایا سـاڵی (٤١٠ ز) بـوو یـان (٤٥٥ ز یـان ٤٧٦ ز)، یـان لەوانەیە سـاڵی (٨٠٠ ز) کۆتـایی بە هەمـوو شـتێک هاتبێت، لەبەر ئەوە چەندین بیردۆزەی جیاواز لە بواری بابەتی ئایینی و دونیاییەوە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم بۆچوونانەیاندا، ئەوەتا مەزنانی ئایینی مەسیحی و بتپەرستەکان ڕووخانی (ڕۆما) بە ویستێکی ئاسمان دادەنێن و ڕابەری کۆمەڵی مەسیحییەکان کە (قدیس ئۆگستین ٣٥٤-٤٣٠ ز) بوو جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ڕووخانی ڕۆما بریتی بووە لە: "قۆنـاغێکی ڕێخۆشـکەر بـۆ سـەرکەوتنی دەسـەڵاتی خـودای مەزن؛ کە چارەنووسـی مرۆڤـــایەتییە، ئەمەش نیشـــانەکانی خـــودا بـــۆ ڕووداوە گەردوونییەکـــان و ئاڕاســتەکردنیان، چــونکە پێویســتە مــرۆڤ گــوێڕایەڵ و ملکەچــی بــۆ ویســتە خوداوەنـدییەکان بێـت". بۆچوونەکـانی (قـدیس ئۆگسـتین) دەربـارەی ئەم باسـە لە دووتـوێی پەرتووکەکەیـدا بە نـاوی (شـاری خـودا) کـۆکراوەتەوە، کە مەبەسـتی بەرگریکردنە لە ئایینی مەسیحییەت دژی ئەو تۆمەتـانەی خراونەتە پاڵی؛ بەوەی کە ڕۆما لەسەر دەستی (ئەلاریک) سەرکردەی گووتە خۆرئاواییەکان لە سـاڵی (٤١٠ ز) ڕووخاوە و ئامۆژگارییەکانی مەسیحییەت و ڕق و قینەی بتپەرستەکان بوونە هـۆی لادانی دەوڵەت لە خوداپەرستی[١].

لە مێژوونووسـە بتپەرسـتییەکانی سـەدەی پێنجەمـدا؛ کە تـاوانی ڕووخـانی ڕۆمایـان دابـووە پـاڵ مەسـیحییەت و یەکێـک لەوانە (زوریمـووس) بـوو، لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی (مێژووی نوێ)؛ ڕووداوەکـانی ڕۆمـای هەتـا سـاڵی (٤١٠ ز) تۆمار کردووە و بەڕاشکاوی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە مەسیحییەت لە هۆکـارە گرنگەکانی تێکچوونی بارودۆخی ئیمپڕاتورییەت بوو، ئیمپڕاتۆر (قوستەنتینی مەزن) بە بەرپرسیاری یەکەم دادەنێت لە ڕووخانی ئیمپڕاتۆرییەتەکە لە خۆرئاوادا، چونکە بـووەتە هۆکـاری تورەبـوونی خوداوەنـدی بتپەرسـتەکان، هاوکـات (ئەمیـانۆس مارسیلینووس) لەدایکبووی ساڵی(٣٣٠ ز) لە (ئەنتاکیا)؛ هەسـتابوو بە تۆمـار کردنـی مێژووی ڕۆمـانی هەر لە سـەرەتاکانییەوە، لە فەرمـانڕەوایی ئیمپڕاتـۆر (نیرڤا)وە لە سـاڵی (٦٩ ز) هەتـا کـوژرانی ئیمپڕاتـۆر (ڤـالنز) لە سـاڵی (٣٧٨ ز)، لەگەڵ ئەوەی کە

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٤.

کەسێکی بتپەرست بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری ئەو کارەساتانەی بەسەر ڕۆمادا هاتبوو دەگەڕاندەوە بۆ لاوازی باری ئاکاری، ئەویش بە زۆربوونی دیاردەی بەدڕەوشتی و دزی و جەردەیی لە سنووری ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا[1].

(ئیلسۆرس هنتکتون) لە گوتارێکیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕووخاندنی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی لە خۆرئاوادا هاوکات بوو لەگەڵ ئەو وشکەساڵییەی دووچاری گێتی هاتبوو، کە ئاماژەکانی لەنیوان (٢٠٠-٤٠٠ ز) تۆماری کردبوو لە ڕێژەی بارانبارینێدا، کە بووەتە هۆی وشکەساڵی و برسێتی و پەیدابوونی جموجووڵی هۆزە (جەرمانییەکان) و هەڵگەڕانەوەیان لە دژی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی لە خۆرئاوادا، (سیمۆفوج)یش هەمان بۆچوونی (ئیلسۆرس هنتکتۆن)ی هەیە کە چالاکی خاکی لە (ئیتاڵیا) و ویلایەتەکانی بوو بە هۆی بە لەوەڕگاکردنی زەوییەکان، چونکە جووتیارەکانی پێیان وا بوو ئەو سەردەمە باشترین کارێک کە سوودی هەبێت بۆیان لەوەڕگایە نەک کشتوکاڵ، هەرچەندە لەوەڕگاکانیش لە (ئیتاڵیا) دواتر گۆڕان بۆ زەوییەکی ڕووتەن و پشتگوێخستنی پڕۆژەکانی ئاودێری لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە ببووە هۆی زیادبوونی زەلکاوەکان و دروستبوونی ژینگەیەکی لەبار بۆ نەخۆشی مەلاریا، کە ببووە هۆکارێکی بکوژ بۆ زۆرینەی جووتیارەکان، لەبەر ئەوە مایەپووچی کشتوکاڵ چارەنووسی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی لە خۆرئاوا دەستنیشان کرد[2]. (بینز)ی مێژوونووس ئەم بۆچوونە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: "ئەو ساڵەی شاری ڕۆمای پایتەخت داگیرکرا؛ وشکە ساڵی ناوچەکانی میسڕ و وڵاتی گالی نەگرتەوە، هەتا ببێتە هۆکاری ئەو شکستەی شارەکە و داگیرکردنی، دیارە ئەوەش بەو شێوەیە نەبوو؛ چونکە کاریگەری وشکەساڵی و تێکچوونی دۆخی دارایی بە یەک ساڵ و دوو ساڵ دەرنەکەوت، بەڵکوو کەڵەکەبوونی قەیرانی دارایی چەندین ساڵە، بەمەش کاریگەرییەکانی بەسەر دەوڵەت و خەڵکیدا دەرکەوت، خراپی بارودۆخی کشتوکاڵی هەموو ئیمپڕاتۆرییەتەکەیشی نەگرتبووەوە؛ وەک لە وڵاتی (گال)دا هەبوو، کە هەتا سەدەی پێنجەمی زایینی کشتوکاڵەکەی لە گەشەدا بوو وەک لە وڵاتی (میسڕ)، دواکەوتنی کشتوکاڵ لە (ئیتاڵیا)دا بە پلەی یەکەم

---

(١) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ص٢٨.

(٢) عەبدولقادر ئەحمەد یوسف: مێژووی چاخەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا، و: شاناز ڕەفزیی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١١.

دەگەڕێتەوە بۆ سەرپەرشتینەکردنی کێڵگەکان لە لایەن خاوەن موڵکەکانەوە، چونکە ئەم کێڵگە گەورانە کە بە (لاتیفۆردیا) ناوبرابوون؛ بەڕێوەبردنیان درابووە دەست بریکارەکان، کە ئەمانیش گرنگییەکی ئەوتۆیان نەدەدا بە بەرزکردنەوەی ئاستی کشتوکاڵی[1]. بەڵام (ئەندری پیکانۆیل) داڕووخانی ئابووری دەخاتە ئەستۆی کۆمەڵێک هۆکار، یەکێک لەو هۆکارانەش نەمانی دامەزراوەی کۆیلایەتییە؛ کە پێویست بوو پارێزگاری لە بەردەوامبوونی و یارمەتیدەری کۆیلە بکرایە لەپێناو بەردەوامبوونی ئابووری ڕۆمانیدا. هەروەها فەرامۆشکردنی ئاڕاستە ئابوورییەکان بۆ کەرتە گەورەکان و پەیرەوکردنی ڕامیاری خۆبژێوی؛ زیانی بە شارەکان گەیاند و بووە هۆی تێکشکانی سەرمایەداری. لەگەڵ ئەوەشدا جەنگە ناوخۆییەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیش لە سەردەمی (مارکۆس ئەورلیۆس) بە هۆکارێکی گرنگ دادەنێت بۆ ڕووکردنە ڕامیاری خۆبژێوی لە کەرتە گەورەکاندا، هەروەها شاری ڕۆما لە دوای کۆتایی دەسەڵاتی (تراجان)ەوە ئەو سەنتەرە بازرگانییە گەورەیشی لەدەستدا[2].

(ویلبانک) هەمان بۆچوونی پێشووی هەیە و هۆکاری ڕاستەقینەی ڕووخانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی لە خۆرئاوا دەخاتە ئەستۆی شێوازە سەرەتاییەکان لە بەرهەمهێناندا؛ کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشتیان بە دامەزراوەی کۆیلایەتی دەبەست و ڕووخانی ئەم دامەزراوەیەش بووە هۆی بەدیارکەوتنی کەرتەکان و وێران بوونی ئیمپڕاتۆرییەتەکە، هۆکاری ڕووخانی ئابووری بەپێی بۆچوونی (ویسترمان)یش نەبوونی سەربەستی ئابووری بوو؛ کە گەورەترین زیانی لە پڕۆژە تاکەکەسییەکان دا و پشتی شاری ڕۆمای چەماندەوە، جگە لەمەش چەندین هۆکاری ڕامیاری ناوەندی دامەزراوەی کۆیلایەتی هۆکارەوە بوون بۆ ڕووخان، چونکە کاری کۆیلایەتی دژە لەگەڵ ئەوپەڕی ژیاری و بەرزی ژیان، ئەمە (ڕامیاری ئیمپڕاتۆرییەتەکانە) لە دواکاتەکاندا لە بەکرێدانی زەویە گەورەکان بە موڵکدارەکان (ڕامیاری خۆبژێوی) هێنایەکایەوە و هێزی دەرەبەگایەتی زیاد کرد، کە وای لە

---

(١) نورمان كانتور: العصور الوسطى الباكرة، ص٣٩.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٥.

جووتیار کرد ببێتە ئامێرێکی بەرهەمهێنان و دامەزراوەی کۆیلایەتی زیانمەند کرد، لە ئەنجامدا ئابووری شاری داتەپاند[1].

هۆکاری داتەپینی ئابووری؛ دزەپێکردنی زێر بوو بۆ دەرەوەی ئیمپراتۆرییەت، هەردوو مێژوونووس (وستریر و مونرۆ) دەڵێن پیشەسازییە سەرەتاییەکانی ڕۆما بۆ تێرکردنی پێویستییە سەرەتاییەکان بوو نەک بازرگانی، ڕاستە بازرگانی شمەکی جوانکاری وەک (عاج و ئاوریشم و زێر و زیو) هەبوو لەگەڵ خۆرهەلاتدا؛ بەلام ئەم بازرگانیکردنە زیانی بە ئابووری ڕۆما گەیاند، چونکە خۆرهەلات پێویستی بە پیشەسازی و بەرهەمی ڕۆما نەبوو، لەبەر ئەوە پێویست بوو لەسەر ڕۆمان لە بەرامبەردا زێڕ ڕەوانە بکەن لەبری نرخی کەلوپەلەکان، لەدەستچوونی ئەم ڕێژەیە لە زێڕ و لە توانای قەرەبووکردنەوەی لە لایەن ڕۆمانیاوە؛ کاریگەرییەکی خراپی هەبوو لەسەر بازرگانی، کەمی زێڕیش بووە هۆی کەمبوونەوەی دراو و دابەزینی نرخ و نەمانی دەستکەوتە سەرەکییەکان[2]. (پلنی)ش لە پەرتووکی (مێژووی سروشت)دا هەمان بۆچوونی هەیە دەربارەی بازرگانی لەگەڵ هندستان و عەرەبەکاندا دەڵێت: "هندییەکان لە ڕێگای بازرگانییەوە لەگەڵ ڕۆمان سالانە کەموکورتیان هەیە بە زیاتر لە پەنجا ملیۆن و سەد ملیۆن لەگەڵ عەرەبەکاندا"، بەلام (ویسترمان) وای بۆی دەچێت کە ئەم بازرگانییە سوودی هەردوولای تێدا بووە، هاوکات هۆکارێک بووە بۆ کێشانەوەی زێڕ لە ئیمپراتورییەتی ڕۆمانی و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هۆی کەمی کانزا بەنرخەکان دەگەڕێتەوە بۆ عەمبارکردنی زێڕ و زیو لەناو ولاتی ڕۆمانیدا؛ نەک دزەکردنی بۆ دەرەوە[3].

هەندێکیش وایدەبینن کە کەوتنی ئابووری ڕۆمانی؛ بە شێوەیەکی گشتی بە هۆی بەسووکزانینی کاری بازرگانی و پیشەسازییەوە بووە لای ڕۆمانییەکان و دەسەلاتی ڕۆمانیاش ئەم جۆرە کارانەی قەدەغە کردبوو لە چین و توێژە بەرزەکان و بە کاری کویلەکانی دەزانی، لەبەر ئەوە ئارەزووی داهێنانی ئامێری بەرهەمهێنانی نەبوو. بەلام پرۆفیسۆر (ڕوستوفازیف) بڕوای وایە کە کێشە کۆمەلایەتییەکانی نێوان چینەکان؛ هۆکاری ئەم ڕووخانە بوو، گۆڕا بۆ کێشەیەکی خوێناوی لەنێوان

---

(١) محمد زاید عبدالله: مدخل الی تاریخ اوروبا، ص٢٠.

(٢) andre piganiol.LEmpire chretien capris,١٩٤٧I p.٤١١-٤٢٢

(٣) عبدالقادر احمد الیوسف: العصور الوسطی الاوروبیة، ص١٧.

ئەو چینە کرێکارانەی سوپا لەناو لادێیەکان دروستی کردبوون و لەنێوان چینی خانەدانەکان لە شاردا. بیردۆزەکەش بەکورتی؛ بەو هۆکارەی کە ئیمپڕاتۆرییەت تووشی ململانێیەکی بەهێز ببووەوە لەنێوان سەرکردەکانی سوپا لە سەدەی سێدا، لە هەمان کاتدا ببووە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگێکی ناوخۆیی زیانبەخش، هەندێک وا گومان دەبەن هۆکارە ڕامیارییەکان لە ئەنجامی ئەو کێبڕکێیەوە هاتە ئاراوە، کە لەنێوان ئەنجوومەنی پیران و ئیمپڕاتۆرەکاندا بوو لەسەر دەسەڵات، بەڵام ئەم بۆچوونە لە ڕاستییەوە نزیک نییە؛ چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەنجوومەنی پیران چین و توێژە خانەدانەکان دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا یارمەتییەکانی لە بواری ڕامیاریدا زۆر کەم بوو، کەواتە کێشەی ڕاستەقینە لەنێوان ئەنجوومەنی پیران و ئیمپڕاتورەکاندا نەبوو[1] هەندێکی دیکەش وا بۆیدەچن کە کێشەی نێوان هێزی سەربازی و ئیمپڕاتۆرەکان بوو، لەبەر ئەوەی هێزی سەربازی لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمەوە ڕۆمانی نەبوو، بەڵکوو ببوو بە چەند پارچە و تیپێکەوە، کە کاریگەری لەسەر ژیاری ڕۆمانی کەم بوو، زۆربەیان لە هۆزە (جەرمانییەکان) بوون، ئەمە و ئیمپڕاتۆرەکان هێزی سەربازیان نابووت کردبوو، لە دوای کۆتایی فەرمانڕەواکانی وەچەکانی (ئەنتونی)؛ بە گۆڕینی فەرمانڕەوایی بۆ پشتاوپشتی، ئەم گۆڕینی فەرمانڕەواییەش لە شێوەی هەڵبژاردنەوە بۆ پشتاوپشتی لەگەڵ بیروڕای سەربەستی ڕۆمانیدا نەدەگونجا، ئیمپڕاتۆرەکان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بە هێزی سەربازی نەیارەکانیان سەرکووت دەکرد، ئەمەش بوو بە دیاردەیەکی ئاشکرا هەر لە سەردەمی ئیمپڕاتۆر (سبتیسووس سفیرووس ١٩٣-٢١١ز)ەوە، لێرەدا (ڕوستۆ فتریف) پرسیار لەوە دەکات بۆچی وەچەی (سفیروس) لە فەرمانڕەوایی پشتاوپشتیدا درێژەی نەکێشا لەگەڵ ئەوەشدا، کە هێزی سەربازی باوەڕی بە بنەمای پشتاوپشتی هێنابوو، سەرەڕای دژایەتی کردنی لە لایەن چینە خانەدانەکانی شارەوە. کەواتە بۆچی هێزی سەربازی پشتی کردە (ئەلیکسەندەر سیفیرووس) و کوشتی؟ بۆچی ئاوایان بە ئیمپڕاتورەکانی دوای ئەو کرد؟ کەواتە هۆکارە ڕاستەقینەکان لە چیدا خۆیان حەشارداوە؟ ناوەڕۆکی ململانێکە هەر لە سەدەی سێیەمەوە جەنگی نێوان هێزی سەربازی و چینە خانەدانەکانی شار بوو هاوکات

(١) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ل٥٩-٦١.

لەگەڵ خاوەن مولکە کشتوکاڵییەکان، ئەم ململانێیەش بە سەرکەوتنی هێزی سەربازی و وێرانکردنی خانەدانەکانی شار کۆتایی پێ هات[1]. ئەوەش بزانین ئەم ململانێیە هۆشیارییەکی چینایەتی نەبوو؛ بەڵکوو ململانێیەتی لە خۆوە دروست بووبوو، کە هێزی سەربازی نوێنەری هێزێکی وێرانکەر بوو بۆ سیستمی ڕۆمانی؛ بەتایبەتی لە سەدەی سێیەمدا، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری سەربازەکانی لەو دانیشتووانانە بوون، کە لەو سیستمەدا هیچ سوودمەند نەبوون، ئەمان بریتی بوون لە جووتیارەکان و چینە خانەدان و موڵکدارەکان دەسەڵاتدارانی شار بوون، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕقێکی زۆر هەبوو لەنێوان هێزی سەربازی و چینە خانەدانەکان و پێویست بوو لەسەر ئەو هێزە سەربازییە هیوابڕاوە کە هەستی بە پارێزگاریکردنی تەواوی ژیاری ڕۆمانی خانەدانی، سەرەڕای ئارامگرتنی لەژێر باری باج و چەوساندنەوە لەپێناوی ژیانی چینە بەرزەکاندا[2]، سەرەڕای ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر ئیمپراتۆرییەکەدا هات، لە کۆتایی سەدەی سێیەمدا؛ دوژمنایەتی هەر بەردەوام بوو لەنێوان لادێی و شار، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەدەی چوارەمدا شار گرنگی خۆی لە دەستدا هەر بە ئامێرێکی دەسەڵات مایەوە بۆ کۆکردنەوەی باج لە دێهاتەکان، ئەمەش نیشانەی دڕندایەتی بوو لای جووتیارەکان، بەو هۆکارەش چەندین شەڕ و پێکدادان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا ڕوویدا لەنێوان جووتیارەکان و شاردا، کە هێزی سەربازی تێیدا پشتیوانی دەستەی یەکەم بوو، ئەم ململانێیەش بووە هۆی تێکچوونی بارودۆخی دانیشتووانی شارەکان کە بڕبڕەی پشتی ئابووری ڕۆمانی بوو، هەرچەندە جەنگە چینایەتییەکە سەرکەوتنی بۆ جووتیارەکانیش بەدەست نەهێنا و ناهەمواری بارودۆخیان هەر بەردەوام بوو، دۆخی چینی کرێکارەکان لە دێهات و شار زیاتر خراپ دەبوو لە ئەنجامی چاکسازییەکانی (دیوکلدیانوس)ەوە[3].

لە کۆتاییدا دەتوانین بە چەند خاڵیک گرنگترین ئەو هۆکارانە بخەینەڕوو کە بوونە هۆی ڕووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی:

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٧.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٨.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٢٦.

١. جەنجاڵبوونی بنەمای سیستمی کۆیلایەتی: دوای ئەوەی کە وا بەرھەمی کشتوکاڵ پەکیکەوت، کە ئەنجامێکی سروشتی بوو بە ھۆی بەردەوامبوونی چەوساندنەوەی دڕندانەی کۆیلەکان و بەکارھێنانیان بە شێوەیەکی دڕندانە لە کێڵگە گەورەکاندا، ئەگەرچی ڕۆڵی سەرەکی ئەو کێڵگە گەورانە لە ڕابردوودا گەشەکردنی ئابووری بوو، دواجار گۆڕا و کاردانەوەی پێچەوانەی ھەبوو، کە بووە ھۆکاری ڕێگر لەبەردەم ئەم گەشەکردنەدا، لەبەر نەبوونی بەرژەوەندی کۆیلە لە پڕۆسەی بەرھەمهێناندا بە شێوەیەکی گشتی، ھەتا دەھات زیاتر خۆیان لە کارکردن دەدزییەوە، جارجاریش نارەزایی خۆیان پیشان دەدا بۆ خزمەتکردنی گەورەکانیان، ئابووریناسی ئەو سەردەمەی ڕۆمانی (کۆبۆسیلان) ئەم ڕاستییەی درکاند، کە خۆی زۆر گرنگی دەدا بە کاری کۆیلە، ھەر بۆیە لە یەکێک لە گوتەکانیدا گوتوویەتی" کێڵگەی گەورە بە تەواوەتی ئیتاڵیای شپرزە کردووە".[1]

٢. چینی خانەدانەکان دواجار گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە چیدیکە چەوساندنەوەی کۆیلەکان سوود ناگەیەنێتە بەرژەوەندییەکانیان و ئەو شێوازەی بەکاریاندەھێنا لەگەڵیان؛ ئەنجامەکەیان دەشکێتەوە بەسەریاندا، ھەر ئەوەش بوو کە پاڵی پێوەدەنان بۆ ئەوەی شێوازێکی نوێ بۆ چەوساندنەوە بگرنە بەر ئەویش لە ڕێگەی ئازادکردنیان و بەستنەوەیان بە زەوییەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بتوانرێت بکرێتە خاوەنداری پارچەیەکی بچووک لە زەوی و لەبری پێشکەشکردنیان، بڕێکی دیاریکراو لە بەرھەمی کشتوکاڵی بۆ خاوەندارە سەرەکییەکان، لە ڕاستیدا ئەم پڕۆسەیە پەلەی کرد لە نەھێشتنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و ڕێخۆشکردن بۆ ھاتنەکایەوەی پەیوەندی دەرەبەگایەتی لە کیشوەری ئەورووپادا[2].

٣. ھەوڵی سەربەخۆیی خاوەندارە مەزنەکان: کە ھەتا دەھات پەرەیدەسەند و پەنابردنی زۆربەی زۆری جووتیارە سەربەستەکان بۆلایان، لەپێناو خۆپاراستنیان لەو بێسەروبەرییەی کە وڵاتی گرتبووەوە، دواجار بووە ھۆی ئەوەی یەکێتی پارچەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی لاواز بکات.

---

(١) عبد القادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٣٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٨-١٩.

٤. لەو هۆکـارە رامیارییـانەی کە پەلەی کـرد لە ڕووخانـدنی ئیمپڕاتـۆرییەتی رۆمانیـدا، دابەشـبوونی ئەم ئیمپڕاتـۆرییەتە بـوو لە سـاڵی (٣٩٥ ز) بـۆ هەردوو ئیمپڕاتـۆرییەتی خـۆرهەڵات و خۆرئـاوا کە بەشـە خـۆرهەڵاتییەکەی بە دەوڵەتـی بیزەنتی دەناسرا، کە هەتاوەکوو ناوەڕاستەکانی سەدەی پازدەهەم بەردەوام بوو[١].

٥. پەیدابوونی ئایینی مەسیحی لە بەشـی خۆرهەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا هاتەکـایەوە و لە ناوەڕاسـتەکانی سـەدەی یەکەمـدا وردە وردە پەرەیسـەند و بەرەو یۆنان ڕۆیشت و دواجار بـاڵی ڕووەو (ئیتاڵیا)دا کێشـا، لەگەڵ سـەرەتاکانی سـەدەی دووەمـی زایینیـدا ئـایینی مەسـیحییەت چەنـدین بیروبـاوەڕ لای هێنایەکـایەوە، وەک بانگهێشت بۆ دادوەری و یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا و نەهێشتنی جیاوازی چینـایەتی و کـۆمەڵایەتی، ئەم بانگهێشـتانە بـوو بە هـۆی ئەوەی کە وا چیـنە چەوسـێنراوە سـتەملێکراوەکان بەرەو پیـری بچـن و بـیکەنە لانـکەی خۆڕزگـارکردن لەو دۆخە نـاهەمووارەی کە تێیـدا دەژیـان لە ڕووی ئـابووری و کـۆمەڵایەتییەوە، لە ڕاسـتیدا ئـایینی مەسـیحی لەنێـو زۆربەی زۆری خەڵـکە بێـدەرەتانەکان بڵاوبـوویەوە، بڵاوبـوونەوەی بەپەلەی ئـایینی مەسـیحییەت وای لە دەوڵەت کـرد کە بیکـاتە ئـایینی فەرمـی دەوڵەت[٢]، بەتـایبەت لە سـەردەمی ئیمپڕاتـۆر (قوسـتەنتین) لە سـەرەتاکانی سـەدەی چـوارەمی زاییـنیـدا، ئەگەرچـی کەنیسـە ڕۆڵـی بڵاوکـردنەوەی ئەم ئـایینەی خستبووە ئەستۆی خۆی لە سەرەتاکانی دروستبوونییەوە و بانگەشـەی بۆ دەکرد، بەڵام دواجـار پاشەکشـەی بەو بانگەشـانە کـرد؛ بەتـایبەتی لە ڕووی بانگەشـەکردن ڕووەو برایەتی و هاوکاری و خۆڕزگارکردن لە هەژاری، دواجار چینـی خـوارەوەی ئەم ئایینە خۆیان بەتەنها ئەم بانگەشـانەیان بڵاودەکردەوە لەپێنـاو دەسـتەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان و بەرژەوەندی چینە چەوساوەکان، بەڵام پیاوە ئایینییەکـانی کە وا دەکەوتنە توێژەکانی سەرەوەی پیاوەکانی ئەم ئایینە بانگەشەکانییان تەنها لەپێناو خزمەتکردنـی بەرژەوەنـدییەکانییان؛ بەرژەوەنـدییەکانی چینـی خانەدانەکـان کە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٦.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٣٣.

دەسەڵاتدار بوو لە ڕۆما، کە زۆر بە ئاشکرا خۆی لە هەڵوێستیان نواند؛ کاتێک کە وا پشتگیری سیستمی دەرەبەگایەتییان دەکرد لە ئەورووپا[١].

٦. ئەم هەموو هۆکارانە بووە هۆی ئافراندنی کەشێک کە ئاسانکاری بخاتە بەردەم هێزە (جەرمانییەکان)، کە پەلاماری ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیان دەدا بۆ دەستگرتن بەسەریدا؛ ئەویش لە ساڵی (٤٧٦ ز) هاتەدی[٢].

## گەشەکردنی ڕۆشنبیری و ئاستی بیرکردنەوە لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا

شارستانیەتی دێرین کارێکی گەورەی کردە سەر ژیاری ڕۆمانی و ژیانێکی نوێ هاتەکایەوە؛ کە لە ڕاستیدا بە تێکەڵبوونی هەردوو ژیاری ڕۆمانی و ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتی، کە خرابوونە سەر دەوڵەتی رۆما. زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی جێپەنجەکانی ئەم ژیارە نوێیە دەبینین لە زانستە سروشتییەکان، بۆ نموونە زانای ڕۆمانی (بەتلیمووس) سیستمی گەردوونی هێنایەکایەوە لە هەمان کاتدا نووسینەکانی (گالینۆس) لە پزیشکیدا، کە سوودی لە هەوڵە دێرینەکانی یۆنانی وەرگرتووە، جگە لەو هەوڵ و کۆششانەی لە خۆرهەڵاتی دێریندا هاتووەتەکایەوە، لە ڕاستیدا فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی دەستوپێوەندەکانی لە چینی خانەدان هاندەربوون بۆ گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و وێژە و هونەر[٣]، لەم وڵاتەدا ئەگەرچی ئەم جۆرە ڕۆشنبیری و هونەرانە سیمای فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیای پێوەدیاربوو، بەڵام لە هەمان کاتدا جۆرێکی دیکە لە ڕۆشنبیری و هونەری جیاواز لەو سەردەمەدا هاتووەتەکایەوە، کە گوزارشت لە خواست و ئارەزووی خەڵکە بێبەش و هەژار و نەدارەکان دەکرد، کە بێبەش بوون لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و خۆشگوزەرانی و هەردەم لە شاکارە وێژەیی و هونەرییەکانیاندا داوای یەکسانی و دادوەریان دەکرد، گرنگترین ئەو پاشماوانەی کە وا ڕۆمانییەکان بەجێیهێشتووە؛ بریتییە لە یاسا بەناوبانگەکانی ڕۆمانی، کە وا لەگەڵ گەشەکردنی ژیانی ئابووری ڕۆمانەوە هاتەکایەوە، سوودی لێ وەرگیرا بۆ پیادەکردنی خاوەندارێتی تاکەکەسی بێسنوور و هەروەها کاردانەوەیەکی گەورەی

---

(١) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوروبية وحضارتها، ص٦٢.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٧.

(٣) صلاح ابو السعود: الحضارة البيزنطية، ص٤٢.

هەبوو بۆسەر گەشەکردنی بیرۆکەی ئابووری لە چەندین لایەن، چالاکی ئابووری وەک کار؛ چۆنێتی دابەشکردنی و لەو سەردەمەدا چالاکی سەرمایەی بازرگانی هاتەکایەوە و لەو بیرۆکانەیدا باسی لێوەکراون و لە هەمان کاتدا باس لە گرنگی پیشەسازییەکان کراوە لە کۆمەڵگای ڕۆمانیدا[1].

لە هەمان کاتدا ئیشەکان دابەشکران بەسەر جۆری پیشەیی ڕێزلێنراو و پیشەی بینراو و لێرەدا ئەو جۆرە کارەی کە بە بازوو ئەنجام دەدرا بە جۆری نەبینراو دەژمێرا، جگە لە کارکردن لە بواری کشتوکاڵی، کە وەکوو پیشەیەکی ڕێزلێنراو تەماشای دەکرا و هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بنەمای ئابووری هاتنەکایەوە، ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵی هاتەکایەوە، بیرۆکەکان وایان دەخواست کە خانەدانەکان تەنها پێویستە خۆیان بە چالاکی بیرۆکەیی خەریک بکەن و لە هەمان کاتدا گرنگییەکی زۆر درا بە بواری کشتوکاڵی و چەندین ئامۆژگاری ڕێنمایی خرایە بەردەم خاوەندارانی کێڵگە گەورەکان، لەبارەی بەکارهێنانی باشترین شێوەی ڕێوشوێن لە فرەکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و زۆرکردنی داهاتەکان، بیرۆکە ئابوورییەکانی ئەو سەردەمە وایدەخواست کە پێویستە لەسەر کۆیلەکان پابەندی هەموو فەرمانێک بن کە پێیان دەسپێردرێت و جێبەجێی بکەن، ئەگەر هاتوو توانای جێبەجێکردنیان هەبوو، ئەگەرچی بیرۆکەی ئابووری لای ڕۆمان گەشەکردنی بە خۆیەوە بینی؛ بەڵام لە ڕاستیدا دەگەیشتە ئاستی بیرۆکەی ئابووری یۆنانەکان، ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار[2]، گرنگترینیان بریتییە لە زیاتر گرنگیدانی خانەدانەکانی ڕۆما بۆ شێوازی جۆرە ژیانێک؛ بریتی بوو لە خۆشنوودی و شادمانی؛ بەتایبەتی لە کاتەکانی سەرەتای هاتنەکایەوەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا، مێژووناسی ئابووری (ئەری کرۆڵ) باس لەم ڕاستییە دەکات و دەڵێت: "دوابەدوای دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی؛ کارگێڕی دارایی توانی لە وڵاتی ڕۆمانی داهاتەکان بخاتەگەر و بۆ ماوەیەک خۆشگوزەرانی باڵ بکێشێت بەسەر ژیانی ڕۆماندا، کە لە ڕێگایەوە توانرا باجەکان سووک و ئاسان بکرێت، کە دەبنە هۆی ئەوەی نارەزایی کەم ببێتەوە لەناو چین و

---

(١) نورمان كانتور: العصور الوسطى الباكرة، ص٣٩.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٠.

توێژەکانی کۆمەڵگای ڕۆمانیدا، گرنگترین ئەو کەسانەی سەردەمی ڕۆمانی کە باسیان لە کاروبارە ئابوورییەکان دەکرد بریتی بوون،[1] لە (کانوون، فاروون و کۆلومیلا)"، بەڵام چەقی قورسایی بیرۆکەکانیان خۆی لە بەرگریکردن لە بەرژەوەندی چینە خانەدانە خاوەنداەرەکان دەبینییەوە کە زۆربەیان چینی دەسەڵاتدار بوون، بیرۆکە ئابوورییەکانی ئەو سەردەمە لە زۆر ڕووەوە پشتگیریان لە چاوچنۆکی خانەدانەکان دەکرد، لێرەدا بریتییە لە سامانە سروشتی و مرۆییەکانی شوێنەکان کە وا سەر بە دەوڵەتی ڕۆمانی بوون، وا دایان دەنا کە ئەم جۆرە بەکارهێنان و چەوساندنەوەیە دیاردەیەکی سروشتی و ڕەوایە. بوونی کۆیلە دیاردەیەکە دەگونجێت لەگەڵ یاسا سروشتییەکاندا، لە هەمان کاتدا پشتگیری ئەوەیان دەکرد ئەگەر هاتوو نارەزاییەک یاخود ڕاپەڕینێک سەرهەڵبدات لە لایەن کۆیلەکانەوە؛ دەبێت بە توندترین شێوە سەرکوت بکرێت و باشتر وایە بۆ خانەدانەکان کە کۆیلە بەتەمەنەکان و نەخۆشەکان وەلابنێن، چونکە ئەوانە هیچ جۆرە سوودێک بە خاوەنەکانیان نابەخشن و بگرە دەبن بە ئەرک بەسەریانەوە[2].

(فاروون) ئەگەرچی زانایەکی ئابووری بوو؛ لە هەمان کاتدا زانایەک بوو لە بواری مێژوو و وێژەدا، ئەم زانایە کاتێک باس لە کاروبارەکانی ئابووری دەکرد؛ فرە جەختی لەوە دەکردەوە کە پێویستە زۆر گرنگی بە چالاکی کشتوکاڵ بدرێت و گلەییەکانی ئاراستەی چینی خانەدانەکانی ئەو سەردەمە دەکرد کە چۆن دێهاتەکانیان چۆڵ کردووە و نیشتەجێی شارەکان بوون و نوێنەرەکانیان تەرخان کردووە بۆ کارگێڕی.

بەرێوەبردنی بەرهەمی کشتوکاڵی؛ هەر ئەمەشە بووە بە هۆی نالەباری بارودۆخی کشتوکاڵ، ئەمانە وایانکرد کە بانگەوازەکانی خۆی بەرز بکاتەوە، بگرە پێویستە هەوڵ بدرێت بۆ گەڕانەوە بۆ ئابووری سروشتی و لە هەمان کاتدا تێڕوانینێکی تایبەتی هەبوو بۆ کۆیلەکان و هەردەم کۆششی ئەوەی بوو بۆ هێنانەخوارەوەی پلەوپایەیان و هەوڵی ئەوە بدات کە دایانببڕێت لە بوونەوەرە

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص١١٧.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٨.

مرۆییەکان، ئەو بیرۆکە نوێیانەی کە وا هێنایەکایەوە لەم بوارەدا بۆ دابەشکردنی بوارەکانی کار لە بواری کشتوکاڵی؛ بەمشێوەیە دابەشی کردن:

أ. ئامێرەکانی کار کە توانای دووان و گفتوگۆکردنیان هەیە (کۆیلەکان).

ب. ئامێرەکانی کار کە دەنگێکی گەورەیان هەبوو (گاکان).

ج. ئامێرەکانی کار کە لاڵن، وەک ئامێرەکانی دیکە لە بواری کشتوکاڵیدا بەکاردەهێنرێت[1].

(کۆلۆمیلا) دوانزە بڵاوکراوەی هەبوو لەسەر کشتوکاڵ و زۆربەی بڵاوکراوەکانی لە کاتێکدا بوو کە وا سیستمی کێڵگە گەورەکان دووچاری قەیران بوون و گەیشتە ئەو باوەڕەی کە هیچ سوودێک نییە بیخاتەوە سەر ڕێچکەی ئاسایی خۆی، چونکە ئەم سیستمە چیدیکە ناتوانێت دەرامەتی پێویست بۆ چینی خانەدانەکانی دەسەڵاتدار بهێنێتەکایەوە کە وا تێڕوانینەکانی بۆ ڕێزلێنان لە سیستمی کێڵگە گەورەکان لە چالاکی کشتوکاڵی هەتا دەهات بەرەو نەمان دەچوو و ڕێنماییەکانی پێشکەش کرد کە دەیگوت پێویستە چیدیکە پشت نەبەسترێت بە کاری کۆیلەکان و پێشبینی ئەوەی دەکرد کە سیستمی کشتوکاڵ ڕووەو داڕووخان و لەناوچوون هەنگاو دەنێت لە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا، چونکە لەسەر بنەمای بەکارهێنانی چەوساندنەوەی کاری کۆیلەکان وەستابوون و بانگەوازی ئەوەی بەرز دەکردەوە کە ئیدی پێویستە هەنگاو بنرێت بۆ شێوازێکی بەرهەمهێنانی نوێ کە ئەویش شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتییە لە ئەورووپادا. لە ڕاستیدا ئەو پێشبینییانەی کە وا (کۆلۆمیلا) کردی؛ دواجار هاتەکایەوە، ئەویش سیستمی دەرەبەگایەتییە لەسەر دەستی خێڵە (جەرمانییەکان) لە ئەورووپا بەرپابوو، بەتایبەتی دوای ڕووخانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی[2].

## لەناوچوونی ژیارە دێرینەکان

لەناوچوونی ژیارە دێرینەکان دەگەڕێتەوە بۆ دوو کۆمەڵە هۆکار:

---

(١) هنري بيرين: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ت: عطية القوص، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٩٦، ص٧٠.

(٢) مورس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٢٢.

**یەکەم/ هۆکارە ناوخۆییەکان**

أ. چەوساندنەوەی درندانەی کۆیلەکان کە بەند بوو لەسەر شێوازی بەرهەمهێنان لای ژیارە دێرینەکان؛ ئەم هۆکارە ئاستەنگێکی گەورەی خستە بەردەم پێشکەوتنیان و هەتا دەهات بەرەو سستی دەیبردن، لە ڕاستیدا کۆیلەکان هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکیان نەبوو لە زیادکردنی بەرهەم و چاککردنیدا و لە بەرامبەر ئەم ڕاستییەدا گۆڕانکاری لە پێکهاتەی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆیلەکاندا بووە شتێکی حەتمی بەرەو پێکهاتەیەکی پێشکەوتووتر کە خۆی لە سیستمی دەرەبەگایەتیدا دەبینییەوە.

ب. بەرهەڵستی کۆیلەکان و هاونیشتمانییە چەوسێنراوەکانی دیکە بۆ سیستمی کۆیلایەتی کە خۆی لە چەندین سەرهەڵدان و شۆڕشدا بینییەوە و هەندێکجار کۆیلەکان خۆیان لەدەست سستمی ئاغاکانیان دەرباز دەکرد، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی لاوازکردنی ڕژێمەکانی ئەو سەردەمە کە فەرمانڕەواییان دەکرد.

ت. بەکارهێنانی زۆری بیانییەکان لە سوپای وڵاتانی ئەو سەردەمەدا؛ بەتایبەتی لە (یۆنان و ڕۆمان) مەترسییەکی گەورەی خستە بەردەم ئەم وڵاتانەوە، وەک چۆن ئەم هۆکارە بوو بە هۆی لاوازی و لەکەداربوونی توانا و دەسەڵاتی دەوڵەتەکانیان کە بوو بە هۆکاری پەرەسەندنی بزوتنەوە جوداخوازییەکان، کە هەندێکجار یارمەتییان پێشکەش بە داگیرکەرانی دەرەکی و نەتەوە پەلامادەرەکان هەبوو.

ث. بێتوانایی چینە خانەدانەکان کە خاوەنداریێتی زەوی و کۆیلەیان دەکرد بەرامبەر دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە ئابووری کۆمەڵایەتییەکان کە زۆربەی زۆری دانیشتووانی ئەو سەردەمە پێوەی دەیانناڵاند[1].

ج. پەیوەندییە بەکرێدانەکان کە لە سەردەمەکانی دواییدا سەریانهەڵدا، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ کورتکردنەوەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، چونکە لە ڕاستیدا ئەم جۆرە پەیوەندییە بوو بە هۆی لاوازکردن و دواجار لێکترازاندنی سیستمی کۆیلایەتی لەم ئیمپراتۆرییەدا، چونکە ئەم جۆرە پەیوەندییە بوو بە هۆی ئەوەی کە کۆیلەکان لە تەنها هۆکارێکی بەرهەمهێنانەوە کە خاوەنداریێتییەکانیان دەگەڕایەوە بۆ ئاغاکانیان؛ ببنە خەڵکانیک کە وا زەوییەکان بە کرێ بگرن و هەندێک ماف پەیدا

---

(١) جوزیف نسیم یوسف: تاریخ العصور الوسطى الاوروبیة و حضارتها، ص٥٧-٥٩.

بــکەن لەو زەویــانەدا، ئەگەرچــی ئەم جــۆرە پەیوەنــدییە نــوێیە نەبــووە هــۆی ڕزگاربوونیــان لە شــێوازی پاشــکۆیەتی لە بــواری ئابووریيــدا بــۆ خاوەنــدارە ســەرەکییەکان لە ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمانیـدا، چـونکە ئابوورییەکەیـان کە وەسـتابوو لەســەر کــۆیلایەتی ڕێگاخۆشــکەربوو بــۆ پەیــدابوونی دەرەبەگــایەتی. بەڵام لە بەرامبەردا سیستمی کۆیلایەتی لە خـۆرهەڵاتی دیـرین و بگـرە لە یۆنانیشـدا؛ ئەم جـۆرە هانـدانەی بە خـۆیەوە نەبینـی، ئـابووریی کـۆیلایەتی مـایەوە بە جۆرێـک لە پێکهاتەی گرنگ لە پەیکەری ئابووری کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی دێرین، کە نەیتوانی بە ســەرەکی بیرەخســێنێت لە ئــابووری ئەو وڵاتــانەدا، کە ڕێخۆشــکەربێت بــۆ پەیــدابوونی سیســتمی دەرەبەگــایەتی؛ وەک چــۆن ئەم دۆخە بەرپــا بــوو لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمـانی، سیسـتمی ئـابووری خـۆرهەڵات سیسـتمێکی تونـدوتیژ بـوو لەچاو سیستمی ئابووری خۆرئاوادا[1].

### دووەم/ هۆکارە دەرەکییەکان

وەک ئاماژەمان بۆ کرد جیاوازی هەیە لەنێوان دەوڵەتێک و دەوڵەتێکی دیکە؛ ئیدی لە خۆرهەڵات بێت یان خۆرئاوا بەپێی ئەو تایبەتمەندییانەی هەریەک لەو وڵاتـانە[2]، بەڵام بەهەرحاڵ هۆکارە دەرەکییەکان ڕۆڵی خۆیان بینی لە ڕووخان و لەناوچوونی ژیارە دێرینەکان، ئەم هۆکارانە یەکجار زۆرن، بەڵام بەتەنها ڕۆڵی خۆیان نەگێڕاوە، بەدەر لە هێرشــەکان؛ خێـڵ و هۆزەکـانی کە وا دراوسـێی ئەم ئیمپراتـۆرانە بـوون هەمیشــە لە دەرفەت دەگەڕان بــۆ پەلامــاردان و گورزوەشــاندن بە مەبەســتی هێنــانەخوارەوەی شــکۆی ئەم ئیمپراتــۆرانە. لە ڕاســتیدا زۆر لەو دەوڵەتــانەی کە سیســتمی کــۆیلایەتی تێیــدا بەرپــابوو؛ ڕووخانـدن و لەنـاوچوونی لە ئەنجـامی ئەو گــورزانە بــوو کە لە دەرەوە لێیاندەوەشــێنرا و ببــوونە هۆکــاری ســەرەکی ئەم ڕووخانــدنە، بــۆ نمــوونە دەوڵەتــی (بــابلی) دوای چەنــدین هێــرش و پەلامــارە یەکلەدواییەکــانی ڕۆمــان و ساســانییەکان ڕووخێنــرا؛ بە هەمــان شــێوە (میســری سەردەمی فیرعەونەکان) تێکشکێنرا[3]. بەڵام دەوڵەتی (یۆنان) هەتا دەهات بچووک و

---

(١) جاک لوکوف: هل ولدت اوروبا في العصور الوسيط، ص٥٨-٦٠.

(٢) موريس كين: حضارة اوروبا العصور الوسطى، ص٤٣.

(٣) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ العصور الوسطى الاوربية وحضارتها، ص٥٨-٥٩.

## کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی

**قۆناغی یەکەم:** لە سەدەی پێنجەمی زایینی بۆ سەدەی دەی زایینی بەردەوام بووە، ئەگەر بکرێت ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی دابنێین بە نموونەی کلاسیکی بۆ کۆمەڵگەی کۆیلایەتی لە ئەورووپادا؛ دەتوانین بە هەمان شێوە پاشایەتی (فەرەنگی) بکەینە نموونەی کلاسیکی بۆ کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی، کە لەسەر بنەمای خاوەندارێتی زەویوزاری کشتوکاڵی هاتبووە کایەوە.

سەرکردەکانی هۆزە (جەرمانییەکان) هانی دابەشکردنی زەویوزارەکانیان دەدا بەسەر جووتیارەکاندا لەپێناو فرەکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی، بەڵام لە هەمان کاتدا مانەوەی ئەو پارچە زەوییە بچووکانە بەدەست جووتیارەکانەوە ئەرکێکی گران بوو، لەبەر ئەو هەموو شەڕ و شۆڕانەی کە لەو کاتەدا بەردەوام بوو و زۆرجار هۆزە دەرەکییەکان دەیاندا بە سەریاندا؛ بەتایبەتی هۆزە (جەرمانییەکان)، کە وای لێ کردن بەناچاری زەویوزارە بچووکەکان بخەنە بەر دەستی دەرەبەگە گەورەکانەوە و لە لایەن ئەوانەوە سودیان لێ وەربگرێت بەرامبەر دابینکردنی پاراستنی و ئاسایش و ڕزگاربوونیان لەو باج و سەرانانەی کە وا ئەرکی سەرشانیانی قورس کردبوو، پرۆسەی جوداکردنەوەی کۆمەڵایەتی لە پاشایەتی (فەرەنگی) قووڵ بووەوە و لەنێوان هەردوو سەدەی شەشەم و حەوتەمدا و زۆربەی زۆری زەویوزارە بەرینەکانیان کەوتنە بەردەستی دەرەبەگە گەورەکان و نەجیبزادەکانیان، کە بوو بە هۆی ڕێخۆشکردن بۆ هاتنەکایەوەی خاوەندارێتی خانووبەرە و پاشایەتی بە شێوەیەکی بەرچاو دەرکەوت لەنێوان سەدەکانی هەشتەم و نۆیەم، کە خۆی لە دابەشبوونی وڵاتدا بینی بە چەندین کەرتی جیاجیا و دوور لە یەکدی، کە هەر یەک لەو کەرتانە سەربەخۆییەکی ناوەکی هەبوو و ئەو کۆیلانەی کە وا ئیشیان دەکرد لە لای ئاغا و دەرەبەگەکان؛ بوونە هۆی ڕووخان و لەناوچوونی سیستمی کۆیلایەتی و لە هەمان کاتدا ڕێخۆشکەربوون بۆ هەنگاونان و چوونەناوەوەی وەک پێکهاتەیەکی ئابووری کۆمەڵایەتی زیاتر گەشەکردوو لە ڕووی گەشەکردنی هێزەکانی بەرهەمهێنان کە ئەویش سیستمی دەرەبەگایەتییە.

**قۆناغی دووەم:** دەرەبەگایەتی پێگەیشتوو بوو، ئەو ماوەیە بریتییە لەو کاتانە کە وا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی بە شێوەیەکی بەرچاو چەسپا؛

بەتایبەتی لەویٚ هاتەکایەوە، کاتێک کە بەتەواوەتی ئیشەکان جودا بوونەوە لە کاری کشتوکاڵی و لە هەمان کاتدا ڕۆڵی شارەکان هەتا دەهات گرنگی زیاتر بە خۆیەوە دەبینی، کە بوونە ناوەندی بەرهەمهێنانی کاڵاکان.

لە سیما سەرەکییەکانی ئەم ماوەیە وردەوردە کزبوونی پەیوەندی دەرەبەگایەتییەکان بوو بە هۆی پرۆسەکانی کەڵەکەبوونی سەرەتای سەرمایەداری کە بوو بە هۆی دروستبوونی یەکەم ناوکی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، کە لە ڕاستیدا (مافی فاکتۆر هاتەکایەوە) بەهێزبوونی ڕۆڵی سەرمایەداری بازرگانی و بڵاوبوونەوەی بازنەی پەیوەندییە کاڵا و داراییەکانی و هەروەها فراوانبوونی سنووری بازاڕی ناوخۆیی و دەستگرتنی بەسەر بازاڕە دەرەکییەکاندا[1].

(١) محمود سعيد عمران: حضارة اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٩-٦٠.

# بەشی سێیەم

- دیۆکلدیانۆس (٢٨٤-٣٠٥ ز)
- کورتەیەکی ژیانی
- کارەکانی دیۆکلدیانۆس
- دابەشکارییە کارگێڕییەکانی
- دیۆکلدیانۆس و ئەنجوومەنی سینات
- قوستەنتینی مەزن (٣٠٦-٣٣٧ ز)
- کارکردن لە پێناو یەکێتی ئیمپراتۆری بیزەنتیدا
- کەسایەتی قوستەنتین
- داننان بە ئایینی مەسیحیدا
- فەرمانی میلان (٣١٣ ز)
- بنیاتنانی شاری قوستەنتینییە
- گرنگییەکانی شاری قوستەنتینییە
- جێنشینەکانی قوستەنتین (٣٣٧-٣٧٨ ز)
- جولیان (٣٦١ - ٣٦٣ز)
- جوڤیان (٣٦٣-٣٦٤ ز)
- ڤالینز (٣٦٤-٣٧٨ ز)

## دیۆکلدیانۆس (٢٨٤-٣٠٥ ز)

(دیۆکلـدیانۆس) لە نـاوچەیەکی نزیـک بە (سـالۆنا) لە هەرێمـی (داڵماشـیا) و لە ساڵی (٢٤٥ز)دا لەدایکبووە، ناوەکەشی هەر بە ناوی ئەو شوێنەوە بووە و دایکیشی هەر لەوێ لەدایکبووە. دایک و بـاوکی خزمەتکـاری خێزانـی (ئەنۆلینـۆس) بـوون کە ئەنـدامی (ئەنجـوومەنی سـینات) بـوون، پاش ئەوەی بـاوکی تـوانی ئـازادی خـۆی و خێـزانەکەی بەدەسـتبهێنێت، (دیۆکلـدیانۆس) وەک (نووسـەر) کـاری دەکـرد، پـاش مـاوەیەک بە هـۆی زیرەکـی و لێهـاتووییەوە گەشـتە پلـەی (کونسـووڵ)، دوابەدوای ئەوە کرا بە فەرماندەی پاسەوانانی کۆشکی ئیمپڕاتۆر، ئەم ئەرکە بە کەسێک دەدرا کە جێبڕوا بێت، (دیۆکلدیانۆس) لە جەنگی ڕۆمەکان دژ بە ساسانییەکان جەربەزەیی و ئازایەتی و دڵسۆزێتی خۆی نیشاندا[1].

لەسـەر ئاسـتی سـوپاش تـوانی بگـات بە پلەوپـایەیەکی بەرز کە ئەویـش پلـەی ئیمپڕاتۆری بوو، وەرگرتنی دەسەڵات لە لایەن (دیۆکلدیانۆس) لەو سەردەمەدا خۆی لەخۆیدا دوو ڕاستیمان بۆ دەردەخات:

١. پێکهـاتەی سـوپای ڕۆمـانی کە لە ڕەگەزی جگە لە ڕۆمـانی پێکهـاتووە لەم ماوەیەدا.

٢. ئەو ڕۆڵە کـاریگەرەیە کە سـوپا لە چارەنووسـی ڕامیـاری ئیمپڕاتۆرییەتـدا دەیگێڕا، لێرەشدا دەتوانین بڵێین (دیۆکلدیانۆس) باشترین نوێنەر بوو بۆ سـەردەمی خۆی[2].

ئەوەی جێگەی ئاماژەبۆکردنە؛ (دیۆکلدیانۆس) کەسێکی زۆر ڕۆشنبیر نەبوو، هەروەهـا ئاگـاداری پێشـکەوتنی سیسـتمە ڕۆمانییەکـان نەبـوو؛ جـگە لە مێـژووی ڕۆمان، بەڵام سەرەڕای ئەمانەی کە باسمان کرد؛ تێگەیشتنێکی تەواوی هەبوو بۆ کێشـەکانی نـاو ئیمپڕاتـۆرییەتەکەی لە ڕێگـای ئەوە دەرفەتەی بـۆی ڕەخسـا و دەسـەڵاتی گـرتە دەسـت، هاوکـات وەک سـەربازێک دەیـڕوانییە کێشـەکانی ئیمپڕاتۆرییەت، واتە لە ڕوانگەیەکی سەربازییەوە و بە پلە یەک ئامانجی پاراستنی سنووری ئیمپڕاتۆرییەتەکەی بوو پێش هەموو شتێک. پاش مردنی (نومریانووس) لە

---

(١) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا، ص٢١.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٣٢-٣٣.

(٢٨٣ يـان ٢٨٤ ز)دا هەمـووان لەسـەر ئەوە يەكـدەنگ بـوون كە ئەو شـياوترين كەسێكە، چونكە توانا و ڕەوايەتی چوونە سەر تەختی ئیمپڕاتۆرییەتی هەیە[١].

## كارەكانی دیۆكلدیانۆس

یەكەم كـاری ئەوەبـوو، كە هـاوڕێیەكی نزیكـی بەنـاوی (مەكسـیمیان) كـردە هاوكـاری دەسـەڵاتداریتی، ئەوكـاتە هەوڵـی چارەسـەركردنی بـارودۆخی شـێواوی ئیمپڕاتۆرییەتیدا[٢] كە لێرەدا كورتەكەی دەخەینەڕوو:

ڕێكخسـتنەكانی سـوپای دووبـارە كـردەوە، جگە لە دامەزرانـدنی هێزێكـی نـوێی گەڕۆك كە زۆر بەخێرایـی لە هەمـوو بەشـەكانی ئیمپڕاتـۆرییەت دەجـووڵانەوە بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوەی هەر مەترسـییەك بە ئامـادەكردنی (٥٠٠٠٠٠) سـەرباز لە چوارچێـوەی پێویسـتییەكانی ئیمپڕاتـۆرییەت، هاوكـات میـری ناچـار بـوو هـانی (جەرمـان و بەربەر و نەتەوەكـانی دیـكە) بـدات بـۆ چـوونە ڕیـزی سـوپاوە، لە ڕاستیشدا ڕێگایدا بە (جەرمانەكان) سنووری ئیمپڕاتۆرییەت ببەزێنن، چونكە ئەمانە بە هاوپەیمانی ئیمپڕاتۆرییەت دادەنرێت و بەشێكە لە هێزی هاوپەیمانی[٣].

چـاككردنی دۆخـی ئـابووری لەنێـو ئیمپڕاتـۆرییەتەكەدا بە كۆنترۆڵكردنی دراو و جێگیركردنی بەهـاكەی و دیاریكردنی نرخـی خـواردەمەنی، دۆزینەوەی سیسـتمێكی نوێ بۆ وەرگرتنـی بـاج، دەستگرتن بەسـەر هەمـوو پرۆژە ئـابووری و بازرگـانی و پیشەسازی و كشتوكاڵییەكاندا. قەیرانی دارایی گەورەترین كێشەی ئابووری بوو كە ڕاسـتەوخۆ ڕووبەڕووی ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی بـوویەوە، چـونكە خەرجییەكـانی میری لە داهاتەكانی زیاتر بوو، ئەوەش بە هۆی گەورەیی سوپای ڕۆمانی و مەزنـی سیسـتمی كـارگێڕی لە لایەك و خراپـی سیسـتمی كـۆكردنەوەی بـاجیش لە لایەكـی دیـــكەوە، بەڵام (دیۆكلـــدیانۆس) لە جێگیركردنـــی بەهـــای دراودا ســـەركەوتنی بەدەستهێنا، هەرچەندە دراوی زێڕ و زیو كەم ببوونەوە[٤].

---

(١) ه. ا. ل. فشر: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٦-٣٧.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٣.

(٤) سعيد عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٥.

کۆکردنەوە و ڕێکخستنی خاوەن پیشە جۆراوجۆرەکان لە سەندیکای جۆراوجۆر بە مەبەستی ناچارکردنی هەر سەندیکایەک بە بەرهەمهێنانی بەشێکی دیار لە یەکە پیشەسازییەکان بە ئامانجی پاراستنی ئەو بڕە بەرهەمە کە بەردەوام لە کەمیدایە، هەروەها ڕێکخستنی پیشەوەرەکان لەو سەندیکایانە کاری کۆکردنەوەی باجەکانی ئاسان دەکردەوە و هەموو سەندیکایەک پابەند بووە بە پێدانی ئەو بڕە پارەیەی لەسەریەتی بە میری. هاوکات (دیۆکلدیانۆس) ئەو مەرجەی سەپاند بەسەر منداڵان بەوەی هەمان پیشەی باوکیان هەڵبگرن، هەرچەندە ئەم کارە سوودمەند بوو بۆ میری؛ بەڵام زیانی هەبوو بۆ پڕۆژە تایبەتییەکان[١].

دیاریکردنی سنوورێک بۆ ئەگەری ڕوودانی هەر کودەتیایەکی سەربازی کە ناوبەناو مەترسی دروست دەکرد لەسەر دەسەڵاتی قەیسەرەکان، بەڵام کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەوان هێنا و سنورداری کردن، تەنانەت زاڵبوونی دەسەڵاتی (دیۆکلدیانۆس) بەسەر هەموو ناوچەکانی دەوروبەریشیدا کە تاکە دەسەڵات بوو هەموو ناوچەکانی لەژێر دەستدا بێت بە خودی ناوچەکانی دەستی (مەکسیمیان)یش[٢]. هەروەها کەمکردنەوەی ئەو ناکۆکی و ململانێیانەی کە بەدرێژایی مێژوو لەپێش سەردەمی (دیۆکلدیانۆس)ەوە لەنێوان ڕیزەکانی سوپای پاسەوانانی سنووردا هەبوو[٣].

ئەمە سەرەڕای چاوخشاندنەوە بە دەزگاکانی وڵاتدا و لابردنی هەموو ئەوانەی کە پێی وا بوو خراپن و هێشتنەوەی ئەوانەش کە لە لای پەسەند بوون، نوێکردنەوەی ژمارەیەک لە ڕێکخستنەکان کە پێی وا بوو دەکرێت لە ڕێیانەوە گیروگرفتەکانی وڵات چارەسەر بکرێت[٤].

لە سەروو هەمووشیانەوە بەهێزکردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر؛ ئەویش لە ڕێی دروستکردنی دەزگایەکی کارگێڕی گورجوگۆڵ و ڕێکخراوەوە، کە بتوانێت دەست بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەتدا بگرێت، لەگەڵ جیاکردنەوەی دەسەڵات لەنێوان سوپا

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٣.
(٢) قحطان عبدالستار الحديثي وصلاح عبدالهادي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٤٥.
(٣) حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٠ م، ص١٨-١٩.
(٤) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩.

و دەزگـــا شارســـتانییەکاندا، هاوکـــات دروســـتکردنی ســـوپایەکی مەزن بـــۆ بەرپەرچدانەوەی هێرش و پەلاماری بەربەرییەکان[1].

### دابەشکارییە کارگێڕییەکانی

لەپێنـاوی سـەرخسـتنی کارەکانیـدا؛ (دیۆکلـدیانۆس) ئیمپراتـۆرییەتییەکەی کـردە دوو بەشەوە: بەشـی خـۆرهەڵات و بەشـی خۆرئـاوا. دابەشکردنەکەشی بەم چەشنە بوو:

هەریەکێک لەو دوو بەشە (خۆرهەڵات و خۆرئاوا) فەرمانڕەوایەکی بـۆ دانـان؛ کە نازناوی (ئۆگستۆس)یـان هەڵدەگرت، بەڵام خـۆی سـەرکردایەتی بەشـی خـۆرهەڵاتی وەرگـرت و هاوکارەکەشـی کە (مەکسـیمیان) بـوو بەشـی خۆرئـاوای بەرکەوت، بـۆ ئەوەی بتوانێت باشتر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆرییەتەکەی بکات و کارەکانی باشـتر بـڕۆن بەڕێـوە؛ پێکهـاتە کـارگێڕییەکەی وردتـر کـردەوە و ئەوە بـوو لەم دوو بەشەشـدا هەرێمـی لـێ دروسـت کـردن، بەو جـۆرە ئیمپراتـۆرییەتەکەی بەسـەر چـوار هەرێمـی بەڕێوەبردندا دابەشکرد کە بریتی بوون لە:

أ. **هەرێمی ئیتاڵیا:** پایتەختەکەی شاری (میلان) بوو.

ب. **هەرێمـی گـاڵ:** پـایتەختەکەی شـاری (تریـڤ) بـوو، کە دەکەوێتـە سـەر ڕووباری (ڕایین).

ت. **هەرێمـی ئیلیریـا:** پـایتەختەکەی شـاری (سـیرمیووم) بـوو، کە (بەلگـراد)ی ئێستایە.

ث. **هەرێمی ئانادۆل:** لە خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکەی و پایتەختەکەی شـاری (نیکۆمیدیا) بوو، کە کەوتووەتە بەشی ئاسیایی کەناری (بسفۆڕ)ەوە.

جگە لەوان دوو کەسـی دیکەش کاروبـاری وڵاتیـان گرتە دەست، کە یەکەمیـان (گـالیریۆس) بـوو؛ لە لایەن (دیۆکلیـدیانۆس)ەوە پشـتگیری کرابـوو، دووەمیشـیان (کۆنستەنتیۆس) بوو؛ کە لە لایەن (مەکسیمیان)ەوە پشتگیریکرا[2].

دابەشکردنی دەسەڵاتەکانیش لەنێوان ئەم چوار کەسایەتییەدا بەم جۆرە بوو:

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٧.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٣٥.

١. (کۆنستەنتیۆس) کاروباری بەرگریکردن لە (گاڵ و ئیسپانیا و ئینگلتەرا)ی وەرگرت، (تریڤ)ی کردە مەڵبەندی دەسەڵاتدارێتی خۆی.

٢. (مەکسیمیان) هەریەک لە (ئیتاڵیا و باکووری ئەفریقا)ی وەرگرت و (میلان)ی کردە ناوەندی دەسەڵاتدارێتی خۆی.

٣. (دیۆکلدیانۆس) ناوچەی (تەراکیا و ئاسیای بچووک و میسر)ی خستە ئەستۆی دەسەڵاتدارێتییەکەی.

٤. (گالیریۆس) (ئیللیریا)ی وەرگرت و (سیرمیۆم)ی کردە مەڵبەندی دەسەڵاتدارێتییەکەی[١].

هەریەک لەو چوار کەسە؛ جگە لەوەی مەزنی ناوچەکەی خۆی بوو، دەسەڵاتی بەسەر یەکێتی هەموو ئیمپڕاتۆرییەتەکەشدا دەڕۆیشت و هەموو بڕیار و فەرمانێک بە ناوی هەموویانەوە دەردەچوو. ئەم جۆرە دابەشکردنە کارگێڕییە هەرچەندە لایەنی ئەرێنی خۆی هەبوو، بەڵام بەدەر نەبوو لە لایەنی نەرێنیش، بۆ نموونە:

١. بۆ ماوەیەک یەکێتی ڕامیاری دەوڵەتی ڕۆمانی بەرەو لاوازی ڕۆشت و هەرێمەکان هەتا ڕادەیەک جۆرە جیابوونەوەیەکیان بە خۆیانەوە دی.

٢. خەرجکردنی پارەیەکی زۆر لە دروستکردنی دەزگای نوێی هەرێمەکان، کە بە هۆیەوە باجیش بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بوو[٢].

لە کۆتاییدا بەرنامە و چاکسازییەکانی (دیۆکلدیانۆس) وەک ئەوەی چاوەڕێی بوو ئامانجی خۆی نەپێکا و ئاستەنگی گەورە و جیددی هاتەپێشی، هێرشی بەربەرییەکان لەسەر سنوور کۆتاییان پێ نەهات و بەردەوامی هەبوو، شەڕی ناوخۆش بەردەوامییەکی هەبوو، نەخۆشی (تاعوون) بڵاوبوویەوە و خەڵکێکی زۆر گیانیان لەدەستدا. بازرگانی و پیشەسازیش نەک گەشەیان نەکرد؛ بەڵکوو بەرەو لاوازی هەنگاویاننا، سەرباری ئەمانەش بایەخی دراوی دەوڵەت بە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی شتومەکەوە کەمبووەوە[٣]. یەکێکی دیکە لە کێشە جیدییەکانی سەردەمی (دیۆکلدیانۆس)؛ ئایینی (مەسیحی) بوو، چونکە سەرەڕای هەموو ئەو ڕێکاریانەی کە پێشتر دژ بە شوێنکەوتووانی ئەم ئایینە گیرابوویەبەر؛ زۆر

---

(١) حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية، ص١٨.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٣٥-٣٧.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢.

بەخێرایی و بە نهێنی تەشەنەی دەکرد، (دیۆکلدیانۆس) لەبری دۆزینەوە و دانانی چارەسەرێکی گونجاو؛ هەوڵیدا لە ڕێگەی هێزەوە گرفتی ئایینی (مەسیحی) و شوێنکەوتووانی لە ئیمپراتۆرییەتەکەیدا چارەسەر بکات، لەم ڕووەوە زۆر بەسەختی بەرەنگاریان بوویەوە و بە توندترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، هەر بەوەشەوە نەوەستا؛ بگرە ڕێوڕەسمی ئایین پەرستنی لێ قەدەغەکردن، دەستیشی گرت بەسەر زەویوزار و موڵکوماڵیاندا و ژمارەیەکی زۆریانی ناچار کرد کە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی بتپەرستی[1].

ئەم کار و چاکسازیانەی کە (دیۆکلدیانۆس) ئەنجامیدان؛ لە دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتەکەیدا تەواو پڕاوپڕ بە سوودی ئیمپرتۆر نەبوو، بەڵکوو ئەوەندەی دیکە ئەرک و کارەکانی ئەستۆی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمی گرانتر کردبوو؛ بە جۆرێکی وا کە هەردوو ئیمپراتۆرییەتەکە دەسەڵاتیان لە تەواوی ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەدا هەبێت، ئەمەش وایکرد کە کاروبارەکانی ئیمپراتۆر (دیۆکلدیانۆس) بەتەواوەتی بەڕێوەنەچێت[2].

### دیۆکلدیانۆس و ئەنجوومەنی سینات

(دیۆکلدیانۆس) ئەفسەرانی سوپا و فەرماندەکانی لە چینی سوارەکان هەڵدەبژارد، ئەمەش واتای لەدەستدانی پلەوپایەی تایبەتی سیناتۆرەکان بوو، ئەنجوومەنی (سیناتی ڕۆم) بە کۆمەڵێک لە زەویدارە گەورەکان گۆڕا کە هیچ ڕۆڵێکیان لە کاروباری کارگێڕی دەوڵەتدا نەمابوو، بەم بارودۆخەشەوە ئەنجوومەنی (سینات) دەسەڵاتی خۆی لە شاری ڕۆما پاراست، ئەنجوومەنی (سینات) لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی (ئیپبین) سەدەکانی (٤-٥ ز) گۆڕا بۆ شوورای شار، لەوێدا کە ساڵی (٢٣٠ ز) ئیمپراتۆر سەرقاڵی جەنگ بوو، بەدەگمەن لە ڕۆمادا بوونی هەبووە، ئەنجوومەنی (سینات) لەو کاتەدا هەموو کارەکانی ئەوی ئەنجامدەدا. لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی (دیۆکلدیانۆس) چینی سوارەکان گەشەی کرد؛ لە ئەنجامدا گۆڕا بۆ ژمارەیەک چینی نوێ کە وابەستە بوو بە ئەرکی سوپاوە.

---

(١) یوسا بیوس القیصري: حیاة قسطنطین العظیم، ت: القمص مرقس داود، مکتبة المحبة، القاهرة،١٩٧٥، ص١٥.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص٢٥-٢٦.

لە کۆتاییدا و لە ساڵی (٣٠٥ ز) و لە تەمەنی (٤٩) ساڵیدا؛ (دیۆکلدیانۆس) پاش (٩) ساڵ لە ئەرکەکانی دەستی لە هەموو کارێک کێشایەوە، هاوکات (مەکسیمیان)یش بەپێی ڕێککەوتنی پێشتری لەگەڵ (دیۆکلدیانۆس) دەستی لە کاروبارەکانی هەڵگرت، بەمجۆرە کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتیان هات[1].

## قوستەنتینی مەزن (٣٠٦-٣٣٧ ز)

(قوستەنتینی مەزن) لە ماوەی ساڵانی (٣٠٦-٣٣٧ ز) فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتی کردووە، لە سەردەمی ئەم ئیمپراتۆرەدا سەرتاپای ناوچەکانی قەڵەمڕەویی ئیمپراتۆرییەت بەوپەڕی کارامەیی و لێزانییەوە بەڕێوەدەبران. لە گرنگترین کارەکانی (قوستەنتینی مەزن) کە مرۆڤایەتی شانازی پێوە دەکات دەرکردنی (فەرمانی میلان) بوو، کە بۆ یەکەمجار بوو لە مێژووی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتدا و بگرە لە مێژووی مرۆڤایەتیشدا ڕێگە بە ئازادییە ئایینییەکان بدرێت و کارئاسانی بۆ بکرێت، لە هەمان کاتدا پەیڕەوکردنی ئەو ئایینانە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریدا بە فەرمی دانیانپێدابنرێت[2].

ئەم بڕیارە (قوستەنتینی مەزن) سەرەتایەکی زۆر کاریگەرە بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی ڕامیاری و ڕێگەدان بە ئازادییەکان و لەبەرچاوگرتنی مافەکانی مرۆڤ، هەروەها یەکێکی دیکە لە کارەکانی (قوستەنتینی مەزن) بنیاتنانی شاری (قوستەنتینییە) بوو، کە بەدرێژایی مێژووی دوای بنیاتنانی ئەو شارە وەکوو چەقی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت بە ناوەندی ڕامیاری و ئایینی خۆرئاوا دادەنرێت، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لەسەر تێکەڵاوی خۆرئاوا و خۆرهەڵات بە پێوەری نزیکی (قوستەنتینییە) لە خۆرهەڵات، هەڵبەتە ئەم تێکەڵبوونە ژیاری و ڕۆشنبیری و ئایینی و فەرهەنگی بووە، کە لە دوای بنیاتنانی قوستەنتینییەوە لەنێوان خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە دروست بوو، چونکە پێشتر ناوەندی ئیمپراتۆرییەت لە ڕۆما بوو و ئەو کاریگەرییە دروست نەبووبوو[3].

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٧-٣٩.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٤٧.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٥.

**کارکردن لەپێناو یەکێتی ئیمپڕاتۆری بیزەنتیدا:**

لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی زایینیدا؛ ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی بە شێوەیەکی گشتی پێویستی بە ئیمپڕاتۆرێکی چاک و لێهاتوو هەبوو؛ کە بتوانێت لە لەناوچوون ڕزگاری بکات، دوو ئیمپڕاتۆری مەزن سەریانهەڵدا لە هەرێمی ئیلیریای دێرین (ئەم ناوچەیە دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای نیمچەدوورگەی بەلقان)، کە ئەوانیش بریتیبوون لە (دیۆکلدیانووس و قوستەنتینی مەزن) کە هەردووکیان بەدواییەکدا هاتوون، لە ماوەی سالانی نێوان (٢٨٤-٣٣٧ ز) کە توانیان ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی ڕزگار بکەن لە لەناوچوون. هەرچەندە (دیۆکلدیانۆس) و (قوستەنتینی مەزن) چەند هەڵەیەکیان هەبووە؛ بەڵام گومان لەوەدا نییە کە هیچ پیاوێک لەنێوان پیاوانی ڕامیاریدا سەرنەکەوتووە جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبن بەدرێژایی مێژوو، وەک ئەو سەرکەوتنانەی (دیۆکلدیانۆس و قوستەنتینی مەزن) لەو چاکسازی و کارانەی کە کردوویانە، هەموو ئەو کارانەی ئەم دوو ئیمپڕاتۆرە ئەنجامیاندا؛ گەل لێیان ڕازی بووە[1]، ئەو سیستمە بەڕێوەبەرایەتییەی (دیۆکلدیانۆس) دایمەزراند؛ بۆ ماوەی هەزار ساڵ لە مێژووی دەوڵەتی ڕۆمانی خۆرهەڵاتی ئەورووپا کارییێدەکرا، هەروەها ئەو دراوەی (قوستەنتین) لێیدا؛ هەتاوەکوو سەدەی (١١ ز) کارییێدەکرا، ئەو سیستمە نوێیەی کە (دیۆکلدیانۆس) دایڕشتبوو؛ پلانێکی گشتگیری هەبوو، چاکسازی کردبوو لە هەموو لایەنەکاندا، وەک بواری سەربازی، باجی نوێی داهێنا و شێوازێکی تازەی هێنایەکایەوە بۆ وەرگرتنی باج کە میری بتوانێت بەئاسانی سەرپەرشتی بکات. بارودۆخی لە ئاگایی وڵات توانای ئەوەی لێسەندەوە کە بتوانێت هەموو کارەکانی وڵات کۆنترۆڵ بکات، هەر بۆیە سیستمی چوارینەیی هێنایەکایەوە، بەڵام ئەو سیستمە نوێیە گومانی تێدا نییە کە توانی لە هەر لایەکەوە دەسەڵاتی سنووری گێڕایەوە شوێنی پێشووی، هەروەها ئاژاوەی نێوخۆیی لەناوبرد و وڵاتی کۆنترۆڵ کرد. تەزاری (قەیسەر) و بەتایبەتی (دیۆکلدیانۆس) ناوی (گالیریۆس) بوو[2]، لەم کاتەدا شتێکی دیکە هاتەکایەوە و بە شێوەیەکی بەهێز گەشەی دەکرد،

---

(١) صلاح ابو السعود: الحضارة البيزنطية، العالمية للكتب والنشر، الطبعة الاولى، ٢٠١٥ م، ص٢٢-٢٣.

(٢) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٤٤.

ئەویــش دەرکەوتنــی ئــایینی مەســیحییە، ئەم ڕووداوە هەرچەنــدە هەنــدێک کەس نکوڵیــان لێــی کــرد؛ بەڵام تەشەنەیســەند و باوەڕهێنــان بە (مەسـیح) وایکـرد دڵــی خەڵکانێکی زۆر بۆ خۆی ڕابکیشێت، بە شێوەیەک گرنگیان پێدەدا لە ڕووداوەکاندا؛ بە جۆرێک لە ئایینی (بودی) زیاتر بوو. دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت لەو گروپە نوێیە دەترســا، بەو جــۆرە لێــی دەڕوانــین کە دروســتبوونی دەوڵەتێــک لەنێــو دەوڵەتەکەیاندایە، ئەم ئایینە نوێیە سەرەڕای ئەو فشارە زۆرانە هەر لە گەشەکردنی خــۆی بەردەوام بــوو. (گــالیریۆس) حەزی لە شــوێنکەوتووانی ئــایینی (مەسـیحی نەدەکـرد)، بەڵام ســەردەمی (دیۆکلـدیانۆس) بە ســەردەمی شــەهیدان دەناسـرێت لە لایەن مەســیحییەکانەوە. لە ســاڵی (٣٠٥ ز)دا (دیۆکلــدیانۆس) و هاوکــارەکەی (ماکسـیمیلیان) دەستیانلەکارکێشــایەوە، بەم کـارە پـلەی هەریەک لە (گـالیریۆس و قوستەنتین) بەرز بووەوە بۆ پلەی (ئۆگستس) و هەریەکەیـان تەزارێکی بۆ جێگری خـۆی دەستنیشـانکرد. لە بەرەی خۆرهەڵاتیـدا هەریەک لە (ئۆگسـتس گـالبریۆس) و تەزارەکەی (ماکسـمین) فەرمانڕەواییـان دەکـرد، سیسـتمێکی تونـدوتیژ و دڕنـدەیان پیــادەدەکرد لە بەڕێوبەرایەتیــدا، بەمپێــیە ئیمپڕاتۆرەکــان توانیــان دژایەتــی مەســیحییەکان بــکەن، لە بەری خۆرئــاواش هەردوو کەســایەتی (ئۆگســتس کونســتانیوس) و (ماکســنیۆس)ی تەزاری فەرمانڕەواییــان دەکــرد، بەڵام لە (٣٠٦/٧/٢٥ ز) (قوستەنتین) کۆچی دوایی کرد و سوپای (بەڕیتانی) لە هەمـان ڕۆژدا بــانگی (کەسـتنیتان)یـان کـرد و کردیـان بە ئیمپڕاتــۆر[1]، هەرچەنـدە ئەمە لەگەڵ (گالیریۆس) لە بابوباپیرییەوە شوانی مەڕوماڵاتی بۆ مابووەوە، بە هـۆی دڕندەیی و تونــدوتیژییەوە پلەکــانی ســوپای بڕیــوە، زۆری نەخایانــد ســەلماندی بە هــۆی ســەرکەوتنەکانییەوە لە بەری (دانــووب) و بەرامــبەر (ساســانییەکان)، هەر ئەو شــانازی و شایستەییەشــی بــوو کە بە شــایەنی ئەوە زانــرا کە پــلەی (تەزاری) پێببەخشرێت، هەر بۆیە بە یەکێک لە کەسانە دەژمێردرا کە فێربووبوونیان لە گیانی یەکلایـیکەرەوەی ســەربازی و نەریتــی ڕۆمانییەکــانی وەرگرتبــوو[2]. ئەو پــیلانەی (دیۆکلـدیانۆس) دایـنـابوو نەدەگونجـا، بەڵام لەبەرئەوەی هێزێـک هەبـوو پشـتگیری

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٤٢.

(٢) صلاح ابو السعود: الحضارة البيزنطية، ص٢٤.

(قوستەنتین)ی دەکرد کە دەبووایە بەرەنگاری ببنەوە، (گالیریۆس) لە کۆتاییدا ناچاربوو دان بە (قوستەنتین) وەک ئیمپراتۆری خۆرئاواوە بنێت، هەرچەندە پێی ناخۆش بوو؛ بەڵام راستیی بارووۆدخەکە پێچەوانەی ویستی بوو. بەو جۆرە هەرچوار فەرمانڕەواکە (گالیریۆس و ماکسین) لە خۆرهەڵات و (ماکسنیۆسی کوری ماکسیمیان) و (قوستەنتینی کوڕی کەستەنیۆس) لە خۆرئاوادا توانیان سنوورەکانیان بپارێزن بەمەش بەریان بە (بەربەرەکان) گرت و (بەربەرەکان) نەیاندەتوانی دەستدرێژی بکەنە سەریان، بەم پێیەش سیستمی (دیۆکلدیانۆس) سەرکەوت. پاش مردنی (گالیریۆس) لە ساڵی (٣١١ ز) کێشە و ململانێ لەسەر دەسەڵات دەستیپێکرد، لە بەرەی خۆرهەڵاتدا (گالیریۆس لیکانوس لینیۆس) توانی دەسەڵات وەربگرێت و بوو بە (ئۆکستسی خۆرهەڵات)، بەڵام لە بەرەی خۆرئاوادا ململانێ لەنێوان (ماکسینیۆس) و (قوستەنتین)دا ڕوویدا[1].

(ماکسیمیان) لە پاش خۆی کوڕێکی بەجێهێشت کە ناوی (ماکسینتیوس) بوو، هەروەها (کەستەنیتوس)یش کوڕێکی هەبوو بەناوی (قوستەنتین)، هەرچەندە لە سەرەتاوە بۆچوونی باوکیان ئەوە بوو کە هەردووکیان لە ڕێی هەڵبژاردنەوە دەسەڵات بگرنە دەست؛ بەڵام زۆری نەخایاند (ماکسینتیوس) خۆی کردە فەرمانڕەوا بەسەر (ئیتاڵیا و ئەفریقا)دا و فەرمانڕەواییەکی زۆردارانەی پەیڕەوکرد، ئەمەش دەرفەتێکی لەباری بۆ (قوستەنتین) ڕەخساند، کە بەرەو ناوچەی (گال) بچێت و بیخاتە بندەستی خۆی، هەر بەمەوە نەوەستا؛ (ئیتاڵیا)شی گرت و (ماکسینتیوس)ی کوشت و منداڵەکانیشی لەسێدارەدان، هەرکەسێکیش کە پەیوەندی بەوانەوە هەبوو لەناوی بردن، ئەم پاکتاوکردنانە گشتیان لە ساڵی (٣١٢ ز)دا ڕوویاندا[2].

کاتێک (قوستەنتین) چووە (ئەنجوومەنی سینات)ەوە؛ ڕێزێکی زۆری لە ئەندامانی گرت و پشتیوانی خۆی بۆ کاروبارەکانیان نیشاندا، لە بەرامبەردا ئەندامانی (ئەنجوومەنی سینات) فەرمانێکیان دەرکرد؛ بەپێی ئەو فەرمانە (قوستەنتین) پێگەی یەکەمی لەناو ئەو شەش کەسەدا وەرگرت کە لەناو ئیمپراتۆرییەتدا نازناوی (ئۆگستۆس)یان هەبوو، لەنێوان ساڵەکانی (٣١٢-٣٢٤ ز)دا (قوستەنتین) توانی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٢-٢٣.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٤٨.

بەتەواوی (ئەدرنا و کریس تولیس) بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەمەش توانی ببێت بە تاکە دەسەڵاتداری ئیمپڕاتۆرییەتەکە، لێرەوە (قوستەنتین) سیستمی چوارینەیی لابرد و چەند فەرمانڕەوایەکی وەک یاریدەدەر بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دانا[1].

### کەسایەتی قوستەنتین

مێژوونووسان لەبارەی کەسایەتی (قوستەنتین)ەوە دەڵێن بەبایەخترین شتێک کە سروشت بە (قوستەنتین)ی بەخشیبێت (ژیری) بووە، هەر لە سەرەتای تەمەنی منداڵییەوە هەتا کۆتا ڕۆژی ژیانی هێز و توانا و تەندروستی خۆی بەباشی پاراستبوو، خاوەن کەسایەتییەکی ژیر و خۆڕاگر بوو، (هێلانە)ی دایکی ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەری هەبوو لە دروستبوونی کەسایەتی (قوستەنتین)دا، لە سەردەمی ئەم ئیمپڕاتۆرەدا زانست و هونەر پاڵپشتی لێدەکرا و بە جۆرێک گەشەی کرد کە پەرەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆیەوەدی. (قوستەنتین) جگە لەوەی گرنگی بە خوێندنەوە و نووسین دەدا؛ بەوردی بیری لە گیروگرفتەکانی کۆمەڵگەکەشی دەکردەوە و چارەسەریشی بۆ دادەنان، ئەگەر ویستی جێبەجێکردنی کارێکی هەبووایە هیچ شتێک یان کەسێک نەیدەتوانی ڕێی پێ بگرێت و گرفتی بۆ دروست بکات[2].

لە مەیدانی شەڕکردنیشدا سەرکردەیەکی جەربەزە و بەتوانا بوو، خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی دەکرد، سەرکەوتنەکانیشی زیاتر پەیوەندی بە تواناکانیەوە هەبووە؛ نەک بە بەخت و ڕێکەوت، (قوستەنتین) لە ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا دوو کاری مەزنی دیکەی ئەنجامداوە، کە ئەوانیش بریتیبوون لە داننان بە ئایینی (مەسیحی) و بنیاتنانی شاری قوستەنتینییە وەک پایتەختی نوێی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی[3].

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٩-٤٠.

(٢) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٢٣.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٤٠-٤١.

## یەکەم/ دانانان بە ئایینی مەسیحیدا

(قوستەنتین) ئەوەی ئاشکرا کرد کە لە چوارچێوەی ئیمپڕاتۆریەتەکەیاندا داندەنێن بە ئایینی مەسیحییەتدا، بەڵام ئەم دانپێدانانە وەک ئایینی فەرمی دەوڵەت نەبوو! کاتێک کە (قوستەنتین) چووە سەر تەختی ئیمپڕاتۆری؛ ئایینی (مەسیحی) سێ سەدەیەک دەبوو لە ئیمپڕاتۆریەتەکەیدا بڵاوببوویەوە، هەندێک لە ئیمپڕاتۆرەکانی پێشووی وەک (دیۆکلدیۆس و گالیریۆس) هەوڵیاندابوو لە ڕێگەی هێز و زۆرداریەوە ئەو ئایینە نەهێڵن و لەناویببەن، بەڵام شکستیان هێنابوو، لەم سۆنگەیەشەوە (هێلانە)ی دایکی ڕۆڵی هەبوو لە هێورکردنەوەی (قوستەنتین) بەرامبەر بە ئایینی (مەسیحی)[1].

## فەرمانی میلان (٣١٣ ز)

(قوستەنتین) دوای سەرکەوتنی بەسەر نەیارەکانیدا لە ساڵی (٣١٢ ز) لە (میلیڤان)؛ فەرمانی (میلان)ی ڕاگەیاند لەپێناو گەڕانەوەی ئاشتی و هێمنی بۆ (کڵێسا مەسیحییەکان)، لە دەرکردنی ئەم فەرمانەدا (ئۆگستۆس لیتیۆس)یش بەشداری و هاوکاری کرد، لە فەرمانەکەدا هاتبوو: "کاتێک کە ئێمە هەردووکمان (قوستەنتین ئۆگستۆس و لیتیۆس ئۆگستۆس) لە (میلان) یەکدیمان دی، بیرمان لەو کارانە کردەوە کە ئاشتییەکی بەرفراوان بۆ هەمووان بەدیبهێنێت. یەک لەو کارانە کە هەموومان بایەخی پێ دەدەین و بە خێر و سەلامەتی هەمووانیش تەواو دەبێت؛ بابەتی ئازادی بیروباوەڕە. بۆیە بڕیارماندا فەرمانێک دەربکەین کە پەیوەندی بە مەسیحییەکان و گشت تاقمە ئایینییەکانەوە هەیە، هەتا لە بیروباوەڕەکانیاندا سەربەست و ئازاد بن، بەمجۆرە ڕەزامەندی خواو هەموو هێزە ئاسمانییەکان بۆ خۆمان دەستەبەر دەکەین، لە هەمان کاتدا دەستەبەریتی سەرجەمی جەماوەری گەل دەکەین کە لە چوارچێوەی ئیمپڕاتۆرییەتەکەماندا دەژین، بەمچەشنە بڕیارماندا کە دەستنەهێنینە ڕێی هیچ کەسێک کە ئایینی مەسیحی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، هەموو کەسێکیش ئازادە لە هەڵبژاردنی هەر ئایینێک کە خۆی ئارەزووی بکات"[2].

---

(١) موسوعة الادیان (المسیحیة)، ص٣٢.

(٢) محمود سعید عمران: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص٤٣.

سەبارەت بەوەی کەی خودی (قوستەنتین) بووە بە (مەسیحی)؛ بۆچوونەکان جیاوازن لە یەکدی، هەندێک پێیانوایە کاتێک کە چووەتە سەر تەختی ئیمپڕاتۆری بووە بە (مەسیحی)، هەندێک دەڵێن لەو کاتەدا بووە کە خاچەکەی لە ئاسماندا بینیوە کە ئەم ڕووداوەیان لە ساڵی (٣١٢ ز)دا ڕوویداوە. هەندێکی دیکە پێیان وایە ئەو کاتە باوەڕی بە ئایینی (مەسیحی) هێنا کە لە سەرەمەرگدا بووە، بۆچوونێکی نزیکیش هەیە کە پێی وایە ئەو کاتە بوو کە (قوستەنتین) بایەخێکی یەکجار گەورەی بە ڕۆژی یەکشەممە دا، کە ئەمەش ئەو ڕۆژە بوو (مەسیحییەکان) تێیدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا[1]. بەڵام ئەو هۆکارانە چ بوون کە پاڵی بە (قوستەنتین)ەوەنا دان بە ئایینی مەسیحیدا بنێت، لەم بارەیەوە چەندین بیروڕایەکی جیاواز بوونیان هەیە کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. هەندێک لایان وایە کە (قوستەنتین) بە تێگەیشتنی خۆی باوەڕی بە ئایینی (مەسیحی) هێناوە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ناوبراو پەیوەندی و هەڵسوکەوتی بەرامبەر بە (مەسیحییەکان) باش بووە و ژمارەیەک کڵێسای دروستکردووە.

٢. هەڵسوکەوتی (قوستەنتین) بەرامبەر بە (بتپەرستەکان) کە بە بەراورد لەگەڵ مەسیحیەکاندا باش نەبووە.

٣. دەستەی سێیەم پێیان وایە کە باوەڕهێنانی (قوستەنتین) بە ئایینی (مەسیحی) هۆیەکی ڕامیاری هەبووە، بۆ نموونە (هنری گریگۆسی) مێژوونووس ئەوە دەخاتەڕوو کە (قوستەنتین) لە ماوەی فەرمانڕەواییەکەیدا دەیگوت: "هەرکەسێک ناوچەی خۆرهەڵاتی بوویت دەبێت (مەسیحی) بێت، یاخود بە لایەنی کەمەوە دۆستی (مەسیحی) بێت[2].

٤. کاتێک ئیمپڕاتۆر (قوستەنتین) پێشڕەوی کرد بۆ ئەورووپا لە شەڕی دژ بە (مارکسنتۆس) و لە کاتێکی زۆر دژوار و سەختی شەڕەکەدا؛ بەتایبەت دوای خۆرئاوا بوون، (قوستەنتین) ڕووناکییەکی لە ئاسمانەوە بینی لەسەر شێوەی خاچێک (صلیب) و لەژێرەوەی نووسرابوو (بە پشتیوانی خودا سەردەکەویت) لەو کاتەوە (قوستەنتین) خاچی کردە دروشمی شەرەکەی و توانی سەرکەوتن بەدەست

---

(١) محمد زاید عبدالله: مدخل الی تاریخ اوروبا، ص٣٩-٤٠.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ج١/ ص٢٧-٢٩.

بهێنێت، ئەمەش یەکێک بوو لەو هۆکارانەی کە پاڵینا بە (قوستەنتین)ەوە دان بە ئایینی مەسیحیدا بنێت[1].

٥. لە کۆتاییدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە (قوستەنتین) پیاوێکی زیرەک بووە و هاوسەنگی لەنێوان مەسیحی و بتپەرستەکاندا ڕاگرتبوو، بەڵام وردەوردە لە ژیانیدا پەیوەندی بەلای مەسیحییەتدا دەچوو، هەتا لە کۆتاییدا بوو بە مەسیحی[2].

## دووەم/ بنیاتنانی شاری قوستەنتینییە

لەپێناو چەسپاندنی تەختی ئیمپراتۆری؛ (قوستەنتین) بیری لە بنیاتنانی پایتەختێکی نوێ کردەوە لە شوێنێکی ستراتیجیدا، دەیویست لە جێگەیەکی وادا بێت کە ئەورووپا و ئاسیا پێکەوە گرێبدات، هەتا شێوازێکی ناوەندی هەبێت، لە لایەکەوە بۆ لێدان لە (بەربەرەکان) کە لە ناوچەی (دانووب)دا دەژیان، لە لایەکی دیکەشەوە بۆ لێدان لە (ساسانییەکان) کە لە خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکەیەوە بوون. لەو بارەیەوە شاری (نیکومیدیا) گەلێک باش هەڵکەوتبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو شارە یادگاریەکی (دیۆکلدیانۆس)ی بیردەهێنایەوە؛ لە کۆتاییدا گوندی (بێزەنتینی بیزاس)ی هەڵبژارد، کە لە جێگەکەیدا شاری (قوستەنتینییە)ی بنیاتنا[3].

## گرنگییەکانی شاری قوستەنتینیە

ئەم شارە بە شێوەیەکی سێگۆشەیی کەوتبووە سەر کەنداوی (بۆسفۆر)، بەشی خۆرهەڵاتی نزیک دەبوویەوە لە کەناراوەکانی ئاسیا، بەندەرەکەشی بەشی باکووری شارەکەی دەگرتەوە، دەریای (مەڕمەڕە) کەوتبووە لای باشووری شارەکەوە، بەری خۆرئاوای شارەکەش بریتیبوو لەو بنکە سێکوچکەییە کە بەرەو ئەورووپا دەچووەوە. بەندەرەکەی هەتا بڵێی گەورە و ڕێکوپێک و فراوان بوو، لەوێوە کەشتییەکان بەتاڵ دەکران و بار دەکرانەوە، دەکرا لە کاتی پێویستیدا هەموو جۆرە خۆئامادەکردنێکی ڕێکخراوی تێدا ئەنجام بدرێت دژ بە هێرشی کەشتییەکانی

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٣٩.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٤٤-٤٥.

(٣) موسوعة الاديان (المسيحية)، ص٥١.

دوژمــن و بەرپەرچــدانەوەیان، هاوشــێوەی شــاری (دومیــات) لە (میســر) کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا توندوتۆڵ و پتەوکرابوو دژ بە هێرش و پەلاماری دوژمن[1].

کەنـــداوی (بۆســـفۆر و دەردەنیـــل) وەک دوو دەروازەی مەزنـــی شـــاری (قوستەنتینییە) دەتوانرا لە کاتی هێرشی کەشتییەکانی دوژمن لەوێوە دابخرێن، یاخود بە ڕووی کەشتییە بازرگانییەکاندا بکرێنەوە، دەتوانرا بە ئاسانی سامانی سروشتی و بەرهەمە پیشەسازی و دەستییەکان لە دەریای ڕەشەوە بگوازرێتەوە بۆ (دەریای ناوەڕاست).

دروستکردنی شاری (قوستەنتینییە) ماوەی (٦) ساڵی خایاند، واتە ساڵی (٣٢٤ ز) دەستکرا بە دەستپێکی بنیاتنانەکە و کارەکانی بەردەوام بوون هەتا ساڵی (٣٣٠ ز) کە کۆتایی بە کارەکانی هات. شێوازی شارەکە بە جۆرێک بنیاتنرابوو کە خۆی لە (١٢) گەڕەک دەبینییەوە و بە شوورایەک تەوقدرابوو، دوو گەڕەکیش لە دەرەوەی شار بۆ خاوەن پیشەوەرەکان دروستکرابوو. بەمجۆرە لە ڕێکەوتی (٣٣٠/٤/١١ ز) بە بۆنەی بنیاتنانی شارەکەوە ئاهەنگێکی تایبەتیان گێڕا، لە ئاهەنگەکەدا پەیکەرێکی (قوستەنتین) کە لە دار دروستکرابوو و چوارچێوەکەی بە زێڕ ڕازێندرابوویەوە؛ لەنــاو کۆشــکەکەیدا دانــرا و بــۆ مــاوەی (٤٠) ڕۆژ ئاهەنگیــان گێــڕا، هەر بەو بۆنەیەشەوە بۆ ماوەیەکی زۆر گۆشت و زەیت و خواردنەوە بەخۆڕایی بوو؛ هەتا خەڵکی هانبدەن ڕوو بکەنە ئەو شارە و ئاوەدانی بکەنەوە[2].

## جێنشینەکانی قوستەنتین (٣٣٧–٣٧٨ ز)

(قوستەنتینی مەزن) لە ساڵی (٣٣٧ ز) کۆچی دوایی کرد، پاش خۆی کوڕەکانی شوێنیان گرتەوە کە ئەمانە بوون:

١. قوستەنتینی دووەم.
٢. کەستەنتیوس.
٣. کۆنستانس.

---

(١) سعید عبدالفتاح عاشور: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص٢٦.
(٢) محمود سعید عمران: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص٤٧-٤٨.

کوڕەکانی هەر بە سروشتی لەنێوان خۆیاندا ناکۆک و دژبەری یەکدی بوون[(١)].

دوای مردنی (قوستەنتیوس) و (کۆنستانس) لە ساڵی (٣٥٠ ز)؛ دەسەڵات بۆ (قوستەنتینی دووەم) مایەوە، (قوستەنتینی دووەم) دوای سەرکەوتنی بەسەر (ماکنینتیوس) لە ساڵی (٣٥١ ز)دا؛ لەو ساڵەوە هەتا کۆتایی ژیانی لە (٣٦١ ز) بەبێ هیچ ڕکابەرییەک فەرمانڕەوایی کرد. لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا مەترسی دەرەکی لەسەر ئیمپڕاتۆرییەتەکە هەر مابوو، لە خۆرهەڵاتەوە مەترسی ساسانییەکان و لە خۆرئاواشەوە مەترسی هۆزە (جەرمانییەکان) و بەتایبەتی بە هۆی پەیدابوونی هۆزەکانی (هۆن)ەوە گەشتبووە لوتکە. دوای مردنی (قوستەنتینی دووەم)؛ (جولیان) بەبێ هیچ خوێنڕشتن و ڕووبەڕووبوونەوەیەک چووە سەر تەختی ئیمپڕاتۆری[(٢)].

## جولیان (٣٦١ – ٣٦٣ز)

سەرەکیترین کاری (جولیان) لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتییەکەیدا؛ بایەخدانی بوو بە کۆمەڵگەکەی، وەک نەریتی خۆی کاتی ڕابواردنی زستانەی لە (پاریس) بەسەر دەبرد، زیاتر سەرقاڵی بەڕێوەبردنی دامودەزگا کارگێڕییەکان بوو. لە سەردەمی ئەم ئیمپڕاتۆرەدا بارودۆخی بازرگانی و پیشەسازی لە سایەی بەڕێوەبەرایەتییەکی دەستووری و یاساییدا گەشەی کرد و پەرەیسەند، دامودەزگاکانیشی بەو کەسانە پڕ کردبوویەوە کە شارەزا و پسپۆڕ و لێهاتوو بوون، لە ڕووی ئاینییەوە بەوە ناوی دەرکردبوو کە پەیوەندی بە بتپەرستەکانەوە هەبووە، لە کۆتاییشدا گومانەکان ڕاست دەرچوون؛ چونکە ئەو کاتێک چووە سەر تەختی ئیمپڕاتۆری، بە ئاشکرا ئەو مەبەستەی دەگەیاند و فەرمانێکی دەرکرد کە پەرستگا (بتپەرستییەکان) بکرێنەوە، ئەمە ئومێدی بتپەرستەکانی ژیاندەوە و هەموو مافە ئایینی و ڕامیارییەکانیان دەستکەوتەوە، هاوکات (جولیان) بەوە ناسراوە کە لە ئایینی (مەسیحی) هەڵگەڕاوەتەوە. (جولیان) بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ڕق و قینی (مەسیحییەکان)

---

(١) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٣١.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٣٠-٣١.

نەبێتەوە؛ هەموویانی لە کۆشکی خۆی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن کە دەیەوێت میللەتەکەی لە ئاشتی و ئارامیدا بژیت، لەو چوارچێوەیەشدا هەموو کەسێک ئازادە لە هەڵبژاردنی ئەو ئایینەی کە باوەڕی پێیەتی و ئارامی پێ دەبەخشێت، بەڵام لە کۆتاییدا مەسیحییەکانی لە کاروبارەکانی دەوڵەت دوورخستەوە و لە جێی ئەوان بتپەرستەکانی دانا[1].

## جۆڤیان (٣٦٣-٣٦٤ ز)

پێچەوانەی (جولیان)؛ زۆرینەی خەڵک مەسیحییەتیان لا پەسەند بوو وەک لە (بتپەرستی)، ڕامیاری (جولیان) نەک تەنها لەم ڕووەوە سەرکەوتوو نەبوو؛ بەڵکوو لە ڕووی کاروباری سوپاییشەوە شکستی هێنا، پاش مردنی (جولیان) لە ساڵی (٣٦٣ ز)دا؛ سوپای ئیمپراتۆری سەرکردەیەکی مەسیحیان هەڵبژارد بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی وڵات کە ئەویش (جوڤیان) بوو، (جوڤیان) بەپێی ڕێککەوتننامەیەکی سەرشۆڕانە کە مۆری کردبوو؛ دەبوو لە ماوەی (٣٠) ساڵدا واز لە چوار ویلایەتەکە بهێنێت، لە هەمان کاتدا سازشی لە سەروەری ئیمپڕاتۆرییەتیەکەی بەسەر (ئەرمینیا)وە کرد، بەڵام ماوەی دەسەڵاتداریتییەکەی زۆری نەخایاند و لە ساڵی (٣٦٤ز)دا کۆچی دوایی کرد[2].

## ڤالینز (٣٦٤ -٣٧٨ ز)

دوای مردنی (جۆڤیان)، فەرماندەکانی سوپا داوایان لە (ڤالینز) کرد، کە شوێنی (جۆڤیان) بگرێتەوە، (ڤالینتیان)ی برای (ڤالینز) کە فەرمانڕەوای ڕۆما بوو؛ وای بە باش دەزانی کە (ڤالینز) ببێتە ئیمپڕاتۆری (قوستەنتینییە). (ڤالینز) سەرەڕای ئەوەی کە (مەسیحی) بوو؛ بە هۆی ئەوەی لەسەر ڕێبازی (ئاریۆسی) بوو خەڵک ڕقوکینەیان هەبوو بەرامبەری. لە سەردەمی ئەمیشدا هێرش و پەلاماری دوژمنەکانی ئیمپڕاتۆرییەت لەسەر سنورەکان هەر لە بەردەوامدا بوو، لە ئەنجامدا بەربەرییەکان خۆیان لەناو ئیمپراتۆرییەتەکەدا چەسپاند، پەیوەندی نێوان خەڵک و

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٢٠-٢٣.

(٢) سعيد عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٢٣.

کاربەدەستەکان هەر بە خراپی مایەوە، لەم بارودۆخەدا هۆزە (گووتەکان) بەرەو (قوستەنتینییە) پەلیانهاویشت[1]. (ڤالینز) لە ساڵی (٣٧٨ ز)دا بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ یارمەتییەکی خۆرئاوا بکات؛ بە خۆی و لەشکرەکەیەوە ڕۆیشت هەتا بەرەنگاری (گووتەکان) ببێتەوە، ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە کە لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا بە جەنگی (ئەدرنە) ناسراوە و لە ئەنجامدا لەشکرەکەی (ڤالینز) شکستی هێنا و خودی ئیمپڕاتۆریش لە جەنگەکەدا کوژرا! بە کوژرانی (ڤالینز) بنەماڵەیەکی دیکە چوونە سەر تەخت و بوونە فەرمانڕەوا کە ئەوانیش بنەماڵەی (سیۆدۆسیۆس) بوون[2].

---

(١) محمد زايد عبدالله: مدخل الى التاريخ اوروبا العصور الوسطى الباكرة، ص٤٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥١.

# بەشی چوارەم

- ئایینی مەسیحی
- دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی
- هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی
- هەڵوێستی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانی بەرامبەر بە ئایینی مەسیحی
- داننان بە ئایینی مەسیحیدا (فەرمانی میلان)
- بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ماوەی هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی زایینیدا
- (الهرطقة) لادەرەکان
- دەرکەوتن و گەشەکردنی پاپاوییەت
- بەرپرسیارییەکانی پاپا
- پەیوەندییەکانی پاپاوییەت
- کۆمەڵگای کڵێسایی
- ناکۆکی نێوان پاپا و بیزەنتە
- ئایینی ئیسلام

## دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی

ئایینی (مەسیحی) یەکێکە لەو ئایینە ئاسمانیانەی کە لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویدا لە ناوچەکانی (فەڵەستین) و بەتایبەت لە ناوچە کەنارییەکانی (شام)دا دەرکەوت و زۆر بەخێرایی بە هەرێمە جیاوازەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا بڵاوبووەوە. ئەم ئایینە بڵاوبوونەوەکەی شێوەیەکی سەرسوورهێنەری هەبوو، موژدەبەخش و پەیامبەرەکەی (عیسای کوڕی مەریەم) بوو (د. خ)، پەیامەکەشی بریتیبوو لە پەرتووکی (ئینجیل) کە خودا ناردبووی بۆ ڕێنوێنیکردنی ئەو کەسانەی کە باوەڕ بەم ئایینە دەهێنن. (عیسای کوڕی مەریەم) (د. خ) لە سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی زایینیدا ژیاوە و بانگەشەی بۆ ئایینەکەی دەکرد و درێغی لە بڵاوکردنەوەیدا نەکرد. لەپاش کۆچکردنی خۆیشی لە ساڵی (٣٣ ز)دا[١] بڵاوکردنەوەی ئایینەکە کەوتە ئەستۆی هاوەڵەکانی کە (عیسا) (د. خ) خۆی پەروەردەی کردبوون و بنەماکانی مەسیحییەتی تێگەیاندبوون، بەو شێوەیە سەرەتای نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینی بە سەرەتای دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئایینەکان لە مێژوودا دەناسرێت، دوای سێ سەدە لە دەرکەوتنی؛ ئەم ئایینە بووە ئایینێکی شێوازبەندی فەرمی لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا، دواتریش هێندە بڵاوبوویەوە کە بووە تاکە ئایینی دانپێدانراو لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا[٢].

### هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی

#### یەکەم/ سروشتی پێکهاتەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی

هەرێم و بەشە جیاوازەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی بە تۆڕێکی بەهێزی ڕێگاوبانەکان بە یەکدییەوە بەسترابوونەوە و ئاسایش و ئارامی باڵی بەسەردا کێشابوون، ئەمەش هۆکارێکی باش بوو بۆ گواستنەوەی بیروباوەڕ و هزرەکان بەخێرایی و بەئاسانی لەناو هەرێمەکانی ئیمپراتۆریدا، هەروەکوو چۆن یارمەتیدەرێکی باشی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و جموجووڵە سەربازییەکان بوو[٣].

---

(١) روبيرت ر. بالمر: تاريخ العالم الحديث, ت: محمود حسين الامين، الموصل، ١٩٩٤ م، ج١/ ص٢٩.

(٢) فلدنياند مشيفل: الحضارة الاوروبية في القرون الوسطى وعصر النهضة، ت: منير البعلبكي، ط١، بيروت، ١٩٥٢، ص٢٣.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٣٥.

**دووەم/ سروشتی مژدەبەخشی ئایینی مەسیحی**

سروشـتی مژدەبەخشـی ئـایینی مەسـیحی یـارمەتی خێـرا بڵاوبـوونەوەی ئایینەکەیـدا، لە سـەرەتادا چەمکە مەسـیحییەکان لەنـاو هەژار و بەشـخوراوەکانی نیشتەجێی شارەکاندا بڵاوبوویەوە، پاشان بەناو تێکڕای چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵدا بڵاوبوویەوە[1].

مەسیحییە پێشـەنگەکان هەموویـان مـژدەبەخش بـوون؛ لە هەمـوو جموجـووڵ و کۆچوڕەوێکیاندا بانگەشـەیان بۆ پەیامەکەیـان دەکرد، بەلای مرۆڤێکی مەسـیحییەوە لەوە خۆشتر نەبوو کە مرۆڤێکی تازە بباتە سەر ئایینی (مەسیحی)، ئەوان بە بوێری و بەبێ تـرس مـوژدەی ئایینەکەیـان بە خەڵکی دەگەیاند، گەرچـی لە ئەنجـامی ئەم کارەیانـدا ڕووبەڕووی ئەشـکەنجە و چەوسـاندنەوەی زۆر و ترسـناک دەبـوونەوە؛ بەڵام ڕێگـــری و ئەشـــکەنجە نەک نەبـــووە هـــۆی کۆتاییهێنـــان بەم ئـــایینە و دەستبەرداربوونی شوێنکەوتووەکانی، بەڵکوو دەستەیەک لە مەسیحییە پێشـەنگەکان کە لە خوێندکارەکانی (مەسیح) پێکهاتبوون و پێیان دەگوترا نێردراو و حەوارییەکان (الرسل و الحواريون)[2]، ئەم نێردراوانە وازیان لە کاروباری دونیایی هێنـا و خۆیـان بـۆ بڵاوکـردنەوەی بیروبـاوەڕە نوێیەکەیـان یەکلایـی کـردەوە هەر بـۆیە گشـت ئەو سەرکەوتنانەی کە دواتر مەسیحییەکان بەدەستیانهێنا؛ بۆ ئەم دەستەیە دەگەڕێتەوە. پێشـــەنگی ئەو نێـــردراوانەش (قەشـــە پـــۆڵس) بـــوو کە ڕۆشـــنبیرێکی (جـــوو) و هاوڵاتییەکی ڕۆمانی خەڵکی (تەڕسووس) بوو، (پۆڵس) لە سەرەتادا دوژمنـی ئایینی (مەسیحی) بوو؛ بەڵام لە دواییدا باوەڕی بە ئایینەکە هێنا[3].

(پـۆڵس) ڕۆشـنبیرییەکی بەرز و شـارەزاییەکی زۆر باشـی لەبـارەی وانەکـان و کەلتـووری (جـوو) و فەلسـەفەی یۆنـانی و هەمـوو بیـروڕا و ڕەوتە بڵاوەکـانی سـەردەمەکەی هەبـوو، هەروەهـا زانسـتێکی باشـی دەربـارەی ئـایینە خۆرهەڵاتییەکانیش هەبوو. پاش باوەڕهێنانیشی؛ خۆی بۆ بانگەشەکردن و گەیاندنی ئایینی (مەسیحی) بۆ خەڵکی یەکلایی کردەوە، لە سەرەتادا مژدە و ئامۆژگارییەکانی بەتەنها بۆ نەتەوەکەی خۆی بوو، لەگەڵ ئەوەشـدا بـاوەڕی ڕەهـای بەوە هەبـوو کە

---

(١) روبرت ر.بالمر: تاريخ العالم الحديث، ج١/ ص٣٠.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٦٣.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٢٧.

ئـایینی (مەسـیحی) ئـایینی تێکڕای گەل و نەتەوە و نەژادە جیاوازەکـانە، (پۆڵس) بە هەمـوو نـاوچە جیاوازەکـانی ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمـانی دەگەڕا و لە هەر ناوچەیەکـدا کومەڵێک خوێندکاری لێ کۆدەبـووەوە و بەڵێنـی هەسـتان بە ئەرکی مـوژدەبەری و بانگەشەکردن بۆ لای ئایینە نوێیەکەی لێوەردەگرتن[1].

## سێیەم/ پەرەسەندنە هزری و ئایینییەکان

لەپـــاڵ ڕۆڵ و تێکۆشـــانی مەســـیحییە پێشـــەنگەکان و قوربانیـــدانەکانیان؛ پەرەســـەندنە هـــزری و ئایینییەکـــانی کـــاتی دەرکەوتنـــی ئـــایینی (مەســـیحی) کە ئیمپراتـــۆرییەتی ڕۆمـــانی بە خـــۆیەوە دی، یارمەتیـــدەرێکی بـــاش و گونجـــاوی سەرکەوتنی ئایینی (مەسیحی) بوون، دەستکەوتە ڕۆشنبیری و هزرییە مەزنەکـانی یۆنان بوونە هۆی ئەوەی بتپەرستی (الوثنیة)ی یۆنانی و ڕۆمانییەکان پشکێکی زۆر لە زیندوویەتی و کارایی خۆیـان لەدەست بدەن. هەرچەنـدە (ئۆگسـتس) هەوڵیـدا کە سەرلەنوێ شوێنی خواوەندە ڕۆمانییەکان بەرز بکاتەوە؛ بەڵام سـەرکەوتوو نەبـوو، تەنها لە جەختکردنەوەی لەسـەر پەرستنی ئیمپراتۆر نەبێت؛ کە ئەمەش لە ڕاسـتیدا ئـایینی شـێوازبەندی دەوڵەت بـوو، پەرسـتنی ئیمپراتـۆریش زیـاتر گومـانی لای ڕۆشنبیران دروستکرد؛ چونکە لەگەڵ ژیری و ژیربێژیدا نەدەهاتەوەیەک[2].

بێگومـان فەلسـەفەی ژیـری هەرگیـز ناتوانێـت شـوێنی بیروبـاوەڕی ئـایینی بگرێتەوە، هەرگیـز ناتوانێت حەزە سـۆزئامێز و ڕەوانییەکـانی مرۆڤێکی سـادە تێر بکـات، بەکـورتی بۆشـاییەکی ڕەوانـی لە کەتواریانـدا هەبـوو، ڕەنـگە هەر ئەمەش بتوانێت ڕاڤەی بڵاوبوونەوەی ئایینە سۆفیگەرییەکان بکات. دروشم و فێرکارییەکانی ئەم ئایینانەش لە پەنهانی و نادیاری و خەیاڵدا ڕۆچووبوون و ئـاوێزانی ئەفسـانە و خورافات ببوون، لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو گێتی یۆنانی و ڕۆمانی تەوژمیـان هێنـابوو، ئـایینە هێنراوەکـان بەوە جیادەکرانەوە کە لەگەڵ سـۆزدا یەکـانگیر بـوون، ئەوانـیش ڕوانـگەی خەیـاڵ و پەنهانیـان لە لایەک و ئـاڵۆزی دروشـم و ڕێوڕەسـمەکانیان لە لایەکی دیکەوە[3]. کاتێک ئـایینی مەسـیحی دەرکەوت و بڵاوبـووەوە؛ ڕۆشـنبیرەکانی

---

(١) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٤٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٣٦.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢.

کۆمەڵگا حەزەکانی خۆیان لە ڕێبازە فەلسەفییە بڵاوەکاندا دەبینینەوە، بەڵام تێکڕای خەڵکی تێرکردنی ئەو حەزانەی خۆیان لە ئایینە خۆرهەڵاتییە سۆفیگەرییەکاندا دەبینییەوە، ئەفلاتوونێتی نوێ ویستی ڕۆڵی هێڵێکی نزیکخەرەوە و گونجاندن ببینێت لەنێوان ئەم دوو ئاڕاستە جیاوازەدا، بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بۆیە کاتێک کە ئایینی مەسیحی دەرکەوت؛ گێتی خاڵی بوو لە ئایینێکی ڕاست و گشتگیر و بۆشاییەکی گەورەی ڕەوانی هەبوو کە (مەسیحییەت) ئەرکی پڕکردنەوەی گرتەئەستۆ[1].

ئایینی (مەسیحی) زۆر شتی خستەڕوو کە پێشتر ئایینە خۆرهەڵاتییەکان خستبوویانەتە بەر باس، ئەم ئایینە چەند مەشخەڵێکی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو کە لە برایەتی نێوان مرۆڤەکان لەژێر چاودێری باوکایەتی خوداییدا (الابوة الالهية)؛ فێرکارییە مەسیحییەکان چەمکێکی نوێی بە خۆشەویستی و بەخشین و چاکەکردن بەخشی، تەنانەت ئەم ئایینە بۆ خستنەڕووی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی و کەتواری بۆ ژیانی دونیا و بەختەوەری دواڕۆژ؛ بەرەو دوورترین ماوە هەنگاوی نابوو.[2]!

(قەشە پۆڵس) بناغەی بۆ (بیری ڕامیاری مەسیحییەتی) دان، ئەویش ئەو کاتە بوو کە گوتی: "هیچ دەسەڵاتێک نییە جگە لە دەسەڵاتی خودا و هەر خۆی بەخشیویتی، هەرکەسێکیش بەرامبەر بەو دەسەڵاتە ڕابووەستێت؛ ئەوا بەرامبەر بە خودا ڕاوەستاوە و سزای ئەو کەسانەش تێداچوون و دۆزەخە". هەر بۆیە مەسیحییەکان هەرگیز بەرامبەر بە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی ڕانەدەوەستان و ململانێیان لەگەڵدا نەدەکرد، چونکە ئەوان پێیان وا بوو کە شوێنی ئەوان لەم گێتییەدا نییە؛ بەڵکوو ئەوان میوانن و ڕێبوارێکی ژینی دوایین، لەبەرئەوە دەسەڵاتدارێتی ڕۆمانی هەرچەندە هەندێک کات بەتوندی لەگەڵیاندا ڕەفتاری دەکرد؛ بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵیاندا لێبوردە بوو، ئەو ئیمپراتۆرییەتە هیچ هەوڵێکی جیددی نەدا بۆ ئەوەی لە ڕیشەوە هەڵیانبکێشێت و هەڵمەتی چەوساندنەوەی گشتگیر و بەهێزی لە بەرامبەردا بەکارنەهێنان، تەنها لە بارودۆخە ئاڵۆز و شێواوەکانی سەدەی سێیەمی زاییندا نەبێت.[3]!

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٦٥.

(٢) روبرت ر.بالمر: تاريخ العالم الحديث، ص٢١.

(٣) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٦٨.

هەرچەنـدە مەسـیحییەت هێرشـی نەدەکـردە سـەر دەوڵەت و دژ بە دەسـەڵات ڕانەدەوەستا؛ بەڵام ملکەچی دەوڵەتیش نەدەبوو، مەسیحییەکان سووربوون لەسـەر ئەوەی سـەربەخۆبوونی خۆیـان بپـارێزن؛ بەتـایبەت لە بـواری پەرسـتن و بیروباوەڕیاندا و ڕازی نەدەبوون بە هیچ شێوەیەک دەست بخرێتە کاروباریانەوە، بەتـایبەت دڵسـۆزبوون بەرامبەر بەو بنەمـایەی کە دەڵێـت: "ئەوەی هـی قەیسـەرە بیدەن بە قەیسەر و ئەوەیش هی خودایە بیدەن بە خودا"[1]. لەبەرئەوە سووربوون لەسـەر ڕەتکـردنەوەی پەرسـتنی ئیمپراتـۆر کە دەسـەڵاتداریتی ڕۆمـانی وەک دیـاردەیەک لە دیاردەکـانی هەواداری ڕامیـاری و (مەسـیحییەکان) بە کـوفر و بێباوەڕییـان دادەنـا، هەروەهـا (مەسیحییەکان) بە شێوەیەکی ڕەهـا دەستێوەردانی دەسـەڵاتیان لە کاروبـارە پەرستشـییەکان ڕەتـدەکردەوە کە ئەمەش زۆر کێشـە و گیروگرفتی بۆ دروست دەکردن[2].

## هەڵوێستی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانی بەرامبەر بە ئایینی مەسیحی

ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمـانی لەگەڵ ئەوەی ڕامیـارییەکی میـانەڕەوانەی بەرامـبەر بە ئـایینە جیاوازەکـان پەیـڕەو دەکـرد؛ بەڵام زۆر بەتونـدی ڕووبەڕووی ئـایینی مەسیحی بووەوە و بە هەموو شێوەیەک ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی دەکرد، چەند هۆکارێکی گرنگ لە پشت ئەم هەڵوێستە دژبەرییەی ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمـانییەوە بوو، کە بریتی بوون لە:

مەسـیحیە پێشـەنگەکان کە زۆرینەیـان لە شـارەکاندا نیشـتەجێ ببـوون؛ بە شـێوەیەکی گۆشـەگیر و دوور لە خەڵکـی ژیانیـان بەسـەر دەبـرد، ئەمەش زیـاتر گومـانی لەسـەر دروسـت دەکـردن و وای لە دەسـەڵاتدارێتی ڕۆمـانی کـرد لێیـان بترسێت و دواتریش بە پیلانگێڕان دژ بە ئاسایشی وڵات تۆمەتباریان بکات، هاوکات زۆریـنەی مەسـیحییە پێشـەنگەکان لە لایەکەوە لەو گریکـانە بـوون کە لە شـارە ڕۆمانییەکاندا ژیانیان بەسەردەبرد و لە لایەکی دیکەشەوە لە کۆیلە و چەوساوەکان

---

(٣) ئینجیلی مەتتا: بەشی ٢٢: برگەی ٢١.

(٢) روبرت ر. بالمر: تاريخ العالم الحديث، ص٣٢.

پێکهـــاتبوون، ئەمەش جێگـــای گومـــان و نـــاڕەزایی هـــاولاَتییە ڕۆمانییەکـــان و دەسەلاَتداریێتی ڕۆمانی بوو کە ئەم چین و توێژە جیاوازانەی تێدا کۆببوونەوە[١].

مەسیحییەکان پەرستنی ئیمپڕاتۆریان ڕەتدەکردەوە؛ چونکە ئەو پەرستنەیان بە جۆرێک لە (بتپەرستی) دەزانی و هەرگیز ئامادەنەبوون سازشی لەسەر بکەن، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پەرستنی ئیمپڕاتۆر ئەرکێکی بنەڕەتی بوو سەبارەت بە ئایینی دێرینـی ڕۆمـانی و یەکێـک بـوو لە پایەکـانی فەرمـانڕەوایی و ڕەگەزێـک بـوو لە ڕەگەزەکانی یەکێتی ئیمپڕاتۆرییەتەکە و لە هەمان کاتیشدا دیاردەیەکی پەیوەندارێتی ئایینەکە بوو[٢].

کاتێک دەسەلاَتدارێتی ڕۆمانی ئەم هەلَوێستە دژبەرییەی مەسیحییەتی بینی کە دژ بە پەرستنی ئیمپڕاتـۆر ڕادەوەستێت، ئەمەی بە هەڕەشـەیەکی ترسـناک دادەنـا؛ نەک بـۆ دەسـەلاَت و پـایەی بـالاَی ئیمپڕاتـۆر بەتەنهـا؛ بەلَکـوو بـۆ ئیمپڕاتـۆرێتی و قەوارەی ئیمپڕاتـۆرییەتیش، بۆیە لە دیدی دەسـەلاَتداراندا؛ ئەنجامـدەری تـاوانی لەم شـێوەیە شایسـتەی هەمـوو جـۆرە سـزادانێک بـوو. ڕەنـگە بۆچـوونی مێژوونوسـی ڕۆمانی (تاکیتووس) باشترین دەربڕین بێت کە تێڕوانینی ڕۆمانییەکان لەم ڕووەوە دەخـاتەڕوو، هەروەک دەلَێت: "مەسـیحییەکان بە دوژمنـایەتیکردنی ڕەگەزی مرۆیـی تۆمەتبـارکران، بەوەی کە هەمـوو جـۆرە گومانێکیـان بەرامـبەر بە سـەرجەم ئەو بەهایـانەی کە کۆمەلَگـای ژیـاری لەسـەری دادەمەزرێـت دروسـت دەکـرد و بەرژەوەنـدی ئایینیـان لەسـەر هەمـوو بەرژەوەنـدییەکانی کۆمەلَگـا و دەولَەتەوە دادەنا"[٣].

ئەو هۆکـارانەی کە باسـمان کـرد؛ پالَیـان بە دەولَەتـی ڕۆمانییەوەنـا بـۆ دژایەتیکردنـی ئـایینی (مەسـیحی)، ئەم دژایەتیـیەش لە شـێوەی چەوسـاندنەوە و ئەشـکەنجەدان و تەنـانەت کوشتنیشـدا دەردەکەوت، مەسـیحییەکان لە گێـڕانەوەی ڕووداو و ئـازار و ئەشـکەنجەکانی ئەم قۆنـاغە زیـادەڕەوی دەکەن، بەلاَم ئەوەی گومـانی تێـدا نیـیە ئەوەیە کە ڕامیـاری دوژمنکاریـانەی ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی بەرامـبەر بە ئـایینی (مەسـیحی) نەک هەر نەیتـوانی لە ڕیشـەوە مەسـیحییەت

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٣٣.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبا، ج١/ ص٦٤.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا، ص٢٤.

هەڵبکێشـێت؛ بەڵکـوو دەستەوسـتانیش بـوو لەبەردەم بڵاوبـوونەوەی ئەو ئـایینە نـوێیەدا، ئەم هەڵوێسـتە دژ بە مەسـیحییەتییە وای لە مەسـیحییەکان کـرد کە بە شێوەیەکی نهێنـی و دوور لە چاوی دەسـەڵات پەیوەندی بە بۆنە ئایینییەکانیانەوە بکەن، گەر ئاشکراش بوونایە؛ ئەوا ڕووبەڕووی گەورەترین شێوەی ئەشکەنجەدان دەبـوونەوە، ئەوەی مـایەی تێڕامـانە ئەوەیە کە مەسـیحییەکان زۆر جەربەزانە ڕووبەڕووی ئەم ڕامیـارییە توندوتیژەی دەسـەڵات دەبوونەوە و چەوساندنەوە و ئەشـکەنجەدان وای لـێ نەدەکـردن کە لە بیروباوەڕەکەیـان پاشـگەز ببـنەوە، چەوساندنەوەی مەسیحییەکان لەسەردەستی چەند ئیمپڕاتۆرێکی ستەمکار کە بە ستەم و زۆرداری ناسرابوون وەک سەردەمی (نیرون ٣٧-٦٨ ز) کە لەم ماوەیەدا دژایەتیکردنیـان گەیشـتە ترۆپـک، هەروەهـا لە سـەردەمی (دیۆکلدیانۆس ٢٤-٣١١ز)یشدا بە هەمان جۆر بوو[1]. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ئەم چەوساندنەوەیە لەسەر دەستی ئەو ئیمپڕاتۆرانەشدا ڕوویداوە کە بە دادپەروەر و ژیـر ناوبانگیـان دەرکردبـوو؛ وەک (دیۆکلـدیانۆس) کە بە هـۆی ئەوەوە هەر بەردەوامی هەبوو[2].

جێی ئاماژەیە کە ئیمپڕاتۆرەکان لەچاو فەرمانڕەوا ناوچەییەکاندا نەرمتر بوون؛ چونکە ئەوان (واتە فەرمانڕەوا ناوچەییەکان) زیاتر حەزیان لە توندوتیژی بوو بۆ وەڵامدانەوەی فشاری ڕای گشتی دژ بە مەسیحییەت دەکرد، دەتوانین ڕامیاری فەرمانڕەوایەتی ڕۆمـانی بەرامبەر بە مەسیحییەت بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ لەو نامەیەدا دیاری بکەین کە (تراجان) بۆ فەرمانڕەوای یەکێک لە هەرێمەکانی بندەستی ناردی کە دەڵێت: "لەبەرئەوەی مەسیحییەکان بە ئاشکرا بیروباوەڕ و پەرستشیان دەرنابڕن؛ وازیان لێ بهێنن"[3].

## داننان بە ئایینی مەسیحیدا (فەرمانی میلان ٣١٣ ز)

لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زایینیدا؛ سەرەڕای ئەوەی ڕامیارییەکی توند و سـەرکوتکارانەی فەرمـانڕەوایەتی ڕۆمـانی بەرامـبەر بە ئـایینی مەسـیحی و

---

(١) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا، ص٣٢-٣٤.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٥.

(٣) محمد زايد عبدالله: العصور الوسطى الباكرة، ص٣٦.

شـــوێنکەوتووەکانی گیرابـــووەبەر، ژمـــارەی مەســـیحییەکان ڕۆژلەدوایـــڕۆژ لە زیادبووندا بوون، ئەم بارودۆخە خوازیاری پەیوەندیەکی نوێی نێوان ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمـــانی و مەســـیحییەت بـــوو، ژمـــارەی مەســـیحییەکان هێنـــدە زیـــادیکردبوو؛ ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی ناچار کرد ڕامیاری خۆی بەرامبەریان بگۆڕێت و مامەڵەیان لەگەڵ بکات. ئیمپڕاتۆر (قوستەنتین) درکی بەو ڕاستیە کردبوو؛ هەر بۆیە لە ساڵی (٣١٣ ز)دا بەپێی فەرمـانی (مـیلان) ئەم هەنگـاوە بوێرانەیەینـا، بەپێـی ئەم فەرمـانە ئایینی (مەسیحی) بووە ئایینێکی دانپێدانراو لە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا[١].

هەتـا ئێسـتا بەتەواوی هۆکـاری ئەم هەنگـاوەی ئیمپڕاتـۆر (قوسـتەنتین) ڕوون نەبووەتەوە، بەپێی گێڕانەوەی مەسیحییە پێشینەکان کاتێک ئیمپڕاتۆر لە جەنگی دژ بە (ماکســنتووس) لە ئەورووپـا لە پێشـڕەویکردندا بـوو، لە سـاتە ناهەموارەکـانی جەنگدا و لەپاش ئاوابوونی خـۆر؛ ڕووناکییەکی لە ئاسماندا بەدیکرد و لە ناویدا خاچێـک و لە ژێریشـیدا ئەم دەســتەواژەیە نووســرابوو: "بە کــۆمەکی خــودا سـەردەکەوین"، هەر لەو سـاتەدا (قوسـتەنتین) خـاچی کـردە دروشـمی خـۆی و لە جەنگەکەشــدا ســەرکەوتنی بەدەســتهێنا، ئەمەش پاڵپێوەنـــا بـــۆ ئەوەی ئـــایینی (مەســیحی) بە ڕەســمی بناســێت کە پێشــتر لە بەشــی ســێیەم ئاماژەمــان بــۆ ڕاوبۆچوونەکان کردووە[٢].

لەگەڵ ئەوەی (قوستەنتین) لە کۆتایی ژیانیدا بوو بە (مەسیحی)؛ بەڵام هەرگیز دەسبەرداری چەمکی (پەرستنی ئیمپڕاتۆر) نەبوو! ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە (قوســتەنتین) بە ڕەچــاوکردنی بــارودۆخی ڕامیــاری و بە مەبەســتی زاڵبــوون بەسەر یەکێک لە هۆکارەکانی پشێوی و دابەشبوونی نـاو ئیمپڕاتۆرییەتەکەی؛ ئەم هەنگاوەیناوە و بۆ ئەم بڕیارە بەتەنها بابەتە ئایینییەکانی ڕەچاو نەکردووە، بەڵام هەمـوو ئەوەی باسـمانکرد لە گرنگی ئەو ڕاستییە کەمناکەنەوە کە ئەم هەنگـاوەی (قوستەنتین) گرنگییەکی گەورەی هەبوو لەسەر داهاتووی مەسیحییەت و تەنانەت داهاتووی ئەورووپاش[٣].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا فى العصور الوسطى، ص٣٢.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا فى العصور الوسطى، ص ٤٧.

(٣) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٦.

لە سەردەمی ئیمپڕاتۆر (جولیانی هەڵگەڕاوە ٣٦١-٣٦٣ ز) مەسیحییەت تووشی شکستێکی کاتی هات، بەڵام ئەم شکستە نەک هەر نەبووە هۆی لەناوچوونی ئایینەکە و دەستبەرداربوونی شوێنکەوتووەکانی؛ بەڵکوو ئایینەکەی بەهێزتر کرد، بە جۆرێک لە سەردەمی (سیۆدۆسیۆس) و لە ساڵی (٣٩٥ ز)دا ئایینی (مەسیحی) بەرزکرایەوە بۆ ئاستی ئایینە شێوازبەندییەکانی دەوڵەت، لەپاش ئەم قۆناغە بارودۆخەکە پێچەوانە بووەوە؛ چونکە لێرەوە فەرمانڕەوایی ڕۆمانی دەستی کرد بە چەوساندنەوەی پەیڕەوانی ئایینەکانی دیکە و ئیمپڕاتۆرییەت لێرەوە بوو بە ئیمپڕاتۆرییەتێکی (مەسیحی)[١].

## بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە سەدەی (چوارەم و پێنجەمی) زایینیدا

لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمدا؛ سەرەڕای شێوازی ڕامیاری فەرمانڕەوایی ڕۆمانی بەرامبەر بە ئایینی مەسیحی، کڵێسای ڕۆمانی لە سەرجەم بەش و ناوچەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا دەستی بە چالاکی کرد و سەرکەوتوو بوو لە دامەزراندنی دامودەزگای چەسپاو و جێگیر؛ کە لە سیستمی (کهونووتی) و پاپا و ئۆسقۆفەکاندا خۆی دەنواند. لە سەدەی پێنجەمیشدا کە دەسەڵاتی ڕۆمانی بە شێوەیەکی یەکجارەکی ڕووخا؛ کڵێسا و ڕێکخستنەکانی توانیان بمێننەوە، تەنانەت هێندە بەهێز بوو کە توانی دەسەڵات و هەژموونی خۆی بەسەر کۆمەڵگای ئەورووپیدا بچەسپێنێت و شوێنی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی بگرێتەوە، کڵێسای (کاسۆلیکی) بەتەنها لە گەشەپێدانی کڵێسادا سەرکەوتوو نەبوو؛ بەڵکوو لە ڕێی جوگرافیشەوە توانی سنووری ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی دێرین تێبپەڕێنێت[٢].

کاتێک (سەکسۆنەکان) بەریتانیایان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، خەریک بوو دوورگەکانی (بەریتانیا) بەگشتی پەراوێز بخرێن؛ بەڵام (قەشە پاتریک) کە شەش ساڵی تەمەنی لاوێتی خۆی لە (ئێرلەندا) بەسەربردبوو، پێش ئەوەی ببێتە ڕاهیب لە وڵاتی (گال)؛ لە ساڵی (٤٦١ ز) گەڕایەوە بۆ (ئێرلەندا) بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئایینی (مەسیحی)، ئەوە بوو توانی ئەم ئایینە لەناو ئێرلەندییەکاندا

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا فى العصور الوسطى، ص٥٢.

(٢) عبدالامير محمد امين و: اوروبا فى العصور الوسطى، ج١/ ص ٣٩-٤٠.

بڵاوبکاتەوە، ئەوانیش بە ناوچەکانی دەورووبەریاندا ئایینەکەیان بڵاوکردەوە و بوون بە موژبەخشی کارای ئایینی (مەسیحی)[1].

موژدەبەخش ئێرلەندییەکان بە سەرکردایەتی (سنت کۆلۆمبا ٥١٢–٥٩٧ ز) بۆ گەیاندنی ئایینە نوێیەکە بە دەریادا گەشتیان کرد و ڕوویان کردە کەناراوەکانی (باکووری ئینگلتەرا) و لەوێدا گەلێکیان بینی کە زمانیان لە زمانی (کلتی)ەوە نزیک بوو، لەبەرئەوەی ناوە لاتینییەکەی ئێرلەندا (سکۆتا) بوو؛ ئەم ناوەیان بەسەر ئەو بەشە باکوورییەی (بەریتانیا)دا بڕی و بە (سکۆتلاند) ناسرا. بەشێکی دیکە لە موژدەبەخشە ئێرلەندەییەکان دەریایان بڕی و ڕوویان کردە (برتانی کلتی) کە دەکەوتە ناوەوەی وڵاتی (فەرەنگ)، چونکە هەتا ئەودەمە (بتپەرست) بوون و ئەوان ئایینی مەسیحیان تێدا بڵاوکردەوە[2].

لەساڵی (٥٩٧ ز)دا (پاپا گریگۆری)؛ (ئۆگستینی ڕاهیب)ی بۆ ڕێنموونیکردنی (سەکسۆنەکانی باشووری ئینگلتەرا) نارد، ئۆگەستین سەرکەوتنێکی بێ وێنەی لە کارەکەیدا بەدەستهێنا، لە لایەکی دیکەوە موژدەبەخشی سەکسۆنی (ونفرد) کە دواتر بە (بونیفاس) ناسرا هەستا بە دامەزراندنی کڵێسایەک لە بەشە خۆرهەڵاتییەکەی وڵاتی (فەرەنگ)دا، لەبەر ئەم هۆکارەیە کە زۆرینەی (ئەڵمانییەکان) هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش (بونیفاس) بە قەشەی نەتەوەیی خۆیان دەزانن. لە خۆرهەڵاتیشدا هەردوو قەشە (مسیدیووس و سیرل) کە برای یەکدی بوون؛ هەستان بە ئەنجامدانی چالاکییەکی گەورە لە ڕێنموونیکردنی گەلانی (سلاڤی)دا و توانیان لە ئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانەکانیاندا سەرکەوتنێکی نموونەیی بەدەست بهێنن. جێی بیرهێنانەوەیە کە دەسەڵاتی کڵێسای (مەسیحی) بەپێی ناوچەکان دەگۆڕا و بارودۆخی بڵاو و دیار دەسەڵاتی کڵێسای دیاریدەکرد، لە خۆرهەڵات لەبەرئەوەی فەرمانڕەوایەتییەکی بەهێز هەبوو و دەسەڵات و سەرکردایەتی بەدەست خودی ئیمپراتۆرییەتەوە هەبوو؛ کڵێسا ملکەچی ئەو فەرمانڕەوایەتییە بوو، بەڵام لە خۆرئاوادا لەبەرئەوەی ئەو دەسەڵاتە نەبوو؛ دەسەڵاتی کڵێسا باڵادەست بوو، بە

(١) ئاراس زەینەڵ: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ص٥٣.

(٢) سعيد عبالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٩٢.

جۆرێـک ئەم بـارودۆخە شـوێن و پـایەیەکی بـاڵای پێبەخشـیبوو کە بـۆ هاوشـێوە خۆرهەڵاتییەکەی (کڵێسای خۆرهەڵاتی) نەڕەخسا[١].

## (الهرطقة = لادەرەکان)

کڵێسای مەسیحییەت لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە دووچاری گەلێک بزوتنەوەی جوداخوازی بووەوە، مەبەست لە (الهرطقة) یان لادەر واتا (ئەوانەی داهێنانی ئایینی دادەهێنن و لە ڕێگە ڕاسـتەکە لادەدەن)، یـان دەرچـوونێکی تەواو؛ یـاخود بەشـێکی بیروباوەڕە دانپێدانراوەکانی کڵێسا. هەڵگەڕانەوە جـودایی و جیـاوازییەکی ڕەوانـی و ڕۆشنبیری بـوو، پەیوەنـدی بە دۆزی ئاکاری یاخود سـەرپێچیکردن (المعاصي)ەوە نەبـوو! زۆربـوونی ژمـارەی لادەرەکـان و فراوانبـوونی بزوتنەوەکەیـان پێویسـتی بە وەڵامـدانەوەیەکی بەهێزی کڵێسـا هەبـوو، لە کۆتاییدا بەربەرەکـانیکردنی لادەرەکـان بــووە هــۆی بەهێزکــردن و شــکۆمەندبوونی کڵێســا، بەڵام زۆربــوونی بــزوتنەوە لادەرەکان کڵێسای ناچار کرد دوو کاری گرنگ ئەنجام بدات[٢]:

یەکەم/ پێناسەکردنێکی شێوازبەندی و دیاریکراو و ورد بۆ ئەو بیروباوەڕانەی کە جیاوازیان لەسەری هەیە.

دووەم/ گــرتنەبەری چەنــد هەڵســوکەوتێکی داپڵۆســێنەرانە یــاخود قـایلکەرانە بەرامبەر بە لادەرەکان.

زۆریــنەی بــزوتنەوە هەڵگەڕاوەکــان لە مــاوەی ســەدەی یەکەم لە مێــژووی مەســیحییەتدا دەربــارەی کــۆمەڵە کاروبارێــک کە پەیوەنــدی بە بیروبــاوەڕی سێلانەییەوە[٣] هەبوو دەرکەوتن.

---

(١) سعيد عبالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٥٥.

(٢) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٠.

(٣) سێلانەیی یان سیانەیی خودا (الثالوث): بریتییە لەو باوەڕەوەی کە مەسیحییەکان باوەڕیـان پێیەتـی؛ وەک چـۆن لە نـامەی یەکەمـی یوحەننـا: بەشـی ٥: بـڕگەی ٧ لە نوسـخەی (پاشـا جەیمـس)دا دەڵێـت: "ئەوانەی لە ئاسـماندا گەواهـی دەدەن سـیانن: بـاوک و کـوڕ و گیـانی پیـرۆز؛ ئەو سـیانەش یەکێکن". واتە بە بـڕوای مەسـیحییەکان (بـاوک = خـودای ئاسـمانان، کـوڕ -وشـەکە- = بەرجەسـتەبووی خـودا لە لاشـەی عیسـای مەسـیحدا؛ واتە لە جەسـتەی مـرۆڤ، گیـانی پیـرۆز = سروشـتی خـودایی کە کەسـایەتییەکی خـودایە و یارمەتیدەری مەسیح و باوەڕدارانی مەسیحە و خاوەن توانا و ویستی خوداییە). واتە بەپێی ئەم ئەم باوەڕە

ڕۆژگاری ئەمڕۆش تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی ئەستەمە و زۆر ئاڵۆز و پەنهانە[1].

لێرەدا پرسیارێک دێتەئاراوە دەربارەی سروشت و کەسێتی (مەسیح) و پەیوەندی ئەو (مەسیح) بە باوکەوە، ڕەنگە (ئاریۆس) لەپێشینەترین لادەر بووبێت کە ئەم بابەتەی وروژاندووە، هەر لە ناوی ئەوەوە ڕێبازی (ئاریۆسی) داتاشراوە کە لە ساڵی (٣٢٣ ز) لە ئەسکەندەرییەوە دەرکەوت[2].

ئەگەر (مەسیح) کوڕی خودا بێت[3]؛ ئەوا بێگومان لەو بچووکتر و نوێترە، بۆیە دەسەڵاتی لە خودا کەمترە، یەکێک لە سیفەتە نەمرییەکانی خودا بریتییە لە بێسەرەتایی و بێکۆتایی بوونی، بەڵام (مەسیح) نەمر نییە؛ چونکە سەرەتای هەیە، بەڵام (ئەسقۆفی ئەسکەندەرییە) بەتوندی بەرامبەر بەم بۆچوونانەی (ئاریۆس) ڕاوەستا و سزای (مەحڕووم) بێبەشکردنی بەسەردا سەپاند[4].

بیروبۆچوونەکانی (ئاریۆس) گیروگرفت و کێشەیەکی زۆری لەناو مەسیحییەکاندا دروستکرد و لێکیترازاندن، بە جۆرێک کە ئیمپراتۆر (قوستەنتینی مەزن)ی ناچار کرد لە ساڵی (٣٢٥ ز) کۆبوونەوەی (نیکییە) گرێبدات، لەم کۆبوونەوەیەدا بەوردی نەمری (مەسیح) و یەکبوونی تەواوی بە باوکەوە دیاریکرا، لەگەڵ ئەوەی (ئاریۆسێتی) پیداگری لەسەر بیروباوەڕەکانی دەکرد؛ بەڵام بیروباوەڕی (کاسۆلیکی) بە هۆی پشتیوانیکردنی فەرمانڕەوایەتی ڕۆمانییەوە توانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، لە بەرامبەردا ئاریۆسێتیش توانی لە بوارێکی دیکەدا

---

هەریەک لەم کەسایەتیانە خودان؛ بەڵام ئەم سیانە سیان نین! بەڵکوو گشتیان یەکن، هەرچەندە سێ کەسایەتیشن!

بڕوانە: (هامنۆ ئەیوب هەورامی: مەسیح چی گوت؟، چ١، بڵاوکراوەی ئاستانە، ب١، ل٢٤٤).

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤١.

(٢) محمد زايد عبدالله: العصور الوسطى الباكرة، ص٤١.

(٣) لە بنەڕەتدا دەستەواژەکانی (باوک و کوڕ) دەستەواژەی مەجازی بوون لە وێژە و فەرهەنگی ئایینی جوو و عیبرییەکاندا، هەر بۆیە لە چەندین دەقی ئینجیلدا خودی عیسا (د. خ) ئەو دەستەواژەیەی بۆ تەواوی گەلی ئیسرائیلیش بەکارهێناوە، بۆ نموونە لە ئینجیلی مەتتا: بەشی ٥: برگەی ٩ دەڵێت: "خۆزگە دەخوازرێت بە ئاشتیخوازان؛ چونکە بە ڕۆڵەی خودا ناودەبردرێن". بەڵام مەسیحییەکان چونکە بە تێڕوانینێکی یۆنانییەوە دەقەکانیان وەرگرت، جیاوازبوون لە تێڕوانینە عیبرییەکان، هەر بۆیە دەبینین لەم دەستەواژەیەشدا هەمان جیاوازی لە هەردوو فەرهەنگەکەدا بەڕوونی دەبیندرێت.

بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: (هامنۆ ئەیوب هەورامی: مەسیح چی گوت؟، ب١/ ل٥٩-٦١).

(٤) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٤٧.

سەرکەوتن بەدەستبهێنێت کە ئەویش بریتیبوو لە هەستانی موژدەبەخشە ئاریۆسییەکان بە بڵاوکردنەوەی ئەم ڕێبازە لەنێو هۆزە جەرمانەکاندا کە چەند ئەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوە[1].

لە کۆبوونەوەکەی (ئەفسووس)یشدا کە لە ساڵی (٤٣١ ز) بەسترا؛ جارێکی دیکە جەخت لەسەر بیروباوەڕی سێلانەیی کرایەوە، ئەمەش ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکانی (نوستریووس) بوو کە پێی وا بوو (مەسیح) دوو سروشتی هەیە؛ یەکێکیان ئاسمانی و ئەوی دیکەیان مرۆیی کە بە هۆیەوە دوو کەسایەتی بەرهەمهاتووە و (مەریەم)یش دایکی ئەو کەسێتییە مرۆییەیە کە بە تەنها هەر لەم کۆبوونەوەیەدا جەخت لەسەر (دایکی خودا) کرایەوە وەک نازناوێک بۆ (مەریەم)، هەر لێرەشەوە پێگەکەشی بەرزکرایەوە و بە مەزنی هەموو قەشەکان دانرا، هەر لەو ساتەشەوە باڵایی و بەرزڕاگرتنی پایەی (مەریەم) بووە تایبەتمەندییەکی دیار لە بیروباوەڕی مەسیحییەتی کاسۆلیکیدا[2].

هەڵگەڕانەوەکان لێرەدا کۆتاییان نەهات؛ ئەوە بوو کڵێسای (کاسۆلیکی) ڕووبەڕووی هەڵگەڕانەوەیەکی دیکە بوویەوە کە (مینۆفستییەکان) پێی هەستان و پێیان وا بوو کە (مەسیح) یەک سروشتی هەیە، کۆبوونەوەی (خەلقەدونیا) لە ساڵی (٤٥١ ز) بەستار و ئەوە بوو ئەم بۆچوونەی ڕەتکردەوە و پێناسە و دەستنیشانکردنەکەی پێشووی سەبارەت بە کەسایەتی و سروشتی (مەسیح) دووپاتکردەوە[3].

(مینۆفستییەتی) لە خۆرهەڵاتدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و توانی سیما (معالم)ەکانی بڵاوبکاتەوە و لایەنگرێکی زۆر لە وڵاتانی (میسر و سوریا و فەڵەستین) بۆ خۆی دروست بکات، ئەمەش کێشە و گرفتی زۆری بۆ ئیمپڕاتۆرە خۆرهەڵاتییەکان دروستکرد[4].

---

(١) حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية، ص٢٨.

(٢) ئاراس زەینەڵ: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٥٦.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤٢.

(٤) حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزقنطية، ص٢٨-٢٩.

## دەرکەوتن و گەشەکردنی پاپاییەت

### یەکەم/ دەرکەوتنی پاپاییەت

لە ڕاستیدا ئەو جیاوازیەی کە لە گێتی ئەمڕۆدا هەیە لەنێوان هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و دونیاییدا هیچ بوونێکی نەبوو لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا، خەڵکی لەم سەردەمەدا کۆمەڵگای ڕامیاریان دەناسی؛ ئەویش کۆمەڵگای (مەسیحی) بوو، لە ڕاستیدا لەوێ دوو هێز فەرمانڕەوایی ئەو کۆمەڵگایەیان دەکرد؛ بەڵام هەردووکیان یەک کۆمەڵ خەڵکیان بەڕێوەدەبرد کە هەموویان بە هۆی مەسیحییەتی خۆرئاواوە پەیوەستبوون بەیەکەوە، بۆ ڕاستی ئەمەش دەتوانین نموونەی پاپاوییەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا وەربگرین. ئەو تەوژمەی کە کەنیسەی پێدا تێپەڕی؛ قسەی لەسەر سیستمی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆری دەکرد، تێیدا داوای کەسایەتییەکی مەزنی دەکرد بۆ ئەوەی بیکات بە سەرکردە، هەروەک چۆن ئیمپراتۆر ئەرکی بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەتەکەی دەگرێتەئەستۆ[١].

لێرە بەدواوە جیاوازییەکی ڕوون دەبینین لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا کە لە خۆرهەڵاتدا کەنیسە جڵەوی گرتەدەست و دەستێوەردانیان لە کاروباری کەنیسەدا زیادیکرد؛ بەتایبەتی لەنێوان سەدەی شەشەم و هەشتەمدا، بە شێوەیەک ئەم دەستێوەردانە تەنها لە ڕامیاری دەرەکی کەنیسەدا خۆی نەبینییەوە؛ بەڵکوو لە سیستم و ڕامیاری ناوخۆشدا بوو، بۆیە ڕاگرتنی دەستێوەردانی ئیمپراتۆرییەتی (بیزەنتی) لە کاروباری کەنیسەدا دژواربوو، هەتا وایلێهات ئیمپراتۆر (قوستەنتین) جۆرێک لە قەیسەرییەتی پاپاوی یاخود یەکخستنی دەسەڵاتی ڕامیاری و ئایینی پێوەدیاربوو[٢]. لە ڕاستیدا بنەمای ئەم ڕامیارییە خودی (قوستەنتین) دایمەزراند؛ هەر لەو کاتەوە کە دانی بە مەسیحییەتدا دانا. بنیاتنانی (قوستەنتینییە) یاسایەکی نوێی هێنایەکایەوە کە جێنشینی (ئەباترەکانی خۆرهەڵات) پەیڕەویاندەکرد؛ ئەویش بانگەشەکردنی کۆمەڵە ئایینییەکان بوو لە لایەن پاپاوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کێشە جۆراوجۆرەکانی تایبەت بە کەنیسە و بیروباوەڕی (مەسیحی)، بەڵام لە خۆرئاوادا بارودۆخەکە جیاواز بوو؛ چونکە ئیمپراتۆرییەتی خۆرئاوا پاش دابەشکردنی گێتی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢١٥.

(٢) ه. ا. ل. فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٠٦.

ڕۆمانی لاوازبوو و نەیدەتوانی دەسەڵاتی خۆی بە شێوەیەکی گشتی بسەپێنێت بەسەر کەنیسە و دەوڵەتدا؛ هەروەک لە خۆرهەڵاتدا ڕوویدا[1].

لێرە بەدواوە پاپا بوو بە سەرۆکی کەنیسەی (کاسۆلیکی) و بنکەی ویلایەتەکانی و پاسەوانی یەکەم بوو لە یاسا و سیستم و بیروباوەڕەکان و مامۆستای شوێنکەوتەکانی بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە پاپا جێگیری (مەسیح) بوو؛ چونکە دەسەڵاتەکەی ڕاستەوخۆ لە مەسیحییەوە وەرگرتبوو، پاپا جێنشینی (قەدیس پەترۆس) بوو لەسەر تەختی ڕۆما، هەروەها پاپا بەڵگەیەکی بەهێزی دۆزییەوە لە گوتەکەی (مەسیح)دا بۆ (قەدیس پەترۆس) کە پێی گوت: "من پێت دەڵێم کە تۆ (قەدیس پەترۆس)؛ لەسەر ئەم بەردە کەنیسەکەم دروست بکە کە دەرگاکانی دۆزەخ لەو بەهێزتر نەبن، کلیلی مەلەکووتی ئاسمانت پێ دەدەم، هەرچی پەیوەستە بە زەوی و ئاسمانیشەوە، هەرچی لە زەوی و لە ئاسمانیشدا بەربڵاوە". بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە، کە پاپا ببێتە جێگری (قەدیس پەترۆس) کە لە هەمان کاتدا سەرۆکی دەستەیەکی ڕامیاری بوو لە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەتا ئەو ڕادەیەی کە هاوچەرخەکان بە (میری میران) ناوی دەبەن، لێرەوە پاپاوییەت دەسەڵاتی خۆی بەڕێوەدەبات وەکوو دامەزراوەیەکی دەرەبەگایەتی چالاک، هەتا وایلێهات کە هەماهەنگی هەبێت لەنێوان کەنیسە و دەستەی ڕامیاری لە خۆرئاوای ئەورووپادا[2].

سەرکەوتنەکانی (هلدبراند) لە بەرنامە چاکسازییەکانیدا زۆری نەخایاند بۆ بەدیهێنانی ئارەزووەکانی پاپا لە دەستبەسەراگرتنی کەنیسەی خۆرئاوایی؛ لە کاتێکدا گرنگترین کاری پاپاوییەت دوای ئەو سەرکەوتنە لە چوارچێوەی ڕێکخستنی کاروباری کەنیسەدابوو، تەنانەت مێژووی پاپاوییەت باسی ماوەی نێوان ناوەڕاستی سەدەی یازدەهەم و سەرەتای سەدەی سیازدەهەم دەکات کە کارێکە بۆ دەستەبەرکردنی پەیوەندییەکان و سیستم و دەسەڵاتی ناوەندی لەنێو کەنیسەدا، تێکۆشانی کەنیسە لەپێناو بەدیهێنانی بالادەستی هاوکاتبوو لەگەڵ بزوتنەوەیەکی ناوخۆیی کە هەوڵی دەدا بۆ پشتگیریکردنی پێگەی پاپا و هەژموونی لەناو

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج٢/ ص٢٦٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٢١.

کەنیسەدا. پتەوکردنی هەژموونی پاپا لەناو کەنیسەدا چەند ئاراستەیەکی لەخۆگرتبوو:

**یەکەم/** سووربوونی پاپا لەسەر پێگەی تایبەتی خۆی لەناو دەزگای کەنیسەدا، بەو هۆیەی کە تاکە سەرچاوەیە بۆ شیکردنەوەی بناغەی بیروباوەڕ.

**دووەم/** گەشەکردنی ڕێکخستنی کەنیسەی هەرێمی بە مەبەستی سنووردانان بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی و میرە دەرەبەگەکان و خۆهەڵقورتانیان لە کاروباری کەنیسەدا[1].

لە ڕاستیدا دەبوایە گەشە بەو ڕێکخستنە بدرێت، پاش ئەوەی (شارلەمان) ئیمپراتۆرییەتەکەی دامەزراند؛ لەسەر بنەمایەکی (سیۆکراتی = دەسەڵاتی پیاوە ئایینییەکان)، ئەوەی بۆ دەوڵەت دەستەبەری کردبوو کە کۆنترۆڵی کەنیسە و پیاوەکانی بکات، هەروەها هەرەشەی لە هەژموونی پاپاوییەت و مافەکانی دەکرد لە دەستبەسەراگرتنی کەنیسەدا، لێرەدا دەبینین پاپاوییەت سەرکەوتوو بوو لە ڕێکخستنی کەنیسە و دانانی هەرێمەکان وەک یەکەیەکی ڕامیاری، هەروەها سەرکەوتوو بوو لە ملکەچکردنی سەرۆکی ئەسقافەکان لەو هەرێمانەدا بۆ دەسەڵاتی ڕەهای پاپاوییەت؛ بەمەش لە کۆتایی سەدەی سیازدەهەمدا دەسەڵاتی پاپا بەسەر کەنیسەی خۆرئاوادا باڵادەستی بەدەستهێنا[2].

**دووەم/ سیستمی بەڕێوەبردنی کەنیسە**

لە ڕۆژگاری یەکەمینەکانی مەسیحییەتدا سیستمێکی ئایینی گرنگ دەرکەوت کە بە کەنیسە ناسراوبوو، ئەوانەشی کە ئەم سیستمەیان بەڕێوەدەبرد و سەرپەرشتی بەجێهێنانی ڕێوڕەوسم و سرووتە ئایینییەکانیان دەکرد کە بە پیاوانی ئایینی (ئەکلیرس) ناسرابوون؛ بۆ جیاکردنەوەیان لە مەسیحییەکانی دیکە، دوانزدە خوێندکارەکەی (مەسیح) کە بە (حەوارییەکان) ناسرابوون؛ بە بنەمای (ئەکلیرس) دادەنرێت، پاش ئەمانیش (ئەسقەف)ەکان هاتن کە جێنیشینی حەوارییەکان بوون. کاتێک کە مەسیحییە پێشینەکان سەرەتا لە شاردا نیشتەجێبوون؛ شار بووە بنکە بۆ

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ج٢/ ص٢٦٤.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص١١٨.

ئەسقەفەکان، ئەسقەفیش سەرپەرشتی کاروباری کڵێسایی و ئاینی ئەو شارەی دەرکرد کە تێیدا نیشتەجێ دەبوو[1]. ئەو کارگێڕییە ئاینییەی کە ئەسقەف سەرپەرشتی دەکرد؛ پێی دەگوترا (ئەسقەفییە). ئەو کەسانەشی کە لە چوارچێوەی ئەسقەفییەدا کاریان دەکرد؛ کەسانێک سەرپەرشتی دەکردن کە بە (قسەس) ناسرابوون. لە بەڕێوەبردنی کاروباری کەنیسەدا گروپێکی تر یارمەتی (قسەس)یان دەدا بە (شەمامە) ناسرابوون، ئەمانە پەیڕەوی ڕێوڕەسم و سرووتە ئایینییەکانیان دەکرد، بەڵام ئیشوکاری دیکەیان ئەنجامدەدا؛ وەکوو:

أ. پاککردنەوەی کەنیسە.

ب. دابەشکردنی دیارییەکان.

ئەو شارانە کە حەوارییەکان تێیدا بوون؛ هەستابوون بە دروستکردنی کەنیسە، چونکە پێگەیەکی تایبەتیان هەبوو لەناو گێتی مەسیحییەتدا کە ڕۆما بە پلەی یەکەم دەهات لەم بوارەدا[2].

## سێیەم/ بەناوبانگترین پاپاکانی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست:

### پاپا لیۆی یەکەم (٤٤٠-٤٦١ ز)

لە سەدەی پێنجەمدا ژمارەیەک پاپا دەرکەوتن کە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە بەهێزکردنی پێگەی پاپاوییەت و دانانی یەکەم بەردی بناغەی ئەو کۆشکە پایەبڵندە، لە بەناوبانگترینی ئەو پاپایانەش (پاپا لیۆی یەکەم) بوو کە بە یەکێک لەو سێ پاپایە دەناسرێت کە بە (مەزن) ناوبراون[3].

لە ساڵی (٤٦١ ز) کاتێک کە ئەسقافەکان لە کۆڕی (خلقدونیا)دا بێئومێد بوون لە گەیشتن بە بڕیارێک کە جێی ڕەزامەندی هەمووان بێت، (پاپا لیۆی یەکەم) نامەیەکی نارد کە باسی لەوە دەکرد ناکۆکی کۆتایی پێ هاتووە، هەروەها جەخت لەسەر ئەو بیروباوەڕە دەکاتەوە کە دەڵێت (مەسیح) دوو سروشتی مرۆیی و خودایی هەیە، بەمەش بەرپەرچی بۆچوونەکەی (منوفستین) دەداتەوە کە دەڵێت: "مەسیح یەک سروشتی خودایی هەیە". (پاپا لیوی یەکەم) بە هۆی پێگەی چەسپاوی لە کۆڕی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج٢/ ٢٢٩.

(٢) عبدالامير محمد امين و: : تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٨٥.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٥٤.

(خلقدونیا)وە کاریگەری هەبوو لەسەر (پەتریاکی قوستەنتینییە) کە دانبنێت بە دەسەڵاتی پاپادا. یەکێکی دیکە لە کارە سەرکەوتووەکانی کە سەرکەوتنی تێدا بەدەستهێنا بریتیبوو لە وەرگرتنی فەرمانێک لە ئیمپڕاتۆر (ڤالنتین) لە ساڵی (٤٤٥ ز)دا کە بە هۆیەوە داننرا بە دەسەڵاتی باڵای پاپاوییەتەوە بەسەر هەموو ئەسقەفەکانی خۆرئاوادا، هەروەها ئیمپڕاتۆر داوای لە هەموو فەرمانبەرە میرییەکان کرد کە پابەندبن بەم فەرمانەوە[١].

## پاپا گلاسیۆسی یەکەم (٤٩٢-٤٩٦ ز)

(پاپا گلاسیۆسی یەکەم) بەوە بەناوبانگ بوو کە تێڕوانینی تایبەتی هەبوو بۆ دووانەیی لە دەسەڵاتدا کە زۆرجار بە تیۆری (گلاسیۆس) ناسراوە، ئەم تیۆرە دەڵێت دوو دەسەڵات لە گێتیدا هەیە؛ یەکەمیان ئایینی و دووەمیان دونیاییە. ئەم دووانە جیاوازن؛ بەڵام یەک سەرچاوەیان هەیە ئەویش (خودایە)، هەریەکەیان پشت بەوی دیکەیان دەبەستێت؛ بەڵام هەردووکیان بێلایەنن و هەریەکەیان سەرۆکە لە بوارە تایبەتەکەی خۆیدا، بۆ نموونە دەسەڵاتی دونیایی ملکەچی دەسەڵاتی ئایینییە لە بوارێکی تایبەتدا و بە پێچەوانەشەوە لە سەدەی نۆیەمدا هەریەک لە (یوناس و ئورلیان و هنکمار ڕیجی) تیۆری گلاسیۆسیان شیکردەوە و گوتیان هەریەک لە دەسەڵاتی ئایینی و دونیایی لە پشگیری (حچیرە)ی کەنیسەدان. پێویستە لەسەر پیاوی ئایینی جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە فەرمانڕەوای دونیایی هەستێت بە ئەنجامدانی کارەکەی لە ئاهەنگی چەورکردنی پاشادا بە زەیتی پیرۆز، ئەو کەسەی کە بەو ئەرکە هەڵدەستێت؛ پلەیەک لە سەروو ئەو کەسەوەیە کە چەور (مەسح) دەکرێت، هەروەها پیاوی ئایینی پلەیەک لە سەرووی فەرمانڕەوای دونیاییەوەیە[٢].

لە سەدەی شەشەمدا و لە کاتی دامرکاندنەوەی ململانێ و ناکۆکییەکاندا؛ پاپا زۆر هەژموون و پێگەی لەدەستدا، هەروەها لە ماوەی ئەم دوو سەدەیەی دواییدا پاپا ئەو پلەیەی لەدەستدا کە پێشتر بەدەستیهێنابوو، لە زۆر کاتدا پاپا دەربەدەر و پشتگوێخراو بوو لە شاری ڕۆمای هەژار و وێراندا[٣].

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: : تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ج١/ ص٨٧.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ج٢/ ص٢١٦.

(٣) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا في العصور الوسطی، ج٢/ ص٢١٧.

## پاپا گریگۆری مەزن (٥٩٠-٦٠٤ ز)

پێشکەوتنی کەنیسەی مەسیحی لە خۆرئاوا و لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست و بەرزبوونەوەی پێگەی پاپاکان؛ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە (پاپا گریگۆری مەزن)ەوە کە لە مەزنترین پاپاکانی مێژووی کەنیسەی مەسیحی بوو لەو سەردەمەدا. هەر ئەویش بوو کە بنەمایەکی دانا لە بواری ئایینی و دونیاییدا کە هەموو پاپاکان لە دوای ئەو لەسەری دەڕۆیشتن. (گریگۆری) لە ساڵی (٥٤٠ ز) لە (ڕۆما) لە خێزانێکی خانەدان و دەوڵەمەند و بەناوبانگ لەدایک بوو، هەر لەوێشدا چەندین پۆستی میری وەرگرت، کرا بە فەرمانڕەوای یەکێک لە شارەکان، بەڵام وای بەباش زانی کە واز لە خۆشییەکانی ژیان بهێنێت و ڕوو بکاتە یەکێک لە دێرەکان[1].

## گرنگترین کارەکانی پاپا گریگۆری مەزن

١.**لە بواری ئایینیدا:** پاش ئەوەی کە هەرچی زەویوزار و زێڕ و زیوی هەبوو پێشکەشی کەنیسەی کرد؛ ڕووی کردە دێرەکان، هەڵبەتە نەدەبوو ژیانی لە دێردا بەسەربەرێت، هەر بۆیە پاپا بانگی کرد بۆ (ڕۆما) و پۆستێکی ئایینی بەرزی پێ دا، پاشان ناردی بۆ (قوستەنتینییە) و لە ساڵی (٥٩٠ ز) هەڵیانبژارد کە لەسەر تەختی (قەدیس پەترۆس) دابنیشێت.

٢.**لە بواری رامیاریدا:** ڕێزێکی زۆری لە دەسەڵاتی یاسایی ئیمپڕاتۆر دەگرت و لە هەمان کاتدا شانازی بە پۆستی پاپایی خۆیەوە دەکرد، ملکەچکردنی ئەم دەسەڵاتەی بۆ هەر دەسەڵاتێکی دیکە ڕەتکردەوە.

٣.**لە بواری دارایی و بازرگانیدا:** گرنگی بە لایەنی دارایی و بازرگانیش دەدا، بە شێوەیەکی ورد و سەرنجڕاکێش پارێزگاری لە داهاتی دارایی کەنیسە دەکرد، هەروەها بازاری گونجاوی هەڵدەبژارد، بۆ ئەوەی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان کە کێڵگەکانی کەنیسە بەرهەمیان دەهێنا بۆی بنێرن، بەمەش قازانجێکی زۆری دەست دەکەوت، هیچ ڕەزیلی لە داهاتی کەنیسە نەدەکرد و بەشی هەژار و لێقەوماوانیشی دەدا.

---

(١) عبدالامير محمد امين و: : تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٩٤

٤. **لە بواری هونەری ئاوازدا:** لاواندنەوەی بۆ میوزیکی کەنیسە دانا و چەند سروودێکی فەرمی بۆ دانـاوە کە هەتـا ڕۆژگـاری ئەمڕۆشـمان نـاوی ئەوی هەڵگرتووە. هەروەها (گریگۆری) لە بواری نووسینیشدا دەستێکی باڵای هەبووە، گرنگترینیان ئەو بابەتەیە کە باس لە ڕێپیشـاندانی پیاوانی ئایینی دەکات، هەروەها دەربـارەی سـروود و بـۆنە ئایینییەکـان و چیرۆکـی پەیامبەرەکـانیش نووسـراوی بەجێهێشتووە[1].

## بەرپرسیارییەتییەکانی پاپا

### یەکەم/ مەڕسووم و یاسای پاپاوییەت

فەرمـان و بڕیارەکانی پاپا لە شێوەی بۆنەدا دەردەکران و هەمیشە بە (زمـانی لاتینـی) دەنووسـران، ئەم بۆنەیەش دەکرایە دوو بەشـەوە، بەتـایبەت لە سـەردەمی (پاپـا ئەنۆسـتنی سـێیەم). بـۆنە گەورەکـان بچووکەکـان؛ کە یەکەمـین بەڵگەنـامەی فەرمییە سروشـتێکی دیـاریکراوی هەبووبێت لەگەڵ ئاکاری تـایبەتی و نەگۆڕ، ئەم بۆنـانەش پێویسـتیان بە ژمـارەیەک فەرمـانبەری تـایبەت هەبـوو لە دیـوانی پاپـاوی. داڕشتنی مەرسـوومی پاپاوییەت بەپێی چەنـد ڕێسـایەکی تـایبەتی و ورد شـێواز و گوتە و خەت و چۆنییەتی کۆتایی هاتنی دیاری دەکرا، بۆیە شـتێکی ئاسـان بـوو لە نووسینی دیوانی پاپاوییەتدا سـاختەکردنی هەر بەڵگەیەکی پاپاوی ئاشکرا بکرێت ئەگەر یاسـاکانی پێشـووی تێدا نەبێـت، ئەمە سـەرەڕای ئەوەی ئەو نامـانەی کە لە دیوانی پاپاوییەت دەردەکران؛ دواجار لەبەریـان دەگیرایەوە، بۆ ئەوەی یەکێکیـان لە ئەرشیفی (کەنیسەی ڕۆمانی)دا بمێنێتەوە، هەروەهـا لێکۆڵینەوە لەسـەر بەڵگەنـامە و بۆنەکانی پاپاوییەت کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی دوازدەهەم. دەتـوانین دان بە ڕاسـتیەکدا بنێـین؛ ئەویـش ئەوەیە کە وڵاتـی پاپـاوی لەو کـاتەدا پەیوەسـت بـوو بە هەندێ یاسای دیبلۆماسی و ڕووکەشی یاساییەوە؛ ئەویش ئاڕاستەیەک بوو کە لەو سـەردەمەدا هاوشێوەی نەبوو لە هیچ جێگایەکی دیکەی لە ئەورووپادا[2].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٩٥.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج٢/ ص٢٢١.

دادگای پاپاوی لە سەردەمی (ئەنۆستنی سێیەم)دا وەکوو دەستەیەکی یاسایی باڵا دەرکەوت؛ کە لە هەموو ئەو کێشانەی دەڕوانی کە پێشکەشی دەکرا، لە زۆربەی ناوچەکانی خۆرئاوای ئەورووپادا ژمارەی ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی پاپا دەکرایەوە لە زیادبووندا بوو، هەتا وایلێهات لە کۆتایی سەدەی دوازدەهەمدا شتێکی ئاسایی بوو کە یاساکانی دادگای کەنیسە بخرێتە بەردەم دادگای پاپاوییەت. لە زۆربەی کاتدا پاپا بە یارمەتی هەندێک (کەردالەکان) سەیری کێشەکە دەکات، ئەگەر لە بارودۆخێکی تایبەتدا بێت؛ کێشەکان دەچنە لای هەندێک لە پیاوانی ئایینی وڵات[1].

## دووەم/ پاپاوییەت لەنێوان سەدەی چوارەم و پێنجەمدا

گرنگترین پێشکەوتن سەبارەت بە کەنیسەی مەسیحییەت لە کاتی داڕووخانی (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی)دا، بەرز ڕاگرتنی پایەی (ئەسقەفی ڕۆما) بوو کە لە سەدەی چوارەمدا بە پاپا ناسرا لە لایەنی ئایینی و دونیاییەوە، هەروەک چۆن پلەی جێنشینەکانی (قەدیس پەترۆس)مان بینی لە ئەسقەفەکانی سەردەمی چەوساندنەوەدا، بەڵام دواتر لە سەردەمی داڕووخانی (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی) و لاوازبوونیدا، پاپا نەک هەر ئەو پایەبڵندییەی خۆی پاراست؛ بەڵکوو سەرکردایەتیکردنی لە ئەسقەفەکانی دیکەدا پەرەیسەند، هەتا وایلێهات؛ بوو بە تیڕوانینێکی چەسپاو و باوەڕپێکراو لە لای خەڵک. سەرکردایەتی پاپا لە زۆربەی بوارەکاندا بە شێوەیەکی بەرچاو دەبینرێت، لەوانە ئەو کارانەی کە پێی هەستابوو بۆ بووژاندنەوەی هەرتەقە لادەرەکان، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی جووڵانەوەکانی هەرتەقە لە سەردەمە یەکەمینەکانی مەسیحییەت لە خۆرهەڵاتدا ڕوویدا؛ وەکوو (ئاریۆسی و منوفستی) ئەمەش بووە هۆی کێشە بۆ ئەسقەفەکانی خۆرهەڵات بە پلەی یەکەم. لەگەڵ ئەوەی کە حەوت کۆڕە گشتییە ئایینییەکە؛ کە لە سەرەتادا هەموویان لە خۆرهەڵات بەستران، ڕۆما ڕۆڵێکی سەرکردەیی بینی لەو کۆڕانەدا، کە ئەمەش ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە پێناسەکردنی بیروباوەڕی (کاسۆلیکی) و دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی، لە ساڵی (٣٢٥ ز) و لە (کۆڕی نیکییە)دا هەستان بە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج٢/ ص٢٢١.

شـیکردنەوەی (ڕۆمـا) بەپێـی سروشـتـی بـاوک و کـوڕ، لەم کـۆڕەدا دوو (قسـەس) ئامادەبوون کە نوێنەرایەتی پاپایان دەکرد[1].

### سێیەم/ کارەکانی پاپاوییەت

لەگەڵ دانپێدانانی فەرمانڕەوایەتی ئیمپڕاتۆر بە مەسیحییەتدا بەرپرسیارییەتی و کاروبـاری زۆر کەوتە ئەسـتۆی پاپا و ئەسـقەفەکان، خەڵکێکی زۆر هـاتنە نێو ئەم ئـایینە نـوێیەوە، کە زۆربەیـان هیوایـان وا بـوو کە سـوود لەم بـارودۆخە نـوێیە وەربگرن، زیاتر لەوەی کە باوەڕیان پێی هەبێت. بەهەرحاڵ؛ ئەم کارە پێویستی بە ژمـارەیەکی زۆر کەنیسـە هەبـوو لەگەڵ پێشکەشـکردنی ئامۆژگـاری و ڕێنیشـاندان. پێویست بوو لە سەر پاپا و ئەسقەفەکان، کە پارەکان کۆبکەنەوە بە شێوەیەکی باش یارمەتییەکان دابەش بکەن بەسـەر کەسانی شیاودا، هەروەهـا پاپا ڕۆڵێکی گرنگی هەبـوو لە دانـانی یاسـای کەنیسـەدا پاپا لەو مـاوەیەدا خەریکی دەرکردنـی یاسـای پاپـاوی بـوو، ئەو یاسـا و بڕیـارانەی پاپـا بـوو بە سـەرچاوەیەکی گرنـگ لە سـەرچاوەکانی یاسـای کەنیسـە، بەمەش یاسـا و بڕیارەکـانی کـۆڕی کەنیسـەی بە تەواوی دەرکرد[2].

## پەیوەندییەکانی پاپاوییەت

### یەکەم/ پەیوەندی پاپا بە قوستەنتینییەوە

هـیچ گومـان لەوەدا نیـیە کە گرنگـی ڕامیـاری و ئـابووری بـۆ هەر شـارێکی مەسیحی بەپێی پێگەی ئایینی دیاری دەکرێت، لە سەر ئەم بنەمـایە (قوسـتەنتینییە)ی پـایتەختی نـوێ پێگەیەکـی بەرزی وەرگـرت لە لایەنـی ئـایینییەوە. وەک زانیمـان کە شـارێکی نـوێیە و هـیچ کـام لە هـاوەڵانی مەسـیح سـەردانیان نەکـردووە و هیچیـان ئەسقەفییەیان بۆ دروست نەکردووە! بەهەرحاڵ؛ کۆمەڵگەی (قوستەنتینییە) لە سـاڵی (٣٨١ ز)دا لە ڕووی ئـــایینییەوە بە پـــلەی دووەم دانـــرا لە پـــاش (ڕۆمـــا)؛ بە (قوســـتەنتینییە) دەگـــوترا (ڕۆمـــای نـــوێ)، ئەمەش لەو دەمەوەی کە (پەتریـــاکی

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٨٧

(٢) عبدالامیر محمد امین و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ص٨٧

قوستەنتینییە) دانی بە دەسەلاتی (ئەسقەفی ڕۆما)دا نا وەکوو جێنشینی (قدیس پەترۆس)، لە هەمان کاتدا وەکوو سەرکردەیەک بانگەشەی دەسەلاتی خۆی دەکرد بەسەر هەموو کەنیسەکانی خۆرهەلاتدا[1]. هەروەها لە لایەن کەنیسەکانی خۆرهەلاتەوە داننرا بە دەسەلاتی (قوستەنتینییە)دا، لەمەشدا هیچ کەس ڕووبەڕووی نەبووەوە؛ (کەنیسەی ئەسکەندەرییە) نەبێت، چونکە (میسر) پلەوپایەی بەرزی هەبوو لە (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی) و گەشتە ڕادەی سەربەخۆیی، ئەمە لە لایەک؛ لە لایەکی دیکەشەوە هەولەکانی (ئەسکەندەرییە) بە سەرکردایەتی (ئەسناسیووس) لە دژایەتیکردنی ئاریۆسییەکان پێگە و شکۆمەندی زیادی کرد، لەگەل هەموو ئەمانەشدا و بە تێپەڕبوونی سەدەی پێنجەم قوستەنتینییە دەسەلاتی تەواوی خۆی بەسەر هەموو کەنیسەکانی خۆرهەلاتدا چەسپاند. هەروەها سەرکردایەتی پاپا بەسەر کەنیسەکانی خۆرهەلاتدا دەسەلاتێکی ناڕاستەوخۆ بوو؛ لە ڕێگەی پەتریاکی قوستەنتینییەوە بوو، ئەمەش بە شێوەیەکی بێلایەن نەبوو؛ بەلکوو لەڕێگەی دەستێوەردانی فەرمانڕەوایی ئیمپڕاتۆڕەوە بوو لە کاروباریدا بە شێوەیەکی بەردەوام، تەنانەت لە کێشە ئایینییەکانیشدا[2].

## دووەم/ پەیوەندی نێوان پاپا و پاشای لۆمباردییەکان

دەبێت (ڕۆما) دان بەوەدا بنێت کە شوێنکەوتەی پاشای لۆمباردییەکانە، سەرەڕای ئەوەی کە باجی سالانە بدات؛ پاپا هەولی دەدا کە وا (ئەستولف) بترسێنێت بەوەی بە ڕێگر لەقەلەمی دەدات، یاخود هەڕەشەی لێ دەکات هەتا یارمەتی (ئیمپڕاتۆرییەتی بێزەنتی) نەدات، بەلام ئەم هەڕەشانە سەرینەگرت لە گۆڕینی مەبەستی (پاشای لۆمباردییەکان)؛ لەم کاتەدا (پاپا ستێڤن) ناچار بوو بەخێرایی کار بکات بۆ ئەوەی لەم تەنگانەیە ڕزگاری ببێت. بەم شێوەیە بارودۆخەکە بەڕێوەچوو؛ هەتا سالی (٧٥٢ ز) کە (پیپینووس -بیبنی بچووک-ی کوڕی چارلس مارتل -شارل مارتل-) کرا بە پاشا، ئەمەش پاش وەلاخستنی دوایین پاشای (بنەمالەی میرۆفینجی)، کاتێک کە پەیوەندی نهێنی دروست بوو لەنێوان (پاپا

---

(١) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطى، ص٤٥.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٨٩.

ستێڤن) و (پیپینووس)؛ هەر بۆیە پاپا بڕیاریدا لە ساڵی (٧٥٣ ز)دا پەیماننامە ببەستن، لە یۆلیۆی (٧٥٤ ز)دا پاپا گەڕایەوە بۆ تاجلەسەرنانی (پیپینووس) و نازناوی (پەترياک)ی پێدا[1]. بەڵام (ئەستوولف) بە هۆی هەواڵی هاوپەیمانی نێوان پاپا و شای فەرەنگییەوە ترسا و هەوڵیدا کەوا بارودۆخەکە چاک بکات؛ بەڵام بۆی نەکرا. زۆری پێ نەچوو (سوپای فەرەنگ) لە بەهاری ساڵی (٧٥٤ز)دا باکووری ئیتاڵیای داگیر کرد، لێرەدا (ئەستوولف) نەیتوانی هیچ بەرگرییەک بکات، بۆیە ناچار بوو بەرەو (بافیا) هەڵبێت، بەڵام (پیپنووس) گەمارۆی (ئەستوولف)ی دا و ناچاری کرد کە داوای ئاشتبوونەوە بکات بەوەی کە پشتیوانی پاشای فەرەنگە بکات و مافی پاپاش بگێڕێتەوە، پاش مۆرکردنی ئەم ڕێکەوتنە پاپا بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ (ڕۆما)، خاوەندارییەتییەکانی پاپا وەک یەکەیەکی یەکگرتوو مانەوە لە (ئیتاڵیا)، لە کاتێکدا لە (شانشینی لۆمباردی) شکستی هێنابوو لە یەکخستنی (ئیتاڵیا)دا، پاپا بوو بە دەسەڵاتداری دونیایی؛ لەپاڵ ئەوەی کە دەسەڵاتداری ڕەوانی بوو[2].

### سێیەم/ پەیوەندی نێوان پاپا و ئیمپراتۆرییەت

پەیوەندی نێوان پاپا و ئیمپراتۆرییەت ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە مێژووی ئەورووپا و سەدەکانی ناوەڕاستدا، لەو قۆناغەدا ناکۆکی نێوان سەرۆکی دەسەڵاتی ئایینی و سەرۆکی دەسەڵاتی دونیایی دەرکەوت کە دان بە مەسیحییەت دانرابوو، زۆری پێ نەچوو کەنیسە بینی کەوا جۆش و خرۆشی ئیمپراتۆرەکان بۆ ئایینی نوێ و پارێزگاریکردنی کەنیسە هیچ لە قورساییەکانی سەرشانی کەنیسە کەم ناکاتەوە، کۆمەڵی (نیکیەی ئایینی گشتی) بە هۆی داوای لە (ئیمپراتۆر قوستەنتین) کۆبووەوە، هەر بۆ خۆی بڕیاریدا لەسەر شیکردنەوەی ئەو کێشانەی، کە قسەی لەسەر کرابوو، ڕاستگۆ بوو لە بڕیارەکانیدا، (جستنیان) خۆی وەکوو سەرکردەی باڵای کەنیسە دادەنا و خەمخۆری کەنیسە و زۆر بەجۆش بوو بۆ یەکگرتنی کەنیسە، پاپاش جەختی لەسەر ئەم بڕیارە کردەوە[3].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ٨٩.
(٢) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطى، ص٤٥.
(٣) سانت ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، ص١٩٦.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پەیوەندییەکانی نێوان پاپا و ئیمپڕاتۆر بێبەش نەبوو لە سارد و سڕی و ئاژاوە، لە زۆر کاتدا و بەتایبەتی کاتێک کە پاپا هەوڵی دەدا ڕێک بکەوێت لەگەڵ هەرتەقە ئاریۆسییەکاندا، بە هۆی ناکۆکی نێوان (پاپا مجلیووس) و (ئیمپڕاتۆر جستنیان)؛ پاپا لە (قوستەنتینییە) بەند کرابوو بۆ ماوەی چەند ساڵێک، کاتێک کە دەسەڵاتی (ئیمپڕاتۆرییەتی بیزەنتی) گەڕایەوە بۆ (ئیتاڵیا). بە هۆی فراوانخوازی جستنیانەوە ناکۆکییەکان بەردەوام بوون، لە ڕاستیدا پاشا بیزەنتییەکان ڕقیان لە پاپا بوو، هەوڵیان دەدا بۆ کەمکردنەوەی هەژموونی پاپا بە هەموو ڕێگایەک، بۆ ئەمەش (ئەسقەفی ڕافینا) و ئەسقەفەکانی دیکە هانیان دەدان بۆ ئەوەی بەرەنگاری پاشا ببنەوە، هەروەها هانی هەندێک لە لادەرەکانیان دەدا؛ بەتایبەتی (منۆفستین)، کاتێکیش کە بینیان هیچ سوودێکی نییە؛ ناچار پەنایان بردە بەر بەهێزکردنی پێگەی (پەتریاکی قوستەنتینییە) و هانیان دەدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی پاپا و دژایەتیکردنی[1].

## چوارەم/ ناکۆکی نێوان ڕۆما و قوستەنتینییە

ناکۆکی نێوان (ڕۆما و قوستەنتینییە) لە سەرەتای سەدەی هەشتەمەوە پەرەیسەند، دەرکەوتنی (ئایینی ئیسلام) پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەم بابەتەوە هەبوو، چونکە موسڵمانەکان گاڵتەیان بە مەسیحییەکان دەکرد بەوەی کە مەسیحیەکان پەیوەستن بە وێنە و پەیکەرەوە و زیادەڕەویش دەکەن لە پیرۆزڕاگرتنی ئەو دوو بەرکەوتەیەوە هەتا ڕادەی پەرستن. بیروبۆچوونی جیاواز پەیدا بوو لای مەسیحییەکانی خۆرهەڵات ئامانجیشیان سنووردانان بوو بۆ پەیوەست بوون بەو دوو بەرجەستەبوویەوە (وێنە و پەیکەر) و هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی پیرۆزڕاگرتنیان. پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێبازە بە (اللایقونین) ناسرابوون، ئەمانەش لە لایەن هەندێک لە پاشاکان؛ بەتایبەتی (لیو ئەیسوری) (٧١٤-٧٤١ ز) پشتیوانی دەکران، ئەمەش دژوارییەکی ئایینی ترسناکی دروست کرد[2]. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ناکۆکی نێوان (ڕۆما و قوستەنتینییە)؛ ئەوا بۆ بەدەستهێنانی سەرکردایەتی ئایینی بوو بە سەر گێتی مەسیحییەتدا. قوستەنتینییە بڕوای وا بوو

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ج١/ ص٩٠.

(٢) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطی، ص٤٦.

کە خۆی پێگەی پاشاکانە  و جێگای نیشتەجێبوونیانە، لە دواییدا درا بە (پەتریارکی قوستەنتینییە) کە دەسەڵاتی ئایینی هەبێت بە سەر گێتی مەسیحییەتدا و دەسەڵاتی رامیاریش بەدەست ئیمپراتۆرەوە بوو[1].

لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمدا ناکۆکی نێوان (رۆما و قوستەنتینییە) پەرەیسەند؛ سەرەرای ئەو ناکۆکییە ئابووری و رۆشنبیرییە، بەڵام یەکگرتوویی کەنیسەی مەسیحی هەر بەردەوام بوو، ئەم جیابوونەوەیەش لە سەردەمی دواتردا روویدا، لە راستیدا ماوەی نێوان (٦٥٠–٧٥٠ ز) نزیکەی شەش پاپا لەوێدا هەبوو کە بەبنەچە خۆرهەڵاتی بوون، بەڵام هەر لەم ماوەیەدا دەسەڵاتی پاپا لە قوستەنتینیە دوچاری گیرگرفتی زۆر بویەوە، ئەمەش چەند هۆکارێکی هەبوو لەوانە:-

١-زیاد بوونی جیاوازیی ئابووریی و رۆشنبیریی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا.

٢-چاوتێبرینی هەندێ لە پەتریارکەکانی قوستەنتینیە و ئارەزووی جیابونەوەیان لە رۆما.

٣-دەستێوەردانی ئیمپراتۆرەکان لە کاروباری ئایینیی بە شێوەیەکی بەردەوام[2].

## پێنجەم/ گرنگی ئەسقەفی رۆما

شتیکی سەخت نییە ئەو هۆکارانە بدۆزینەوە کە وایکردووە (ئەسقەفی رۆما) گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەبێت بەسەر ئەسقەفەکانی دیکەی خۆرئاوادا، وەک زانراوە رۆڵی ئەسقەف زۆرجار گونجاوە لەگەڵ رۆڵی رامیاری و ئابووری ئەو شارەی کە تەختی ئەسقەفی تیدا دامەزراوە. ئەگەر بێتوو (خۆرهەڵاتی رۆمانی) دەوڵەمەند ببێت بە شاری گرنگ و بوو بە پێگەی تەختی ئایینیی گەورەی وەکوو (ئەسکەندەرییە، قودس –ئۆرشەلیم– قەیسەرِیە، ئنتاکیا، قوستەنتینییە)؛ ئەوا خۆرئاوا لەم قۆناغە سەرەتاییەدا لە مێژووی مەسیحی هیچی تێدا نەبوو، جگە لە (رۆما و قرتاجە) نەبێت! (قرتاجە) هەرچی کارێکی کردبێت؛ ناگاتە ئەو پێگەیەی (رۆما) کە رابردوویەکی رەسەن و ناوبانگێکی فراوانی هەبوو، هیچ جێگای سەرسورمان نییە

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٩٠.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٩١.

پێگەی تایبەتی (ڕۆما) کە پێی بەناوبانگە لە گرنگی شارەکەی وەرگرتبێت، تەنانەت (ئەسقاقەکانی ڕۆما) ئەم گرنگی و پێگەیەیان بەکاردەهێنا بۆ بەدیهێنانی جۆرێک لە باڵادەستی و سەرکردایەتیکردن بەسەر ئەسقەفەکانی دیکەی (ڕۆما)دا. دەبێت ئەوەش بزانین کە بەدەستهێنانی ئەو سەرکردایەتییە بۆ ئەسقەفی ڕۆما شتێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو دووچاری بەرگری و دژایەتی بووەوە لە لایەن ئەسقەفەکانی دیکەی خۆرئاوا؛ بەتایبەتی (ئەسقەفەی قرتاجە)[١].

### شەشەم/ کەوتنی کەنیسەی خۆرئاوا

لە دەیەی کۆتایی سەدەی سیازدەهەمی زایینیدا؛ (کەنیسەی ڕۆمانی) شکۆمەندی خۆی لە لایەنی ئایینی و دونیاییەوە لەدەستدا، گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە بوون بە هۆی ئەم ڕووداوە بریتی بوون لە:

١.زۆربوونی ئاراستەی ئایینی لەنێوان کۆمەڵگاکانی ئەورووپای خۆرئاوادا.

٢.ئاراستە ئابوورییە دواکەوتووەکان لە شارەکانی ئەورووپادا دژایەتی ئەو کارانەی دەکرد کە کەنیسە بڕیاری لەسەر دابوو.

٣.خواستی بەدەستهێنانی قازانج، دووبەرەکی بەهێزی خستە نێوان بیروباوەڕ و ئارەزووەکانی خەڵک، کەنیسەش نەیدەتوانی ڕێگە لە خواستەکانی خەڵک بگرێت لە بەدەستهێنانی قازانجدا.

٤.ناکۆکیی مێژوویی نێوان پاپا و (بنەماڵەی هۆهنشتاوفن)، کە بە سەرکەوتنی پاپا کۆتایی هات لە ساڵی (١٢٦٨ز)، هیچ شتێک نەبوو جگە لە سەرکەوتنێکی خەیاڵی نەبێت، کە پاپا ویستی دەسەڵاتی ئەڵمانی لە (هەردوو سەقەڵیە)دا بە دەسەڵاتی فەرەنسی بگۆڕێتەوە هەتاوەکوو ساڵی (١٢٨٢ ز)[٢].

ڕامیاری فەرەنسییەکان لە (سەقڵیە)دا بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش بە هۆی ئاژاوەی نێوان (فەرەنسی و ئەرەگۆنییەکانی ئیسپانیا) لەپێناو دەستگرتن بە سەر بەشەکانی (باشووری ئیتاڵیا)دا، بۆیە پاپاوییەت ناچار بوو کە بانگەوازی جەنگی خاچییەکان بکات بە هاوکاری پاشای فەرەنسا (فلیپی سێیەم) لە دژی

---

(١) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطى، ص٤٧.

(٢) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطى، ص٤٨.

(ئەرەگۆنییەکـان) لە (ئیتاڵیـا و ئیسپانیا)دا. ئەم جەنگانە بوونە هۆی کەمکردنەوەی شکۆمەندی پاپا لە ناوەڕاستی ئەورووپای سەروو، هەروەها ڕێگەی لێ گرت لە درێژەپێدانی جەنگـی خاچییەکـان لە زەویـیە پیرۆزەکانـدا، سـەرقاڵبوونی پاپـا لە کاروباری ڕامیاری ئەورووپا لە (ئیتاڵیا)، کاریگەری دیاری هەبوو لە هەرەسهێنانی دەوڵەتی خاچی بە شێوەیەکی یەکجاریی لە ساڵی (١٢٩١ ز)دا[١].

## کۆمەڵگەی کڵێسایی

لە سـەدەکانی ناوەڕاستدا دوو هێزی گەورە لە ئەورووپادا بوونیـان هەبوو، ئەم هێـزانە یەکێکیـان لە ڕۆمـاوە هـاتبوو؛ کە پاپـا بـوو، دووەمیـان لە (فەڕەنسـای ئاوستراسـیا)وە هـاتبوو؛ کە پاشـا بـوو. بەرپرسـیارانی (ئاوستراسـیا) و (پیپنـی هێرسـتال) و (چـارل مارتێـل) دەوڵەتـی فەرەنگیـان بنیاتنـایەوە و ڕێگەشـیان بـۆ ئیمپڕاتۆرییەتێک خۆش کرد. لە پاشـاندا کە (شـارلەمان) جڵەوی دەسـەڵات دەگرێتە دەست، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ (ڕۆما)؛ دەبینین پاپا تێکڕای کڵێسـاکانی خۆرئاوای لە دەوری خۆی کۆکردەوە و خۆی بە سەرۆکی ئەو کۆمەڵگا کاسۆلیکییە دانا، ڕێگای بۆ جێگرەوەکانی خۆش کرد، هەتا بانگەشـەی ئەوە بکەن ئەوان خـاوەن کەسـایەتی تەنهـان بەسـەر ئەو کۆمەڵگـایەدا، لە هەمـان کاتـدا کڵێسـا هـۆیەک بـوو بـۆ نەمـانی (ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی). هەرچەنـدە کڵێسـا زۆر بەهێواشـی و لەسـەرخۆ گەشـەی دەکرد؛ بەڵام لە هەمـان کاتـدا بەدرێژایـی هەمـوو ئەو سـەدانە زۆر بەهێـز و پشـت ئەسـتوور بـوو[٢]. یەکێـک لەو هۆکـارانەی کە پاڵپشـت بـوو بـۆ کڵێسـا؛ (تیۆرییەکـانی پەترۆس) بوو کە دەیگوت: "قەشە پەترۆس وەک میرێکی پەیامبەر وایە کە بەڵێن و مافی دەسـەڵاتی بـاڵای لە کڵێسـادا پێ ڕەوا بینـراوە." سـەبارەت بەو خـاڵەش کە ئەم تیۆرییەی لەسەر هەڵچنراوە لە (ئینجیلی مەتتـا: بەشـی ١٦: بـڕگەی ١٨)دا هـاتووە کە دەڵێـت: "تـۆ ئەی پەتـرۆس؛ لەسـەر ئەم تاشـە بەردە کڵێسـا دروسـت بـکە." پێشـتر ئاماژەمـــان پـــێ کـــردووە کە مەسـیحییەکان لەنـــاو ئیمپڕاتـــۆرییەتەکەدا بەرەو کۆمەڵگایەکی بەرفراوان دەچوون؛ هەر لە (بەڕیتانیا)وە هەتا ڕۆخەکانی (ڕووباری

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٣٠٢.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا في العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ص٣٥.

فورات). لەهەمان کاتدا سیمبوڵی خاچی وشە و قسە کردنی گرتبووەوە، هەر چی مەسیحییەکانن؛ جا سەر بە هەر زمان و دەوڵەتێک بوونایە ئەوا سەرجەم خێزانێکیان پێک دەهێنا، کە ئەویش خێزانێکی (مەسیحی) بوو[1]. لە سەدەی پێنجەمەوە هەڵبژاردنێکی گشتگیر بۆ کڵێساکان دەستی پێ کردبوو؛ ناوچەکان دابەش کرابوون بەسەر چەند ئەسقەفێکەوە، کە لەلایەن ئەساقیفەکانەوە بەڕێوە دەبران، ئەم یەکێتی ئەسقەفیانەش کڵێسای ناوچەکەیان پێک دەهێنا کە لە لایەن میترانەوە سەرپەرشتی دەکرا، لە سەروو ئەمانەشەوە بەتریاک هەبووە کە لە پایتەختەکانی ئەو دەمەی وەک: (قوستەنتینییە، ئەسکەندەرییە، ئەنتاکیا، ڕۆما، قودس، قەیسەرییە، کەبادۆکیا، قەرتاجی تونس و هەرقلیەی تەراکیا) هەبوون. بەو چەشنە کڵێسا دانی دەنا بە دەسەڵاتی باڵای هەریەکێک لەوانەدا لە سەردەمە جیاوازەکاندا، لە ماوەی سەدەکانی پێنج و شەشدا لەژێر فەرمانڕەوایەتی پاشا بەربەرەکاندا؛ لە ئەساقیفەکان ئەو دەسەڵاتەی کە بەدەستیان هێنابوو لە سەردەمی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا پاراستبوویان لە شەڕ و هێرشی ناوخۆ و دەرەوەدا[2].

خوێندکاری کڵێساکان (الرهبانیة)؛ هەڵبەت مەبەست لە سیستمی پەرستگەکانە، بریتی بووە لە ژیانێکی خاوێنتر بۆ ئەوان وەک لە ژیانی ئاسایی سەرجەمی مەسیحییەکان. خوێندکارانی کڵێساکان لە سەرەتادا لە ڕیزی پیاوە ئاینییەکاندا بوون، لە هەمان کاتیشدا خوێندکاران خۆیان ئەو شتەیان نەدەویست؛ بەڵکوو وەک تەواوی خەڵکانی ئاسایی وا بوون، خوێندنی کڵێسا سەرەتا لە میسرەوە دەستی پێ کرد، ئینجا شام. خوێندکارەکان ژیانێکی دژوار و ناڕەحەتیان بەسەر دەبرد لە بارەی ڕۆژووگرتن و بەسەربردنی ژیانەوە، بەڵام خوێندکارانی کڵێسای ئەورووپای خۆرئاوا بەو جۆرە تاڵاوی ناڕەحەتی ژیان و ڕۆژووگرتنیان نەبوو[3].

لە سەردەمی هەڵچوون و لێدانی بەربەرەکاندا چەند حەشارگەیەکیان بۆ خەڵکی کردبووەوە، لەوێدا خەڵکەکە جیا لە جێگەکانی دیکەدا زیاتر هەستی بە پشوودان و دڵنیایی دەکرد، ئەو حەشارگانە بەتایبەت لە سەدەی پێنجەمدا لە (پەرستگەی قەدیس ڤیکتۆر) بوو لە (مێرسیلیا) و هەروەها (پەرستگەی میلان و توور). لەو

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا، ص٢٢.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤٠-٤٢.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: حضارة ونظم اوروبا، ص٣٢.

پەرستگایانەدا قسە و باس لە سەر قەزا و قەدەر و بەخششی خودایی دەکرا، هەروەها سەبارەت بە هەڵە و گوناح. جگە لەوە یاسای پەرستگەکان وا دانرابوون کە بە پێی پێویستییەکانی ئەو دەمەی ئەورووپا بگونجێن، لە هەمان کاتدا خوێندکارەکان دەیانویست لەبەردەم کاروباری پەرستگەکاندا بەرپرسیار بن، ئەگەر وشەی پاپا بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەساقیفەکان بەکار بهێنرایە؛ ئەوا لەوەوبەدوا تەنها بۆ ئەوانە بەکار دەهێنرا کە لەسەر تەختی پاپایی دادەنیشتن و ئەویش تەنها لە (ڕۆما) بوو، ئەسقەفی (ڕۆما) زەوی و موڵکێکی یەکجار زۆری هەبوو؛ ئەویش لە یەکەم سەردەمی (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما) و سەرجەمی (ئیتاڵیا)دا. بەوجۆرە ئەسقەفی (ڕۆما) بەرپرسیار دەبوو لە سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی ئەو زەوی و موڵکانەدا[١].

## ناکۆکی نێوان پاپاکان و بیزەنتە

وەک گوتمان لەو سەردەمەدا پاپا ببووە فەرمانڕەوای ئایینی، کاتێک دەسەڵاتی پاپاکان لە زیادبووندا بوو؛ لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرەکان لە کزی و لاوازیدا بوو، ئەمەش دەبوو دۆخێکی وا بئافرێنێت دژایەتی و بەیەکدادان لەنێوانیاندا پەیدا بێت. لە کۆتایی سەدەی حەوتەمدا کاتێک (پاپا سێرگیووسی یەکەم) ئەوەی ڕەتکردەوە دان بنێت بە بڕیارەکانی (کۆمەڵەی ترولۆ)، هەر لەساڵی (٦٩١ ز)ەوە لە (ڕۆما)دا بەیەکدادان لەنێوان پاپا و ئیمپڕاتۆردا هەبوو، (جەستنیانی دووەم) پیلانێکی بۆ کەنارخستنی پاپاکان دانا بوو، بەڵام هێزە سەربازەکان سەرنەویکردنیان بۆ ئیمپڕاتۆرەکان ڕەتکردەوە، ئەمەش بە هۆی ڕاپەڕین و بەرپابوونی چەند شۆڕشێک بوو لە (ڕۆما)دا. لەم کاتەشدا (پاشا لیوتپراندی لۆمباردی) (٧١٢-٧٤٤ ز) هێرشی کردە سەر ناوچەکانی (ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی) لە (باکووری ئیتاڵیا)، ئەو مەترسییە لە سەردەمی (پاپا گریگۆری)دا سەرلەنوێ دەستی پێ کردەوە، مەبەست لێرەدا (پاپا گریگۆری سێیەم) (٧٣١-٧٤١ ز)ە کە هێرشی بردە سەر (لۆمباردییەکان)، بەمەش هەڕەشەی لێ کردن؛ کەچی نیازی هێرشبردنەسەریان نەبێت؛ بەتایبەتی فەرەنگەکان[٢].

---

(١) فشر: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٣٥.

(٢) حسنين محمد ربيع: تاريخ الدولة البيزنطية، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩٠، ص١٠٠-١٠٥.

دوای (چارل مارتیل)؛ کورەکەی (پیپنی سێیەم) (٧١٤-٧٦٨ ز) کە بە (پیپنی کورتەباڵا) ناسرابوو لە ماوەی دە ساڵدا کارەکانی لە بەهێزکردنی دەسەڵاتیدا چەقی بەستبوو، لە ساڵی (٧٥١ ز)دا نامەیەکی بۆ (پاپا زەکەریا) ناردبوو، تیایدا داوای کردبوو (پاشای مێرۆڤنجییەکان) بەلاوەبنێت و خۆی بکرێتە پاشای فەرەنگ. بۆ وەرگرتنی بڕیارێک لەو بارەیەوە؛ کۆبوونەوەیەک کرا لەگەڵ پیاوانی ناودار لە نۆڤەمبەری ساڵی (٧٥١ ز)دا و لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکەشدا لە مانگی یەکی ساڵی (٧٥٢ ز)دا. لە کۆمەڵەی دووەمیاندا چەند پیاوێکی ئایینی و لە سەروو هەموویانەوە (قەشە بۆنیفاسی) ئامادە بوو، هەردوو کۆبوونەوەکە لە (شاری سواسۆن) ئەنجامدران، لەوێدا بڕیاردرا (پیپنی سێیەم) ببێتە (پاشای فەرەنگ)، بەوجۆرە فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی مێرۆڤینچییەکان (٤٢٨-٧٥١ ز) کۆتایی هات و فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کارۆلینجەکان (٧٥١-٩٨٧ ز) دەستی پێ کرد، ئیدی لەو دەمەوە پەیوەندی نێوان پاپاکان و (پیپنی سێیەم) بەهێز بووەوە[1].

## ئایینی ئیسلام

ئیسلام کە کۆتا ئایینی ئاسمانییە بۆ مرۆڤایەتی؛ سەرچاوەی تێڕامانی موسڵمانانە بۆ ژیان، مێژووی ئیسلامیش تیشکی ڕووناکی لەو ئایینەوە وەرگرتبوو و ئیسلام بنەڕەتێک بووە بۆ پەیڕەوی ژیان، لە ڕووی زمانەوانییەوە ئیسلام واتای ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانە، بەڵام لە ڕووی ئایینییەوە کۆتا ئایینی ئاسمانییە کە خودا پێی ڕازییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی و (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا) (د. خ) وەک کۆتا پەیامبەر ناردوویەتی بۆ ڕێنموونی مرۆڤایەتی و پەری.

بنەڕەتەکانی ئایینی ئیسلام خۆیان لەم خاڵانەی لای خوارەوە دەبیننەوە:

١.خودا تەنهایە و هیچ هاوبەشێکی نییە و چاک و خراپ بە دەست خۆیەتی.

٢.قورئان پەیامی بێگومان و دەستکاری نەکراو و پارێزراوی خودایە.

٣.موحەمەد (د. خ) پەیامبەری خودایە و کۆتایی زنجیرەی پەیامبەرانە، فەرمایشتەکانی لە خوداوەیە {إن هو إلا وحي يوحى}[2] و لە خۆیەوە هیچ قسەیەک ناکات.

---

(١) عبدالامير محمدامين: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٠٢.

(٢) القران الكريم: سورة النجم، آية ٤.

٤.ئیسـلام کۆتـا ئـایینە و لە پەیـڕەوی ژیانـدا لە لای دەسـەڵاتی ئیسـلامی و کۆمەڵگەی موسڵمانان پەسەندە، لە بڕیاری بیروباوەڕی و تێرامان بۆ ڕۆژی دوایی؛ خودا بە ناردنی ئیسلام هیچ ئایینێکی پێشووی ناوێت و پەسەندی نییە {ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه...}[1].

٥.ئیسـلام تەواوکەری ئـایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆیەتی و پەیامبەر (د. خ) وا پێناسـەی خـۆی کـردووە، کە هەمـوو پەیـامبەران وەک خشـتی خـانوویەک وان، خانووەکە یەک خشتی لە سووچێکەوە مابوو ئەویش (موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا)یە (د. خ).

٦.بڕوا بوون بە (خودا و فریشتەکان و پەیامبەران و پەرتووکی خودا و ڕۆژی دوایی و خێر و شـەڕی قەدەر) پایەکـانی بـاوەڕن و بەبێ ئەوانە تـاک لە بـازنەی بـاوەڕدا نابێت، بەڵام ئیسـلام خـۆی بە تەواوکەر و خـاوەنی ئـایینە ئاسـمانییەکانی پێشوو دەزانێت.

٧.قورئان و سوننەت تاکە سەرچاوەی ئایینن و لادان لێیان گومڕاییە، پەیامبەری خـودا (د. خ) (مـوحەمەدی کـوڕی عەبـدوڵا قورەیشـی هاشـمی)یە، کە لە کـۆمەڵگەی عەرەبی حیجـازدا دەرکەوت، ئەم پەیـامبەرە (د. خ) لە سـاڵی (٥٧١ ز) لەدایـک بـوو، پێش لەدایکبوونی؛ بـاوکی کۆچی دوایی کرد. سـەرەتاکانی ژیـانی بە سـەختییەکانی مەرگی باوک و دایک و باپیر و بێ برا و خوشکی بردە سەر، دواتر بەشداری کرد لە جەنـگ و کـاری بازرگـانی و ڕێکخسـتنی کێشـەکان، لە (مەککە) لە سـەر بنەڕەتـی چەسـپاندنی بیروبـاوەڕ کـاری دەکـرد و لە (مەدینـە) دەوڵەتـی دامەزرانـد و دواتـر فراوانخـوازی دەسـەڵاتیی ئیسـلامی هاتەکایەوە، بە تەواوکردنـی پەیـامی خـودایی لە ساڵی (١١ ک) کۆچی دوایی کرد.

دواتر (جێنشینە ڕاشیدییەکان) هـاتن و (سـەردەمی ڕاشـیدی) لە چەنـد بـوارێکەوە هەنگاوی نا:

أ.لە سیستمی دەسەڵاتدا کـارکردن بە قورئـان و سـوننەت و گـرتنەبەری ڕاوێژ و ڕێکخستنی کارگێڕی.

---

(١) القران الكريم: سورة آل عمران، آية ٨٥.

ب.له ئاستی دەرەوەدا فتوحاتی ئیسلامی و پێشڕەوی و بانگەواز کرا بۆ چوونه ناو ئەم ئایینه نوێیه.

له (سەردەمی ئومەوی) بارەکه گۆڕا و ڕاوێژ بۆ پۆستی یەکەم (خیلافەت) نەما و بوو به میراتی، بەڵام فتوحات و بانگەواز لەسەر ئاستی دەرەکی تەواو پێشکەوت، کۆمەڵگه له سێ چین پێکهاتبوو؛ چینی دەسەڵاتدار و زانایان و خەڵکی گشتی، پەیوەندی نێوانیان بەهێز بوو، زانایان هاوسەنگی نێوانیان ڕادەگرتن، باری ئابووریش بەره بەره گەشەی دەکرد.

دواتر (سەردەمی عەباسی) هات که به هەمان شێوەی (ئومەوی) بوو، بەڵام به سێ تایبەتمەندی زیاترەوە:

١.بەشداری بەرفراوانی نەتەوەکانی دیکەی جگه له عەرەب، وەک فارس و تورک و کورد له دەسەڵاتدا.

٢.بزاڤی بەهێزی ژیاری؛ هەم له مەیدانی بیناسازی و هونەری و نەخشاندندا هەم له مەیدانی نووسین و زانستدا به جۆرێک بوو به نموونەی باڵای سەردەمی خۆی.

٣.بوونی فره دەسەڵاتی له سایەی دەسەڵاتێکی بەڕێز سەیرکراوی وەک خیلافەتدا، دەبینن چەندین دەوڵەت و میرنشین و پەیوەست به خیلافەت دەرکەوتن.

سەبارەت به بەریەککەوتنی موسڵمان و مەسیحییەت دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی (دەوڵەتی ئیسلامی) له (مەدینه) له سەردەمی پەیامبەردا (د. خ)، ئەویش کاتێک که ڕۆمەکان عەرەبه بەکرێگیراوەکانی لای خۆیان لەگەڵ سوپایەکی خۆیاندا ڕێکدەخست بۆ لێدانی موسڵمانان و هێرش بردنه سەریان. بۆیه پەیامبەر (د. خ) وەڵامی دانەوە و (جەنگی موئته) ڕوویدا و دواتریش (جەنگی تەبووک) به دوایدا هات که تێیدا لەگەڵ چەند لایەنێکی مەسیحیدا ئاگربەستی کرد، کاتێک ئامادەییان بۆ ڕێکەوتن دەربڕی؛ دواتر له سەردەمی (خەلیفه ڕاشیدییەکان)دا ئەمه بەردەوام بوو، له سەردەمی (ئومەوی)دا موسڵمانان تەواو پێشڕەوییان کرد. مەسیحییەت جیا له شکستی مەیدانی و سەربازیدا؛ شکستی خۆی له مەیدانی هزری و بیروباوەڕیشدا بینی، (سەردەمی عەباسی) بەرفراوانترین ماوەی ئەو جەنگەی بەخۆوەدی و جەنگه خاچییەکان ڕوویاندا.

دابەشبوونی مەزهەبی ناو موسڵمانان و دەرکەوتنی ڕەوتە جیا جیاکانی وەک (شیعە و خەواریج و موعتەزیلە) گرفت بوون بۆ موسڵمانان، هەر چەندە موسڵمانان لە چەند خاڵێکی گشتیدا یەکیان دەگرتەوە بە جیاوازی ئەو هەموو ڕەوتانەشەوە: (یەک خودا، یەک پەیامبەر، یەک پەرتوک، یەک ڕووگە). بەڵام ناکۆکی ڕامیاری زیادمەندی دەکردن، بۆ نموونە پیلانی توندی (شیعە) دژ بە موسڵمانان -سوننە- یاریدەدەری خاچییەکان بوو، یان ڕەوتی کاریگەربوونی (موعتەزیلە) بە بیری دێرینی (یۆنانی)؛ تێکپرژاوی مەیدانی هزری ناو موسڵمانانی لێکەوتەوە، بەڵام وێڕای ئەمانە بەگشتی ڕەوتی ئیسلامی توانی بەسەر بارەکەدا زاڵ ببێت و لە ململانێی مەسیحییەتدا چۆک دانەدات[١].

---

(١) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حسين ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام (السياسي- الديني- الثقافي- الاجتماعي)، دار الجيل، بيروت، ٢٠٠١ م، (٤ اجزاء).

# بەشی پێنجەم

- ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی و بەربەرەکان لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا
- سیستەمی فەرمانڕەوایی
- سەرانە لەناو ئیمپراتۆرییەتدا
- کڵێسای مەسیحییەکان
- بەربەرەکان و دابونەریتیان
- سەردەمی هێرشی بەربەرەکان و باڵادەستییان بە سەر خۆرئاوادا
- تێکچوونی پێکهاتەی تەختی ئیمپراتۆڕییەت لە خۆرئاوادا (٣٦٤-٤٧٦ ز)

## ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی و بەربەرەکان لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا

(قوستەنتین)ی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پاش گۆڕینی شێوەی دەسەڵاتی کارگێڕی فەرمانڕەوایەتییەکەی؛ توانی چەند سەرکەوتنێکی گەورە لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمدا بەدەست بهێنێت و ئارامی و ئاسایش لە وڵاتدا بەرقەرار بکات، ئەگەر پێشتر چارەنووسی ئیمپراتۆر بە ململانێی نێوان سوپا و پاسەوانانی کۆشکی ئیمپراتۆرەوە گرێدراوبوو، ئەوا لە سەردەمی (قوستەنتین)دا خۆی هەموو شتێک بوو.

## سیستەمی فەرمانڕەوایی

ئەوەی پەیوەندیی بە سیستمی دەسەڵاتداریێتی هەبووە لە (قوستەنتینیە)ی پایتەختی ئیمپراتۆریەت؛ دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی شارستانی و سەربازی کاروبارەکانیان بەڕێوە بردووە، بەڵام بە پلەی یەکەم و زیاتر مەدەنییەکان لە بەڕێوەبەرایەتیدا لەپێشترن وەک لە سەربازییەکان، هەر بۆیە دەتوانین ئەو سیستمە دەسەڵاتداریێتییە بەم جۆرە دابەش بکەین[1]:

١. لە سەرووی هەموو دەستەی بەڕێوەبەرایەتی دەزگای دەوڵەتەوە بەرپرسیاری ئەو (ژووری پیرۆزە) دەبینین، کە بە (ژووری ئیمپراتۆر) دەناسرێت، ئەم بەرپرسیارێتییە لەم سەردەمەدا بە (سەرۆکی دیوانی پاشایەتیی) دەناسرێت، ئەو بەرپرسیارە جگە لەوەی بەردەوام لەگەڵ ئیمپراتۆر بووە؛ هەندێک کاروباری دیکەشی گرتۆتە دەست، بۆ نموونە: سەرپەرشتی نزیکەی دە هەزار ئەفسەر و پۆلیسی پاسەوانانی کۆشکی ئیمپراتۆری کردووە، ئەمە جگە لە سەرپەرشتی کردنی (کۆگاکانی چەک و تەقەمەنی)، ئەم ئەرکە لە چوار بەش پێک هاتووە و خۆی بەرپرسیار بووە لە بەڕێوەبردنی ئەو بەشانە، کە ژمارەی کاربەدەستەکانیان لە (١٥٠) نووسەر پێک هاتبوون[2].

---

(١) ستيفن رانسمان: الحضارة البيزنطية، ت: عبدالعزيز توفيق جاويد، مكتبة المصرية، القاهرة، ١٩٦١ م، ص٧٧-٧٩.

(٢) ادوارد جيبون: اضمحلال الامبراطورية الرومانية وسقوطها، دار الكتاب العربي، القاهرة، ١٩٦٩ م، ج١/ ٥٠٩.

٢.وەزیـری دەوڵەت بە نـاوی ئیمپڕاتـۆرەوە دواوە و هەمـوو ڕێوڕەسـمەکانی ئیمپڕاتۆر و بڕیارەکانی تۆمار کردووە.

٣.سەرپەرشتیار؛ کاری سەرپەرشتی کردنی شوێنە پیرۆزەکان بووە، تەواوی بەڕێـوەبەرانی نـاوخۆیی و کاربەدەسـتانی دارایـی ئیمپڕاتـۆرییەت لەم ڕووەوە پەیوەنـدی ڕاسـتەوخۆیان بە سەرپەرشـتیارەوە هەبـووە، لە هەمـان کاتـدا ئەم سەرپەرشـتی کـارە دادوەرییەکانیشـی کـردووە، کە پەیوەنـدی بە کاروبـار و گیروگرفتەکانی داراییەوە هەبووە.

٤.سەرپەرشـتێکی تـایبەت بۆ ئاگاداربوون لە موڵک و زەویوزارە تایبەتییەکانی ئیمپڕاتۆر هەبووە[1].

٥.سـەرکردەی هێـزی سـوارە (فرسـان)؛ کە تـایبەت بـووە بە ئیمپڕاتـۆر لەگەڵ سـەرکردەی هێزی پیادە (مشـاة)، ئەو دوو سـەرکردەیە نزیکەی ٣٥٠٠ سـەربازیان لەژێـر دەسـتدا بـووە، کە بەسـەر حەوت بەشـدا دابەش کـراون زۆریـنەی ئەو سـەربازانەش لە ئەرمەنەکـان پێـک هـاتبوون. جـگە لەمـانە؛ چەنـد دەسـتە و بەرپرسـیارییەتییەکی دیـکەی وەکـوو: (دەرگەوان، نـۆکەر، سـیخوڕ و خزمەتکـار) هەمەجۆر بوونی هەبووە، لە لایەکی دیکەوە ئەو دابەش کردنەی کە لە سـەردەمی (دیۆکلـدیانۆس)دا هەبـوو؛ (ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی) بەسـەر چـوار هەرێمـدا دابەش کردبـوو، هەتـا ئەم سـەردەمەش وەکـوو خـۆی مـابووەوە بە بـێ ئەوەی یەکێتـی تەواوی خاکی (ڕۆمانی) خستبێتە مەترسییەوە، بەڵام ئیمپڕاتۆر فەرمانڕەوایانی ئەم هەرێمـانەی لە دەسـەڵاتی سـوپایی خسـتبوو، کاروباریـان ببـووە بەجێگەیانـدنی فەرمانەکانی ئیمپڕاتۆر و کۆکردنەوەی باج[2].

## سەرانە لەناو ئیمپڕاتۆرییەتدا

هەر شارێکی (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمـانی) ئەنجوومەنێکی پیرانـی خـۆی هەبـوو کە پێک هاتبوون لە خـاوەن زەویوزارەکـان، هەریەکەیـان لایەنـی کەم پازدە فەدان؛ هەر فەدانێکـیش (٤٢٠٠،٨٣ م)، (١٥٠) دۆنمـی هەبـووە و دۆنمێـک (٢٥٠٠ م)، ئەم

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٩.

(٢) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٥-٥٧.

ئەنجوومەنە کاروباری شارەکانیشی بەڕێوە دەبرد کە لە هەر شارێکدا دادوەرێک و سەرانە کۆ کەرەوەیەک و ئەفسەرێکی پۆلیسی هەبووە. ئەو جۆرە دەسەڵاتدارییە لە شارەکاندا ببووە هۆی کەم کردنەوەی ئازادی دانیشتووان، دەسەڵاتی ناوەندی لە ڕێی ڕاوێژ کردن بە خاوەن زەویوزارەکان؛ دەیتوانی دەست بەسەر هەموو زەویوزار و کۆ کردنەوەی سەرانەکاندا بگرێت، ئەمەش ناڕەحەتییەکی زۆری بۆ کاربەدەستانی شارەوانی دژ بەو ئەنجوومەنە (ئەنجوومەنی پیران) دروست کردبوو. سەرانە لەچاو دەستکەوتی ساڵانەی خەڵکەکەدا زۆر بوو، کاتی خۆی (قوستەنتینی یەکەم) لە ساڵی (٣١٢ ز)دا ئەو جۆرە سەرانەیەی دانابوو، واتە (سەرانەی زەویوزار) جگە لەو سەرانەیە؛ کۆمەڵێک سەرانەی دیکەش وەردەگیرا، وەک: (سەرانەی بازرگانی، پیشەسازی، شتومەک بردن، شتومەک هێنان و گومرگ)، تەنانەت لە دەریاوانەکان و خواردەمەنیش سەرانە وەردەگیرا، ئەمانە ببوونە هۆی پەیدابوونی گرانی و کاریگەری خراپی کردبووە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی و هزریی و پێشکەوتنی کۆمەڵگەکە[١].

## کڵێسای مەسیحییەکان

لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا سەرەڕای هەوڵدانی بێ ئەنجامی (جولیانی ئیمپراتۆر)؛ ئایینی بتپەرستی بەرەو نەمان دەچوو، ئایینی مەسیحی وردە وردە جێی سروشتی خۆی لە کۆمەڵگەی ڕۆمانیدا کردەوە، (قوستەنتینی ئیمپراتۆر) ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە سەرخستنی ئایینی مەسیحیدا، بە چوونی (قوستەنتین) بۆ سەر تەخت؛ مەسیحییەتیش بوژانەوەی بە خۆیەوە دی، (قوستەنتین) هەموو سەرانەیەکی شارەوانی لە کڵێساکان دوور خستبووەوە و موڵکێکی زۆری ئیمپراتۆرییەتەکەشی پێ بەخشیبوون و ڕاسپاردن و ڕاوێژکردنیشیان هەبوو، بەمەش کڵێساکان دەوڵەمەند و بەهێز بوون. لەو دەمەدا؛ کە وێژەی بتپەرستی بەرەو نەمان دەچوو، وێژەی مەسیحی بەرەو گەشەکردن هەنگاوی دەنا، کڵێسا لەو کاتەدا؛ کە هەموو شتێک لە دەوروبەریدا بەرەو تێکشکان و داڕمان دەچوو، جگە لەوەی توانی خۆی ڕزگار بکات؛ بەرنامەیەکی دانا کە لە دواڕۆژدا هەموو مرۆڤایەتی لەژێر ئاڵاکەیدا کۆ

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٦٠.

ببێتەوە و لە هەموو شوێنێکدا تەنانەت لەناو بەربەرەکانیشدا بڵاو بوونەوە و وەک موژدەدەر بانگی مەسیحییەتیان بە گوێی خەڵکدا دەدا[١].

## بەربەرەکان و دابونەریتیان

(ڕۆما) لەگەڵ ئەوەی خۆی وەک زلهێزێکی گیتی پیشان دەدا؛ بەڵام ئەو ڕاستییەشیان دەزانی کە ئەو توانایەیان نییە لە هەر ناوچەیەکدا کە بیانەوێت و لە بەرژەوەندییاندا بێت سنورەکانیان فراوان بکەن، بەتایبەت ئەو ناوچانەی کە لە باکوورەوە بۆ باشوور و لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا هۆزە نیشتەجێکانی ئەو ناوچانەی لێ دەژیان. لە سنوورەکانی باکوور سێ گەلی گەورەی لێ دەژیا: (جەرمەنەکان، سلاڤ و گەلەکانی ئاسیا)، لە خۆرهەڵاتەوە (ساسانییەکان) بوون کە زۆرجار لەگەڵ (ڕۆما)دا لە پێناوی دەسبەسەرداگرتنی چەند شارێکی سنوورییدا بەشەڕ دەهاتن، لە باشووریشەوە (موسڵمانەکان)ی لێ بوو، کە هەتا ئەو دەمە هێشتا نەبوونە جێی مەترسی بۆیان، جگە لەوان لە بیابانەکانی باکووری ئەفریقادا هۆزە بەربەرەکانی لێ دەژیان کە بەردەوام مەترسییان بۆ سوپای (ڕۆما) پەیدا دەکرد، ئەو هێزە دەرەکییانە لەگەڵ ئەوەی هۆکاری لاوازبوونی (ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆما) بوون، بەڵام بیریان لە داگیرکردنی (ڕۆما) نەدەکردەوە[٢].

ئەوەی پەیوەندیی بە جەرمەنەکانەوە هەیە؛ ئەوا هەر لە سەردەمی (ڤالێنز)ی ئیمپڕاتۆرەوە پاش تێکشکان و کوشتنی لە شەڕی (ئەدرنا) لەساڵی (٣٧٨ ز)دا مەترسییان بۆ (ڕۆما) پەیدا کردبوو، بەڵام پاش کۆچی دوایی جێنشینەکەی (ثیۆدیۆسیوسی یەکەم) لە ساڵی (٣٩٥ز)دا ئەو مەترسییە لەسەر سنوورەکانی باکووری ئیمپڕاتۆریەتەکە زیاتر و ئاشکراتر بوو، کە (گەلانی سلاڤی) پشتیان گرتبوون، ئەم سلاڤانەش لە لایەن هۆزە ئاسیاییەکانی دەوروبەری (ڕووباری مین) هاتبوون، هۆزەکانی (مارکۆنی، هێرۆل و گۆت) بەرەو (ڕووباری دانووب) ڕۆیشتبوون، لە خۆرئاواشەوە بەدرێژایی باشووری (ڕووباری ڕایین)؛ (هۆزەکانی فەرەنجە) تێیدا جێگیر بوون، لە باکووریشەوە (هۆزەکانی فریزبان) بوو لە

---

(١) دوارد جیبون: سەرچاوەی پێشوو، ج١/ ص٥٨٨.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٦٢.

کەنارەکانی (گۆمی فلیڤۆ) لە خۆرهەڵاتیشەوە (هۆزەکانی ڤەنداڵ و لۆمباردیەکان)ی نێوان (ڕووباری ئالْپ و ئۆدەر) هەبوون، جگە لە هەموو ئەوانە گەلەکانی (ئەنگلۆساکسۆن و دانیمارکی و سویدی)؛ واتا (ئیسکەندنافیا) بوون، کە ئەمانە تەنها لە سەدەی نۆیەمی زاییندا ببوونە مەترسی بۆیان[١].

(فەرمانڕەوایەتی جەرمان) لە (کۆمەڵەی مالی) پێک هاتبوو، کە هەموو کەسێک بەشداری تیدا دەکرد، وەک خۆیان دەیانگوت کە ئەم کۆمەڵە زۆر پیرۆز بووە لایان، چونکە خودا بۆ خۆی دایمەزراندووە، ئەم کۆمەڵگایانەش بۆ خۆی کاروبارەکانی دەسەڵاتی دادوەری بەڕێوە دەبرد، لە کاتێکدا کە خەڵکانی ئازادیخواز کۆ دەبوونەوە و پێکەوە دەنگیان دەدا، ئەو خەڵکانەش بیروباوەڕێکی پتەوی وا کۆی کردبوونەوە؛ کە هێندەیان باوەڕ بە خۆیان بوو لە هیچ شتێک نەدەترسان، تەنانەت جەرمانەکان بایەخێکی ئەو تۆیان بە کشتوکاڵ کردن نەدەدا، هیچ کەسێک زەویوزارێکی تایبەت بە خۆی نەبوو، دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوایەتی بۆ هەر گوند و خێزانێک پارچەیەک لە زەوی دەدانێ و ئەم چەشنە سیستمەش یەکسانییەکی لە دابەش کردنی سامانی وڵاتەکەدا بۆ دانیشتووانی دابینکردبوو[٢].

سەبارەت بە ژیانی خەڵکیش ڕێگە نەدەدرا پیاوێک چەند ژنێک بهێنێت؛ تەنها بە پیاوانی ناودار نەبێت، بە گشتی بایەخێکی زۆریان بە مەی خواردنەوە دەدا؛ بەتایبەت لە بۆنە و جەژنەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا گەلێک جار جەژنەکان بە خوێنڕشتن و کوشتنی یەک لە میوانەکان کۆتایی دەهات! واتە هەندێک لایەنی ژیانی جەرمانەکان جۆرێک لە بەربەرییەتی تێدا بوو، کەچی دوو گەلی بەربەری دیکەش زیاتر پشتیوانیان لە جەرمانەکان دەکرد و هانیان دەدان بۆ ئەوەی بە زەبرتر بن، ئەوانیش (سلاڤ و هۆن) بوون، سلاڤەکان لە ناوچەکانی (ڕووباری دانووب) و (دەریای ڕەش) و (ڕووباری ڤۆلگا) بە درێژایی (دەریای بەڵتیک) بڵاو ببوونەوە و بەسەر سێ کەرتدا دابەش ببوون کە ئەمانەن:

١.سلاڤەکانی باشوور: کە خەڵکی (بۆسنە و سرب و کروات بوون).

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٤.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٦٣.

٢.سلاڤەکانی خۆرئاوا: نیشتەجێی (ڕووباری دانووب) و (دەریای ئەدریاتیک) بوون، کە ئەمانەش پۆلۆنی و چیک و مورافییەکان بوون.

٣.سلاڤەکانی باکوور: لەنێوان (ڕووباری ئالْپ و فستولا و بەلْتیک) و (چیایەکانی کروات)دا دەژیان و بە نیشتەجێ بووەکان ناسرا بوون، فینلەندییەکانیش لەگەلْ ئەواندا بوونەتە یەک و نەتەوەیەکیان لێ دروست بوو؛ کە بە (ڕووسیای سەرەتایی) دەناسران[1].

هۆنەکان؛ کە دەچنەوە سەر (ڕەگەزی ئۆراسی تەتەری) و بەناوبانگترین کەسایەتیان (ئاتیلا) بوو، سەرچاوەیەکی مەترسیدار بۆ هەموو گەلەکانی خۆرئاوا؛ لەوانەش جەرمانی و ڕۆمانییەکان. ئەمانە شێوەی ڕووخساریان بەم جۆرە بوو: (چاو تەنگ و بچووک، لووت پان و گوێ گەورە، پێست گەنمی و خالْ خالْی)، ڕەنگە ئەم شێوە ڕووخسارە شتێکی سەیر بووبێت بۆ خەلْکی ئەورووپا، مێژوونووسی بەناوبانگی بێزەنتی (ئەمیانووس مارسێلینووس) ناوی نابوون (دڕندەی دووپێ)، جگە لەم ڕەگەز تەتەرانەی کە گەیشتبوونە ئەورووپا، هەندێک لە گەلەکانی دیکەش پەڕیبوونە ئەوێ، وەک (بولگار و خەزەرییەکان) لەسەدەی حەوتەمدا و (مەجەڕییەکان) لە سەدەی نۆیەمدا و (مەغۆلەکان) لە سەدەی سیازدەهەمدا و (تورکەکان) لە سەدەی چواردەهەمدا، بێگومان هێرش و پەلاماردانی تورکەکان دوا داگیرکردنی ئەورووپا بووە[2].

## سەردەمی هێرشی بەربەرەکان و بالآدەستییان بە سەر خۆرئاوادا

(ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی) بە هەردوو بەشەکەیەوە (خۆرهەلآت و خۆرئاوا) دووچاری دەردەسەرییەکی زۆر ببوو بە هۆکاری (هۆزە جەرمانی و ئاسیاییەکان). ئەنجامی خەباتی (هۆزە جەرمانییەکان)؛ دابڕاندنی بەشی خۆرئاوای لێ کەوتەوە و تێیدا بوون بە فەرمانڕەوا و چەند دەولْەتێکیان پێکەوەنا، تەنانەت هەندێکیان بوون بە بنچینەی دەولْەتە نوێیەکانی ئەورووپا! (جەرمانییەکان) گەلێکی سەرەتایی بوون؛ لە ژیانی هۆزایەتیدا دەژیان، لەنێوان هەردوو (ڕووباری ڕاین) لە خۆرئاوا و (دنیبر) لە خۆرهەلآت و لەنێوان هەردوو دەریای (باکوور و بلگین)دا و لە (باکوور)

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٦٦.

(٢) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٩-٦٤

و (دانووب) و شاخەکانی (الکوییات و ئالب)دا لە باشوور ئاکنجی ببوون، واتە شوێنی نیشتەجێبوونیان لە دەرەوەی سنووری ئیمپڕاتۆرییەتدا بوو. پەیوەندییە ئاشتەوایی و شەڕانگیزییەکانی نێوان (جەرمانی و ڕۆمانییەکان) هەتا ڕادەیەک دێرین بوو، هەر لە ساڵی (١٠١ پ. ز) هۆزەکانی (کمبری و تیوتن) هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی دۆڵی (ئەلپوو)یان داوە لە (ئیتاڵیا)، هەروەها (هلڤیتییەکان) هەوڵی دابڕاندنی (دەشتی بورگندی)یان داوە، بەڵام هیچ کامێک لەو هەوڵانە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا؛ بە هۆی بەرگری ڕۆمانییەکانەوە. هەر بۆیە بەشێک لەم هۆزانە ناچار بوون لە گەڕاندا بن بەرەو خۆرهەڵات لە (ناوچەی سلاڤییەکان)دا و لە پێدەشتەکانی (باشووری ڕووسیا) هۆزەکانی (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) لە باکووری خۆرهەڵاتی ناوچەی (دەریای ڕەش) نیشتەجێ بوون؛ نزیک بە هۆزەکانی (گووتە خۆرئاواییەکان). لە نزیک ئەمانیشەوە (هۆزەکانی ڤەندال) لە ناوچەکانی (دانووبی ناوەڕاست)دا نیشتەجێ بوون "کە ئێستا لەنێوان ڤیەننا و بۆدابستدایە"(١).

جموجووڵەکانی ئەم سێ کۆمەڵە هۆزە لەو هۆکارانە بوون کە وای لە هۆزە جەرمانییەکانی دیکە کرد یەکێتییەک پێک بهێنن بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکانیان، ئەو یەکێتی هۆزایەتییە کە دروست بوو؛ بە (ئەلْمانی) ناسرا، کە بە واتای یەکێتی هەموو پیاوەکان، لە ناوچەکانی باشووری خۆرهەڵاتی (ڕووباری ڕایین)دا؛ (یەکێتی بورگندیش) لە نزیک (ڕووباری المین)دا و یەکێتی (فەرەنگە کەنارییەکان) لە خوارووی (ڕووباری ڕایین)، (فەرەنگە سالییەکان) یەکێتییەکیان پێک هێنا لە زەوییە نزمەکانی نزیک (ڕووباری سالا)، فەرەنگەکان بەو دوو ناوە ناوبراون بە هۆی شوێنە جوگرافییەکەیان، چونکە (جولیان) ڕێگەی پێدان ئەم ناوچانە داگیر بکەن، هەروەها چەند یەکێتییەکی دیکە دروست بوون لە لایەن (ئینگلیز و سەکسۆن و گووت)ەکانەوە(٢).

ئەوانەی لە ناوچەکانی نێوان هەردوو (ڕووباری ڕایین و ئەلبا)دا نیشتەجێ بوون؛ لەسەر کەنارەکانی (دەریای باکوور) و لە خۆرهەڵاتی ئەوانیشدا یەکێتی هۆزەکانی (لۆمباردیا) نیشتەجێ ببوون، وا مەزندە دەکرا بڵاو بوونەوەی (هۆزە

---

(١) فشر: تاريخ العصور الوسطى، ص١٩-٢٠.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٦.

جەرمانییەکـان) لە نـاوچە سـلاڤییەکاندا ئیمپراتـۆرییەت لە گوشـاری جەرمانییەکـان بپارێزێـت، بەڵام کـۆچێکی دیـکەی پـێچەوانەی هۆزەکـانی (گـووت و ڤەنـداڵ)ەکان ڕوویـدا بەرەو ناوچەکـانی خۆرئـاوا و (ئیمپراتـۆرییەتی ڕۆمـانی)، ئەم کـۆچە پێچەوانەیە؛ بوو بە هۆی نائارامی شوێنەکانی ئەو هۆزانەی کە پێشتر باسمان لێوە کردوون و بەرەو ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەت هەڵکشـان، هـۆی سـەرەکی ئەم کۆچە پێچەوانەیە؛ ئەو شـەپۆلە کۆچە بـوو کە لە ئاسیاوە بەرەو ناوچەکانی خـۆرهەڵاتی ئەوروپـا دەسـتی پـێ کردبـوو، لە سـەدەی چـوارەمی زایینیـیەوە لە ڕێگـای ئەو تەنگەبەرەوە کە لەنێوان (شـاخەکانی ئـۆڕاڵ و دەریـای خەزەر)دایە، گرنگترین ئەو کۆمەڵە هۆزانە (هۆزەکانی هۆن) بوون[1].

لە سـەدەی سـێیەمی زایینیـدا نـاوچەی (هۆنەکـان) لەنێـوان (دەریـای بەلکـاش و ئـوڕاڵ)دا بـوون، لە ئەنجـامی مانـدووبوونیان لەو بەرگـرییەی کە لە بەرامـبەر (چینییەکان)دا دەیانکرد؛ لە ساڵی (٣٥٥ ز)ەوە ڕوویان لە پێدەشتەکانی ڕووسیا کرد و شکسـتیان بە بەرگری (هـۆزە ئالانییەکـان) هێنـا، (ئالانییەکـان) ئەو کـۆمەڵە هـۆزە بـوون کە لە خـۆرهەڵاتی (گـووتە خۆرهەڵاتییەکـان)ەوە نیشـتەجێ ببـوون. پاشـان (هۆنەکان) لە سـاڵی (٣٧٢ ز) توانیـان (ڕووبـاری ڤۆڵگا) ببڕن و هێرش بکەنە سـەر (گـووتە خۆرئاواییەکـان) لە ناوچەکـانی (یـوکرین)دا، پاشـا (ئـورنیخ) کە پاشـای هۆنەکان بوو؛ لە ئەنجامی دۆڕانی شـەڕەکەدا خـۆی کوشت، پاشماوەی گووتەکان هەتـا سـاڵی (٤٥٥ ز) لەژێر ڕکێفی هۆنەکانـدا مـانەوە، لەو سـەروبەندەدا هۆزەکـانی (گووتی خۆرئاوا) لە ساڵی (٣٧٦ ز) داوایان لە ئیمپراتور (ڤالێنز) کرد کە ڕێگایان پێ بـدات (ڕووبـاری دانـووب) ببڕن بە مەبەسـتی ئەوەی پەنـا بـدرێنەوە لە سـنووری ئیمپراتۆرییەتەکەیدا[2]، بە چەند ئەگەرێک ئیمپراتـور داواکارییەکەیـانی پەسـەند کرد؛ لەوانە:

١. قازانج کردن لە توانەکانیان لەپێناو پاراستنی سنوورەکانی ئیمپراتۆرییەتدا.

٢.بەکارهێنانیان لە کاروباری کشتوکاڵیدا.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٢-٧٤.

(٢) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا العصور الوسطى الباكرة، ص٦٢.

٣.بۆ بەهێز کردنی (ئاینزای ئاریۆسییەت) کە خودی ئیمپراتۆر باوەڕی پێ هێنابوو، چونکە (گووتەکان) پێش بەستنی (کۆنگرەی نیقیا) لە ساڵی (٣٢٥ ز) باوەڕیان بەو ئایینزایە هێنابوو، ئەمەش بە هۆکاری (قەشە یولفیلاس) کە لە ساڵی (٣٤١ ز)ەوە بانگەوازی (ئاریۆسی) لەنێو ئەو هۆزانەدا بڵاو کردەوە.

ڕەزامەندی ئیمپراتۆر لەسەر داواکارییەکەیان بەپێی ئەم مەرجانەی خوارەوە بوو:

١. دەبێت چەکەکانیان ڕادەست بکەنەوە.

٢.منداڵی ڕێبەرەکانیان وەکوو بارمتە بدرێنە دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت، ئەمەش بۆ دڵنیابوون لە نیازپاکیان بەرامبەر بە ئیمپراتۆرییەت، بەڵام کردەوەکانی (سوپای ڕۆمانی) لە دەستبەسەرداگرتنی خۆراک و تاڵان کردنی مەڕوماڵاتیان بووە ئەگەری بەرپاکردنی شۆڕشێک دژ بە ڕۆمەکان لە ساڵی (٣٧٨ ز)[١].

(ئیمپراتۆر ڤالێنز) هەوڵیدا بارودوخەکە هێمن بکاتەوە؛ بەڵام لە ئەنجامی پێکدادانێکدا لە ناوچەی (ئەدریانۆبل) لە هەمان ساڵدا کوژرا، ناوچەی (ئەدریانۆبل) یەکێکە لە ناوچە سەربازییە گرنگەکان و بە بۆچوونی مێژوونووسی هاوچەرخیان (ئەمیانووس مارسلینووس) -ئەم ڕووداوە- ئەنجامی ترسناکی هەبووە لە سەر ئیمپراتۆرییەت، (ئەمیانووس مارسلینووس) ئەوەی ئاماژەی بۆ کردووە کە خاڵی وەرچەرخان بووە لەنێوان مێژووی دێرین و ناوەڕاستدا؛ بەربەرەکان لەو کاتەوە خاکی ڕۆمانییەکانیان بەجێ نەهێشتووە! لە لایەکی دیکەشەوە ئەم شەڕە؛ ڕۆمانەکانی لەوە بەئاگا هێنا کە شێوازی دێرینی کردەوە سەربازییەکانیان بێسوودە لەو شەڕەدا، دیارە تیپە پیادە ڕۆمانەکان کاریگەر نین و پێویستە بگۆڕدرێن بە تیپی (سوارچاک)، کە توانای جموجوولی خێرایان هەبوو[٢].

ئیمپراتۆر (سیۆدۆسیووسی یەکەم) ساڵی (٣٧٩-٣٩٥ ز) توانی ئاگربەستێک لەگەڵ (گووتە خۆرئاواییەکان)دا بکات، بەڵام مەترسییەکەیان لەسەر (ئیتاڵیا) زۆر بوو لە ناوچەکانی (ئەدریاتیک)ەوە لە سەردەمی ئیمپراتۆری خۆرئاوا (ئەنوریووس)ی تازەپێگەیشتوو، لە بەشی خۆرئاوادا دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ لەدەست

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٣.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٤.

ژەنەڕاڵێکی جەرمانیدا بوو بە ناوی (ستیلکۆ)، ئەم ژەنەڕاڵە توانی بە شێوەکاری سەربازی و دیپلۆماسی دەستدرێژییەکانی (گووتە خۆرئاواییەکان) ڕابگرێت، بەڵام بوو بە قوربانی پیلانی کەسانێک و تۆمەتی پیلانگێڕان دژی دەسەڵات درایە پاڵی و ساڵی (٤٠٨ ز) خوی و چەندین کەسی لایەنگری کوژران، ئەوانی دیکەش توانیان ڕابکەن و پەیوەندییان کرد بە (ئەلاریک)ی سەرکردەی گووتە خۆرئاواییەکانەوە، بۆیە سەرکردەی گووتەکان ئەم هەلەی قوستەوە و داوای کرد لە (ئەنوریووس) کە پەلە بکات لە باجدان، هەروەها وەک بە فەرمانڕەوای ناوچەکانی (ئەدریاتیک) دایبمەزرێنێت. بەڵام کاتێک ئیمپڕاتۆر داواکارییەکانی ڕەتکردەوە؛ لەشکرکێشی کردە سەر (ڕۆما) و خستییە ژێر ئابڵوقەدانێکی توندەوە، هەتا وای لێ هات خواردن بەرەو نەمان چوو و خەڵکی یەکدیان دەکوشت لە پێناو هەندێک خۆراکدا[1].

دانیشتووانی (ڕۆما) لە (ئەلاریک) داوایانکرد بۆ ئەوەی لە ڕێگای گفتوگۆوە بگەنە ڕێکەوتنێک، (ئەلاریک) بەرامبەر بە ڕێکەوتن چەند داواکاریەکی هەبوو؛ وەک ئەوەی پێویستە هەموو سەروەت و سامانەکەیان ڕادەستی ئەو بکەن، شاندی گفتوگۆ کاتێک لێیان پرسی: "تۆ چیت هێشتەوە بۆ ئێمە؟" لە بەرامبەردا وەڵامی دانەوە و گوتی: "گیانەکانتانم بۆ ئێوە بەجێ هێشتووە!" لەگەڵ ئەوەشدا (ئەلاریک) ڕازی بوو بەوەی کە ئاگربەستێکیان لەگەڵدا ببەستێت بەرامبەر بە (پێنج هەزار پاوەندی زێڕ و یەک هەزار پاوەندی زیو و چوار هەزار قاتی بەرگی ئاوریشمی و سێ هەزار پاوەند لە بەهارات). بەڵام ئاگربەستەکە پێشێل کرا؛ پاش ئەوەی یەکێک لە لایەنگرانی (ئەلاریک) بە ناوی (ساروەوس) چووە ناو ڕۆمانەکانەوە و پێشوازی لێ کرا و (سارووس)یش دەستی بە هێرش کردن کرد بۆ سەر سوپای (ئەلاریک)، بۆیە (ئەلاریک) ئەم کردەوەیەی بە پێشێل کردنی ئاگربەستەکەی زانی و لە ساڵی (٤١٠ ز) پەلاماری (ڕۆما)ی دا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تەواوی شارەکەی لەبەردەم سوپاکەیدا واڵا کرد و لە ئەنجامدا بێجگە لە (کەنیسەکان)؛ بە هەزاران کەس دیل کران کە لە نێوانیاندا خوشکی ئیمپڕاتۆر (کالابلاسیریا) بوونی هەبوو[2]. لە ڕۆژی شەشەمدا ڕۆمای بەجێهێشت و بەرەو (سقلّیە) بەڕێکەوت، بەڵام لە ڕێگادا و هەر لە

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٨٠.

(٢) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا، ص٦٣-٦٤.

هەمان ساڵدا کۆچی دوایی دەکات و بە شێوەیەکی دراماتیکی کە شیاوی سەرکردە بەربەرییەکان بوو؛ لە شوێنێکدا کە بە (کوزانزا) ناودەبرێت لە دەریادا دەنێژرێت. بەم شێوەیە (گووتە خۆرئاواییەکان) دووەمین گورزی خۆیان لە (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی) وەشاند، داگیرکردنی (ڕۆما) لە لایەن بەربەرەکانەوە کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر ڕۆمانەکان؛ چونکە ئەوان ڕۆمایان بە پایتەختی هەرە زیندووی خۆیان دادەنا و چەند جارێک (هانیباڵ) هەوڵی داگیرکردنی دابوو. داگیرکردنی (ڕۆما) بە کارەساتێکی گەورە و گرنگی ڕامیاری و سەربازی دادەنرێت، ئەم داگیرکردنە هەموو سەرچاوە و توانای سەربازی دەوڵەتی ئاشکرا کرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بتپەرستەکان ناڕازی بن بە وازهێنانی سەرکردەکانیان لە بیروڕا دێرینەکان و پابەندبوونیان بە مەسیحییەتەوە. ئەم کارەساتە کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو بە سەر مەسیحییەتەوە، چونکە وایان دادەنا بیروباوەڕی نەرمونیانی مەسیحییەت بووە هۆی ڕووخانی ورەی سەربازەکان! بەڵام (قەشە ئۆگستین) بەرپەرچی ئەم بۆچوونانەی دایەوە لە پەرتوکەکەیدا (شاری خودا). سەرەڕای (ڕووخانی ڕۆما)؛ دیارە نیازی (گووتە خۆرئاواییەکان) تەنها ئەوەندە نەبوو (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما) بڕوخێنن! بەڵکوو دەیانویست دەست بەسەر بەشێک لە خاکەکەیدا بگرن و ببن بە خاوەنی سەروەت و سامانەکەی، بۆیە (ئەوتولن) بەوە ڕازی بوو کە لە (ئیتاڵیا) پاشەکشە بکات بەرامبەر بە داگیرکردنی ناوچەی (گالەی باشوور) و -ڕەزامەندە- سەر بە ئیمپراتۆرییەت بێت لەسەر خواستی (ئەناریۆس)ی خوشکی ئیمپراتۆر[1].

ئیمپراتۆر مەرجی یەکەمی پەسەند کردنی و مەرجی دووەمی ڕەتکردەوە، بەڵام بەرامبەر بە ڕازی بوونی خوشکەکەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ (ئەتولن) بکات. (ئەتولن) لە ساڵی (٤١٤ ز) شاری (تولوز)ی کردە پایتەختەکەی خۆی، (بلاسیریا) گەڕایەوە بۆ لای براکەی پاش ئەوەی مێردەکەی کۆچی دوایی کرد، پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێک لە سەرکردەکانی کرد و بوو بە دایکی (ڤالنتینی سێیەم). دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆرییەت هەوڵی بەرگری کردنیان دا لە (ئیتاڵیا) لە کاتی هێرشی (گووتە خۆرئاواییەکان)دا، ئەویش بە کشانەوەی بەرگریکەران لە شوێنە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٣.

دوورەکـــانەوە بە مەبەســـتی کەمکـــردنەوەی ســـنووری بەرگـــری کـــردن و بەرگریکردنێکی کاریگەرتر لە (ڕۆما)[1].

(هــۆزە جەرمانییەکـــان) ئەمەیـــان بە هەل زانـــی و هـــاتنە نـــاو ســـنووری ئیمپراتـــۆرییەتەکەوە، لە لایەکـی دیکەشـــەوە هەنـدێک لە ژەنەڕاڵەکـان پشـتیان بەو هۆزانە بەستبوو بۆ جێبەجێکردنی مەرامەکانیان. (ڤەندالەکان) یەکەم هـۆز بوون کە لە ساڵی (٤٢٩ ز) بە سەرکردایەتی (کزریک) بەرەو وڵاتی (گال) ڕۆیشتن، پاشان بۆ (ئیسـپانیا) و لەوێشـــەوە بەرەو (ئەفریقیـا) بە هـۆی ئەوەی هۆزەکـانی (گـووت) بەردەوام هەڕەشەیان لێ دەکردن[2]. بۆچوونێکی دیکەش دەڵێت: "ئەم جموجووڵەیان بە هۆی ئەوەوە بوو کە چەند سەرکردەیەکی ڕۆمانی پشتیان پێ بەستبوون دژ بە بەرامبەرەکانیـان و زۆربەی نـاوچەی (ئەفریقیـا لە بـاکووری لیبیـاوە) کەوتە ژێـر دەسـەڵاتیانەوە، پـاش کـۆنترۆڵکردنی (قرتـاجە) لـە سـاڵی (٤٣٩ ز)؛ (ڤەنـدالەکان) هێرشێکی دەریاییان کردە سەر (ئیتاڵیا). هۆی ئەم هێرشـە دەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە خێزانی (ڤالنتینی سێیەم) داوای یارمەتی لە (کیسرک)ی کردبوو دژ بە دوژمنەکانی، دوای کـوژرانی مێـردەکەی؛ تـوانی لە سـاڵی (٤٥٥ ز)دا (ڕۆمـا) بخـاتە ژێـر ڕکێفـی خـۆیەوە و یـازدە ڕۆژ تیایـدا مـایەوە، هەرچـی سـەروەت و سـامانێکی بەردەسـت کەوت؛ بە تـاڵانی بـرد، ئەگەر ئەو هەوڵانەی (پاپـا لیـۆنی یەکەم) نەبـووایە؛ کـارە دوژمنکارییەکانی (کیسرک) چەند بارە دەبوونەوە؛ چونکە ئەو سـەرکردە ڤەندالییە پەیمـانی بە پاپا دابوو کە پاش چوونە نـاو (ڕۆمـا) خوێن نارێژێت و ئەشکەنجەی کەس نـادات و زینـدووەکان ناسـووتێنێت، ئەو ئـاژاوەیەی کە لە سـاڵی (٤٧٧ ز)ی و لەنێـوان میراتگرانـی (کیسـیرک)دا ڕوویـدا ڕۆڵێکـی گرنگـی بینـی لە لاواز کردنـی (ڤەندالەکان) لە (باکووری ئەفریقیا)دا. پیادەکردنی پاکتاوی ئایینی دژ بە لایەنگرانی (کڵێسای ڕۆما) و زیادەڕەوییان لە کۆکردنەوەی؛ وای کرد کە (ئیمپراتۆر جستنیان) بە هـۆی سـەرکردەی خەبـاتگێڕ (بلیسـاریووس)ەوە دەسـەڵاتی (ڤەنـدالەکان) کەم بکـاتەوە، لە دواییشـدا و لـە سـاڵی (٥٤٣ ز) کۆتـایی پـێ بێنێـت، بەڵام ناوچەکـانی بەڕیتانیا لە سەرەتای سەدەی پێنجەمدا پاش ئەوەی ڕۆمانەکان بەجێیان هێشت و

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٥.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: اوروبا العصور الوسطى، ص٤٥.

ـشەکشـەیان لـێ کـرد؛ دانیشـتووانەکانی نەیـانتوانی بەرگـری بکـەن دژ بە (ئینگلیـز، ـەکسۆن و گووت)یەکان پاش ئەوەی پەلاماری دوورگەکەیاندا[1].

ئەم داگیرکارییە نـزیکەی سـەدە و نیوێکی خایاند کە بە درێژایی ئەو سـەردەمە کوشـتارێکی زۆر لەو شـارەدا ئەنجـام درا، کە زۆر بە زەقـی بە ڕووی شـارەکەوە ـیار بـوو، کـۆچکردنی هـۆزە (گـووتە خـۆرئـاوایی و ڤەنـداڵەکان) کـاری کـردە سـەر هـۆزە (بۆرگەنـدییەکان) و لە شـوێنەکانیان دەرکـران، هەر چەنـدە (ئیمپڕاتـۆر ئەنوریـۆس) ڕێـگەی دا (بۆرگەنـدییەکان) بـۆ ئەوەی بێـنە نـاو سـنووری ئیمڕاتۆرییەتەکەیەوە؛ بەڵام (سوپای ڕۆمانی) کوشتارێکی زۆری لـێ کـردن بە هـۆی تێپەڕینیـان لەو ناوچـانەی کە بۆیـان دەستنیشـان کرابـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا دەسـەڵاتداران ڕێگەیـان بە هەندێکیان دا کە لە نزیـک (دەریـاچەی جنێـڤ) نیشـتەجێ بین، لە پاشـاندا بڵاوەیان کرد بەرەو ناوچەی (دۆڵی ڕۆن) و لەوێدا شانشینێکیان بـۆ خۆیـان دروسـت کـرد. هۆزەکـانی (هـۆنی ئاسـیایی) لە سـاڵی (٤٢٥ ز) لەو ناوچـانەدا نیشتەجێ بوون کە ئێستا بە (بولگاریـا) ناسـراوە، لە سـاڵی (٤٣٣ ز) و دوای کـۆچی دوایی پاشاکەیان؛ هەردوو برازاکەی (بلدا و ئاتێلا) وڵاتیان بەڕێوەدەبرد[2].

لە سـاڵی (٤٤٤ ز) پاش کـوژرانی (بلدا)ی بـرای؛ (ئـاتێلا) بـووە تـاکە فەرمـانڕەوای وڵاتەکەی، (ئـاتێلا) بە بەهێزتـرین فەرمانڕەواکـانی ئەورووپـا دادەنرێـت لەو کـاتەدا. چونکە لە هەردوو بەشەکەی (خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمـا) بـاجی وەردەگـرت. سـوپاکەی نـزیکەی نیـو ملیـون جەنگـاوەر بـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا بەرەو بەشی خۆرئاوا کەوتەڕێ بۆ ڕزگار کردنی، هـۆی جووڵانی بەرەو خۆرئـاوا وەکـوو زانراوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە؛ کاتێک (ئەنوریای خوشکی ئیمپڕاتـۆر ڤـالنتینی سـێیەم) دوور دەخـرێتەوە بـۆ (قوسـتەنتینییە)، –لە ئەنجـامی کەتنێکـی ڕەوشـتیدا– لەوێـوە ئەنگوسـتیلەی بۆ (ئـاتێلا) نـاردووە بـۆ ئەوەی بە هـاوارییەوە بچێـت، (ئـاتێلا) ئەمەی وەکوو داواکردنی دروستکردنی خێزان تێگەیشت[3]، بۆیە داوای دەسـتی (ئەنۆریـا)ی کـرد لە بـراکەی (ڤـالنتین)؛ بە مەرجێـک کە دیـاری هاوسـەرگیرییەکە نیـوەی بەشـی

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٦-٤٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٦.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٨.

خۆرئاوای ئیمپراتورییەت بێت. پاش ئەوەی ئیمپراتۆر ئەم مەرجەی پەسەند نەکرد؛ (ئاتێلا) هێرشی کردە سەری و لە ساڵی (٤٥١ ز) چووەوە ناو (وڵاتی گال)ەوە، هەر چەندە بەرگریکەرانی ڕۆمانی بە سەرکردایەتی (ئەتیۆس) و هۆزەکانی (گووتی خۆرئاوا) بەرەنگاری (ئاتێلا) بوونەوە و سوپای ئاتێلایان نزیک (شالۆن) تێکشکاند؛ بەڵام (ئاتێلا) هێرشی بردە سەر (ئیتالیا) و چەند شارێکی کاول کرد و پاشان لە ساڵی (٤٥٢ ز) هێرشی کردە سەر (ڕۆما). سەرچاوەکان وا ڕادەگەیەنن کە (پاپا لیو) پەرجوویەکی داهێنا بەوەی کە توانی (ئاتێلا) ڕازی بکات بە پاشەکشەکردن و وازهێنان لە (ڕۆما)، بەڵام هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو پاشەکشەیە دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی (پەتای تاعوون) لەناو سوپاکەیدا و نزیک بوونەوەی سوپای (ئەتیوس)، پاش کۆچی دوایی (ئاتێلا) لە ساڵی (٤٥٣ ز)؛ (ئیمپراتۆرییەتی هۆن) تێکشکا بە هۆی ئەو ناکۆکییەی کە لەنێوان ژەنەڕاڵەکانیدا سەریهەڵدا، لە لایەکی دیکەشەوە بەرپابوونی شۆڕشی هۆزە جەرمانییەکان ئەوانەی لەژێر ڕکێفیدا بوون، بەتایبەتی هۆزە (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) کە لە ساڵی (٤٥٥ ز)دا ڕزگاریان بوو لە دەسەڵاتی (هۆنەکان)[1].

## تێکچوونی پێکهاتەی تەختی ئیمپراتۆرییەت لە خۆرئاوادا (٣٦٤ – ٤٧٦ ز)

سوپا و ئەنجوومەنی پیران پاش کۆچی دوایی (ئیمپراتۆر جۆڤیان)؛ تەختی پاشایەتیان بە (ڤالنتینی یەکەم ٣٦٤ – ٣٧٥ ز) سپاردەوە، (ڤالێنز) براکەی بە پلەی ئیمپراتۆر لەسەر بەشی خۆرهەڵات دایمەزراند. (ڤالنتین) چەند چاکسازییەکی ئەنجامدا بە مەبەستی چاک کردن و پارێزگاری کردن لە ئاستی دراو –ئابووری- و دانانی سنوورێک بۆ خراپەکاری فەرمانڕەواکان و ڕاگەیاندنی لێبوردەیی بۆ سەرجەم ڕێبازە ئایینییەکان، هەروەها توانی بەرەنگاری هێرشی (هۆزە جەرمانییەکان) ببێتەوە لە ناوچەکانی (ڕاین)، هەروەها بۆ کرێکارەکان و دانانی سنوورێک بۆ ئەو پارێزەرانەی کە بە شێوەیەکی خراپ بەرەنگاری سەرجەم هێرشەکانی (هۆزە جەرمانییەکان) ببێتەوە لە ناوچەی (راین)دا. دوای (ڤالنتین)؛ (کراتیان)ی کوڕی بوو بە جێنشینی، ئەویش لەسەر هەمان ڕێچکەی باوکی

---

(١) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٧.

بەردەوام بـوو و بـۆ مـاوەی دوو سـاڵ لە دەسـەڵاتدا مـایەوە، بەو هۆکـارەی کە سـەرقاڵی ڕابـواردن و ژیـانی تـایبەتی خـۆی بـوو؛ هەمـوو کارەکـانی بە وەزیـرە چاوچنۆکەکانی سپارد، ئەمەش بووە دەرفەتێک بۆ (ژەنەڕاڵ ماکسیمووس) و تـوانی لەسـەر تەخت لایبدات و (ڤالنتینی دووەم) لە جێگەی ئەو دابنێت. (ڤالنتینی دووەم) لەو دەمەدا لە تەمەنـی بیست ساڵیدا بـوو کاتێک چـووە سـەر تەختی ئیمپڕاتـۆری، تەمەن گەنجییـەکەی وای کـرد کە ژەنەراڵێکـی بتپەرسـت بە نـاوی (ئەربوکاسـت) بەسـەریدا زاڵ بێت و بیکوژێت. دوای کـوژرانی (ڤالنتینی دووەم) و لە سـاڵی (٣٩٢ ز)؛ (ئەربوکاســت) بـــوو بە خـــاوەنی بڕیـــاردان لە هەڵبژاردنـــی پاشـــاکان، هەڵسـوکەوتەکانی لەو بـوارەدا پێشـینەیەک بـوو کە ژەنەڕاڵە بەربەرەکـان ئەنجامیـان دەدا لە خۆرئاوادا[1].

(ئەربوکاسـت)؛ (یوجینـووس)ی هەڵبـژارد بـۆ تەختـی ئیمپڕاتـۆرییەت، هەر بـۆیە (سیۆدۆسیۆســی یەکەم) کە ئیمپڕاتـۆری خـۆرهەڵات بـوو؛ بڕیـاری هێرشـێکی سـەربازی دژی ئەو ژەنەڕاڵە دا، سـوپاکەی (سیۆدۆسیۆس) تێکەڵ بوو لە (بەربەر، جەرمـان و ئاسـیاییەکان) و لە ناویانـدا (سـتلیکۆی ڤەنـداڵی) و (ئەلاریکـی سـەرۆکی گـووتە خۆرئاواییەکـان)ی تێـدا بـوون و لە ئەنجامـدا توانیـان لە سـاڵی (٣٩٤ ز)دا سـەرکەوتن بەدەسـت بهێـنن بەسـەر (ژەنەڕاڵ ئەربوکاسـت)دا، بەڵام نەیـانتوانی (ژەنەڕاڵ ئەربوکاست) دەسگیر بکەن؛ چونکە خۆکوشتنی بە باشتر زانی نەوەک دیل بکرێت، هەر بـۆیە کۆتـایی بە ژیـانی خـۆی هێنـا، هەر لە ئەنجـامی سـەرکەوتنەکەی (ئیمپڕاتــۆر سیۆدۆســیۆس)دا (یوجینــۆس) کــوژرا، (سیۆدۆســیۆس) پــاش ئەم سـەرکەوتنە (ئەرنوریـۆس)ی کـوڕی کە تەمەنـی یـازدە سـاڵ بـوو بە ئیمپڕاتـۆری خۆرئـاوا و کـوڕەکەی دیکەشـی (ئەرکـادیۆس) کـرد بە ئیمپڕاتـۆری خـۆرهەڵات کە تەمەنـی هەژدە سـاڵ بـوو، -پـاش ڕێکخسـتنەوە و یەکگـرتنەوەی ئیمپڕاتـۆرییەت و دانانی هەردوو کوڕەکەی لە هەردوو بەشەکەدا- (سیۆدۆسیۆس) لە سـاڵی (٣٩٥ ز) لە (شاری میلان) کۆچی دوایی کرد[2].

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٨-٤٩.

(٢) ابراهيم علي طرخان: دولة الغوط الغربيين، ص٥٩.

هەردوو کـوڕەکەی (ئەرنوریـۆس و ئەرکـادیۆس) لەو تەمەنەدا نەبـوون کە لە ئاستی بەرپرسیارییەتیدا بن بەرامبەر ڕووداوەکان؛ وەزیرە جەرمانییەکان توانیان زاڵ بین بەسەریاندا لە هەردوو بەشەکەدا، (ڕوفینیۆس) لە خۆرهەڵات و (ستلیکۆ) لە خۆرئـاوا! (کیبـوون)ی مێژوونـووس لەم بـارەیەوە دەڵێـت: "لە سـەردەمی فەرمـانڕەوایەتی (ئەرکـادیۆس و ئەنوریـۆس)دا گەورەترین زیـان بە ئیمپڕاتۆرییەت کەوتـووە، چـونکە کڵێسـاکانی بـۆ ڕاهیبەکـان و دەوڵەتـی بـۆ خەسـێنراوەکان و هەرێمەکانی بۆ بەربەرە جەرمانەکان بەجێهێشت"[1].

(ستلیکۆ) توانی هێرشـی (ئەلاریک) بوەستێنێت هەتا خۆی لە ژیاندا بوو، بەڵام ئیمپڕاتـۆر (ئەنوریـۆس) لـە سـاڵی (٤٠٨ ز) فەرمـانی دا بە کوشـتنی (سـتلیکۆ) و زۆربەی ئەو کەسـانەی کە لە چـواردەوری بـوون؛ ئەمەش بە هانـدانی وەزیـر (ئەلیمپیـۆس)، چـونکە (سـتلیکۆ)ی بە پیلانگێـڕان دژ بە تەختـی ئیمپڕاتـۆری و ڕێککەوتن لەگەڵ گووتە خۆرئاواییەکاندا تاوانبار کرد. بەڵام لە سەردەمی (ئیمپڕاتۆر ڤـالنتینی سـێیەم ٤٢٣ – ٤٥٥ ز) دایکـی (کالابلاسـیدیا) دەسـتی بە سـەر ڕامیـاری ئیمپڕاتۆرییەتەکەدا گرتبوو هەتا کۆچی دوایی کردنی لـە سـاڵی (٤٥٠ ز)؛ لە کاتێکدا کە (ژەنەڕاڵ ئەتیۆس)ی بە پشـتوپەنای خۆی دەزانـی، بەڵام (ڤالنتین) لە بەرامبەردا لە ساڵی (٤٥٤ ز)دا (ژەنەڕاڵ ئەتیۆس)ی کوشت، ئەمەش لە ئەنجامی هاندانی وەزیـر (پترونیۆس)، چونکە (ئەتیۆس) دەیویست داخوازی (یودوکیـای کچـی ڤالنتین) بکـات بۆ کوڕەکەی، ئەم کوشتنە زیانێکی گەورەی لە بەشی خۆرئاوا دا، چونکە یەکێک لە داروودەسـتەکەی کە ئامـادەی کوشـتنی ئەم سـەرکردەیە بـوو؛ بە ئیمپڕاتـۆری گـوت: "گەورەم؛ دەسـتە ڕاسـتەکەت بە دەسـتی چەپـت بـڕی!" لە پـاش چەنـد مانگێـک؛ (پترونیۆس) لایەنگرانی (ئەتیۆس)ی هاندا بـۆ ئەوەی (ڤالنتین) بکوژن، پاشـان خـۆی کاندید کرد بۆ تەختی ئیمپڕاتۆری و بێوەژنەکەی ڤالنتین (یودوکسیا)ی ناچـار کـرد کە شـووی پـێ بکـات، پاشـان لە کـوڕەکەی (بـالادیوس)ی مـارە کـرد. بەپـێ گـوتەی (پرۆکوبیوس)؛ (یودوکسیا) داوای یارمەتی لە (کیسیرکی پاشـای ڤەندالەکان) کـرد، هەر بۆیە (کیسیرک) لە باکووری ئەفریقیاوە بە هێزێکی سەربازییەوە لە ساڵی (٤٥٥ ز) پەلاماری (ڕۆما)ی دا و لەگەڵ خۆیدا (یودوکسیا) کچەکەی برد و بۆ (قرتاجە) و

---

(١) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ج١/ ص٧٣.

کچەکەی (یودوکسیا)ی لە کوڕەکەی مارە کرد و (یودوکسیا)ی دایکی بەڕێ کرد بۆ قوستەنتینە) لەسەر داوای (ئیمپڕاتۆر لیوی یەکەم)[1].

لە ڕاستیدا ژەنەڕاڵە جەرمانییەکان باڵادەست بوون لە دەزگای تەختی ئیمپڕاتۆرییەتی خۆرئاوادا و پاشان وەک سێبەرێکیان لێ هاتبوو و هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو تەنها بە ناو نەبێت، ئەم دیاردەیە بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی (٤٥٥ – ٤٧٦ ز) بە زەقی دەبینرا.

(گووتە خۆرئاواییەکان) لە ساڵی (٤٥٥ ز) لە وڵاتی (گال)دا (ئەڤیتۆس)یان پاڵاوت؛ چونکە ئەنجوومەنی پیران لە (ڕۆما) ڕەزامەندی نەبوو, هەر بۆیە وازیان لەو پاڵاوتنە هێنا، سوپا ژەنەڕاڵێکی گووتی بە ناوی (ماجوریان ٤٥٦ – ٤٦١ ز) هەڵبژارد، ئەمیش بە ناچاری سازشی کرد لە ئەنجامی ناڕازی بوونی (ڕیکیمر)ی ژەنەڕاڵی بەربەری، ئەویش (ژەنەڕاڵ سیڤرۆس ٤٦٧ -٤٧٢ ز)ی هەڵبژارد؛ چونکە یەکێک بوو لە داروودەستەکەی خۆی و بە بتپەرستیش تاوانبار بوو. پاشان (ڕیکیمر)؛ (سیڤرۆس)ی دەستگیر کرد و لە سێدارەیدا، پاشان (ڕیکیمر)؛ (ئولیبریۆس)ی هەڵبژارد و تەنها بۆ ماوەی دوو مانگ لە دەسەڵاتدا مایەوە و لە ساڵی (٤٧٢ ز) بە شێوەیەکی سروشتی کوچی دوایی کرد. دوای ئەو لە ساڵی (٤٧٣ ز)دا؛ (گلیسریۆس) لە جێگەی دانرا، بەڵام ئەوەندەی نەبرد و لە هەمان ساڵدا لابرا، پاشان تەنها بۆ ماوەی دوو ساڵ (نەپووس) فەرمانڕەوایی کرد و (ژەنەڕاڵ ئورستز) توانی لای بدات و لە ساڵی (٤٧٥ ز) تەختی فەرمانڕەوایی بە کوڕەکەی (ڕۆمیلۆس) سپارد[2].

لەو سەروبەندە ناهەموارەدا؛ چەندین هۆزی بەربەری بەرەو (ئیتاڵیا) کۆچیان کرد و لە ساڵی (٤٧٦ ز) داوایان لە (ئورستز) کرد کە (٣/٢)ی زەوییەکانی (ئیتاڵیا)یان بداتێ، بەڵام کاتێک داواکارییەکەیان ڕەتکرایەوە؛ پەلاماریان دا و کوشتیان. کوڕەکەی (ڕومیلۆس)؛ یان کوڕی (ئەدوڤاکار)، ئەمەی دوایی کوڕی (ئەدیکون) بوو، کە یەکێک بوو لە وەزیرەکانی (ئاتیلا). (ئەدوڤاکار) داوایەکی پێشکەش بە (زینوی ئیمپڕاتۆری خۆرهەڵات) کرد بە هۆی ئەنجوومەنی پیرانی

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: تاريخ العصور الوصطى الاوروبية، ص ٤٩-٥٠.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٥٠.

(ڕۆمـــا)وه بـــۆ ئەوەی ڕەزامەنـــد بێـــت لەســـەر فەرمـــانڕەوایەتییەکەی بە نـــاوی ئیمپڕاتۆرەوە لە بەشی خۆرئاوادا، ئیمپڕاتۆریش ناچار بوو ڕەزامەندی دەرببڕێت، بەم شـێوەیە و لەو دەمەوە کۆتـایی بە فەرمـانڕەوایی پاشـایان و ئیمپڕاتۆرەکـانی خۆرئاوا هات[1].

ئەم ڕووداوە لای مێژوونووسە هاوچەرخەکان نیشانەی ئەوە نەبوو کە (ڕۆما) سەروەرییەکەی لەدەست دابێت؛ بەڵکوو لەوانەیە پێچەوانەکەی ڕاستتر بێت، چونکە ئەو بۆچوونەی هەبوو کە (ئەدوڤاکار) خوازیار بوو دووبارە هەردوو بەشـەکەی ئیمپڕاتۆرییەت لەژێر دەسەڵاتی یەک ئیمپڕاتۆردا یەک بخاتەوە. ئەنجوومەنی پیران پەیکەرێکـی بـۆ ئیمپڕاتـۆر (زینـوی) دروسـت کـرد، لە ڕاسـتیدا پرۆسـەی بە جەرمانیکردنی (ئیتاڵیا) سەردەمێکی درێژی خایاند و ئەنجامە ڕامیارییەکانی گونجاو بـوون لەگەڵ ئەو گۆڕانکـارییە پـێ بە پێـیەی لە ئـارادا بـوو لە سـەرجەم بەشـی خۆرئـاوادا، کە لەژێـر ڕکێفی هـۆزە جەرمانییەکاندا بـوو. هەوڵەکەی (جسـتنیان) بـۆ ڕێکخستنەوەی (ئیتاڵیا) جارێکی دیکە لە چوارچێوەی ئیمپڕاتۆریدا تەنها هەوڵێکی کـاتی بـوو، چـونکە بەشـی هەرە زۆری (ئیتاڵیـا) لـە سـاڵی (٥٦٧ ز) گەرایەوە ژێـر دەسەڵاتی جەرمانەکان[2].

لە سـەرەتای سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا و بەتـایبەتی لە سـەرەتای سـەدەی (٤ ز) گۆڕانکارییەکی بەرفراوانمان لە گێتی ئەورووپا بەگشتی و (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمـانی) بەتـایبەتی بەرچـاو دەکەوێـت، ئەم گۆڕانکاریـانەش لە ئەنجـامی چەنـد هۆکارێکـدا ڕوویاندا؛ وەک:

١.نەمانی (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی) و دەرکەوتنی ئایینی مەسیحی.

٢.گواستنەوەی پایەختی ئیمپڕاتۆرییەتەکە لە خۆرئـاوەوە بـۆ خـۆرهەڵات، واتە لە ڕۆماوە بۆ قوستەنتینیە.

٣.هۆیەکی گرنگی دیکە کە ڕۆڵێکی مەزنی لە تایبەتمەندییەتی مێژوویی ئەورووپا بەگشتی و بەشی خۆرئاوای ئەورووپا بەتایبەت گێڕا، ئەو کۆمەڵە خەڵکە بەربەرانە بوون کە بەلێشاو بەرەو (ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی) هاتن و لە کۆتاییدا لە ڕووبەرێکی زۆر بەرفراوانی ئیمپڕاتۆرییەتەکەدا مانەوە.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٤.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص ٥١.

وشەی بەربەری وشەیەکی زۆر دێرینە، لای یۆنانییەکان بە واتای سوکایەتی و گەمە (یاری) پێ کردن هاتووە و هاوواتا بووە بۆ وشەی نەزان و بێمێشک، رۆمانەکانیش ئەو وشەیەیان خستە نێو زمانەکەیانەوە کە هەمان واتای دەدا، لە هەمان کاتیشدا بە واتای هێزێکی بیانی دوژمن دێت کە هەڕەشە لە هەردوو ژیاری یۆنانی و ڕۆمانی دەکات[١].

پێشتر ئاماژەمان بەوە داوە کە بەربەرەکان هەمەچەشنە بوون و بە تەنیا جەرمانەکان نەبوون! هاوکات ئەو دەستە و تاقمانەی کە کاریان کردبووە سەر مێژووی (ڕۆما) لە سەردەمی دێرینەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، دەستە و کۆمەڵی گەلانی ڕەوەند و کۆچەری ئاسیا بوون، پەلامار و هێرشەکانیشیان بەرەو خۆرئاوا زیاتر هۆی ئابووری هەبوو، کە بە دوای خواردن و دەستەبەرکردنی ژیانی خۆیاندا دەگەڕان، مەزنترینی ئەو گەلانەش: (هۆن و بولگار و مەنگۆل و تورکی هەمە جۆر بوون)[٢].

سەبارەت بە (سلاڤەکان)؛ سەرەتا لە ناوچەکانی (ئاسیای ناوەڕاست) نیشتەجێ ببوون، بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان (سلاڤەکان) کەوتبوونە ژێر نارەحەتی و فشارێکی زۆری ئاسیایی و جەرمانەکانەوە، هەتا ئاستێک کە ژمارەیەکی زۆر لە سلاڤەکانیان بەند کرد، دواتر دەیانکردنە کۆیلە و هەر لەوەشەوە وشەی (سلاڤ) کە واتە (بەندە)یە بەسەریاندا سەپێنرا، بەڵام لە کۆتاییدا (سلاڤەکان) توانییان خۆیان ڕزگار بکەن و لەگەڵ دەستە و تاقمەکانی دەوروبەریاندا یەک بگرن. شایانی باسە مەزنترین دەستەی بەربەری کە کاریگەری زۆری کردبووە سەر پێشکەوتنی مێژوویی خۆرئاوای ئەورووپا؛ دەستە و تاقمەکانی گەلانی (جەرمانی) بوون. هۆزە (گووتییەکان) لە ناوچەکانی (داکیا) هەر زوو کەوتنە ژێر کاریگەری( ئایینی مەسیحی) و (ژیاری ڕۆمانی)، دەتوانین بڵێین ئەم هۆزە گووتییانە بناغەیەک بوون بۆ دامەزراندنی یەکەم (شانشینی جەرمانی) لەناو سنووری (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی)دا، وردە وردە ژمارەی جەرمانییە نیشتەجێ بووەکان هەتا دەهات زیادی دەکرد لە (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی)دا، ئەمانە وەک جووتیار و سەرباز و کرێگرتە لە

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في اوروبة، ج١/ ص١٤.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٧٢

خزمەتـی ئیمپڕاتـۆرییەتەکەدا بـوون، پاشـان کـار گەیشـتە ئەوەی، کە لەنێـوان جەرمانەکـان و ڕۆمانەکانـدا ژن و ژنخـوازیش پەیـدا ببێـت. لە کـاتی هێـرش و پەلامـاردانی بەربەرەکانـدا بـۆ سـەر (ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی) گەلێـک خراپەکـاری ڕوویدا؛ وەکوو کوشتنی مەسیحییەکان لەناو کڵێسادا و ئەنجامدانی کاری نامرۆڤانە بەرامبەر بە کچان و ژنـانی بێوەژن یەکێکی دیکە بوو لە خراپەکاری بەربەرەکان، هەروەهـا قەشـەکانیان دەگـرت و پـاش سـوکایەتی پـێ کـردن؛ دەیـان کوشـتن، دانیشتووانی ئەوێ ئازار و ستەمێکی بێوێنەیان بەدەست بەربەرەکانەوە چەشت[1].

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٧-١٤.

# بەشی شەشەم

- مێژووی هۆزە جەرمەنییەکان
- یەکەم/ گووتە خۆرئاواییەکان
- دووەم/ گووتە خۆرهەڵاتییەکان
- سێیەم/ بورگەندییەکان
- چوارەم/ ئەنگلۆساکسۆنەکان
- پێنجەم/ ڤاندالەکان
- شەشەم/ هۆزەکانی هۆن
- حەوتەم/ سلاڤییەکان

أ. سلاڤییە باشوورییەکان

ب. سلاڤییە خۆرئاواییەکان

ج. سلاڤییە خۆرهەڵاتییەکان

## مێژووی هۆزە جەرمانییەکان

### یەکەم/ گووتە خۆرئاواییەکان

(گووتە خۆرئاواییەکان) لە ساڵی (٣٧٦ ز)دا لە دانووبەوە پەڕینەوە و لە (بولگاریا)ی ئێستا نیشتەجێبوون، بەپێی هەندێک لە سەرچاوە مێژووییەکان؛ ئەوانەی کە لە دانووبەوە پەڕینەوە نزیکەی ملیۆنێک کەس دەبوون، ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو بۆ ئەوکاتە؛ چونکە ئیمپراتۆر ئەم ڕامیارییەی زووزوو جێبەجێ دەکرد. دەرکەوتنی (گووتی خۆرئاوایی) و جێگیربوونیان لە (بەلقان)؛ کاریگەریەکی مەزنی هەبوو لەسەر داهاتووی ئیمپراتۆر[1]، ئیمپراتۆر (ڤالینز) ڕێگەیدا بە پەڕینەوە و نیشتەجێبوونیان لەناو ئیمپراتۆرییەتدا وەکوو هاوپەیمانییەتی ئیمپراتۆر؛ بەڵام بە چەند مەرجێک:

١. چەکەکانیان ڕادەست بکەنەوە.

٢. منداڵی ڕێبەرەکانیان وەک بارمتە بدرێنە دەسەڵاتداری ئیمپراتۆری و ئەمەش بۆ دڵنیابوون لە نیازپاکی (گووتە خۆرئاواییەکان) بەرامبەر بە ئیمپراتۆرییەت و لەم ڕوانگەیەوە سوودێکی زۆریان لە (گووتە خۆرئاواییەکان) وەرگرت.

هەر بۆیە دەبینین کە ئیمپراتۆر مەبەستی هەبوو لە ڕێگەدان بە (گووتە خۆرئاواییەکان) کە لە (دانووب) بپەڕنەوە و ئەمەش خۆی لە کایە ڕامیاری و ئابووری و ئایینییەکان دەبینییەوە و لە گرنگترین مەبەستەکانیشی بریتی بوون لە:

ا. بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگرێت لەپێناو بەرگریکردن لە سنوورەکانی ئیمپراتۆرییەت لە بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمنەکانی ئیمپراتۆر.

ب. بۆ بەهێزکردنی ئایینزای (ئاریۆسی) کە خودی ئیمپراتۆر باوەڕی پێ هێنابوو، چونکە (گووتەکان) پێش بەستنی کۆنگرەی (نیقیا) لە ساڵی (٣٢٥ ز)؛ باوەڕیان بەو ئایینزایە هێنابوو، چونکە هەر لە ساڵی (٣٤١ ز)ەوە کەسانێکی وەک (قەشە یولفیلاس) کاریان دەکرد بۆ ئەوەی ئایینزای (ئاریۆسی) جێگر بێت[2].

بەم جۆرە (ئاریۆسی) لەناو بەربەرەکاندا سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەستهێنا؛ ئەوەش پەیوەست بوو بە چوونە ناو ئیمپراتۆرییەتەوە و بەمەش مەسیحییەت

---

(١) خليل علي مراد وجاسم محمد حسن العدول وعبدالجبار قادر غفور: دراسات في التاريخ الاوربي الحديث و المعاصر، جامعة الموصل، كلية التربية، ١٩٨٨ م، ص١٦.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٤٣.

لەسەر دەستی دیلە ڕۆمانییەکان چووە ناو هۆزی (ئەلتیوتوونییە) کە لە لایەن گووتەکانەوە گیرابوون لە کاتی هێرشەکانیان بۆ ئاسیای بچووک لە سەدەی سێیەمدا. (یولفیلاس ٣١١-٣٨١ ز) بە واتایەکی دروست نێردراو نەبوو؛ بەڵکوو یەکێک بووە لە نەوە دیلە مەسیحییەکانی (کەپەدۆکیە) و بەڵام لەنان گووتەکاندا لەدایکبوو، ئەمانە لە باکووری ڕووباری (ڕایین) دەژیان و لەنێوانیاندا پەروەردەکرابوو، لە ساڵی (٣٤١ ز) (یوسبیووس مەتڕان نکومیدیا ئاریۆسی) وەکوو قەشەیان دەستبەکار بووە، کاتێک (ئەسنریک)ی سەرکردەی گووتەکان تێکۆشا لەگەڵ پاشاکانیان مەسیحییەکان و شوێنکەوتەکانیاندا؛ (قنسگندگیووس ئاریۆسی) مۆڵەتیدا بە (یولفیلاس) کە ڕێگە بدات بە ڕەوەندە گووتییە مەسیحییە کەمینەکان کە لە ڕووباری (دانووب) بپەڕنەوە، ویستی ئەو گووتانەی کە پەیڕەوکاری ئایینەکەن و بنەماکان فێرببن و ژمارەیان زیاد بکات، هەروەها هەستا بە وەرگێڕانی زۆربەی کێشە ئایینییەکان بۆ زمانی (گووتی). ئەگەر لەو سەردەمەدا (گووتەکان) بێستان نەبووبێت بۆ نووسینەوە؛ ئەوا ئەم بیستانەی بۆ داناون و خستوویەتییە سەر پیتە یۆنانییەکان، ئەم وەرگێڕانەش یەکەم کاری وێژەییە لە هەموو زمانەکانی (ئەلتیوتوونییە)، (گووتەکان) باوەڕی تەواویان بە (یولفیلاس) هەبووە و بەتوندی و پاکی و دەستبەرنەدان لە ئایینەکەی (مەسیحی ئاریۆسی)یان لە وەرگرت بەبێ مشتومڕ[1].

ح. بەکارهێنانی (گووتە خۆرئاواییەکان) بۆ کاری کشتوکاڵی.

بەڵام گووتەکان نەگەیشتبوونە (مویزیا)؛ هەتا پەیوەندی نێوانیان گەیشتە ئاستی شڵەژان و تێکچوون، چونکە نەیاندەویست چەکەکانیان ڕادەست بکەنەوە، هەر بۆیە بەرتیلێکی زۆریاندا بە فەرمانبەرەکانی ئیمپڕاتۆرییەت بۆ ئەوەی چەکەکانیان لێنەسێنن؛ ئەوانیش بەرتیلەکانیان لێ وەرگرتن ئەم کردارەش دژی فەرمانی ئیمپڕاتۆری بوو. بەڵام لێرەوە بارودۆخ بەرەو خراپی ڕۆیشت، چونکە بەرهەم و خۆراکەکانی (مویزیا) بەشی ئەو هەزارەها خەڵکەی نەکرد کە هاتبوونە ناو ئیمپڕاتۆرییەتەوە[2]. بۆیە (ڤالێنز) فەرمانی دەکرد بە کۆکردنەوەی بەشێکی زۆر لە گەنمی ناوچەکانی ئاسیا بۆ تێرکردنی گووتەکان؛ هەتا ئەوکاتەی کە زەوی

---

(١) عەبدولقادر ئەحمەد: مێژووی چاخەکانی ناوەڕاست، ل٤٦.

(٢) خليل علي مراد: دراسات في التاريخ الاوربي، ص١٧.

وەردەگـرن و دەسـت دەكەن بە كشـتوكاڵ، بەڵام كە فەرمـانڕەوا دەسـتی كـرد بـە كۆكردنەوەی پارەكـان؛ بۆ خـۆی گلـی دایەوە و ئەمەش بـووە هـۆی بڵاوبوونەوەی برسێتی زیاتر لەناو گووتەكان و ناچاریكردن بە خۆفرۆشـتی. ئەمە لە كاتێكدا بـوو كە گەنجینەكـان پڕ ببـوون، بەڵام خراپـی دۆخەكە وایكـرد كە گووتەكـان ئـارامگربن، بەڵام ئارامگرییەک كە بە زیانی خۆیان بەردەوام بووم، چونكە ئەوە بـوو گەیـاندنییە ئاسـتێک كە ناچـاربوون بە فرۆشـتنی منـداڵەكانیان لە بـازاڕی (كۆیلەكـان). بەڵام لەمەبەدواوە گووتەكـان ڕەفتاریـان گـۆڕی لەگەڵ ڕۆمانییەكانـدا و بڕیاریانـدا كە پەلامـاری بازاڕەكـان بـدەن و دزی و تـاڵانی ئەنجـام بـدەن، لە بەرامـبەردا سـوپای ڕۆمانی دەستیان كرد بە كوشتن و گرتنیان، ئەمەش شەڕ و پێكدادانی لێكەوتەوە و ئەم بەریەككەوتنانەش بۆ مـاوەی سـاڵێک بەردەوام بـوون؛ بەتـایبەت لەو ناوچـانەی كە بەدرێژایی (دانووب) و بەشی باكووری شاخی (بەلقان) بـوون. بەمجۆرە تەواوی ئەو تایبەتمەنـدیانەی كە لەومـاوەیەدا وەریـانگرت كە پەرچەكـرداری برسـێتی و چەوسـانەوە و زۆری سـەربازە ڕۆمانییەكـان و دزی و تـاڵانی و كوشـتنیان بـوو و ئەمەش گیانی بەربەرییەتی و شەڕانگێزی گووتەكانی ژیاندەوە كە تەنێكی داپۆشراو بوو بە پەردەیەكی تەنكی مەسیحی و ئەو ژیارەی كە وەریانگرتووە[1].

شۆڕشـی گووتەكـان لە سـاڵی (٣٧٨ ز) دەسـتی پـێ كـرد، ئەمە بـووە هـۆی شەڕەكانی سەدەی سێیەم ڕووبەڕووبوونەوەی زۆر گەورە و ترسناكی لێكەوتەوە و چەندین شاری پێوە وێران بوون، ئەوەش بە ڕێگەیەكی بەربەری و دڕندانە. بەڵام لە هەمـان كاتـدا هەرچـی كۆیلە و كەسـە ستەمدیدەكان و دەركراوی ویلایەتەكـان بـوون؛ هەموویـان هـاتنە پـاڵ (گووتەكـان) دژ بە ڕۆمانییەكـان، بەڵام ڕۆمانییەكـان بەهێـزی خۆیـان لەدەسـتنەدابوو، هەتـا توانیـان هێرشـی گووتەكانیـان لە (بەلقـان) تێكشكاند، لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەی (گووتە خۆرهەڵاتییەكان) و هۆزەكانی دیكەی (هۆن) چوونەپاڵ (گوتە خۆرئاواییەكان)[2].

(گـووتە خۆرئاواییەكـان) ڕەگەزێـک بـوون لە هـۆزە (جەرمانییەكـان)، میللەتێكی كۆچەری و سوارچاک بوون، سوپایەكی بەهێزیان هەبووە؛ بە جۆرێک تەنانەت ژن و منـداڵی تێدا بـووە، كەسـایەتییە گەورەكانیـان سـواری عەرەبـانە دەبـوون. سـوارە

---

(١) نورمان بينز: الامبراطورية البيزنطية، ص٣٠.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٤.

گووتەکـــان توانیـــان شکســـت بە تیپــی پیـــادەی ئیمپڕاتـــۆرییەت بهێـــنن لەنزیـــک (قوستەنتینییە) و بە سـەرکردایەتی فەرماندەی بەناوبانـگ (ئالاریـک) ئیمپڕاتۆریـان کوشت و پاشان ڕوویانکردە خۆرئاوا و لە ساڵی (٤١٠ ز) شاری ڕۆمایان داگیر کـرد. بەڵام کە بینیـان (ئیتاڵیـا) وڵاتێکـی هەژارە و توانـای لەخـۆگرتنی ئەم خەڵـکە زۆرەی نییە؛ هەر بۆیە پەڕینەوە بۆ وڵاتی (گال و ئیسپانیا) هەتا لەوێ شانشینی (گـووتی خۆرئـاوایی) دابمەزرێـنن و پەرەیـان بە دەسـەڵاتی خۆیانـدا و توانیـان فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتە بکەن و بەردەوامی بە سەروەریان بدەن بەسەرییەوە؛ هەتا سـەرەتاکانی سـەدەی هەشـتەم بـۆ نـۆیەمی زایینـی کە موسـڵمانە ئومەوییەکـان هێرشیان کردە سەریان و کۆتاییان پێ هێنان[1].

لە کۆتایی سەدەی چوارەمدا؛ شاڵاوێک لە جموجۆڵ و کۆچی میللەتە جیاوازەکان دەستی پێ کرد کە ئاڕاستەکەی زیاتر بەرەو ئەورووپا بوو، ئەم شاڵاوانە هەموو گێتی بەربەرەکانی هەژاند و بزوتنەوەیەکی بەرفراوانی مەزنی میللەتانی لێکەوتەوە کە تەختی فەرمـانڕەوایەتی ئیمپڕاتـۆرییەتی ڕۆمـانی خۆرئـاوای داتەپاند. هۆزەکانی (گووت) لە لایەن دامودەزگای ئیمپڕاتـۆرییەوە زۆر بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵداکرا، ئەمەش بـووە هـۆی بەرپـابوونی ڕاپەڕینـی گووتەکـان لەپێنـاوی سـەربەخۆییدا، لە ئەنجامدا هەردوولا (گووتەکانی خۆرئـاوا و هێزەکانی ئیمپراتـۆر) لە سـاڵی (٣٧٨ ز) کەوتـنە شـەڕێکی گەورەی خوێنـاوییەوە کە لە مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا بە شـەڕی (ئەدرنە) ناسـراوە، ئەم شـەڕە بە کـوژرانی ئیمپڕاتـۆری ڕۆمـا و شکسـت و لەناوچوونی سوپاکەی کۆتایی پێ هات[2].

دوای ئەم ڕووداوانە ئیمپڕاتـــۆر (سیۆدیۆســـیۆس ٣٧٩-٣٩٥ ز) کاروبـــاری فەرمـانڕەوایی گرتەدەسـت و هەوڵیـدا بە شـێوازی دیپلۆماسـی و ئاشـتیانە شـەڕ و ناکۆکی نێوانیان کۆتایی پێ بهێنێت و چارەسەری کێشەکانیان بکات، بۆیە لە سـاڵی (٣٨٢ ز) پەیماننامەیەکی لەگەڵدا بەستن، بەپێی ئەو پەیماننامەیە گووتەکان لە هەموو بـــاج و ســـەرانەیەک بەخشـــران، لە بەرامـــبەردا ئەوانـــیش لە ڕیـــزی ســـوپای ئیمپڕاتۆرییەتدا خزمەتی سەربازی بکەن[3].

---

(١) ابراهيم علی طرخان: دولة الغوط الغربيين، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٥٨ م، ص٥٠-٥١.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: اوروبا العصور الوسطى، ص٤٣.

(٣) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٧١-٧٢.

لێــرەوە لاوازی دەســەڵاتداریتی ئیمپراتــۆرییەتی ڕۆمــانی بــووە هــۆی ئەوەی بەربەرەکـان بەبێ تـرس و فشـاری هێزەکـان سنوورەکانیان تێبپەڕێنن، لە کۆتاییدا کار گەیشتە ئەوەی خۆیـان ببنە سـەروەری وڵاتەکە، بەرەوپێشـچوونی بەربەرەکـان دژ بە خۆرئاوا کە لە خـۆرهەڵات کردیـان؛ چونکە لە خۆرهەڵاتدا زیـاتر ئامادەکاری بەرگریکردن و پاراستنی خاکەکەی کرابوو لە (قوستەنتینیە) کە ببووە پایتەختێکی نوێ بۆ گێتی ڕۆمانەکـان[1]. (ئالاریک)ی سـەرکردەی گووتەکـان لەشکرکێشییەکەی داگیرکـــاری ئیتاڵیـــادا هەتـــا شـــاری (میلانـــۆ) بـــرد و ئـــابڵووقەی ئیمپراتـــۆر (هۆنۆریـۆس)یشـیاندا لە نـاوچەی (ئاسـتی)، بەڵام ئیمپراتـۆر تـوانی لێیـان هەڵبێت. پاشـان (ئالاریک) و سـوپاکەی چیاکـانی (ئالپ)یـان بڕی و بەرەو شـووراکانی ڕۆمـا پێشڕەویانکرد، ئەوە بـوو پێشـوەختە نوێنەرێکی خـۆی نـاردە ئەوێ و داوای ئاشـتی لـێ کـردن، پەیـامەکەی (ئالاریـک) بەمشـێوەیە بـوو: "هەتـا چەنـد گژوگیـا و لەوەڕگە زیـاتر بێت؛ هێنـدەش چـاکتر دەبێت بـۆ لەوەڕانـدن". مەبەسـتی ئەوە بـوو کە خێر و بەرەکەتـــی وڵاتەکە زۆرە و بەشـــی هەمـــووان دەکـــات. لە ئەنجامـــدا گەیشـــتنە ڕێککەوتنێک و ئەوە بوو پەیماننامەیەکی لەگەڵ دەسـەڵاتدارانی ڕۆمـادا مـۆر کـرد کە بۆ هێشتنەوەی ڕۆمای پایتەختی دێرینیان بڕی (٥٠٠٠) پارچە زێڕ و (٣٠٠٠) پـارچە زیویان پێ ببەخشن. ئەم پەیماننـامەیە هەتـا سـەر نەبوو؛ چونکە لە سـاڵی (٤١٠ ز) سـەرلەنوێ (ئالاریـک) هێرشـی کـردەوە سـەر ڕۆمـا، ئەمجـارە ستەم و زۆرداری و کۆکـوژییەکی زۆر خـراپ و دڵڕەقـانەی ئەنجامـدا، هەمـوو ماڵێکیـان تـاڵان دەکـرد و دانیشـتووانەکەیان کـردە ژێردەسـتەی خۆیـان، ئەم سـتەم و کوشـتارەی لەشـکری (ئالاریک) بە ئەندازەیەک بوو؛ مەسیحییەکان بە کارەساتی کۆتایی دونیا دایاندەنا[2].

پاش داگیرکردنی ڕۆما لە لایەن گووتە خۆرئاواییەکانەوە؛ (ئالاریک) بیریکردەوە لە ڕێی دەریـای سپی ناوەڕاسـتەوە بەرەو کەنارەکـانی ئەفریقـا بچێت، ئامـانجی ئەم کارەشی نیشتەجێکردنی گووتەکـان بـوو لە (ئەفریقـا و سـەقەلیە)، بەڵام ئەم ئامـانجە ســـەرکەوتوو نەبـــوو؛ ئەوەش بە هـــۆی تۆفـــانێکەوە بـــوو لە ســـاڵی (٤١٠ ز) کە پـــاپۆڕەکەی (ئالاریـــک)ی نوقـــوم کـــرد، هەر بـــۆیە گووتەکـــان تەرمەکەیـــان وەک ئەفسـانەیەک ناشـت. دوای مردنـی (ئالاریـک)؛ چەنـد کەسـێک بـوونە جێگـری، لەوانە:

---

(١) ابراهيم علي طرخان: دولة الغوط الغربيين، ص٥٣.

(٢) ابراهيم علي طرخان: دولة الغوط الغربيين، ص٦١-٦٢.

(ئاساولف ، سینگیریک، والیا و ...هتد). بەڵام لە ساڵی (٥٠٧ ز) گووتەکان دووچاری شکستێکی قورس هاتن بەدەستی فەرەنگەکان و بەرەو (ئیسپانیا) کشانەوە، بەو جۆرە لە (ئیسپانیا) درێژەیان بە دەسەڵاتی خۆیاندا، هەتا شاڵاو و پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی کە لە ساڵی (٧١١ ز) دەگاتە ئەویَ؛ بەمجۆرە گووتەکان لەوێش نامێنن و کۆتایی بە دەسەڵاتیان دێت[١].

## دووەم/ گووتە خۆرهەڵاتییەکان

ئەگەر (کلۆڤس) بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی دەوڵەتی فەرەنگی ناسرابێت؛ ئەوا (پاشا سیودریکی ٤٩٣-٥٢٦ ز) کە پڕشنگدارترین دەسەڵاتداری سەردەمی خۆی بوو بە دامەزرێنەری دەوڵەتێکی دیکە دادەنرێت، تەنانەت لە ڕووی ژیارییەوە لە (کلۆڤس) گەلێک پێشکەوتووتر بووە، (سیودریک) لە ڕووی ژیری و ژیاری و ڕامیارییەوە لەگەڵ هەمووان‌دا جیاوازی هەبوو، لە (قوستەنتینییە) پەروەردە ببوو، لەگەڵ ئەوەی هەر لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە دەستبەسەرکرابوو. بە مردنی (ئاتیلا) لە ساڵی (٤٥٣ ز)؛ هەموو میللەتە ژێردەستەکانی (هۆن) ڕزگاریان بوو، لە کاتێکدا گووتەکانیش یەکێک بوون لەوان، ئەمانەش لە لایەن (٣) میرەوە فەرمانڕەوایەتی دەکران کە سەر بە خێزانی ئامالییەکان (ئەلماس) بوون بریتی بوون لە: (والامیر، وایدێمیر و سویدیمیر)، (سویدیمیر) لە ساڵی (٤٧٣ ز) کوڕێکی لەدایکبوو و ناوی لێنا (سیودریک). کاتێک (سیودریک) چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی؛ (گووتەکان) ناچار بوون دەست بکەنە پەلهاویشتنێکی سەربازی و هەوڵی فراوانخوازی بدەن، بەتایبەت چاویان لە داگیرکردنی (قوستەنتینییە) بوو؛ بۆ ئەم مەبەستەش بەرنامەیان بۆ هێرشکردن داڕشت[٢].

(سیودریک) لەگەڵ میللەتەکەیدا کە نزیکی (٢٠٠٠٠٠) کەسێک دەبوون؛ بەرەو (ئیتاڵیا) بەڕێکەوتن، لە سەرەتای ساڵی (٤٨٨ ز) توانیان هۆزەکانی (جێپیدی) و (سارماتییەکان) داگیر بکەن، پاش ئەوە بە ساڵێک کۆتایی بە (ئۆدواکەر) هێنا، ئیدی وردەوردە ئەم گووتە خۆرهەڵاتیانە توانیان سەر بە هەموو (ئیتاڵیا) نەوی بکەن و دوورگەی (سەقلیە)شیان خستەژێردەستیانەوە. بە کوشتنی (ئودواکەر)ی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٧٣-٧٩.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٩٤-٩٤.

فەرمانڕەوای (ئیتاڵیا) لە ساڵی (٤٩٣ ز) وڵاتەکە بەتەنها مایەوە، بەمجۆرە لە لایەن ئیمپراتۆری بێزەنتییەوە (ئەناستاسی) وەک پاشای (ئیتاڵیا) دانپێدانرا[١].

دوای ئەوە (سیودریک) لەگەڵ زۆربەی پاشاکانی بەربەریدا کەوتە هاوپەیمانییەتییەوە و خوشکی (کلۆڤس)یشی بۆ خۆی مارە کرد؛ (سیودریک) ناوبانگێکی وای دەرکردبوو وەک ئەوەی سەرکردەی هەموو بەربەرەکانی ئیمپراتۆرییەتی خۆرئاوا بێت. (سیودریک) پاشایەکی لەسەرخۆ و هێور بوو، دەیزانی چۆن هەڵسوکەوتێکی ئاشتی و ئاسایشیانە بکات، میللەتەکەی خۆی لەوە بەدەرخستبوو کە لەبەردەم یاسا لە خەڵکی دیکە زیاتر بن، هەمیشە پێی باش بووە کە تێکەڵاوی دانیشتووانی بنەڕەتی ئەو شوێنانە بن کە داگیری دەکردن. بەڵام لە ڕاستیدا (گووتەکان) زیاتر پیشەیان شەڕکردن بووە و ڕێیان بە منداڵەکانیان نەدەدا لە بوارەکانی وێژە و هونەردا بخوێنن. ئەوکاتەی (سیودریک) ویستی کاروباری وڵاتەکەی ڕێکبخاتەوە؛ کونسوولێکی بۆ خۆرئاوا دانا و (٣) والیشی بۆ هەریەک لە (ئیتاڵیا، ڕۆما، گال) دانا، بەڵام خۆی ئەندامەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی دادەنا، لە هەمان کاتدا باج و سەرانەی کەمکردەوە و کۆشکی خۆی کراوە بوو بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە لایەن دادگاوە بڕیارێکی ناڕەوایان بەسەردا دەدرا[٢].

بەو جۆرە سەرکردەیەکی بەربەری توانی هێمنی و ئاسایش بۆ (ئیتاڵیا) بگەڕێنێتەوە کە بەر لەو ئەو برایەتی و ئاسایشە لەسەردەستی ئیمپراتۆرەکاندا نەمابوو، سەرەڕای ئەوانەش وڵاتەکەی ئاوەدانکردەوە و خانووبەرەیەکی زۆر و کەناڵی ئاو و شانۆی تێدا دروست کرد و گەرما و کۆشک و پەرستگەی بنیاتنا و زەویوزاری بۆ کشتوکاڵ ڕێکخست و سامانی ژێرزەوی بەکارهێنا بەتایبەتی ئاسن و زێڕ. لە بواری ڕۆشنبیریشدا؛ هەرچەندە (سیودریک) نەخوێندەوار بوو، بەڵام ژمارەیەکی زۆر وێژەدۆست و شارەزایانی زانستی لە تەوقی خۆی کۆکردبووەوە. (سیودریک) هەرچەندە لەسەر ئایینزای (ئاریۆسی) بوو؛ بەڵام ڕێزی هەموو مافێکی کاسۆلیکەکانی دەگرت و هەرچی ڕەوایەتییەک هەبوو بە پەرستگاکانی (کاسۆلیکی) دا و مافی ئازادی هەڵبژاردنی قەشەکانی بە خەڵکی دەدا، لە هەمان کاتدا جووەکانیشی دەپاراست، لە نامەیەکدا بۆ سەرکردەی جووەکان نووسیبووی: "ئێمە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٧٨.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١١-١١٢.

ناتوانین به زۆری هێز ئایین بسەپێنین، چونکه هیچ کەسێک ناتوانێت باوەڕی به ئایینێک هەبێت که بەزۆر بەسەریدا سەپێندرابێت"[1].

بەمجۆره دەبینین که (سیودریک) پاشایەکی دادپەروەر و خۆشەویست بووه و له ماوەی فەرمانڕەوایەتیدا هەر بەو شێوەیه دەسەڵاتی وڵاتەکەی بەڕێوەبردووه، هەتا له ساڵی (٥٢٦ ز)دا کۆچی دوایی کردووه. به مردنی (سیودریک) سەروەری و دەسەڵاتی گووتەکان بەسەر گیتی بەربەرەکاندا کۆتایی پێ هات و گووته خۆرهەڵاتییەکان له خۆرئاواییەکان جیابوونەوه، خۆرهەڵاتییەکان کوڕەزاکەی سیودریکیان کرده فەرمانڕەوای خۆیان که ناوی (ئامالاریک ٥٢٦-٥٣٤ ز) بوو. گووته خۆرئاواییەکانیش یەکێک له کوڕەکانی (ئالاریکی دووەم)یان کرده مەزنی خۆیان که ناوی (ئامالاریک) بوو. پاش ماوەیەک دەوڵەتی گووته خۆرهەڵاتییەکان بەرەو لاوازبوون چوو؛ هەتا له ساڵی (٥٥٣ ز) بەدەستی ئیمپراتۆر (جەستینانی یەکەم) کۆتایی پێ هات و لەناوبران[2].

### سێیەم/ بورگووندییەکان

ئەم بورگووندیانه له جەرمانه خۆرهەڵاتییەکانن که له دەوروبەری ساڵی (١٥٠ ز)دا له (سیلیزیا)دا دەژیان؛ سەدەیەک دواتر چوونەته دۆڵەکانی ناوچەی (مین)، پاش ئەوێ بەرەو رووباری (ڕاین) ڕۆشتوون. ڕۆمانییەکان ڕێگایانپێدان زەویوزارەکانی سەرڕێگەیان بەکاربهێنن به مەبەستی پاراستنی سنوورەکان له هێرش و پەلاماری (جەرمانەکان)، ئەم بورگوندیانه شاری (ورمز)یان کرده پایتەختی خۆیان. لەوێ ڕۆمانییەکان بۆ بەڕێوەبردنی دەزگا بەڕێوەبەرایەتییەکان بەکاریانهێناون؛ هەروەک چۆن جەرمەنەکانیان بەکارهێنا، (بورگووندییەکان) توانیان دەرفەتی کارکردنیان لەگەڵ (ڕۆمانەکان و گووته خۆرئاواییەکان) بەکاربهێنن له بەرەنگاربوونەوەی هۆنەکاندا و ئەوه بوو له ساڵی (٤٥١ ز) توانیان له ناوچەی (چالۆنس) بەسەریاندا سەربکەون، پاش ئەوه به شێوەیەکی ئاشتیخوازانه سنووری

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص١١٤-١١٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١٦-١١٧.

دەسەڵاتیان لە ناوچەکانی نێوان (ئاڵپ و ڕوون) فراوان بکەن، ئەم ناوچەیەش دوایی هەر بەناوی خۆیانەوە ناسرا[1].

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە (بورگووندییەکان) پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی خۆرهەڵات) هەبووە و پاشاکانی (بورگووندی) گوێڕایەڵبوون بۆیان، بەڵام بە پێچەوانەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ لەگەڵ (فەرەنگ)دا زۆر باش نەبووە؛ بەتایبەتی لە سەردەمی (کلۆڤس)، چونکە لەم سەردەمەدا شەڕ لەنێوانیان سەریهەڵدا و بۆ ماوەی (١٠) ساڵ درێژەیکێشا، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ژنی (کلۆڤس) لە ڕەگەزی (بوورگوندی) بوو! ئەوەی جێگەی تێڕامانە کە دەوڵەتی (بورگووندییەکان) دەسەڵاتەکەیان زۆر درێژەینەکێشا و ئەوە بوو لە سەدەی شەشەمی زایینیدا کۆتایی پێ هات! هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە زۆر بەهێز نەبوون و نەیانتوانی خۆیان لەبەردەم ڕووداو و گۆڕانکارییە مەزنەکانی ئەو سەردەمەدا ڕابگرن[2].

### چوارەم/ ئەنگلۆساکسۆنەکان

(بەڕیتانیا) دووچاری داگیرکردنی دوو میللەت بووەوە کە ئەوانیش بریتیبوون لە (ئینگلیز و ساکسۆنەکان)، ئەو داگیرکردنەش ماوەی سەد ساڵێکی خایاند و لە ئەنجامدا بوو بەهۆی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی (ئەنگلۆساکسۆنی ٤٥٥-٥٨٤ ز). (بەڕیتانیای مەزن) کە (ڕۆمانەکان) بەشێکیان لێ داگیرکردبوون؛ کەوتبووە ژێردەستی سێ میللەتی جیاوازەوە کە ئەوانیش: (کالدونییەکان، بکتەکان، سکۆتلەندییەکان) بوون، پاکتەکان بە بەردەوامی لە سەرووی سکۆتلەنداوە هێرشی دڕندانەیان دەکردە سەر باشوورییەکان، (ڕۆمانەکان) کە دەستیان بەسەر دوورگەکانی بەڕیتانیادا گرتبوو؛ توانیان بەرەنگاریان ببنەوە، بەڵام کاتێک کە ئیمپراتۆری خۆرئاوا (هۆنۆریۆس) هێزەکانی لە دوورگەکە کشانەوە بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەکانی (ئالاریک)، ئیدی ڕۆما دەسەڵاتی بەسەر ئەوێدا نەما! لە ساڵی (٤٩١ ز)دا (ئیللا) دەوڵەتی (سوسێکس) واتە (ساکسۆنیای باشوور)ی

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٦.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ص٦٨.

له (وینچێستەر) دامەزراند، هەروەها (کێردێکیش) لە ساڵی (٥١٦ ز)دا دەوڵەتی (ویسێکسی) لە (وینچێستەر) واتە (ساکسۆنیای خۆرئاوا) دامەزراند[١].

لەم ساتەوە ئیدی ئەمە بووە دەسپێکی شەڕوپێکدادان لەنێوان (ساکسۆنییەکان و کامبیرییەکان)، بەڵام (ئارسەری میری کارلیۆنییەکان) پشتگیری لە (کامبیرییەکان) کرد و توانی (ساکسۆنییەکان) تێکبشکێنێت، هەربۆیە سەرچاوەکان ئەوەمان لێ ناشارنەوە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە وا لە (١٢) شەڕدا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن کە تەنها بە دەستی خۆی لە یەک ڕۆژدا (٤٠٠) کەسی لە دوژمنەکانی کوشتووە. بەڵام ئەم بارودۆخەکە هەروا نەمایەوە، ئەوە بوو لە یەکێک لە شەڕێکەدا (ئارسەر) بریندارکرا و برایە دوورگەیەک لەوێدا کۆچی دوایی کرد. لە ساڵی (٥٢٦ ز)دا (ساکسۆنییەکان) توانیان دەوڵەتێک لە خۆرهەڵاتی (ئینگلتەرا) دابمەزرێنن، ئەم فەرمانڕەوایەتییەش بە ئیسێکس (ساکسۆنییە خۆرهەڵاتییەکان) ناسران و شاری (لەندەن)یان کردە پایتەختی خۆیان، وشەی لەندەن بە واتای (شاری کەشتی) دێت. ئەو ناوچەیەی کە (ڕۆمەکان) فەرمانڕەوایەتیان تێدا دەکرد ببوو بە (٧) دەسەڵاتداریتی پاشایەتی بەربەری بچووک کە دواتر لە یەک دەوڵەتدا یەکیانگرت[٢].

لە سەدەی چوارەمدا قەشە (پاتریک) ئایینزای (کاسۆلیکی) هێنایە (ئێرلەندا) و (ئێرلەندا) بووە مەڵبەندێکی پڕشنگداری (مەسیحییەت)، لەناو ئێرلەندییەکاندا قەشەیەکی بەناوبانگ دەرکەوت کە توانی ڕۆڵێکی دیار و بەرچاو لە (سیستمی کڵێسایی مەسیحی) لە ئەورووپا ببینێت کە ئەویش (کۆلۆمبان) بوو. ناودارترین کەسایەتی (جەرمانەکان) لە مێژووی ئینگلتەرەدا (ئێپیلبێرت) بوو، ئەم پاشایە هەوڵی یەکگرتنی وڵاتەکەیدا، جگە لەوە هەنگاوێکی یەکجار گەورەی‌نا بۆ کۆکردنەوەی پاشا جیاوازەکانی (ئینگلتەرا) لە چوارچێوەی نەتەوەیەک و لەسەر ڕێبازی (مەسیحییەت)، هەموو خەڵکەکەشی ئایینی پاشاکەیان وەرگرت جگە لە (لەندەن) نەبێت کە دژ بە پەسەندکردنی ئایینی (مەسیحی) بوون[٣].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٩٢-٩٣.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١٩.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١٩-١٢٠.

**پێنجەم/ ڤاندالەکان**

وشەی (ڤاندال) بە واتای (بەربەر) و هەموو ئەوانە دێت کە سەرقاڵی وێرانکاری و کاولکردنن، ئەم گەلە بەناوبانگبوون لە توندوتیژی و کاری ڕێگری و کوشت و بڕین و وێرانکردندا، چونکە توانیبوویان پەلاماری وڵاتی (گال و ئیسپانیا) بدەن، بەدەر لەوەی کە توانیان شانشینێک لە جێگەی (قرتاجەی دێرین) دابمەزرێنن. زۆرێک لە سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن کە (ڤاندالەکان) توندوتیژتر لە میللەتەکانی دیکەی (جەرمانی) هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ژێردەستەکانیاندا دەکرد، هاوکات لە کاتی فەرمانڕەوایی ناوچەکانی وڵاتی گالدا و بە سەرۆکایەتی پاشاکەیان (گوندریک) زۆربەی شارەکانی ناوچەی (ڕایین)ی وێرانکرد؛ وەک (ماینس، ئەمیان، ڕیمس، ئەراس، مورین، تورنای، سبیر و ستراسبورگ)[1].

(ڤاندالەکان) هاوشێوەی (بورگوندییەکان) لە میللەتانی (جەرمانی خۆرهەڵاتی) بوون، لە سەرەتای سەدەی یەکەمدا لە ناوچەکانی (سیلیزیا و بۆهیمیا) نیشتەجێببوون، لە ئەنجامی ئەو ئاژاوە و بارودۆخە نالەبارەی لە پاش شەڕی (مارکۆمانی) لە ساڵی (١٦٦ ز) هاتەئاراوە؛ ئەم میللەتانە دووچاری پەرت و لێکترازان بوون، بەشێک لە ڤاندالەکان (ڤاندالی ئەسەدنجین) بەرەو (هەنگاریا) ڕۆیشتن، بەشەکەی دیکەشی (ڤاندالی سلینجوون) لە (سیلیزیا) مانەوە[2].

لە ساڵی (٤٢٨ ز)دا؛ (گەیسێریک) کە لە سەردەمی خۆیدا مەزنترین کەسایەتی هەبووە، بوو بە پاشای (ڤاندالەکان)، ئەم پاشایە ڕامیاریزانێکی هێندە لێزانبوو کە هیچ سەرکردەیەکی بەربەرەکان شانیانلەشانی نەدەدا جگە لە (کلۆڤس). (گەیسێریک) سەرکردەیەکی بەتوانا و لێهاتووبوو لە مەیدانی جەنگدا، لە ساڵی (٤٢٩ ز) بە سەرکردایەتی لەشکرێکی (٨٠٠٠٠) سەربازی لە گەرووی (چیاکانی تارێق) پەڕیەوە و گەیشتە ئەوبەری کەناراوەکانی دەریا لە باکووری ئەفریقا، لەوێ لەگەڵ هۆزە بەربەرەکاندا بووە هاوپەیمان و بە هەردوولا سەرکردەی ڕۆمانەکان (بۆنیفاس)یان لە شەڕێکی قورسدا تێکشکاند و شاری (هیپۆ)یان بۆ ماوەی (١٤) مانگ ئابڵووقەدا، ئەم شارە کەوتووەتە سەردەریا لە باکووری خۆرئاوای قرتاجەوە[3].

---

(١) محمد زاید عبدالله: مدخل الی تاریخ اوروبا، ص٦٨.

(٢) محمد زاید عبدالله: مدخل الی تاریخ اوروبا، ص٦٨.

(٣) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ص٨٩.

لە ساڵی (٤٥٥ ز) توانیان بە کەشتییەکانیانەوە بگەنە (ڕۆما) بە مەبەستی جێبەجێکردنی پرۆسە تاڵانی و دزی و جەردەییەکانیان، ئەم پرۆسەیە نزیکەی (٢) هەفتەی خایاند؛ بە شێوەیەک سەری (کابیتوول)یان ڕووخاند، چونکە پێیانوابوو لە زێڕ دروستکراوە، هەروەها پەیکەرەکانیان لەگەڵ خۆیان برد، نەک لەبەرئەوەی وەک کارێکی هونەری داتاشرابوون؛ بەڵکوو زیاتر لەبەرئەوەی لە زیو دروستکرابوون[١].

(ڤاندالەکان) وردەوردە دەستیانکرد بە دروستکردنی پاپۆڕ و دواتریش هێزێکی دەریایی مەزنیان پێکەوەنا، بە دروستکردنی هێزی دەرياییەکەیان؛ دەوڵەتی (ڤاندالەکان) زیاتر گەشەیسەند و بەهێزبوو، توانیان دەستبگرن بەسەر هەندێک دوورگەی وەک: (سەقلیە، کۆرسیکا، سەردینیا، بلیار)، لەوێشەوە پەلیان بەرەو دوورگەکانی دەریای (ئیجە) هاویشت. ئامانجی (گەیسێریک) ئەوەبوو مەیدانخوازی ئیمپراتۆرییەتی خۆرهەڵات لە (قوستەنتینییە) بکات؛ هاوشێوەی ئەوەی لە (ڕۆما) ئەنجامیاندا، بە هۆکاری ئەم فراوانخوازییە دەریاییەدا توانیان ببنە سەروەری دەریای (سپی ناوەڕاست). پاشای ئەم ڤاندالانە (گەیسێریک) بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ فەرمانڕەوایی کرد؛ لەم ماوەیەشدا بەرهەڵستی هەردوو ئیمپراتۆرییەتی خۆرهەڵات و خۆرئاوای دەکرد، (گەیسێریک) لە کاتێکدا میللەتەکەی لە لووتکەی سەرکەوتندا بوو؛ لە ساڵی (٤٧٧ ز)دا کۆچی دوایی کرد، دوای مردنی ئەو دەسەڵاتەی (ڤاندالەکان) بە هۆی ناکۆکییە ئایینییەکان لە لایەک و شەڕی (بەربەرەکان) لە لایەکی دیکەوە بەرەو لاوازی ڕۆشتن و لە ئەنجامدا لەسەردەستی سەرکردەی بێزەنتی (بێلیساریۆس) لە ساڵی (٥٣٤ ز)دا کۆتاییان پێ هات[٢].

### شەشەم/ هۆزەکانی هۆن

ئەم هۆزانە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر (مەنگۆلەکان)، ئەورووپییەکان بە بینینیان ترسیان لێ دەنیشت؛ چونکە خاوەن شێوەیەکی جیاواز بوون لەوان، دەموچاویان بێ موو و پڕ لە برین بوو، چاوەکانیان بچووک بوون. لە ساڵی (٤٥١ ز) بە سەرکردایەتی گەورەکەیان بە ناوی (ئاتیلا) توانیان بچنە وڵاتی گالەوە، لە

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٥٨.

(٢) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٨٠-٨٤.

ئەنجامی ئەم هێرش و پەلامارە؛ هێزەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی) هاوپەیمانیان لەگەڵ (گـووتە خۆرئاواییەکـان) و زۆرێـک لە هـۆزە (جەرمانییەکـان) ئەنجامـدا بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی (هۆنەکان)، لە شـەڕێکی خوێناویدا لەنزیک شـاری (توریس) پێکدادان لەنێوانیاندا ڕوویدا و (هۆنەکان) سـەرکەوتن و بەردەوامبووم لە پێشڕەوییەکانیان؛ بە جۆرێک کە توانیان بچنە ناو (ئیتاڵیا) و نزیکی شورای (ڕۆما) بوونەوە، بەڵام (پاپا لیۆی مەزن) بە شـێوەیەک بەرچـاو و لێهاتووانە ڕووبەڕوویان ببووە، هەرچەندە زۆرییێنەچوو بە هۆی مردنی لەناکاوی (ئاتیلا)ی سـەرکردەیانەوە ئیتاڵیایان بەجێهێشت و گەڕانەوە[1].

هۆزەکانی (هۆن) کە لە سەدەی سێیەمی زایینییەوە لە دەشتە مەزنەکانی ئاسیای ناوەڕاسـت؛ واتە لەپشـت دەریـای خەزەرەوە (قەزویـن) نیشـتەجێبوون، وردەوردە بەرەو خۆرئاوا دەکشان، ئەم هۆزانەش لەناوخۆدا ببوونە دوو بەش:

هۆزەکانی هۆنی سپی، کە مەترسییەکی زۆری لە ساسانیدا دروست کردبوو.

هۆزەکـانی دیـکەی هـۆن بەرەو ئەوروپـا دەڕۆیشـتن، ئەمـانە لە سـاڵی (٣٧٦ ز) مۆڵەتیـــان لە ئیمپراتـــۆری ئەوکـــاتەی ڕۆمـــا (ڤـــالێنز) وەرگـــرت، کە لەنـــاو ئیمپراتـۆریەتەکەدا وەک یەکێتیەکـی ئیتنـی نیشـتەجێ بـبن،ئەم هـۆزە یەکـێکن لەو هـۆزانەی کە لە دڕندایەتیـدا هاوشـانیان نەبـووە و تـرس و لەرزێکـی بـێ وێنەیـان خستبووە دڵی دانیشتووانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆماوە.[2]

(ئاتیلا) سەرکردەی ئەم هۆزە بوو، ڕەمزی ئایینەکەیان بریتیبوو لە خەنجەرێکی داچەقیوو لە زەویدا، (ئاتیلا) چاوی لەوەبوو دەسەڵاتی تەواوی بەسـەر هۆزەکەیەوە هەبێت، لەم پێناوەشدا فەرمانیدا (بلیدا)ی برای بکوژن، بەمەش دەسـەڵاتی تەواوەتی گرتەدەســـت لەنێـــوان ســـاڵانی (٤٣٣-٤٥٣ ز). (ئـــاتیلا) لە لای هـــۆزەکەی وەک خوداوەندێکی پیرۆز تەماشـادەکرا، یەکەم هێرشی بۆ سـەر ناوچەکـانی خۆرهەڵاتی ئیمپڕاتـۆرییەتەکە بـوو، بە ئامـانجی ئەوەی ئیمپڕاتـۆر (سیۆدۆسـیۆس) ناچـار بکـات لەشکرەکەی لە بەرامبەر (گەیسێریک) بکێشێتەوە، (ئاتیلا) توانی لە (دانووب)ی نزیک بە (مارگووس) تێبپەڕێنێت و نزیکەی (٧٠) شـار وێران بکـات، بەمەش (ئـاتیلا) جگە لەوەی ئیمپڕاتـۆری ناچـارکرد لەشـکرەکەی بەرەودوا بکێشـێنێتەوە؛ بەڵکـوو بـاج و

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٢٣.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٥٣.

خەراجیشی لەسەر زیادکردن کە بیدات بە (هۆنەکان)، هاوکات ناچاریشیکرد دەست لە ناوچەکانی لای ڕاستی ڕووباری (دانووب) هەڵگرێت بۆ (ئاتیلا) و هۆزەکەی[1].

پاش مردنی (سیۆدۆسیوس) لە ساڵی (٤٥٠ ز)دا؛ (ئاتیلا) بە سەرکردایەتی لەشکرێکی (٦٠٠٠٠٠) هەزار چەکدارییەوە بەرەو وڵاتی (گاڵ) ڕۆشتن، لەوێ لە ڕووباری (ڕاین) پەڕینەوە و تالانی و فەرهوودیەکی زۆریانکرد و پاشان ڕووبارەکانی (مۆزێل و سین)یان تێپەڕاند و بەرەو شاری (ئۆرلیانس) ڕۆیشتن، خەڵکی ئەوێ لە ترسی (ئاتیلا) و لەشکرەکەی شارەکەیان بەجێهێشت، چونکە (ئاتیلا) و سوپاکەی بە هەر ناوچەکەیدا دەڕۆشتن بەجۆرێک وێرانیان دەکردن کە داروبەردی لەسەریەک نەهێشتووە، تەنها شارێک کە لە دەستی ڕزگاریبووبێ (ترۆی) بوو، کە ئەویش لە ڕێی قەشەی شارەکەوە (ئەنانیووس) بوو کە ورەی دانیشتووانەکەی بەرزکردبووەوە. بۆ ڕێگرتن لە شالاوی دڕندانەی (بەربەرەکانی هۆن)؛ ژمارەیەک ڕەگەزی جیاواز خۆیان کردە هاوپەیمانییەک ئەوانەش بریتیبوون لە: (ڕۆمانی، گووتە خۆرئاواییەکان، ساکسۆنەکان، بورگوندییەکان، فەرەنگەکان)، ئەنجامی ئەم جموجووڵانەش لەنزیک (چالۆنس) لە ساڵی (٤٥١ ز) لەنێوان هێزە هاوپەیمانەکان و لەشکرەکەی (ئاتیلا) شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا، بەڵام شەڕەکە ئەنجامی پێچەوانەی ڕابردووی هۆنەکانی هەبوو و بە تێکشکانیان کۆتایی هات[2]. لەم شەڕەدا نزیکەی (١٥٠٠٠٠–١٦٠٠٠٠) سەرباز کوژران، بەمەش توانرا بەشی خۆرئاوا لەدەست (هۆنەکان) ڕزگاربکەن، دوای ئەم شکستە لە هەمان ساڵدا (ئاتیلا) و پاشماوەی هێزەکەی بەرەو (ئەڵمانیا) گەڕانەوە. ساڵی دواتر (ئاتیلا) بە ئامانجی تۆڵەسەندنەوەی ئەو شکستە؛ بەشی باکووری ئیتالیای داگیرکرد و (ئاکویلیا و پادوا)ی کردە خۆڵەمێش! هەندێک شاری دیکەی وەک: (ڤێرونا، پاڤیا، میلانۆ)ش ناچاربوون سەری بۆ نەوی بکەن، (ئیتالییەکان) هیچ لەشکرێکی وایان نەمابوو بەرگریان لێ بکات؛ بۆیە (پاپا لیۆی یەکەم) لەپێناو ڕزگارکردنی میللەتەکەیدا بەرەو (ئاتیلا) ڕۆیشت و هەرچی دیاری و داوایەکی هەیبوو پێشکەشیکرد، ئامادەیشی نیشاندا کە باجی سەرانەشی پێ بدات لە خۆشبەختی (ئیتالییەکان). زۆری نەبرد کە نەخۆشی تاعوون لەناو لەشکری (هۆن) بڵاوبووەوە و ژمارەیەکی زۆری لێ

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٧٦.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٤٢.

کوشتن، چەند مانگێک دواتر و لە ساڵی (٤٥٣ ز)دا (ئاتیلا) لە گوندەکەی خۆی نزیک بە دانووب گیانیلەدەستدا و کۆچی دوایی کرد[١].

### حەوتەم/ سلاڤییەکان

یەکێک لەو ڕەگەزانەی کە لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپادا ڕۆڵ و کاریگەری خۆیان هەبووە لەسەر گۆڕەپانی رامیاری و سەربازی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەورووپا و ناوچەکە؛ شوێنپەنجەیان لەو سەردەمەدا زۆر بە ئاشکرا دەردەکەوێت لەو ناوچە بەرفراوانەی کە تێیدا دەردەکەوێت کە ئەوانیش سلاڤییەکانن. (سلاڤییەکان) ڕەگەزێکن لەو ڕەگەزە سەرەکیانەی سەر خاکی ئەورووپا و ڕووسیا، ئەوەی لێرەدا هاتووە کورتەیەکە لە مێژووی ئەم ڕەگەزە سەرەکیانەی ئەورووپا، بێگومان ئەم سلاڤیانە لەو سەردەمەی کە تێیدا دەرکەوتن وەک هێزێکی کاریگەر و گرنگ کار و چالاکی خۆیان هەبووە و کاریگەری بە هێزیان هەبووە لەسەر رامیاری ئەورووپا و ڕووسیا، بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە لەو ناوچانەی کە تێیدا ژیاون، خاوەنی کیان و بوونی رامیاری سەربەخۆی خۆیان بوون؛ بە شێوەیەکی گشتی بەسەر ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئەورووپادا نیشتەجێبووبوون و جێگیرببوون لە چەند وڵاتێکی جیاوازدا، ڕۆڵیان هەبووە لە بەرەوپێشبردنی لایەنی ژیاری سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا، خودی (سلاڤییەکان) لە چەند هۆزێکی جیاجیا پێکهاتبوون کە بە شێوەیەکی گشتی دابەشبووبوون بەسەر چەند ناوچەیەکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا[٢].

سلاڤییەکان بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگەزی (ئاری) یان (هیندۆئەورووپی)، ئەوەی دەربارەی ئەم سلاڤیانە زانراوە ئەو زانیاریانەی کە لەبارەیانەوە هاتووە؛ هەتا سەدەی دەیەم لە زیادبوون و بڵاوبوونەوەی بەرچاودا بوون لە ئەورووپا بە ئاراستەی خۆرئاوا و باشوور، هەرچەندە لەو سەردەمەدا لە بواری ژیاردا زۆر لاوازبوون بەرامبەر ئەو پێشکەوتنەی کە ڕووبەڕووی دەبوونەوە لەگەڵ ژیارەکانی دیکە ئەورووپادا. ئەوەی کە ئەوان زۆر هەوڵیان بۆ دەدا بریتیبوو لەوەی شوێنپێی لە شوێنکەوتەی سەرانی (الارقی) کە فەرمانڕەوایان بوون، ئەمەش بە هۆی ئەوەی

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط، ج١/ ص٢٦.

(٢) نورالدين حاطوم: هەمان سەرچاوە، ج٢/ ص٥٥٥.

کە زانـــراوە دەربارەیـــان بە هەڕەمەکـــی کارەکانیـــان ئەنجامـــدەدا. لە ڕوانـــگەی ڕامیارییەوە هیچ شارەزاییان نەبووە، بەڵام زۆری نەبرد گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە سروشـتی سـلاڤییەکاندا ڕوویـدا؛ بـۆیە وردەوردە بـوونە گەلێکـی بەهێـز و بەتوانـا لەڕووی جەنگاوەرییەوە، ئەمەش وایکرد کە دەوڵەتێک بـۆ خۆیـان پێکبهێنن، چەند سـەرکردەیەکی بیـانی سـەرکردایەتی دەکـردن، هەروەهـا لە ژیـاری وڵاتـانی دەوروبەری خۆیان سوودیان وەرگرتووە و لەو چوارچێوەیەشدا ئایینی مەسیحیان هەڵبژارد بۆ خۆیان و بوون بە (مەسیحی)[1].

لەگەڵ بەرەوپێشچوونی کاتدا بزاوتی (سلاڤی) نەشـونمای کـرد و هۆزەکانیـان لە یەکدی دوورکەوتنەوە، بۆیە بوونە سێ بەشی گەورە و فراوانەوە کە ئەمانەن:

١. سـلاڤییە باشـوورییەکان: بریتیبـوون لە (بولگاریـا و سـڕب و کرواتیـا و سلۆڤین).

٢. سلاڤییە خۆرئاواییەکان: لە (پۆڵەندا) و هەندێکی دیکەشیان لە (ئەڵمانیا و بۆهیمیا و مۆراڤیا و سلۆڤاکیا) بوون، دانیشتووانەکەیان پێیاندەگوترا (بۆهیمییەکان)، هەریەک لەم سـێ بەشـە گەورە کەوتـنە ژێـر کـاریگەری بـارودۆخێکی تـایبەتییە و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ببنە سێ بەشی دوور لە یەک[2].

٣. سـلاڤییە خۆرهەڵاتییەکـان: یـان ڕووسـییەکان، ئەمـانەش دەبـن بە چەنـد بەشـێکەوە، ڕووسـیای مەزن لە ناوەڕاسـتدا (ناوەڕاسـتی ئەورووپـا) و بـاکووردا و ڕووسە بچووکەکان لە باشووردا و ڕووسە سپی پێستەکان لە خۆرئاوادا.

### أ. سلاڤییە باشوورییەکان

(سلاڤییەکانی باشوور) مێژوویـان لەگەڵ مێژووی دەوڵەتی بێزەنتیدا تێکەڵبووە، (بولگارییەکان) لە (دانووب) نیشتەجێ و جێگیربوون، یەکەم ئیمپڕاتۆریان بۆ خۆیـان پێکهێنـا و بـوون بە دەوڵەتێکـی سـەربەخۆ لەنێـوان سـاڵانی (٨٩٣–١٠١٨ ز)، ئەم ئیمپڕاتۆرییەتە لە سەردەمی (سیمونی قەیسەری بولگاریا)دا گەیشتە ئەوپەڕی هێز و توانـا و دەسـەڵاتی خـۆی کە سـاڵانی (٨٩٣–٩٢٧ ز) دەگـرێتەوە، هـۆی ئەم دەسـەڵاتەش دەگەڕێتەوە بـۆ ئەوەی (سـیمۆن) ئەو مـاوە دوورودرێـژەی

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط،ج١/ ص٤٤٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٦٣.

فەرمـانڕەوایی تێیدا دەکرد؛ هەسـتا بە دروسـتکردنی بزوتنەوەیەکی بەرفـراوان لە ابەڵقان) لەسەر هەژماری دەوڵەتی (بێزەنتی) لە لایەک و لە لایەکی دیکەوە لەسـەر هەژمـاری دەوڵەتـانی دراوسـێیاندا. جێگـای ئامـاژەپێکردنە کە ئیمپڕاتـۆرییەتی (بولگـاری) لە سـەردەمی (سـیمۆن)دا تەنهـا لە ڕووی سـەربازی و جەنگیـیەوە بەرەوپێشـچوونی بەخـۆیەوە نەبینـی؛ بەڵکوو ئەو سـەردەمە بە سـەردەمی زێـڕین دانـراوە لە بـواری وێـژە و ئەدەبـدا، ئەویـش بە هـۆی زۆر هانـدانی (سـیمۆن) و سەرپەرشـتیکردنی ئەم بـوارە، ئەمەش جێـی سەرسـوڕمان نییە؛ چـونکە (سـیمۆن) خوێنـدەواربوو (پـێش ئەوەی تەختـی دەسـەڵاتی بولگـاری بگرێتەدەسـت) لە (قوستەنتینییەی پایتەختی بیزەنتی)، هەرلەوێش خۆی ئەو ژیارە مەزنەی بینی؛ بۆیە گەڕایەوە وڵاتـی خـۆی. بـۆ ئەوەی سەرپەرشـتی وەرگێڕانـی (ئینجیـل و پەرتـووکە پیرۆزەکـان) بکـات بـۆ زمـانی گەلەکەی خـۆی. کاتێک ئیمپڕاتـۆرییەتی (بولگـاری) لە ساڵانی (١٠١٨–١١٨٦ ز) شکستیهێنا؛ چووەوە ژێر دەسەڵاتی (بیزەنتییەکان)، پاش ئەوەی ئیمپڕاتـۆری بیزەنتـی (باسـلی دووەم) لە سـاڵانی (٩٧٦-١٠٢٥ ز) ئەم سەرکەوتنەی بەدەستهێنا کە بە خـوێنڕێژ و ستەمکاری (بولگـاری) دادەنرێت. بەڵام زۆرینەبرد دەوڵەتی (بولگاری) دەسـەڵاتی پەیداکردەوە و ئیمپڕاتـۆرییەتی (بولگـاری دووەمی) لە ساڵانی (١١٨٦–١٣٩٨ ز) پێکهێنا و دەوڵەتـی سـەربەخۆی ڕاگەیاند، ئەم ئیمپراتۆرییەتە درێژەی هەبوو؛ هەتا ئەوکاتەی کە دەوڵەتی (عوسـمانی) هێرشـیکردە سەر وڵاتی (بولگاریا)[1].

لە خۆرئـاوای (بولگاریـا) لەنێـوان (بەلەگـراد) و کەنـاری دەریـای (ئەدریـانی)دا (سرپەکان) جێگیربوون و شانشینێکیان دامەزراند کە لە سەردەمی مەزنی سرپەکان (ستیڤن دۆشان) گەیشتە ئەوپەڕی دەسەڵات کە ماوەی نێوان ساڵانی (١٣٣٦–١٣٥٦ ز) دەگـرتەوە، چـونکە توانیـان لەم مـاوەیەدا هەسـتن بە هێرشـێکی زۆر فـراوان لە (بەڵقان) و لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەشدا زۆرێک لەو ناوچانەی بەڵقانیان خستە ژێر دەسـەڵاتی دەوڵەتەکەیـانەوە، تەنـانەت بیریـان لەوەش کردبـووەوە کە شـاری (قوسـتەنتینییە)ی پـایتەختی دەوڵەتـی (بیزەنتـی) بـخەنە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـانەوە؛ بەتایبەتی لە ساڵی (١٣٤٦ ز) کە لەو ساڵەوە (ستیڤن دۆشان) خـۆی وەک ئیمپڕاتـۆڕ دەزانـی. لە ڕووی کاروبـاری ناوخۆشـدا هەسـتان بە دانـانی کۆمەڵێـک یاسـا و

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط، ج١/ ص٤٤٦-٤٤٧.

دەستوور لە ساڵی (١٣٤٩ ز) و توانیان لەو یاسایانەدا بە ئاشکرا بیروبۆچوونی کۆمەڵگەی (سڕبی) باس بکەن، لەسەرووی ئەمانەشەوە (دۆشان) پارێزگاری لە بازرگانەکان و وڵاتەکەی دەکرد و هانی دەدان بۆ بەرەوپێشچوونی زیاتر[١].

لێرەدا ئەوە بەدیدەکرێت کە لەنێوان سەرانی سلاڤییە پێشینەکان لە خۆرئاوای (بەڵقان) و ئەوەی پێکەوە گرێیانیدەدا بریتیبوو لەوەی هەردووکیان کەنیسەی خۆرهەڵاتی هەڵبژێرن هەتا ئەندازەیەک وا دەردەکەوت ئەمانە میراتگری ئاسایی کەنیسەی ئیمپراتۆرییەتی (بیزەنتی) بن لە ناوچەکەدا. ئەمەش پێچەوانەی خزمە کرواتییەکانیان بوو کە لە دەریای ئەوروو‌پادا جێگیربووبوون و بەرەو خۆرئاوا ڕۆشتن و ئایینزای کەنیسەی خۆرئاواییەکانیان هەڵبژارد؛ هەتاوەکوو ئەوکاتەی بوونە ژێردەستەی هەنگارییەکان لە ساڵی (١١٠٢ ز)دا. بەڵام هەنگارییەکان لە گەلی ئاسایی توندوتیژ دەچوون کە لە خۆرهەڵاتی ئەوروو‌پا لە سەدەی نۆیەمدا دەرکەوتن، بۆ ئەوەی بیرەوەری (ئاتیلا) و شەڕە بەناوبانگە (تێکشکێنەرەکانی) لە ئەوروو‌پادا بدەنەوە بە گوێی خەڵکیدا، تەنانەت ئەمانە باسکرابوون بە توندوتیژییەکی لەڕادەبەدەر؛ بە شێوەیەک دەگێڕنەوە گۆشتی گیاندارانیان بە کاڵی خواردووە خوێنی دوژمنەکانیان دەمژی و دەیانخواردەوە[٢].

زۆری نەبرد وردەوردە و لەسەرخۆ گەڕانەوە بۆ باری ئاسایی خۆیان و وازیان لەو توندوتیژییە هێنا کە لەوەوپێش پێی ناسرابوون، ئەمەش بە هۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ گەلانی دیکەی پێشکەوتوو و خاوەن ژیارەکان. پاش ئەوە لە نزیکەی ساڵی (٨٦٠ ز) لەنێوان هەردوو ڕووباری (دۆن و دەنیر)دا جێگیر بوون؛ مەزنی قەشەکانی بانۆنیان (مسودیووس) توانی بیانهێنێتەسەر ئایینی (مەسیحی) و باوەڕیان پێ بهێنێت. لە ساڵی (٨٩٩ ز) هێرشیان کردەسەر (ئیتاڵیا) واتە (لۆمباردیا) و ئەوەبوو لەو پرۆسەیەدا (بانونیا) لە ساڵی (٩٠٠ ز) تالانکرا، چونکە کەس نەبوو ڕێگربێت لەپێش فراوانخوازییەکانیان. لەوکاتەدا ئیدی هەنگارییەکان بە هەلیانزانی لە شێوە ژیان و ژیاری دەرەبەگایەتییەوە خۆیان نزیک کردەوە، ئەمەش هەر لەژێر سایەی (ستڤن)ی پاشایاندا بوو لە ساڵانی (٩٩٧–١٠٣٨ ز) و هەروەها (لادسلاسی پاشا) لە

---

(١) جاك لوكوف: هل ولدت اوربا في العصر الوسيط، ت: محمد حناوي ويوسف نكاوي، ط١، الرباط، ٢٠١٥ م، ص٥١.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط، ج١/ ص٤٤٨.

ساڵانی (١٠٧٧–١٠٩٥ ز). بێگومان گرنگترین پاشماوەیەک کە (هەنگارییەکان) لە مێژوویاندا بەجێیانهێشتبێت لەو سەردەمەدا؛ بریتیبووە لە هێرشبردنیان بۆ سەر نەتەوە و دەوڵەتەکانی دیکە، تەنانەت وایلێهاتبوو لە سەدەی دەیەمدا هێرش بکەنە سەر (ئەڵمانیا)! تەنانەت دوای گرتنەدەستی دەسەڵات لە لایەن (لادسلاسی) توانی ئەو زیادبوونە زۆرە لە وڵاتی (ئەلمانیا) ڕابگرێت و لە بەرامبەردا سوارچاکەکانی (تیتیۆنی) لەسەر هەژماری زەوی (پۆڵەندییەکان) فراوانخوازی کرد[١].

### ب. سلاڤە خۆرئاواییەکان

ئەمانە گرنگترینی گەلەکانیان بریتیبوون لە (مۆرافییەکان، بۆهێمییەکان، وەندییەکان و پۆڵندییەکان)، هەموویان بەوە ناسرابوون کە توانایەکی باشیان هەبووە لە پێکەوەژیان و پەیوەستبوونیان بە یەکدییەوە، تەنانەت (مۆرافییەکان) توانیان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆیەمدا شانشینێکی بەهێز بونیادبنێن. لە سەردەمی (لادسلاسی) پاشایاندا لە ساڵی (٨٤٥–٨٧٠ ز) نێوانی هەرێمی (بانۆنیا) بۆ (بۆهیمیا) بەرەو خۆرئاوا و (گالیسیای خۆرهەڵات و دانووب لە خۆرهەڵات) بگرێتەوە. زۆرینەبرد ئایینی (مەسیحی) لەو ناوچانەدا بڵاوبووەوە و گەشەیکرد لە ژێردەستی قەشەکانی دەوڵەتی (بێزەنتی)، لە سەرووی هەموویانە (کیرلس، میسیۆ، دیۆسی) قەشە بوو؛ کە بە نێردراوی (سلاڤی) ناسرابوو، هەرچەندە زۆربەی (سلاڤە خۆرئاواییەکان) چووبوونە کەشتی کەنیسەی خۆرئاوایی مەسیحییەوە، پاشان شانشینی (مۆرافیان) لە ساڵی (٩٠٥ ز)دا کەوتە ژێردەستی لەشکرکێشییەکانی هەنگارییەکانەوە، بە هۆی ئەمەوە کارتێکردنی خۆرهەڵاتییەکان لێکپچڕا و کاریگەرییان لەسەریان نەما، بۆیە ئەڵمانییەکانی دراوسێیان توانیان بیانگۆڕن بۆ ئایینزای کەنیسەی لاتینی[٢].

کاتێک گرنگی (مۆرافییەکان) بەرەو بێهێزی و لاوازی چوو؛ ئیدی دوای ئەوەی بوونە ژێردەستەی (هەنگارییەکان). لە ساڵانی (٩٠٥–٩٠٦ ز)دا لەسەر نەخشەی ئەوروپا (بۆهیمییەکان) دەرکەوتن و ئەوە بوو دەوڵەتێکیان بونیادنا' گرنگترین

---

(١) محمود سعيد عمران: قسطنطين السابع (ادارة الامبراطورية البيزنطية)، ط١، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٠، ص٦٨.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط، ج١/ ص٤٤٨.

شتێک کە مێژووی ئەم دەوڵەتەی پێ جیابکرێتەوە بریتیبوو لەوەی کە دووچاری دوو لایەنی دژ بە یەکدی بوونەوە؛ یەکەمیان پەلکێشبوونیان بۆ ژیاری (ئەڵمانی)، دووەمیان هانیدەدان بۆ بەرگریکردن لە داگیرکاری ئەڵمانی[1]. بەڵام ڕەوتی یەکەم بەهێزتربوو؛ تەنانەت سەرکردەکانی (بۆهیمیا) زیاتر ژیان و گوزەرانی ئەڵمانییەکانیان بەلاوە سەرنجڕاکێشتربوو! هەرچەندە لەگەڵ ئەوەشدا پاشا بەهێزەکانی (بۆهیمیا) لە سەدەی سیازدەهەمدا وەک (ئۆتۆکاری دووەم) لە ساڵانی (١٢٥٣-١٢٧٨ ز)دا ئەوەیان هەڵبژارد کە ڕامیاری دەرەکیان بەرەوپێشبچێت لەسەر هەژماری زەوییەکانی (ئەڵمانیا)ی دراوسێی. چینێکی دیکە هەن لەناو (سلاڤە خۆرئاواییەکان) کە ئەوانیش بریتیبوون لە (وەندییەکان)، بەڵام وا باوە کە بۆ یەکەمجار (جەرمانییەکان) وشەی وەندییان بەکارهێناوە بۆ هەموو (سلاڤەکان) بەگشتی و بەبێ جیاکردنەوە، مەبەست لەم وشەیەش واتە (جەرمانەکان)؛ بەڵام (وەندییەکان) وا ناسراون کە بریتیبن لە هۆزێکی (سلاڤی) لەنێوان چیای (کربات و دەریای بەلتیک) جێگیربوون و ئەم وەندییانە ئەوەیان لێ زانراوە کە توانای یەکبوونیان نییە (ناتوانن بە یەکەوە بژین)[2].

لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژە بەوە دەکرێت کە (فەرەنگەکان) زۆر نارەحەتیان چەشتووە بەدەست وەندییەکانەوە، هەتا کار گەیشتە ئەو ئاستەی لە ساڵی (٦٣١ ز)دا (پاشا کلۆسەری یەکەم) سەرانە لەسەر (سەکسۆن) دابنێت کە بریتیبوو لە (٥٠٠) مانگا؛ بەرامبەر بە پاراستنیان دژی (وەندییەکان). بەڵام هەرچۆنێک بێت (وەندییەکان) توانیان لە سەدەی حەوتەمدا شانشینێک بونیادبنێن؛ هەرچەندە تەمەنی کورتبوو و زوو دەسەڵاتەکەیان لەناوچوو، بۆیە زۆری نەبرد هۆزە (وەندییەکان) بەش بەش و پارچە پارچە بوون لە یەکدی دوورکەوتنەوە. تەنانەت پاشەڕۆژیان لە سەدەی دەیەم بەدواوە بەسترابوو بە فراوانبوونی ئەڵمانیاوە، لەگەڵ ئەوەشدا (وەندییە بتپەرستەکان) هەمیشە سنوورەکانی خۆرهەڵاتی ئەڵمانیایان دووچاری نارەحەتی دەکردەوە، ئەمەش بە هۆی هێرشبردنەکانیانەوە بۆ ئەو سنوورانە؛ بە شێوەیەک کە جووتیار و کەنیسە و خواپەرستەکانیش بێبەش نەبوون لەم هێرشانە کە لە ساڵی (٩٨٣ ز) ڕوویاندا کە

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط، ج١/ ص٤٤٨.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٤٣.

نریژەیکێشا بۆ ساڵانی (٩٩٨ ز) و (١٠٦٦ ز) لە دواتریشدا. پاشان (قەشە بەرنارد) لە ناوەڕاستی سەدەی دوازدەهەمدا دەرکەوت کە لە (ئەڵمانیا)دا بانگەوازی دەستپێکرد بۆ هێرشێکی خاچی نوێ، بۆیە لەو کاتەدا (ساکسۆن) ئەرکی بەرپەرچدانەوە و لەبەردەم وەستانەوەی دژ بە (وەندییەکان) بوو، گوتی باشوایە ئەو هێرشەی خاچییەکان دژی (وەندییە بتپەرستەکان) بێت، بۆیە بەمشێوەیە هێرشەکە ناونرا بە هێرشی خاچییەکان کە ناسرابوو بە (وەندییەکان) کە لە ساڵی (١١٤٧ ز) ئەنجامدرا، ئەمەش بوو بە هۆی لەناوبردنی بتپەرستی لە وڵاتی (سلاڤییەکان) و لە بەرامبەردا زیادبوون و بڵاوبوونەوەی هێز و دەسەڵاتی (ئەڵمانی). تەنانەت زۆری نەبرد و نەگەشتە نیوەی سەدەی سیازدەهەم؛ هەموو ئەو زەویانەی کە لەنێوان هەردوو ڕووباری (ئالْپ و ئۆدەر)دا بوو چووە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانییەکانەوە، لە خۆرهەڵاتی ئەمانیشەوە واتە لەنێوان هەردوو ڕووباری (ئۆدەر و فستۆلا)دا (پۆڵەندییەکان) شانشینێکیان پێکهێنا لەسەر ڕێڕەوی (سلاڤییەکان) و بگرە پاکتر لەوەی کە دەوڵەتی (بۆهیمیا)ی لەسەربوو[1].

(پۆڵەندییەکان) لەنێوان ناوچەکان بەدرێژایی (ئودەر) لە خۆرئاواوە بۆ (فستولا) لە خۆرهەڵاتەوە؛ لە چیاکانی (کارییان) لە باشوورەوە بۆ (بەلتیک) لە باکوورەوە نیشتەجێبووبوو کە (٣) هۆزی (سلاڤی) پێکدەهێنا، هۆزی (پۆلۆنییەکان) لە دۆڵی (ئەودەروفارتا) نیشتەجێبووبوون، (مازۆرییەکانیش لە (گۆماوەی فەستۆلادا) بۆ مۆرزانیۆنەکانیش لە شوێنە دەشتاییەکاندا نیشتەجێبووبوون. سەرکردەی پۆلۆنی (ماینکا) لە ساڵی (٩٦٣ ز)دا دانینا بە ئیمپراتۆرییەتی (جەرمانی) لە سەردەمی (ئۆتۆی یەکەم)، جێی ئاماژەپێکردنە کە (مایزکا) یەکێکە لە سەرکردە دێرینەکانی (پۆلۆنی) کە ئایینی (مەسیحی) هەڵبژارد وەک پەرستشی کەنیسەی (ڕۆما) لە ساڵی (٩٦٧ ز)، لە بەرئەوەی کە (دۆرفا)ی هەڵبژارد وەک خێزانی خۆی کە خوشکی (بۆهیمیای پاشا) بوو، لە سەردەمی (مایزکای کوڕی بولسلافی یەکەم)دا وڵاتی (پۆلۆنیا) ڕووەو خۆرهەڵات لەسەر هەژماری (ڕووسە سلاڤییەکان)؛ واتە ناوچەکانیان لە ساڵانی (٩٩٢–١٠٢٥ ز) فراوانبوو. لە ساڵی (١٠٢٤ز)دا بە شێوەیەکی فەرمی پاپا دانینا بەو وڵاتەدا؛ هەرچەندە (پاشا بولسلاسی یەکەم) توانی

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٦٨ م، ص٤٤٠-٤٤١.

لە ساڵانی (٩٩٢–١٠٢٥ ز) شانشینەکەی خۆی بپارێزێت و لە ڕوانگەی ئایینی و ژیارییەوە کە جیاواز بێت لە دراوسێ وەندییەکانی[1]!

هەرچەندە (پۆڵۆنییەکان) لە ڕووی یاساییەوە جیاواز بوون؛ بەڵام توانیان بۆ ماوەی سەدەیەکی تەواو پاریزگاری لە گیانی خۆیان بکەن، هەتاکوو ئەستێرەی دەسەڵاتیان بەرامبەر بە هێزی بەرهەڵستکاری (ئەڵمان) لە خێزانێکدا کە (هوهنشتاوفن) بوون گەشایەوە، بەڵام زۆری نەبرد وڵاتی (پۆڵەندییەکان) تووشی بەش بەش بوون و پارچە پارچە بوون بووەوە. پاش مردنی (بولسلافی سێیەم ١١٠٢–١١٣٩ ز) کە وڵاتەکەی دابەشکردبوو بەسەر هەرچوار کوڕەکەیدا، ئەمەش بوو بە هۆی پەرتبوون و بەش بەش بوونی یەکێتییەکەیان و هاوکاریکردنیان لە لایەن جەرمانەکانەوە (بۆهیمییەکان و لیتوانییەکان) بۆ دژایەتی هەندێکیان لە بەرامبەر هەندێکی دیکەیاندا. بۆیە (پۆڵەندا) بەم شپرزەییە مایەوە؛ هەتا ئەوکاتەی کە (مەنگۆلەکان) لە ساڵی (١٢٤١ ز)دا دەستیانگرت بەسەریدا و داگیریانکرد و زیانێکی زۆریاندا لە وڵاتەکە؛ بەتایبەتی (کاراکاوی) پایتەخت، هەروەها هەردوو (بۆمیرانیا و سیلیزیا) بەش بەش بوون و بوونە ژێردەستەی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی پیرۆز)، بەو شێوەیە دووبارە بازرگانی (پۆڵەندا) لە سەدەی سیازدەیەمدا کەوتە ژێردەستی بێگانە؛ واتە بازرگانە (ئەڵمانەکان)، پاش ئەوەی ئەو توانایەی لەدەستدا کە لەسەر دەریای (بەلتیک) هەیانبوو، دواتر هێرشی جەرمانەکانیش بۆ سەر بەشی خۆرئاوا دەستی پێ کرد و بەشێک لە (پۆڵۆنییەکان) بوونە شوێنی حەوانەوەی ئەو جووانەی کە لە ترسی (ئەڵمانەکان) هەڵهاتبوون، هەربۆیە (بولسلاف) لە ساڵی (١٢٤٦ ز) پێشوازی لێ کردن[2].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (پۆلەندا) توانی وردە وردە هەستێتەوە و هەست بە بوونی خۆی بکات؛ پاش ئەوەی لە هێرشی (مەنگۆلەکان) بۆ سەر ئەورووپا لە سەدەی سیازدەهەمدا هۆشیاریکردنەوە. پۆڵۆنییەکان (بۆهیماوسلاس)ی پاشایان هەڵبژارد وەک سەرکردەیان لە ساڵی (١٢٩٥–١٣٠٥ ز) کە فەرمانڕەوایەکی جیاوازبوو لەوانی پێشوو، چونکە لەو کاتەدا (ئەڵمانەکان) بەهێزبوونیان بە

(١) نورمان ف. كانتور: التاريخ الوسيط، ت: قاسم عبده قاسم، عين للدراسات والبحوث، الجيزة، ٢٠٠٩ م، ص٣٠٦.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٣٢٧.

خۆیانەوە بینی و فراوانخوازیان کرد لەسەر هەژماری (پۆلۆنییەکان) و ئەوەبوو توانیان (سلسیای پۆلۆندا) بخەنەسەر (بۆهیمیا)، ئەم ڕووداوانە بوونە هۆی ئەوەی کە (لادسلاوسی پاشای پۆڵەندی) هەستێت بە ئەنجامدانی شۆڕشێک لە ساڵی (١٣٢٠–١٣٣٣ ز) کە لە ڕێگەیەوە توانی دەسەڵات بەدەستبهێنێت و لە ناوچەکەدا فراوانخوازییەکانی (ئەڵمانیا) ڕابگرێت[1].

## ج. سلاڤییە خۆرهەڵاتییەکان

هەرچەندە ڕەگەزی (سلاڤی) باڵادەستبوو بەسەر ڕووسیاوە لە سەردەمی دێرین و نوێشدا؛ بەڵام سەرەڕای ئەوەش ناونانی ئەو وڵاتە بە (ڕووسیا) لە لایەن سلاڤییەکانەوە نەبوو! مێژوونووسانیش لەم ڕوانگەیەوە بوون بە دوو کۆمەڵەوە: کۆمەڵی یەکەم بۆچوونیان وایە ئەم ناوە بە ناوی یەکێک لە هۆزەکانی (الفی السرماتیە)وە ناونراوە، بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچوونەیان بریتییە لە ئاماژەی زمانەوانی (سریانی) لە سەدەی شەشەمدا بە وشەی (Rus). کۆمەڵی دووەم بۆچوونیان وایە وشەی (ڕووسیا) ناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە هۆزەکانی باکوور کە لە سەدەی هەشتەمدا وڵاتەکەیان داگیرکرد، بۆیە ناوی خۆیان سەپاند بەسەر ئەو وڵاتە و دانیشتووانەکەیدا. (بیزی) مێژوونووس دەڵێت: (ڕۆمانەکان وشەی سلاڤییان) بەسەر (سلاڤ)دا سەپاندبوو و بەوە ناویان دەبرد کە ئەمەش بۆچوونی (عەرەبە سەقالییەکان) بوو، لە کاتێکدا کە (سلاڤییە خۆرئاواییەکان) ئایینی مەسیحییان هەڵبژارد لە شێوەی بیروباوەڕی ئەورووپیدا، سلاڤییە خۆرهەڵاتییەکان (ڕووسیا) پەیوەستبوون بە کەنیسەی یۆنانییەکانەوە، یان (ئەرسۆدۆکسی) و لەم سۆنگەیەشەوە پەیوەندی پتەویان هەبوو بە گێتی بیزەنتییەوە. جێگەی ئاماژەپێکردنە لە سەدەی نۆیەمدا (سویدییەکان) لە سەرەتای چەرخی شۆڕشەکانی ڤایکینگیدا دەسکەوتێکی (سویدی) هەبوو؛ ئەوەش لە ڕێگای بازرگانییەوە بەدرێژایی (بەڵتیک بۆ کەستنتینییە) کە تێکەڵاوی خەڵکی سلاڤییە خۆرهەڵاتییەکان بووبوون لەو ڕووەوە. لە ساڵی (٨٦٠ ز)دا دەوڵەتی ڕووسیایان دامەزراند کە (نۆفجرۆر) واتە (شاری نوێ) بوو بە پایتەختی و بەو ئاڕاستەیە و لەژێردەستی (ڕووێکی) مەزنیاندا گەشەیکرد و زۆری نەبرد گوزەرانی خەڵکی (ڕووسیا) لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(ڕووێک)دا ژیانەوە و گەشەسەندنی بەخۆیەوە بینی، بۆیە دەسەڵاتیان لە شاری نوێدا گەشەیکرد، هەروەها دوورگەی باکووری (دەریای ڕەش) چووە ژێر دەسەڵاتیانەوە، بۆیە زۆر ئاسایی بوو پەیوەندی نێوان (ڕووسیا) و ئیمپراتۆرییەتی (بیزەنتی) توندوتۆڵ ببێت؛ چونکە ڕێگەی بازرگانی نێوان دەریای (بەلتیک و قوستەنتینییە) بە زەوی‌یەکانی ئەواندا تێدەپەڕی[1].

ئەم پەیوەندییە لەنێوان (ڕووسیا) و بێزەنتی) لە هەموو ناوچەکانیدا بەوشێوەیە نەبوو! چونکە (ڕووسەکان) سێ جار لە ساڵانی (٨٦٠ و ٩٠٧ و ٩٤١ ز) ویستیان هێرشبکەنە سەر (قوستەنتینییە)؛ بەڵام لە هەرسێ جارەکەدا شکستیانهێنا! بۆیە زۆری نەبرد (ڤلادیمێری یەکەم ٩٧٨–١٠١٥ ز)ی پاشای (کیڤ) ئایینی (مەسیحی) هەڵبژارد و کردی بە ئایینی فەرمی وڵاتەکەی لە ساڵی (٩٩٠ ز)دا، بۆیە بەپەلە کەنیسەیەکی (ڕووسی) بنیاتنا کە سەر بە کەنیسەی (بیزەنتی) بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەی (ڕووسیا) لە ژیاری بیزەنتییەوە نزیکبوو و زۆر تێکەڵاویش بوون لەگەڵیاندا؛ بەڵام بەردەوام پێویستیان بە ڕێکخستنی تەواو هەبوو بۆ بەجێهێنانی پەیوەستکردن و یەکێتی نێوان سەروەت و سامانە فراوانەکەیان، (ڤلادیمێری دووەم – مونوماخ ١١١٣–١١٢٥ ز) کۆتا فەرمانڕەوای (کیڤ) بوو کە توانی دەسەڵاتداریتی هەموو هۆزەکانی (ڕووسی) بکات[2]، بەڵام لەپاش خۆی وڵاتەکەی تووشی شپرزەیی هات، دەوڵەتی (کیڤ) شوێنێکی بازرگانی پێکهێنا لەنێوان باکوورییەکان لە ڕووی (ڕووسیا و ناوچەکانی بەڵقانەوە؛ بۆیە لە توانای سویدییەکاندا نەبوو کە بزوتنەوەیەکی سەربازی گشتی دروستبکەن دژ بە دەوڵەتی (کیڤ) لەبەر کەمی ژمارەیان، بۆیە لە ساڵی (٨٥٦ ز)دا بانگەوازێکیان بڵاوکردەوە بۆ هاونەتەوەییەکانی خۆیان لە باکوور، مەزنی باکوورییەکانیش کە ناوی (ڕۆریک) بوو؛ ڕەزامەندی خۆی دەربڕی کە ئەم دەسەڵاتدار بێت بەسەر بەشە باشوورییەکانیشدا لە (گۆتلاند و نرایزلاند)، بۆیە سوپاکەی خۆی بەڕێکرد بەرەو (ڕووسیا) و شوێنێکی بە ناوی (نۆفۆکورووت) بنیاتنا و کردی بە سەربازگەی خۆی. لە ساڵی (٨٦٠ ز) پاش مردنی (ڕۆریک)؛ (ئۆلیک)ی سەرکردە لە ساڵی (٨٧٣ ز)دا فەرمانڕەوایی (نۆفۆکورووت)ی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٦٩-٣٧٠.

(٢) جوزيف نسيم يوسف: تاريخ الدولة البيزنطية، ط١، دار النهضة، مصر، ٢٠٠٥ م، ص١٧٧.

کـرد بەو هۆکـارەی کە جێنشـینی (ڕۆریـک) بـوو، بـۆیە (ئۆلیـک) بە بونیـادنەری ڕاسـتەقینەی دەوڵەتـی (کیـڤ) دادەنرێت کە تـوانی لە سـاڵی (٨٧٦ ز)دا دەسـبگرێت بەسـەر ئەو شـارەدا کە لەژێـر دەسـەڵاتی سـویدییە دێرینەکـان بـوو، بەڵام شـاری (کیـڤ) پـاش (ڤلادیمێـری دووەم) ئەو گـرنگییەی هەیبـوو لە دەسـتیدا؛ ئەو گـرنگییە شاری (سۆزدال) بوو کە لە باکووری خۆرهەڵاتی ڕووسیایە جێگەی گرتەوە و لە بری ئەو گرنگی پێدرا[1].

لێرەوە (ڕووسیا) بوو دوو بەشـی مەزنەوە: (ڕووسـیای بچووک) لە باشـوور و (ڕووسـیای مەزن) لە بـاکوور، ڕووسـیای مەزن تـوانی فراوانخـوازی بکـات بەرەو باکوور و خۆرهەڵات و بەمەش زەوییەکی زۆریان خستە ژێر دەسـەڵاتی خۆیـانەوە، هەتا ساتی شـەڕەکانی (مەنگۆل) کە ئەو بەرەوپێشچوونەی (ڕووسـیا)ی وەسـتان. لە سـەرەتای سـەدەی سـیازدەدا دوو بزوتنەوەی مەزن دەسـتیان بە جووڵە کرد، ئەم دوو بـزوتنەوەیە دەسـتی باڵایـان هەبـووە لە بەرەوپێشـبردنی مێـژووی ئەورووپـا بەگشـتی و و (پۆڵەنـدا و ڕووسـیا) بەتـایبەتی، ئەم دوو بـزوتنەوەیە بریتیبـوون لە شـەڕەکانی دژ بە (مەنگـۆل) لە لایەک و بەرفراوانبـوونی چەکـدارەکانی (تیتـۆن) لە باکووری ئەورووپا لە لایەکی دیکەوە[2].

## کۆتایی ئیمپڕاتۆرییەتی خۆرئاوا

لەنێوان ساڵانی (٤٥٧–٤٦١ ز)دا (ماجۆریان) چووە سەر تەختی ئیمپڕاتـۆرییەتی (ڕۆمـانی)، بـارودۆخی سـەردەمی (ماجۆریـان) پـڕ لە ئـاژاوە و نائـارامی بـوو؛ چ لە نـــاوخۆ و چ لە دەرەوە و بەو هـــۆیەوە گیروگرفتـــی زۆری بـــۆ پەیـــدابوو، بـــۆ چارەسـەرکردنی ئەم بـارودۆخە؛ سـەرەتا بەرنـامەی لێدانی لە (ڤانـداڵەکان) دانـا لە کەناروواوەکانی ئەفریقادا، بەڵام ئەو پاپۆڕە جەنگیانەی لە شـەڕی دژ بە (ڤانـدالەکان) بەکاریهێنـان هەموویـان تێکشـکان، لە ئەنجامدا (ماجۆریـان) لە قەرتـاجەوە بە دڵێکـی شکاوەوە بەرەو (ئیتاڵیا) گەڕایەوە و لەوێش کوشتیان.[3]!

دوای (ماجۆریان) سێ کەس بۆ سەر تەختی ئیمپڕاتۆر دانران:

---

(١) الانطاكي: تاريخ الانطاكي، ت: عمر عبدالسلام، ط١، مطبعة حروس، لبنان، ١٩٩٠ م، ص٢١٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٩٣.

(٣) نورمان بينز واخرون: الامبراطورية البيزنطية، ت: حسين مؤنس، ط١، القاهرة، ١٩٥٠ م، ص٢٠٣.

١.  سێڤیریۆس.
٢.  ئەنپیمیۆس.
٣.  ئۆلیبریۆس.

ئەگەر لە بارودۆخی گشتی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی خۆرئاوا) لەو سەردەمەدا وردببینەوە؛ دەبینین ناوچەیەکی زۆریان لەدەستدابوو، (ڕۆمانەکان) لە (ئینگلەتەرا) کشابوونەوە و (ڤاندالەکان) دەستیان بەسەر کەناراوەکانی ئەفریقادا گرتبوو، (گووتە خۆرئاواییەکان) لە هەمان کاتدا دەستیان بەسەر ئەورووپای خۆرئاوادا گرتبوو، (بورگووندییەکان) لە ناوچەکانی باکووری (ڕایین) نیشتەجێ ببوون، فەرەنگەکانیش لە ناوچە دوورەدەستەکانی (ڕایین) دەژیان، هەموو ئەمانە ئەو ڕاستییەیان دەسەلماند کە کۆتایی بە ئیمپڕاتۆرییەتی خۆرئاوا هاتبوو! لەبەرئەوەی خۆرئاوای ئیمپڕاتۆرییەتەکە بەبێ ئیمپڕاتۆر بوو! ئیمپراتۆری خۆرهەڵاتی بێزەنتی (زینوو ٤٧٤-٤٩١ ز) ببووە تاکە ئیمپڕاتۆری گشت دەسەڵاتداریتی (ڕۆمانی)، هەتا ساڵی (٤٧٦-٨٠٠ ز) تەختی (ڕۆما) بەبێ ئیمپڕاتۆر بوو؛ ئیدی لەوێوە (شارلەمان) کرایە ئیمپڕاتۆری ئەورووپای خۆرئاوا[١].

چەندین هۆکاری ئابووری و ڕامیاری پێکەوە ڕۆڵی خۆیان بینی بۆ ڕووخانی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی) کە لە بەشی دووەم باسمان لێوەکردووە.

---

(١) محمود سعيد عمران: معالم تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٨٧-٨٨

# بەشی حەوتەم

جەستنیانی یەکەم (٥٢٧-٥٦٥ ز)
ڕامیاری ناوخۆیی
چاکسازییەکانی جەستنیان لە ناوخۆی وڵاتدا
ڕامیاری دەرەوە
شەڕی جەستنیان لەگەڵ ساسانییەکاندا
شەڕی جەستنیان لە خۆرئاوادا
جەستنیان و ڤاندالەکان
جەستنیان و گووتە خۆرهەڵاتییەکان
جەستنیان و گووتە خۆرئاواییەکان
کۆتایی سەردەمی جەستنیان
جێگرەوەکانی جەستنیان
جەستینی دووەم (٥٦٥-٥٧٨ ز)
تیباریووسی دووەم (٥٧٨-٥٨٢ ز)
مۆریس (٥٨٢-٦٠٢ ز)
ڕامیاری دەرەوەی جێگرەوەکان
داگیرکردنی ئیتاڵیا لە لایەن لۆمباردییەکانەوە

## بنەماڵەی جەستنیان (٥١٨-٦١٠ ز)

دەرکەوتنی ئەم بنەماڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپڕاتۆر (جەستین) کە لە دوای مردنی ئیمپڕاتۆر (ئەنستاسیۆس) کە لە ساڵی (٥١٨ ز) گەیشتە فەرمانڕەوایی ئیمپڕاتۆریەتی (بیزەنتی)، بە هۆی ئازایەتی و لێهاتووییەوە گەیشتە پلەی فەرماندەی هێزەکانی پاسەوانی کۆشکی ئیمپڕاتۆرییەت، لە دوای کۆچی دوایی ئیمپڕاتۆر (ئەنستاسیۆس) بە کودەتایەتی سەربازی جڵەوی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتی گرتەدەست. جێگای ئاماژەبۆکردنە ئەم ئیمپڕاتۆرە منداڵی نەبوو؛ بۆیە بانگهێشتی (جەستنیان)ی خوشکەزای کرد بۆ کۆشکی ئیمپڕاتۆرییەت لە (قوستەنتینییە)، هەتا لەنزیکەوە پەروەردەی بکات و هاوکات هاوکاری بێت لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا، لەو ماوەیەشدا (جەستنیان) پەرەی بە تواناکانی خۆیدا و شارەزاییەکی باشی لە کاروباری سەربازی و کارگێڕی و یاساکانی وڵات و ڕامیاری و چەندین لایەنی دیکە بەدەستهێنا[١].

## جەستنیانی یەکەم (٥٢٧–٥٦٥ ز)

(جەستنیان) لە ساڵی (٥٢٧ ز) بە فەرمی چووە سەر تەختی ئیمپڕاتۆری، چونکە پێشتر جێگرەوە یاخود (ولي العهد)ی (جەستین) بوو. (جەستنیان) لەو ماوەیەدا شارەزاییەکی زۆری لە بواری بەڕێوەبەرایەتیدا پەیداکردبوو، ئەم ئیمپڕاتۆرە نوێیە حەزی بە ژیانێکی زۆر سادە دەکرد و بە چاکی مامەڵەی لەگەڵ خەڵکەکەیدا دەکرد و وەک باسی لێوە دەکرێت شەو و ڕۆژ سەرقاڵی کارکردن بووە بۆ وڵاتەکەی، لەبەرئەوە ناویاننابوو (ئیمپڕاتۆری شەونخوون)، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بڕیارێکی دەربکردایە؛ کەس نەبوو بتوانێت لە دژی بوەستێتەوە[٢]. (جەستنیان) لەو ماوەیەدا دڵی چووە سەر کچێک کە ناوی (سیودورا) بوو، سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە (سیودورا) کچێکی سەماکەری نیمچەڕووت بووە و بەناوبانگ بووە بە کاری بەدڕەوشتی و خراپەکاری، بە جۆرێک کە هەموو سنوور و بەها کۆمەڵایەتییەکانی بەزاندبوو، هاوکات دەڵێن ئەم کچە لەگەڵ باوکی کاری کردووە لە هۆڵی (سێرک) کە تایبەت بوو بە نمایشکردنی ئاژەڵان؛ بەتایبەت (ورچەکان) کە

---

(١) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٧٩.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٢٧.

جوانییەکی بێوێنەیان هەبوو. هاوکات ئەم کچە کچێکی وریا و چالاک و بەهێز بووە، هەموو ئەم تایبەتمەندیانە پێکەوە وایانکرد کە (جەستنیان) پەیوەست بێت پێیەوە و هەربۆیە لە کۆتاییدا بڕیاریدا هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجام بدات. ئەم بڕیارە بووە هۆکاری نارەزایی خاڵی (جەستین) و دایکی؛ بە هۆی ڕابردووی کچەکەوە، کار گەیشتە ئەوەی خاڵی بڕیاریدا ئەگەر لەو هاوسەرگیرییە پەشیمان نەبێتەوە؛ مافی جێگرەوە و دەسەڵاتی لێ وەردەگرێتەوە! بەڵام بەر لەوەی بڕیارێکی لەو چەشنە بدات؛ کۆچی دوایی کرد و بەو جۆرە هیچ بەربەستێک نەمایەوە و هاوسەرگیرییەکە ئەنجامدرا. ئەم هاوسەرگیرییە سوودی زۆری هەبوو! نەک بۆ (جەستنیان) بەتەنها؛ بەڵکوو بۆ هەموو بنەماڵەکەیان، چونکە پاڵپشتێکی بەهێزی ئیمپڕاتۆر بوو هەتا ئەوساتەی بە نەخوشی شێرپەنجە لە ساڵی (٥٤٨ ز) کۆچی دوایی کرد.

دەتوانین بەگشتی قەڵەمرەویەتی (جەستینیان) بۆ دوو ئاراستەی ڕامیاریکردن جیابکەینەوە کە ڕامیاری ناوخۆیی و دەرەکین:

**یەکەم/ ڕامیاری ناوخۆیی**

پاش تێپەڕبوونی (٥) ساڵ بەسەر فەرمانڕەوایەتییەکەیدا؛ واتە لە ساڵی (٥٣٢ ز)دا (جەستنیان) دووچاری شەڕێکی ناوخۆیی بووەوە، ئەم شەڕەش بە (شۆڕشی نیکیا) ناسرابوو کە لە زمانی یۆنانیدا بە واتای (سەرکەوتن) دێت، بۆ ئەوەی تەواو لەو شەڕە تێبگەین؛ پێویستە لەسەر چۆنییەتی دروستبوونی ئەو لایەنانە هەڵوەستە بکەین کە هەستان بە هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە[١].

مێژووی دروستبوونی ئەو لایەنانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە پێشبڕکێی ئەسپسواری دەستی پێ کرد لە (هیپۆدرۆم)، ئەمە ئەو جێگەیەبوو کە هەتا کۆتایی سەدەی شەشەمیش ئیمپڕاتۆرەکان ژنهێنان و زەماوەندیان تێدا ئەنجام دەدا، لەم شوێنەدا دانیشتووانی (قوستەنتینییە) بەوپەڕی هێز و چێژەوە تەماشای ئەو یاریانەیان دەکرد، شۆفێری ئەسپ و عەرەبانەکان جلەکانیان لە (٤) ڕەنگی جیاواز پێکهاتبوو کە بریتیبوون لە: (سوور، زەرد، سەوز، سپی)، هاندەرانیش بۆ پشتیوانیکردن لە ئەسپەکان؛ هەریەکەیان هەمان ڕەنگی جلی لەبەر دەکرد کە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٩٨.

لێخوڕەکان لەبەریانکردبوو[1]. وردەوردە ئەو پشتیوانیکردنە لە بواری وەرزشەوە گۆڕدرا بە هاوکارییەکی کۆمەڵایەتی و بەو جۆرەش سەوز و سپییەکان بوونە یەک دەستە و زەرد و سوورەکانیش بوونە تاقمێکی دیکە. لە پایەختدا هەردوو پارتی (سەوز و زەرد) هەبوون، پاش ئەوە ئەو هاوکاریکردنە لایەنی ئایینیشی گرتەوە، پارتی (شین) پشتیوانی لە ئایینزای (ئەرسەدۆکسی) دەکرد، پارتی (سەوز) لایەنگیری (یەک سروشتی) دەکرد، ئیدی بەو چەشنە بابەتەکە وەک کودەتایەکی لێهات و بوونە پارتی ڕامیاری، پارتی (شین) بەرەو (هیپۆدرۆم) ڕۆیشتن و داوای ڕووخانی ئیمپڕاتۆر جەستنیانیان دەکرد، بەڵام ئیمپراتۆر بە لێزانی و لێهاتوویی خۆی توانی بارودۆخەکە چارەسەر بکات[2].

(شینەکان) نەیاندەویست (جەستنیان) بە ئیمپڕاتۆری بمێنێتەوە، ئەم کێشەیە هەتا دەهات گەورەتر دەبوو، (سیودورا)ی هاوسەری ئیمپڕاتۆر زیاتر سۆزی بەلای سەوزەکاندا دەچوو، ئەمانە لە دەستە و چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەکە بوون، بەڵام (شینەکان) لە دەستە و چینەکانی سەرەوە بوون، بەو چەشنە کێشەکان بارودۆخێکی چینایەتی وەرگرت، ئەم بارودۆخە وایکردبوو بە یەکجاری وڵاتەکە تێکبچێت، بۆیە دەبینین کە هۆکارەکانی شەڕی (نیکیا) زۆرن؛ لەوانە: ئایینی و کۆمەڵایەتی، بەڵام هۆکاری سەرەکی تەقینەوەی دۆخەکە ئەوەبوو کە (جەستنیان) لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتییەکەیدا پشتی بە چەند کەسێک بەستبوو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا، لەوانە: (جۆن کەپادۆکیا)ی وەزیری خەزێنە، (تریبۆنیان) وەزیری داد، ئەمانە بە ویستی خۆیان هەڵسوکەوتیان بە سامانی دەوڵەتەوە دەکرد، لە کاتێکدا کە شەڕ و برسێتی یەخەی بە میللەتەکە گرتبوو[3].

خەڵکەکە نەیاتوانی زیاتر بەرامبەر بەو بارودۆخە ئارام بگرن؛ بۆیە (شین و سەوز) پێکەوە بەرەو (هیپۆدرۆم) چوون و ئەوەی دەهاتە سەر ڕێگەیان لە داخی دڵی خۆیان دەیانسووتاند و هاواریان دەکرد: (نیکیا) واتە سەرکەوتن، بەمەش شۆڕشەکە ئەو ناوەی بەسەردابڕا. لێرەوە خەڵکی پۆل پۆل دوایانکەوتن و داوای

---

(١) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٩٢.

(٢) ه. ا. ل. فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٤٦.

(٣) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص١٣٠.

لابردنی ئەو دوو وەزیرەیان دەکرد، (جەستنیان) داوای گوتوویژی لەگەڵدا کردن، بەڵام داواکەی لە کاتێکدا بوو کە کارلەکار ترازابوو[١].

لەوکاتەدا پایتەختی (بیزەنتی) هێندە سەربازی تێدا نەمابوو؛ تەنها (٥٠٠٠) سەربازێک لە پاسەوانانی ئیمپراتۆر و (٥٠٠) سەربازی سوارە لە پایتەخت بوون! (جەستنیان) تەنها دوو ڕێگەی بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە لەبەردەستدا بوو؛ یان دەبوو بە شەڕ یاخود بە ڕێگەی ئاشتیانە مامەڵە بکات. سەرئەنجام ڕێگەی یەکەمیانی هەڵبژارد! دەگوترێت (جەستنیان) لە چارەسەرکردنی بارودۆخەکە بێهیوا بووە و بیری لە هەڵهاتن کردووەتەوە، بەڵام ژنەکەی (سیۆدۆرا) بڕیاریدا بمێنێتەوە و دەیگوت: "ئەو کەسەی کە تاج لەسەر دەکات؛ نابێت پاش وازلێهێنانی بژی، منیش نامەوێت بژیم؛ گەر ببینم خەڵکەکە منیان وەک ژنە ئیمپراتۆرێک ناوێت"[٢].

ئەو قسانە زۆر کاریانکردەسەر (جەستینیان)؛ لەبەرئەوە نەک بەتەنها وازی لە بیرۆکەی هەڵهاتن هێنا و بڕیاری شەڕکردنیدا، بەڵکوو نەیدەویست گوتوویژ لەگەڵ خەڵکە ڕاپەڕیوو و نارازییەکەدا بکات، بەڵام لەژێر کاریگەری (سیۆدۆرا)ی هاوسەری پێی ڕاگەیاندن کە بچنە (هیپۆدرۆم) و ئێمەش دەسبەجێ هەردوو وەزیر لەسەرکار لادەبەین، بۆیە خەڵکە ڕاپەڕیوەکە باوەڕیان پێ کردن و چەکیان دانا و ڕوویان کردە (هیپۆدرۆم). بۆ ئەم مەبەستە (جەستنیان) لەشکرێکی بە سەرکردایەتی (بیلیزاریۆس) نارده (هیپۆدرۆم) و ئابڵووقەیدا، هەربۆیە لە ئەنجامی ئەم ڕووداوانەی ڕوویاندا وەک مێژوونووسان دەڵێن تەنها لە ماوەی (٦) ڕۆژی شەڕدا نزیکەی (٣٥٠٠٠) کەس کوژراون[٣]!

## چاکسازییەکانی جەستنیان لە ناوخۆی وڵاتدا

جگە لە شەڕی ناوخۆی (نیکیا)؛ لە هەندێک لە بەشەکانی دیکەی ئیمپراتۆرییەتەکەشدا بەتایبەتی بەشی خۆرهەڵاتی لە (ئاسیای بچووک و میسر)، ژمارەیەک خاوەن زەویوزاری گەورە (مڵاک) پەیدابوون کە بارودۆخی ناهەمواری وڵاتەکەیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان قۆستەوە و ناوچەیەک لە زەویوزاریان

---

(١) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٤٩.

(٢) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٩٥.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٢٩-١٣١.

دەستبەسەرداگرت و میللەتەکەشیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و توانیان باج و سەرانە و بەرتیلیش وەربگرن؛ بەبێ ئەوەی گوێ بە دەسەڵاتی ڕامیاری ئیمپراتۆرییەتەکە بدەن، ئەم خاوەن زەویوزارانە ژیانێکی میرانەیان بەسەردەبرد، مولکەکانیان بە چەشنێکی وا زۆر ببوون کە ببوونە خاوەن هێزێکی مەزن[1].

فەرمانڕەوایەتی (بیزەنتی) بەرامبەر بەو کردارانە دەستەوەستان نەوەستا؛ بەڵکوو بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە دژیان وەستایەوە و هەوڵیدا کە چیدی ئەو مولکانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکارنەهێنێت، کار گەیشتە ئەوەی دەستبەسەر مولکەکانیاندا بگرێت و تۆمەتی زەندەقێتیشیان بداتەپاڵ و سامانەکانیانی خستە خەزێنەی دەوڵەتەوە، بەڵام ئەم ڕێکارانەی کە میری پیادەیکرد؛ نەیتوانی بە یەکجاری دەستەی مولکدارەکان نەهێڵێت[2].

لەم ماوە مێژووییەدا چەندین ڕووداوی سروشتی و مرۆیی ناسۆر ڕوویاندا، ئەوە بوو لە ناوخۆدا چەند جارێک بوومەلەرزەی بەهێز ڕوویدا، هەروەها نەخۆشی (تاعوون) بڵاوبوویەوە بەتایبەت لە خۆرهەڵاتی ئیمپراتۆرییەتەکەدا و بگرە گەیشتە پایەختیش، ئەمانە بوونە هۆی هەڵهاتنی خەڵکەکە و وازهێنانیان لە کشتوکاڵکردن، بەمەش برسێتی بڵاوبووەوە[3].

(جەستنیان) بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندی و دانانی کەسانی شارەزا و لێهاتووی بە باشترین ڕێگا بۆ چارەسەرکردن و هێورکردنەوەی بارودۆخەکە دەبینی، بایەخێکی زۆریشی بە ڕێکخستنی دەسکەوتەکانی دەوڵەت دا و داوای لە خەڵکەکە کرد کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک سەرانەی خۆیان بدەن، هەروەها داوای کرد مامەڵەی خەڵکی بە شێوەیەکی دادپەروەرانە و بە یەکسانی بکرێت، هاوکات دەسەڵاتی سوپا و کارگێڕی ڕێکخست، لە هەمان کاتیشدا نازناوی بە بەرپرسەکان دەبەخشی بۆ ئەوەی کارەکانیان بەباشی ئەنجام بدەن[4].

(جەستنیان) ناوچە دەوڵەمەند و هەژارەکانی پێکەوەگرێدا، بە شێوەیەکی زۆر تایبەت چاودێری بارودۆخی پایەختی دەکرد، ڕێگەشی لە هەموو کەسێک گرتبوو کە سەربەخۆیانە بچێتە (قوستەنتینییە) هەتا ژیانی ئەوێ ئاڵۆزتر نەبێت، گەر

---

(١) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٩٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٣١.

(٣) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص١٤٢.

(٤) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٥٠.

کەسێکیش کاری نەبووایە ئەوا لە نانەواخانەیەک یاخود لە کارگەیەک ئیشیان پێی دەدا، ژمارەیەک لە دادوەریشیان دانا بۆ سەرپەرشتیکردن و لێکۆڵینەوە لە دزی و کوشتن و دەستدرێژیکردن لە پایتەختدا، هەتا هاوشێوەی شەڕی (نیکیا)ی تووشنەبێتەوە. هەروەها چەند فەرمانێکی نوێی دەرکرد؛ لەو بوارەشدا پێشبڕکێی ئەسپسواری قەدەغەکرد، لە ڕووی ئاوەدانکردنەوەشەوە؛ (جەستنیان) ژمارەیەک ڕێگاوبان و پرد و بیری ئاو و خانوو و نەخۆشخانە و گەرماوی بنیاتنا، ئەمە سەرەڕای نۆژەنکردنەوەی کڵێسای بەناوبانگی (سۆفیا)[1].

لە ڕووی بازرگانیشەوە بایەخێکی زۆری بە بازرگانی دەرەوەدا؛ هەوڵیدا ڕێ لە بازرگانە ساسانییەکان بگرێت کە هەموو شتێکیان بۆ خۆیان قۆرغکردبوو، بەتایبەت ئەو شتومەکانەی لە هیند و چینەوە دەهاتن؛ بە نرخێکی گران دەیانفرۆشتن. لەبەرئەوە (جەستنیان) پەیوەندی بە پاشای ئەکسووم (حەبەشە)وە کرد کە گواستنەوەی شتومەکی بازرگانی لە چینەوە بۆ دەریای سوور ئاسان بکات و لە هەمان کاتیشدا بازرگانانی (میسر و شام)ی هاندا هەتا زیاتر شمەک بێننە وڵاتەوە. هەر لە سەردەمی (جەستنیان) یاسای باری کەسێتی دانرا، لەگەڵ کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا یاسای (بیزەنتی) پوختەکرا و بە شێوەیەکی ڕێکوپێک کاری دەوڵەت لەسەری بەردەوامبوو[2].

### دووەم/ ڕامیاری دەرەوە

هەر لە سەرەتاوە (جەستنیان) دەیویست ئیمپراتۆرییەتەکەی بگەڕێنێتەوە سەردەمی شکۆداری پێشووی، ئەمەش بەوە دەبوو کە سەروەریتی لە خۆرئاوای ئەورووپا و کەناراوەکانی ئەفریقادا زیاد بکات؛ هەتا ئەگەر پێویست بە شەڕیش بکات. لێرەدا بە کورتی باسی شەڕەکانی (جەستنیان) دەکەین:

### یەکەم/ شەڕی جەستنیان لەگەڵ ساسانییەکاندا

ناکۆکی نێوان (ساسانی و بیزەنتییەکان) مێژوویەکی دێرینی هەیە، شەڕی یەکەمی نێوانیان لەنێوان ساڵانی (٥٢٧–٥٣٢ ز) ڕوویدا، هۆکاری شەڕی نێوان

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٠٤-١٠٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٣٣-١٣٤.

هەردوولا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پاشای (ساسانییەکان) کە (کەیقوباد) بوو؛ گەیشتبووە تەمەنی (٨٠) ساڵی، بۆ ئەوەی ڕێخۆشکەر بێت بۆ بەدەستهێنانی تەختی پاشایەتی بۆ (کیسرا ئەنۆشیروان)ی کوڕی ؛ داوای لە (جەستنیان)ی ئیمپڕاتۆر کرد کە تەختی پاشایەتی بۆ کوڕەکەی دەستەبەر بکات، لەو بارەیەوە (جەستنیان) هەندێک مەرجی بۆ (کەیقوباد) دانا بەرامبەر بە جێبەجێکردنی داواکەی؛ بەڵام پاشای (ساسانی) بەو مەرجانە قایل نەبوو، لەبەرئەوە پەیوەندی نێوانیان ئاڵۆزی تێکەوت[1].

(جەستنیان) هێزەکانی خستە ژێر سەرکردایەتی (بێلیزاریۆس)؛ ئەویش لە ساڵی (٥٣٠ ز) بەرەو شاری (دارا) بەڕێکەوتن بۆ ئەوەی بەر بە لەشکری ساسانییەکان بگرێت، لە ئەنجامی شەڕی هەردوولادا؛ (بیلیزاریۆس) توانی هەرەس بە (ساسانییەکان) بهێنێت، بە جۆرێک کە لە باکووری شامیش دەریان بکات، هەر لەو ساڵەدا (کەیقوباد) دەمرێت و (کیسرا ئەنۆشیروان) شوێنی دەگرێتەوە و یەکەم کاری کە هەوڵی بۆدا؛ داوای بەستنی پەیمانی ئاشتی لە (جەستینیان) کرد. (جەستنیان) بۆ پاراستنی سنوورەکانی خۆرهەڵات؛ چەند پەیمانێکی لەگەڵ میرەکانی (قەفقاز) لە باکوور و پاشاکانی (حەبەشە) لە باشوور بەست بۆ ئەوەی چیدی هیچ مەترسییەکی (ساسانی) لەسەر نەمێنێت. لە ساڵی(٥٤٠ ز) جارێکی دیکە شەڕ لەنێوان (ساسانی و بیزەنتی) دەستی پێ کردەوە، هۆکاری ئەم شەڕە سەرکەوتنی (جەستنیان) بوو لە (ئیتاڵیا و باکووری ئەفریقا)[2].

(کیسرای ئەنۆشیروانی پاشای ساسانی) بەبێ دوودڵی و بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە چووە شەڕەکەوە، لە ئەنجامدا ژمارەیەک ناوچەی لەسەر سنوور و لە بەرزاییەکانی (فورات) داگیر کرد و لەوێوە بەرەو (ئەنتاکیا) پێشڕەوی کرد، (کیسرا ئەنۆشیروان) شەڕەکەی نەوەستاند؛ هەتا ئەوکاتەی کە (جەستنیان) ناچاربوو داوای ئاشتی لەگەڵدا بکات و ئەویش ڕەزامەند بوو. بەڵام ئاشتی نێوانیان درێژەی نەخایاند؛ چوونە پاش ساڵێک و واتە لە (٥٤١ ز)دا (کیسرا ئەنۆشیروان) پەلاماری ناوچەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی (بیزەنتی) دایەوە، شەڕی ئەم جارەیان ماوەی (٢) ساڵی خایاند، ئەم

---

(١) السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية، ص٧٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى،ج١/ ص١٠٤.

شەڕەش بە بەستنی پەیماننامەی ئاشتی کە لە سالی (٥٤٤ ز) مۆرکرا؛ بڕیاردرا کە بۆ ماوەی (٥٠) ساڵ ئاشتی لەنێوانیاندا بەرقەرار بێت[١].

## سێیەم/ شەڕی جەستنیان لە خۆرئاوا

ئەوکاتەی (جەستنیان) چووە سەر تەخت؛ بەشی خۆرئاوای ئیمپڕاتۆرییەتەکە کەوتبووە ژێر دەسەلاتی (جەرمەنەکان)، (ئیتالیا) لەژێر دەسەلاتدارییەتی (گووتە خۆرهەلاتییەکان) بوو، لە هەمان کاتدا (گووتە خۆرئاواییەکان) فەرمانڕەوایی ئیسپانیایان دەکرد. لەنێوان ئەوانەشدا (فەرەنگەکان) فەرمانڕەوایی ناوچەی گالیان دەکرد، بەلام کەناراوەکانی (ئەفریقا) لەژێر کۆنترۆلی ڤاندالەکاندا بوو، لە دوورگەکانی بەریتانیاشدا (ئەنگلۆساکسۆنەکان) فەرمانڕەوا بوون. سەرەڕای هەولدانی (جەستنیان) بۆ وەرگرتنەوەی دەسەلات لە خۆرئاوا؛ بەلام هیچ هەولێکی سەبارەت بە ناوچەکانی ژێردەستی (فەرەنگەکان و ئەنگلۆساکسۆنەکان) نەدا، سەرئەنجام (جەستنیان) توانی لە ناوچەکانی دیکەدا سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنێت[٢].

## چوارەم/ جەستنیان و ڤاندالەکان

لە سالی (٥٣٣ ز) فراوانخوازییەکانی (ئەفریقا) دەستی پێ کرد کە (بیلیزاریۆس) بە سەرکردایەتی (١٥٠٠٠) سەربازەوە کە (٤/٣) لە سەربازی سوارە و ئەوانی دیکەش لە پیادە پێکهاتبوون، هۆی ئەو شەڕەش ئەوە بوو کە پاشای ڤاندالەکان (هلدریک ٥٢٣–٥٣٠ ز) مەیلی بۆ ئیمپڕاتۆرییەتی (بیزەنتی) دەچوو، کاتێک (بیلیزاریۆس) دەرفەتی تەواوی بۆ ڕەخسا؛ پەلاماری ڤاندالەکانیدا و توانی پایتەختەکەیان کە شاری (قەرتاج) بوو داگیر بکات، ئەو خەلکە ڕۆمانیانەی کە لەوێ نیشتەجێبوون پێشوازی گەرمیان لێ کردن، بەمجۆرە کەناراوەکانی ئەفریقاش کەوتە دەست (جەستنیان)[٣].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص١٠٥.

(٢) السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية، ص٧١-٧٢.

(٣) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٨٦.

## پێنجەم/ جەستنیان و گووتە خۆرهەڵاتییەکان

لەشکری (جەستنیان) لە کاتێکی گونجاودا چوونە ناو (ئیتاڵیا)، پاش مردنی (سیودریک)ی پاشای (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) لە ساڵی (٥٢٦ ز) کزی و لاوازی ڕووی لە دەوڵەتەکەیان کردبوو. دوای (سیودریک)؛ کچە بێوەژنەکەی کە ناوی (ئامالاسۆنتا) بوو شوێنی گرتەوە، ئەمیش کوڕەکەی خۆی کە ناوی (ئەسالاریک) بوو و تەنها تەمەنی (١٠) ساڵ دەبوو کردبووە جێنشینی خۆی. بەڵام ئەمە بەلای گووتە خۆرهەڵاتییەکانەوە باش نەبوو، بۆیە (ئامالاسۆنتا) ئامۆزاکەی خۆی کە ناوی (تیۆداهاد) بوو کردە هاوکاری خۆی، کەچی (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) گومانیان لە (ئامالاسۆنتا) هەبوو؛ ئەوەش بەو هۆکارەی کە پەروەردەیەکی ڕۆمانی کرابوو، هەر بەو هۆکارەش مەیلی بۆ (بیزەنتی) هەبوو، هەموو ئەمانە وایانکرد کە (تیۆداهاد)ی ئامۆزا و هاوکاری دوورخستەوە بۆ دورگەی (بۆڵسینا) کە کەوتبووە ناوەڕاستی ئیتاڵیاوە و لەوێش هەڵیانواسی، ئەم کردارانەش بوو دەرفەتێکی باش بۆ (بیزەنتییەکان) کە بە هۆیەوە بتوانن هێرش بکەنە سەر (ئیتاڵیا)[1].

لە ساڵی (٥٣٦ ز) و واتە (١٠) ساڵ دوای مردنی (سیودریک)؛ (جەستنیان) پلانێکی بۆ گرتنی (ئیتاڵیا) لە ڕێگەی ئاوی و وشکانییەوە دانا، ئاڕاستە ئاوییەکە لە ڕێی دەریاوە لە (باکووری ئەفریقا) هێرشەکە بکرێت، ڕێگا وشکانییەکەش لە ناوچەکانی داڵماشیاوە کە سالۆنای پایتەختەکەیان لێ داگیرکرا لە لایەن بیزەنتییەکانەوە، ئەمە وایکرد کە دوورگەی (سەقەلیە) بەبێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەک بکەوێتە ژێردەستیانەوە، هەر لەوێش خاوەنموڵک و زەویوزارە گەورەکان پێشوازیان لە هێزەکانی (بێزەنتی) کرد. ئامانجی (بیلیزاریۆس) گرتنی شاری (ناپۆلی) پایتەخت بوو کە ئەوە مەبەستی سەرەکی بوو، بە کەوتنی (ناپۆلی)؛ لەشکری گووتە خۆرهەڵاتییەکان (تیۆداهاد)یان لەسەر تەخت هێنایەخوارەوە و لە جێگەی ئەو یەکێک لە سەرکردەکانی لەشکرەکەیان دانا کە ناوی (ویتیجز) بوو، (ویتیجز) بەرەو (ڕاڤنا) چوو بە ئامانجی ئەوەی لەوێ لەشکرەکەی ڕێکبخاتەوە، ئەمەش دەرفەتێک بوو بۆ (بێلیزاریۆس) کە لە ساڵی (٥٣٦ ز) شاری پیرۆزی (ڕۆما) داگیربکات[2].

---

(١) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا العصور الوسطى الباكرة، ص١١٢.

(٢) السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية، ص٧٢-٧٣.

له ساڵی (٥٥٥ ز) سەربازگەکانی (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) لە باشووری (ئیتاڵیا) خۆیانبەدەستەوەدا، بەڵام ناوچەکانی (ڤێرۆنا و برێسیکا) چونکە (فەرەنگەکان) پاڵپشتیان دەکردن؛ توانیان هەتا ساڵی (٥٦٣ ز) بەرەنگاری بکەن، بەو جۆرە کۆتایی بە فەرمانڕەوایی (گووتە خۆرهەڵاتییەکان) لە ئیتاڵیادا هات و دەسەڵاتی (بێزەنتی) دووبارە گەڕایەوە[1].

## شەشەم/ جەستنیان و گووتە خۆرئاواییەکان

(گووتە خۆرئاواییەکان) لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (سیۆدیس ٥٣١ -٥٤٨ ز) توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەرفراوان بکەن هەتا شاری (سەبتە) کە کەوتووەتە باکووری ئەفریقاوە، بەڵام پاش (٤) ساڵ (گووتە خۆرئاواییەکان) کوشتیان و لەبری ئەو (سیودیگیزل)یان هەڵبژارد، ئەم بە هۆی شەڕەکانی لەگەڵ فەرەنگەکاندا ناوبانگێکی سوپایی دەرکردبوو، بەڵام فەرمانڕەوایەتییەکەی زۆرینەخایاند و ئەمیش هەر بە دەستی خۆیان کوژرا[2]!

پاش ئەو گووتە خۆرئاواییەکان (ئەگیلا ٥٤٩-٥٥٤ ز)یان هەڵبژارد، ئەم هەموو ئاڵوگۆڕکردنەی (گووتەکان) لە سادەترین پێناسەدا واتای لاوازی ئەوانی دەبەخشی؛ هەربۆیە (جەستنیان) بە دەرفەتی زانی هێرش بکاتە سەر (ئیسپانیا) بۆ ئەوەی بەیەکجاری ئەو بەرنامەیەی دایڕشتبوو بۆ گەڕاندنەوەی گشت ناوچەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی (بێزەنتی) بەئەنجام بگەیەنێت. لەبەرئەوە فەرمانیدا بە لەشکری (بێزەنتی) لە (باکووری ئەفریقا) کە بەرەو (ئیسپانیا) بڕۆن، ئەنجامی ئەم لەشکرکێشییەش ئەوە بوو لە ساڵی (٥٥٤ ز) شەڕ لەنێوان هەردوولا ڕوویدا و لەشکری (گووتە خۆرئاواییەکان) شکستیهێنا و (ئەگیلا) ناچاربوو هەڵبێت، لە بەرامبەردا (بێزەنتییەکان) توانیان دەستبەسەر ژمارەیەک لە شارەکانی کەناردەریا و ناوەوە بگرن؛ وەک: (قادس، مەلگا، قەرتاجە، قورتووبە، غەرناتە)[3].

---

(١) ه. سانت. ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، ص١٨٣.

(٢) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٥٩.

(٣) قحطان عبدالستار الحديثي: دراسات في التاريخ الساساني والبيزنطي، ص٢٨٩.

به گوتەی بەشێک لە مێژوونووسان؛ هەرچەندە (جەستنیان) نەیتوانی هەموو بەرنامەکانی لە گرتنەوەی سەرجەمی ناوچەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی بیزەنتیدا جێبەجێ بکات، بەڵام توانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت؛ هەر لە گرتنەوەی (ئیسپانیا)؛ هەتا دەگات بە کەناراوەکانی ئەفریقا و سەرکەوتن بەسەر (گووتەکانی خۆرهەڵات و ڤاندالەکان لە ئیتاڵیا) و (گووتەکانی خۆرئاوا لە ئیسپانیا)[1].

## کۆتایی سەردەمی جەستنیان

ئەو پرۆژە مەزنانەی کە (جەستنیان) داینابوون؛ لە توانای خەزێنەکەیدا نەبوو، کە ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکە بەو شێوە فراوانەی کە دەیویست، لە هەمان کاتدا دروستکردنی خانووبەرە و کڵێسا و زۆر شتی دیکەی لەبەردەستدابوو. لە لایەکی دیکەوە شەڕی درێژخایەنی لەگەڵ دەورووبەرەکانیدا لە سەرمایەی دەوڵەتەکەی یەکجار کەمکردبووەوە، زۆربەی ئەو پرۆژە و کارانەشی کە ئەنجامیدابوون؛ لە ڕێی ئەو ماڵ و موڵکە زۆرەوە بوو کە (جەستینی یەکەم) بۆی بەجێهێشتبوو. بە کۆتاییهاتنی سەردەمی ئەو؛ ئیدی دەوڵەت نەیتوانی درێژە بە کار و چاکسازییەکانی بدات. (جەستنیان) بەر لە مردنی؛ جارێکی دیکە باج و سەرانەی زیادکردبوو کە ئەمەش ببووە هۆی ئاڵۆزکردنی ژیانی خەڵکی و لە هەمان کاتدا گەڕاندنەوەی گروپە ڕامیارییەکان، بەمەش ناکۆکی و ئاژاوە و بێسەروبەری لە پایتەختدا دەستی پێ کردەوە[2].

## جێگرەوەکانی جەستنیان
## (جەستینی دووەم ٥٦٥–٥٧٨ ز)

خوشکەزای (جەستنیان) بوو، جێگەی باوەڕی تەواوی خاڵی بوو لە کاروباری دەوڵەتدا و بەردەوام ڕاوێژی پێ دەکرد، ئەنجوومەنی پیرانیشی لەو متمانەیەی بە خوشکەزاکەی ئاگاداركردبووەوە، بۆیە کردی بە پاڵێوراوی خۆی بۆ سەر تەختی ئیمپڕاتۆری، چونکە (جەستینیان) هیچ کوڕی نەبوو هەتا شوێنی بگرێتەوە.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص١٠٣.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٤٤-١٤٥.

(جەستینی دووەم) زۆر گورجوگۆڵ و ئازا و جەربەزە بوو، زۆر بەتوندی و باوەڕبەخۆبوونەوە پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا دەکرد؛ بەتایبەت لەگەڵ بەربەرەکاندا[1].

یەکەم کاری ئەوەبوو کە سەرانەی نەدەدا بە بەربەرەکان؛ چونکە ببووە هۆی کزی و لاوازی خەزێنەی دەوڵەت، هەربۆیە بایەخێکی زۆری بە دارایی دەوڵەت و ڕیکخستنی سوپاکەیدا، بەڵام فەرمانڕەوایەتییەکەی زۆری نەخایاند و لە ساڵی (٥٧٣ ز) تووشی نەخۆشی هزری بوو، دوای خۆی (تیباریوس)ی کوڕی کە سەرکردەی لەشکرەکەی بوو شوێنی گرتەوە[2].

## تیباریۆسی دووەم (٥٧٨–٥٨٢ ز)

یەکەم کاری (تیباریۆسی دووەم) لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی؛ کەمکردنەوەی باج و سەرانە بوو، هەتا کەمێک لە بارگرانی خەڵک کەمبێتەوە، ئەمە بوو بە هۆکارێکی باش بۆ خۆشەویستبوونی لای خەڵک، لە سەردەمی ئەمیشدا هێشتا مەترسی شەڕی دەرەکی هەرمابوو! نەک هەر ئەوە؛ بەڵکوو لە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە ڕۆژانە مەترسیان بۆ پەیدا دەبوو[3].

## مۆریس (٥٨٢–٦٠٢ ز)

لە تەمەنی (٤٣) ساڵیدا فەرمانڕەوایەتییەکەی دەستی پێ کرد، کەسایەتییەکی ژیر و بەتوانا و ڕۆشنبیر و تێگەیشتووی هەبوو، بۆ ماوەیەک لە کاروباری دەزگا دادوەرییەکاندا فەرمانبەربوو، پاش ئەوە چووە بەشی سوپا و دواتر بوو بە سەرکردەی پاسەوانانی ئیمپراتۆر. (مۆریس) بە دادوەری و نەرمی و هێمنی ناوی دەرکردبوو، میللەتەکەی خۆشیاندەویست و لەشکرەکەشی زۆر ڕێزیان لێی دەگرت، بایەخی زۆری بە سوپا و دەزگا و بەڕێوەبەرایەتییەکان و بارودۆخی دارایی دەدا[4].

---

(١) السيد الباز العريني: الدولة البيزنطية، ص١٠٢.

(٢) ه. سانت ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، ص٢٢٩.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٠٨.

(٤) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٤٦.

## ڕامیاری دەرەوەی جێگرەوەکان

(جەستنیان) دوای خۆی گیروگرفتێکی گەورەی دارایی بەجێهێشت بۆ دامودەزگای فەرمانڕەوایەتییەکەی کە دەبوو چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، لەم سۆنگەیەوە جێگرەوەکانی تووشی (٣) گیروگرفت بوون:

١. ژمارەیەکی زۆری فەرمانبەرانی دەزگاکان لە ڕێی بەرتیل و مامەڵەکردن بە پارەی دەوڵەتەوە کارێکی وایان کردبوو کە زۆر لایەنی بەڕێوەبەرایەتییەکان تووشی ئیفلیجبوون ببوون.

٢. دابەشبوون و لێکترازانی ئایینەکەیان مەترسییەکی گەورەی بۆ نەمانی ئیمپڕاتۆرییەتەکە دروستکردبوو.

٣. مەترسی هێرش و پەلاماری دەرەکی، لەشکرەکەیان بە جۆرێک لاواز ببوو؛ توانای بەرگریکردنی ئەو هێرشانەیان نەمابوو[١].

لەگەڵ ئەوەشدا (جەستینی دووەم) هەمیشە شەڕی لە خۆبەدەستەوەدان پێ باشتر بوو، بەو هۆیەوە لە شەڕی دژ بە ساسانییەکاندا لە ساڵی (٥٧٣ ز) لە شاری (دارا) سەرکەوتنێکی کاتی بەدەستهێنابوو. (تیباریوس) بەتەواوی هەڵوێستی بەرامبەر بە خۆرهەڵات و خۆرئاواییەکان لاواز ببوو، کار گەشتە ئەوەی سەر بۆ (ئاڤارییەکان) نەوی بکات و هەندێک لە ناوچەکانی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی پێدان. سەبارەت بە (مۆریس) بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ؛ ئاشتی بە باشترین چارەسەر دەزانی لەگەڵ ساسانییەکاندا[٢].

## داگیرکردنی ئیتاڵیا لە لایەن لۆمباردییەکانەوە

نیشتمانی ڕەسەنی (لۆمباردییەکان) ناوچەکانی ڕووباری (ئالپ) بوون، دوای ئەوەی لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی زایینی توانیان دەست بەسەر (هەنگاریا) بگرن، کە هاتنە سەر ئایینی (مەسیحی) ڕاستەوخۆ ئایینزای ئاریۆسیان پەسەند کرد. لە سەردەمی (جەستینیان) ئەم لۆمباردیانە لە هێزە مەزن و سەرەکییەکان بوون، گیروگرفتی ئەمانە زیاتر لەگەڵ (ئاڤارییەکان) بوو کە تەواو کەوتبوونە ژێر کۆنترۆڵیانەوە، هەربۆیە (لۆمباردییەکان) ناچاربوون لە ساڵی (٥٦٨ ز) بەرەو

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٤٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى،ج١/ ص.

(ئیتاڵیـا) بـڕۆن کە لەوکـاتەدا سـەرکردەکەیان (ئـالبۆین) بـوو، بەوجـۆرە توانیـان بەهێمنـی بچـنە نـاو ئیتاڵیـاوە. لەسـەرەتادا هـیچ ڕێیـان لـێ نەگیـرا، پـاش ئەوە دەستیاندایە چەک و پرۆسە فراوانخوازییەکانیان دەست پێ کرد، لە ساڵی (٥٧٠ ز) چوونە ناو (میلانۆ)، دوای ئەویش لە ئەنجامی پرۆسـەی ئابڵوقەدانێکی درێژخایەندا توانیان شاری (پاڤیا) بگرن و بیکەنە پایتەختیان، پاش ئەم خزمەتانەی کە ئالبۆینی سەرکردەیان بۆ میللەتەکەی ئەنجامیدا؛ لە ساڵی (٥٧٢ ز) کۆچی دوایی کرد[١].

(لۆمباردییەکان) بە مردنی سەرکردەکەیان دەستەوسان نەبوون، بەڵکوو توانیان ناوچەیەکی بەرفراوانی (ئیتاڵیا) داگیر بکەن، بەڵام مامەڵەکردنیـان لەگەڵ دانیشـووانە ڕەسەنەکەدا مامەڵەیەکی گەورە و بچووکی بوو، چونکە وەک جووتیـار تەماشـایان دەکردن کە دەبوو کشـتوکاڵ بـۆ ئاغاکانیـان بەرهەم بهێنن، هەروەهـا دەسـتیانگرت بەسەر زەویوزار و مەڕومالات و خانووەکانیاندا و ئەوەشـی کە هەیـانبوو بە تـالانی بردیـان. جـگە لەوە دەسـتیانگرت بەسـەر موڵـک و سـامانی کڵێسـاکاندا؛ چـونکە (لۆمباردییەکان) کە لەسەر ئایینزای (ئاریۆسـی) بـوون کە هـیچ ڕێزێکیـان بـۆ کڵێسـا (کاسۆلیکییەکان) دانەدەنا[٢].

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین مێژووی (ئیتاڵیا) لەنێوان ساڵانی (٦٠٠–٨٠٠ ز)دا بەمجۆرە کورت بکەینەوە:

مێــژووی خەبــات و هەوڵــدان لەنێــوان (٥) هێــزدا کە هــیچ یەکێــک لەوانە دروشمەکانیان لەگەڵ یەکدیدا نەدەگونجا و بگرە دژبەیەک بوون، ئەو (٥) هێزەش بریتیبوون لە (بیزەنتییەکان، لۆمباردییەکان، فەرەنگەکان، پاپاکان و دۆکتیا و سپۆڵتا و بێنیفێنتۆ).

هەردوو دەوڵەتـی (لۆمبـاردی و بێزەنتـی) تەواو شـوێنەواری خۆیـان ونکـرد لە کۆتایی سەدەی هەشتەمدا، ڕامیاری (لۆمباردییەکان) ئەوەبوو کە (ئیتاڵیا) بەتەواوی سەریان بۆ نەوی بکات، سەرئەنجام (شارلەمان) توانی لە ساڵی (٧٧٤ ز) کۆتـایی بە دەوڵەتی (لۆمباردییەکان) بهێنێت[٣].

---

(١) محمود سعيد عمران: الامبراطورية البيزنطية وحضارتها، ص٥٩.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٤٩.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

# بەشی هەشتەم

- فەرمانڕەوایی فەرەنگییەکان
- کلۆڤس (٤٨١-٥١١ ز)
- کلۆڤس و ئایینی مەسیحی
- پەیوەندی نێوان فەرەنگییەکان و کەنیسە
- تایبەتمەندییەکانی سەردەمی کلۆڤس
- شەڕەکانی کلۆڤس
- لۆسەری یەکەم (٥٥٨-٥٦١ ز)
- ناکۆکی نێوان پاشایەتی و خانەدانەکان
- لۆسەری دووەم (٦١٣-٦٢٨ ز)
- داگۆبێرتی یەکەم (٦٢٨-٦٣٨ ز)
- بەرپرسیارانی ئاوستراسیا و کلێسا (٦٨٧-٧٦٨ ز)
- شارل مارتل –چەکووش- (٧١٤-٧٤١ ز)
- پەیوەندی نێوان شارل مارتل و کەنیسە
- پیپنی سێیەم -پیپنی کورتەبالا- (٧٤١-٧٦٨ ز)
- پەیوەندی نێوان پیپنی سێیەم کەنیسە

## فەرمانڕەوایی فەرەنگییەکان

فەرەنگە نەتەوەییەکان لە هۆزەکانی (جەرمانی) بوون و سەرەتای سەرکەوتنیان بۆ ساڵی (٤٨١ ز) دەست پێ دەکات، ئەوەش بە دەسپێکی فەرمانڕەوایی (پاشا کلۆڤس) دەناسرێتەوە؛ یان (کلدوج)، لە کاتێکدا کە شوێنی نیشتەجێبوونیان لە دۆڵی راینی خواروو (شلدوموز) هەتاوەکوو ناوچەکانی (دوڤەر) بوو، بەڵام پێش دەسپێکی ژیانی (فەرەنگییەکان) و فەرمانڕەواییان بۆ ئەو ناوچەیە کە وڵاتی (گال)ە؛ ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین وڵاتی (گال) دابەشکراوە لەنێوان چەند دەوڵەتێکدا و هەریەک بۆ خۆیان بەشێکیان داگیرکردووە بەبێ ویستی دانیشتووانەکەی و داگیرکەری ئەو بەشانە هەموو لە ململانێدا بوون. بۆ نموونە (دوڵی سین) کە لەژێر ئالآی ڕۆمانییەکاندا بوو و (سیجریووس) فەرمانڕەوایی دەکرد، (ئەڵمانەکان) لە سەرووی (ڕاین و باخی ڕەش) فەرمانڕەواییان دەکرد، هەروەها (گووتی خۆرئاوایی) لە باشووری ڕووباری (لوار)، لە هەمان کاتدا (بورگەندییەکان) نیشتەجێی حەوزی (ڕوون) بەرەو خۆرهەڵات بووبوون[1].

لە ڕاستیدا (کلۆڤس) توانی هەموو ئەو شوێنانە داگیربکات و لەژێر کونترۆڵی خۆیدا بهێڵێتەوە، دەتوانین بڵێین (کلۆڤس) یەکێکە لە پاشا بەناوبانگ و لێهاتوو و ئازا و چاونەترسەکان کە ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە مێژووی ئەو بنەماڵەیەدا، ڕامیاری (کلۆڤس) هەمان شێوەی ڕامیاری کارگێڕی وڵاتی (گال) بووە و دراوی فەرەنگییەکان لەسەر هەمان شێوەی دراوی ڕۆمانییەکان بوو[2]. (کلۆفس) توانی لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا یاسای فەرەنگییەکان بنووسێتەوە لەنێوان ساڵانی (٥٠٧–٥١١ ز) کە بە (یاسای ساڵی Saliclaw) ناسراوە و دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک لە هۆزەکانی (فەرەنگ) و دواتر لەسەر دەستی چوار لە سەرکردەکانیان کۆکرایەوە، سێ ئەنجوومەنیش کە بۆ ئەو مەبەستە پێکهێنرابوون؛ واژوویان لەسەرکرد کە پەیوەندی هەبوو بە (سزادان، قەرەبووکردنەوە، میراتی بنەماڵە، پێشەکییەک لە پلەوپایەیی فەرەنگییەکان). لە ڕاستیدا ئەم یاسایە مافی ژنانی فەرامۆشکردبوو و

---

(١) محمد رفعت ومحمد احمد حسونة: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٢٢.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٧٨.

هیچ گرنگی بە ژنان نەدەدا، هۆی فەرامۆشکردنی ژنان لەم یاسادا ئەوە بوو کە پێیانوابوو ژنان پێویستییان بە هێزی پیاو هەیە لە پاریزگاریکردنیاندا[1].

فەرەنگییەکان لە خۆرائاوادا لەژێر کاریگەریی خێرایی ژیاری (ڕۆمانی) بوون بە پێچەوانەی براکانیان لە خۆرهەڵات کە پاریزەری سیستم و دابونەریتی (جەرمانییەکان) بوون، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو دابەشبوون و دابڕانەی کە لە هەردوو کەنیسەی خۆرهەڵات و کەنیسەی خۆرئاوادا هەبوو، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دوو فەرمانڕەوای دژی یەک فەرمانڕەواییان دەکرد، لە ئاکامی ئەو جیاوازییەدا بوونە دوو بەشەوە: بەشی خۆرهەڵات پێی دەگوترا (ئوستراسیا) و بەش خۆئاوای بە ناوی (نوسترسیا) باسرا، ڕەگەزی (جەرمان) لە (ئوستراسیا) زۆرینە بوون و لە ئەنجامدا (ئەڵمانیا)ی لێوە دروستبوو، بە پێچەوانەوە کاریگەری (ڕۆمانی) لە (نوسترسیا) زیاتربوو کە دواتر بە (فەڕەنسا) ناسرا[2].

فەرەنجییەکان لە سەردەمی (کلۆڤس) پەرەیانسەند، وڵاتیان زۆر مەزن بوو و کوشکی پاشایەتیان گەورە بوو و کاروبارەکانی زۆر بوون، پاشا پێویستی بە یاریدەدەر هەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی لەناو کۆشکی پاشایەتیدا؛ بۆیە کاری جێگیر یان جینیشینی دەرگاوانی دانا، کاری ئەم دەرگاوانە ئەوە بوو کاری پاشای وڵاتی ڕێکدەخست لەگەڵ خەڵک و بە مەبەستی دیاریکردنی کاتی بینینی پاشا و پاراستنی لە هەموو مەترسییەک، ئەم کارە سەرەتا لای خەڵک کارێکی زۆر ناشرین بوو، هەربۆیە خەڵکی بە چاوی کەم و سووکەوە تەماشایان دەکرد، چونکە دەرگاوان کاری ڕێکخستنی کارەکانی پاشا و بینینی میوانەکان بوو، بەڵام ئەو کارە بەرە بەرە پەرەیسەند و ببووە کارێکی زۆر گرنگ لە ناو کۆمەڵگادا، هەتاوەکوو گەشتە پلەی وەزیری[3]. یەکەم کەس توانی ئەو کارە لە بەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێت و لە ڕێگای ئەو کارە بگات بە پلەوپایەی چاک؛ لەوانە وەزیری کۆشک (پیپن ٦٨٧-٧١٤ ز) بوو لە (ئوستراسیا) و دوای شەڕێکی دوورودرێژ دەسبگرێت بەسەر (نوسترسیا) و بەمەش ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخسا کە فەرمانڕەوایی هەموو (فەرەنگ) بکات. (پیپن) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە مێژووی (فەرەنگییەکان) و توانی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٠١.

(٢) ه. ا. ل-فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٤.

(٣) محمد زايد عبداللة: مدخل الى تاريخ اوروبا، ص١٤٨.

بناغەی دەوڵەتی (شارلەمانی) بەناوبانگ دابنێت و لە دوای خۆی کوڕەکەی هات بە ناوی (شارل مارتل)ەوە کە ئەمیش توانی لە نێوان ساڵانی (٧١٤–٧٤١ ز) فەرمانڕەوایی (فەرەنگەکان) بکات و بە هۆی بەهێزی و توندییەکەیەوە ناوبانگی (شارلی چەکوشی) پێ بەخشرا (المطرقة)[1].

مێژوو باس لەوە دەکات لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی زایینیدا باس و خواسی فەرەنگەکانی تۆمارکردووە، ئەوەش لە کاتێکدا لەشکری ئیمپڕاتۆرییەت لەنزیک شاری (مینس) تێکیاندەشکێنن و ناچاریان دەکەن لە کەناراوەکانی خۆرئاوای (ڕایین) نیشتەجێببن، دوای نزیکەی (١٥٠) ساڵ لەم ڕووداوە؛ فەرەنگەکان لە ساڵی (٤٦٣ ز) دەسبەسەر شاری (کلۆنی) دەگرن و دەیکەنە پایتەختی خۆیان، بەمەش توانیان دەسەڵاتی خۆیان لە دۆڵەکانی (ڕایین و ئاخن) هەتا شاری (متز) فراوانبکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە هۆزەکانی (فەرەنگ) لە کەناری خۆرهەڵاتی ڕووباری (ڕایین) مابوونەوە، کە بە ناوی ناوچەکەوە بە (فرانکۆنیا) ناسرابوو. فەرەنگییەکان کە لە ساڵی (٤٣٠ ز)دا لە بەشی باکووری (گال) سەقامگیرببوون؛ خۆیان بە (بەربەر) دانەدەنا، بەڵکوو خۆیان وەک گەلێکی ئازادیخواز کە بە هێزی چەک ئازادیان بەدەستهێنابوو هەژمار دەکرد، تەنانەت وشەی (Franks) بە واتای (ئازاد) دێت؛ وەک ئاماژەیەک بەوەی کە مافی ڕامیاریان بەدەستهێنابوو. ئەم فەرەنگانە قۆناغێکی گرنگ پێکدەهێنن لە مێژووی داگیرکردنی (جەرمانەکان) لە ئەورووپای خۆرئاوادا کە دەوڵەتەکەیان ماوەیەکی درێژخایەن خۆی ڕاگرت، لە هەمان کاتدا توانیان بە شێوەیەکی بەربڵاو ژیاری ڕۆمانەکان تێکەڵ بە تایبەتمەندی و نەریتی ڕەسەنی خۆیان بکەن[2].

دەتوانین ساڵی (٤٣١ ز) وەک سەرەتایەک بۆ مێژووی دەوڵەتی (فەرەنگ) دیاریبکەین؛ واتە ئەو ساڵەی کە (کلۆدیۆی پاشای فەرەنگییەکان) هێرشی کردەسەر شاری (کلۆنی)، ساڵی (٩١١ ز) بە ساڵی کۆتایی دەوڵەتەکە دەسنیشان دەکرێت؛ چونکە لەم ساڵەدا بەدواوە چیدی نازناوی ئیمپڕاتۆر بۆ فەرمانڕەواکانی (فەرەنگ) دانەنرا[3].

---

(١) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٠٠.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٧٨.

له سـۆنگەی مێژوویـانەوە دەتـوانین مێـژووی فەرەنگییەکـان بکەیـن بە دوو بەشەوە:

١. دەوڵەتی میرۆفنجی باپیرەگەورەی فەرەنجییەکان: مێژووی ئەم دەسـەڵاتە لە ساڵانی (٤٣١ ز) یاخود (٤٨٢ ز) بەردەوامبووە هەتا ساڵی (٧٥١ ز).

٢. دەوڵەتـی کـارۆلنجی: نـاودارترین ئیمپڕاتۆریـان (شـارلەمان) بـووە و مـاوەی دەسەڵاتیان لەنێوان ساڵانی (٧٥١–٩١١ ز) بوو.

له ڕاستیدا دامەزرێنەری سەرەکی دەوڵەتی فەرەنجی مێرۆڤینچی (کلۆڤس) بووە لەنێوان ساڵانی (٤٨١–٥١١ ز)[١].

## کلۆڤس (٤٨١-٥١١ ز)

تەختـی پاشـایەتی دەوڵەتـی (میرۆفنچییەکـان) لە سـاڵی (٤٨١ ز)دا بـۆ (کلـۆڤس) مـایەوە کە ئەودەمە تەمەنـی لە (١٥) سـاڵیدا تێپەڕی نەکردبـوو، ئەوکـات وڵاتەکەی تەنهـا لە نـاوچەی (گـاڵ) پێکهـاتبوو، خـۆی ژمـارەیەک لە شـار و ناوچەکـانی دەورووبەری خستەسـەر قەڵەمـڕەویەکەی و ژمـارەیەکی زۆر لە پیـاوە ناودارەکانیشی خستە زیندانەوە، دوای وەرگرتنی خەڵات و دیاری لێیان ئازادیکردن و دەسکەوتێکی زۆریشیان لە چەک و خواردەمەنی دەسکەوت. لە سـاڵی (٤٨٦ ز)دا هێرشـیکردە سـەر شـاری (سواسـوون) و لەو هەڵمەتەشـدا هێزەکـانی ڕۆمانییـان بە سەرکردایەتی (سیاگریووس) تێکشـکاند و ناچاریـانکردن بە کشـانەوە بەرەو شـاری (تولـووز) کە لەژێر سـایەی پاشـای گـووتە خۆرئاواییەکـان (ئەلاریکی دووەم) بـوو، بەڵام (ئەلاریـک) پەنـاینەدان و (سـیاگریووس)ی ڕادەسـتی (کلـۆڤس) کردەوە و پـاش دەسگرتن بەسەر موڵک و سامانیدا خستییە زیندانەوە و پاشان بە نهێنی کوشتی. بە کەوتنـی شـاری (سواسـوون) واتـای دواسـێبەری ئیمپڕاتـۆرییەتی خۆرئـاوا بـوو لە ئەورووپادا. جێگای ئاماژەپێکردنە کە (کلۆڤس) و لەشکرەکەی هەتا ئەوکاتە لەسـەر ئاینی بتپەرستی (وثنی) بوون[٢].

---

(١) نورالدین حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في اوربة، ط١، دار الفكر، دمشق، ١٩٦٧ م، ص٨٠-٨٢.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٦٨.

## کلۆڤس و ئایینی مەسیحی

(کلۆتیدا)ی هاوسەری (کلۆڤس) پەیڕەوکاری ئایینی (مەسیحی) بوو؛ ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە باوەڕهێنانی (کلۆڤس) بۆ ئایینی (مەسیحی)، ئەم ژنە هەرچەندە تەمەنی زۆر کەم بوو؛ بەڵام لە ڕووی هۆش و ئاوەزەوە زۆر لە تەمەنی خۆی تێپەڕاندبوو، یەکەم منداڵیان کوڕ بوو؛ (کلۆتیدا) دەیویست وەک خۆی منداڵەکەی ببێتە (مەسیحی) و هەوڵێکی یەکجار زۆری لەگەڵ (کلۆڤس)دا بۆ ئەوەی منداڵەکەیان ببێت بە (مەسیحی)؛ هەتا لە ئەنجامدا قایلی کرد، ئەویش بەو مەرجەی کە خودی (کلۆڤس) لەسەر ئایینی (بتپەرستی) بمێنێتەوە، بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی مەزنیان سازدا لە پڕۆسەی بەمەسیحیکردنی منداڵەکەیان لە کڵێسا، کەچی لە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراودا منداڵەکەیان کۆچی دوایی کرد! ئەم ڕووداوە ناڕەحەتییەکی زۆری بۆ (کلۆڤس) دروستکرد و بە ژنەکەی گوت: "ئەگەر منداڵەکەیان نەکردایە بە (مەسیحی) و بیانکردایە بە بتپەرست منداڵەکەیان نەدەمرد"[1].

بۆ ساڵی دواتر کوڕێکی دیکەیان بوو؛ لەوکاتەدا جەنگێکی مەزن لەنێوان (فەرەنگییەکان و ئەڵمانەکان) بەرپابوو، کار گەشتبووە ڕادەیەکی وا کە (کلۆڤس) هەرەسبهێنێت، لەم ڕووەوە (گریگۆری تۆری) مێژوونووس دەڵێت: (کلۆڤس) سەر بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێت و بە گریانەوە لەگەڵ عیسادا دەدوا: "تۆ ئەی عیسا؛ ئەو کەسە بوویت کە تاڵاوی ژیانت چەشتووە لەپێناو هاوکاری و خزمەتکردنی لێقەوماوان و سەرکەوتنی ئەوانەی کە باوەڕیان پێت هەبوو، ئێستاش بەندە داوای یارمەتیت لێ دەکات، ئەگەر سەرکەوتنم بۆ بڕەخسێنێت بەسەر نەیارەکانمدا؛ باوەڕی تەواوت پێ دەهێنم و واز لە خوداکەی خۆم دێنم، باوەڕت پێ دێنم و داوات لێ دەکەم لە نەیارەکانم ڕزگارم بکەیت ...". بەر لەوەی قسەکانی تەواو بکات وەک (گریگۆری) نووسیویەتی: لە کاتی شەڕەکەدا (ئەڵمانەکان) پاشەکشەیانکرد؛ ئەمەش دوای ئەوەی کە پاشاکەیان لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا کوژرا، ئیدی (ئەڵمانەکان) سەریان بۆ (کلۆڤس) نەویکرد و داوایان لێی کرد ئەو شەڕە خوێناوییە بوەستێنێت، لە بەرامبەردا هەموو (ئەڵمان) ئامادەبوون بێنە ژێر فەرمانی ئەوەوە، بەو جۆرە

---

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ص٧٧-٧٩.

(کلۆڤس) داواکەیانی پەسەندکرد و گەڕایەوە بۆ ماڵ هەتا ژنەکەی لەو سەرکەوتنە مەزنە ئاگاداربکاتەوە کە بە ناوی مەسیحییەوە بەدەستیهێنابوو[1].

هەر دوای ئەوەی (کلۆڤس) فەرمانیدا کە قەشە بانگ بکەن، لە کاتی بەیەکگەیشتنی هەردووکیاندا (قەشە و کلۆڤس) قەشەکە دەیگوت: (کلۆڤس) زۆر بەبێ دەنگی گوێی لێ ڕادەگرت، (کلۆڤس) بە قەشەکەی گوت کە گەلەکەی ناهێڵن دەسبەرداری ئایینی (بتەرستی) بێت؛ لەبەرئەوە داوای لێ کردن ئەو قسانەی کە بۆ ئەویکردووە بە هەمان شێوە بۆ گەلەکەشی بکات، خەڵکەکە دوای بیستنی قسەکانی قەشەکە بە یەکدەنگ بڕیاریاندا واز لە ئایینی (بتپەرستی) بهێنن و بچنە سەر ئایینی (مەسیحی)، بەمشێوەیە لە ساڵی (٤٩٦ ز)دا (کلۆڤس) چووە سەر ئایینی (مەسیحی)، هەر لە هەمان ڕۆژدا (٣٠٠٠) لە پیاوەکانیشی بوون بە (مەسیحی)[2].

## پەیوەندی نێوان فەرەنگییەکان و کەنیسە

پەیوەندی نێوان هەردوولایان دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری خێزانی لەسەری و لە وەرگرتنی ئایینی مەسیحییدا لەسەر ئایینزای کاسۆلیکی، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ خێزانەکەی کە مەسیحییە بە ناوی (کلووی)دا کە یەکێکە لە خانمانی (بۆرگەندی). خودی (کلۆفس) بۆیە بوو بە (مەسیحی) چونکە لە شەڕدا بوو، لەتەک هۆزەکانی (ئەڵمان) و پەیمانیدا ئەگەر (خودای مەسیح) سەریبخات لەم شەڕەدا؛ ئەوا دەبێتە (مەسیحی). لە دوای ئەو سەرکەوتنە بەسەریاندا؛ پەیمانی خۆی بەجێهێنا لە باوەڕهێنان بە ئایینی (مەسیحی)، هەندێکی دیکەش دەڵێن کە ڕاهیبە مەسیحییەکان زۆر یارمەتیدەربوون لەو شەڕەدا[3].

بوونە مەسیحی (کلۆڤس) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە مێژووی (فەرەنسا)دا؛ چونکە یەکەم پاشای (جەرمانی) بوو لەسەر ئایینزای (کاسۆلیکی) باوەڕیهێنا، بە پێچەوانەی هۆزە سەرکەوتووەکانی (جەرمانی) لە خۆرئاوا لەسەر ئایینزای (ئەریوکا) بوون، (کلۆڤس) و یاریدەدەرەکانی لەژێر پەردەی ئاییندا فەرمانڕەوای

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٧٩.
(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٠٤-١٠٥.
(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٠٣.

خویان پەرەپێدا و کەنیسە یارمەتیدەربوو بۆ (کلۆڤس) لەگەڵ سەرکەوتنی بەسەر گووتەکاندا لە ساڵی (٥٠٧ ز). سەردەمی (کلۆڤس) سەردەمی تێکەڵبوونی ڕۆشنبیری فەرەنگییەکان بوو لەگەڵ کەلتووری و ژیاری ڕۆمانیدا[١].

## تایبەتمەندییەکانی سەردەمی کلۆڤس

١. (فەرەنگییەکان) کە بوونە دەسەڵاتدار؛ هیچ جۆرە زوڵم و ستەمێکیان بەرامبەر بە دانیشتووانە ڕەسەنەکە ئەنجام نەدا، ئەمەش بووە هۆی نزیکبوونەوە و تێکەڵبوونی فەرەنگییەکان بە خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتانەی کە داگیریانکردبوو.

٢. باوەڕهێنانی (کلۆڤس) بە ئایینی (مەسیحی) و لەسەر ئاینزای (ئەسناسیۆسی) گەورەترین هۆکاری نزیکبوونەوەی فەرەنگییەکان و دانیشتووانی ڕەسەنی ئەو شوێنانەبوو، هاوکات توانیان هەست و سۆزی خەڵکەکەش بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، هەموو ئەمانەش ڕێخۆشکەربوون بۆ پێکهێنانی پەیماننامەیەکی بەهێز لەنێوان (فەرەنگییەکان و پاپاکان)دا؛ بەتایبەت لە کۆتایی ساڵانی فەرمانڕەوایەتی فەرەنگییەکاندا.

٣. (فەرەنگییەکان) وەک گووتەکانیان نەدەکرد کە لە شوێنێکەوە دەچوونە شوێنێکی دیکە؛ بەڵکوو لە نیشتمانی ڕەسەنی خۆیان کە ناوچەکانی (ڕایین) بوو کۆببوونەوە و وردە وردە بەرەو ناوچەکانی دەوروبەریان بڵاودەبوونەوە، ئەمەش هۆیەک بوو کە فەرەنگییەکان بتوانن ڕەسەنایەتی خۆیان کە (جەرمانی) بوو بپارێزن[٢].

## شەڕەکانی کلۆڤس

### أ. شەڕ لەگەڵ سورنجییەکاندا

دوای ئەوەی (کلۆڤس) لە ساڵی (٤٨٦ ز)دا بەسەر ئەڵمانەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و چووە سەر ئایینی (مەسیحی)، شەڕێکی گەورەی لەگەڵ سورنجییەکاندا بەرپاکرد و توانی بیانخاتە ژێر فەرمانڕەوایەتی خۆیەوە[٣].

---

(١) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٩.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٧٢-٧٤.

(٣) محمد زايد عبدالله: مدخل الى تاريخ اوروبا العصور الوسطى الباكرة، ص١٤٥-١٤٦.

### ب. شەڕ لەگەڵ بورگوندییەکان

لەو کاتەدا فەرمانڕەوایی (بورگوندییەکان) بەدەست (گۆندۆباد ٤٨٠-٥١٦ ز)ەوە بوو، دەوڵەتەکەیان کەوتبووە ناوچەکانی: (ڕوون، ساون، مێرسیلیا)وە، (گۆندۆباد) پەیڕەوکاری ئایینی (مەسیحی) و لەسەر ئایینزای (ئاریۆسی) بوو، ناکۆکی نێوان هەردوولا (کلۆڤس و گۆندۆباد) لەوەوە دەستی پێ کرد کە (گۆندۆباد) باوکی (کلۆتلدا)ی کوشتبوو؛ دایکیشی لە ئاودا خنکابوو، خوشکە گەورەکەشی بێسەروشوێن کردبوو، لەبەرئەوە (کلۆتیدا) ڕقوکینەیەکی یەکجار زۆری بەرامبەر بە (گۆندۆباد) هەبوو، ئەمەش (کلۆڤس)ی هاندا بۆ ئەوەی لە دژی بجەنگێت[1].

جەنگی نێوانیان لە دەورووبەری شاری (دیجۆن) دەستی پێ کرد، (کلۆڤس) گرەوی شەڕەکەی بەوە بردەوە کە (گۆدیگێزڵ)ی برای (گۆندۆباد) خیانەتی لێ کرد و چووەپاڵ (کلۆڤس)، لە ئەنجامدا (گۆندۆباد) بەرەو شاری (ئاڤینۆن) هەڵهات، براکەشی (گۆدیگێزڵ) چووە ناو شاری (ڤیەننا)وە و لەباتی (گۆندۆباد) بووە فەرمانڕەوای (بۆرگوندییەکان).

پاش ماوەیەک (گۆندوباد) چووە سەر ئایینی (مەسیحی)؛ ئەمە ڕێی بۆ هاوپەیمانێتییەک لەنێوان ئەو و (کلۆڤس)دا خۆشکرد و پێکەوە کەوتنە لێدانی دەوڵەتی (گووتە خۆرئاواییەکان) کە لەسەر ئاینزای (ئاریۆسی) بوون[2].

### ج. شەڕ لەگەڵ گووتە خۆرئاواییەکان

فەرمانڕەوای (گووتەکان) لەوکاتەدا بەدەست (ئەلاریکی دووەم ٤٨٥-٥٠٧ ز)ەوە بوو؛ شاری (تۆلووز) پایتەختیان بوو. ئامانجی (کلۆڤس) ئەوە بوو کە تەواوی ناوچەکانی (گال) بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و ڕازی نەبوو بە مانەوەی (گووتەکان) لە دەوروبەریدا، لە لایەکی دیکەشەوە (گووتەکان) کە لەسەر ئایینزای (ئاریۆسی) بوون و (کلۆڤس) زۆر بەوە نارەحەت بوو، پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ وەزیرەکانیدا؛ (کلۆڤس) ڕازی بوو بەوەی کە هێرشبکاتەسەر (گووتەکان)، بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی (٥٠٧ ز)دا لەشکرێکی گەورەی کۆکردەوە، لە ئەنجامی شەڕ و

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط، ج١/ ص٧٩-٨٠

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٩٨-١٠٠.

بەیەکدادانەکان کە لەنێوانیاندا ڕوویدا؛ (گووتەکان) هەرەسیانهێنا و (ئەلاریک)یش بەدەستی (کلۆڤس) لە شەڕەکەدا کوژرا، (گووتەکان) تەنها ڕێی هەڵهاتنیان بۆ مایەوە؛ بەمجۆرە هەموو ناوچەکانی (گال) و زەوییەکانی ڕۆمانییەکان بۆ (کلۆڤس) مایەوە[1].

(کلۆڤس) پاشای سەرجەم (فەرەنگەکان) نەبوو؛ بەڵکوو تەنها پاشای بەشە مەزنەکەی بوو کە (فەرەنگە دەرياييەکان) بوون، دوای سەرکەوتنی بەسەر (بۆرگووندییەکان و گووتەکان) و دەسبەسەرداگرتنی موڵکی ئیمپڕاتۆرییەتەکە لە ناوچەی (گال)دا هەوڵیدا هەردوو بەشەکەی (فەرەنگ) پێکەوەگرێبدات و بیانخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە، لەپێناو ئەو ئامانجەشدا (کلۆڤس) ژمارەیەکی زۆری کەسوکارەکانیانی کوشتن، بەڵام دواتر لەو کارەی پەشیمانبووەوە و هەتا دوارۆژەکانی ژیانی بە پەشیمانی و زویری مایەوە[2].

(کلۆڤس) دوای ئەوەی توانی دەسەڵاتی بگەیەنێتە ئاستێکی بەرز لە خۆرئاوای ئەورووپادا، هیچ ڕێگەیەکی لەپێش ئیمپڕاتۆری خۆرهەڵات (ئەناستاسیۆسی یەکەم ٤٩١-٥١٨ ز)دا نەهێشتەوە جگە لە داننان بە دەسەڵاتداریتی (کلۆڤس) نەبێت، نازناوی (کۆنسووڵ)ی پێ ببەخشێت، بەمەش (کلۆڤس) تاجی ئیمپڕاتۆرییەتی نایەسەری و پایەتەختەکەی لە (توور)ەوە گواستەوە بۆ (پاریس)، ئەم گۆڕانکاریانە لە ساڵی (٥٠٨ ز) ڕوویدا کە بە سەرکەوتنی بەسەر (گووتەکان)دا بەدەستهێنابوو، (کلۆڤس) بەو جۆرە لە دەسەڵات پایەبەرزیدا مایەوە؛ هەتا لە ساڵی (٥١١ ز)دا کۆچی دوایی کرد و شانشینەکەی لەنێوان هەرچوار کوڕەکەیدا دابەشکرا، بەپێی دابونەریتی (جەرمانییەکان) دەبوو دوای مردنی باوک هەموو میراتییەکەی بە یەکسانی بەسەر کوڕەکانیدا دابەشبکرێت[3].

جیگای ئاماژەبۆکردنە ناکۆکییەکی خوێناوی کەوتە نێوان کوڕەکانییەوە، لەوکاتانەشدا بزوتنەوەی فراوانخوازی فەرەنگەکان بەردەوامبوو؛ بەڵام کوڕە بچووکی (کلۆڤس) کە ناوی (لۆسەری یەکەم) بوو توانی لەنێوان ساڵانی (٥٥٨-٥٦١

---

(١) سعيد عبد الفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٧٥-٧٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١٠.

(٣) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط، ج١/ ص٨٠.

ز) جارێکی دیکە شانشینی (فەرەنگ) یەکبخاتەوە، کەچی خۆی جارێکی دیکە شانشینەکەی لەنێوان چوار کوڕەکەیدا بەمشێوەیە دابەشکردەوە:

یەکەم/ ئوستراسیا: بەشی باکووری خۆرهەڵاتی وڵاتی (گال) و زەوییەکانی (ڕاین و دانووب) هەتا دوو ڕووباری لەخۆ دەگرت.

دووەم/ نوستراسیا: باکووری وڵاتی (گال) بوو لەنێوان (لوار و ئالمۆز)دا.

سێیەم/ بۆرگووندیا: لە دەورووبەری حەوزی (ڕۆن) بوو لەگەڵ شانشینی (بۆرگووندیای پێشوو).

چوارەم/ ئۆکووتین: ئەو زەوییانە بوون کە (فەرەنگەکان) لە گووتە خۆرئاواییەکانیان وەرگرتەوە[1].

## لۆسەری یەکەم (٥٥٨-٥٦١ ز)

کاردانەوەی ئیمپراتۆرییەتی (بیزەنتی) دژ بە (بەربەرەکان) لە (ئیتاڵیا و کەناراوەکانی ئەفریقا و بەشێک لە ئیسپانیا) زیاتر تێپەڕی نەکرد و نەگەیشتە وڵاتی گالەکانیش؛ چونکە گەلێکی کاریگەری لێبوو کە توانیبووی پارێزگاری لە هێزە جەرمانییەکانی خۆی بکات، (فەرەنگەکان) لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کوڕەکانی (کلۆڤس)دا هێزی سوپاییان لەنێوان جەماوەری هۆزە جیاوازەکاندا دابەشکردبوو، هەمیشە لە دەوری سەرکردەکانیان کۆدەبوونەوە، ئەمەش بەپێی دابونەریتە جەرمانییەکان؛ بەتایبەت لە کاتی مەترسییەکاندا، هەرچەندە بە کەمی ملکەچی سەرۆکەکانیان بوون؛ تەنانەت جارێکیان پاشاکەی خۆیان ترساندبوو کە وازی لێ دەهێنن گەر بەرەو (بۆرگووندیا) نەیانبات، هەروەها جارێکی دیکە زۆر بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵ پاشاکەیان (لۆسەری یەکەم ٥٥٨-٥٦١ ز) کرد، چونکە نەیویستبوو بەرەو (ساکسۆنیا) بیانبات، بۆیە خۆشەویستی و لایەنگریان بۆ پاشا کەمببووەوە؛ بەتایبەت دەستەیەک لە پیاوە بەهێزەکان کە بەرژەوەندی هاوبەش کۆیکردبوونەوە و لە مێژوودا بە (لویدس) ناسراون، ئەم دەستەیە بوونە ئۆرستوکراتی دژ بە پاشا[2].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوربا في العصور الوسطى، ج١/ ص٧٢.

(٢) عەبدولقادر ئەحمەد یوسف: مێژووی چاخەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا، و: شاناز ڕەمزی، چ١، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٢ ز، ل٩٢ – ٩٣.

ئەو دەستەیە لە (ئوستراسیا) پەرەیانسەند، ئەمان کەمتر ژیاری بوون لە (نیوستریا)، ئەو جیاوازییە هەتا دەهات ئاشکراتر دەبوو، هەتا بووە هۆکارێک بۆ جیابوونەوەی هەردووکیان لە شانشینی (فەرەنگی)دا، ئەم ناکۆکییە لەنێوان پاشا خانەدانەکاندا لە لایەک و لەنێوان (ئوستراسیا و نیۆیستریا) لە لایەکی دیکەوە ماوەی سەدە و نیوێکی خایاند، هەمیشە ڕامیاری دژ بە یەکیان دەگرتەبەر، پاش (٣) ساڵ لە یەکێتی نێوانیان لە سەردەمی (لۆسەری یەکەم) دەوڵەتی (فەرەنگ) دابەشبوو لەنێوان هەرچوار کوڕەکانی لۆسەردا:

١. چاربێرت بووە پاشای (پاریس).
٢. جۆنسرامبووە پاشای (ئۆرلیلنز و بۆرگوونديا).
٣. سیگبێرت بووە پاشای (ئوستراسیا).
٤. چیلپریک بووە پاشای (سواسۆن).

هەریەکەیان بوونە خاوەنی بەشێک لە بەشی باشوور؛ وەک چۆن لە ساڵی (٥١١ ز) لەپاش مردنی (کلۆڤس) ڕوویدا، ئەویش دەوڵەتەکەی لاوازکرد[١].

## ناکۆکی نێوان پاشایەتی و خانەدانەکان

دەسەڵاتی پاشایەتی هەوڵی دەدا دەسەڵاتی خۆی بەهێزبکات و بەرنامەیەکیش بۆ قەڵەمڕەوی دابنێ، بۆ نموونە (چیلپریکی پاشا) سەرەڕای نارەزایی (فەرەنگەکان) باج و سەرانەی سەپاند، لە هەمان کاتدا ئەو هەستەی کە لەنێوانیاندا هەبوو بۆ سەربەخۆیی، پاشا کارێکی وای لەنێوانیاندا دروستکرد؛ وەک سەرەتایەک دەستیکرد بە لەسێدارەدانی قەشەکان کە شوێن و پلەیەکی بەرز و بەهێزیان لەنێو خەڵکیدا هەبوو، (چاربێرت) و (جۆنسرام)ی برای لەو بارودۆخە ڕازی نەبوون و هەوڵیاندا سنوورێکی بۆ دابنێن، لە ئەنجامدا هاوپەیمانێتییەک لەنێوانیاندا کە بە (ئەندەلۆت) ناسراوە ڕوویدا؛ بەو پێیە (چاربێرت) بووە جێگرەوەی میراتگری مامی؛ چونکە کوڕی نەبوو[٢].

هەرچەندە پاشاکان لە ڕێگای ئەو هاوپەیمانێتییەوە دەیانویست سەرکەوتنێکی سەرەتایی بەدەستبهێنن، بەڵام پیاوە خانەدانەکان هێشتا هێزێکی وایانمابوو کە

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص ١٥٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص ١٥٩.

بتوانن دژ بە بڕیارەکانی ئەوان بوەستن، لەبەرئەوە توانیان کە مافی مولّکایەتی و میراتگری زەویوزار بەدەستبهێنن، بەرامبەر بەوە لە فەرمانی پاشا دەرنەچن و بە ئارەزووی خۆیان هیچ کارێک ئەنجام نەدەن، هەربۆیە هەردوولا لە سالّی (٥٨٧ ز) لەسەر ئەوە ڕێکەوتن. لە سالّی( ٥٩٣ز)دا (جۆنسرام) کۆچی دوایی کرد و ولاّتەکەی لەگەلّ (چاربێرت) بۆ ماوەیەکی کەم یەکدەگرن، پاش ئەوەی چاربێرتیش لە سالّی (٥٩٧ ز) کۆچی دوایی دەکات؛ ئیدی (ئوستراسیا) بۆ (سیودبرتی دووەم)ی کوڕی بەجێدەمێنێت و (بۆرگووندیا)ش بۆ کوڕەکەی دیکەی (سیودریکی دووەم) بەجێدەمێنێت[1].

لە سالّی (٦١٣ ز)دا (سیودریک) کۆچی دوایی دەکات، ئەودەمە ناودارەکانی (بورگوندیا و ئوستراسیا) بە نهێنی پەیوەندی دەکەن بە پاشای (نیوستریا) واتە (لۆسەری دووەم) و پێی ڕادەگەیەنن کە ڕەزامەندن ئەو ببێتە پاشای هەموو ولاّت؛ بە مەرجێک لەژێر دەسەلاّتی (برۆنهێلّدا) ڕزگاریان بکات، لۆسەر ئەو مەرجەی پەسەند کرد و لە ئەنجامی شەڕێکی نێوانیاندا؛ (برۆنهێلّدا) و چوار کوڕەکەی لە لایەن لۆسەری دووەمەوە کوژران[2].

## لۆسەری دووەم (٦١٣-٦٢٨ ز)

(لۆسەر) تاکە پاشا بوو کە پاش ئەو ڕووداوانە فەرمانڕەوایی میرۆڤیجەکانی کرد، لە سەردەمی ئەودا یەکێتی ولاّتەکە بەرقەرار بووە و گرنگترینی ڕووداوەکان لە سەردەمی ئەودا پێکهاتنی کۆمەلّەیەک بوو لە (پاریس) لە سالّی (٦١٤ ز)، ئەم کۆمەلّەیە (٧٩) قەشە و چەندەها کەسایەتی ناوداری تێدابوو، دەتوانین بلّێین تێکەلاّوییەک لەنێوان دەستەی خانەدانی ئایینی و خانەدانی شارستانیدا دروستبوو. لە ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەو کۆمەلّەیەدا دەستوورێکی هەمیشەیی دانرا، ئەمەش بە سەرکەوتنێکی مەزنی ئەو دوو دەستەیە دادەنرێت، ئەم دەستوورە بڕیاریدا بە لابردنی ئەو باجەی کە هەرچوار کوڕەکەی (لۆسەر) دایاننابوو بە چەشنێکی نائاسایی. لە هەمان کاتدا پیاوانی ناودار و کەنیسە؛ ئەو مولّکانەی کە لێیان

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٨٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٥٨.

زەوتکرابــوو بۆیــان گەڕایەوە، هەروەهــا لە دەســتوورەکەدا هــاتووە کە فەرمــانی لەسێدارەدان بەسـەر هەرکەسێکدا دەدرێت کە مەترسـی لەسـەر ئاسایشـی دەوڵەت دروست بکات[1].

## داگۆبێرتی یەکەم (٦٢٨-٦٣٨ ز)

لە ساڵی (٦٢٢ ز) خەڵکی (ئوستراسیا) کاتێک بینیان هەمـان پاشـای (نیوسـتریا) فەرمانڕەوایی ئەوانیش دەکات بێزار بوون؛ لەبەرئەوە داوایان لە (لۆسـەری دووەم) کـرد کە پاشـایەکی تایبەتیـان بـۆ دابنێت، وا پـێ دەچێت کە دەسـەڵاتی ناودارەکـان گەیشتبووە ئاستێک کە (لۆسەری دووەم) بە ناچاری گـوێی بـۆ داواکەیـان شـلبکات، لە ئەنجامدا (داگۆبێرت)ی کوڕی نارد؛ بەڵام (داگۆبێرتی یەکەم) پاش مردنی بـاوکی هەردوو ناوچەکەی خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی[2].

دەســەڵاتدارێتی (داگــۆبێرتی یەکەم) گەیشــتبووە لــووتکەی فەرمــانڕەوایەتی (مێرۆڤنجییەکــان)، چــونکە ســەروەرێتی مەزنــی لە خۆرئــاوای ئەورووپــا بەدەستهێنابوو، هەروەها سنووریکیشی بۆ هەڕەشەی هۆزەکانی (وێندز) دانابوو کە لە بنچینەدا (سلاڤی) بـوون و پاشـاکەیان نـاوی (سـاما) بـوو، هاوکـات (داگـۆبێرت) گەورەی هەمـوو وڵاتـی (گـال) بـوو، لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە (داگۆبێرت) کارەکـانی سپاردبوو بە وەزیرە لێهاتوو و شارەزاکانی کە لەنێوانیاندا (پیپنی لاندوون) بـوو کە بەرپرسـی کۆشـکی (ئوستراسـیا) بـوو، (کۆنی بێرت) کە قەشـەیەکی (کۆڵـونی) بـوو؛ جـگە لەوانەش قەشــەی میتـز (ئەرنۆلـف)[3]، تەنـانەت (داگـۆبێرت) خـۆی سـەردانی (ئوستراســـیا و بورگونـــدیا)ی کـــرد و لەوێ لەگەڵ گەورەپیـــاوان و خـــانەدانە بچووکەکـان کۆبـووەوە، لەپێنـاو دانـانی سـنوورێک بـۆ بەکارهێنـانی هێـز و شـەڕی نێـوان خەڵـکە، هەروەهـا بـایەخی بە چـاککردنی یاسـا و باشـکردنیدا، لە ئەنجـامی پەیوەندی فراوانیان لەگەڵ دەرەوەدا بازرگانیش پەرەیسـەند. (داگۆبێرت) پەیمـانێکی سـازدا لەنێـوان (لۆمباردییەکـانی ئیتاڵیـا و گـووتە خۆرئاواییەکـانی ئیسـپانیا)دا، دوو

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٨٦.

(٢) ول ديورانت: موسوعة قصة الحضارة، ت: محمد برزان، نوبليس، بيروت، ط١، ٢٠٠٨، مج٢٤، ص٨٨.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٨٧.

نوێنەریشی وەک باڵیۆز نارده ئیمپراتورییەتی (بێزەنتی)، سەرئەنجام (داگۆبێرت) له ساڵی (٦٣٨ ز) کۆچی دوایی کرد، به نەمانی ئەو؛ فەرمانڕەوایەتی میرۆڤیجییەکانیش کۆتایی پێ هات[١].

پاش کۆچکردنی (داگۆبێرت) میللەتی (میرۆڤیچ) بەرەو جیابوونەوه و نەمان دەچوو، لێرەدا بەزەحمەت دەتوانرێت مێژووی سەردەمی هەڵچوونی فەرەنگییەکان به ناوی پاشاکانیانەوه تێبینی بکەین؛ بەڵکوو زیاتر دەتوانین به ناوی بەرپرسیارانی کۆشکەکانەوه جیایانبکەینەوه، له ڕاستیدا پاشاکانی (میرۆڤیجەکان) ئامرازێک بوون بەدەست بەرپرسانی کۆشکەکانەوه که به ئارەزووی خۆیان بەکاریاندەهێنان[٢].

دوای (داگۆبێرت) هەردوو کوڕەکەی فەرمانڕەواییان گرتەدەست:

١. سیگبێرت (٦٣٤-٦٥٦ ز).
٢. کلۆڤسی دووەم (٦٣٩-٦٥٧ ز).

یەکەمیان له (ئوستراسیا) فەرمانڕەوا بوو؛ دووەمیشیان له (نیویستریا و بورگوندیا)، هەریەکێک لەو دوو وڵاته بەرپرسێکی کۆشکی هەبوو. له سەردەمی ئەو فەرمانڕەوایەتییەدا بەرپرسانی کۆشک خزمەتێکی یەکجار گەورەیان به دەوڵەت کرد و سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێنا و هەر لەناو ئەوانەدا ژمارەیەک ناوداریان تێدا هەڵکەوت که دەسەڵاتدارێتی فەرەنگیان له باوکەوه بۆ کوڕ دەگرتەدەست، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکرده خانەدانەکانی (ئوستراسیا) له شەڕی بەردەوامدا بوون دژ به پاشاکان[٣].

## بەرپرسیارانی ئوستراسیا و کڵێسا (٦٨٧-٧٦٨ز)

له پاش شەڕی (تارتەری) که له ساڵی (٦٨٧ ز)دا ڕوویدا و به هۆیەوه (پێپینی هێرستاڵ) بووه مەزنی هەرسێ پاشاکانی فەرەنگ؛ واته (ئوستراسیا، ینۆستریا و بورگوندیا). (پێپن) ڕێی به (سیۆدریکی سێیەمی پاشای نیۆستریا ٦٧٣-٦٧٨ ز)دا که فەرمانڕەوایەتی هەرسێ ناوچەکه بکات، بەوچەشنە ئەوان لەگەڵ (پێپن)دا هاوکاری

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٦٣.
(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص ٨٧.
(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٦٤.

فەرمانڕەوایەتی فەرەنگیان کرد و بەو جۆرەش مایەوە هەتا لە ساڵی (٧١٤ ز) کۆچی دوایی کرد[1].

بەپێی دەستووری ئەوکات؛ خێزانەکەی (پێپن) مافی ئەوەیان هەبوو کە بە میراتی ببنە بەرپرسیاری کۆشک و ئەوەش بە هیچ جۆرێک ناکۆکی لەسەر نەبوو، دوای مردنی (پێپن) ئەو مافە بە کوڕەزاکەی درا کە تەمەنی تەنها (٦) ساڵ دەبوو، بەڵام لەژێر چاودێری ژنەکەیدا (پلێکترۆد)[2].

دانیشتووانی (نیویستریا) هەوڵیاندا ئەو بەرپرسیاریتی کۆشکە لەوکاتەدا بە دەرفەتێک بزانن هەتا خۆیان لە دەسەڵاتداریتی (ئوستراسیاکان) ڕزگار بکەن، لە ئەنجامدا توانیان سەرکەوتن بەدەستبهێنن و (چیلپیریک) بکەنە پاشای خۆیان و (ڕاگانفرێد)یش بکەنە بەرپرسیاری کۆشک لە (نیویستریا). لەهەمان کاتدا ئامادەنەبوون سەر بۆ منداڵ و بێوەژنێک نەوی بکەن؛ بەڵکوو دانیان بە کوڕێکی دیکەی (پێپن)دانا کە ئەویش (چارل مارتل) بوو! هەرچەندە هەندێک کەس لایانوابوو کە ئەم کوڕی یاسایی (پێپن) نییە! (چارل مارتل) توانی لە شەڕێکدا دژ بە (نیوستریاکان) لە ناوچەی (ڤینسی) لە ساڵی (٧١٦ ز) سەرکەوتن بەدەستبهێنێت[3]، (چارل مارتل) بەم سەرکەوتنەوە نەوەستا؛ لەبری ئەوەی بەپێی دابونەریتە (جەرمانییەکان) ئاهەنگی سەرکەوتن ئەنجام بدات، شوێنی (نیوستریەکان) کەوت و هەتا شوراکانی (پاریس) تێکیشکاندن، ئەم سەرکەوتنە تەواوکەری سەرکەوتنی (پێپنی هێرستال) بوو لە شەڕی (تری) لە ساڵی (٦٨٧ ز) و نیشانەی سەرکەوتنی کۆتایی (ئۆستراسیا) و سەرەتای سەردەمێکی نوێیە لە مێژووی فەرەنگییەکاندا. لە ڕاستیدا تێکڕای دامودەزگا (فەرەنگییەکان) ڕووخان و هیچ سیستمێکی نوێ لەو ماوەیەدا دەرنەکەوت، وڵات دابەشبوو؛ هەرێمە سنوورییەکان ڕووبەڕووی هێرش بوونەوە یان سەربەخۆییان ڕاگەیاند، بە شێوەیەک ئەستەم بوو لەو قۆناغەدا بتوانرێت سنووری دەوڵەتی (فەرەنگ) دیاریبکرێت[4].

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٨٩.

(٢) نورالدين حاطرم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٨٦.

(٣) هـ. ا. ل. فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٨٢.

(٤) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٧١.

## شارل مارتل (شارلی چەکووش ٧١٤-٧٤١ ز)

(شارلی چەکووش) لە ساڵی (٧١٤-٧٤١ ز) جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست لە وڵاتی فەڕەنسادا، ڕۆلیکی گرنگی گێڕا لە مێژووی ئەو بنەماڵەیە و پەرەسەندنی شانشینەکە بە شێوەیەکی بەرچاو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەم پاشایە. نازناوی چەکووشیان لێنا؛ چونکە وەک چەکووش لێدانی بەهێزی دەدا لە دوژمنەکانی، هەندێکی دیکەش دەیگێڕنەوە بۆ توندوتیژی و لێدان بەرامبەر بە کەنیسەی کاسۆلیکی لە وڵاتی (گال)، کە ئەوکاتە وا پێویستی دەکرد بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ پیاوە ئایینییەکاندا بکات. (شارل مارتل) لەوکاتەوەی کە دەسەڵاتی وەرگرت لە (فەرەنگ)؛ ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گیروگرفت بووەوە، بەتایبەت کێشە و شەڕە ناوخۆییەکان لە لایەک و مەترسی (ئومەوییەکان) لە (تولوز)ەوە، ئەمە بەدەر لە هەڕەشەی (ئەڵمانەکان و سەکسۆن و پاڤارییەکان) کە خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ڕزگاربوون لەژێر دەسەڵاتی فەرەنگەکان[1].

هەرچەندە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو خۆی لە چارەسەرکردنی کێشەی ناوخۆییەکان و پاراستنی وڵات لە مەترسی دەرەوە خۆی دەبینییەوە، سیستمی فەرمانڕەوایی توندوتیژ بووە؛ بەتایبەتی لە بواری باج و دەرامەت، لە ئەنجامی ئەو جۆرە ڕامیارییە توانی دەسبگرێت بەسەر هەموو ئەو شوێنانەی کە گەلی (جەرمانی) لێی نیشتەجێبوون، لە هەمان کاتدا (شارل) هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە دەخستەگەڕ بۆ گێڕانەوەی جەرمانییەکانی نیشتەجێی ناوچەکانی (ڕاین) بۆ ژێر ڕکێفی خۆی، سەرەڕای ئەوەی کە (شارل) پەیوەندی خۆشبوو لەگەڵ کەنیسەدا[2]؛ کەچی دەستیگرت بەسەر زەویوزاری کەنیسەدا و ئیمیازەکانی و کەمکردنەوە، چونکە وڵات پێویستی بە پارە هەبوو بۆ شەڕکردن لەگەڵ (ئومەوییەکان) و بنیاتنانەوەی دەوڵەت و پێکهێنانی سوپایەکی گەورە و بەهێز لە میللەتی (جەرمان) لە دژی (ئومەوییەکان). سەرەنجامی ئەم ناکۆکی و ڕووبەڕووبوونەوانە ئومەوییەکان لە پێشڕەویدا بوون و سەرەنجام هەردوولا لە شەڕی (بواتییە) ساڵی (٧٣٢ ز) ڕووبەڕووی یەک بوونەوە لە جەنگێکی چارەنووسسازانەدا کە (فەرەنگەکان) بە

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٩٠.

(٢) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٦.

(٣) ابن عذاري: البيان المغرب في اختصار اخبار ملوك الاندلس و المغرب، دار الثقافة، بيروت، ١٩٨٠ م.

ســـەرکردایەتی خـــودی (شـــارل مارتـــل) و ئومەوییەکـــانیش بە ســـەرکردایەتی (عەبدولڕەحمان ئەلغافقی)[1] بوون کە ناوی تەواوی (ئەبوو سەعید عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای ئەلغافقی ئەلعەکی) بوو و دووجار دەسەڵاتی (ئەندەلووس)ی وەرگرتبـــوو بە نـــوێنەرایەتی بنەمـــاڵەی (ئومەوییەکـــان)، لەم شـــەڕەدا (بیلاتـــی شەهیدان)یش ناسراوە کوژرا و سوپاکەشی بەخراپی شکستیانهێنا، ئەم شکستە بە جۆرێـک بـوو کە زیـانی ئومەوییەکـان بە نـزیکەی (٣٧٥،٠٠٠) کـوژراو بـوو و مەترسییەکانیان کۆتایی پێ هات بۆ گێتی (مەسیحییەت)، بەمەش توانی مەترسی گەورەی موسـڵمانەکان کوتـایی پـێ بهێنێـت. (شـارل مارتـل) نازنـاوی (سـەرۆکی کۆشک)ی لە باوکییەوە (پیپن) بۆ مایەوە و توانی لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا دەسەڵاتی بەهێزتر بکات و بە جۆرێک کە دژایەتی پیاوە خانەدانەکانیش بکات[2].

گۆڕینی (کوننات و دۆقاتەکان) لە هەموو شوێنی شانشینەکەی بە (کوننات و دۆقات) لە (ئەوستراسیا) کە (جەرمانی) بوون، چونکە باوەڕی بە کەس نەدەکرد تەنها ئەوان نەبێت! لە ماوەی فەرمانڕەواییەکەیدا دوو هێرشی کردە سەر (باڤاریا) و (٥) جاریش بۆ سەر (سەکسۆن). بەڵام نەیتوانی بگات بە پلەی پاشایەتی بە واتای وشەکە و وەکوو (سەرۆکی کۆشک) مایەوە. بەمجۆرە دەسەڵاتی مایەوە هەتا لە پێش مردنی ساڵی (٧٤١ ز) شانشینەکەی دابەشکرد بەسەر هەرسێ کوڕەکەیدا بەمشێوەیە: کوڕی گەورە (کارلومان) لە (ئەوستراسیا و سوابیا و تورنگن)، (پیپنی سێیەم – کورتەباڵا) لە (نوسترسیا و بورگندیا و بروفانسی)، کوڕی سێیەمی (کریفۆ) ئەو شوێنانەی کە مابوونەوە لەنێوان هەرسێ شانشینەکەدا پێی بەخشی[3].

## پەیوەندی نێوان شارل مارتل و کەنیسە

(شارل مارتل) زۆر پەیوەندی خۆشبوو لەگەڵ پیاوە ئایینییەکان و دامەزراوەی کەنیسەدا، هەروەها یارمەتی و پشتگیری (قەدیس بونیفاس)ی کرد بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی لەنێو بتپەرستەکاندا. ئەم هەوڵانەی وایکرد کە پاپا دانبنێت بە کارە پیروزەکانی (شارل مارتل)دا، پاپا خۆی دەیگوت ناتوانم بەرگری

(١) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٢٣.
(٢) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٨.

(قس و شماسه و ڕەهبان) بکەم لە دژی بتپەرستەکان لە بیروباوەڕی بتپەرستیدا؛ ئەگەر فەرەنگەکان پشتگیریم نەکەن، بەڵام سەرەڕای ئەو پەیوەندییە خۆشەی کە لەنێوان (شارل مارتل) و کەنیسەدا هەبوو؛ کەچی دریغی لەوە نەدەکرد کە دەسەڵاتی پیاوە ئاینییەکان کەمبکاتەوە و دەسبەسەر زەویوزارەکانیان بریت هەتا ئەو سەروەت و سامانە وەک داهات بگەڕێنێتەوە بۆ خەزینەی دەوڵەت، چونکە دەوڵەت زۆر پێویستی بەو برە پارەیە هەبووە لە دوو بوارەدا:

١. بۆ دروستکردنی سوپایەکی گەورە لە جەرمانییەکان.

٢. لە مەترسی هێرشی موسڵمانەکان؛ بەتایبەتی ئەو شەڕە گەورەی کە لەگەڵیاندا ئەنجامیدا لە ساڵی (٧٣٢ ز) کە توانی سەربکەوێت بەسەریاندا[١].

## پیپنی سێیەم (پیپنی کورتەباڵا ٧٤١-٧٦٨ ز)

لە دوای مردنی (شارل مارتل)؛ هەردوو کوڕەکەی کە (کارلومان) و (پیپنی کورتەباڵا) یان (پیپنی سێیەم) فەرمانڕەواییان کرد، (کارلومان) لە ساڵی (٧٤٧ ز) دەستیلەکارکێشایەوە بۆ (پیپن)، بەمجۆرە (پیپن) توانی دەسەڵاتی تەواوەتی لە وڵاتەکەی بگرێتەدەست بەبێ هیچ ترس و بیمێک. هەر لە سەرەتای فەرمانڕەوایەتییەکەیەوە بڕیاریدا کە سنوورێک بۆ (میرۆفنجییەکان) دابنێت؛ ئەوەش لە ڕێگای پەیوەندیخۆشکردن لەگەڵ کەنیسە و گێڕانەوەی هەندێک لە زەویوزارەکان بوون بۆیان کە پێشتر باوکی لێی سەندبوونەوە. ئەوکاتەی (پیپن) دەسەڵاتی وەرگرت؛ (لۆمباردییەکان) باکووری ئیتاڵیایان وەرگرتەوە بۆ خۆیان لە دەوڵەتی خۆرهەلات، کاتێک کە (ئستولف ٧٤٩-٧٥٦ ز) باج و خەراجێکی زۆریان خستەسەر دانیشتووانی (ئیتاڵیا)[٢]، پاپا هەوڵیدا لای ئیمپراتۆری خۆرهەڵات باوەڕ بە (ئستولف) بهێنێت کە لەم ڕامیارییە پاشگەز ببێتەوە؛ بەڵام هەوڵەکانی سەرکەوتوو نەبوو، هەربۆیە پاپا پێویستی بە یەکێک هەبوو کە پشتگیری و هاوکاری بکات و داوای یارمەتی لە پاشاکانی (فەرەنگ) کرد بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن، لە هەمان کاتدا (پیپن) لەبەر بەرژەوەندی خۆی کە چاوی بڕیوە تاجی پاشایەتی؛ نوێنەری نارد بۆ لای پاپا و پێی ڕاگەیاندن: "ئایا ئەوەی نازناوی هەیە هێز و شکۆی نییە و ئەوەی

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٩٠.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص٩١.

هێز و شکۆی هەبێت نازناوی نییە"، بۆیە پاپا فەرمانی دەرکرد کە (پیپن) ببێتە پاشای وڵات، هەر لەوکاتدا پاپا بڕیاری کۆبوونەوەیدا لەگەڵ پیاوە ئایینییەکان و خانەدانەکان، پێشتر ئەوەی دیاربوو؛ پاشا تەنها لە لایەن خانەدانەکانی وڵاتەوە هەڵدەبژێردرا[1]، بەڵام ئێستا بە پێچەوانەی ئەوانەی پێشووەوە بوو؛ چونکە ئیدی لە لایەن پاپا و پیاوە ئایینییەکان و خانەدانەکانەوە هەلبژێردرا، ئەمەش خۆیلەخۆیدا پلەوپایەیەکی زۆر پیرۆزە و بڕیاریاندا بە لادانی پاشای پێشوو و دانانی (پیپن) بە پاشای وڵات، ئەم ئەم ئەرکەیان خستە ئەستۆی وەکوو دابونەریتی ئەوان؛ بەمەش کەس بۆی نەبوو دەسوەربداتە کاری پاشایەتی، چونکە کارێکی پیرۆزە و دەبێت پلەوپایەی پاشا پارێزراو بێت، (پیپن) خۆی بە قەرزاری پاپا دەزانی؛ هەربۆیە دوای سەرکەوتنی بە سەر لۆمباردییەکاندا لە (ئیتاڵیا) هەموو ئەو زەویوزارانەی بەخشییەوە بە پاپا و پاپا ببووە میری دونیا و جێگیری پاشا لەنێوان (ڕاڤنا و ڕۆما)، (پیپن) دواساتی ژیانی لە خزمەتی چاکسازی وڵات تەرخانکردبوو و ڕێگای خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتی مەزنی (شارلەمان) لەنێوان ساڵانی (٧٦٨-٨١٤ ز)[2].

## پەیوەندی نێوان پیپنی سێیەم و کەنیسە

(پیپن) پەیوەندی خۆشبوو لەگەڵ پاپادا، دوای ئەوەی ببووە پاشا و ئەو پلەیە پاپا پێی بەخشی و وەک  یەکەم پاشای فەرەنگەکان خۆرئاوا ناساندی، ئەمە وایکرد کە (پیپن) خۆی بە قەرزاری پاپا بزانێت، هەربۆیە زۆر پشگیری پاپای دەکرد؛ بەتایبەتی لە دژی (لۆمباردییەکان) و هەوڵەکانی بۆ گێڕانەوەی ئەو هەموو زەویوزارانەی (ئیتاڵیا) بۆ پاپا کە (پیپن) پێیدایەوە، لەبەرئەوە دەبینین ئەو کەسایەتییەی کە (پیپن) بۆ خۆی بنیاتینابوو؛ بووە هۆکاری ئەوەی کە کەنیسە لەو سەردەمانە زۆر پێویستیان بە پشتگیری (پیپن) هەبێت، چونکە کێشەی ناوخۆیی زۆریان هەبوو، بەمەش پەیوەندی نێوانیان زۆر ڕووی لە بەهێزی کرد[3].

---

(١) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٢٤.
(٢) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٧٨.
(٣) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٢٤.

(پیپن) توانی کۆمەڵێک چاکسازی گرنگ ئەنجام بدات لەناو کەنیسەدا؛ دوای ئەوەی کە دووچاری گەندەڵی هاتبوون لەناو سیستمی کەنیسە و فەرامۆشکردنی ئەرکەکانی خۆیان، بۆیە (پیپن) هەندێک لەو پیاوە گەندەڵانەی لە کەنیسە دەرکرد و توانی چەند کومەڵەیەکی ئایینی پێکبهێنێت پەیوەست بە (قس واساقفە) بە پاپاوە و دانانی ڕۆژی یەکشەممە بە ڕۆژی پشوو لەو کاتدا (استولف) دەستی دەخستە کاروبارەکانی پاپاوە، هەربۆیە پاپا داوای یارمەتی لە (پیپن) دەکرد لە دژی (استولف) و دەستێوەردانەکانی لە کاروباری ئیتاڵیادا، ئەم کارانەشی وایلێکردبوو کە زۆر خوشەویست نەبێت لای پیاوە خانەدانەکانی (فەرەنگ)، بەڵام فەرەنگەکان دووجار هەڵمەتیان بردە (ئیتاڵیا) بە مەبەستی گەمارۆدانی (استولف) لە (بافیا) و گێڕانەوەی زەوییەکان بۆ پاپا و وەرگرتنی باجێکی زۆر لە (لۆمباردییەکان)[٢].

# بەشی نۆیەم

- شارلەمان (٧٦٨-٨١٤ ز)
- تایبەتمەندییەکانی شارلەمان
- گرتنی ئاکۆیتین
- پەیوەندییەکانی ئیمپراتۆر شارلەمان
- شارلەمان و لۆمباردییەکان لە ئیتاڵیادا
- شارلەمان و سەکسۆنەکان
- شارلەمان و ئاڤارەکان
- شارلەمان و باڤارییەکان
- شارلەمان و موسڵمانەکان لە ئیسپانیا
- ژیانەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی
- بارودۆخی ناوخۆیی
- سیستەمی فەرمانڕەوایەتی شارلەمان
- کاروباری دارایی
- شۆڕشی زانستی سەردەمی شارلەمان
- کۆتایی دەسەڵاتی شارلەمان

## شارلەمان (٧٦٨-٨١٤ ز)

(پێپنی سێیەم) دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت، (شارلەمان) کوڕە گەورەکەی بوو؛ لە ساڵی (٧٤٢ ز) لەدایکبوو، (کارلۆمان) کوڕە بچووکەکەی بوو؛ ئەمیان لە ساڵی (٧٥١ ز) لەدایکبوو، برایەکی دیکەشیان هەبوو بەناوی (پێپن)؛ بەڵام لە تەمەنێکی کەم و لە تافی منداڵیدا کۆچی دوایی کرد. (پێپن) جگە لە کوڕەکانی؛ لە ساڵی (٧٥٧ ز) کچێکیشی بوو کە ناوینا (جیسێلا)، بەڵام ئەو کچەی هەر بە منداڵی ژیانی ڕەبەنی هەڵبژارد لە کەنیسەی کۆشکی پاشادا، کاتێک کە (پاپا ستێڤاڵی سێیەم) تاجی پاشایەتی فەرەنگی لە ساڵی (٧٥٤ ز) کردە سەری (پێپن)؛ (شارلەمان و کارلۆمان) کرانە جێنشینی (ولي العهد). لە ساڵی (٧٦٨ ز)دا (پێپن) کۆچی دوایی کرد و وڵاتەکەی کە بووە میراتی بۆ هەردوو کوڕەکەی لەنێوان خۆیاندا دابەشیانکرد، بەڵام (کارلۆمان) تەمەنی زۆر درێژەی نەکێشا و ئەوە بوو پاش (٣) ساڵ کۆچی دوایی کرد، بەمەش (شارلەمان) بووە تاکە پاشای بێڕکابەری دەوڵەتی (کارۆلینجی)[١].

## تایبەتمەندییەکانی شارلەمان

دیارترین ئەو خەسڵەت و خووڕەوشتانەی شارلەمانی پێناسراوەتەوە؛ کەسێکی باڵابەرز و خاوەن جەستەیەکی بەخۆ و سیما پاشایانە بووە، سەرەڕای ئەوەش چەند خەسڵەتێکی تایبەتی هەبووە کە ئەویش چالاکی و زیندوویێتی و زاڵبوونی دەسەڵاتی بووە بەسەر کاروبارەکاندا، هەر بەم هێز و توانایەش بووە کە توانیوییەتی نزیکەی (٤٢) ساڵ فەرمانڕەوایی ئەورووپا بکات[٢].

بە یەکێک لە ژیرترین پیاوەکانی سەردەمی خۆی ناسراوە، بە ئارامگری و پشوودرێژی ناوبانگی دەرکردبوو؛ چونکە بە سۆزدارانە بڕیاری نەداوە، هەمیشە توانیویەتی زاڵبێت بەسەر هەستەکانیدا، دووجار نەبێت؛ هەرگیز نەگریاوە، جارێکیان

---

(١) اينهارد: سيرة شارلمان، ت: عادل زيتون، الطبعة الاولى، دار حسان، دمشق، ١٩٨٩ م، ص٥٤.

(٢) عفاف سيد صبرة: الامبراطوريتان البيزنطية والرومانية الغربية، زمن شارلمان، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٨٢ م، ص٤٧.

بۆ مردنی دایکی و جارێکیش بۆ مردنی (پاپا هادریانی یەکەم ٧٧٢-٧٩٥ ز) کە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی بووە[١].

(شارلەمان) شارەزاییەکی باشی لە زمانی (یۆنانی)[٢] هەبووە و بەباشی لێی تێگەشتووە، بە سروشتی خۆی حەزی بە هاوڕێیەتی و بەستنی پەیماننامە هەبووە وەک لە شەڕ و کوشتار، هەروەها دۆستان و هاوڕێیانی خۆی خۆشویستووە و ڕێزی لێ گرتوون، هەموو توانای خۆی لەپێناو پاراستنیاندا بەختکردووە. لە هەمان کاتدا (شارلەمان) ڕامیارییەکی زیرەکانە و توانایەکی کەمهاوتای هەبووە لە کاروباری فەرمانڕەوایەتیکردن و بەڕێوەبردندا، مەزنایەتی (شارلەمان) بۆ ئەو دەستکەوتانە دەگەڕێتەوە کە لە بوارەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا بەدەستیهێناوە کە خۆی لە چاکسازییە ناوخۆییەکانی نیشانەیەکی درەوشاوەی سەردەمەکەی بووە، هەروەها جەنگە دەرەکییەکانی کە مۆرکێکی ئایینی وەرگرتبوو؛ وایکردوە لە لایەن هاوسەردەمەکانییەوە وەک ئەفسانە وێنا بکرێت. سەرەڕای ئەوەی گرنگیەکی زۆری داوە بە ژیانی تایبەتی خۆی؛ بەتایبەت منداڵەکانی زۆر خۆشویستوون و بایەخێکی تایبەتی پێداون، هەمیشە لە کاتی نانخواردندا لەگەڵیانبووە، هێندە پەیوەست بووە پێیانەوە لە کاتی گەشتەکانیشیدا بردوونی لەگەڵ خۆیدا، سەرەڕای ئەوەش مامۆستای تایبەتی بۆ کوڕەکانی دابینکردبوو. جێگەی ئاماژەیە کە ئەم مامەڵەیەی بەتەنها بۆ کوڕەکانی نەبووە؛ بگرە بۆ کچەکانیشی بە هەمان جۆر بووە و زۆری خۆشویستوون کە سەرچاوەکان ئاماژە بە جوانییەکەیان دەکەن. (شارلەمان) لە سەرەتاوە ئەو ڕاستییەی سەلماند کە شیاوی ئەو تەختی فەرمانڕەواییەیە، جگە لەوەی کەسێکی جەربەزە و لەسەرخۆ بووە؛ ڕامیاریزانێکی هەڵکەوتوو و بەئەزموون بوو لە بواری بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا. لە سەردەمی خۆیدا لە مەیدانی سەربازیدا نموونەیەک بوو کە نەدەکرا فەرمانەکانی جێبەجێ نەکرێت، کاری هەرەگەورە و بەرچاوی (شارلەمان) ئەوەبوو کە لە بواری ناوخۆ و دەرەوەدا سەرکەوتوو بوو، لە بواری کاروباری ناوخۆییدا جێپەنجەی بۆ هەمیشە دیاربوو،

---

(١) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص٨٨.

(٢) زمانی یۆنانی زمانی نووسینەوەی (ئینجیلەکان و پەیمانی نوێ) بوو، هەربۆیە وەک زمانێکی پیرۆز و گرنگ لەپاڵ زمانی (لاتینی) بەکارهاتووە لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپادا.

شەڕەکانیشی کە چوارچێوەیەکی ئایینی وەرگرتبوو؛ لە سەردەمی خۆیدا هەمووی بە چاوێکی سەرکەوتووانەوە دەیاننرخاند[1].

سەرکەوتنەکانی لە بواری ڕامیاری و سەربازی دەسەڵاتی شارلەمانی زۆر فراوانکرد؛ بە جۆرێک لە شاخەکانەوە هەتا ڕووباری (ئاڵپ) و لە دەریای ڕەشەوە هەتا ڕووباری (تیبر) گشتی بەشێک بوون لە قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییەکەی، دەتوانین بڵێین ئەم ڕووبەرە وایکردبوو کە هیچی لە ئیمپراتۆری ڕۆمانی خۆرئاوای پێشوو کەمتر نەبێت! لە ساڵی (٧٩٩ ز) بارودۆخی (پاپا لیۆی سێیەم) زۆر خراپ بوو، کڵێسای (کاسۆلیکی) چەند ڕووداوێکی سەخت و کوشندەی بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت کاتێک پاپا لەگەڵ چینی خانەدانە مەزنەکانی (ڕۆما) لە کێشەدابوو، چونکە پێیان قورسبوو دەسەڵاتەکانیان لە لایەن پاپاوە کەمبکرێتەوە. هەربۆیە لە لایەن ئوسقوفە مەزنەکانەوە بە داوێنپیسی تۆمەتباریان کرد و جەنگیان لە دژی پاپا ڕاگەیاند، لەبەر ئەوەش کەمینێکیان بۆ دانا و دەسگیریان کرد. بارودۆخەکە بە جۆرێک تێکچووبوو؛ پاپا ناچاربوو کە هەڵبێت بۆ (بادربۆرن)، لەوێشەوە داوای یارمەتی لە (شارلەمان) کرد، (شارلەمان) ئەمەی بە دەرفەت زانی و چووە (ڕۆما) و بڕیاری بەستنی دادگایەکی ئاشکرایدا، تێیدا بێتاوانی پاپای لە هەموو تۆمەتەکان ڕاگەیاند و فەرمانی دوورخستنەوەشی بۆ دوژمنەکانی دەرکرد[2].

لەپاش ئەم ڕووداوانەی کە باسمانکرد؛ لە جەژنی سەریساڵی (٨٠٠ ز)دا؛ (شارلەمان) سەردانی کەنیسەی (قەدیس پەترۆس)ی کرد لە (ڕۆما)، لە کاتێکدا کە ئیمپراتۆر (شارلەمان) لەسەر ئەژنۆ کەوتبووە سەر چۆک بەرامبەر قوربانگا (المذبح)[3]؛ پاپا بەرەولای هات و تاجی لەسەرنا و بۆی پاڕایەوە وەکوو (ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمان) سەرکەوتوو بێت، دەڵێن تەنانەت خودی (شارلەمان) ئەمەی بەلاوە سەیربووە! ئەمەش بۆ یەکەمجار بوو پاشایەکی (جەرمانی) ئەم نازناوەی پێ ببەخشرێت[4].

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٨٩.

(٢) اينهارد: سيرة شارلمان، ص٥٤.

(٣) لە شێوەی مێزی نانخواردندا بووە و بۆ مەبەستی پێشکەشکردنی دیاری و قوربانی بە ئامانجی ئایینی یاخود جێگایەکی پیرۆزە بۆ سرووتە ئایینییەکان و ئەم قوربانگایە لە پەرستگا و کەنیسەکاندا هەبووە.

(٤) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٠٤.

هەرچەندە ئەمە پێچەوانەی نەخشەکانی (شارلەمان) بوو؛ پاپا بە نەشارەزایی ئەم کارەی ئەنجامدا، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیربچێتەوە کە ئەم کارەی کڵێسا بۆ بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی بوو لەگەڵ (جەرمانەکان)؛ بۆ ئەوەی بیانکات بە پارێزەری کڵێسا لە ئەورووپای خۆرئاوادا لەپێناو ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکان[1].

دوای بەخشینی نازناوی ئیمپڕاتۆر بە (شارلەمان) لە لایەن پاپاوە؛ ئیمپڕاتۆری (بێزەنتییەکان) لە قوستەنتینییەوە خۆی بە ئیمپڕاتۆری خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەزانی. (شارلەمان) لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ بێزەنتییەکاندا زۆر وریا و دیپلۆماسی بوو، حەزی نەدەکرد بە هۆی نازناوی ئیمپڕاتۆرییەوە هێرش بکاتە سەر (قوستەنتینییە) کە (پاپا لیۆی سێیەم) پێی بەخشیوە و ئەو نازناو بەخشینەشی بە مەبەستی تایبەتی خۆی بووە. هەرچەندە بۆ یەکخستنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی بیری لەو بابەتە کردووە؛ بەڵام کارێکی لەو جۆرە ڕوویندا و (شارلەمان) بۆ یەکێتی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بیری لە پڕۆژەیەکی دیکە کردەوە کە ئەویش پڕۆژەی ژنخوازی ڕامیاری بوو لە لەگەڵ (ئیرین) کە ژنە ئیمپڕاتۆری (بێزەنتی) بوو[2].

## گرتنی ئاکۆیتین

هەرچەندە (چارل مارتێل) ناوچەی (ئاکۆیتین)ی لە داگیرکاری موسڵمانانەکان ڕزگارکرد؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (ئاکۆیتین) یەکێک بوو لەو ناوچانەی (فەرەنگ) کە ئاڵۆزی و ئاژاوەی تێدابوو، کاتێک (وەیفار) کاروباری ئەو ناوچەیەی گرتەدەست؛ بە دەسەڵاتداریێتی (فەرەنگ) و پیاوە ئایینییەکان لەوێ ڕازی نەبوو، هەربۆیە لە ساڵی (٧٦٠ ز) بەدواوە دەستیگرت بەسەر زەویوزاری کڵێساکانی فەرەنگدا، ئەو کارانەی (وەیفار) ناڕەحەتییەکی زۆری بۆ (پێپن) دروستکرد کە لە ڕاستیدا دەبووە مەترسییەک بۆی، چونکە (پێپن) وەک پاشایەکی دەسەڵاتدار؛ پاراستنی کڵێسا و پیاوە ئایینییەکانی ڕۆمای لەئەستۆبوو. لە ئەنجامی ئەو ناکۆکییەدا شەڕێک لەنێوان

---

(١) جیفری برۆن: س. پ، ل١٣٠.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١١٣.

فەرەنگەکـان و ئاکۆیتینەکانـدا بەرپـابوو، دوای (٢) سـاڵ بە هـۆی سـەرقاڵبوونی پیپنەوە بە شەڕ لەگەڵ باڤارییەکاندا شەڕەکە ڕاگیرا[1].

لە ساڵی (٧٦٥ ز) سەرلەنوێ شەڕی نێوانیان دەستی پێ کردەوە و لە ماوەی (٣) سـاڵدا (پێـپن) تـوانی سـەرکەوتن بەدەسـتبهێنێت و (ئـاکوێتین) بخـاتە ژێـر دەسـەڵاتدارێتی فەرەنگییەکـانەوە، ئەو بـارودۆخە بەو جـۆرە مـایەوە هەتـا هاتنەسەرکاری (شارلەمان) و (کارلۆمان)ی برای. لە ساڵی (٧٦٩ ز)دا شۆڕشێک لە (ئاکۆیتین) لەژێر فەرماندەیی (قەشە هۆنرۆڵد) کە باوکی (وەیفار) بوو ڕوویدا، بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەو شەڕە؛ (شارلەمان) داوای یارمەتی لە (کارلۆمـان)ی برای کـرد، بەڵام ئەو بەپیـر بـانگەوازەکەیەوە نەچـوو! هۆکـاری ئەوەش پەیوەنـدی بە چـۆنییەتی وەرگرتنـی مـافە میراتییەکەیـانەوە هەبـوو، بەڵام لەگەڵ یـارمەتینەدانی کارلۆمانیشدا؛ هێزەکانی (فەرەنگ) توانیان (هۆنرۆڵد) لە وڵاتەکە وەدەرنێن[2].

## پەیوەندییەکانی ئیمپراتۆر شارلەمان

### یەکەم/ شارلەمان و لۆمباردییەکان لە ئیتاڵیادا

لە سـاڵی (٧٧٠ ز)دا (شـارلەمان) کچـی پاشـای لۆمباردییەکـان (دیسـیدریۆس)ی کردە هاوسەری خۆی، هەرچەندە دایکی زۆری لێ کرد کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ژنەدا بکات؛ بەڵام (پاپا ستیڤانی سێیەم) دژی بوو، چونکە پێی وا بوو ئەو ژنهێنانە وەک هاوپەیمـانییەک وایە لەنێـوان (فەرەنـگ و لۆمباردییەکـان) دژ بە دەسـەڵاتی پاپاکـان، ئەم کێشـانە وایـانکرد کە زۆر نەخایەنێـت (شـارلەمان) لە هاوسـەرەکەی جیابێتەوە، ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵییەکی زۆر لای پاپاکان، کاتێک (کارلۆمـان) لە ساڵی (٧٧١ ز) کۆچی دوایی کرد؛ ژنەکەی کەوتە دوژمنایەتی (شارلەمان)، چونکە لە مـافی فەرمـانڕەوایەتی تەختـی پاشـایەتی کوڕەکـانی بێبەش کردبـوو، ئەو خـانمە (واتە ژنەکەی کارلۆمـان) خـۆی دایەپـاڵ ژنە جیـابووەوەکەی (شـارلەمان) لە شـاری (پاڤیـا)ی پـایەختی (لۆمباردییەکـان)، وەک دەردەکەوێـت تـوانی ڕۆڵێکـی سـەرەکی

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٧٤.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩٠.

فەرەنگەکـان و ئاکۆیتینەکانـدا بەرپـابوو، دوای (٢) سـاڵ بە هـۆی سـەرقاڵبوونی پیپنەوە بە شەڕ لەگەڵ باڤارییەکاندا شەڕەکە ڕاگیرا[١].

لە ساڵی (٧٦٥ ز) سەرلەنوێ شەڕی نێوانیان دەستی پێ کردەوە و لە ماوەی ٣) ساڵدا (پێپن) توانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت و (ئاکوێتین) بخاتە ژێر دەسەڵاتداریێتی فەرەنگییەکانەوە، ئەو بارودۆخە بەو جۆرە مایەوە هەتا هاتنەسەرکاری (شارلەمان) و (کارلۆمان)ی برای. لە ساڵی (٧٦٩ ز)دا شۆڕشێک لە (ئاکۆیتین) لەژێر فەرماندەیی (قەشە هۆنرۆڵد) کە باوکی (وەیفار) بوو ڕوویدا، بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەو شەڕە؛ (شارلەمان) داوای یارمەتی لە (کارلۆمان)ی برای کرد، بەڵام ئەو بەپیر بانگەوازەکەیەوە نەچوو! هۆکاری ئەوەش پەیوەندی بە چۆنییەتی وەرگرتنی مافە میراتییەکەیانەوە هەبوو، بەڵام لەگەڵ یارمەتینەدانی کارلۆمانیشدا؛ هێزەکانی (فەرەنگ) توانیان (هۆنرۆڵد) لە وڵاتەکە وەدەرنێن[٢].

## پەیوەندییەکانی ئیمپراتۆر شارلەمان

### یەکەم/ شارلەمان و لۆمباردییەکان لە ئیتاڵیادا

لە ساڵی (٧٧٠ ز)دا (شارلەمان) کچی پاشای لۆمباردییەکان (دیسیدریۆس)ی کردە هاوسەری خۆی، هەرچەندە دایکی زۆری لێ کرد کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ژنەدا بکات؛ بەڵام (پاپا ستیڤانی سێیەم) دژی بوو، چونکە پێی وا بوو ئەو ژنهێنانە وەک هاوپەیمانییەک وایە لەنێوان (فەرەنگ و لۆمباردییەکان) دژ بە دەسەڵاتی پاپاکان، ئەم کێشانە وایانکرد کە زۆر نەخایەنێت (شارلەمان) لە هاوسەرەکەی جیاببێتەوە، ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵییەکی زۆر لای پاپاکان، کاتێک (کارلۆمان) لە ساڵی (٧٧١ ز) کۆچی دوایی کرد؛ ژنەکەی کەوتە دوژمنایەتی (شارلەمان)، چونکە لە مافی فەرمانڕەوایەتی تەختی پاشایەتی کوڕەکانی بێبەش کردبوو، ئەو خانمە (واتە ژنەکەی کارلۆمان) خۆی دایەپاڵ ژنە جیابووەوەکەی (شارلەمان) لە شاری (پاڤیا)ی پایتەختی (لۆمباردییەکان)، وەک دەردەکەوێت توانی ڕۆڵێکی سەرەکی

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٧٤.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩٠.

ببینێت لە جۆش و خرۆشدانی؛ یاخود هاندانی پاشای (لۆمباردییەکان) دژ بە (شارلەمان)[1].

سەبارەت بەو بارودۆخ و گۆڕانکاریانە؛ (شارلەمان) ڕازی نەبوو کە (دێسدریوس) ژن و منداڵەکانی (کارلۆمان)ی برای لای خۆی بهێڵێتەوە و بیانحەوێنێتەوە، هاوکات یارمەتیدانی پاپا کاسۆلیکەکان بۆ (شارلەمان) کە خۆشی سەر بە ئایینزای (کاسۆلیکی) بوو دژ بە (لۆمباردییە ئاریۆسەکان) زیاتر لە پلەوپایەی شارلەمانی بەرزدەکردەوە لەپێش کڵێسا و تەواوی گێتی مەسیحییەتدا. (شارلەمان) هێزەکانی خۆی لە دەوروبەری شاری (جنێڤ) کۆکردەوە و لە ساڵی (٧٧٣ ز)دا بەرەو چیاکانی (ئاڵپ) ڕۆیشتن و شاری (پاڤیا)ی پایتەختی لۆمباردییەکانی بۆ ماوەی (٧) مانگ گەمارۆدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە زیاتر (لۆمباردییەکان) نەتوانن چیدی بەرامبەر بەو گەمارۆیە خۆڕاگرن و ئەوە بوو لە ساڵی (٧٧٤ ز)دا (پاڤیا) کەوتە ژێردەستی (شارلەمان)[2].

سەبارەت بە پاشای (لۆمباردییەکان)؛ (دیسیدریۆس) بە فەرمانی (شارلەمان) نێردرایە یەکێک لە دێرەکان بۆ ئەوەی ئەو ژیانەی ماوییەتی لەوێ بەسەریبەرێت، لێرەوە (شارلەمان) کۆتایی بە پاشای (لۆمباردییەکان) هێنا و خۆی بە پاشای ئەوانیش ناساند و نازناوی فەرمی بوو بە (پاشای فەرەنگ و لۆمباردی و ڕۆمانەکان). لێرەشەوە درێژەی بە فراوانخوازییەکانیدا لە (ئیتاڵیا) و ئەوە بوو توانی دەسەڵاتی بگەیەنێتە (ڤینیسیا و لێوارەکانی دەڵماشیا و دوورگەی کۆرسیکا) و هەموو ئەو ناوچانەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەو جۆرە و لەو ناوچانەدا سنووری دەسەڵاتەکەی بووە هاوسنوری ئیمپراتۆرییەتی (بیزەنتی)[3].

لە ماوەی گەمارۆی (باڤیا)دا و لە ئاهەنگی جەژنی (مەسیح) کە لە ساڵی (٧٧٤ ز) بەڕێوەچوو؛ چووە ڕۆماوە و ئەوە بوو پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێ کرا و لە لایەن پاپا و کەنیسەی کاسۆلیکییەوە؛ هەر لەو دووتوێیەشدا وەک پارێزەری کەنیسە و (مەسیحییەت) ناسێنرا. جارێکیان بۆ پاپای نووسیبوو: "یەکێک لە

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٧٦.
(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٠٩.
(٣) جیفری برون: س. پ، ص١٢٧-١٢٨.

ئەركەكانی پاشا ئەوەیە بەرگری لە كەنیسەی پیرۆزی خودا بكات و بە هێزی شمشێر بیپارێزێت و بیروباوەڕی (كاسۆلیكی) بچەسپێنێت، ئەركی پاپاش ئەوەیە بە نوێژ و پاڕانەوە و جێبەجێكردنی یاساكانی كەنیسە پشتگیری لە پادشا بكات". ئەگەر لە ئەنجامی شەڕەكان وردببینەوە؛ دەبینین كە (شارلەمان) پشتیوانی تەواوی لە پاپاكان كردووە و لە هەمان كاتدا كۆتایی بە دەسەڵاتی دەوڵەتی (ئایینزای ئاریۆسی) هێنا كە ئەوەش سەركەوتنێكی مەزن بوو بۆ پاپاكان و سەرجەمی گێتی مەسیحی! بە كورتی و بە نەمانی دەوڵەتی (لۆمباردییەكان) هاوپەیمانییەتی لەنێوان پاپاكان و شارلەماندا نوێ دەبێتەوە[1].

### دووەم/ شارلەمان و سەكسۆنەكان

گرنگترین و خوێناویترین جەنگەكانی لە دژی (سەكسۆنییەكان) بوو؛ چونكە زۆر ڕقی بەرامبەریان هەبوو، (ئینهارد)ی مێژوونووسی (شارلەمان) بەوە پەسنیان دەكات كە گەلێكن بە دڵڕەقی ناسراون، هاوپەیمان و دڵسۆزی شەیتانن و دەیپەرستن، زۆر دوژمنی مەسیحییەتن و هەروەها هەموو یاسا مرۆییەكان پێشێل دەكەن[2].

ئامانجی (شارلەمان) لە جەنگی دژی (سەكسۆنەكان) تەنها پاراستنی ئەو سنوورە بەرفراوانەی ئیمپڕاتۆرییەتەكەی نەبوو؛ بەڵكوو دەیویست بە هێز ئایینی (مەسیحییەت) بەسەریاندا بسەپێنێت، چونكە (سەكسۆنەكان) تەنها میللەتی (جەرمانی) بوون كە لەسەر بتپەرستی مابوونەوە. شەڕی ئەمان لەگەڵ (سەكسۆنەكان) نزیكەی (٣) چارەگە سەدەی خایاند، واتە لە ساڵی (٧٢٢-٨٠٤ ز)، لەو ماوەیەدا (شارلەمان) بۆ خۆی سەركردایەتی (١٣) هێرشی كردووە. هۆكاری سەرەكی ئەو شەڕانەش بە پلەی یەكەم ئەوەبوو كە (شارلەمان) بەردەوام هەوڵی دەدا هێرش و پەلاماری (سەكسۆنەكان) بۆ سەر سنوورەكانی ڕابگرێت، سەرئەنجام لە ساڵی (٧٧٦ ز) توانی ناوچەی (دیستیڤالیا) لەژێر دەسەڵاتی (سەكسۆنەكان) دەربهێنێت. ئەو موژدەدەرانەی كە لە لایەن شارلەمانەوە نێردرابوون بۆ بڵاوكردنەوەی ئایینی (مەسیحی) لە ناو بتپەرستەكانیاندا؛ لە لایەن (ویدیكیند)ی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٨٩.

(٢) اينهارد: سيرة شارلمان، ص٦٧.

سەرکردەی سەکسۆنەکانییەکانەوە دەسدرێژییەکی زۆریان کرابووەسەر، بۆیە (شارلەمان) لە شەڕێکدا کە بە شەڕی (بۆخوولت) بەناوبانگە توانی (ویدیکیند) و سوپاکەی دووچاری شکبست بکات[1].

لەساڵی (٧٨٤ ز)دا (سەکسۆنەکان) هێرشیانکردە سەر هێزەکانی (شارلەمان) کە لەوکاتەدا لەگەڵ (سلاڤییەکان) لە شەڕدا بوون، ئەمەش زیاتر ڕق و کینەی شارلەمانی زیاتر کرد کە بە شوێنیان بکەوێت و لە ئەنجامدا توانی شکست بە سەکسۆنەکان بهێنێت، تەنها لە شاری (ڤێردین) هێزەکانی شارلەمان توانیان (٥٠٠٠) کەس لە (سەکسۆنەکان) بکوژن، هەروەها لە ساڵی (٧٩٤ ز) (شارلەمان) ناچاربوو نزیکەی (٧٠٠٠) سەکسۆنی لە یەکدی جیابکاتەوە و بڵاوەیان پێ بکات؛ بە ئامانجی ئەوەی ڕێگە بە هێرش و دەستدرێژییەکانیان بگرێت، دوا هێرشیش لە ساڵی (٨٠٤ ز)دا بوو کە (سەکسۆنەکان) ئیدی سەریان بۆ قەڵەمڕەوییەتی (شارلەمان) نەویکرد[2].

### سێیەم/ شارلەمان و ئاڤارەکان

(ئاڤارییەکان) لە ئاسیای ناوەڕاستەوە گەیشتبوونە ئەوێ، ئەمانەش لەو هۆز و گروپە مەنگۆلیانە جیانەکرانەوە، پێست زەرد و چاو خواروخێچ و کوونەسوژنەیی بوون و بە ئەسپسواری و ڕمبازێن بەناوبانگ بوون، هەمیشە ڕەوەند و کۆچەرو بێ خاک و دەوڵەت بوون، کۆمەڵێک هۆزی جیاواز بوون کە هەریەکەیان گەورەیەکیان هەبووە و بە (خاقان) ناوبانگی دەرکردووە، ئەمانە بۆ یەکەمجار لە کۆتایی سەدەی شەشەمی زایینی لە ئەورووپا لە ڕووی ڕامیارییەوە دەرکەوتن. لە سەردەمی ئیمپراتۆر (هیرکلیۆس) لە ساڵی (٦٢٦ ز)دا مەترسیان بۆ (قوستەنتینییە) هێنایەپێشەوە، بەڵام دوای وەرگرتنی سەرانە لێیان؛ وازیان لە پایتەختی (بیزەنتی) هێنا[3].

لە کۆتاییدا ئەم ئاڤارییانە لە دەوروبەری ڕووباری (سییس) لە باکووری شاری (بەلگراد)ی ئێستا نیشتەجێبوون، هەموو ژیانیان بە ڕەوەندی و هێرش و پەلاماردان

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص١٥٢.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٠.

(٣) السيد الباز العريني: تأريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٧٤.

و تـالانكردن بردووەتەسـەر؛ بە جۆرێـک کە هەر لەم ڕێـگەیەوە ببـوونە خـاوەنی خەزنەیەکی مەزن و زێڕێکی زۆر کە لە ماوەی دوو سەدەدا لە ئەنجامی تالانکردنی دراوسێکانیاندا بەدەستیانهێنابوو. (ئاڤارییەکان) لە ساڵی (٧٨٨ ز)دا بەرەو (باڤاریا) کەوتنەڕێ، ئەمەش نـاڕەحەتییەکی زۆری بـۆ (شـارلەمان) هێنایەپێشـەوە؛ هەربۆیە بڕیاریـدا لەو هێـرش و دەسـتدرێژیکردنە بیانوەسـتێنێت، لەو بـارەیەوە خاقـانی ئاڤارییەکـانی ئاگـادارکردەوە کە بەرەو وڵاتـی خۆیـان بکشـێنەوە؛ بەڵام (خاقـان) داواکەی (شـارلەمانی) ڕەتکـردەوە، ئەمەش زیـاتر زەمینـەی بـۆ شـەڕی نێـوان هەردوولا خۆشکرد، جێگەی ئامـاژەیە هێزە (ئاڤارییەکـان) بێبەرنـامە و بێسـەروبەر بوون، بە پێچەوانەی لەشکری (شارلەمان) کە ڕێکخـراو و ڕێکوپێـک و دامەزراوەیی بوون، بۆیە (شارلەمان) بەرنامەیەکی دانا کە لەشکرەکەی بەسەر چەند کەرتێکدا دابەش بکـات، هەربـۆیە لە چەنـد شـوێنێکی جیـاوازەوە هێرشـیان کردەسـەر (ئاڤارییەکان). شایانی باسە (ئاڤارییەکان) ترسێکی گەورەیان لێنیشت و لە مەیدانی شـەڕەکەدا ژمـارەیەکی زۆریـان کـوژران و ژمـارەیەکی باشیشـیان لـێ بەدیلگیـران، هەرچـی سـامان و خەزنە زێـڕیش هەبـوو؛ بەبـێ هـیچ بەرەنگـاربوونەوەیەک لێیانسـەندنەوە و بەمەش بەبـێ هـیچ ڕووبەڕووبـوونەوەیەکی ئەوتـۆ؛ خۆیـان بەدەستەوەدا و چوونە سەر ئایینی (مەسیحی)، بەوشێوەیە شوێنەواریان بڕینەوە و ئەوانەشی کە مابووە لەگەڵ میللەتەکانی دیکەی ناو ئەورووپا تێکەڵ بوون[١].

### چوارەم/ شارلەمان و باڤارییەکان

بەرلەوەی (شـارلەمان) لەسـەر تەختـی فەرمـانڕەوایی دەسـتبەکاربێت؛ بە مـاوەیەکی کەم (باڤاریـا) چوونەسـەر ئـایینی (مەسـیحی) و لە ڕووی ڕامیاریشـەوە کەوتـنە ژێـر دەسـەڵاتداریتی دەوڵەتـی (فەرەنـگ). لە شـەڕەکانی دژ بە (سەکسـۆنییەکان)؛ (دۆقـی باڤاریـا) کە (تاسـیلۆ) بـوو جەربەزەیـی و ئـازایەتییەکی زۆری نوانـدبوو، کاتێـک شـەڕی دژ بە (سەکسـۆنییەکان) کۆتـایی هـات؛ ئەودەمە (شـارلەمان) بۆیـدەرکەوت کە زنجیرەیەک پیلان لە دژی ئەنجام دەدرێن. (تاسـیلۆ) یەکێـک لەو پیلانگێـڕانەیە و (شـارلەمان) هاتەسـەر ئەو بیـروڕایەی کە (تاسـیلۆ) خیانەتی لێ دەکات، پاپا لەم سۆنگەیەوە بڕوای بە بۆچوونەکانی (شارلەمان) کرد،

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩٤.

هەربۆیە (پاپا) ڕاستەوخۆ هەڕەشەی لێ کردن کە هەموو مافێک لە (باڤارییەکان) دەسێنێتەوە گەر بەتەواوی سەر بۆ (شارلەمان) نەوی نەکەن، لەوبارەوە لە کۆبوونەوەیەکدا (تاسیلۆ) بانگێشتکرا؛ بەڵام هەموو ئەو هەڕەشەکردنانەی ڕەتکردەوە، ئەمەش ڕێی بۆ بەرپاکردنی شەڕێک کردەوە لە لایەن شارلەمانەوە دژ بە (باڤارییەکان)[1].

(باڤارییەکان) هیچ ئامادەبوونێکیان دژ بە (شارلەمان) پیشان نەدا؛ هەربۆیە (تاسیلۆ) تەنها ڕێگەی خۆڕادەستکردنی بە (شارلەمان) بۆ مایەوە و ئەوە بوو لە ساڵی (٧٨٩ ز)دا (باڤاریا)ی ڕادەستکرد. (شارلەمان) ڕێزی ئەم کارەی لەبەرچاو بوو و ئەوە بوو بەڕێوەبردنی ناوچەکەی دایەوە دەست (تاسیلۆ)؛ بەو مەرجەی هەموو فەرمانەکانی بەجێبگەیەنێت، بەرامبەر بەوەش (تاسیلۆ) کوڕەکەی وەک دەستبەسەرێک لای (شارلەمان) هێشتەوە، بەڵام ئەم پەیمانەی نێوانیان زۆرینەخایاند؛ چونکە (تاسیلۆ) سەرلەنوێ هەڵگەڕایەوە و هەموو ئەوانەی کە سەر بە (شارلەمان) بوون لە باڤاریاوە بەرەو (ئاڤار) دەریکردن. ئەم هەڵوێستەی (تاسیلۆ)؛ شارلەمانی زۆر نارەحەت کرد، بەڵام بە پیلان و فێڵ (تاسیلۆ)ی بانگهێشتی کۆبوونەوەیەک کرد و لە کۆبوونەوەکەدا دەسگیری کرد و لە دادگادا فەرمانی کوشتنی بەسەردا سەپێندرا. بەڵام (شارلەمان) دووبارە بەخشینی تاسیلۆی بەڕەواتر بینی و کردییە خوێندکارێکی کڵێسا و خۆی و خێزانەکەی ناردە دێرێک هەتا ئەو ژیانەی کە ماویانە لەوێ بیبەنەسەر، ئیدی لەوکاتەوە (باڤاریا) بووە بەشێک لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی پاشایەتی (فەرەنگی)، هەروەها لە ڕووی کارگێڕییەوە کرایە چەند بەشێک و بۆ هەریەکێکیان دەسەڵاتدارێکی دانا کە لەژێر فەرمانڕەوایەتی فەرەنگەدا بن[2].

## پێنجەم/ شارلەمان و خیلافەتی عەبباسی

لەمیانەی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانیدا؛ (شارلەمان) پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی (هاروون ئەلرەشید) دروست کرد کە فەرمانڕەوای هەموو

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٠.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٩٦.

خۆرهەڵاتی دەکرد جگە لە (هندستان)، بنەمای پەیوەندییەکەیان بەند بوو لەسەر ڕێزگرتن و دۆستایەتی.

لە ساڵی (٧٩٧ ز)دا (شارلەمان) شاندێکی ناردە لای (هاروون ئەلڕەشیدی خەلیفەی عەبباسی) کە کۆمەڵێک دیاریان بۆ خەلیفە هێنابوو، لە بەرامبەردا (هاروون ئەلڕەشید) نوێنەری خۆی نارد بۆ لای (شارلەمان) و ئەوە بوو لە ساڵی (٨٠١ ز)دا وەڵامی ئەو دۆستایەتییەی دایەوە. دووەمجار (شارلەمان) لە (٨٠٢ ز) شاندێکی دیکەی بە کۆمەڵێک دیارییەوە ناردەوە بۆ لای (خەلیفە عەبباسی) بە مەبەستی دڵنیابوون لە مافی مەسیحییەکانی سنووری (خیلافەتی عەبباسی)؛ لە بەرامبەردا (هاروون ئەلڕەشید) بۆ دڵنیابوونی ئیمپراتۆری (کارۆلینجی) لە مافی مەسیحییەکان؛ شاندی دووەمی بۆ لای (شارلەمان) نارد لەگەڵ شاندە هاتووەکەدا و ئەوە بوو کاتژمێرێکی ئاوی و شەترەنجێکی لە (عاج) دروستکراوی بۆ نارد، هەندێک لە سەرچاوەکان دەڵێن (شارلەمان) داوای (فیل)ی لە (هاروون ئەلڕەشید) کردووە؛ ئەویش ئەو تەنها فیلەی کە هی خۆی بووە بە دیاری بۆیناردووە[1].

ئەوەی وایکردبوو پەیوەندی دۆستانە لەنێوان (شارلەمان) و (هاروون ئەلڕەشید) دروست ببێت؛ بە شێوەیەکی گشتی ئەمانە بوون:

١. (شارلەمان) دەیویست بەم پەیوەندییە ئاسایش و ئارامی دابین بکات بۆ حاجی و بازرگانە ئەوروپییەکان کە سەردانی شوێنە پیرۆزەکانیان دەکرد لە خۆرهەڵات، هەروەها دابینکردنی ئارامی مافی کەمینە مەسیحییەکان کە لە سنووری خیلافەتی عەبباسی نیشتەجێبوون.

٢. ئامانجێکی دیکەی (شارلەمان) سنووردانان بوو بۆ زیاتر بەهێزنەبوونی دەوڵەتی (بێزەنتی) و ئاوڕدانەوەی لە ناوچەکانی ناوەڕاست و خۆرئاوای ئەوروپا.

١. (هارون ئەلڕەشید) دەیویست بە نزیکبوونەوەی لە (شارلەمان) دژایەتی دەوڵەتی (ئومەوی) لە (ئەندەلووس) بکات و سنوور لەبەردەم بەهێزبوونیاندا دابنێت، هەروەها لە لایەکی دیکەوە دژایەتی و ململانێی بەردەوام هەبوو لەنێوان (خیلافەتی عەبباسی) و ئیمپراتۆرییەتی (بێزەنتی)دا؛ هەربۆیە دەیویست بە نزیکبوونەوەی لە (شارلەمان) درزی نێوان بێزەنتە و خۆرئاوا فراوانتر بکات و

---

(١) اینهارد: سيرة شارلمان، ص١٠٤-١٠٥.

یەکگرتنیـان نەیەتەدی کە دواجـار دەبـوونە مەترسـییەکی مەزن لەسـەر (خیلافەتـی عەبباسی)[1].

پـاش ئەوەی (شـارلەمان) سـەردەمێکی زۆری بە فراوانکردنـی دەوڵەتەکەیەوە بەسەربرد؛ پێی وا بوو کە پێویستە کاتەکانی دیکەی بۆ پشوودان و ژیانی خۆی تەرخان بکات، بەڵام پێدەچوو کە ئەو بارودۆخە هەتا سەر نەبێت؛ چونکە ڕۆژانە گیروگرفتـی دیـکەی بـۆ دروسـت دەبـوو، هەروەک (ئاینهـارد) کە مێژوونووسـێکی (شـارلەمان) بـوو باسـی دەکات، هەروەهـا ژمـارەیەک لە سـەرچاوە عەرەبییەکانیش هەمـان زانیـاری ئەو دەگێـڕنەوە کە ژمـارەیەک دەسـتە و گرووپـی موسـڵمانان لە ئەنـدەلووس (عەبـدولڕەحمانی داخـل ١٣٨-١٧٢ ک/ ٧٥٦-٧٨٨ ز)ی فەرمانڕەوایـان بەوە تاوانبـار دەکـرد کە بەزۆر دەسـەڵاتی گرتووەتەدەسـت، کاتێـک کە داوای یارمەتیان لە (خەلیفەکانی عەبباسی) کردووە نائومێد بوون، بۆیە بۆ پشتیوانیکردن و بەدەستهێنانی یارمەتی؛ پەنایان بردووەتە بەر (شارلەمان)[2].

بـۆ ئەم مەبەسـتە (شـارلەمان) لە سـاڵی (٧٧٨ ز)دا لەشـکرێکی زۆری لە (باڤاریەکان و لۆمباردییەکان و بورگوندییەکان) و خەڵکانی دی پێکەوەنا و بەسـەر چەنـد هێزێکـدا دابەشـیکردن، بەڵام لەبەرئەوەی بەجێهێنـانی ئەو بەرنـامەیەی لەو کاتەیدا نەبوو کە دەستنیشـانیکردبوو؛ سـەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، لە هەمـان کاتـدا شاری (سەرکەسـتە) بەرگرییەکی گەورەی وایانکرد کە (شـارلەمان) و لەشکرەکەی ناچـاربوون بکشـێنەوە، لە کـاتی کشـانەوەی (شـارلەمان) هۆزەکـانی (باسـک) هێرشیانکردە سەر پشتەوەی لەشـکرەی (شـارلەمان)، ئەو هـۆزانە لە گەلێک شـوێندا بۆسـە کەمینیـان بـۆ دانـابوون؛ لە ئەنجامـدا توانیـان ئەو بەشـەی لەشـکرەکەی (شارلەمان) لەناوبەرن و هەرچییەکیشیان هەبوو تاڵانی بکەن، ئەو شـەڕە لە مـانگی (٧٧٨/٨ ز)دا ڕوویدا و لە مێژوودا بە شەڕی (ڕۆنتۆ) ناوبانگی دەرکردووە[3].

(شـارلەمان) بەو شکسـتە ڕازی نەبـوو؛ بـۆیە بە لەشـکرێکی مەزنەوە بەرەو (ئیسـپانیا) پێشـڕەوی کـرد، لە ئەنجامـدا تـوانی زنجیـرە کەناراوەکـانی بـاکووری

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٩٦.

(٢) عبدالمجيد نعنعي: تاريخ الدولة الاموية في بلاد الاندلس، دار النهضة العربية، بيروت،١٩٨٦، ص١٦٠.

(٣)) احمد مختار العبادي: في تاريخ المغرب والاندلس، مؤسسة الثقافة الجامعية، اسكندرية، د-ث، ص١٠٩.

(ئیسپانیا) داگیر بکات و لەوێوە بەرەو خۆرهەڵات هەنگاویاننا. پاش کەناراوەکانی باشووری ئەورووپای زامنکرد لە هێرش و پەلاماری موسڵمانەکان؛ لە هەمان کاتدا (شارلەمان) دەرفەتی ناکۆکی نێوان (بەغدا و قورتووبە)ی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێنا و بەو مەبەستەش پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ (خیلافەتی عەبباسی لە بەغداد) دروستکرد، ئەو خۆنزیککردنەوەیەی (شارلەمان) لەگەڵ (بەغداد)؛ ناکۆکی نێوان (خیلافەتی عەبباسی لە بەغداد) و دەوڵەتی (ئومەوی لە ئەندەلووس) زیاتر قووڵکردەوە[1].

## ژیاندنەوەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی

هەروەک پێشتر باسمان لێوەی کرد؛ (شارلەمان) توانی بەسەر دەوڵەتی (لۆمباردی ئاریۆسی)دا سەربکەوێت و پاپاکان لە مەترسی دەسەڵاتدارییەتیان ڕزگار بکات کە ماوەی دوو سەدە دەبوو ببوونە هەڕەشە بۆیان. هەروەها شەڕەکانی دژ بە (سەکسۆنییەکان) لەپێناو ئەوەدا بوو کە دوا پاشماوەی (بتپەرستە جەرمانەکان) لەناوبەرێت و لەو سۆنگەیەشەوە توانی دەوڵەتی (ئاڤاریای بتپەرست) لەناوبەرێت، ئەمە بەدەر لە شەڕەکانیشی لە (ئیسپانیا) دژ بە موسڵمانەکان. یەکەم کاری ئاییني (مەسیحی) بوو دژ بە فراوانکردنی دەسەڵاتی (ئیسلامی) لە (ئیسپانیا)دا؛ واتە (شارلەمان) لە ماوەی (٣)ساڵی جەنگەکانیدا توانی سنووری دەوڵەتەکەی فراوان بکات و بەشێکی گەورە لە ئەورووپا بگرێتەوە و گێتی (مەسیحییەت) دەسەڵاتدار و مەزن و بەهێز بکات[2].

ئەوکاتەی (شارلەمان) بەرەو (ڕۆما) کەوتەڕێ؛ بەر لە گەیشتنی پاپا چوو بۆ پێشوازی لێ کردنی، بە گەیشتنی (شارلەمان)؛ دانیشتووانی (ڕۆما) پێشوازییەکی گەرم و ئاهەنگێکی مەزنیان بەو بۆنەیەوە بۆ گێڕا. بە لێکۆڵینەوە لە تاوانەکانی پاپا و لە کۆبوونەوەیەکی ئایینیدا هەموو گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە دەبێت بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەردا بسەپێندرێت؛ بەڵام (شارلەمان) توانی ئەو بڕیارە بگۆڕێت بە دەرکردنی و دوورخستنەوەی بۆ دەرەوەی (ڕۆما)[3].

---

(١) عبدالمجيد نعني: تاريخ الدولة الاموية في بلاد الاندلس، ص١٦٤.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٠.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٩٧.

## بارودۆخی ناوخۆ

### یەکەم/ سیستمی فەرمانڕەوایەتی شارلەمان

فەرمانڕەوایی (شارلەمان) بە چەشنێکی فراوان بریتیبوو لە دەزگایەکی ئایینی، دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتییەکەی (شارلەمان) بە ڕێژەیەکی زۆر فەرمانڕەوایەتییەکی ئایینی بووە و ئوسقووف و کۆنتەکان بەشدارییەکی کارایان دەکرد لە بەڕێوەبردنی کاروبارە کارگێڕییەکاندا، (شارلەمان) وڵاتی بۆ (٣٠) کۆنت دابەشکردبوو؛ هەر کۆنتێکیشی کردە (٣٠) مارک، بۆ هەریەکێکیشیان بەرپرسێکی دانا، بەو پێیەی کۆنتەکان ڕامیاری و مارکەکانیش سەربازی بوون؛ بۆیە بۆ هەر کۆنتێک بەرپرسێکی ڕامیاری و بۆ هەر مارکێکیش بەرپرسێکی سەربازی دیاری کرد. زۆربەی دەزگا بەڕێوەبەرایەتییە ناوەندییەکان لە دەستی پیاوە ئایینییە دادوەرییەکاندا بوو؛ چ لە دادگای باڵا و چ پیاوەکانی کڵێسا تایبەتییەکانی سەر بە کۆشکی (کارۆلینجی)، لەبەرئەوەی سەرکردەی ئەو کڵێسا تایبەتییە بریتیبوو لە یەکەم ڕاوێژکاری (شارلەمان)ی ئیمپڕاتۆر و خاوەن پلەوپایەیەکی بەرز لە ئیمپڕاتۆرییەتەکەدا. (شارلەمان) سیستەمی نوێنەرایەتی بەکاردەهێنا، ئەو نوێنەرانەی کە بۆ دەزگا دادوەرییەکان لە سەرجەم ئیمپڕاتۆرییەتەکەدا دەنێردران، ئەسقەفە سەرۆک دێرەکان کارە گرنگەکانیان دەخستە بەردەستیان[1].

لێرەدا دەتوانین بەکورتی کاروباری ئەو نوێنەرانە دەستنیشان بکەین:

١. گوێگرتن لە گشت نارەزایی و سکاڵاکردنێک دژ بە کۆنتەکان و لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە و گەڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان، لە هەمان کاتدا دەبوو پشتیوانی لە کۆنتەکان بکەن؛ ئەگەر لە لایەن دەستوپێوەندی پاشاوە گیروگرفت بۆ کاروبارەکانی دادوەرێتی دروست بکرێت.

٢. هەستان بە کۆنترۆڵکردنی کڵێسا و دێرەکان بە پشکنین و سزادانی پیاوە ئایینییەکان؛ بەتایبەت ئەوانەی پابەندی سیستەمی کڵێسا نەبوونایە.

٣. چاودێریکردنی پرۆسەی بەجێگەیاندنی خزمەتی سەربازی.

٤. سەرپەرشتیکردنی ئەو زەویانەی کە پاشا دەیبەخشێت، هەروەها دیاریکردنی باج و خزمەتگوزارییەکان[2].

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٨٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٧.

بۆ زانینی زیاتر له کارەکانی ئەو نوێنەرانه؛ دەقی گوتەکانی یەکێک لەو نوێنەرانەی (شارلەمان) له سەردانەکانیاندا دەخەینەڕوو کە دەڵێت: "ئێمە بە فەرمانی سەرۆک و سەروەری مەزنمان (شارلەمانی ئیمپراتۆر) هاتووینەته ئێرە؛ لەپێناوی هێنانەدی چاکەیەکی وا کە سوودی بۆ ئەو دونیایەی دیکەتان هەبێت، لەبەرئەوە دەتانخەینە سەر ڕێگەیەکی وا کە بەپێی یاسای یەزدان ژیانێکی کارامە بەسەربەرن، دراوسێکانتان بە چەشنی خۆتان خۆشبووێت، یارمەتی هەژاران بدەن بەپێی تواناتان"[1].

## دووەم/ کاروباری دارایی سەردەمی شارلەمان

(شارلەمان) هەوڵی دەدا بایەخ بە کاروبارە داراییەکانی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی بدات و پارەی وڵاتەکە ڕێکبخاتەوە و یەک سیستەم بۆ هاوسەنگێتی ئەو فێڵانەی کە له پارەکەیاندا دەکرێت؛ دابنێت، چونکە بەر لەوەی (شارلەمان) لەسەر تەختی ئیمپڕاتۆرییەتی فەرمانڕەوا بێت؛ زیاتر له (٦٠) بنکەی سکەلێدان بوونیان هەبوو، لەبەرئەوە (شارلەمان) ناچاربوو بەشێکی زۆریان لاببات و کەمێکیان بهێڵێتەوە؛ کە ئەوانیش لەژێر کۆنترۆڵ و چاودێری دەوڵەتدا بن. له هەمان کاتدا پێوەری پارەکەی گۆڕی و کارێکی وایکرد کە (١) جونێی بریتی بێت له (٢٠) شیلینگ. (شارلەمان) چەند فەرمانێکی یاسایی دەرکرد کە سوو حەرام بکات، هەروەها نرخی هەندێک شتومەک و خۆراکی وەک گەنمی جێگیر کرد، کاروباری بازرگانی دەپاراست و هەرکەسێکیش سەرانەی نادەستووری وەربگرتبایە سزای دەدا، له هەمان کاتدا کۆنترۆڵی خستەسەر ڕێگاوبانە سەرەکییەکان بۆ پاراستنی ژیانی هاموشۆکەران و بازرگانەکان له دەستی دز و جەردە و پیاوکوژەکان[2].

## سێیەم/ کاروباری زانستی سەردەمی شارلەمان

لایەنی زانستی له سەردەمی (شارلەمان) زۆر گرنگی پێدراوە؛ بە جۆرێک هیچ پاشایەکی پێش خۆی بەمجۆرە گرنگیان پێ نەداوە، هەرچەندە ئەمە له لایەنی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٤.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٩٨.

(میرۆفنجییەکان) گرنگی پێ نەدرا، چونکە خۆیان بە بەرپرسیار نەدەزانی بەرامبەر بە ژێردەستەکانیان[1].

(شارلەمان) پێچەوانەی فەرمانڕەوایانی پێش خۆی گرنگی دەدا بە هاولاتیانی و دەویست گرنگی بە زانست بدەن، بەڵام بە پەروەردەیەکی (مەسیحی – لاتینی) و گرنگیدان بە بنەما سەرەکییەکانی (مەسیحییەت)، ئەمەش لەژێر کاریگەری پاپا و کەنیسەی (کاسۆلیکی) بوو. لە سەردەمی (شارلەمان)دا سەرقافڵەی ئەو شۆڕشە زانستییەی کە ئەنجامدرا؛ زانای ئینگلیزی (ئاڵکون ٧٣٥-٨٠٤ ز) بوو کە سەرۆکی قوتابخانەی (یورک) بوو، (شارلەمان) توانی لە ساڵی (٧٨١ ز) (ئاڵکون) بخاتە خزمەتی خۆیەوە و کردییە بەرپرسیاری قوتابخانەی کۆشکی ئیمپراتۆر لە (ئاخن)، دوای ئەوەی (ئاڵکون) ئەو کارەی لەوێ پێسپێردرا و توانی کاریگەرییەکی بەرچاو و گەورەی هەبێت لە ڕێنماییکردنی ڕامیارییەکی پەروەردەیی (شارلەمان) و لە هەمان کاتدا ڕێنماییکردن و بەڕێوەبردنی جموجووڵ و بزوتنەوەی ویژەیی لە ئیمپراتۆرییەتی (کارۆلینجی)دا، لەبەرئەوەی (ئاڵکون) مامۆستا و ڕێکخەریشی بوو، لە لایەکی دیکەوە (ئاڵکون) بوو بە ڕاوێژکار و یەکەم سەرچاوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کڵێسا[2].

ئەو بەرنامە زانستییەی (ئاڵکون) لەسەر بنەمای بەرنامەیەکی کلاسیکی دێرین دانرابوو کە لەم (٧) بەشە پێکهاتبوون: (ڕێزمان، گوتار، ژیربێژی، مۆسیقا، بیرکاری، ئەندازیاری، گەردوون). لەوەش بترازێت؛ (شارلەمان) کارێکی دیکەشی بە شایستەی (ئاڵکون) زانی، ئەویش پێداچوونەوەی (پەرتووکی پیرۆز)[3] و ژمارەیەک پەرتوکی تایبەت بە نوێژکردن و ڕوولەخوداکردن، لێرەدا ئەو ڕاستییەش بەدیدەکرێت کە ئاڵکونێکی بە ڕەگەز (ئینگلیزی ئەنگلۆسەکسۆنی) ببووە سەرکردەی بزوتنەوەی

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٨٢.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٥.

(٣) پەرتوکی پیرۆز مەبەست لێی پەرتوکی پیرۆزی مەسیحییەکانە و لە (٢) بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمی پێی دەگوترێت (پەیمانی دێرین) کە لە (تەورات و کوتوبیم و نبییم) پێکهاتووە و هەموو ئەمانەش پەیام و پەرتوکە پیرۆزەکانی جوو و ئیسرائیلییەکانن، بەشی دووەم (پەیمانی نوێ)یە کە چوار ئینجیلی (مەتتا، مەرقۆس، لۆقا، یوحەننا) و (کرداری نێردراوان) و نامەی کەسایەتییە پێشینەکانی مەسیحییەتە، وەک (پۆڵس، پەترۆس، یوحەننا، یاقووب و ...هتد).

چاکسازی (کارۆلینجەکان) لە پەیڕەویکردنی ئەرکە ئایینییەکاندا کە لەسەر بنەمایەی کاروباری کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاست دامەزرابوو بەڕێوەدەچوو[1].

لە هەمـان کاتـدا بـایەخ بە دەستنووسـەکان دەدرا و چاودێریـان دەکـرا و بەسەریاندا دەچوونەوە و نوسخەیان لێ دەردەهێنان. کار گەیشتە ئەندازەیەک کە بەتەنها خۆیان بە قوتابخانەی کۆشکی ئیمپڕاتۆرەوە خەریک نەدەکرد؛ بەڵکوو چەند قوتابخـانەیەکی دیکەشـی لە نـاوچەکەدا هەبـوو کە بایەخیـان پـێ دەدرا، لەو قوتابخانـانەدا خوێنـدن کرابـووە دوو قۆنـاغ: قۆنـاغی یەکەم کە پلەی زانستیانەی کەمتر بوو لە قۆناغی دووەم، لەمەی دووەمیشیاندا خوێندکارەکانی کڵێسا (ڕەهبانی) و چەنـد کەسـێکی فەرمـانبەری ئەو کڵێسـایە دەیانخوێنـد. جـگە لەوانە چەنـد قوتابخانەیەکی دیکەش بۆ خوێندن و سرووودوێژی کرانەوە. پاش (شارلەمان) ئەم شۆڕشەی (کارۆلینجەکان) گەیشتبووە لووتکەی پێشکەوتن؛ ئەمەش لەسەردەستی خوێندکارەکانی ئاڵکوندا، بۆ وێنە (ئاینهارد) مێژوونووسێکی تایبەت بە (شارلەمان) بوو[2].

## کۆتایی دەسەڵاتی شارلەمان

لە سەردەمی ژیان و دەسەڵاتی (شارلەمان)دا دەوڵەتی (کارۆلینجی) زۆر بەهێز و بەویقـار بـوو، بەڵام دوای مردنـی (شـارلەمان) لە سـاڵی (٨١٤ ز)؛ بـووە هـۆی پارچەپـارچەبوون و دابەشـبوونی دەوڵەتەکە و بە جۆرێـک کە بەتەواوی کـزی و لاوازی پێوە دیاربوو، بەپێی دەستوور و نەریتی (فەرەنگ)؛ ئیمپڕاتۆرییەتەکە بەسەر کوڕەکانیدا دابەشکرا، بەڵام بە هۆی مردنی دووان لە کوڕەکانییەوە؛ دەسەڵات بۆ کوڕەکەی دیکەی کە ناوی (لـویس ٨١٤-٨٤٠ ز) مـایەوە، کە ئەمیش لە سـاڵی (٨١٧ ز) وڵاتەکەی کـردە (٣) دەسـەڵاتدارێتی پاشـایی بـۆ کوڕەکـانی: (پێپن و لۆسـەر و لویس) کە هەریەکەیان لە پارچەی خۆیدا فەرمانڕەوایەتیان دەکرد[3].

ئەو دابەشـبوونە دەسـەڵاتدارێتییە هەر بەو چەشـنە مـایەوە؛ بەتـایبەت دوای ئەوەی کە (لویس) لە ژنی دووەمی کوڕێکی بـوو کە لە مێژوودا بە (چارلی بێمـوو)

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٧.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص٩٨.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٨.

ناوی ڕۆیشتووە، ئەو چوار کوڕەی (لویس) لە باوکیان هەڵگەڕانەوە و لەو دەمەوە ناکۆکی و دووبەرەکییەکی توند لەنێو ئەو خێزانەدا دروستبوو کە زۆرجار کار دەگەیشتە شەڕی چەکداری دژ بە یەکدی. لە ساڵی (٨٤٣ ز) بەپێی ڕێکەوتننامەی (فردانی) کە لە ساڵی (٨٤٠ ز) ئەنجامدرا؛ سەرلەنوێ ئیمپراتۆرییەتی (فەرەنگ) دابەشکرایەوە، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە؛ زەوییەکانی نێوان (ئالب و ڕاین) بەر (لویس) کەوت، (چارلی) فەرمانڕەوایەتی بەشێکی گەورەی (فەڕەنسا) و ویلایەتەکانی (ئیسپانیا)ی گرتەدەست، بەڵام (ئیتاڵیا) و زەوییەکانی نێوان (ڕاین) لە خۆرهەڵات و (چیڵد و سائوون و ڕوون) لە خۆرئاوا بە (لۆسەر) بەخشرا[1].

ئەو دابەشکردنە دوو بایەخی گرنگی هەبوو:

١. سەرەتایەک بوو بۆ پەیدابوونی چەند دەوڵەتێک لەوانە (فەڕەنسا و ئەڵمانیا).

٢. ئەو دابەشبوونە و چەند هۆکارێکی دیکەی وەک هێرش و پەلاماری بەربەرەکانی باکووری ئیمپراتۆرییەتەکە بوونە هۆی کۆتایی ئیمپراتۆرییەتەکە و پەیدابوونی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی.

ئەو گۆڕانکاریانە بوونە هۆی هێنانەکایەی بارودۆخێکی وا کە لەوەبەدواوە خاوەن زەویوزار و موڵکەکان بوونە فەرمانڕەوا و دادوەر و سەرکردەی سوپا و بەرپرسی سەرانەسەندن. سەرجەمی خەڵکەکەش ئەم سیستم و دۆخەیان پێ چاکتر بوو؛ چونکە میللەتەکە هەستیان بە ئارامی و ئاسایشی زیاتر دەکرد کە یەکێک لە ناوچەکەی خۆیاندا فەرمانڕەوا بێت و بەرژەوەندییەکانیان بپارێزێت، وەک لە پاشایەک یاخود ئیمپراتۆرێک کە کز و بێدەسەڵات بێت و بەرژەوەندییەکانیان نەپارێزێت. هاوکات بەرپرسیارانی ناوچەکان تەنها بەناو بەسترابوونەوە بە پاشاوە؛ واتە دەرەبەگەکان لە کاتی بێتوانایی و بێدەسەڵاتی پاشاکاندا ڕۆڵێکی بەهێزیان دەبینی، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر دەسەڵاتی پاشا بەهێز ببووایە؛ ئەوا لە ڕۆڵی دەرەبەگەکانی کەمدەکردەوە، بەمشێوەیە دەبینین کە دوای نەمانی دەوڵەتی (کارۆلینجی) لە لایەکەوە دەرەبەگایەتی و لە لایەکی دیکەوە سیستمی پاشایەتی لە (ئەڵمانیا و فەڕەنسا و ئینگلتەرا)دا جێگیرتەوە[2].

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٠٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٩.

# بەشی دەیەم

- مێژووی ڤایکینگەکان
- شوێنی جوگرافی ڤایکینگەکان
- ژیاری ڤایکینگەکان
- هێرشی ڤایکینگەکان بۆ سەر ئەورووپا
- وڵاتانی ئیسکەندەناڤی
- ژیانی ئابووری گەلانی ئیسکەندەناڤی
- کۆمەڵگا و دەوڵەت
- هێرشەکانی دەریا
- هۆکاری هێرشی نۆرماندییەکان
- گێتی ئەسکەندەناڤی هەتا کۆتایی سەدەی نۆی زایینی
- هۆکاری شەڕەنگێزی نۆرماندی (ئیسکەندەناڤییەکان)

## مێژووی ڤایکینگەکان

ڤایکینگەکان یەکێک بوون لەو هۆزە جەرمانانەی بە شێوازی ژیانی تایبەتی و بالادەستیان لە ڕووی دەریاوانییەوە کاریگەری گەورەیان لەسەر کیشوەری ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبووە، ئەوان بە بەلەمە درێژەکانیان و بالادەستیان لە دەریاکاندا ناسراون، هەروەها کە بە باکوورییەکانیش ناسراون، هۆزە جەرمانەکان بریتیبوون لە (٣) بەشی سەرەکی:

یەکەم/ باکوورییەکان کە گەلی (سویدی و نەرویجی و دانی)ن کە ڤایکینگەکانیش بەشێکن لێی.

دووەم/ خۆرهەلاتییەکان کە لە (گووت و لۆمبارد و ڤەندالّ) و چەند هۆزێکی دیکەش پێکدێن.

سێیەم/ خۆرئاواییەکان کە لە هۆزەکانی (کمبری و سویڤی سۆرنجییەکان) و چەندین هۆزی دیکە پێکدێن کە لە لایەن ڕۆمانییەکانەوە بە (بەربەر) ناسراون[1].

وشەی (بەربەر) بۆ یەکەمجار لە لایەن یۆنانییەکانەوە بەکارهاتووە، ئەوان هەموو ئەو گەلانەی یۆنانی نەبوون بە (بەربەر) ناویان دەهێنان، ڕۆمانییەکانیش ئەم ناوەیان بۆ ئەو هۆزە کۆچەری و هێرشبەرانەی نزیک بە سنوورەکانیان لە باکوور و باشوور بەکاردەهێنا. هۆزەکانی سنووری باکووری ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی (جەرمەنەکان) بوون کە هەندێکیان مێژووی هاتنیان بۆ ئەو ناوچانە بۆ دوو سەدە پێش زایین دەگەڕێتەوە[2] و لە ناوچەکانی خۆرئاوای (ئەلّمانیای ئەمڕۆ) نیشتەجێبوون، بۆچوونێک هەیە کە لە سەردەمی (هرقل)دا بە هۆی هێرش بۆ سەر ناوچەی (میدی و فارس و ئەرمەنەکان) کۆچیانکردووە بۆ (باکووری ئەفریقا و ئیسپانیا)، بەوەش میدییەکان لەگەلّ (لیبی و ئەرمەنییەکان) تێکەلّبوون و فارسەکانیش لەگەلّ (جیتوولینەکان) تێکەلاوبوون و پێیاندەگوتن بەربەر[3]. یەکێک لەو هۆزە بەربەرانەی باکووری ئەورووپا (ڤایکینگەکان) بوون کە ناوەکەیان بە واتای (کەنداوییەکان) دێت، چونکە لە کەنداوەکان یان ڕێڕەوی ڕووبارەکاندا کۆدەبوونەوە کە پێگەی دەستپێکی هێرشەکانیان بوون بۆ سەر ناوچە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٧٤.

(٢) احمد غانم حافظ: الامبراطورية الرومانية من النشاة الى الانهيار، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٧ م، ص١٥٠.

(٣) محمد صقي: بربر في الاندلس، المدارس للنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، ٢٠٠٢ م، ص١٦.

وشکانییەکان. لە ڕووی ڕەگەزییەوە دەگەڕێنەوە سەر (تیتۆنی یان جەرمان) کە لە ناوچەکانی (ئیسکەندەناڤیا) و نیمچەدوورگەی (دانیمارک) ژیاون، کۆمەڵگای (ڤایکینگ) بەسەر (٣) بەشدا دابەشبوون کە بریتی بوون لە:

١. (یارلز) خانەدان.
٢. (بوندی) جووتیار و خاوەن زەوییەکان.
٣. خزمەتکارەکان.

بەپێی بیروباوەڕیان؛ وایان لە منداڵەکانیان تێدەگەیاند کە ئەم ڕێکخستنە چینایەتییە فەرمانێکی خودایيە بۆ دابەشکردنی کار، هەرکەس بیەوێت گۆڕانکاری لە چینی خۆی بکات لە چوارچێوەی باوەڕ دەردەچێت[1].

(ئیبن فەزلان) کە دیپلۆماتی موسڵمانی سەدەی دەیەمە و خۆی چاوی پێیان کەوتووە لە ڕووباری (ڤۆڵگا)؛ بەمجۆرە پەسنیان دەکات: "هیچ خەڵکانێکم هەتا ئەوکاتە بەو جۆرە لەشجوان و ڕێکوپێک نەدیبوو، ئەوان نە جبەیان لەبەر دەکرد نە کەوا، هیچ کەسیان بۆ ساتێکیش تەور و شمشێری لە خۆی دوورنەخستۆتەوە، شمشێرەکانیان بە شێوەی خۆرئاواییەکان تەخت بوو، هەر ژنێک سندووقێک ئاسن، مس، زیو، یان زێڕی بەسەر سنگییەوە بوو کە قەبارە و جۆرەکەی بۆ سەروەت و سامانی مێردەکەی دەگەڕایەوە، ئەگەرچی لە کۆمەڵگای باکووریەکان پیاوان دەستیان دەڕوا و زیاتر دەسەڵاتیان بەدەستە؛ بەڵام ژنانیش خاوەن ئیمتیاز و مافگەلێکن"[2].

لە کۆمەڵگای باکووریەکاندا دایک و باوک زەماوەندیان بۆ منداڵەکانیان ڕێکدەخست؛ بەڵام کچان ئەو مافەیان هەبوو ڕەزامەندی لەسەر هاوسەری پێشنیارکراو دەرنەبڕن، ژنان لە دارایی و سەروەت و سامانی مێردەکانیان بەشیان هەبوو، زۆربەی پیاوەکانیان زیاتر لە ژنێکیان هەبوو، پیاوەکانیان لە زستاندا زیاتر لە ماڵ دووردەکەوتنەوە بە هۆی ئەوەی هێرشەکانیان زیاتر لەو وەرزەدا بووە بۆ ناوچە جیاجیاکان، چونکە لەم وەرزەدا کەشوهەوا گونجاوبوو بۆ ئەوان[3].

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١١١.
(٢) سفرنام ابن فضلان: ت: سيد ابو فضل طباطبائي، انشارات فرضک ايران، ١٣٤٥ ش، ص١٢٣.
(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٧٨.

## شوێنی جوگرافی ڤایکینگەکان

دەربارەی شوێنی نیشتەجێبوونی هۆزە جەرمەنییەکان بەگشتی تێڕوانینی جیاواز هەیە، ئاماژەکان ئەوە دەردەخەن لە کەناراوەکانی دەریای بەڵتیکەوە بەرەو ناوچەی گەمارۆدراوی نێوان هەردوو ڕووباری (ئالپ و ڕایین) لە باشوورەوە کشاون. ئەمە لە کاتێکدایە کە هەندێک لە مێژووناسانی دیکە پێیانوایە (ئیسکەندەناڤیا و دانیمارک) زێدی ڕەسەنیانە، هەندێک لە مێژوونووسان پێیانوایە ئەوانە لە (ئارییەکانی ئاسیا) بن، هەرچۆنێک بێت ناوچەکانی خۆیان شوێنی دڵخوازیان نەبوو؛ ئەوەش لەبەر سەرما و ژیانی سەخت، ئەمە بەدەر لە چاوتێبڕین لەو سەروەت و سامانەی لەناو دەوڵەتی ڕۆمانیدا هەبوو[١].

بە شێوەیەکی گشتی ئەو هۆکارانەی وایانکرد ناوچەکانی خۆیان بەجێبهێڵن؛ هۆکاری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی بوون، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی ئەو هۆکارانەی وای لە ڤایکینگەکان کرد وڵاتی خۆیان بەجێبهێڵن بەرەو سنوورەکانی دیکە؛ بریتیبوو لە چەند هۆکارێک، کە خۆی لە هۆکاری (ڕامیاری، دەروونی، ئابووری، کۆمەڵایەتی) دەبینییەوە. لە ڕووی دەروونییەوە مێژوو سەلماندوویەتی کە نەتەوە دوورەدەستەکان جۆرێک لە هەستی ئیرەیی و چاوتێبڕین و چاوچنۆکی کاریگەری بەسەر دەروونیانەوە زیاترە لە نەتەوە ژیارییە نزیکەکانیان، هەربۆیە جەرمانەکان ئارەزووی دەستبەسەرداگرتن و داگیرکردنی گەلانی دیکەیان هەبووە؛ بەتایبەت لە سنووری ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی. لە ڕووی ئابوورییەوە ڤایکینگەکان بازرگان بوون. لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ژمارەی ڤایکینگەکان لە سەدەی نۆیەمدا زیادیکرد؛ بە جۆرێک نیشتیمانە هەژارەکەیان ئەو ژمارە زۆرەی پێ بەخێو نەدەکرا[٢]. کۆتا هۆکار ڕامیارییە؛ کاتێک سیستمی پاشایەتی لە (نەرویج) لە لایەن ڤایکینگەکانەوە سەریهەڵدا، بەتایبەت لە ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم لەسەردەستی (هارۆڵد) ڤایکینگەکان سنووری هێرشەکەیان جیاکردەوە، سویدییەکان بەرەو خۆرهەڵاتی ئەورووپا ڕۆیشتن، لە ناوچەکانی (دەریای ڕەش و خۆرهەڵاتی ئەورووپا)، بەڵام نەرویجییەکان بەرەو ناوچەکانی (ئینگلتەرا و ئێرلەندا و باکووری زەریای ئەتڵەسی) ڕۆشتن، هەرچی دانییەکانن بەرەو باشووری خۆرئاوای

---

(١) جفري برۆن: پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، ل٨٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٠٩.

ئیمپراتۆرییەتی (کارۆلینجی) لە (ئەڵمانیا و فەڕەنسا) ڕۆشتن. دۆزەرەوە ڤایکینگەکان بە پـاپۆڕە مەزنەکـانی تـایبەت بە گەشـتییە زەریاییەکانیـان لە سـاڵی (٨٢٥ ز)دا (ئایسـلەندا)یان دۆزیەوە پـاش (٥٠) سـاڵ لێـی نیشـتەجێبوون. پاپۆڕەکـانی دیـکەی باکوورییەکان لە ئایسلەنداوە زیاتر هەنگاویاننا بەرەو خۆرئاوای (ئایسلەندا) و هەر لەو پرۆسەیەشـــدا لە ســـاڵی (٩٨٥ ز) گەیشـــتنە (گرینلانـــد) و تەنـــانەت هێنـــدە جووڵەکانیـان زۆر و فـراوان بـوون؛ لە سـاڵی (٩٩٢ ز)دا کەناراوەکـانی ئەمریکـای باکووریـــان لە زەریـــای (ئەتڵەســـی) دۆزیـــیەوە و نـــاوی فینلەنـــدیان لێنـــا و لێـــی نیشتەجێبوون[1].

## ژیاری ڤایکینگەکان

شـێوازی کـارگێڕی و ڕێکخسـتنی خێـزان لای باکوورییەکـان لەسـەر (٣) بنەمـا وەستابوو: (پابەندبوون بە ئایین، کاری هەرەوەزی، پێکەوەیی). ڤایکینگەکان لەگەڵ ئەوەی لە هەرێمێکـی دوورەدەسـتی ئەوپەڕی بـاکووری ئەورووپـادا دەژیـان و بەشێکی زۆری هەرێمەکەیان بەستەڵەک بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیان چەندین دەسـاوەردی ژیـاری بـۆ خۆیـان دەسـتەبەر بـکەن. باکوورییەکـان تەنهـا چەنـد گونـدێکیان هەبـوو، یـانی زۆربەیـان لە کـێڵگە دوور و لابەلاکانـدا دەژیـان کە لە خـانووبەرەی گەورەدا هەموویـان و بنەمـاڵە کرێکـاران و کۆیلەکـانیش جێیـان دەبووەوە، بۆ بژێوی ژیانیان بەدەر لە کشتوکاڵ و دەغڵودانەکانیان؛ خەریکی ڕاوی نێچیـر و ڕاوەماسـیش دەبـوون. باکوورییەکـان پـێچەوانەی هـۆزە جەرمـانە سـەرەتاییەکان؛ هەرگیـز ئەو کارانەیـان تـایبەت نەدەکـرد بە ژنـان و کۆیلەکانیـان، هەموو چینەکانی کۆمەڵ لە خانەدان و جووتیارە پیاو و ژنەکانیـان کاریـان دەکرد، دەتوانین بڵێین هەر باکوورییەک بۆ خۆی پیشەسازێک بوو؛ بەتـایبەت لە دارتاشـیدا شارەزایی باشیان هەبوو[2].

لە ڕووی ئـابوورییەوە خـاوەنی چەنـدین بنەمـای ئـابووری بـوون؛ لەوانە: (ڕاوەماسی، ڕاوی ئاژەڵ، بەخێوکردنی ئاژەڵ، چاندنی دانەوێڵە و میوە)، بۆ ئەوەی

---

(١) جیمس ئاکوریک: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، و: علی بوداغی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر، ل١٥٩.

(٢) ول وایریل دیورانت: موسوعة قصة الحضارة، ج٢٤/ ص١٨١.

ـێشتر پەرە بە لایەنی کشتوکاڵی بدەن؛ هەر لە سەدەی سێیەمی زایینییەوە بەشێکی ـارستانەکانی باشووریان کردە زەوی کشتوکاڵی، دیارە ئەوەش بەدەر لە لایەنی ـدەریاوانی و بازرگانی لە ڕێگای دەریاوە. هەر بۆیە لە سەدەی نۆیەمی زاییندا بازرگانیان لەگەڵ بێزەنتی و موسڵمانەکانیشدا دەست پێ کرد و تێیدا بازرگانی (قوماش و ماسی و شمشێر و تیر)یان لەگەڵدا دەکردن. لە ڕووی ویژەییەوە خاوەن ـدەقی هۆنراوەی خۆیان بوون کە هۆنراوەکانیان چاکەیانیان نیشاندەدا، هەروەها زیاتر باسی گیانی پاڵەوانێتی و ئازایەتی دەکرد، لەم سۆنگەیەشەوە ئەفسانەی تایبەت بە خۆیان هەبوو بە ناوی (ساجا)؛ کە باسی لە مانەوەی مرۆڤ و بەرگەگرتنی دەکرد لە ژیاندا[١].

ڤایکینگەکان بایەخێکی زۆریان بە خواردنەوە کحوولییەکان دەدا؛ بە جۆرێک زیادەڕەویان دەکرد لە خواردنەوەدا کە پیاوەکانیان زۆربەی کات مەست بوون. بەپێی نوێترین لێکۆڵینەوەی زانکۆی (ئۆپسالا) لە (سوید) کە لەسەر پاشماوەی جل وبەرگی ڤایکینگەکان ئەنجامیانداوە؛ ناوی (اللە وعلی) هەیە، (ئانیکا لارسن) لێکۆڵەری شوێنەواری لە زانکۆی (ئۆپسالا کاتێک) سەرقاڵی توێژینەوەی پاشماوەی جلی ژنان و پیاوانی (ڤایکینگ) بوو کە لە گۆڕستانێکی تایبەت بە ئەوان دۆزرابووەوە؛ دوای لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوت بە هۆی بازرگانیان لەگەڵ ناوچەکانی (ئاسیای ناوەڕاست) هەبووە و لەوێشەوە پەیوەست بوونەتەوە بە (ئێران و چین)، لەسەر ئەو جلوبەرگانەش بە خەتی کوفی ناوی (اللە وعلی)ی لەسەر نەخشێنراوە، ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە پەیوەندی بازرگانی لەنێوان موسڵمانان و ڤایکینگەکاندا هەبووە[٢].

لە ڕووی ماددییەوە خاوەن سەروەت و سامانی زۆربوون کە کەلوپەلی جوانکاری و شمشێری دەسک گرانبەهایان هەبوو، هەندێک لەو شمەکانەیان دەخستە ناو گۆڕەکانیان، بێگومان ئەم سەرچاوە ماددییە زۆرەیان لە لایەکەوە بۆ هێرش و تالانییەکان و لە لایەکی دیکەوە بۆ بازرگانیان دەگەڕێتەوە. هۆکاری سەرەکی بازرگانیکردنیان؛ کەشتییەکانیان بوون، چونکە ڤایکینگەکان لێزانی و پسپۆڕییەکی تەواویان لە دروستکردنی پاپۆڕدا هەبوو، پاپۆڕەکانی ئەوان لەچاو

---

(١) موريس بيشوب: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٣٨.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٨.

پاپۆڕەکانی دیکەی سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست و تەنانەت پاپۆڕەکانی قۆناغی ترۆپکی گەشەی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیش پێشکەوتووتر بوون، داهێنانی (کۆڵەکەی کلکی پاپۆڕ) لە سەدەی حەوتەمەوە؛ لە لایەن ئەوانەوە پاپۆڕگەلێکی پێ بەخشین کە دەیانتوانی تەنانەت بەرگەی شەپۆلە پڕخرۆشەکانی زەریای ئەتڵەسیش بگرن[1].

## هێرشی ڤایکینگەکان بۆ سەر ئەورووپا

یەکەم هێرشی بەربەرەکان بۆ سەر ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی لە ساڵی (٢٣٠ ز) تۆمارکراوە، ڕۆمانییەکان بۆ ماوەی دوو سەدە توانیان بەرامبەر بەو هێرشان خۆڕاگربن، بەڵام سەرئەنجام بە هۆی شەڕە ناوخۆییەکان و زۆربوونی ڕێژەی هەژاری و تاوان لەناو ئیمپڕاتۆرییەتەکە بەرەو لاوازی چوو، ئەمەش ڕێگەی بۆ ئەو هۆزانە خۆشکرد کە بتوانن بێنە ناو سنوورەکانی ئیمپڕاتۆرییەتەوە. ڤایکینگەکان جیاواز لە هۆزەکانی دیکە درەنگتر هێرش و پەلاماریان دەست پێ کرد کە بۆ کۆتاییەکانی سەردەمی دێرین و سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، ڤایکینگەکان یەکەم هێرشیان لە ساڵی (٧٨٧ ز) کردە سەر (ئینگلتەرا)، ئەم ڕووداوەش لە سەردەمی (بیوهتریک پاشای وسکس ٧٨٦-٨٠٢ ز) بوو، هەروەها لە پێشتریشدا و لە ساڵی (٧٣٩ ز) هێرشیان کردبووە سەر ئوسقووفییەی (لندسفرین) لە ناوچەی کەنارییەکانی باکووری خۆرهەڵاتی (ئینگلتەرا)، دوای ئەوەش لە ساڵی (٧٩٤ ز) هێرشیان کردە سەر دێری (قەدیس پۆڵس) لە (جاروو) کە لە کەناری خۆرهەڵاتیدا بوو، دوای ئەوە هێرشەکانیان وەستان و هەڵوەستەیەکیان کرد هەتا ساڵی (٨٣٥ ز). دواتر دووبارە دەستیان بە هێرشەکانیان کردەوە و ئەوەبوو دەستپێکی هێرشەکانیان بۆ سەر ئیمپڕاتۆرییەتی (کارۆلینجی) بوو کە هێشتا (شارلەمان) لە ژیاندا مابوو. لە ساڵی (٨٤١ ز) هێرشەکانیان بۆ سەر زەوییەکانی (کارۆلینجی) چڕتر کردەوە و ئاڕاستەکەشیان بەرەو ڕووباری (سین) بوو و لەو هەڵمەتەشدا شاری (ڕوان)یان داگیر کرد، ڤایکینگەکان هێرشەکانیان لە وەرزی هاوین ئەنجامدەدا؛ بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی نۆیەمدا لە ڕێڕەوەکانی ڕووبار یان کەنداوەکان ئارامیان دەگرت و کاتەکانی زستانیان لەوێ بەسەردەبرد، بەمەش

---

(١) جیمس. ئا. کوریک: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل١٥٩.

قوناغێکی نوێیان بۆ هێرشەکانیان دەست پێ کرد، بە دامەزراندنی ئەو بنکە دوورییانە بەرەوپێشچوونیان بە خۆیانەوە بینی، چونکە لە ساڵی (٨٥٧ ز) لە بنکە دەریاییەکانیانەوە هێرشیان کردە سەر شارەکانی (تۆر، بۆردۆ، بلوا، ئەورلیان، بواتیە) لە ڕێڕەوی ڕووباری (لەورا)[١].

شێوازی دروستکردنی کەشتیە باکوورییەکان ڕێگەی بە ڤایکینگەکان دەدا هێرشەکانیان خێرا و کاریگەر بێت، ئەو پاپۆڕانە کە بە هێزی باگیر و بێڵە بەگەڕدەکەوتن؛ زۆر بەئاسانی کۆنترۆڵ دەکران و دەیانتوانی لە ئۆقیانووس و دەریاکاندا وەک یەک بڕۆنە پێش، لە ساڵی (٨٨٥ ز) نزیکەی (٤٠٠٠٠) کەس و بە نزیکەیی (٧٠٠) پاپۆڕی مەزنی ڤایکینگەکان ڕووباری (سین)یان تێپەڕاند و پەلاماری پاریسیاندا، ڤایکینگەکان کە بینیان ناتوانن دەستبەجێ دەست بەسەر شارەکەدا بگرن؛ بۆیە گەمارۆکە درێژەی کێشا و چەند مانگێکی خایاند، هەر بۆیە ئیمپراتۆر (شارلی قەڵەو) پارەیەکی زۆری وەک بەرتیل پێ بەخشین و ڕێگەی ئەوەی پێ دان لە (بورگەندیا) بمێننەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هێرش و پەلامار و گەمارۆکانیان هەر بەردەوام بوون، ئەمە وایکرد کە (شارلی پاشای فەرەنسای خۆرئاوا) ناچار بوو لە ساڵی (٩١١ ز)دا زەوییەکانی نزیک بە ڕووباری (سین) ببەخشێت بە سەرکردەی ڤایکینگەکان کە بە (نۆرماندی) ناودەبرا[٢]، ئەمەش لەسەر بنەمای ڕێکەوتنێک بوو کە ئەگەر (ڕۆلۆ) و نۆرماندییەکانی ژێردەسەڵاتی دەست لە تاڵان و کاولکاری هەڵبگرن و بێنە سەر ئایینی (مەسیحی)؛ ئەوا (پاشا شارل) دەتوانێت (ڕۆلۆ) بکاتە (دۆقی نۆرماندی). (ڕۆلۆ) پێشوازی لە پێشنیارەکە کرد و بەمجۆرەش یەکێک لە دەسەڵاتە مەزنەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەرکەوت کە (دۆقنشینی نۆرماندی) بوو. جێگەی ئاماژەیە کە پەلاماری ڤایکینگەکان بەتەنها تایبەت نەبوو بە ناوچەیەکی دیاریکراوەوە؛ بەڵکوو زۆرێک لە ناوچەکانی گرتبووەوە، بەتایبەت ناوچە کەنارییەکان. لە ساڵی (٨٤٤ ز) لە (دەریای سپی ناوەڕاست)ەوە بەڕێکەوتن بۆ باشووری (ئەندەلووس) کە ئەوکات لەژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکاندا بوو، ئەوە بوو بە گەرووی (جەبەل تاریق)دا تێپەڕین و پەلاماری (لیشبۆنە، قادشن، ئیشبیلە)یاندا؛ لەگەڵ هەندێک لە ناوچە کەنارییەکانی (مەغریب)، موسڵمانەکان

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٢٠.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الأوروبية، ص١١٣.

ڕووبەڕوویان بوونەوە و بە (مەجووس) ناویان دەبردن، (عەبدولڕەحمانی دووەم) هەوڵیدا نوێنەر بنێرێت بۆ لایان هەتا مەترسییەکانیان کەمبکاتەوە، بەڵام ئەو مەترسیانە لەسەر هەندێک گوند و ناوچە کەنارییەکان بەردەوامی هەبوو هەتا ساڵی (٨٥٩ ز)[١].

دواتر (ڤایکینگ و سویدی و سولاڤ)ەکان لە ساڵی (١٠١٣ ز)دا کەنارەکانی (کەنت وسکس)یان داگیر کرد و لە ئەنجامی بەردەوامی هێرش و پەلامارەکانیاندا توانیان تەواوی (میدلاندز و ئۆکسفۆرد و مانچستەر) داگیر بکەن، تەنانەت لە ساڵی (١٠١٤ ز) شاری (لەندەن) کەوتە ژێردەستیان. هۆکاری هەموو ئەم سەرکەوتنانە دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای گیانی جەنگاوەری توندوتیژانە و هێزی بەرگەگرتنیان، هەر ئەمەش وایکردبوو سەرکەون بەسەر نەتەوەکانی دیکەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەی زۆربوونیان نائاسایی بوو، هەروەها پلانی شەڕکردنی تۆکمەیان هەبوو؛ ئەوەش یارمەتیدەریان بوو بۆ دەرکەوتنی هێزیان وەک دەریاوانێک، کەشتییەکانیان ناویان (دراگۆن) بوو و لەسەر شێوەی ئەژدیها دروستیان دەکردن کە درێژی هەریەکەیان نزیکەی (٦٠) پێ دەبوو، ئەم کەشتیانەش چەند بەشێکی لە ئاسن پێکهاتبوو، بەڵام لایەکانی دیکەی لە تەختە دروستکرابوون[٢].

لە کۆتای سەدەی دەیەمدا کە بە کۆتایی سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست دەناسرێت؛ هێرش و پەلاماری ڤایکینگەکان وەستا، بەشێک لە هۆکارەکەی بۆ گۆڕانکارییەکانی (ئیسکەندەناڤیا) دەگەڕایەوە، شانشینەکانی (دانیمارک، نەرویج، سوید) دامەزرابوون، خانەدان و بڕیاربەدەستانی باکووری لەبری درێژەدان بە تەراتێن و تالان و برۆ؛ کات و تواناکانی خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی ئەو شانشینانە تەرخان دەکرد، جگە لەوەش مەسیحییەت لە (ئیسکەندەناڤیا)دا پەرەیسەند و جێی بە ئایینی دێرینی باکوورییەکان لێژ کرد، ئایینی نوێ بە پێچەوانەی ئایینە دێرینەکان بایەخ و بەها جەنگاوەرییەکانی ڤایکینگەکانی بە بەرز و پیرۆز دانەدەنا، هانی نەدەدان و ئەو بەهانەیەش وردەوردە کاڵبووەوە، بەڵام لە ڕوویەکەوە کۆتایی سەردەمی ڤایکینگەکان ئەوکاتە بوو کە ئەوان بە یەکجاری لە (بەریتانیا و نۆرماندی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٠.

(٢) موريس بيشوب: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣٨.

و ڕووسیا) و ناوچەکانی دیکەی ئەورووپا گیرسانەوە و نیشتەجێبوون، بەمجۆرە لە کۆتاییەکانی قۆناغی بەرایی سەدەکانی ناوەڕاستدا سەردەمی ڤایکینگەکان کۆتایی پێ هات[1].

## وڵاتانی ئیسکەندەناڤی

لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی زایینیدا؛ ئەم وڵاتانە سەرەتای سەردەمێکی نوێیان بە خۆیانەوە بینی، ئەو سەردەمەشیان ناونا (سەردەمی ڤایکینگی)، مەبەست لە (ڤایکینگ) ئەو ڕەگەزانەی باکوور بوو کە لە نیمچەدوورگەی (ئیسکەندەناڤی) بۆ نیمچەدوورگەی (دانیمارک) نیشتەجێبوون. هێرشی ئیسکەندەناڤییەکان لە سەدەی (٦ ز) بۆ سەر وڵاتانی ئەورووپا شێوەیەکی ترسناکی بەخۆیەوەبینی، ئەمانە ناویان لە خۆیاننابوو (ڤایکینگ) کە واتای دانیشتووانی (فیوردات – کەنداو)ی دەگەیاند. (فیوردات) دیاردەیەکی سروشتییە و بە هۆی دووری کەناراوەکانی بەشەکانی باکوور و باشووری ئەورووپا ئەو ناوەیان بەبەردابڕابوو، خەڵکی ئەو ناوچانە وێڕای بەدیکردنی جیاوازی لە زمانەکەیاندا؛ بەڵام خاوەنی یەک زمان بوون، دواتر وردەوردە زمانی دیکەی وەکو (سویدی، دانیمارکی، فەرەنگی) هاتنەکایەوە، دانیشتووانی ئەم ناوچەیە هەتا سەدەی (١١ ز) خاوەنی کەسایەتی تایبەت بە خۆیان بوون[2].

لێرەوە دانیمارکییەکان توانیان کۆمەڵێک ناوچە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە؛ وەکوو (خۆرئاوای بەڵتیک، جوتلاند، باشووری سوید) لە (هاللاند، سکانیا، بلیکنک). هەرچی نەرویجییەکان بوون؛ بەدرێژایی ڕووباری خۆرئاوایی نیمچەدوورگەی (ئیسکەندەناڤی) نیشتەجێ ببوون، بەڵام سویدییەکان لە ناوەڕاستی ئەم وڵاتەی ئێستای خۆیاندا کە پێکهاتوون لە ناوەندی دەریاچەی (میلار) نیشتەجێبوون[3].

واتە لە باشووری (گووت) دەژیان کە تیرەیەک بوون سەر بە گەلی مەزنی (گووتەکان)، بەڵام لە ناوچەکانی باکووری نیمچەدوورگەی (ئیسکەندەناڤی)دا گەلی (لابوسیۆن) نیشتەجێببوون کە جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ گەلەکانی پیشوو هەبوو،

---

(١) – جیمس ئاکوریک: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل١٦٠.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی، ص١٧٤.

(٣) فشر: تاریخ أوروبا العصور الوسطی، ص١١٣.

به ناوچەکـانی نیشـتەجێبوونی ئەو گەلانە دەگـوترا ئەورووپـای خۆرئـاوا. هەرچـی (نۆرمانـدی) بـوون کە واتـای باکوورییەکـانی دەگەیانـد؛ و هەر بە (نۆرمانـدی) لە دواتردا ناسران و بوونە هەڵگری ئەو ناونیشـانە. وڵاتانی (ئیسـکەندەناڤی) لە ڕووی جـوگرافییەوە نـاوچەیەکی داخـراو نەبـوون؛ وڵاتـی (سـوید) دەیـڕوانییە سـەر خۆرهەڵاتی دەریای (بەڵتیک)، هەروەهـا بە هـۆی کەنداو و ڕێژگەی ڕووبارەکانەوە کە دەیـانڕوانییە سـەر دەشـتەکانی (ڕووسـیا) لە بەشـی خـۆرهەڵاتەوە و لەوێـوە کرانەوەیـان هەبـوو بە ڕووی وشـکانیدا. هەرچـی شـوێنی دانیمارکییەکـان بـوو؛ کەوتبووە ناوەڕاستی سـەرزەوییەکانی نێوان هەردوو دەریـای (بەڵتیـک و بـاکوور)، ئەمـانەش بەردەوام برەویـان بە پیشـەی دەریاوانیـدا، لە لایەکیشـەوە کـاریگەری نەرویجییەکـانی خۆرئـاوا و باشـووریان لەسـەر دیـار بـوو، سـەرەڕای کـردنەوەی سـنوورەکانی وڵات بە ڕووی کـاریگەرییە دەرەکییەکانـدا[1]. ژیـاری گەلانـی (ئیسـکەندەناڤی) وێـڕای هەمەجـۆری و جیاوازیەکانیـان؛ لەگەڵ ئەوەشـدا خـاوەنی تایبەتمەندی خۆیان بوون لە ڕووی ڕەوشت و دابونەریتەوە و لەم سۆنگەیەشـەوە زۆر پێشـکەوتوو بـوون. گەلانـی (ئیسـکەندەناڤی) لە ڕووی ئـایینەوە هەڵگـری بیروبـاوەڕی (بتپەرسـتی جێرمـانی) بـوون و دیـاردە سروشـتییەکانی وەک (دار، کانیاو)یان دەپەرست، هەروەها (خۆر) پیرۆزییەکی تایبەتی هەبوو لای ئەم گەلانە و دەیانپەرست. یەکەم پەیوەنـدی گەلانـی (ئیسـکەندەناڤی) بە ئـایینی مەسـیحییەوە؛ لە سـەرەتای سـەدەی (٩ ز) بـوو لە ڕێگـای بازرگـانییەوە، بەتـایبەت لەگەڵ گەلـی (فربزبین)، بەمجۆرە ئایینی مەسیحی لەم ناوچانەدا بەرەبەرە بڵاوبووەوە و جێگەی بە بتپەرستی لەقکرد[2].

## ژیانی ئابووری گەلانی ئیسکەندەناڤی

گەلانـی (ئیسـکەندەناڤی) چـالاکی ئـابووری جۆراوجۆریـان هەبـوو؛ وەک (ڕاووشـکار، ئاژەڵـداری، کشـتوکاڵ) لە کشتوکاڵیشـدا کاریـان لەسـەر بەرهەمەکـانی وەک (گەنـم و جـۆ و شـێلم) دەکـرد، لە سـەدەی (٣ ز) ڕوویـانکردە پـاککردنەوە و چاککردنەوەی دارستانەکان و ئامادەکردنی بۆ کشتوکاڵ، ئەم جووڵەیە وردەوردە و

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في أوروبة، ج١/ ص٣٨٣.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في أوروبة، ج١/ ص٣٨٥.

ـوژلەدوایـرۆژ لە نـاوچە کەناراوەییەکـانەوە بەرەو نـاوەوە گەشـەی کـرد. گەلانـی ئیسـکەندەناڤی) بەکـۆمەڵ لە گونـدەکان و کـێڵگە داخراوەکانیانـدا و لەژێـر بەزەیـی هـۆیە جوگرافییەکانــدا دەژیـــان، خانووەکانیـــان لە دار و ســـەربازگە و شـــوێنی خۆشاردنەوەشـیان لە بەرد و قـوڕ دروسـت دەکـرد. لە سـەدەی (٩ ز) هەردوو پیشەی دەریاوانی و بازرگانی لای گەلانی (ئیسکەندەناڤی) چالاکییەیەکی ئابووری و سەرەکی و پڕبایەخ بوو، دەریاوانییەکانیان بە هۆی کەشتییە چارۆکەدارەکانیانەوە ئەرکە بازرگانییەکانیـان ڕادەپەڕانـد، بەمجـۆرە وڵاتـانی (ئیسـکەندەناڤی) لە کۆتـایی سـەدەی (٨ ز) و سـەرەتای سـەدەی (٩ ز) توانیـان کۆمەڵێـک پەیوەنـدی بازرگـانی لەگەڵ خۆرهەڵات؛ وەک (بیزەنتی و ئیسلامی) دابمەزرێنن[1]، شتومەک و کەلوپەلیان لە ڕێگـای ڕووبـاری (ڤۆلگـا و دنیـر) دەگەیانـدە ناوچەکـانی دەریـای (بەڵتیـک). نۆرماندییەکان بە هەمـان ڕێگـادا خـوری و کۆیلەیـان بـۆ (کەسـتەنتینییە و بەغـداد) دەنـارد، بە هەمـان شـێوە بـۆ دوورگەی (گونلانـد) و شـاری (بیرکـا) لە دوورگەی (بیورکوو) لە ناوەڕاسـتی (مـیلار). لە دانیمـارکیش بەنـدەری (شـلزفیک و هیشـابوو) لەسەر ڕووبـاری (شـلای) کە ناوەنـدی بنەڕەتـی ئەو بازرگانییە بوون. ئەم ناوچـانە بـوون بە ناوەنـدێک بـۆ پێکەوەبەسـتنەوە و پاراسـتنی پەیوەنـدییە بازرگانییەکـانی نێوان هەردوو گێتـی خـۆرهەڵات و خۆرئـاوا، بازرگانەکـانی (ئینگلیـز و سەکسـۆنی وفریزی) لە ڕێگەی بەنـدەری (دوورشـتید) کوتـاڵی تایبەتیـان دەبـرد بـۆ ئەورووپـا و کەرەستەی ئاسنین بەتایبەتی شمشێر و تیروکەوانیان بۆ خۆرهەڵات دەهێنا[2].

## کۆمەڵگا و دەوڵەت

پێکهاتەی گەلانی (ئیسکەندەناڤی) لە کۆتـایی سـەدەی (٨ ز) و سـەرەتای سـەدەی (٩ ز)دا پێکهاتەیەکی کـۆمەڵایەتی خـانەدانی بـوو، لە کۆمەڵگـادا چینـی سـەرکردەکان (یـارڵ) هەبـوو کە خـاوەن دەسـەڵاتێکی بەهێـز بـوون لە هێرشـە سـەربازییەکانیدا و پشـتی بە (چینـی ئـازادیخوازان) دەبەسـت، دەسـەڵاتی گشـتی زیـاتر لەدەسـت ئەنجوومەنی چینـی ئازادیخوازانـدابوو نەک پاشـا؛ کە لە ڕێگـای هەڵبـژاردن دەهـاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. بەڵام دەسەڵاتی پاشایەتی لە (دانیمارک) جیاواز بوو لەو

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٠.

(٢) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في أوروبة، ج١/ ص٣٨٦.

دەسـەڵاتەی کە لە (سـوید و نەرویـج)دا بـوونی هەبـوو، لە کۆتـایی سـەدەی (٨ ز) دامەزرانـدنی دەوڵەت لە (نەرویـج) لە سـەردەمی (فیـورد ئۆسـلۆ) و لەسەردەسـتی پاشـاکانی (فیسـتفولد) دەسـتی پـێ کـرد، لە (سـوید) پاشـاکانی (ئۆبلانـد) دەوڵەتیـان دامەزرانـد؛ بەڵام نەیـانتوانی (گـووتی کیشـووی) بـخەنە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـانەوە، هەروەهـا دانیشـتووانی دورگەی (گوتلانـد) هەتـا پـاش (١٠٠) سـاڵ ئینجـا بڕیاریانـدا کەوا بـاج بـدەن، شانشـینی (دانیمـارک) بەهێزتـرین شانشـین بـوو لە نـاوچەکەدا، ڕامیـاری دەرەکیـان ڕامیـارییەکی دیکتاتۆریـانە بـوو، ئەوە بـوو لە سـەدەی (٨ ز)دا باشووری نەرویجیان داگیر کرد[1].

پاشای دانیمارک (گود فرواد) لە هەوڵی ئەوەدابوو دەسەڵاتی بەرەو ناوچەکانی باشـوور لەسـەر هەژمـاری (ئاویودریت، فەرەنگە) فراوان بکـات، بەڵام (شـارلەمان) ببوو بە کۆسپ لەسەر ڕێگای فراوانخوازیەکانیدا و کوشتنی (گود مزوار) لە ساڵی (٨١٠ ز) بووە سەرەتای بەرپابوونی جەنگیکی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵات[2].

## هێرشەکانی دەریا

مێـژووی گەلانـی (ئیسـکەندەناڤی) لە سـەدەی (٩ ز) جیـادەکرانەوە بە زۆری هێرشـی دەریـایی کە ناسـراو بـوو بە (دەریـاوانی و بازرگـانی)، ئەمەش چالاکییەکی ئـابووری گونجـاو بـوو بـۆ دانیشـتووانی کەنـداوەکان لە وڵاتـانی ئیسـکەندەناڤیا، لە هێرشە دەرياييەکاندا جگە لە کاری بازرگانی؛ هەندێکجار کاری چەتەیی تێدا بوو. لە چـارەکەی دووەمـی سـەدەی (٩ ز) کـاری چەتەیـی لە دەریـادا لای وڵاتـانی (ئیسـکەندەناڤی) بـرەوی زیـاتر بـوو لەچـاو بازرگانیـدا، هێرشـەکانی (نەرویـج) لە سەدەی (٧ ز) دەستی پێ کرد بۆ ناوچەکانی (هیرید و شتلاند و میروە) و بەمەش توانیان ناوەندێکی تێدا دابمەزرێنن. بەڵام کەشتییەکانی (نۆرماندی) لە سەدەی (٨ ز) توانیـان بە هـۆی باکووری دوورگەی ئیکوسـیا (سـکوتلاندا)وە بگەنە ناوچەکانی باشوور، نۆرماندییەکان لە ساڵی (٧٨٧ ز) هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی (ئینگلیز) لەنزیـک (دورشـتر). هەروەهـا لە سـاڵی (٧٩٥ ز) توانیـان هێـرش بـکەنە سـەر

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٢٨٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٧٩.

دوورگەیەک لەناو (ئێرلەندا)دا، ئەگەر سەرنج بدەین لەم ڕووداو و هێرشانە؛ کاری چەتەیی و پەلاماردان بۆ دوورگەکانی (بەریتانیا) هەتاوەکوو ساڵی (٨٣٥ ز) بەردەوام بووە، لەو ساتە بەدواوە هێرشەکانی وڵاتانی (ئیسکەندەناڤی) بەرەو کەنارەکانی دەریای (بەڵتیک) ئاڕاستەکەی گۆڕا، دانیمارکییەکان توانیان لە سەرەتای سەدەی (٩ ز) بەندەری (ڕیریک) لە وڵاتی (ئاویودرین) بخەنە ژێر ڕکیفی خۆیانەوە[١].

هەروەها سویدییەکان پرۆسەی هێرش و پەلاماردانیان بۆ ئەو ناوچەیە دەست پێ کرد و بەو جۆرە لە (کورلاند) هەندێک دەزگای بێهێز و لاوازیان دامەزراند بە مەبەستی کاری چەتەیی، لە سەدەی (٩ ز)دا توانیان لە کەنارەکانی (فنلاندا) و دەریاچەی (لادوگا) نیشتەجێ ببن و ناوەندێکیان دامەزراند لەژێر ناوی (فاریگین)؛ وەکوو ناوەندێکی بازرگانی کە هەندێکجار بۆ کاری بازرگانی و هەندێکجاریش بۆ هێرش و پەلاماردان و کاری چەتەیی بوو[٢].

لە ساڵی (٨٣٩ ز) نوێنەری خۆیان (باڵیۆز) لە شاری (کەستەنتینییە) دانا، هەروەها سەرکردە سەرکێشەکانی سوید کە لەژێر فەرمانڕەوایی بازرگانە مەزنەکاندا بوون؛ توانیان بۆ یەکەمجار لە نیوەی ئەو سەدەیەدا یەکەم دەوڵەتیان لە (ڕووسیا) دابمەزرێنن و هێندە بەهێز بوون کە لە ساڵی (٨٦٠ ز)دا شاری کەستەنتینییەشی خستە ژێر مەترسییەکی گەورەوە. جێگەی ئاماژەیە کە ئەم دەوڵەتە شوێندەستی دیار بووە لەسەر شارەکانی (ڕووسیا)، سەرەڕای ئەوەی هەر شارێک ناوی تایبەت بە خۆی هەبووە[٣].

## هۆکارەکانی هێرشی نۆرماندییەکان

١. زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووانیان وایکرد کە کێڵگە کشتوکاڵییەکان نەتوانن بڕە خۆراکی ئەو خەڵکە زۆرە بۆ دابین بکەن.

٢. دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز وای لە جەنگاوەرەکان کرد کە وڵاتەکانیان بەجێبهێڵن.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٨٩.

(٢) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١١٧.

(٣) نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في اوروبة، ج١/ ص٣٨٩.

٣.  حەزکردن بە سەرکێشی و هێرش و پەلاماری ناوچەی دەریایی لە لایان.
٤.  بازرگانی ولاتانی (ئیسکەندەناڤی) زەمینەی خۆش کرد بۆ کەڵەکەبوونی سەرمایە و بوژانەوەی ئابووری دانیشتووانی باکوور.
٥.  ئەم بازرگانییە خەڵکی ناوچەکانی باکووری بە گێتی خۆرئاوا ئاشنا کرد بۆ بەدەستهێنانی کەرەستەی پێویست، هەر بۆیە دەستیان کرد بە هێرشکردن بۆ سەر ئەم ناوچانە.
٦.  بێهێزی خۆرئاواییەکان بۆ بەرگریکردن لە ولاتەکانیان هاندەرێکی دیکە بوو بۆ پەلامار و هێرشی نۆرماندییەکان[(١)].

## گێتی ئیسکەندەناڤی هەتا کۆتایی سەدەی نۆی زایینی

هەرێمی (ئیسکەندەناڤیا) هەتا ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم یەک زمانی سەرەکیان هەبوو و  بە سەردەمێکی دواکەوتوویيدا ژیانیان بەسەر دەبرد، بەلام دوای ئەو سەردەمە زمانەکەیان چەندین زمانی دیکەی لێ بووەوە و هەرێمەکەش بووە چەند پارچەیەک کە بریتیبوون لە (سوید، دانیمارک، نەرویج، فینلەندا). هەتا ئەو سەردەمەش دانیمارکییەکان لە بەشی دوورگەکانی خۆرئاوای دەریای (بەلتیک) و (نەرویجییەکان) لە کەناری خۆرئاوای دوورگەکە و (سویدییەکان) لە ناوەڕاستدا و (گووتەکان)یش لە باشوور و (لابۆنیۆن)کانیش لە بەری باکووری دوورگەکە نیشتەجێبوون. سەرجەم ئەو کۆمەڵ و هەرێمانە لای دانیشتووانی خۆرئاوای ئەورووپا بە (نۆرماندی) و  هەرێمی نۆرماندییەکان ناسرابوون. سەبارەت بە پەیوەندیشیان بە دەرەوەی دوورگەکە؛ ئەوا (سویدییەکان) لە ڕێگای دەریای باڵتیکەوە بە (ڕووس) و دانیمارکییەکانیش بە ئەورووپییەکانەوە بەسترابوونەوە. هەموو ئەمانە پێکەوە ئەو نیمچەدوورگەیەیان بە گێتی دەرەوە گرێدابوو. ڕەوشی (ئیسکەندەناڤییەکان) لە ڕووی ڕەوشتییەوە لە ئاستێکی دواکەوتوودا بوون. خوێنڕشتن و چەوساندنەوە و دیاردەی زۆری و تۆڵەسەندنەوە و سیستمی خێڵایەتی لە گرنگترین دیاردە ڕەفتارییەکانی ئەو سەردەمەدا بوون. ئایینی (ئیسکەندەناڤییەکان) کۆمەڵێکی بتپەرست و سروشتپەرست بوون، لە گرنگترین

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١٧٥.

خوداوەندەکانیشیان بریتیبوون لە (سوور، ئوودن، فرۆ). لە سەرەتای سەدەی نۆشدا باوەڕیان بە مەسیحییەت هێنا و ئەو دیاردەیەش سەرەتا لەناو بازرگانەکاندا بڵاوبووبووەوە هەتا بە هۆیەوە بایەخ و سوود بە بازرگانییەکانیان بگەیەنن. لە بواری نووسینیشدا (ئیسکەندەناڤییەکان) لە ڕووی نووسینەوە (ئەبجەدی ڕۆنی)یان بەکاردەهێنا و لە سەدەی سێیەمی زایینیشەوە نووسینی (ئەبجەدی لاتینی و ئەبجەدی گریکی)یان تێدا بڵاوبووەوە، بەڵام نووسینی فەرمی لای ئەوان هەتا سەدەی نۆیەم؛ نووسینی (ئەبجەدی ڕۆنی) بوو کە لە (١٦) نیشانە پێکهاتبوو. لە ڕووی ژیاری ماددییەوە؛ (ئیسکەندەناڤییەکان) بایەخیان بە ئاوەدانی و بنیاتنانی کۆشک و تەلار دەدا، هەروەها زینەیان لە جوانکاری و ئاسن و مس و زیویان لە چەک و پێویستییەکانی ڕۆژانەدا بەکاردەهێنا و هونەری زەخرەفەیان لە بیناسازی بەکاردەهێنا، لەو ڕووەشەوە کەوتنە ژێر کاریگەری (کارۆلینجی و سەکسۆنی و ئێرلەندییەکان). لە ڕووی ئابوورییەوە بنەماکانی ئابووری لای ئەوان لەسەر ڕاوەماسی و ڕاوی ئاژەڵەکان و بەخێوکردنی ئاژەڵ و چاندنی دانەوێڵە و میوە وەستابوو. سەرەڕای دەریاوانی و بازرگانی لە ڕێگای دەریاوە؛ ئەو پێگە دەریاییەیان هاوکاری کردبوون کە شارەزاییەکی تەواویان لە دەریاوانیدا هەبوو، هەر بۆیە لە سەدەی نۆیەمی زایینیدا بازرگانیان لەگەڵ (بیزەنتی و موسڵمانەکان) دەست پێ کرد و تێیدا بازرگانی قوماش و ماسی و شمشێر و تیر و دەیان شتی دیکەیان لەگەڵدا دەکردن. لە سەرەتای سەدەی نۆیەمیشدا سکە پارەی خۆیان لێدا، هەروەها کۆمەڵگای (ئیسکەندەناڤی) کۆمەڵگەیەکی شانشینی خانەدانی بوون و (ئەنجوومەنی گەل)یش کە هەڵبژێردراوی خەڵک بوون؛ کاروباری میللەتیان لە چوارچێوەی دەوڵەتدا جێبەجێ دەکرد. پاشایەتی لە (دانیمارک)دا بەهێزتربوو لەچاو (سوید و نەرویج)، لە (نەرویج) و لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی زایینیدا (هالفران) و کوڕەکەی (گودفرید) ناوچەکەیان لەدەست دانیمارکییەکان ڕزگارکرد و ناوچەی دیکەشیان داگیرکرد و بەمەش سنووری دەسەڵاتیان فراوان کرد[1]. هەروەها لە شانشینی (سوید)یشدا دەسەڵاتی خۆیان بەهێز کرد؛ بە جۆرێک لە سەدەی دەیەمدا باجیان بەسەر (گرینلاند)دا سەپاند. (دانیمارک)یش دەوڵەتێکی داگیرکەری

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في أوروبة، ج١/ ص٣٨٩.

دروستکرد و ئەگەر بەتوانایی (شارلەمان)ی فەرنگەکان نەبووایە؛ دوورنەبوو دەسەڵاتداریتیان لە سەردەمی (گودفرواد)دا نەگاتە ناوچەکانی دەوڵەتی فەرنگە و ناوەڕاستی ئەورووپا!

دەریاوانی یەکێک بوو لە کارە گرنگەکانی خەڵکی (ئیسکەندەناڤی) و دەسەڵاتداریتییەکانی، تەنانەت چەندین دەزگای دەریاوانیان لە دەسەڵاتەکانی (هبرید و شلاند و فیروە) دامەزراند، هەتا گەشت بەوەی لە ساڵی (٧٨٧ ز)دا پەلاماری کەنارەکانی ئینگلتەرایاندا و ئەوە بوو لە ساڵی (٧٩٥ ز) پەلاماری دوورگەی ئیرلەنداشیاندا، تەنانەت لە ساڵی (٨٣٥ ز) لەشکرکێشییەکانیان گەشتنە سنوورەکانی دەوڵەتی (فەرەنگ). لە لایەکی دیکەوە فینلەندییەکان پەلاماری کەنارەکانی ڕووسیایاندا، هێندە بەهێز بوون لە ساڵی(٨٦٠ ز) بوونە هەڕەشە بۆ (کەستەنتینییە)، سەرجەم ئەو کارانەش بە هێزی دەریاوانی و کەشتییە چارۆکەدارە (ئیسکەندەناڤییەکان) ئەنجامدرا.

## هۆکاری شەڕەنگێزی نۆرماندی (ئیسکەندەناڤییەکان)

١. زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و کەمی زەوی کشتوکاڵی.

٢. سەرهەڵدانی دەوڵەتی بەهێز کە ئازادیخوازانی هاندا وڵات بەجێبهێڵن.

٣. حەز و ئارەزوومەندیان بۆ شەڕ و تاڵانی و کوشتن و بڕین.

٤. بەهێزی بازرگانیان لەگەڵ دەوروو‌بەر، هانی شەڕ و دەستبەسەرداگرتنی هەموو بازرگانیەکانیان.

٥. شارەزابوونی نۆرماندییەکان بە دەرامەتی ئابووری ئەورووپای ناوەڕاست و باشوور.

بەکورتی ئیسکەندەناڤییەکان کۆمەڵێکی (دواکەوتووی، بتپەرستی، دەریاوانی، شەڕانگێزی، هێرشبەر) بوون و لە دواتردا گۆڕان بۆ کۆمەڵێکی پێشکەوتوویی (مەسیحی، ئاشتیخوازی، بەرگریکار)[1].

---

(١) نورالدين حاطوم: تاريخ العصور الوسيط في أوروبة، ج١/ ص٣٨٩.

# بەشی یازدەیەم

- دەرەبەگایەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا
- مێژووی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی
- سیستمی دەرەبەگایەتی
- هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی
- کۆتایی سیستمی دەرەبەگایەتی و هۆکارەکانی

## مێژووی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی

سـەبارەت بە مێـژووی سـەرهەڵدانی سیسـتمی دەرەبەگـایەتی لە ئەورووپـادا ـێژوویەکـی دیـاریکراوی نییە! بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا لەنێـوان مێژوونووسـانی ئەو ـوارەدا بۆچـوونی جیـاواز هەیە؛ هەنـدێک مێژوونـووس پێیـانوایە مێـژووی ـەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی دەگەڕێتەوە بۆ سـەرەتای سـەدەکانی ناوەڕاسـت و بـاس ـوەش دەکەن لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی کرداری ئەم سیسـتمە دەرکەوتـووە و ـەردەوامبووە هەتا سـەدەی سیازدەهەمی زایینی. بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان ـیانوایە ئەم سیستمە لە سەدەی نۆیەم و دەیەمـی زایینیدا لە ئەورووپای خۆرئـاوا ـەریهەڵداوە؛ بەتـایبەتی لە سـەردەمی (شـارلەمان) بە ڕوونـی دەرکەوتـووە و وردە ـردە جێی خۆی کردووەتەوە و بـوو بە سیسـتم لە بـواری ئـابووری و کۆمەڵایەتی کارگێڕیدا. بەڵام هەندێکی دیکە لە مێژوونووسـان پێیانوایە کە لە سـەدەی دەیەم و ـازدەهەمی زایینیدا؛ دەرەبەگـایەتی لە زۆربەی ئەورووپـای خۆرئـاوادا گەیشـتووەتە ـوتکەی قۆنـاغی پێشکەوتنی[1].

بەڵام دەکرێـت بڵێـین سـەرەتای دەرکەوتنـی سیسـتمی دەرەبەگـایەتی لە ـواسـاتەکانی ئیمپڕاتـۆرییەتی (ڕۆمـانی) دەسـتی پـێ کـرد و بەتـایبەتی لە نـاوچە خورئاواییەکـان و هـێڵە سەرەکییەکانیشـی لە سـەردەمی هەردوو ئیمپڕاتـۆرییەتی فەرەنگـی و کارۆلینجییەکـان) دەرکەوتـن؛ بەڵام لەنێـوان هەردوو سـەدەی دەیەم و یازدەهەمی زایینیدا گەیشتە ساتی گەڵاڵەبوونی[2].

لە ئینگلتەراشـدا و لە سـەردەمی (ویلـیەم فـاتح ١٠٦٦-١٠٨٧ ز) دەرەبەگـایەتی سـەریهەڵدا؛ بەو پێـیەی (ویلـیەم فـاتح) لە بنەڕەتـدا پاشـکۆیەکی دەرەبەگـایەتی (vasal)ی پاشای (فەڕەنسا) بوو، هەر لە سـەرەتای دەسـەڵاتەکەیدا کۆمەڵێک یاسا و ڕێسـای نـوێی هێنایەکـایەوە و هەرچـی قەڵا هەبـوو لە (ئینگلـتەرا) خسـتییە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆیەوە و بەبێ ڕەزامەندی ئەو نەدەبوو هـیچ قەڵایەک بنیاتبنرێت، ئەو دەرەبەگـایەتیەی (ویلـیەم فـاتح) جێبەجێی دەکـرد نمـوونەی دەرەبەگـایەتی بـوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەموو زەوییەکانی (ئینگلتەرا)ی کردە موڵکی خۆی و پاشان

---

(١) جیمس ئا. کوریک: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، ل٨٥.

(٢) عبدالقادر أحمد الیوسف: س. پ، ل ١٣٤.

بەسەر گەورە و دەستوپێوەندەکانیدا دابەشیکرد، ئەوانیش بەسەر داروودەستەکانیاندا دابەشیانکرد[1].

## سیستمی دەرەبەگایەتی

دەرەبەگـــایەتی ئەو سیســـتمە ئـابووری و رامیــاری و کـۆمەڵایەتییە بــوو کە ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستی گرتەوە؛ بەتـایبەتی بەشـی خۆرئـاوای ئەورووپـا، هەروەهــا شــێوازێکە لە شــێوازەکانی دەســەڵات کە لە ئەنجــامی ڕێکەوتنــی نێــوان دەرەبەگ و جووتیـاردا دروسـتبووە، هەروەهـا سیسـتمێکی پشتاوپشـت بـوو کە پلە کۆمەڵایەتییەکــان لەبــاوکەوە بــۆ کــوڕو نەوەکــان دەگــوازرایەوە، لە گرنگتــرین تایبەتمەندییەکانی ئەم سیستمە؛ پێدانی زەوی کشتوکاڵی بوو بە کەسێکی دیاریکراو، لەپێنــاو خزمەتــی ســەربازییدا، لەم سیســتمەوە شــێوازی ئاغــا و ژێردەســتەیی هاتەکــایەوە، یەکە دەرەبەگایەتییەکــان ســەرەڕای ئەوەی یەکەیەکــی ســەربازی بچووکی ناوچەیی بوون؛ لە هەمان کاتدا بریتیبوون لە دەوڵەتێکی بچووک، هەروەها یەکەیەکی ئـابووری و دادوەریش بـوون بـۆ خۆیـان. لە سیسـتەمی دەرەبەگایەتیـدا دەسەڵات شێوازێکی هەڕەمی هەبوو؛ لە لووتکەی هەڕەمەکەدا گەورە دەرەبەگەکـان بوون کە ڕاستەوخۆ شوێنکەوتەی پاشاکان بوون، دوای ئەوانیش (بـارۆن) بوو کە ئەمــانیش ژمــارەیەک دەرەبەگــی لە خۆیــان بچــووکتر لەژێــر دەســەڵاتیاندابوون و دواتریش سوارەکان، کۆتا چینی خوارەوەی هەڕەمەکە جووتیار و کۆیلەکـان بوون. سیستمی دەرەبەگایەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست و لە مێژووی ئەورووپای خۆرئـاوا گرنگییەکی تایبەتی هەیە؛ چونکە جگە لەوەی دەسەڵاتێکی دیـار و بەرچـاوی هەبوو لە مێژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـت، بەڵکـوو مـاوەیەکی دووردرێژی لە ئەورووپـادا تەمەنـی خـۆی بەسـەربردووە و ئەوەنـدە ڕەنگـدانەوە و کـاریگەری هەبـوو لەنێـو کـۆمەڵگەدا، گەیشـتووەتە ئەو ئاسـتەی لای هەنـدێک لە مێژوونووسـانی سـەدەکانی ناوەڕاست بە سەردەم و قۆنـاغی دەرەبەگـایەتی ناوزەند بکرێت، واتە باڵادەسـتی و هەژمــوون و ســەروەری دەرەبەگــایەتی لە قۆناغێــک لە قۆناغەکــانی مێــژووی ئەورووپادا بابەتێکی گرنگ و حاشاهەڵنەگرە.

---

(١) د. عبدالأمير محمد: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص ١٤٢.

دەرەبەگـایەتی سیسـتمێکی کۆمەڵایەتی و ئـابووری و ڕامیـاری بـوو، دیـارترین سیمای کۆمەڵگای ئەورووپا بوو لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا، ماوەی چەندین سـەدە یـان دەکرێـت بڵێین بەدرێژایـی مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـت لە بەشـی خۆرئـاوای ئەورووپـا وەکـوو شـوێنگرەوەی دەسـەڵاتەکانی پێشـوو فەرمـانڕەوایی کـردووە، هەروەهـا دەرەبەگـایەتی بەمجـۆرەش پێناسـەکراوە: "تـاقیکردنەوەیەکی کـرداری بـووە کە ڕووداوەکـانی ئەوکـاتە سـەپاندوویانە وەکـوو شـوێنگرەوەی دەسەڵات"[1].

دەرەبەگایەتی (فیوداڵیزم) یەکێکە لەو بابەتانەی چەندین بیروڕای جیاواز هەبووە لەسەر (ناوەکەی، مێژووی سـەرهەڵدان و کۆتاییهاتنی، هۆکارەکـانی سـەرهەڵدان و کۆتایی)، هەروەها چەندین لقی جۆراوجۆری لێ بووەتەوە، بۆیە قورسـە واتـایەکی پڕبەپێسـت بـۆ وشـەی دەرەبەگـایەتی (فیـوداڵیزم) بـدۆزرێتەوە، چـونکە هەتـا کۆتاییەکانی سـەدەی هەژدەی زایینـی ئەم نـاوە زۆر دیـار و بڵاو نەبـوو! واتە هەتـا دوای شۆڕشی فەڕەنسی (١٧٨٩ ز) زیاتر سەرەنجی بەشـێک لە مێژوونووسـانی بۆ هەندێک لە خەسڵەتە دیارەکـانی ڕژێمـی لەنـاوچووی (فەڕەنسـا) ڕاکێشـا، لەوکـاتەوە هەندێ وشە بۆ (فیوداڵیزم) لە زمانەکانی مێژووی ئەورووپادا بەشێوەیەکی ئاسـایی پەیدابوون، هەندێک لە مێژوونووسانی ئەوکاتە وا پێناسەیان کردووە کە: "شێوازێکە لە شـێوازەکانی فەرمـانڕەوایی کە تێیـدا دەسـەڵات بەکاردەهێنرێـت لە ئەنجـامی ڕێکەوتنێک لەنێوان گەورە و پاشکۆکانی یان (دارودەستەکەی)"[2].

بێگومـان سیسـتمی دەرەبەگـایەتی شـتێکی لە پێشـەوە داڕێـژراو نەبـوو؛ بەڵکـوو درێژکەرەوەیەکبـوو بەرامـبەر بە هەمـوو ئەو پشـێوییە کـارگێڕی و ئـابوورییەی لە ئەنجـامی لاوازبـوون و ڕووخـانی ئیمپراتـۆرییەتی (ڕۆمـانی خۆرئـاوا) کە بە دوای خۆیـدا هێنـابووی، ئەو سیسـتمە لەو شـوێنانەدا کە ئیـدی باسـێک لە زنجیـرە ڕیزبەندییەکانی دەسەڵات و بەڕێوەبەرانی پێشـوو نەمـا و لە بەرامـبەردا سیسـتمێکی نوێی داهێنا[3].

---

(١) د.عبدالأمير محمد: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج٢/ ص٣٠٢.

(٢) د.عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١١٨ .

(٣) جیمس ئا. کوریک: سەدەکانی بەرایی ناوەڕاست، و: عەلی بوداغی، چ١، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ل٨٥.

ئەم سیستەمە سەرەتا بە میرایەتی و خاوەندارێتی زەوی دەستی پێ کرد، کـ
ئەو جووتیارانەی بە هۆی ئەو باج و بارگرانیانەی میری خستبوویە سەرشـ
قەرزار ببوون و توانای دانەوەی قەرزەکانیان نەبوو، لە ناچاریدا دەبوو
کۆیلەی زەوی و سوێندی دڵسۆزییان بۆ دەرەبەگ و خاوەن زەوییە دەوڵەمەنـ
دەخوارد کە هەتا کۆتایی ژیانیان کۆیلە و خزمەتکارێکی دڵسۆزی ئەوان بـ
دوای خۆشیان نەوەکانیان کۆیلەیان دەبن[1].

جووتیارەکان بە ویستی خۆیان و بەپێی ڕێکەوتنێک دەبوون بە کـ
سوێندی وەفادارییان بۆ دەرەبەگ و خاوەنزەوییەکان دەخوارد، بە جۆرێک لە
هەردوو ئەژنۆیان و لەبەردەم گەورەکەیان چۆکیان دادەنا وەک ملکەچبوون دە
دەخستە نێو دەستی دەرەبەگەکەی؛ بەو واتایەی هەموو ئەرکەکانی داوەتە
ئەو و سوێندی دڵسۆزی بۆ دەخواست کە بەمشێوەیە بوو: "بۆ ئاغای گەو
مەزن؛ چونکە هەمووان دەزانن کە من ناتوانم جلوبەرگ و خواردنی ڕۆ
دابینبکەم، هەربۆیە چاوی هیوا و ئومێدم لە ئێوە و نیازپاکی ئێوە وایکردووە
لەژێر باڵ و سێبەری ئێوەدا بژیم. بەو واتایەی کە ئێوە جلوبەرگ و خواردنی
دابینبکەن بۆ ئەوەی بتوانم خزمەتی ئێوە بکەم، منیش هەتا دواساتەکانی ژ
دەبێت خزمەتکار و بەڵێندەری ئێوەبم، ئەو کارە لە ناخی دڵەوە و بە پێخۆشبو
خۆم دەکەم و لە هەموو تەمەنی ژیانمدا مۆڵەتی ئەوەم نابێت لەژێر بـ
سەرپەرشتی ئێوە دەربچم، هەریەکێک لە ئێمە بیەوێت ئەم ڕێکەوتنە تێکبدات؛ بە
قەرەبووی لایەنی بەرامبەر بکاتەوە، ئەم بەڵێن و ڕێکەوتنە هەرگیـ
هەڵناوەشێتەوە"[2]!

دەرەبەگەکان دەسەڵاتداری ڕەهای ناوچەکانیان بوون، و خاوەن هە
دەسەڵاتێکی سەربازی و کارگێڕی و یاساییش بوون، کۆیلەکان مافی ئەوە
نەبوو لای دەرەبەگێکەوە بچنە لای دەرەبەگێکی دیکە و ببنە کۆیلەی[3].

لە سیستمی دەرەبەگایەتیدا؛ زەوی یەکەی بەرهەمهێنی بنەڕەتی ناو سەدەک
ناوەڕاست بوو، بۆ دوو بەش دابەش دەبوو: بەشێکیان هی دەرەبەگەکان بوو: 

---

(١) موريس بيشوب: تاريخ أوروبا فى العصور الوسطى، ص١٢٢.

(٢) د.عبدالقادر احمد يوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ل١٢٨؛ جيمس ئا. كوريک: س. پ، ل٨٨ – ٨٩.

(٣) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٠٢.

دەگوترا (دۆمین)، بەشێکی دیکەش جووتیارەکان کاریان تێدادەکرد، لە بەرامبەر بەخششێکی دارایی و ئەرکێک کە لە بەرژەوەندی خاوەنزەوی و دەرەبەگ بەجێیان دەگەیاند. جووتیارەکانیش بۆ دوو دەستە دابەشبوون: جووتیارە ئازادەکان و کۆیلەکان. کۆیلەکان پەیوەست بە زەوی بوون و نەیاندەتوانی بەجێیبهێڵن و مافی هاوسەرگیرییان نەبوو بەبێ مۆڵەتی گەورەکانیان و دوای مردنیشیان نەوەکانیان بە هەمان شێوەی خۆیان دەبوون بە کۆیلە. جووتیارە ئازادەکانیش بارودۆخیان لە کۆیلەکان باشتر نەبوو! چونکە تەنها بە ڕووکەش نەبێت ئازادبوون، ئەوان دەبوو بەشێک لە داهاتیان بە خاوەنزەوییەکان ببەخشن، دەبوو لە ماڵی خاوەنزەویدا خزمەت بکات و لە چەندین بۆنەی تایبەت بە دەرەبەگەکانیاندا بەشداری بکات[1].

هەروەها جگە لەو پابەندبوونانەی سەرەوە کە باسمانکرد؛ جووتیارەکان کۆمەڵێک ئەرک و پابەندبوونی دیکە لەسەریانبوو، دەبوو جێبەجێی بکەن بەرامبەر دەرەبەگ و گەورەکانیان؛ ئەوانیش:

١. پێدانی (٣) باج لە ساڵێکدا.

٢. پێدانی بەشێک لە دانەوێڵە و مەڕوماڵاتەکەی.

٣. کارکردنێکی زۆری ڕۆژانە بەدرێژایی ساڵ.

٤. پێدانی بڕێک پارە لە بەرامبەر بەکارهێنانی هەر کەلوپەل و خواردن و خواردنەوەیەکی خاوەنەکەی.

٥. پارەدان لەبری ڕێگەدان بە ڕاوکردنی ماسی و ئاژەڵی کێوی.

٦. بەشداریکردنی هەر شەڕێک کە گەورەکەی تێیدا بەشداربووایە.

٧. لە کاتی پلە بەرزبوونەوەی کوڕی خاوەنەکە بۆ پلەی سوارچاکی؛ دەبوو دیاری بۆ ببردایە.

٨. هەر کالا و شمەکێک دەیفرۆشت دەبوو باجی بدایە.

٩. کڕینی هەندێک لە کەلوپەلەکانی گەورەکەی بە ناچاری.

١٠. ئەگەر کوڕێکی بناردایە بۆ خوێندن یان کەنیسە ئەوا سزای ماددی دەدرا[2]!

دەرەبەگەکان خاوەنی دەسەڵاتی ڕامیاری و سەربازی و ئابووریش بوون، هەروەها سوپایەکی تایبەتی سوارەیان هەبوو، جگە لەوانەش خاوەنی دەسەڵاتی

---

(١) جفری برۆن: پوختەی مێژووی ئەوروپا، و: نهاد جلال، چ١، ناوەندی ڕۆشنبیر، ٢٠٠٩ ز، ل١٣٧.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٠٥.

دادەوەری بــوون، دەیــانتوانی دادگــایی خەڵکــی بــکەن و هەنێکجــار ســزای لەسێدارەدانیشیان بەسەر خەڵکدا سەپاندووە. بەپێی ڕێسای دەرەبەگایەتی؛ دوای مردنـی بـاوک کـوڕەکەی دەبـووە دەرەبەگ (فیـوداڵ)، واتە سیسـتمی پشتاوپشـتی پەیڕەودەکرا، هەروەک چۆن بۆ کۆیلەکـانیش وا بـوو؛ بەڵام ئەگەر بەتەنها کچـی هەبووایە ئەوا دەسەڵات دەگوێزرایەوە بۆ مێردی کچەکە[1].

دەسەڵات لە سیستمی دەرەبەگایەتیدا بە شێوازی هەڕەمی بوو؛ بە جۆرێکی گەورە (تیجانەکان) وەک دۆق و پاشاکان لە سەرووی لووتکەی هەڕەمەکەوە بوون و چینی باڵای دەرەبەگایەتی بوون، دوای ئەوان (باڕۆن) دەهات کە خاوەنموڵکەکان بــوون، دەیــان زەوی و چەنــدین دەرەبەگــی لە خۆیــان بچــووکتر لەژێــر دەسەڵاتیاندابوو، دووانیشیان لە سوارەکان بوون کە سەرپەرشتی چەکدارەکانیان دەکـرد، کۆتـا چینـیش لە خـوارەوەی هەڕەمەکەوە بـوون، جووتیـار و کۆیلەکـان بوون[2].

لە مــاوەی ســەدەکانی دەیەم و یــازدەیەم لە ئەورووپــای خۆرئاواییــدا قەڵا دەرەبەگییەکـان بڵاوبـوونەوە کە لە شـێوەی کۆشـکدا بـوون، لە سـەرەتادا لە دار و تەختە بە (٢) نهۆمی لە شێوەی بورجێک دروستدەکرا کە دەرەبەگ و خێزانەکەی لە نهۆمی دووەمدا دەژیان و نهۆمی یەکەمیش کۆگای دانەوێڵە و ئاژەڵەکان بوو، جگە لە بوونی شوێن بۆ خزمەتگوزاران[3].

پاشان بنیاتنانی قەڵاکان پێشکەوتن؛ لە سـەرەتادا لە بەرد و لە چەند ناوچەیەکی بەرزدا بە چەند نهۆمێک کە دەگەیشتە (٥) نهۆم بنیاددەنران و شورایەک یان دوو شورای بەردین و خەندەقێکی قووڵ لە دەوریدا بوو؛ لەگەڵ پردێکی جووڵاو کە لە کــاتی مەترســیدا بەرزدەکــرانەوە، دواتــر خانووەکــان لەنــاو شــورای قەڵاکــان دروسـتدەکران هەتـا دانیشـتووانی گونـد لە کـاتی هێرشکردنەسـەریان پەنایـان بـۆ ببەن[4].

---

(١) عبدالقادر احمد یوسف، س. پ، ل ١٤٥.

(٢) ئامانج نازم بیجان: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا، چ١، چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٠ ز، ل١٠٧-١٠٨.

(٣) جفری برۆن: س. پ، ل١٣٩.

(٤) موریس بیشوب: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی، ص١٢٨.

سیستمی (دەرەبەگی) کۆمەڵگای ئەورووپی گۆڕی بۆ کۆمەڵگایەکی لادێیی هەژار، هەروەها کۆمەڵگای ئەورووپی دابەشکردبوو بۆ چەند چینێک:

**یەکەم/ گەورەی دەرەبەگەکان:** فەرمانڕەوایی کرداری و دەستڕۆیشتووی تەواو بوو، دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا بەبێ ئەوەی هیچ ئەرکێکی لەسەرشان بووایە، دەیتوانی هەرکارێک بکات کە خۆی بیەوێت؛ تەنانەت لێدان و کوشتنیش! بەبێ ئەوەی هیچ ترسێکی هەبێت یان سزا بدرێت، هەموو دەسەڵاتێکی سەربازی و دادوەری هەبوو لە سەرووی هەموو ئەو باجانەوە بوو کە دادوەرانی گوندەکان سەپاندبوویان، هەروەها دەیتوانی خاوەنی زیاتر لە گوندێک بێت و لە هەریەکێکیان کۆشکێکی هەبوو.

**دووەم/ پیاوانی ئایینی:** ئەمانیش خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەوانی بوون؛ هەتا ڕادەیەک ئەمانیش دەسەڵاتی دەرەبەگایەتشیان هەبوو لە هەمان کاتدا، هەروەها ناونیشانێکی دەرەبەگییان هەبوو کە بە پشتاوپشت بۆیاندەمایەوە.

(ویل دیۆرانت) دەڵێت: "پیاوانی کەنیسە بوونە گەورەترین خاوەنزەوی و دەرەبەگ لە ئەورووپادا، بۆ نموونە کەنیسەی (فیلدا) خاوەنی نزیکەی (١٥٠٠٠) کۆشکی بچووک بوون و کەنیسەی (سانت جوول) خاوەنی (٢٠٠٠) کۆیلەی زەوی بوون، هەروەها قەشەیەکی تر بەناوی قەشە (ڤیتۆر) خاوەنی نزیکەی (٢٠٠٠٠) لە باشترینی پارچە زەوییەکان بوو! بەمشێوەیە کڵێساکانیش بوون بە بەشێک لە سیستمی دەرەبەگایەتی.

**سێیەم/ دیلە موسڵمانەکان:** کڵێساکان ڕێگایاندەدا بە کۆیلەکردنی موسڵمانەکانی ئەورووپا  کە نەبووبوون بە (مەسیحی)، هەربۆیە هەزاران خێزانی دیلی موسڵمانەکانیان بە شێوەی کۆیلە دابەشکرد بەسەر دێرەکاندا، هەندێکجار زەوییەکانی کەنیسە بە کۆیلەکان دەخەمڵێنرا لەجیاتی خەملاندن بە پارە.

**چوارەم/ کۆیلەی زەوی:** ئەمانە لە بنەڕەتدا کۆیلە نەبوون بە واتای  وشە، بەڵام جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو لە هیچ شتێکدا؛ تەنها ئەوە نەبێت کە ئەمانە کۆیلە و دیلی جەنگ نەبوون[1].

---

(١) عبدالامير محمد و: تاريخ أوروبا فى العصور الوسطى، ص٦٧.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی

سەبارەت بە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی لەنێوان مێژوونووسـ بیروڕای جیاواز هەیە؛ بەڵام دەکرێت بڵێین زۆرینەیان لەسەرئەوە کۆکـ هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئەم سیستەمە بە هۆی لاوازبوون و دوات ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییەوە بووە، لە سەدەکانی چوارەم و پێنجە زایینیدا ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی) بەرەو داڕووخان ڕۆشت، ئیدی خاوەن زەوی و دەوڵەمەندەکان بوون بە خاوەنی دەسەڵاتی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەرێمەکاندا و سەرۆک هەرێمەکان دەسەڵاتی ناوچەکانیان بەتەنها بۆ دەمایە چەند دەوڵەتۆکەیەکی نیمچەسەربەخۆ و جیا لە دەسەڵاتی ناوەندی دامەز ئەوان لەبری فەرمانبەران و دەسەڵاتدارانی میری وڵاتیان بەڕێوەدەبرد و وردە وڵات کەوتە دەستی ئەوانەوە[1].

هەروەها لاوازی و بێهێزی پاشاکانیش لە پارێزگاریکردنی فەرمانڕەواییەکـ هۆیەکی دیکە بوو بۆ دەرکەوتنی. هەروەها پیاوانی ئایینی و کڵێسا بە هۆکـ دیکەی دەرکەوتنی دەرەبەگایەتی دادەنرێت، پیاوانی ئایینی وێڕای ئە سەرۆکایەتی بواری ئاینییان دەکرد؛ سەروەرێتی دەرەبەگەکانیش بوون، خـ پاپاش گەورەی سیستمی دەرەبەگایەتی بوو، بە پێوەری ئەوەی دەستیان بەـ زەویوزارێکی زۆردا گرتبوو وەک لە پێشتر باسمان کرد، هەروەها کـ یارمەتیدەربوو بۆ لاوازبوون و ڕووخاندنی دەسەڵاتی ناوەند و یاریدەـ دامەزراندن و بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی[2].

هەروەها کڵێسا و پیاوانی ئایینیش وەک پێشتر باسمان لێوەیکرد هۆکـ دیکەی سەرهەڵدانی ئەم سیستەمە بوون، دەکرێت بپرسین چۆن ئەوان بوو هۆکارێک بۆ دامەزراندنی سیستمی ناوبراو؟ بە چ شێوازێک پشتگـ دەرەبەگەکانیان کردووە؟ کڵێسا لە دوای ئەوەی ڕێگای بەخشین (الصدقة فرۆشتنی لێبووردن (صکوک الغفران) و نەدانی تەواوی باجە دونیاییەکان؛ بوو

(١) جفری برۆن: س. پ، ل١٣٥.

(٢) ئامانج نازم بیجان: س. پ، ل١٠١.

خـاوەنی مەزنتـرین سـامان، هەروەهـا سـێیەکی باشـترین زەویـوزاری ئەورووپـای خۆرئاوایان کەوتەدەست[١].

لەوکـاتەوە کڵێسـا و پیـاوانی ئـایینی بـۆ خۆیـان بـوون بە مەزنتـرین دەرەبەگ و پـارێزەری ئەو بـارودۆخە، لەو پێناوەشـدا بـوون بە پێکهێـنەری بنەمـای هـزری سیسـتمی دەرەبەگـایەتی؛ بە جۆرێـک پرەنسـیپەکانیان وا دادەڕشـت کە بگونجێت لەگەڵ ڕەوشتی باودا، بە جەختکردنەوە لەسەر ژیانی گێتی ئاسمانی، هەروەها هانی جووتیارەکانیان دەدا کە هەمیشە خزمەتی دەرەبەگەکانیان بکەن و گوێڕایەڵیان بـبن، ئەمەش بـوو بە ئەرک لەسـەریان و دەبـوو پێوەی پابەنـدبن، بەپێی دەقێکی (سـانت پول) ئاماژە بەوە دەدات و دەڵێت: "بە کۆیلەکـان ڕابگەیەنن گوێڕایەڵی گەورەکانیـان ببن، ڕازیان بکەن هەرگیز سەرپێچیان نەکەن"[٢].

بە تێپەڕبوونی کات کڵێسای (کاسۆلیکی) بوو بە ڕەگەزێکی کـاریگەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و بیری ڕامیاری دەرەبەگایەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست، بەدرێژایی ئەو سـەدەیە دەرەبەگـایەتی سیسـتمێکی ڕامیـاری و ئـابووری پشتبەسـتووبوو بە دامەزراوە ئایینییەکـان، دامودەزگـایەک کە شـەرعییەتی ئـایینی دەدا بە هەمـوو ئەو ڕێسـایانەی کە دەرەبەگـایەتی بەرهەمیهێنـابوو، هاوکـات دەرەبەگـایەتیش چەنـدین ئیمتیازی ئابووری و ڕامیاری بۆ دەسەڵاتی کڵێسا فەراهەمکردبوو.

دەرەبەگـــایەتی ســـەرەتا لە (فەڕەنســـا) و بە دیـــاریکراوی لە ســـەردەمی (میرۆفرەنجییەکان)دا دەرکەوت؛ بەتایبەتی لە سەردەمی (شارلەمان ٨٠٠–٨١٤ ز) بە زەقـی دەرکەوت، یەکێـک لە هۆکارەکـانی دەرکەوتنـی سیسـتمی دەرەبەگـایەتی لە سـەردەمی (شـارلەمان) دەگەڕایەوە بۆ جەنگە زۆرەکانی کە ژمارەیـان (٥٤) جەنـگ بووە، (٥) جەنگی لە دژی (لۆمباردییەکان) و (١٨) جەنـگ لە دژی (سەکسۆنەکان) و (٤) جەنـگ لە دژی (باڤارەکـان) و (٤) جەنـگ لە دژی (سـلاڤەکان) و (٧) جەنـگ لە دژی موسڵمانەکان لە (ئەندەلووس) و دوو جەنگیش لە دژی (بێزەنتییەکان)[٣].

---

(١) ئامانج نازم بیجان: س، پ، ل ١٠٣.

(٢) موریس بیشوب: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٢٨.

(٣) ئامانج نازم بیجان: س. پ، ل١٠٤.

بێگومـان ئەم هەمـوو جەنگـانەش کـاریگەری زۆر خراپیـان کردەسـەر ژیـان و گوزەرانی جووتیارە ئازادە بچووکەکان و ئەرکی سەرشـانی هێندە قورسـکردبوو و بە هـۆی ئەو هەمـوو بـاجە زۆرانەی لەسـەریانبوو؛ کەوتبـوونە ژێربـاری قەرزێکـی زۆرەوە کە توانـای دانەوەیـان نەبـوو، بـۆیە ناچـاربوون واز لە بەرهێنـان و لە زەوییەکانیان بهێنن و ببن بە کۆیلەی زەوی لای دەرەبەگەکان، بۆ ئەوان کاربکەن لەپێناو پێدانی خواردن و کەلوپەل و پاراستنیان، هەروەها ڕزگاربوون لەو باجانەی لەسـەریانبوو؛ ئەمەش خـاڵی وەرچەرخـان بـوو بـۆ ژمـارەیەکی زۆر لە جووتیـارە ئازادەکـان و گۆڕینیـان بـۆ کـۆیلەی زەوی، بە جۆرێک دوای خۆیـان نەوەکانیشـیان دەبوون بە کۆیلە[1].

(شارلەمان) لە ساڵی (٨١٣ ز) لە (ئێکس لاشابیل) پیاوە مەزنەکانی کۆکردەوە و کۆڕێکی بەست بەبێ ڕەزامەندی پاپا، کوڕە تاقانەکەی (لویسی باوەڕدار)ی کردە ئیمپڕاتـۆر و تـاجی لەسـەرنا، (لـویس) کەسـایەتییەکی لاوازی هەبـوو؛ نەیتـوانی ئەو ئارامییەی کە باوکی بەدیهێنابوو بیپارێزێت، ئەم لاوازییەش هانی خەڵکانێکی زۆریدا لە دەسەڵاتی ناوەندی یاخی ببن، تەنانەت کەسوکار و خزمانی لێی هەڵگەڕانەوە و هەریەکە و بەشـێکی ئیمپڕاتـۆرییەتەکەی بـۆ خـۆی دابڕیبـوو، لەم نێوەنـدەدا دەرەبەگەکـان و خانەدانەکـانیش لە تەواوی وڵات دەسـتیاندایە پێشـێلکردنی دەسەڵاتەکانی ناوەند و خۆیان وەک جێگرەوەی دەسەڵات ڕاگەیاند[2].

هەروەهـا ئیمپڕاتـۆرییەتەکەی لەنێـوان کوڕەکانیـدا دابەشـکرد؛ دواتـریش دوای مردنـی (لـویس) و بەپێـی پەیماننـامەی (فەردان ٨٤٣ ز) بە فەرمـی ئیمپڕاتـۆرییەتی (کارۆلینجی) لەنێوان کوڕەکانی لویسدا (لویسی کوڕ، پیپن، لۆسـەر، چارلی کەچەڵ) دابەشکرا، ئەم دابەشکارییەش یەکێکبوو لە هۆکارەکانی لاوازبوونی ئیمپڕاتۆرییەت و سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی و خەڵکیش خۆشحاڵبوو کە لەژێر سایەی دەسەڵاتی دەرەبەگێکـی بەهێـزدابن، چـونکە پـارێزراوتربوون وەک لەوەی لەژێـر دەسـەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتێکی لاواز کە هیچ گەرەنتییەکی پاراستنیان نەبوو[3].

---

(١) د. عبدالامیر محمد و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطى، ص١١٥.

(٢) عبدالقادر أحمد الیوسف: العصور الوسطى الأوروبیة، ص١١٢.

(٣) محمود سعید عمران: تأریخ أوروبـا فی العصور الوسطى، ص٢٠٨ – ٢٠٩.

## كۆتایی سیستمی دەرەبەگایەتی و هۆكارەكانی

لە كۆتاییەكانی سەدەكانی ناوەڕاستدا؛ بەتایبەتی كۆتایی سەدەی یازدەهەم و دوازدەهەمی زایینی بە ماوەی گواستنەوە دادەنرێت لە كیشوەری ئەوروپادا، بەو پێوەرەی كە كۆمەڵێك گۆڕانی ڕامیاری و كۆمەڵایەتی و هزری ڕوویاندا كە چەندین شوێنەواری گرنگی لەسەرئاستی كیشوەری ئەوروپا بەجێهێشت كە دواتربوو بە هۆی گواستنەوەی ئەوروپا بۆ قۆناغێكی نوێ. هەڵوەشاندنەوەی سیستمی دەرەبەگایەتی لە سەرووی هەموو ئەو گۆڕانكارییانەوەبوو لە ئەوروپا كە لە كۆتایی سەدەكانی ناوەڕاستدا ڕوویاندا.

دەزگا سوارچاكییەكان بە دەركەوتنی سوپا هەمیشەییە ڕێكخراوەكان ڕۆڵی خۆیان لە دەستدا، موڵكداری نەتەوەیی لە (ئینگلتەرا و فەرەنسا) لە دەركەوتن و گەشەسەندندابوو، لە بەرامبەر دیدی جیاخوازی دەرەبەگایەتی دەجەنگا؛ دادگا پادشاییەكان شوێنی دادگا دەرەبەگییەكانیان گرتەوە، بەمەش دەرەبەگەكان لە چەند پێناوێكی گرنگ و پێویستی درێژەدان بە هەژموونی خۆیان لەدەستدا[1].

لە سەدەی دوازدەی زایینی لە (فەرەنسا) چەند گۆڕانكارییەكی ناوخۆیی و دەرەكی ڕوویاندا كە بوونەهۆی پتەوكردن و بەهێزكردنی دەسەڵاتی پاشایەتی و فەرمانڕەوایەتی ناوەندی و لاوازكردنی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی، لە ناوخۆدا بنەماڵەی (كابی) دەسەڵاتدار بەهێزبوون لەسەر هەژماری دەرەبەگەكان، (لویسی شەشەم ١١٠٨-١١٣٧ ز) یەكەم پاشای ئەم بنەماڵەیەبوو كە دەستیكرد بە هەنگاونان بەرەو لاوازكردنی دەسەڵات و پێگەی دەرەبەگ و خانەدانەكان و توانی لە ماوەی دەسەڵاتیدا بیانخانە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، پاشاكانی دوای ئەویش لەسەر هەمان ڕێچكە بەردەوامبوون، یەكێكی دیكە لەو هۆكارانەی كە وایكرد دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی لە (فەرەنسا) بەرەو لاوازی بچێت و بكەوێتە ژێر دەسەڵاتی پاشایەتی فەرەنسییەوە؛ چاوتێبڕینی پاشای نۆرماندی بەریتانیا بوو بۆ سەر خاكی فەرەنسا، چونكە ئەوان خۆیان بە خاوەنی بەشێك لە زەوی و زارەكانی فەرەنسا دەزانی، چونكە (ویلیەم فاتح)ی پاشای بەریتانیا خۆی لە ڕەگ و ڕیشەیەكی دەرەبەگایەتی فەرەنسی هەبوو[2].

---

(١) جفری برۆن: س. پ، ل١٤٦.

(٢) عبدالامیر محمد و: هەمان سەرچاوە، ل١٧٦ – ١٧٧.

پاشـان لە سـەردەمی (هێنـری دووەم ١١٥٩-١١٨٩ ز)دا پاشـای (ئینگلـتەرا) کە دایکی (فەڕەنسـی) بـوو؛ مەترسییەکانی هێرشکردنی پاشـایانی (ئینگلتەرا) بۆ سـەر خاکی (فەڕەنسا) زیادیانکرد، چونکە (هێنری) زەویوزارێکی زۆری لە دایکییەوە بۆ بەجێمـابوو لە (فەڕەنسـا)، هەروەهـا هاوسـەرگیری لەگەڵ (ئەلینـۆر)ی میراتگـری (ئۆکتین) کرد، موڵکەکانی ئەویشی بۆ مایەوە، بۆیە هەوڵی گێڕانەوەی ئەو موڵکانەی دەدا، بێگومان ئەمە مەترسیبوو بۆ سەر موڵکی دەرەبەگەکانی (فەڕەنسـا)، هەربۆیە پاشای (فەڕەنسا) هەوڵیدا دەرەبەگەکان لەو مەترسییە تێبگەیەنێت، لەو ڕێگەیەشـەوە تـوانی بیانخـاتە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆیەوە، بەمەش دەسـەڵاتی دەرەبەگـایەتی زیـاتر لاوازبـوو و لە بەرامـبەردا دەسـەڵاتی پاشـایەتی بەهێزتربـوو، هەروەهـا چەنـدین گۆڕانکـاری و پێشـکەوتنی دیـکە لە بوارەکـانی کـۆمەڵایەتی و ئـابووری و هزریـدا ڕوویاندا؛ کە بوونە هۆی گەشەکردنی شارەکان و گەشەی بازرگانی و دەرکەوتن و سەرهەڵدانی چینی بورژوازی، بێگومان ئەمـانەش هۆکارێکبوون بۆ وریـاکردنەوەی خەڵک و هاندانیان دژی دەرەبەگی[1].

یەکێـک لەوانە دەرکەوتـن و پێشـکەوتنی شـارەکان لە ئەورووپـا بـوو کە لە سـەدەکانی دوازدە و سـیازدەهەمی زایینـی کاریگەری دیـار و بەرچاویـان هەبوو لە پێشـکەوتنی کۆمەڵگـای ئەورووپـی لە ڕووی ڕامیـاری و ڕۆشـنبیری و هـزرییەوە، هەروەها لاوازکردن و کۆتاییهێنان بە سیستەمی دەرەبەگایەتی، ئەورووپایـان بەرەو قۆنـاغێکی نـوێ بـرد؛ لە ڕووی ڕامیـارییەوە شـارەکان بـوونە هانـدەر و هاریکـاری گەشـەکردنی فەرمـانڕەوا خۆجێییەکـان و بـوونە هـۆی بەهێزبـوونی پاشـایەتییە ڕەهاکـان، چـونکە دانیشـتووانی شـارەکان ڕق و کینەیەکـی زۆریـان بەرامـبەر دەرەبەگەکان هەبوو، بۆیە هەمیشە هەوڵی سەربەخۆییان دەدا.

لە (فەڕەنسـا و ئینگلـتەرا) زیـاتر پـێگەی پاشـایەتی بەهێزبـوو و سیسـتمی فەرمـانڕەوایی بە تەواوی بەرەو پاشـایەتی هەنگاوینـا، بەڵام (ئیتاڵیـا و ئەڵمانیـا) جیاوازبوون؛ چونکە ئەوان زیاتر بەرەو سیستمی کۆماری هەنگاویاندەنا[2].

---

(١) عبدالأمیر محمد و: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٢-١٧٣.

(٢) محمود شـاکر: پوختەی مێژووی شارستانییەتییەکان، و: نهـاد جـلال، چ٢، چـوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٩ ز، ب٢، ل٥١٨.

ـــرەکان یەکەیەکی ڕامیاری و کارگێڕی جیاوازیان لە کارگێڕی سیستەمی ـ ـەگایەتی دامەزراند، چونکە کارگێڕی دەرەبەگایەتی لەگەڵ ئەو سیستەمە ـ ـی شارەکاندا نەدەگونجا، بۆ نموونە دادگای دەرەبەگی تەنها کاری بە ـ ـریت دەکرد، ئەمەش تەنها لەگەڵ ژیانی لادێ و کشتوکاڵ و سیستمی خێڵەکی ـجا، بەڵام شارەکان بە یاسا و ڕامیارییەکی جیاوازی هەبوو کە لەگەڵ ئەو ـ ـوخە نوێیەدا بگونجێت، هەروەها پێویستیان بە سیستم و دامەزراوەی جیاواز ـبوو[1].

ـە بواری هزری و ڕۆشنبیریشەوە چالاکی بەرچاو لەو بوارانەدا لە کۆمەڵگای ـ ـووپیدا بەدیدەکرا لە سەدەی دوازدەدا، ئەمەش لە بەرهەمە وێژەیی و فەلسەفی ـ ـستییەکاندا ڕەنگیدابووەوە، ئەم چالاکیانەش بە یەکێک لە ڕواڵەتەکانی ـ ـسانس دادەنرێت کە لە سەدەکانی دواتر لە ئەورووپادا دەرکەوت[2].

پێشکەوتنی شارەکان هۆکاری سەرەکی بوو لە پێشکەوتنی ئەو گۆڕانکارییە ـ ـی و ڕۆشنبیریانەدا، ڕێخۆشکەریش بوو بۆ پێکهێنانی دیدێکی نوێی ئایینی و ـسەفی و ڕۆشنبیری، لەبەرئەوەی شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لەسەر بنەمای ـ ـزگانی و پیشەسازی دروستبووبوون و پێشکەوتن[3].

وردە وردە یاسایەکی نوێی ڕێکخستنی ژیانی ئابووری پەیدابوو کە ئەویش ـسای بازرگانی بوو؛ چونکە یاساکانی دەرەبەگایەتی چیدی بەکەڵکی ئەو ژیانە ـوێیەی نێو شارەکان نەدەهات، بۆیە سەندیکا بازرگانی و پیشەوەرییەکان ـرکەوتن بۆ ڕێکخستنی کاروباری بازرگانی و پیشەوەری، لەوانەش وەک ـــەندیکاکانی (بازرگانی ئاوریشم، خوری، خشڵ و زێڕ و زیو، چەکسازی، ـرمانسازی، نانەواکان، ئاسنگەران و دارتاش) بوون، ئەمانە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە ڕێکخستنی بازاڕدا[4].

ئەم سەندیکایانە بۆ یەکەمجار لە سەدەکانی یازدە و دوازدەدا دەرکەوتن، بەڵام ـە سەدەکانی سیازدە و چواردەدا ژمارەیان زۆر زیادیکرد! بۆ نموونە تەنها لە شاری (پاریس) ژمارەی سەندیکاکان گەیشتە (٣٥٠) سەندیکا، لە شاری (لەندەن)

---

١) عبدالقادر ئەحمەد یوسف، س. پ، ل٢٢٩.

٢) موريس بيشوب: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٢٩

٣) جفرى برۆن: س. پ، ل١٤٨–١٤٩.

٤) د. عبدالامير محمد و: س. پ، ل١٣٧.

گەشتە (٦٠) سەندیکا و لە شاری (کۆڵن) (٥٠) سەندیکا بوون، سەندیکاکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە دژایەتیکردنی سیستمی دەرەبەگایەتیدا[1].

کەواتە دەتوانین بڵێین شارە ئەورووپییەکان بوون بە مەڵبەندێکی گرنگی چالاکی رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، هەروەها شۆڕشیک بوو دژ بە سیستمی دەرەبەگایەتی و یەکێک بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی ڕووخانی ئەو سیستمە؛ دروستبوونی شارەکان بوو کە وایکرد خەڵکێکی زۆر لە گوندەکانەوە ڕوویان تێبکەن و ژیانێکی نوێی ئازاد دەستپێبکەن، هەروەها چینی نوێی کۆمەڵایەتی دەرکەوتن کە چینی ڕۆشنبیران و بازرگان و پیشەوەر و هەروەها چینی بۆرژوا کە ئەم چینانە بە هیچ شێوەیەک بەرژەوەندیان لەگەڵ سیستمی دەرەبەگایەتیدا نەبوو، جگە لەوەش بوونە هۆی بەهێزبوونی سیستمی پاشاکان و لە بەرامبەردا لاوازبوونی دەرەبەگەکان و دواتریش کۆتاییهێنان بە دەرەبەگایەتی.

---

(١) جفری برۆن: س. پ، ل١٤٨-١٤٩.

# بەشی دوازدەیەم

- ئینگلتەرا لە سەردەمی نۆرماندییەکاندا
- ولیەمی ڕزگارکەر (١٠٦٦–١٠٨٧ ز)
- ولیەمی دووەم (١٠٨٧–١١٠٠ ز)
- هێنری یەکەم (١١٠٠–١١٣٥ ز)
- ستیڤن کونتی بلوا (١١٣٥–١١٥٤ ز)
- ئینگلتەرا لە سەردەمی پلانتاگنتەکان
- هێنری دووەم (١١٥٤–١١٨٩ ز)
- ناکۆکی لەگەڵ کلێسادا
- ڕیچاردی یەکەم (شێردڵ) (١١٨٩-١١٩٩ز)
- جۆنی یەکەم (١١٩٩–١٢١٦ ز)
- هێنری سێیەم (١٢١٦–١٢٧٢ ز)
- ئیدواردی یەکەم (١٢٧٢–١٣٠٧ ز)
- لێکهەڵوەشانی دامودەزگا دەرەبەگییەکان و گەشەکردنی پەرلەمان
- ئیدواردی چوارەم (١٤٦١–١٤٨٥ ز)

## ئینگلتەرا لە سەردەمی نۆرماندییەکاندا

پێش داگیرکاری (ڕۆمانی) کە لە سەدەی یەکەمی پێش زایینەوە ڕوویدا؛ ـگـتەرا) چەند نەتەوەیەکی تێدابوو کە بە (کلتییەکان) ناسرابوون، بەشێک لە ـێژوونووسان باوەڕیان وایە لە بنەڕەتدا (کلتییەکان) دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی ـریای (سپی ناوەڕاست). پێش ئەمانیش (ئیرییەکان) لە دوورگەکەدا ـتەجێببوون، بەڵام کاتێک (کلتییەکان) هاتنە ناوچەکە؛ زمان و سیستمی خۆیان ـپاند و بە تێپەڕبوونی کات شوێنی ئیرییەکانیان گرتەوە، لە سەدەی یەکەمی پێش ـێندا؛ سوپای (ڕۆمانی) هەستا بە داگیرکردنی (ئینگلتەرا) و بەمجۆرە لە ـەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی زایینی توانی پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆی بکات لەم ـتەدا، بەڵام لە ئەنجامی ئەو مەترسییە کتوپڕانەی ڕووبەڕووی ئیمپراتۆرییەتی ـۆمانی) ببوویەوە لە لایەن هۆزە جەرمانەکانەوە، (ڕۆمانەکان) ناچاربوون کە پێگە ـەربازییەکانیان لە (ئینگلتەرا) بکێشنەوە[1].

(ئینگلتەرا) لەو ماوەیەدا نەکەوتە ژێر کاریگەری ژیاری ڕۆمانییەوە، لەبەرئەوەی ـووربوو لە مەڵبەندە سەرەکییەکانی ئەو ژیارە لە لایەک و سادەیی و سەرەتایی ـەلانی ناوچەکە لە لایەکی دیکەوە، لە هەمووشی گرنگتر بریتیبوو لە ـشەکشەکردنی (ڕۆمانەکان). (ئینگلتەرا) ڕووبەڕووی هێرش و شاڵاوی هۆزە ـەنگلۆسەکسۆنییەکان) ببوویەوە، ئەم هۆزانە توانیان (ئینگلتەرا) داگیربکەن و چەند ـانشینێکی بچووکیان لێ دابمەزرێنن کە بەردەوام لەگەڵ یەکدیدا لە شەڕ و ـکوکیدا بوون، بەمەش پشێوی ڕامیاری و پاشاگەردانی لەوکاتەدا ناوچەکەی ـگرتبووەوە[2].

لێرەوە ئایینی (مەسیحی) توانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت و ڕێگا بۆ خۆی خۆشبکات بۆ خزانە ناو دوورگەکانی (بەریتانیا)، لە کۆتایی سەدەی شەشەمی ـاییندا (ئۆگەستین) توانی ڕۆڵی بەرچاو ببینێت لە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحییەت)دا، دامەزراوەی کڵێسایی و دێرەکان لە زۆربەی دوورگەکانی

---

١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص١٦٥.

٢) هـ سانت ل. ب. موس: ميلاد العصور الوسطى، ص٢٨٤.

(بەریتانیا) بڵاوبوونەوە و بەمشێوەیەش پیاوە ئایینیەکان (ئەسقۆفەکان و ڕاهیبەکان) توانیان ڕۆشنبیری (ڕۆمانی) و تەنانەت جۆرێک لە فێرکردنیش بڵاوبکەنەوە[1].

ململانێی نێوان شانشینە (جەرمانییە بچووکەکان) زیاتر لە دوو سەدەی خایاند، لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینیدا (٧) شانشینی مەزن دەرکەوتن کە بریتیبوون لە: (کانت) لە باشووری خۆرهەڵات و (ئیسێکس و ویسێکس)، دانیشتووانی ئەم شانشینە هەموویان (سەکسۆنی) بوون، هەروەها (ئەملریای باکوور و میرسیە و ئەنگلیا) کە دانیشتوانی ئەم سێ شانشینەیان (ئینگلیزی) بوون، لە سەرەتاکانی سەدەی نۆیەمدا؛ شانشینی (ویسێکس) کە کەوتبووە باشووری خۆرئاوای نزیک و لەو سۆنگەیەشەوە توانی زاڵبێت بەسەر تێکڕای شانشینەکانی دیکەشدا، بەمشێوەیە جۆرە یەکێتییەکی ڕامیاری لە وڵاتدا بەدیهێنا، ئەم بارەش بە خاڵی دەرچوون و جەوهەری دادەنرێت لە مێژووی (ئینگلیزی)دا[2].

(ئینگلتەرا) لە ماوەی سەدەی نۆ و دەدا ڕووبەڕووی هێرشی (ڤایکینگەکان) بووەوە، هێرشەکان سەرجەم بەشە جیاوازەکانی دوورگەکانی بەریتانیای گرتەوە؛ واتە (ویلز، ئێرلەندا، سکۆتلەندا)، لە ئاکامی ئەو هێرشە دڕندانانەشدا کاولکاری و وێرانکاری لێکەوتەوە. (ئەلفرێدی مەزن پاشای ویسیکس) توانی بەرگرییەک دژ بە داگیرکەران لە (ئینگلتەرا)دا ڕێکبخات، لەپاش جەنگێکی درێژخایەن لەنێوان هەردوولادا؛ لە کۆتاییدا گەیشتنە ڕێکەوتننامەیەک لەگەڵ (ڤاندالەکان)، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە (ئینگلتەرا) بۆ دوو بەش دابەشکرا؛ بەشێکیان بۆ (ئەلفرێد) بوو، بەشەکەی دیکەش کەوتە ژێردەسەڵاتی (ڤاندالەکان)، بەڵام جێگرەوەکانی (ئەلفرێد) توانیان ئەو بەشەی ژێردەستی (ڤاندالەکان) بگەڕێننەوە ژێردەسەڵاتی خۆیان و بەوشێوەیە (ئینگلتەرا) یەکیگرت و بووە خاکێکی یەککرتوو[3].

لە سەردەمی (پاشا ئیدوارد)دا وڵات هەمووی کەوتە ژێردەسەڵاتی خانەدانە بەهێزەکانەوە، کاتێک (ئیدوارد) لەساڵی (١٠٦٦ ز) کۆچی دوایی کرد؛ ململانێ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی هەڵگیرسا، هەربۆیە لێرەوە یەکێک لە سەرکردە (ڤاندالەکان) لە باکوورەوە بە بیانووی ئەوەی کە (ئیدوارد) پێش مردنی بەڵێنی

---

(١) هـ سانت ل. ب. موس: میلاد العصور الوسطی، ص٢٨٤.

(٢) عبدالقادر احمد الیوسف: العصور الوسطی الاوربیة، ص ١٦٧.

(٣) محمود سعید عمران: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی،ج١/ ص٢٨٧.

تەختی (ئینگلتەرا)ی لەپاش خۆی پێداوە، (ولیەمی مەزنی نۆرماندیا) لە باشوورەوە بە بیانووی ڕەوایەتی مافی خۆی لە دوای (ئیدوارد)؛ دەبێت فەرمانڕەوایەتی وڵات بکات، بەڵام خانەدانەکان (هارۆڵد کردووین)یان بە پاشا هەڵبژارد[١].

(هارۆڵد) بەسەر (ڤاندالەکان) سەرکەوت و بەرەو باشوور پێشڕەویکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (ولیەم نۆرماندی)، ئەوە بوو لەنزیک (هاستینگز) شەڕ ڕوویدا و هەر بەو ناوەش ناسراوە لە مێژوودا، لەم جەنگەدا سوارەکانی (نۆرماندی) سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، جەنگی (هاستینگز) لە مێژوودا بە جەنگێکی یەکلاکەرەوە دادەنرێت؛ لەبەرئەوەی کۆتایی بە گۆشەگیری (ئینگلتەرا) هێنا و زۆر بە بەهێزی بەستییەوە بە شەپۆلی ڕووداوە ڕامیارییەکانی کیشوەری ئەورووپادا، بە هەمان شێوەش بەستییەوە بە ڕەوتە ڕۆشنبیری و ژیارییەکانی ئەو کیشوەرەوە، هاوکات ملکەچیکرد بۆ فەرمانڕەوایەتییەکی بەهێز و لێهاتوو، ئەو فەرمانڕەوایەتییە لە ماوەی دوو نەوەدا گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی و ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی لە ژیانی ئینگلتەراییەکاندا دروستکرد و ژیانێکی نوێی دامودەزگا و سیستەمی وای فەراهەمهێنا کە چەندەها قۆناغ (ئینگلتەرا)ی پێشخست لەچاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپا؛ لە کاتێکدا لە هەموویان دواکەوتووتربوو[٢]!

## (ولیەمی ڕزگارکەر ١٠٦٦-١٠٨٧ ز)

(ولیەمی ڕزگارکەر) بە یەکێک لە کەسایەتییە گرنگەکانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێت، لە سەرەتادا شوێنکەوتەیەکی دەرەبەگی بوو بۆ پاشای (فەڕەنسا)، (ولیەم) ئامانجی سەرەکی و یەکەمی بریتیبوو لە بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی لەسەر هەژماری خانەدانە ئایینی و مەسیحییەکان؛ بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش بەم کارانە هەستا:

لە سەرەتادا تێکرای قەڵاکانی (ئینگلتەرا)ی بە قەڵای پاشایەتی دائەنا و ڕایگەیاند کە نابێت هیچ قەڵایەکی نوێ بنیاتبنرێت ئەگەر بە ڕەزامەندی پاشا نەبێت! جەنگە تایبەتییەکان؛ واتە تێکڕای ئەو جەنگانە کە خانەدانەکان لە دژی یەکدی هەڵیاندەگیرساند قەدەغەیکرد، هەروەها مافی سکەلێدانی تایبەتکرد بە پاشاوە،

---

(١) عبدالامير محمدامين: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٣٤.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص١٧١.

(ولیەم) هەوڵیدا بەسەر خانەوادەکاندا زاڵبێت؛ ئەویش بە دابڕینیان لە زەویـ
کە سەرچاوەی بژێویان بوو، لە بەرامبەردا ئەم زەویانەی بەسەر پیاوە ـ
نۆرماندییەکاندا دابەشکرد، ئەم پیاوە نۆرماندیانەش لەبەر مەترسی خەڵکی ـ
وڵاتەکە و بۆ پارێزگاریکردن لە خۆیان؛ ڕێگەی بنیاتنانی کۆشک و قەڵای بـ
پێدرا، هەروەها (ولیەم) زەوییەکی فراوانی هێشتەوە و کردی بە موڵکی پاـ
بەمشێوەیە سیستەمێکی دەرەبەگی نوێ دروستبوو کە لەسەروو هەموـ
(ولیەم)ی پاشای سەرجەم زەوییەکان دەهات، زەوییەکانی بەسەر نۆرمانیـ
دابەشکرد و گەلی ئینگلیزیش گۆڕان بۆ چینێکی کۆیلە! هەرچەندە ڕێگای بە ـ
لە ئینگلیزەکاندا کە هەستی خۆیان بۆ پاشا دەرخستبوو کە بتوانن زەوی ـ
بەڵام مۆرکی دەرەبەگایەتی (نۆرماندی) نەخشی خۆی بەسەر وڵاتدا جێهێشت

(ولیەم) لە ساڵی (١٠٨٣ ز) هەستا بە تۆمارکردنی ناوی خاوەنـ
موڵکەکانیان؛ ئەم تۆمارکردنە نزیکەی (٣) ساڵی خایاند و ئەنجامی ئەم کارـ
ئامادەکردنی ئاماری پاشایەتی کۆتایی هات، لە ساڵی (١٠٨٦ ز) دوای تەواوـ
ئەم تۆمارە (سجل)؛ (ولیەم) هەموو خاوەندارەکانی بانگێشتکرد لە ـ
(سالیزبووری) کە ژمارەیان نزیکەی (٦٠٠٠٠) کەس دەبوون بۆ بەـ
کۆبوونەوەیەک، هەموویان سوێندی پابەندبوون بە گوێڕایەڵیان بۆ پاشا خـ
هەستی خۆیان بۆی دووپاتکردەوە[٢].

هەرچەندە (ولیەم) شەرعییەتی ڕزگارکردنی (ئینگلتەرا)ی لە پاپا وەرگرت ـ
ڕامیارییەکەی پیاوە ئایینیەکانیشی گرتەوە! کاتێک (ولیەم) ئینگلتەرای ـ
ژێردەسەڵاتی خۆیەوە؛ سەرنجیدا کە پیاوە ئایینییە ئینگلیزییەکان ژیانیان لە ـ
شارستانییەوە نزیکترە وەک لە ژیانی کڵێسایی، بەڵام (ولیەم) نەیتوانی هەموو ـ
ئایینییەکان چاکبکات، بۆیە گۆڕینی بۆ پیاوە ئایینییەکانی (نۆرماندیا) و لە ـ
هەمووشیانەوە (لانفرانک) بوو کە بووە سەرۆکی ئەسقوفی (کانتربوـ
(لانفرانک) هاوکاری (ولیەم)ی کرد بۆ دانانی سیستمێکی نوێ بۆ دێرەکان[٣].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٥٦.
(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٨٩.
(٣) عبدالامير محمدامين: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٧١.

بەمشێوەیە فەرمانڕەوایەتییە ئایینییەکان لە فەرمانڕەوایەتییە کڵێساییەکان جیاکرانەوە، ولیەمیش پابەندبوو بە جێبەجێکردنی تێکڕای ئەو فەرمانانەی لە فەرمانڕەوایەتییە کڵێساییەکانەوە دەردەچوون، هەروەها کۆکردنەوەی دەیەکیش بۆ کۆمەکی کڵێسا، (ولیەم) هەموو ئەم کارانەی بۆ کڵێسا ئەنجامدا؛ بەڵام مەرجی بەسەر کڵێساکانی (ئینگلتەرا) دانا کە نابێت بەبێ ڕەزامەندی پاشا هیچ نێردراوێکی پاپایی بچێتە ناو زەوییە ئینگلیزییەکانەوە، هەروەها داوای ئەوەیکرد کە نابێت هیچ بڕیارێکی پاپایی بەبێ ڕەزامەندی پاشا ڕابگەیەنرێت یاخود جێبەجێبکرێت. لە کۆتایی ڕیکخستنەکانیدا دەربارەی کڵێسا؛ کۆمەڵەی ئەسقوفەکانی لە (ئەنجوومەنی ئەلوینان) جیاکردەوە و بووە دامەزراوەیەک کە قەوارەیەکی سەربەخۆی خۆی هەبوو، بڕیارەکانیشی لەپاش وەرگرتنی ڕەزامەندی پاشا جێبەجێدەکرا[١].

سەبارەت بە ڕێکخستنە شارستانییەتەکانیش؛ (ولیەم) وەک ڕزگارکەرێک مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی وڵاتەکەیدا دەکرد؛ هەتا پایەکانی فەرمانڕەوایەتییەکەی چەسپاند، بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی؛ پشتی بە ژمارەیەک زۆری سەرباز بەستبوو، ئەمەش پارە و پوولێکی زۆری دەویست کە میری خەرجی بکات، لەبەرئەوە دەستیکرد بە کۆکردنەوەی تێکڕای باجەکان کە لە سەردەمی (ئیدوارد)ی ناسراودا ڕەتکرابوونەوە و باجی خستەسەر هەموو هاوردە و نێردراوەکان. لە بواری پەیوەندییە دەرەکییەکانیشدا گرنگترینیان ململانێ بوو لەگەڵ فەڕەنسادا، ڕیشەی ئەم ناکۆکییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە (ولیەمی مەزنی نۆرماندیا) بوو لە پێش ڕزگارکردنی (ئینگلتەرا)دا، لەپاش ڕزگارکردنەکەشدا توانی پارێزگاری لە (نۆرماندیا) بکات. (فەڕەنسا) نۆرماندیای بە خاکی خۆی دەزانی و دەسەڵاتداری (نۆرماندی) جگە لە دەرەبەگێک کە بۆ پاشایەتی (فەڕەنسا) دەگەڕایەوە هیچی دیکە نەبوو، ململانێکەش لێرەوە دەستی پێکرد کە (ولیەم) دانی بەم کەتوارەدا نەنا و بووە فەرمانڕەوای (ئینگلتەرا و نۆرماندیا) پێکەوە. سەرئەنجام جەنگ لەنێوان (ولیەم و فلیپی یەکەمی پاشای فەڕەنسا) ڕوویدا، (ولیەم) لە ئینگلتەراوە بەرەو کیشوەری ئەورووپا پێشڕەویکرد بۆ ئەوەی لە شاری (ڕوین) کە دەکەوتە سەر ڕووباری (سین) لە باکووری خۆرئاوای (پاریس) بجەنگێت، لێرەوە ڕووداوەکان پەرەیانسەند و ئەوە بوو (ولیەم) شاری (مانت)ی سووتاند کە دەکەوتە سەر ڕێژگەی ڕووباری

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٨٩.

(لـوار)، لە لـووتکەی ئەم سـەرکەوتنانەدا؛ (ولـیەم) پێکرا و بە توندی برینداربوو کە هەر ئەم برینەی بووە هۆی مردنی لە ساڵی (١٠٨٧ ز)[1].

کوڕەکـانی (ولـیەم) کە زانیـان باوکیـان لە کۆتـایی ژیانـدایە؛ لەسـەر تەختی فەرمـانڕەوایەتی کەوتـنە ململانێکردنـی یەکـدی، (ولـیەم) نۆرمانـدیای بەخشـی بە (ڕۆبەرت)ی کـوڕەگەورەی، لەپـاش مردنـی (ولـیەم) و لە ئەنجـامی ململانـێکەدا (ڕۆبەرت) تـوانی فەرمـانڕەوایەتی (نۆرمانـدیا) بـۆ خـۆی مسـۆگەر بکـات. کـوڕی دووەمیشی (ولیەمی ڕوومووس) کە بە (ولیەمی دووەم) ناسراوبوو؛ بوو بە پاشای (ئینگلتەرا) لەنێوان ساڵانی (١٠٨٧–١١٠٠ ز). (هنری یەکەمی کوڕی سێیەمی ولیەم) لەپاش (ولـیەم)ی برای جڵەوی فەرمـانڕەوایەتی (ئینگلـتەرا)ی وەرگرت لە (١١٠٠–١١٣٥ ز)، کچەکەشی (ئەدیلا) بووە هاوسـەری (ستیڤن کۆنتی بلوانس)، (سـتیڤن) لە (١١٣٥–١١٥٤ز) فەرمـانڕەوایەتی (ئینگلـتەرا)ی کـرد، بە تێپەڕبـوونی کـات (ئەنگلـۆ سەکسۆنی و دانی و نۆرماندییەکان) لە (ئینگلـتەرا) تێکەڵبوون و لەناویەکدا توانەوە و پێکەوە بوونە هەوێنی پێکهێنانی میللەتـی (ئینگلیزی)، بۆ مـاوەیەکی دوورودرێژ پێکەوە بە ئاشـتی ژیانیـان بەسـەربرد، تایبەتمەنـدییە هاوبەشـەکانیان بـووە خـاڵی جیاکەرەوەی میللەتی (ئینگلیزی) لە میللەتانی دیکەی ناوچە جیاوازەکانی کیشوەری ئەورووپا[2].

## (ولیەمی دووەم ١٠٨٧–١١٠٠ ز)

(ولیەمـی نۆرمانـدی) لە سـاڵی (١٠٨٧ ز)دا کۆچی دوایـی کـرد، کـوڕە گەورەکەی (ڕۆبەرت) لە فەرمـانڕەوایەتی (نۆرمانـدیا)دا شـوێنیگرتەوە، کـوڕە بچووکەکەشـی (ولیەمی دووەم) فەرمانڕەوایەتی (ئینگلتەرا)ی دەکرد، فەرمـانڕەوایەتییەکەی نـزیکەی سـیازدە سـاڵی خایانـد، سـوێندیخوارد کە ئاگـاداری ئەو بنەمایـانە بێـت کە بـاوکی دایڕشـتبوو بـۆ فەرمـانڕەوایەتیکردنی وڵات، بەڵام (ولیەمـی دووەم) کە بـە (سـوور) نـاودەبردرا و فەرمـانڕەوایی وڵاتـی بە شـێوەیەکی تونـدوتیژ بەڕێوەدەبرد، هەربۆیە لەگەڵ (لانفرانکـی) سـەرۆکی ئەسـاقیفەی (کونتربـووری) پەیوەنـدیان تێکچـوو و (ولـیەم) هەتـا سـاڵی (١٠٩٣ ز) بەو جـۆرە مـایەوە، لە سـاڵی (١٠٨٩ ز)دا (لانفرانـک)

---

(١) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٧١.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١ ص٤٥٨.

کۆچی دوایی کرد و شوێنەکەی بە بەتاڵی مایەوە، دەرئەنجام لە ساڵی (١٠٩٣ ز)دا ئەنسلم)ی لە شوێنی دامەزراند، کەچی نێوانیان لەگەڵ (ئەنسلمین) تێکچوو، چونکە ئەنسلم) چوو بۆ (ڕۆما) بە مەبەستی وەرگرتنی پلە شەرعییەکەی. بەڵام (ولیەم) ئاگاداریکردەوە کە ئەگەر بچێتە (ڕۆما)؛ ئەوا بیر لە گەڕانەوە نەکاتەوە بۆ ئینگلتەرا)! ئەوە بوو (ئەنسلم) ڕوویکردە (ڕۆما) و بەدرێژایی فەرمانڕەوایی (ولیەمی دووەم) ڕووی لە (ئینگلتەرا) نەکردەوە، بارودۆخەکە بەو جۆرە مایەوە تا ساڵی (١١٠٠ ز) کە (ولیەم) لەو ساڵەدا و لە کاتی ڕاوکردندا بە شێوەیەکی نادیار تیرۆرکرا[1]، چونکە زۆر بە توندوتیژی و خراپی مامەڵەی لەگەڵ خانەدانەکان و پیاوانی کڵێسادا دەکرد، لە ئەنجامدا برا بچووکەکەی (هێنری یەکەم) شوێنیگرتەوە[2].

## هێنری یەکەم (١١٠٠-١١٣٥ز)

لە سەردەمی (هێنری) یەکەمدا، سیستەمی کارگێڕی و دادوەری چەند هەنگاوێکی گرنگی بەرەوپێشەوەنا، گرنگیدان بە دادگا پاشایەتییەکان زیادیکرد و لە بەرامبەردا دادگا دەرەبەگییەکان کەمیکرد، هەروەها ئەو کێشە و گرفتانەی کە دەخرانە بەردەم ئەنجوومەنی شاهانە زیادیکرد و چەند نوێنەرێک وەک دادوەر دانران و بەو ناوچانەدا دەگەڕان کە پاشا پێی نەدەگەیشت بۆ گوێگرتن لە کێشە دادوەرییەکان، لەو ڕووداوە گرنگانەی لە سەردەمی (هێنری یەکەم) ڕوویاندا؛ پەرەسەندنی یاسای گشتی بوو، مەبەست لەمەش کۆمەڵە یاسایەک بوو کە بەسەر تێکڕای وڵاتدا بەگشتی پیادەدەکرا، بەمشێوەیە یاسای گشتی جیاوازبوو لە یاسا ناوچەیی و کاتی و دابونەریتە ناوخۆییەکان، هەروەها جیاوازیشبوو لە یاساکانی کڵێسا! لە سەردەمی (هێنری یەکەم)دا ئاسایش و دادپەروەری هەموو ناوچەکانی (ئینگلتەرا)ی گرتەوە؛ بە جۆرێک نازناوی (شێری دادپەروەر)یان پێبەخشی[3].

لێرەوە گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر دامودەزگا کارگێڕیەکاندا هات و ئاڵۆزتربوو، ئەنجوومەنی شاهانە کە گەورە پیاوانی وڵات و دەرەبەگە مەزنەکانی

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى, ص٢٩٢.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٩٢.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الأوربية، ص١٧٥.

لەخۆگرتبوو، لە ساڵێکدا سێجار کۆدەبوونەوە، هەروەها ئەنجوومەنێکی بچ
هەبوو کە لە ڕاوێژکاری پاشا و پیاوانی کۆشک پێکدەهات، لەم ئەنجـ
بچووکەوە دامودەزگای کارگێڕی و دادوەری پەرەیانسەند و تایبەتمەندیـ
پۆلێنکردن، لەم پۆلێنکردنەشەوە وەزارەتە جیاوازەکان دەرکەوتن، لەو ڕۆژە
ئەمڕۆ دەزگا کارگێڕییەکان لە گەشەکردن و فراوانبوون و بەرەوپێشچوونـ
ئەنجوومەنە بچووکە بناغە دوورەکانی وەزارەت و سیستمە کارگێڕییەکان
کە ئەمڕۆ لە (ئینگلتەرا) و تێکڕای ئەو هەرێمانەی کە بە زمانی (ئینگلیزی) د
دەبینرێن[1].

لەپاش مردنی (هێنری یەکەم) بارودۆخێکی ئاڵۆز و پاشاگەردانی و
ئاسایش بۆ ماوەی (١٩) ساڵ وڵاتی گرتەوە، ئەم بارودۆخە بە شێوەیەک
بوو؛ هەموو هەوڵەکانی (ولیەمی یەکەم و هێنری یەکەم) کە بۆ بنیاتنـ
دابوویان بەهەدەرچوو! (هێنری یەکەم) کوڕی نەبوو کە شوێنی بگرێتەوە: هە
بڕیاریدا لەپاش خۆی تەختی فەرمانڕەوایەتی بە کچەکەی (متیلدا) ببەخشـ
شوێنی باوکی بگرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش (هێنری) بەڵێن و پەیمـ
خانەدانەکانی وڵات وەربگرت، بەڵام لەپاش مردنی؛ خانەدانەکانی ترسـ
بەڵێنەکەیان پاشگەزبوونەوە و پشتگیری (ستیڤن)یان کرد کە خوشکەزای هە
بوو، (ستیڤن) توانی زاڵبێت بەسەر (متیلدا) و دەسبەسەر تەختدا بگرێت
هەندێک لە خانەوادەکان لێی هەڵگەڕانەوە و داوای گەڕاندنەوەی مافی متیلد
و ڕایانگەیاند کە پێویستە تەختی پاشایەتی (ئینگلیزی) بۆ بگێڕدرێتە
بارودۆخە نالەبارە جەنگێکی ناوخۆیی لێکەوتەوە کە هەتا ساڵی (
بەردەوامبوو، لە ئەنجامدا گەیشتنە ڕێکەوتننامەیەک کە (ستیڤن) لەسەر
پاشایەتی بمێنێتەوە، بەڵام لەپاش خۆی؛ (هێنری دووەمی کوڕی
شوێنیبگرێتەوە، ئەوە بوو لەپاش ساڵێک (ستیڤن) کۆچی دوایی کرد و
ڕێکەوتننامەکەش (هێنری دووەم) دەسەڵاتی تەختی (ئینگلیزی) گرتەدەست[2]

(١) عبدالامير محمدامين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٣٩.
(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٥٨.

## (ستیفن کونتی بلوا ١١٣٥-١١٥٤ ز)

هەرچەندە (ستیفن) یەکەم کەسبوو سوێندی پەیوەندی (ولاء)ی بۆ (ماتیڵدای کچی هێنری یەکەم) خوارد کە دوای (هێنری یەکەم)ی باوکی دەسەڵاتی (ئینگلتەرا) بگرێتەدەست، لەگەڵ ئەوەشدا یەکەم کەسبوو لە سوێندەکەی پاشگەزبووەوە و تەختی پاشایەتی (ئینگلتەرا)ی زەوتکرد. (ستیفن) لە شاری (لەندەن) کەسایەتییەکی خوشەویستی هەبوو، بۆیە دانیشتووانەکەی پشتگیریان دەکرد، ئینجا (ستیفن) ڕوویکردە شاری (ونشستر) و لەوێش پیاوانی ئایینی و شازادەکان پەسەندیانکرد. پێویستبوو لەسەر (ستیفن) کە ڕێز لە مافی لایەنگرانی بگرێت کە یارمەتیاندا بۆ ئەوەی جڵەوی فەرمانڕەوایی بگرێتەدەست، بۆیە ڕێزی لە ئازادی کەنیسە و مافی شازادەکان گرت، لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمی (ستیفن) بە سەردەمی پاشاگەردانی و نائارامی ناودەبرێت؛ چونکە شەڕی ناوخۆ وڵاتی شپرزەکردبوو[1].

(ستیفن) توانی لایەنی ئایینی بەلای خۆیدا کێشبکات؛ ئەمیش لە ڕێگای (هێنری) ئەسقۆفی (ونشستر) و (ڕۆجەر) ئەسقۆفی (سالزبووری) بوو، کە (هینری) برای (ستیفن) بوون. (نۆرماندییەکان) لە ساڵی (١١٣٥ ز) هێرشیان کردەسەر ڕێگای (ئەنجوو)، بەڵام دانیشتووانی (نۆرماندیا) بەلای (ستیفن)دا شکانەوە. هەروەها لێرەوە چەند شۆڕشێک لە باکووردا سەریانهەڵدا؛ بەڵام (ستیفن) هەر هەموویانی لەناوبردن، (ستیفن) لە ساڵی (١١٣٦ ز)دا زیاتر پێگەکەی بەهێزتربوو؛ ئەویش بەو هۆکارەی کە پاپا پشتگیری لێیکرد. بەڵام لە ساڵی (١١٣٩ ز)دا؛ (ستیفن) لەگەڵ بنەماڵەی (ڕۆجەری ئینگلتەرا)دا بوو، بۆیە لایەنگیری پیاوانی ئایینی لەدەستدا، ئەمەش دەرفەتێکی بۆ (ماتیڵدا) ڕەخساند کە هێرشبکاتەسەر (ئینگلتەرا)، بەڵام (ماتیڵدا) تێکشکا و لە ئەنجامی شەڕەکەشدا بەدیلگیرا، کەچی (ستیفن) ئازادیکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە شازادەکان نیگەرانبن و بەلای (ماتیڵدا) شکانەوە و چوونە ڕیزی ئەوەوە[2]، ئەمەش وایکرد لە ساڵی (١١٤١ ز)دا (ستیفن) بڕیاریدا بە فەرماندەیی لەشکرێک شەڕی (ماتیڵدا) و یاخیبووان بکات، بەڵام (ستیفن) تێکشکا و لە (لنکۆڵن) بەدیلگیرا ، بەڵام توانی ئازادی خۆی بکڕێتەوە بەرامبەر بە ئازادکردنی (شیر)ی برای (ماتیڵدا) کە ناوی (ڕۆبرت ئەف گلوستر) بوو. بەدیلگیرانی (پاشا

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٩٤.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٣٩.

ستیفن) بووە مایەی ئەوەی کە دۆستەکانیشی لێی یاخیبن، کە لەو نێوانەشدا (هێنری) برای بوو، ئەویش بووە هۆی ئەوەی کە ڕێگا لەپێش (ماتێڵدا) خۆشبێت بۆ ئەوەی خۆی بە پاشای (ئینگلتەرا) ڕابگەیەنێت، بەڵام نائارامی وڵاتی گرتەوە و شەڕی ناوخۆ بەرپابوو لەپێناو بەدەستهێنانی تاجی (ئینگلتەرا) هاوکات (گوفری) توانی دەسەڵاتداریتی (نۆرماندیا) بەدەستبهێنێت، بەڵام وەک دەرەبەگێکی پەیوەست بە (لویسی حەوتەمی پاشای فەڕەنسا)[1]!

ئیدی لێرەوە تەرازووی هێز بەلای (ماتیلدا) شکایەوە؛ چونکە (هێنری) کوڕی تەمەنی گەیشتە (١٦)ساڵی و نازناوی (دۆقی نۆرماندی) هەڵگرتبوو، دوای مردنی (گوفری) باوکی ئەنجوومەنی هەرێمی بە میراتی بۆمابووەوە، بە خواستی (بانوری) هاوسەری پێشووی (لویسی حەوتەم) لە ساڵی (١١٥٣ ز)دا (هێنری) دەسەڵاتداریتی (ئەکوتینی) گرتەدەست. (هێنری) هێزی ئەم هەرێمانەی کۆکردەوە و هێرشی کردەسەر (ئینگلتەرا)، هاوکات (ستیفن) لە جەنگدا بوو دژ بە شازادە یاخیبووەکان لەنزیکی (لەندەن)، لەمکاتەدا (یوستاج)ی تاکە میراتگری (ستیفن) کۆچی دوایی کرد، ئەم ڕووداوە سەرجەم هاوکێشەکانی گۆڕی، (هێنری) تەمەنی بچووک بوو؛ بۆیە ڕێکەوتنێکی لەگەڵ (ستیفن)دا بەست کە هەتا (ستیفن) لە ژیاندا ماوە پاشای ئینگلتەرا بێت، دوای ئەو ئینجا (هێنری) ببێتە پاشای (ئینگلتەرا) و جێگرەوەی، ئەوە بوو (ستیفن) لە ساڵی (١١٥٤ ز) کۆچی دوایی کرد و لە ئەنجامدا (هێنری) تاجی پاشای (ئینگلتەرا)ی کردەسەری[2].

## ئینگلتەرە لە سەردەمی پلانتاگنتەکان

### هێنری دووەم (١١٥٤-١١٨٩ ز)

(هینری دووەم) بە یەکێک لە مەزنترین پاشاکانی ئەورووپا بەگشتی و (ئینگلتەرا) بەتایبەتی لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا دادەنرێت، دایکی (متیڵدای کچی هنری یەکەم) بوو، باوکیشی (کونت جیفری) میری ئەنگۆ بوو لە فەڕەنسا، (هینری دووەم) فەرمانڕەوایەتی (ئینگلتەرا و نۆرماندیا) و (مینی) لە دایکییەوە و هەردوو کۆنتی (ئەنگۆوتوینیشی) لە باوکییەوە بۆ مایەوە. لە ساڵی (١١٥٢ ز) (هینری دووەم)؛

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٩٥.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٠.

ئەلینوری) خاوەن تەختی (ئۆکۆتینی) خواست، بەمشێوەیە موڵکەکانی خۆی و خێزانەکەی لە (ئینگلتەرا و فەرەنسا)ی گرتەوە؛ بە جۆرێک لە سنووری سکۆتلەنداوە بۆ چیاکانی (برنس) درێژدەبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا (هێنری دووەم) رۆڵی وەک شوێنکەوتەیەکی دەرەبەگی بوو بۆ پاشای (فەرەنسا)؛ ئەویش بەو تایبەتمەندییەی کە کۆنتی (نۆرماندیا) بوو[1].

سەردەمی (هێنری دووەم) بە زیادبوونی دەسەڵاتی شاهانە لەسەر هەژماری خانەدانەکان و پەرەسەندنی کارگێڕی و دادوەری جیادەکرێتەوە، لە لایەنی دادوەرییەوە (هێنری دووەم) گرنگی دادگا شاهانەییەکانی زیادکرد و بوارەکانی تایبەتمەندێتی لەسەر هەژماری دادگا دەرەبەگییەکان فراوانترکرد. لە سەردەمی هێنرییەوە بەکارهێنانی (سوێندخۆران) بووە کارێکی باو لە (ئینگلتەرا)دا، تەنانەت سیستمی سوێندخۆران هەتا ئێستاش لە کاروبارە بنەڕەتییە جیامەندییەکانی دادوەرییە لە هەموو ئەو وڵاتانەی بە (ئینگلیزی) دەدوێن، ڕیشەی مێژوویی سوێندخۆران دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی)، بەڵام بنەڕەتە نوێیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ (نۆرماندییەکان) و بەتایبەتیش (هێنری دووەم)، ئەوانیش لە فەرەنگەوە وەریانگرتووە.[2]

سیستمی سوێندخۆران بە واتایەکی کورتتر؛ جۆرێکە لە لێکۆڵینەوەی تاوانکاری کە پشت بە سوێندخواردن دەبەستێت، لە هەر (١٠٤) پیاوێک لەناو هەر گوندێکدا پێویستبوو لەسەریان کە لەبەردەم دادگای شاهانەی گەڕۆکدا سوێندبخۆن و ناوی هەموو ئەو گومانلێکراوانەیان بخەنە بەردەم کە لە تێکدانی ئاسایشی وڵاتدا بەشداریانکردبوو، یاخود لە داهاتوودا گومانیان لێدەکرێت کە تێکیبدەن. ئەوە سەرەتایەکبوو بۆ سیستمی سوێندخواردن لە سەردەمی (هێنری دووەم) کە سیستمی وڵات پەرەیسەند و تەماشای تێکڕای کێشە شارستانییەکان دەکرا؛ وەک گیروگرفتەکانی زەوی و ناکۆکییەکان لەسەری، لەمبارەشدا (١٢) پیاو کۆدەبوونەوە و سوێندیاندەخوارد و پاشان ڕای خۆیان لەبەردەم دادگادا دەخستەڕوو[3].

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی ج١/ ص١٤٠.

(٢) فشر: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی، ج٢/ ص٢٨٤.

(٣) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی ج١/ ص ١٤١.

له سـەرەتادا بـارەکە لەنێـوان سـوێندخۆر و گەواهیـدەرەکەدا ڕوون نەبـوو؛ بە تێپەڕبـوونی کـات ئەم دووانە بەڕوونـی لە یەکـدی جیـاکرانەوە، سـوێندخۆر کە لە نـاوچەیەک و لەنـاو خەڵکیـدا هەڵـدەبژێردرا؛ لە دادگـادا دادەنیشـت و گوزارشـتی لە فرمانەکەی دەکرد. بەڵام بڕیاری سزای دەرنەدەکرد؛ چونکە ئەم کارە تایبەتبوو بە دادوەرەوە، هەروەها سوێندخۆر لە ماوەی دادگاییکردنەکەدا گەواهی نەدەدا؛ بەڵکوو دەبوو گوێ لە بەڵگەکانی تۆمەتبارکردن و بەرگریکردن بگرێت کە لەبەردەم دادگادا دەخرانەڕوو. لە کۆتـایی دانیشـتنەکەدا و لە ئەنجامی هەمـوو ئەوەی گوێی لێدەبوو؛ پیشانیدەدا کە تۆمەتبـارکراوەکە بێتـاوانە یـاخود تاوانبـارە، بڵاوبـوونەوەی سیسـتمی سوێندخۆران بووە هۆی بەهێزکردنی دادگا شاهانەییەکان و دەسـەڵاتی پاشـایەتی و لە هەمـان کاتـدا لاوازکردنـی دەسـەڵاتی خـانەدانە (ئینگلیزییەکـان)، هەروەهـا لە سـەردەمی (هێنـری دووەم)دا بەکارهێنـان و گەڕانەوە و پشتبەسـتن بە بەکارهێنـانی یاسای گشتی زیادیکرد[1].

## ناکۆکی لەگەڵ کڵێسادا

سووربوونی (هێنری دووەم) و جەختکردنەوەی لەسەر بەهێزکردنی دەسـەڵاتی دادوەری شاهانە بووە هۆی هەڵگیرسـانی ململانێیەکی ترسـناک لەنێوان (هێنـری) و کڵێسـادا، لەپـاش فەرمـانڕەوایەتی نۆرمانـدی لە (ئینگلـتەرا) دوو سیسـتمی دادوەری سەرەکی هاتنەکایەوە:

یەکەم/ پشتی بەیاسا و دادگا شاهانەکان دەبەست.

دووەمیان: پشتی بە یاسا و دادگا کڵێساییەکان دەبەست.

لەنێوان ئەم دوو سیستەمەدا بـوارێکی گەورە هەبـوو بـۆ جیـاوازی و پێکدادان؛ بەتایبەتی دەربـارەی ئەو کێشـانەی کە سروشـتێکی تێکەڵ و ئاڵۆزیـان هەبوو، وەک کێشەی سـزادانی ئەو پیـاوە ئایینیـانەی کە دەسـەڵاتداربوون، یـاخود لەبەردەم دادگـا کڵێسـاییەکاندا تۆمرتبارکرابوون، (هێنری) پێیوابوو ئەو پیاوە ئایینیـانەی کە لەبەردەم دادگا کڵێساییەکەدا دادگاییکراون، پێویستە جارێکیتر بگوازرێنەوە بۆ دادگای شاهانە

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الأوربية، ص١٧٨.

... به ڕۆڵی خۆی سزای پێویستی بدات، له بەرامبەردا کڵێسا ئەوەی ... که پیاوەکانی بداته دەست دادگایەکی دونیایی[1].

... بیکیت) له ترۆپکی هەرەمی کڵێسای ئینگلیزیدا بوو، واته پۆستی ... ئەسقۆفی (کونتربرِی) لەئەستۆبوو، هاوکات هاورِێیەکی خۆشەویستی ... ئیری) بوو، لەهەمانکاتدا له ڕاوێژکاره نزیکەکانی، هێنری (تۆماس)ی ... ەوه بۆ ئەو پۆستە؛ پاشا وا گومانی برد که دەتوانێت و بۆ بەدیهێنانی ... رامیارییەکانی جێبەجێدەکات، بەڵام (توماس) نموونەیەکی تایبەتی ئەو ... وو که به دڵسۆزییەکی بێ وێنەوه له هەموو کارێکدا که دەخرایه ئەستۆی ...ەدا و بەو شێوەیه ناسرابوو[2].

... ەرەتادا (تۆماس) ڕەزامەندبوو لەسەر پرۆژه تایبەتییەکەی پاشا؛ ئەو ...یەی که پیاوانی ئایینی دەدا به دادگا پاشایەتییەکان، هەرچەنده پارێزگاری ... دەکرد؛ بەڵام له دواییدا ڕەزامەندبوونەکەی کشاندەوه، بۆیه پاشا دەستیکرد ...ساندنەوەی، سەرئەنجام (تۆماس) هەڵهات بۆ (فەڕەنسا) و چەند ساڵێک ... ایەوه، کاتێک به شێوەیەکی ڕووکەشی پەیوەندی نێوان پاشا و سەرۆکی ...قوفەکەی بەرەو باشبوون چوو؛ (تۆماس) بۆ (ئینگلتەرا) گەڕایەوه، بەڵام ...تی (٤) ئەسپسواری پاشا کوژرا[3].

...ەم ڕووداوه ئەورووپا بەگشتی و (ئینگلتەرا)ی بەتایبەتی هەژاند، هەڵوێستی ...ری) هێنده لاوازکرد که وایلێکرد له بەرامبەر نێردراوی پاپادا بێئاگایی خۆی لەو ...نه ڕابگەیەنێت، (هێنری دووەم) له بەرامبەر ئەم ناڕەزایی و هەڵچوونه گشتییەی ...ەکی که له بەرامبەر کوشتنی (تۆماس) نواندیان، ناچاربوو له پرۆژه تایبەتییەکەی ...ادگاییکردنی پیاوانی ئایینی لەبەردەم دادگا شاهانەییەکاندا پاشەکشەبکات و ...گەزبیبێتەوه. (هێنری دووەم) له کۆتایی تەمەنیدا زۆر نائارام بوو، چونکه ...یوەندییەکانی لەگەڵ زۆربەی خەڵکانی دەوروبەری بەرەو خراپبوون چوو؛

---

[1] عبدالأمير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص١٤٢.

[2] محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٩٨.

[3] عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٣.

بەتـــایبەتی لەگەڵ ژنەکەی (ئەلینـــور) و دوو کـــوڕەکەی (ڕیچـــارد و جـــۆن) کە ئامادەبوون بە هاوکاری پاشای (فەڕەنسا) پیلان لە دژی باوکیان بگێڕن[1].

(هێنری دووەم) ساڵی (١١٨٩ ز) کۆچی دوایی کرد، کوڕە گەورەکەی بە ناوی (ڕیچارد) شوێنیگرتەوە کە دواتر بە (شێردڵ) ناوبانگی دەرکرد، (ڕیچارد) لە ماوەی (١٠) ساڵی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا (٦) مانگ زیاتری لە (ئینگلتەرا) بەسەرنەبرد؛ چونکە سەرگەرمی پڕۆژە ڕامیارییەکانی کیشوەری ئەورووپا و بەشداریکردنی لە جەنگی خاچییەکان بوو[2].

پاشـــاکانی (ئینگلـــتەرا) هەر لە ســـەردەمی ڕزگـــارکردنی (نۆرمانـــدی)دا شـوێنکەوتەیەکی دەرەبەگـی بـوون بـۆ پاشـای (فەڕەنسـا)، (ولیەمـی یەکەم) کە (ئینگلتەرا)ی گرت و زاڵبوو بەسەریدا. لە بنەڕەتدا کۆنتێکی (نۆرماندی) هەرێمێکی دەرەبەگـی (فەڕەنسـی) بـوو، ئەوەی سـەیربوو ئەوە بـوو کە لە ڕووی هێـز و قورسایی دەسەڵاتەوە دەسڕۆیشتووتربوون لە پاشای (فەڕەنسا)، لە کاتێکدا پاشا لە لایەنی تیۆرییەوە مەزنیان بوو. لە سەرەتاکانی سەدەی سیازدەهەمدا ئەم ڕەوشە بەرەو گـۆڕان ڕۆیشـت، لە کاتێکـدا کە جێگرەوەکـانی (هێنـری دووەم) نەیـانتوانی پارێزگـاری لە موڵکەکانیـان بـکەن لە کیشـوەری ئەورووپـادا، بەش لەدوای بەش زەوییەکانیان لەدەستدا، هەر بەتەنها پاشاکانی (ئینگلتەرا) موڵکەکانیان لەدەستنەدا؛ بەڵکوو خانەدانە ئینگلیزییەکانیش زۆرینەی هەرێمەکانی ژێردەسەڵاتیان هەرلەوێدا لەدەستدا[3].

ئەم گۆڕانکاریانەی لە کیشوەری ئەورووپادا بەسەر پاشاکان و خانەدانەکانی ئینگلتەرەدا هات، بووە هۆی پەرەسەندنێکی ڕامیاری و دەستووری گرنگ لە خودی ئینگلتەرادا، ئەم بارە وای لە هەردوو دەستەی پاشا و خانەدانەکان کرد کە زیاتر پابەنـــدبن بە ئینگلـــتەراوە و هەریەکەیـــان ئەو مـــاف و دەســـتکەوتانەی کە بەدەستیانهێنابوو پارێزگاری لێبکەن و نەهێڵن بەرامبەرەکانیان لێیان زەوتبکەن، ئەم هەڵوێستە توندەی هەریەک لە پاشا و خانەدانەکان بەرامبەر بە یەکدیی بووە هۆی پێکدادانی توند لەنێوانیاندا، ئەمەش لە کاتێکدا کە پاشا (جۆنی یەکەم ١١٩٩-١٢١٦

---

(١) عبدالامیر محمدامین: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی ج١/ ص ١٤٣.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣٠٠.

(٣) عبدالامیر محمدامین: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی ج١/ ص١٤٤.

ڕا هەڵسوکەوتی خانەدانەکانی بینی کە مەیدانخوازی دەسەڵاتی پاشایەتی پیوەدیاربوو، لە بەرامبەردا خانەدانەکان هەستیان بەوە کرد کە ڕامیاری پاشا بەرامبەریان توندوتیژبووە و سنووری مافە بۆ ماوەییەکانی تێپەڕاندووە[1].

## (ڕیچاردی یەکەم ١١٨٩-١١٩٩ ز)

لە فەرمانڕەوایەتیدا شوێنی باوکی گرتەوە، ئەم پاشا نوێیە بە ئازایەتی و حەزکردن لە کاری پاڵەوانێتی و جەنگکردن بە توندوتیژی ناوی دەرکردبوو، لە ماوەی ئەو (١٠) ساڵەی کە فەرمانڕەوایەتی تێداکرد، لە (٦) مانگ زیاتر ژیانی لە (ئینگلتەرا) بەسەرنەبرد، دووجار گەڕایەوە (ئینگلتەرا) کە هەرجارەی چەند مانگێکی تێدا بەسەردەبرد، ئەویش بۆ کۆکردنەوەی پارەوپوول بوو؛ هەموو ئەمانەش لەپاش ئاهەنگی تاجلەسەرنانی کۆتایی هات، هاوکات بە خوێنڕشتنی ئەو جووانە کۆتایی پێ هات کە دیاریان بۆ هێنابوو.

(ڕیچارد) لە دوای باوکی تەختی فەرمانڕەوایی (ئینگلتەرا)ی گرتەدەست، (ڕیچارد) لە ساڵی (١١٥٧ ز) لە (ئۆکسفۆرد) لەدایکبووە و زۆربەی تەمەنی لە (ئاکویتین) بەسەربرد کە کاروباری ئەو هەرێمەی بەڕێوەدەبرد لەبری (ئەلمیانور)ی دایکی. (ڕیچارد) هەر لە سەرەتای دەستبەکاربوونیدا؛ سەرقاڵی ڕێکخستنی هەڵمەتێکی خاچی بوو کە بە هەڵمەتی سێیەم لە مێژوودا دەناسرێت، کە (فلیپ ئۆگستسی پاشای فەڕەنسا) و (فریدریک بارباروسای ئیمپراتۆری ئەڵمانیا) لەم هەڵمەتەدا هاوکاری بوون، بەڵام بۆ ئەنجامدانی ئەم ویستەی (ڕیچارد) پێویستی زۆری بە پارە هەبوو، بۆ بەدەستهێنانی پارەش چەند هەنگاوێکی ناوە بە لادانی فەرمانبەرانی دەوڵەت و دواتر گەڕانەوەیان بە بڕە پارەیەکی کەم. دووەمیان بەرامبەر بە بڕە پارەیەکی کەم، دانی بە سەربەخۆیی (ئوسکتلندا)نا، هەروەها دەستیبەسەر چەند کەشتییەکدا گرت کە لە ئاوەکانی (بەریتانیا) لەنگەریانگرتبوو؛ بۆ ئەوەی هێزەکانی لە ڕێگای دەریاوە بگەیەنێتە خۆرهەڵات[2].

لەو ڕێگایەشیدا بۆ خۆرهەڵات و لە ساڵی (١١٩١ز) دەستیگرت بە سەر دوورگەی (قوبرس) و فرۆشتنی و بە سوارەی (داویە)، بەڵام ئەم مامەڵەیە

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوربية، ص١٨٣.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٣.

شکستیهێنا و دواتریش فرۆشتییەوە بە (لوزجنان) کە پاشای میرنشینی (قودسی خاچی) بوو، (ڕیچارد) لەگەڵ (سەلاحەدینی ئەیوبی) جەنگا، بەلام نەیتوانی (قودس) داگیربکات، بۆیە لەگەڵ (سەلاحەدین)دا بڕیاری ئاشتیان دەرکرد کە لە ساڵی (١١٩٢ ز) بەرەو ولاتەکەی گەڕایەوە، بەلام لە ڕێگادا زریانی دەریادا کەشتییەکەی بەرەو دوورگەی (کورفۆی بیزەنتی) ڕاپێچکرد، (ڕیچارد) ترسی ئەوەی لێنیشت کە پاشای (بیزەنتی) بە دیلی بگرێت؛ بۆیە بە کەشتییەکی بچووک بەرەو ئەلمانیا بەڕێکەوت، کەچی لە ڕێگادا (لیوبولدی دۆقی نەمسا) بە دیلی گرت! چونکە ناکۆکی لەنێوان ئەم دووانە هەبوو، لەسەر ئەوەی (ڕیچارد) لە شاری (عەککا) ئالای (لیوبولدی) دڕاندبوو، دوای (٣) مانگ (ڕیچارد)ی ڕادەستی (هێنری شەشەمی ئیمپراتۆری ئەڵمانیا) کرد، بە پێچەوانەی نەریتەکانی شەڕی خاچییەکان؛ (هێنری) داوای بریتی کرد لە بەرامبەر ئازادکردنی (ڕیچارد) و ماوەی ساڵێک بە دیلی مایەوە؛ چونکە (ئینگلتەرا) توانای ئەوەی نەبوو ئەو بڕە پارەیە بدات لەپێناو ئازادکردنی (ڕیچاردی شێردڵ)، هاوکات (یوحەننا)ی برای هەوڵیدا کە دەسبەسەر تەختی پاشایەتی (ئینگلتەرا) بگرێت، بەلام دایکیان ڕێگای پێ نەدا، بۆیە (یوحەننا) هەڵهات بۆ (فەڕەنسا) و بە هاوکاری (فلیپ ئۆگستس) هێرشیکردە سەر (ئینگلتەرا)[1].

(فلیپ و یوحەننا) هیچیان پێ نەکرا لە (ئینگلتەرا) و لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا هێرشیانکردەسەر (نۆرماندی) و داگیریانکرد، (ڕیچارد) لە مانگی مارسی ساڵی (١١٩٤ ز)دا لە دیلی ئازادیبوو و گەڕایەوە (ئینگلتەرا) بۆ ئەوەی خۆی ئامادەبکات بۆ شەڕکردن دژ بە (فلیپ). (ڕیچارد) لە ماوەی (٥) ساڵدا توانی زۆربەی موڵکەکانی لە کیشوەری ئەورووپا بگرێتەوە کە (فلیپ) زەوتیکردبوو، لە (٢٦/مارس/١١٩٩ ز) لە شاری (لیموزین) و لە کاتی ململانێدا لە قەلایەکی دەرەبەگاکان تیرێکی نادیار بە ئاڕاستەی (ڕیچاردی شێردڵ) کرا و کوژرا[2].

## (جۆن)ی یەکەم (١١٩٩– ١٢١٦ز)

لەپاش مردنی (ڕیچاردی یەکەم)؛ دەسەلاتی تەختی شاهانەی (ئینگلتەرا)ی گرتەدەست، دوای تاج لەسەرنانی؛ سەرۆکی ئەسقەفی (کانتربوری هیوبرت والتر)

---

(١) ئاراس فەریق زەینەڵ: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٢٧.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣٠٢.

ـچاريكرد كە سـوێندبخوات كە دەسـەڵاتەكەی بە هەڵبـژاردن لە لايەن خـانەدان و ـپـاوە ئايينييەكـانەوە گرتووەتەدەسـت نەک بە بۆمـاوەيی لە بـراكەيەوە، بەڵام لە ـێژووی (جۆن)دا بەڕوونی دەردەكەوێت كە (جۆن) بەسوێندەكەوە پابەند نەبوو! ـژيـانی (جـۆن) بە گەردەلوولێـک لە ڕق و كيـنە لەگەڵ خـانەدان و پاپـا و (فيليـپ ـئۆگستۆسی پاشای فەڕەنسا) جيادەكرێتەوە و باجێكی زۆری بەسەر دانيشتوواندا ـسەپاند لەپێناو بەرگريكردن لە موڵكە ئينگليزييەكان لە ئەورووپادا[1].

باجەكـان بـابەتی سـەرەكيبوون بـۆ دروسـتبوونی ململانێی نێـوان (پاشـا جـۆنی يەكەم) و خـانەدانە (ئينگليزييەكـان)، لە كاتێكدا كە نـاكۆكييەكە لەوپەڕی تونديدابوو؛ پاشا ڕووبەڕووی ململانێيەكی ديكە بووەوە لەگەڵ (پاپا ئەنۆسنتی سێيەم)، ئەويش بە هـۆی ئەو هەوڵە گەورەيەوە ڕوويـدا كە وايلێكـرد شـوێنێكی ديـار لە مێـژوودا بەجێبهێڵێـت، چـونكە لە سـاڵی (١٢٠٥ ز) پيـاوە ئايينييەكـان لە (ئينگلـتەرا) هەڵـی بەتـاڵبوونی پۆسـتی سـەرۆكی ئەسـقەفی كانتربووريـان قۆسـتەوە؛ بـۆ ئەوەی پاشـا دەسـوەرنەدات لە ديـاريكردن و هەڵبژاردنـی سـەرۆكی ئەسـقەفی (كـانتربوری)، هەربـۆيە بە شـێوەيەكی نهێنـی سـەرۆكێكيان هەڵبـژارد و بەبـێ ئاگـاداری پاشـا بـۆ ڕۆمايـان نـارد هەتـاوەكوو بە شـێوازبەندييەک پۆسـتەكەی پێببەخشـرێت، لەمكـاتەدا (پاشا جۆن) پياوێكی ديكەی دەستنيشـانكرد بۆ ئەوەی ئەو پۆسـتە بگرێتەئەسـتۆ و ناردی بۆ (ڕۆما) و لەوێ لەگەڵ ڕكابەرەكەيدا ڕووبەڕووی يەكدی بوونەوە[2].

پاپـا هەڵبژاردنـی (سـتيڤن لانكتـون)ی بـۆ سـەرۆكی ئەسـقەفی (كـانتربووری) بەدڵنەبـوو، بـۆيە (سـتيڤن)ی ڕەتكـردەوە، ئەمەش پەيوەنـدی نێـوان (جـۆن) و پاپـای زياتر گرژكرد، ئەم گرژييە لە سـاڵی (١٢٠٨ ز)  بە دەركردنـی بڕيـاری قەدەغەكـردن لە دژی ڕوويدا، ئەويش بە هۆی توندوتيژی و كوشتنی يەكێک لە پياوەكانی كڵێسا. لە بەرامبەر ئەم ڕووداوەدا؛ (پاپا ئەنۆسنتی سێيەم) لەكارخستنی پاشـای ڕاگەياند و ڕێـی بە دانيشـتوواندا لە گـوێڕايەڵی پاشـا دەربچـن، جـۆنيش لە وەڵامـی ئەم دژايەتيكردنەيدا دەستيگرت بەسەر هەموو موڵكەكانی كڵێسا لە ئينگلتەرادا[3].

---

(١) عبدالامير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٥.

(٢) عبدالامير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص ١٤٥.

(٣) عبدالامير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص ١٤٥.

ئەم گرژییە نزیکەی (٥) ساڵی خایاند؛ سەرئەنجام (پاشا جۆن) بە ناچاری ملیکەچکرد بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی پاپا و ڕەزامەندبوو بە دانانی (ستیڤن) بە سەرۆکی ئەسقەفی (کانتربوری) و داننان بە دەسەڵاتی پاپایی و پەیمانیدا ساڵانە بڕێک پارە وەک ڕەمزێکی ئەو شوێنکەوتەییە بدات، لە پاشاندا (پاشا جۆن) چووەناو ئەو هاوپەیمانێتییە مەزنەی کە ئیمپڕاتۆر (ئۆتۆی چوارەم) و (کۆنت ملاندز) دژی (فیلیپ ئۆگستسی پاشای فەڕەنسا) بەستبوویان، کاتێک خانەدانەکان یارمەتیدانی پاشاکەیان لە جەنگە نوێکەدا ڕەتکردەوە؛ (جۆن) بە سەرکردایەتی کۆمەڵێک لە سەربازی بەکرێگیراو ڕوویکردە (ملاندز)، لە کاتێکدا بە شکستخواردووی لە ساڵی (١٢١٤ ز) گەڕایەوە بۆ (ئینگلتەرا)[1].

خانەدانەکان زۆر بەخراپی تووڕەبوون؛ ئەم تووڕەبوونەش گەیشتە لووتکە، چونکە (جۆن) باجی نوێی بەسەر دانیشتوواندا سەپاند بۆ ئەوەی قەرەبووی زیانی جەنگەکەی بۆ بکاتەوە، بۆیە خانەدانەکان یەکیانگرت و نووسراوێکیان خستەبەردەست پاشا کە جێبەجێی بکات. پاشا سستی لەم ئەرکانەدا نواند و لە ئەنجامدا خانەدانەکان لەندەنیان داگیرکرد و (جۆن) لێرەدا ناچاربوو کە ڕەزامەندبێت لەسەر پەیمانی مەزن (ماگناکارتا) و لە (١٥/یۆنیە/١٢١٥ ز) بە مۆری شاهانە مۆری بکات، ئەم بەڵگەنامەیە لە (٦٣) بڕگە پێکهاتبوو کە زۆربەیان تایبەتبوون بە پاراستنی بەرژەوەندی خانەدانەکان و چەند بڕگەیەکی کەمیشی تایبەتبوو بە پیاوە ئایینییەکان و بازرگانانی شارەکان، (١٠) بڕگەشی بۆ ڕوونکردنەوە و دیاریکردنی کاری دادگا شاهانەییەکان دانرابوو[2].

ماددەی یەکەمی بەڵگەنامەکە باس لە کڵێسا و مافەکانی و بەرژەوەندییەکانی بەتەواوەتی دەکرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێگە لە پاشا دەگرێت دەستبخاتە هەڵبژاردنی ئەسقەف و ڕاهیبەکان، ماددەی (٢ و ١٢ و ٤٣) باس لە نەشکاندنی یاسا دەرەبەگایەتییەکان دەکات لە کۆکردنەوەی پارە و پوولدا، ماددەی (٣ و ٦) باسی لە ڕێزگرتن لە سامان و موڵکی بێوەژن و هەتیوەکان دەکرد، ماددەی (٤١) تایبەتبوو بە پاراستنی بازرگانی، ماددەکانی (٤٤ و ٤٧ و ٤٨) باسی لە وەستاندنی خراپ بەکارهێنانی دارستانەکان لە لایەن پاشاوە دەکات، ماددەکانی (٤٩ و ٥٠ و ٥١) باس

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣٠٨.

(٢) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص ١٤٦.

ـەوە دەکات کە دەبێت پاشا هەموو سەربازە بەکرێگیراوەکان لە سوپا دەربکات، هەموو ئەو شتانەشی کە پاشا دەستیبەسەرداگرتبوون؛ بگەڕێندرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان، ماددەی (١٣) باس لە پێویستبوونی ڕێزگرتنی پاشا دەکات بۆ هەموو بەرژەوەندی و ئەو مافانە کە دانیشتووانی (لەندەن) و شارە ئینگلیزییەکانی دیکەی پێی دەناسرێتەوە، ماددەکانی (١٨، ٢٠، ٢٤، ٣٠، ٣٨، ٤٥) باس لەو کۆتە تایبەتییانە دەکات کە پێویستە لەسەر پیاوەکانی پاشا و کارمەندانی کۆشک دابنرێت[١].

لە لای زۆرێک لە نووسەران (ماگناکارتا) بە بنەڕەتێک بۆ ماف و ئازادییە ڕامیارییەکان دادەنرێت، ئەمە هەتا ئەندازەیەک لە ڕاستییەوە نزیکە، بەڵام پێویستە ئەوەمان لەیادنەچێت کە (ماگناکارتا) لە بنەڕەتدا بەڵگەنامەیەکی دەرەبەگییە کە دەرەبەگە مەزنەکان بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانیان و لە زیادەڕەوییەکانی پاشا دایانڕشتبوو، لە هەموو شتێک زیاتر جەختی لەسەر مافی خانەدانەکان دەکردەوە؛ بەڵام ماف و ئازادییەکانی گەل بە خەیاڵی ئەو کەسانەدا نەدەهات کە بەندەکانی ماگناکارتەیان دارشتبوو. بەهەرحاڵ (ماگناکارتا) گرنگییەکی گەورەی هەبوو لە زۆر بواردا؛ لە لایەکەوە چارەسەری زۆر گیروگرفتی سەردەمی خۆی کرد، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو بارودۆخەی کە ئەو بەڵگەنامە و وشانەی تێدا نووسرا؛ گرنگییەکی زۆری بە نەوەکانی داهاتوو دەدا، بۆ نموونە پاشا دەبێت بخرێتە بەردەم پرسیار و لێپرسینەوەوە، ئەمەش بناغەیەک بوو بۆ هەڵتەکاندنی بیری دەسەڵاتی ڕەهای پاشایەتی و سنووردارکردنی ئەو دەسەڵاتە لە لایەن گەلەوە[٢].

## (هێنری سێیەم ١٢١٦-١٢٧٢ ز)

لەپاش مردنی (جۆنی یەکەم)؛ کوڕەکەی (هێنری سێیەم ١٢١٦–١٢٧٢ ز) شوێنیگرتەوە، لەوکاتەدا تەمەنی تەنها (٩)ساڵ بوو، لەبەرئەوە کۆمەڵێک خانەدانی بەتوانا و ئەسقۆفە مەزنەکان فەرمانڕەوایەتیان گرتبووەئەستۆ، (هێنری سێیەم) لە ساڵی (١٢٢٧ ز)دا بە شێوەیەکی کرداری دەسەڵاتی گرتەدەست، ئیدی لێرەوە جارێکی دیکە بارودۆخی (ئینگلتەرا) بەرەو خراپبوون و لاوازی گەڕایەوە، ئەمەش وای لە پاپا کرد کە شوێن بەتاڵی کڵێساکان بە پیاوە ئیتاڵییەکان پڕبکاتەوە، لە

(١) عبدالأمیر محمدامین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٧.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٦٤.

لایەکی دیکەوە پیاوە ئاینییە ئینگلیزەکان بە ناوی جەنگی خاچییەوە پارەیەکی زۆریان لە (ئینگلتەرا) کۆکردەوە و بۆ گەنجینەی پاپایان نارد، ئەمە ڕق و تووڕەیی هەموو ئینگلیزە عەلمانی و ئایینییەکانی پێکەوە وروژاند. پاشا ئامرازێکی بێدەسەڵاتبوو بەدەست دەستەبژێرەکانییەوە، لاوازی پاشا بەئاشکرا دەرکەوت کاتێک کە ویستی پڕۆژە سەربازییەکانی بەدیبهێنێت؛ بەتایبەت لە دژی پاشای (فەڕەنسا)[1]. کاتێک (هێنری سێیەم) دەرگای وڵاتی بۆ بێگانەکان والاکرد؛ بارودۆخەکە هێندەی دیکە ئاڵۆزبوو، زۆر لە خەڵکانی (پرۆفنس و سافۆی) و کەسانی دیکە بۆ خۆشگوزەرانی خۆیان هاتنەناو (ئینگلتەرا)، ئەمەش لەسەر هەژماری دانیشتووانە ڕەسەنەکانی بوو. هاوکات (هێنری سێیەم) پارەیەکی زۆری بە بەرتیل بەخشییە (ئەڵمانییەکان)، بۆ ئەوەی (ریچارد)ی برای بە ئیمپراتۆر هەڵبژێرن، هەروەها یارمەتی پاپایدا لەو جەنگەی کە لەگەڵ شانشینی (سەقلیە)دا هەڵگیرساندبوو، لە بەرامبەردا پاپا بەڵێنی پێدانی تەختی فەرمانڕەوایی ئەو شانشینەی بە کوڕی دووەمی (ئەدموند)دا[2].

لە کاتێکدا (هێنری سێیەم) پێویستی زۆری بە پارە بوو؛ پەنای بردەبەر ئەنجوومەنی مەزن و داوای یارمەتی لێکردن، لە بەرامبەردا (هێنری سێیەم) سەری بۆ خواستی ئەنجوومەن دانەواند و ڕەزامەندبوو لەسەر دەرکردنی تێکڕای بێگانەکان، لە سەرووی هەموویانەوە بنەماڵەی (لوزجنان)، کاروباری فەرمانڕەوایەتیش کۆمەڵێک لە خانەدانەکان گرتیانەئەستۆ کە وەک وەزیر بەرپرسیاربوون لەبەردەم ئەنجوومەندا، بەمشێوەیە بۆ ماوەیەک خانەدانەکان سەرلەنوێ بووژانەوە؛ بە فەرمانڕەوایەتیکردنی وڵات لەژێر سەرکردایەتی گەورەکەیان (سیمون دی مونتفورت)، لە ساڵی (١٢٥٩ ز) لەگەڵ (فەڕەنسا)دا ڕێکەوتننامەیەکیان گرێدا بۆ کۆتاییهێنان بە باری جەنگ، سنووریشی بۆ زۆرێک لە گەندەڵییەکانی وڵات دانا[3].

پەیوەندی نێوان خانەدانەکان و پاشا هەتاسەر بە باشی نەمایەوە و جارێکی دیکە ڕووی لە گرژی کردەوە، (سیمون دی مونتفورت) توانی هێزەکانی پاشا

---

(١) عبدالامیر محمدامین و: تاریخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٤٨.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص ٤٦٦.

(٣) محمود سعید عمران: تاریخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣١٢.

تێکبشکێنێت، ئەم بارودۆخەش بە بەستنی پەرلەمانی بەناوبانگ لە ساڵی (١٢٦٥ ز) کۆتایی پێ هات, ئەوە بوو بۆ یەکەمجار ئەنجوومەنەکە نوێنەری هەموو شارەکانی لە ڕێی هەڵبژاردنەوە لەخۆگرت و مۆرکێکی جەماوەری بەهێزی بە پەرلەمان بەخشی، گرنگی پێکهێنانی بیری ئەنجوومەنی گشتیش بۆ (سیمون دی مونتفورت) دەگەڕێتەوە. هەر لە هەمان ساڵدا هەندێک لە خانەدانەکان بارودۆخەکەیان تێکدا و شۆڕشیان هەڵگیرساند، لە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو و نەخوازراویشدا (سیمون دی مونتفورت) خۆی کوشت! بەوەش ڕۆژلەدوایڕۆژ هەژموونی خانەدانەکان لە کەمبوونەوەدابوو. بەڵام دوای ئەوەی سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لە تێکشکاندنی هێزی چەوسێنەردا؛ لە ساڵی (١٢٧٢ز)دا (هێنری سێیەم) کۆچی دوایی کرد، ئیدی کوڕەکەی دوای خۆی (میر ئیدوارد) کە بووە (ئیدواردی یەکەم) جێگەیگرتەوە، کەچی لە هەڵمەتی خاچییەکاندا بەشدارینەکرد[1]!

## (ئیدواردی یەکەم ١٢٧٢-١٣٠٧ ز)

(ئیدواردی یەکەم) لە ساڵی (١٢٧٢-١٣٠٧ ز) جڵەوی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست، ئەوکاتە تەمەنی (٣٧) ساڵ بوو، پیاوێکی پێگەیشتوو و ئەزموونێکی فراوانی هەبوو، لە هەمان کاتدا خوێندەوارییەکی باشی هەبوو، هەوڵی دەدا کە ڕەگەزەکانی هێز و دادگەری یەکبخات و زۆر حەزی بە چاکسازی دەکرد، ئەمەش وایلێکرد کە شوێنێکی دیاری لە مێژووی ئینگلیزیدا هەبێت و کاریگەرییەکی زۆری بەسەر داهاتووی ئینگلتەرەوە هەبێت، لەبەرئەو پەرەسەندنە یاساییەی کە لە سەردەمی ئەودا (ئینگلتەرا) بە خۆیەوە بینی، نازناوی (جستنیانی ئینگلتەرا)ی بەسەردابڕا[2].

(ئیدواردی یەکەم) لە پاش گەڕانەوەی لە هەڵمەتی خاچییەکاندا تەختی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست و هیواخوازبوو کە هەڵمەتێکی نوێی خاچی ئامادەبکات، بەڵام ئەو بارودۆخە دەرەکی و ناوخۆییەی کە ڕووبەڕووی بوویەوە؛ بوو بە ئاستەنگ لەبەردەم جێبەجێکردنی ئەم خواستەیدا، (ئیدواردی یەکەم) کاری بۆ یەکخستنی پارچە و دوورگە جیاوازەکانی (بەریتانیا) کرد، بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی بەهێزی یەکگرتووی لێ دروستبکات، مەزنترین سەرکەوتنیش لەم کارەیدا لکاندنی

---

(١) سعید عبدالفتاح عاشور: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی،ج١/ ص٤٦٧.

(٢) عبدالأمیر محمدامین و: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی ج١/ ص١٤٨.

میرنشینی (ویڵز) بوو به ئینگلتەرەوە، لە سەردەمی دوا میریاندا (لیولینی مەزن) مەترسییەکی زۆری بۆ دروستکردبوو، (ئێدواردی یەکەم) سەرکەوتنی بەسەردا بەدەستهێنا و (ویڵز)ی خستە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە. هەروەها یاسای ساڵی (١٢٨٤ ز)ی دەرکرد کە بەپێی ئەم یاسایە (ویڵز)ی خستەسەر تەختی (بەریتانی)، دواتر یاسا (ئینگلیزییەکان) لەسەردەستی کارمەندە ئینگلیزە کارگێڕییەکان لە (ویڵز)دا پیادەکرا، لە ساڵی (١٣٠١ ز)دا (ئێدواردی یەکەم) نازناوی میری (ویڵز)ی بە کوڕە گەورەکەی بەخشی[1].

خانەدانە ئایینییەکان ئەنجوومەنێکی پاشایەتی مەزنیان پێکهێنابوو، کە گەورە کارمەند و ڕاوێژکارەکانی تێدابوو، لە ماوەی سەدەی پازدەهەمدا زۆر کۆبوونەوەیان ئەنجامدا، لە ساڵی (١٢٩٥ ز) کۆبوونەوەیەک بەسترا کە بە پەرلەمانی نموونەیی ناوی دەرکردووە، (ئێدوارد) بۆ کۆبوونەوە لە ئەنجوومەنەکەدا دوو خانەدانی بچووک لە هەموو کۆنتێک و دوو بۆرژواز و بازرگان لە هەموو ناوچەیەکدا بانگهێشتکرد، ئەمە سەرەڕای بانگهێشتکردنی خانەدانە مەزنە دونیایی و ئایینییەکانی وڵاتەکەی، ئەم کۆبوونەوەیە فراوانترین کۆبوونەوەبوو کە پاشای (ئینگلتەرا) بیبەستێت، نوێنەرەکانی پەرلەمانی نموونەیی بۆ (٤) کۆمەڵی جیاواز دابەشببوون، هەتا ئەوکاتەش پەرلەمانەکە تەنها ئەرکی ڕاوێژکاری دەبینی؛ نەک دەزگایەکی یاسادانان (تشریعی)[2]!

## لێکهەڵوەشانی دامودەزگا دەرەبەگییەکان و گەشەکردنی پەرلەمان

گرنگترین تایبەتمەندی لە مێژووی (ئینگلتەرا) لە ماوەی هەردوو سەدەی چواردە و پازدەدا بریتییە لە لێکهەڵوەشانی دامودەزگا دەرەبەگییەکان و پەرەسەندنی پەرلەمان و گەشەکردنی بازرگانی و پیشەسازی و زیادبوونی چینی ناوەند (بۆرژوازی) وەک ئەنجامێکی ئەو بارودۆخە. (ئینگلتەرا) لە کاریگەرییە خراپەکانی جەنگی (سەدساڵە ١٣٣٧-١٤٥٣ ز) کە لەسەر خاکی (فەرەنسا) بەرپابوو ڕزگاریبوو، بەڵام شوێنەوارە ناڕاستەوخۆکانی جەنگ گەورەبوون! بەتایبەت بۆ پەرەسەندنی دامودەزگا ڕامیارییەکانن و سنووردارکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی، هەروەک چۆن

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٣١٤.

(٢) هـ. ا. ل. فشر: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٤٥.

جەنگی (سەدساڵە) کۆتایی بە دەسەڵاتی ڕەهای پاشایەتی لە (فەڕەنسا)دا هێنا، بە هەمان شێوە کۆتایی بەو دەسەڵاتە ڕەهایە لە (ئینگلتەرا)دا هێنا و گرنگی دامودەزگا دەستوورییەکانی بە شێوەیەکی گشتی و گەشەکردنی دەسەڵاتی پەرلەمان بە شێوەیەکی تایبەتی زیادیکرد[1].

لە سەردەمی (ئێدواردی دووەم ۱۳۰۷-۱۳۲۷ ز) پەرلەمان چەندەها هەنگاوی گرنگی لە ڕێگای دەسەڵات و سەرکردایەتیکردنداناا، بەڵام (ئێدوارد) لە بەرامبەر (سکۆتلەندییەکان)دا تێکشکا و هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە (سکۆتلەندا) سەربەخۆی خۆی بەدەستهێنا، ئەمەش هێندەی دیکە هەڵوێستی لەبەردەم پەرلەماندا لاوازکرد و لە ساڵی (۱۳۱۱ ز)دا ناچاربوو ڕێوڕەسمێکی نوێ مۆربکات، بەپێی ئەو ڕێوڕەسمە پەرلەمان سەرپەرشتی دامەزراندنی تاکەکان دەکات بۆ وەرگرتنی پۆستە مەزنەکان لە وڵاتدا، بەڵام کاتێک (ئێدواردی دووەم) ویستی پاشەکشەبکات لەو ڕێوڕەسمە؛ بە هاوکاری نێوان هاوسەرەکەی و خانەدانەکان بووە هۆی لەکارخستن و لەسێدارەدانی[2].

لە سەردەمی (ئێدواردی سێیەم ۱۳۲۷-۱۳۷۷ ز) سەرکەوتنەکانی پەرلەمان ئاشکراتر دەرکەوت. (ئێدواردی سێیەم) بە زیرەکی و ئازایەتی و حەزکردن بە فراوانخوازی ناسرابوو، هەربۆیە بەسەر (سکۆتلەندی و وێڵزییەکان)دا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و خستنییەوە سەر (ئینگلتەرا). هەروەها هەستا بە هێرشکردنەسەر (فەڕەنسا) بە بیانووی ئەوەی لە تەختی (فەڕەنسی) مافی هەیە، ئەمە سەرەتا و هۆکاری ئەو جەنگەبوو کە لەنێوان (ئینگلتەرا و فەڕەنسا) ڕوویدا و لە مێژوودا بە جەنگی (سەدساڵە ۱۳۳۷-۱٤٥۳ ز) ناسراوە. سوپای (ئینگلیزی) توانایەکی باشی هەبوو و توانی چەندین سەرکەوتنی گرنگ بەسەر (فەڕەنسا) بەدەستبهێنێت، تەنانەت لە یەکێک لە شەڕەکاندا پاشای (فەڕەنسا) بەدیلگیرا و چەند ساڵێک بە دیلی مایەوە! جەنگە بەردەوامەکانی (ئێدواردی سێیەم) پێویستی بە پارە و سامانێکی زۆر هەبوو، پەرلەمانیش ئامادەیی دەربڕی بۆ دانانی باجی نوێ لە بەرامبەر وازهێنانی پاپا لە کۆمەڵێک ماف و دەستکەوتی خۆی؛ کە ئەمەش هەمووی لەسەر

---

(۱) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج۱/ ص۱٥۰.

(۲) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج۱/ ص۱٥۱.

هـەژماری دەسـەڵاتی پاشـایەتی بـوو، لە کۆتاییەکـانی فەرمـانڕەوایەتی (ئێـدواردی سێیەم) بە شێوەیەکی کرداری پاشا مافی سەپاندنی باجەکانیشی لەدەستدا[1]!

هەر لە سـەردەمی (ئێـدواردی سـێیەم) پێکهـاتەی پەرلەمـانی (ئینگلیـزی) بە ئەنجـوومەنە بـاڵاکەیەوە (لـۆردات) و ئەنجـوومەنی گشـتی لە سـەدەی چـواردەدا خەملێندرا، ئەنجوومەنی (لۆردات) خـانەدانە مەزنـەکانی لەخۆگرتبوو کە لە بنەڕەتدا ئەنجـوومەنی شـاهانەی مـەزنیان پێکـدەهێنا، خـانەدانە مەزنـەکان لە کۆمەڵگـای ئینگلیزیـدا هەرگیـز کـۆمەڵێکی گەورەیـان پێکنەدەهێنـا وەک تێکـڕای هەرێـمە جیاوازەکانی ئەورووپا! هەر هەرێمێک بەتەنها کوڕە گەورەکەی دەبووە میراتگری. هاوکـات لەگەڵ خـانەدانە مەزنـەکان لە ئەنجوومەنی بـاڵادا کۆمەڵێک لە ئەسـقەف و سـەرۆک دێرەکـان ئامـادەدەبوون کە هەموویـان ئینتیمایـان بـۆ چینـی خانەدانەکـان هەبوو، ئەم دوو کۆمەڵەیە بە (لۆرداتی دونیایی) و (لۆرداتی ڕەوانی) دەناسرانەوە. لە خاوەنـداری زەوی و لە خـانەدانە بچووکەکـان و بـۆرژواز و نـوێنەری شـارەکان پێکهـاتبوون، ئەم دوو تـوێژە (خـاوەنزەوی و بورژوازەکـان) لە بەرهەمهێنـان و بازرگانیکردنـدا بەرژەوەنـدی هاوبەشـیان هەبـوو، ئەنجـوومەنەکە لە سـەرەتادا دەزگایەکی یاسادانان نەبوو، دەستپێشخەرییە ڕامیارییەکان بەدەست ئەنجوومەنی لـۆرداتەوە بـوو، بەڵام ئەنجـوومەنی گشـتی لە گەشـەکردندابوو، لەبەرئەوەی بۆرژوازەکـان لە هەمـوو خەڵکـانی دیکـە زیـاتر خـاوەن پـارەوپوول بـوون، لەو ڕێـگەیەوە هەمیشـە هەوڵـی جێگیرکردنـی بـوونی خۆیـان دەدا، ئەویـش بە ڕەزامەندبوون یاخود نەبوونیان لەسـەر سەپاندنی بـاجی نوێ. پاشـاکانی (ئینگلیز) وەک ئامڕازێـک دەیـانڕوانییە پەرلەمـان بـۆ بەدەسـتهێنانی پـارەوپوول. پەرلەمـانیش بەتـایبەتی ئەنجـوومەنی گشـتی دەرکی بەوەکردبـوو کە پاشـا پێویسـتییەکی زۆری بە پارە هەیە، ئەمەش ناچاری دەکات دەسبەرداربوونێکی نوێی بکات، ئەم پێویستییەش لەپاش جەنگی (سەدساڵە) ڕوویلەزیادبوون کرد[2].

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەرلەمان زیاتر دەسوەردانی لە کاروباری پاشایەتی دەکرد، لە سـاڵی (١٣٤٠ ز) لە سـەردەمی (ئێـدواردی سـێیەم) پەرلەمـان پاشـای ناچـارکرد کە بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان نابێت هەستێت بە کۆکردنەوەی هیچ باجێک! هەروەهـا لە

---

(١) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص١٥١.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢١٧.

ـسالی (١٣٤٣ ز)دا پاشا بەڵێنیدا کە هیچ گۆڕانکارییەک لە باجی سەر بازرگانی ـحرەکـی ناکـات؛ بەبـێ ڕەزامەنـدبوونی پێشـوەختی پەرلەمـان، بەمشـێوەیە ـرۆژلەدوایرۆژ پاشا مافەکانی لەدەستدەدا و دەسەڵاتی کەمتر دەبووەوە[١].

(ڕیچاردی دووەم ١٣٧٧–١٣٩٩ ز) هەوڵیدا ئەو دەسەڵاتەی کە پاشاکانی پێشوو ـەدەستیاندابوو بیگەڕێنێتەوە و سنوورێک بۆ دەسەڵاتی پەرلەمان دابنێت، ئەوەبوو هێزێکی سەربازی تایبەتی دروستکرد بۆ بەهێزکردنی خۆی لە بەرامبەر پەرلەماندا، ئەم ڕامیارییە دوژمنکارییەی پاشا بووە هۆی بەرپابوونی شۆڕشێکی مەزن لە دژی و ئەوە بوو لە سالّی (١٣٩٩ز)دا شۆڕشگێڕان توانیان سەرکەوتن بەدەستبهێنن و ڕیچاردیـان لە تەختـی فەرمـانڕەوایەتی هێنـایەخوارەوە. پەرلەمـان هەسـتا بە هەڵبژاردنـی (هێنـری) لە بنەماڵەی (لانکسـتر) بـۆ سـەرتەختی (ئینگلیـز) و بە نـاوی (هێنـری چـوارەم ١٣٩٩– ١٤١٣ز) فەرمانڕەوایەتییەکـەی دەسـتپێکرد، ئەم پەرەسەندنەش دیاردەیەکبوو لە دیاردەکانی زیادبوونی دەسەڵاتی پەرلەمان، ئەمە یەکەمجـاربوو کە پەرلەمـان دەسـبخاتە کاروبـارێکی گرنگـی وەک دیـاریکردنی چارەنووسی فەرمانڕەوایەتی و هەڵبژاردنی فەرمانڕەواوە[٢].

لە سەردەمی پاشاکانی بنەماڵەی (لانکستر)؛ واتە (هێنری چوارەم ١٣٩٩-١٤١٣ ز) و (هێنری پێنجەم ١٤١٣-١٤٢٢ ز) و (هێنری شەشەم ١٤٢٢–١٤٦١ ز) دەسەڵاتی پەرلەمـان لە زیـادبوون و فراوانـدابوو، (هێنـری چـوارەم) ڕووبەڕووی کۆمەڵێـک مەیدانخوازی زۆر بـووەوە و لە هەمـوو لایەکەوە بە دوژمـن گەمـارۆدرابوو، بـۆیە بەردەوام داوای کـۆمەکی لە پەرلەمـان دەکـرد، بەڵام کـوڕەکەی (هێنـری پێـنجەم) کەسێکی توندوتیژبوو، جارێکی دیکە لەگەڵ (فەڕەنسا)دا جەنگی هەڵگیرساندەوە و لە ئابی (١٤١٥ ز) توانی (فەڕەنسا) داگیر بکات؛ ئەوەش پاش ئـەو سـەرکەوتنەی کە لە شەڕی (ئەگنگوورت) سەرکەوتنی بەدەستهێنا، پاش (٥) سـاڵ لـەم ڕووداوە؛ واتـە لە (١٤٢٠ ز) پەیماننامەی ئاشتیان بەسەردا سەپاندن[٣].

(هێنـری پێـنجەم) لە (٣٥) سـاڵیدابوو کاتێـک کە کـۆچی دوایـی کـرد، کـوڕەکەی (هێنری شەشـەم) شـوێنیگرتەوە کە تەنهـا (٩) مانـگ بـوو! بـۆیە لەژێـر سـەرپەرشـتی

---

(١) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى, ج١/ ص١٥٣.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤٧٢.

(٣) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص ١٥٣-١٥٤.

دانـرا، خانەدانەکـان ئەم بارودۆخەیـان قۆسـتەوە، بارودۆخەکـەیان تێکـدا و دژ بە یەکـدی جەنگــان، بەمەش ئاسایشــی وڵات تێکچــوو، دز و تــاڵانچی لە هەمـــوو ناوچەکـانی وڵاتـدا بڵاوبـوونەوە و دەسـەڵاتی پاشـایەتیش لە زۆربەی ناوچەکـانی وڵاتدا دووچاری هەرەسهێنان بووەوە[1].

لەم بـارودۆخە نـاهەموارەدا کە (ئینگلـتەرا) پێیـدا تێـدەپەڕی؛ (جـان دارک) لە (فەڕەنسا) دەرکەوت و شکست و نەهـامەتی زۆری بەسـەر سوپای ئینگلیزیدا هێنا، بەمەش بارودۆخی (ئینگلیـز) هێنـدەی دیکە خراپبوو، لە سـاڵی (١٤٣٧ ز)دا (هێنـری شەشـــەم) پێگەیشـــت و دەســـەڵاتی وڵاتـــی گرتەدەســـت، بەڵام زۆر لاوازبـــوو و تایبەتمەنـدییە بەهێزەکـانی پاشـای تێدانەبوو، (هێنـری)؛ (مـارگرێتی میـری ئەنگـوا)ی خواسـت، کە بە پـێچەوانەی مێـردەکەیەوە زیـرەک و لێهـاتوو و لە هەمــان کاتــدا تونـدوتیژ بـوو، خـاوەن کەسـایەتییەکی لێهـاتوو بـوو، ئەم تایبەتمەنـدیانەش وای لە زۆربەی خانەدانەکـان کـرد کە بەردەوام خەریکـی پـیلان و شۆڕشـکردن بـن دژ بە دەسەڵاتی شاهانە[2].

لە سـاڵی (١٤٥٣ ز)دا (پاشـا هێنـری) ژیـری خـۆی لەدەسـتدا و (ڕیچـارد کۆنتی یۆرک) کوڕێکی خۆی لە شوێنی پاشا دانا. (ڕیچـارد) کەسێکی شایسـتە و بەتوانـا و خۆشەویسـت بـوو، بەهیوابـوو لەپـاش (هێنـری شەشـەم) تەختـی پاشـایەتی بگـرێتە دەسـت، چـونکە پاشـا میراتگـری نەبـوو، بەڵام لـە بەرامبـەردا (مارگرێـت) کـوڕێکی هەبوو، هاوکات بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو (پاشـا هێنـری) ژیـری بـۆ گەڕایەوە، (مارگرێت) هەوڵیدا (ڕیچـارد) لەناوببات بۆ ئەوەی تەختـی پاشـایەتی بـۆ کـوڕەکەی بێـت، لەمکارەشیدا سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا و دووریخسـتەوە، لەبەرئەوە (ڕیچـارد) جەنگـی لە دژی بنەمــاڵەی (لانکسـتر) ڕاگەیانـد و بانگەشــەی ئەوەی کـرد کە ئەو بنەمــاڵەیە شایســتەی فەرمــانڕەوایەتیکردن نــین؛ چـــونکە وڵات بەدەســتیانەوە دەناڵێنێت[3]!

جەنگـی نێـوان هەردوو بنەمـاڵەی (یـۆرک و لانکسـتر) بە جەنگـی (دوو گـوڵ) ناسـراوە؛ لەبەرئەوەی دروشـمی بنەمـاڵەی (لانکسـتر) گـوڵێکی سـپی بـوو، دروشـمی

---

(١) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٥٤.

(٢) هـ. ا. ل. فشر: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٤٥.

(٣) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤٧٦.

بنەماڵەی یۆرکیش گوڵێکی سوور بوو، ململانێی نێوانیان زۆر توندوتیژ بوو، تێکڕای ـانیشتووانی (ئینگلیز) چاودێری جەنگەکەیان دەکرد، بە هۆی ئەم جەنگەوە هەندێک ـە خانەدانەکان لەناوچوون و هەندێکیشیان بەرەی جەنگیان دەگواستەوە، بۆیە ئەم جەنگە بووە هۆی کەمبوونەوەی ئەندامانی چینی خانەدانەکان و کەمبوونەوەی پێگەیان. لە کۆتاییدا و لە ئازاری (١٤٦١ ز) لەنزیک (یۆرک) جەنگێکی خوێناوی لەنێوان ئەم دوو کۆمەڵەیەدا ڕوویدا، ئەنجامەکەش بە سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی بنەماڵەی (یۆرک) کۆتایی پێ هات و بە هەزارەها ئەندامی بنەماڵەی (لانکستر) کوژران و ئەوەشی دەربازبوو لە دواتردا لەسێدارەدران. لەپاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە (ئێدواردی کوڕە گەورەی یۆرک) بەرەو (لەندەن) پێشڕەویکرد؛ بۆ ئەوەی تاجی پاشایەتی لەسەربنێت و بە ناوی (ئێدواردی چوارەم) فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی (یۆرک) دەستی پێ کرد کە (٢٤) ساڵی خایاند[١].

## ئێدواردی چوارەم (١٤٦١–١٤٨٣ز)

(ئێدواردی چوارەم ١٤٦١–١٤٨٣ ز) یەکەم پاشای بنەماڵەی (یورک) بوو؛ زۆر زیرەک و بەتوانا و خۆشەویستبوو لای خەڵک، پاشا گرنگی بە فەرمانڕەوایی نەدەدا کە خۆی لە سەرووی هەڕەمەکەیەوە بوو، لە بەرامبەردا زیاتر گرنگی دەدا بە مەیخواردنەوە و بگرە زیادەڕەویشی تێدا دەکرد، بەڵام لە ساڵانی کۆتایی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا؛ هەتا ئەندازەیەکی زۆر ئاسایش و هێمنی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو. لە ساڵی (١٤٨٣ ز)دا (ئێدواردی چوارەم) لەناکاو کۆچی دوایی کرد؛ کوڕەکەی کە (ئێدواردی پێنجەم) بوو و تەمەنی تەنها (١٢) ساڵ بوو شوێنیگرتەوە[٢].

(ڕیچارد)ی مامی پاشا ڕایگەیاند دەبێتە جێگری پاشا (ئێدواردی پێنجەم) و برا بچووکەکەشی لەژێر سایەی خۆیدا دەپارێزێت، دواتر ڕایگەیاند کە ئەو دوو برایە یاسایی نین و ئەوەبوو خۆی بە ناوی (ڕیچاردی سێیەم)ەوە بوو بە پاشای (ئینگلتەرا) و (ئێدواردی پێنجەم) و برا بچووکەکەی لە قەڵای (لەندەن)دا کوشت! ئەم

---

(١) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص١٥٥.

(٢) عبدالأمير محمدامين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى ج١/ ص ١٥٥-١٥٦.

ڕووداوه سەرلەنوێ ململانێی نێوان بنەماڵەی (لانکستر و یورک)ی زیندووکردەوه؛ چونکه زۆر له لایەنگرانی بنەماڵەی (یورک) بۆ ئەوەی تۆڵه له (ڕیچاردی سێیەم) بکەنەوه چوونەپاڵ بنەماڵەی (لانکستر) و یەکێک له نزیکەکانی بنەماڵەی (لانکستر) که (هێنری سیۆدۆر) بوو سەرکردایەتی کۆمەڵی (لانکستر)ی کرد، (هێنری سیۆدۆر) پێگەی خۆی به خواستنی (ئەلیزابێس)ی کچی (ئیدواردی چوارەم) له بنەماڵەی (یورک) بەهێزتر کرد. له ئابی ساڵی (١٤٨٥ ز) جەنگی (بۆسۆرن) لەنێوان سوپای (ڕیچاردی سێیەم و هێنری سیۆدۆر)دا ڕوویدا، جەنگەکه به تێکشکانی (ڕیچارد) و کوژرانی کۆتایی پێ هات. دوای ئەم سەرکەوتنه مەزنه؛ (هێنری سیۆدۆر) دەسەڵاتی پاشایەتی به ناوی (هێنری حەوتەم) گرتەدەست. له هەندێک ماوەی جەنگی ناوخۆدا پەرلەمان ڕۆڵی لاوازدەبوو؛ بەڵام هێز و هەژموونی به شێوەیەک مایەوه که توانی ناهەمواریيەکانی جەنگی ناوخۆ تێبپەڕێنێت و تەنانەت چەوسێنەرەوەی بنەماڵەی سیۆدۆریشی به هەمان شێوه تێپەڕاند[١].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص١٧٤.

# بەشی سیازدەیەم

-ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز

-ئەڵمانیا پاش ڕێککەوتنامەی فردان (٨٤٣-٩١٩ ز)

-ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی سەکسۆنی (٩١٩-١٠٢٤ ز)

-هێنری یەکەم - هێنری فاولر (٩١٩-٩٣٦ ز)

-ئۆتۆی یەکەم —مەزن- (٩٣٦-٩٧٣ ز)

-ڕامیاری دەرەوەی ئۆتۆی مەزن

-دەسوەردان لە کاروباری ئیتاڵیا

-جێگرەوەکانی ئۆتۆی مەزن

-ئۆتۆی دووەم (٩٧٣-٩٨٣ ز)

-ئۆتۆی سێیەم (٩٨٣-١٠٠٢ ز)

-هێنری دووەم (١٠٠٢-١٠٢٣ ز)

## ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی پیرۆز

ساڵی (٤٧٦ ز) کۆتایی بە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی خۆرئاوا هات، ئەمە لە کاتێکدا ڕوویدا کە (ئەدواکر)ی ئیمپڕاتۆر (ڕۆمیلیۆس)؛ (ئۆگستسی لاواز)ی لابرد و بلێسەی دەسەلاتی ئیمپڕاتۆری بۆ (قوستەنتینییە) گواستەوە، ئەمەش وەک ئاماژەیەک بۆ دانپێدانان بە ئیمپڕاتۆرییەت لەوێدا. سروشتی دانپێدانانەکە هەرچۆنێک بووبێت؛ ئەوەی دەسەلماند کە (بیری ئیمپڕاتۆری) بە هەناوی کۆمەڵگاکانی ئەورووپادا تەواو ڕۆچووبوو. لە لایەنی کردارییەوە ئیمپڕاتۆری (بیزەنتی) هیچ دەسەلاتێک؛ یاخود هەژموونێکی بەسەر (ئیتاڵیا) و هیچ بەشێکی ژێردەستی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی دێرین) لە خۆرئاوادا نەبوو، بۆیە زۆر لە ئیمپڕاتۆرە خۆرهەلاتییەکان هەوڵی زیندووکردنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی دێرینیان دەدا، هەروەها دەیانویست ئەزموونی خۆیان بەسەر (ئیتاڵیا) و هەرێمە خۆرئاواییەکان بسەپێنن. (جەستینیان) لە سەدەی شەشەمی زایینییدا، هەولی جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی لەمشێوەیەیدا، ئەوەبوو چەند هەڵمەتێکی بەرەو (ئیتاڵیا و باکووری ئەفریقا) ئەنجامدا[1].

هەرچەندە هاوسەردەمەکانی (جەستنیان) پێیانوابوو کە لەم هەولانەیدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، بەلام ئەو بنەمایانەی کە (جەستنیان) ئیمپڕاتۆرییەتە نوێیەکەی لە خۆرئاوادا لەسەر بنیاتنابوو؛ زۆر لاواز بوو، بۆیە لە دوای نەمانی خۆی لێکهەڵوەشا و (لۆمباردییەکان) دەستیانبەسەر (ئیتاڵیا)دا گرت، هەروەها عەرەبە موسڵمانەکانیش دەستیانبەسەر باکووری ئەفریقادا گرت. ڕۆژدوایڕۆژ جیاوازی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا لە زیادبووندابوو. دەرکەوتنی بزووتنەوەی (ئەللایقونییە) لە بەشی خۆرهەلات و پشتیوانیکردنی لە لایەن ئیمپڕاتۆر (لیو ئایسۆری)؛ زیاتر بووە هۆی دوورخستنەوەی خۆرهەلات و خۆرئاوا لە یەکدی[2]. پاپاکان بەتوندی دژی ئەم بزووتنەوەیە وەستان و کردیانە بیانوویەک بۆ ڕزگاربوون لە هەژموونی ئیمپڕاتۆرە خۆرهەلاتییەکان لە (ئیتاڵیا)دا، تەنانەت (پاپا

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی، ج١/ ص١٩١.

(٢) ل. م. هارتمان. و. ج. بارکلاف: الدولة والامبراطوریة في العصور الوسطی، ت: جوزیف نسیم، ١٩٧٠، ص١٨٣.

گریگۆری دووەم ٧١٥-٧٣١ ز) بڕیاری بێبەشکردنی بۆ ئیمپڕاتۆری (لیو ئایسۆری دەرکرد. ئیمپراتۆر بەرامبەر ئەم بڕیارە ڕاوەستا و دەستیبەسەر هەموو موڵکەکانی پاپا لە (سەقلیە و باشووری ئیتاڵیا)دا گرت. بەمشێوەیە ڕق و دوژمنایەتی؛ بنچینەی پەیوەندی نێوان مەسیحییەتی خۆرهەلات و خۆرئاوا بوو. سەرباری ئەوەی لە خۆرئاوا ئیمپراتۆرێکی دانپێدانراو نەبوو؛ بەڵام بیری ئیمپڕاتۆری هەر بە زیندوویی مابووەوە. لەگەڵ دامەزراندنی شانشینی (فەرەنگ) لە ئەورووپادا؛ پاپا پشتیوانییەکی تەواوی لەم شانشینە کرد. شارلەمانیش وەک بەهێزترین فەرمانڕەوای ئەم شانشینە توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر زۆرینەی بەشەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیدا بسەپێنێت[١].

(شارلەمان) لە هەموو بارێکدا هەوڵی سەرخستنی کاروبارەکانی کڵێسای دەدا: وەک: دوورخستنەوەی مەترسی (لۆمباردییەکان) لەسەر پاپا، جەنگەکانی لەگەڵ (موسڵمانەکان و بیزەنتییەکان)دا، هەروەها بەشێک لە موڵکەکانی ئەوانی بە پاپا بەخشی، ئەمە کاتێک کە (پاپا لیوی سێیەم ٧٩٥-٨١٦ ز) تووشی ئازاردان و دژایەتیکردن هات لە لایەن دوژمنەکانییەوە، (شارلەمان) بە هەموو هێزێکەوە پشتیگرت، ئەمەش وەک داننانێک بە کارە گرنگەکانی (شارلەمان) و سەرخستنی بیری ئیمپڕاتۆری کە بە زیندوویی مابووەوە. لە ساڵی (٨٠٠ ز) لە (ڕۆما) و لە میانەی ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونەوە؛ پاپا تاجی ئیمپڕاتۆری کردەسەر (شارلەمان)، بەمشێوەیە خەونی زیندووکردنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی خۆرئاوا بەدیهات[٢].

هەندێک لە مێژوونووسان ئەمە بە سەرەتای دەرکەوتنی ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی پیرۆز) دەبینن و پێیانوایە؛ لە کاتی تاجلەسەرنانی (شارلەمان) دوو ئیمپڕاتۆرییەتی (مەسیحی) خۆرهەلات و خۆرئاوا لە هەمان کاتدا بوونیان هەبوو. بەڵام بەشێکی دیکە لە مێژوونووسان بۆچوونیان وایە کە لە یەک ئیمپڕاتۆرییەت زیاتر بوونی نەبووە؛ ئەویش ئیمپڕاتۆرییەتی (بێزەنتی) بوو لە خۆرهەڵات، هەروەها پێشیانوایە کە تاجلەسەرنانی (شارلەمان) بە مەبەستی دامەزراندنی ئیمپڕاتۆرییەتێکی دیکە

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٩١.

(٢) ل. م. هارثمان: الدولة والامبراطورية في العصور الوسطى، ص١٨٤.

ـەبووە، بەڵکوو هەڵبژاردنی ئیمپراتۆرێک بووە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆرییەتە ڕاوەستاوەکەدا (مەبەست لە ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتەیە)، چونکە لە بنەڕەتدا بوونی ـوو ئیمپراتۆرییەت لە یەک کاتدا، لەگەڵ بیری ئیمپراتۆرییەتێک کە لەسەر یەکێتی ـامەزراوە؛ نەگونجاوە[1]!

تاجلەسەرنانی (شارلەمان) لە لایەن پاپاوە؛ زیاتر پەیوەندی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئاڵۆزترکرد، ئیمپراتۆرەکانی خۆرهەڵات بە هیچ شێوەیەک دانیان بە ئیمپراتۆری خۆرئاوا و تەنانەت ڕۆماشدا نەدەنا! بەڵام ڕەوشی ڕامیاری و سەربازی ئیمپراتۆرییەتی خۆرهەڵات بواری ئەوەیان نەڕەخساند کە ئەم ناکۆکییە پەرەبسەنێت، بۆیە ئیمپراتۆری (بیزەنتی) لە ساڵی (٨١٢ ز)دا، ناچاربوو دان بە ئیمپراتۆرییەتەکەی (شارلەمان)دا بنێت، بەڵام بە مردنی (شارلەمان) و لاوازبوون و دابەشبوونی ئیمپراتۆرییەتیەکەی؛ وای لە ئیمپراتۆرە خۆرهەڵاتییەکان کرد کە دانپێدانانەکەی پێشوویان لەیادبکەن[2].

ڕێکەوتننامەی (فردان) لە ساڵی (٨٤٣ ز)دا بۆ دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەتی (شارلەمان) لەنێوان کوڕەکانیدا بەسترا. (ئیتاڵیا) و چەند بەشێکی دیکەی ئیمپراتۆرییەتەکە کەوتنە ژێردەستی (لۆسەر)ی کوڕە گەورەی (لویسی لەخوداترس) و توانی پارێزگاری لە نازناوە ئیمپراتۆرییەتییەکەی بکات. لە دوای مردنی (لۆسەر)؛ بەپێی دابونەریتی (فەرەنگییەکان) وڵاتەکەی لەنێوان کوڕ و نەوەکانیدا چەند جارێک دابەشکرا، بەمەش ئەو بەشەی کە دەکەوتە ژێردەسەڵاتی ئەو کەسەی کە نازناوی ئیمپراتۆرییەتی هەڵگرتبوو، لە کەمبوونەوەیەکی بەردەوامدابوو؛ هەتا لە کۆتاییدا بەشێکی بچووکی لەناو خاکی (ئیتاڵیا)دا لێمایەوە. سەرئەنجام ئەویش لە ساڵی (٩٢٤ ز)دا بە تەواوی لەناوچوو، بەڵام بیری ئیمپراتۆرییەتی پاش ماوەیەکی کەم و سەرلەنوێ بوژایەوە. ئەم جارەیان پاشاکانی (ئەڵمانیا) پاڵەوان و بوژێنەرەوەی بوون[3].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٢.

(٢) ل. م. هارتمان: الدولة والامبراطورية، ص١٨٥.

(٣) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الأوروبية، ص١٤٠.

## ئەڵمانیا پاش ڕێکەوتننامەی فردان (٨٤٣-٩١٩ ز)

(ئەڵمانیا) یاخود شانشینی (فەرەنگی خۆرهەلات)؛ بەشی (لویسی ئەڵمانی) بوو، کە دوای خۆی (٣) ئەندامی بنەماڵەکەی یەک لەدوای یەک فەرمانڕەوایەتیان تێداکرد دوا پاشایان (لویسی بچووک ٨٩٩-٩١١ ز) بوو کە بە مردنی کۆتایی بە دەسەلاتی بنەماڵەی (کارۆلنجی) لە (ئەڵمانیا)دا هات. فەرمانڕەوایی پاشاکانی کۆتایی دوو تایبەتمەندی جیگەرەوەیان هەبوو:

یەکەم/ زیادبوونی مەترسییەکانی خۆرهەلات، کە لە هێرشەکانی (سلاڤ و هەنگاری)دا بەرجەستە دەبوو.

دووەم/ زیادبوونی هەژموونی فەرمانڕەوایی دەرەبەگە (ئەڵمانییەکان) کە لەپاش کۆتایی هاتنی دەسەلاتی بنەماڵەی (کارۆلنجی) لە ساڵی (٩١١ ز)دا (ئەڵمانیا) لە (٤ هەرێمی مەزن پێکهاتبوون کە ئەوانیش: (سەکسۆنییەکان) لە باکووری خۆرهەلات (باڤاریا) لە باشوور، (سوابیا) لە لایەکانی (ڕایینی سەروو)، هەروەها (فرانکۆنیا) لە لایەنەکانی (ڕایینی ناوەڕاست). لەسەر بنەمای هەڵبژاردن؛ (کۆنراد ٩١١–٩١٨ ز) گەورەی (فرانکۆنی) بە پاشای (ئەڵمانیا) هەڵبژێردرا، بەلام ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی بە هۆی کورتییەکەیەوە گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. پاش مردنی (هێنری مەزنی سەکسۆنیا) بە پاشا هەڵبژێردرا و مێژووی (ئەڵمانیا)ی بە ئاڕاستەیەکی نوێ و ناوازەدا برد[1].

کشانی بەربەرییەکان لە باکوورەوە بۆ ناوەڕاستی ئەورووپا بوو، بە هۆی دابەزینێکی ڕێژەیی لە ژمارەی دانیشتووانی باکوور (ئەڵمانیا)، لە هەمان کاتدا هەندێک ڕەگەزی دیکە لە هەرێمی دەریای (بەلتیک)؛ ڕووەو باکوور کشان و شوێنی هۆزە بەربەرییەکانیان گرتەوە. بەمشێوەیە ڕووباری (ئالپ) بوو بە لەمپەر، وەک لەنێوان هۆزە تازەکۆچکردووەکان و گێتی خۆرئاوادا. لە ڕاستیدا هەتا ئەو سەردەمە شتێک نەبوو لە ئەورووپادا بە ناوی (دەوڵەتی ئەڵمانیا)، بەڵکوو تەنها هۆزەکانی (ئەڵمانی) هەبوون. دواتر کاتێک (شارلمان) دەستیبەسەر ئەم ناوچەیەدا گرت، هەمووی لە یەکێتییەکی یەکگرتوودا کۆکردنەوە و سیستمێکی بەرگری هاوبەشی بۆ دانان؛ لەپێناو پاراستنی لە مەترسییە دەرەکییەکان. هەڵوەشاندنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢١٤.

ڕومـــانی) لە ســـەردەمی جێنشـــینەکانیدا؛ ئەم یەکگرتـــووییەی هەڵوەشـــاندنەوە و ەرژەوەنـدی خێڵایەتـی وەک جـارانی لێهـاتەوە، هەروەهـا دژی هەمـوو هەولێکـی یەکبوون و یەکگرتنەوە بوون. لەگەڵ بەستنی پەیمانی (فردان) لە ساڵی (٨٤٣ ز)دا؛ لویسی دووەم) بوو بە پاشای ئەم هەرێمە کە پێی دەلێین ئەڵمانیا (٨٤٣ ز، ٨٧٦ ز)، هــەتـا دوای مردنـی (لوســەر) کە پاشــای (لورینییەکــان) بــوو لە ســاڵی (٨٩٦ ز)، پەیماننامەی (مرسن) لە ساڵی (٨٧٠ ز)دا بەسترا و هەندێک خاڵی دیکە بەر (لویسی دووەم) کەوت کە بەمشێوەیەبوو[1].

(ئەڵمانیا) ئەو ناوچانەی دەگرتنەوە کە دەکەوتنە نێوان هەردوو ڕووباری (ڕایین) و (ئالپ)، لەگەڵ هەندێک بەشی هەرێمی (لورین). دوای مردنی (لویسی دووەم) لـە ســـاڵی (٨٧١ ز)؛ دەوڵەتەکە بەســـــەر کوڕەکانیـــدا دابەشـــبوو، بە شـــێوەیەک کە پاشاگەردانی بۆ ماوەی (٦) ساڵ وڵاتی گرتەوە. دوای ئەم ماوەیە (ئـارنولف) کوڕی ناشــەرعی (کارولەمــانی کــوڕی لویســی دووەم ٨٧٧–٨٩٩ ز) بە پاشــای (ئەڵمانیــا) هەڵبژێردرا. (کارولەمان) توانی بەرپەرچی هێرشە دەرەکییەکـان بداتەوە و لـە سـاڵی (٨٩٦ ز) بـوو بە ئیمپڕاتـۆر. دوای خـۆی (لـویس)ی کـوڕی کە بە (لویسـی بچـووک) ناسراوە؛ شوێنی گرتەوە. وا دەردەکەوێت کە (لویس) کەسێکی بێهێز بووبێت، بۆیە نەیتوانی بەرپەچی هێرشی (مەجەڕییەکان) بداتەوە کە چەندین نـاوچەی ئەڵمانیایـان داگیرکـرد؛ وەک: (باڤاریـا ، سەکسـۆنیا و تورنجیـا). بەمشـێوەیە دەوڵەت نەیتـوانی پارێزگاری بکات؛ بۆیە هەر هەرێمێک ئەرکی پاداشت و پارێزگاری لـە خـۆی کەوتە ئەسـتۆی خـۆی. ئەم هەنگـاوەش بـووە هـۆی ئەوەی کە ویلایەتەکـان (هەرێمەکـان) لەژێــر فــەرمانڕەوایی و دەســـەڵاتی ناوەنـد جیـاببنەوە. بەمشـێوەیە لە (ئەڵمانیـا) دەرەبەگایەتی هاتەکایەوە. کاتێک (لویسی بچووک) کۆچی دوایی کرد لە ساڵی (٩١١ ز)؛ بە میراتگرتنــی دەســـەڵات (مــرش)ی لە (ئەڵمانیــا) هەڵوەشــێندرایەوە، چــونکە پیاومـاقوڵان و پیـاوانی ئـایینی (کـونرادی یەکەم ٩١١–٩١٨ ز)یـان بە پاشـای وڵات هەڵبژارد. لە ڕاستیدا (کونراد) وەک نـوێنەری فەرمانڕەوایی هەرێمـەکان بوو؛ نەک پاشای (ئەڵمانیا)! واتە هەر بەناو پاشا بوو[2]. بە هەر شێوەیەک بێت ئەوەی جێگای

---

(١) عبدالأمیر محمد امین و: تاریخ أوروبا في العصور الوسطی، ج١/ ص١٣٩.

(٢) نورالدین حاطوم: تاریخ العصور الوسیط في أوروبة، ج١/ ص٢٢٢.

سەرنجە ئەوەیە؛ (پراسیپی) هەڵبژاردنی پاشا شوێنی (پراسیپی) پشتاوپشت (بە میراتگرتنی دەسەڵات)ی گرتەوە، کە ئەویشیان بووەوە مایەی پاشاگەردانی و نائارامی! بۆیە دەتوانین بڵێین کە (ئەڵمانیا) سەرکەوتوو نەبوو لە بونیادنانی فەرمانڕەوایەتییەکی ناوەندی بەهێز لەم قۆناغەدا. بە هۆی بوونی مەترسییە دەرەکییەکانەوە؛ (کونراد) هەستی بەوە کرد کە (ئەڵمانیا) پێویستی بە کەسێکی بەهێز و بەتواناتر هەیە بۆ یەکگرتنەوە و کۆکردنەوەی دەوڵەت لەپێناو بەرپەچدانەوەی مەترسی، بۆیە لە کات و ساتی مردنیدا؛ (هێنری دۆقی سەکسۆنیا)ی کاندیدکرد بۆ ئەوەی ببێتە پاشای (ئەڵمانیا) کە بە بۆچوونی (کونراد) ئەو کەسایەتییەبوو کە دەتوانێت لە ئەستۆی بگرێت[1].

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ العصور الوسطی، ج١/ ص١٩٣.

## ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی سەکسۆنی (٩١٩–١٠٢٤ ز)

### هێنری یەکەم (هێنری فاولەر ٩١٩–٩٣٦ ز)

یەکەم پاشا لە بنەماڵەی (سەکسۆن) بوو کە فەرمانڕەوایەتی (ئەڵمانیا)ی کرد، خانەدانەکانی (ئەڵمانیا) لەسەر کاندیدکردنی ڕازی بوون و بە هاتنی (هێنری فاولەر) یاخود (ڕاوکەر) -چونکە زۆر حەزی لە ڕاوکردنی باڵندە بوو- سەردەمی فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی (سەکسۆنی) لە (ئەڵمانیا) دەستی پێ کرد کە نزیکەی سەدەیەکی خایاند. (هێنری یەکەم) بە شێوەیەک بناغەی بۆ ڕامیاری ناوخۆیی و دەرەکی (ئەڵمانیا) دارشت کە پاشاکانی پاش خۆیشی لەسەری دەڕۆیشتن. (هێنری یەکەم) لە بواری ڕامیاری ناوخۆدا؛ تواناکانی تەنها لە (سەکسۆنیا) بەهەدەردەدا و دەستینەدەخستە کاروباری ناوخۆی هەرێمەکانی دیکە، تەنها ئەوەی لێدەویستن کە دان بە دەسەڵاتەکەیدا بنێن. لەم بوارەدا پەیڕەوی ئەو بنەمایەی دەکرد کە دەڵێت: "خۆت بژی و واز لە ئەوانی تر بێنە با بژین"[١].

بەڵام لە بواری ڕامیاری دەرەکیدا؛ لەبەرئەوەی سنووری خۆرهەڵاتی (ئەڵمانیا) هەمیشە لەبەردەم مەترسی هێرشی (هەنگارییەکان)دا بوو، پاشاکانی پێش خۆشی لەبری وەستاندنی هێرشەکانیان؛ سەرانەیان پێ دەدان، بەڵام (هێنری یەکەم) بە هۆی ئەو سوپایەی کە پێکیهێنابوو لەگەڵ ئەو قەڵایانەی کە بنیاتینابوو، توانی لە بەرانبەر (هەنگارییەکان)دا ڕابوەستێت. لە ساڵی (٩٣٣ ز)دا کاتێک کە نێردراوی (هەنگارییەکان) هاتن بۆ وەرگرتنی سەرانە؛ (هێنری یەکەم) لاشەی سەگێکی تۆپیوی پێدان لەباتی سەرانە، ئەمەش وەک ڕاگەیاندنی جەنگ وابوو، بەمشێوەیە جەنگ هەڵگیرسا. سەرەتا (هەنگارییەکان) و دواتر (سلاڤییەکان) زۆر بەتوندی تێکشکان، تەنانەت بوونە ژێردەستەیەکی تەواوی (ئەڵمانەکان)، هەروەها لە ناوچەی (شلزفیک) دانیمارکییەکانیان تێکشکاندن و تووشی شکستێکی گەورەیان کردن. بەم شێوەیە ماوەی فەرمانڕەوایی (هێنری یەکەم) بە زنجیرەیەک سەرکەوتنی سەربازی کۆتاییهات. بەهەرحاڵ سەردەمی (هێنری) ڕێخۆشکەربوو بۆ جێنشینەکانی هەتا بتوانن دەوڵەتێکی جێگیر دابمەزرێنن، چونکە ڕامیاری (هێنری) لەسەر دوو شێوازی کۆمەڵگەیی ڕێچکەی بەستبوو:

یەکەم/ بەرپەچدانەوە و چارەسەرکردنی گیروگرفتە ناوخۆییەکان بوو.

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٤٢.

دووەم/ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییە دەرەکییەکان بوو.

سەبارەت بە یەکەمیان؛ هەڵبژاردنی (هێنری) وەک پاشای (ئەڵمانیا) جێگای ڕەزامەندی هەموو میرەکان نەبوو، هەرچەندە سەرەتای هەڵبژاردنی دەنگیان بۆدا. ئەمەش ڕەنگە بە هۆی ئەم دوو هۆکارەوە بووبێت:

١. بە هۆی ترسی میرەکان لە هێز و توانای (هێنری).

٢. بە هۆی ویستیان بۆ یەکبوونی پارچە جیاوازەکانی (ئەڵمانیا) لە دەوڵەتێکی یەکگرتوودا لە ترسی مەترسییە دەرەکییەکان[1].

میرەکان لە هەرێمەکاندا هەردەم لە هەوڵی ئەوەدابوون کە سەربەخۆیی هەرێمەکانیان بپارێزن، یاخود لە هەوڵی سەربەخۆبوونیاندا بوون، بۆیە هەردەم نائارامی و پەشێوی وڵاتی گرتبووەوە. هەڵبەتە مەترسی ناوخۆیی لە مەترسی دەرەکی ترسناکترە؛ هەر بۆیە (هێنری) ڕێگاچارەی یا ڕامیارییەکی نەرم و هاوکات توندوتیژیشی بەکارهێنا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتەدا. سەرکەوتووش بوو لەم ڕامیارییەی و توانی بنەماڵەکانی دەسەڵاتی تەختی ئەڵمانی) بەهێز بکات بۆ سەردەمی خۆی و بنەماڵەکەشی. سەبارەت بە باکوور و (سلاڤییەکان) لە خۆرهەڵات؛ مەترسی سەرەکییان خستبووە سەر سنوورەکانی (ئەڵمانیا)، بۆیە پێکهێنانی لەشکرێکی بەهێز و بەتوانا؛ ئەرکی سەرەکی (هێنری) بوو کە هەتا ڕادەیەکی زۆر لەم ئەرکەیدا سەرکەوتووبوو. توانی چەندین سەرکەوتن بەسەر لایەنە هێرشهێنەکانیدا بەدەستبهێنیت؛ بەتایبەت بەسەر (مەجەڕییەکان) لەنێوان سالانی (٩٣٣–٩٥٥ ز)، لەگەڵ ئەمانەشدا هێرشە سنوورییەکان کۆتایی پێ نەهات، بۆیە (هێنری) سیستمێکی نوێی دەسپێکرد کە بە (مارکیاتەکان) ناسرابوو، کە ئەویش بریتیبوو لە دانانی چەند پێگەیەکی بەهێز لەسەر سنوورەکان؛ بە شێوەیەک کە نزیکبوون لە یەکدی، هەروەها سەربازی مەشقپێکراوی تێدا دانابوون. هەرپێگەیەک چەند قەڵایەکی دارینی لێ دانابوون کە سەربازان دەچوونە نێویەوە و ئامادەبوون بۆ هەر هێرشێکی لەناکاو. بەمشێوەیە (هێنری) توانی هێڵێکی بەرگری دابمەزرێنێت لەنێوان (ئەڵمانیا) و دراوسێکانیدا[2].

---

(١) عبدالأمير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٤.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢١٦.

**ئۆتۆی یەکەم -مەزن- (٩٣٦-٩٧٣ ز)**

ئەگەر بنەماڵەی (سەکسۆن) بە مەزنترین بنەماڵەی فەرمانڕەوایی (ئەڵمانیا) لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دابنرێت؛ ئەوا (ئۆتۆی یەکەم) بە مەزنترین پاشای ئەو بنەماڵەیە دادەنرێت. (ئۆتۆ) وەکوو باوکی تەنها بەوەندە ڕازی نەبوو کە فەرمانڕەوای (ئەڵمانییەکان) هەر بەناو دان بە دەسەڵاتەکەیدا بنێن، بەتەنهاش گرنگی بە هەرێمی (سەکسۆنیا) نەدەدا، بەڵکوو ئەوەشی لە فەرمانڕەواکان دەویست کە بەتەواوی ملکەچی دەسەڵاتی پاشایەتی ببن. (ئۆتۆی یەکەم) زۆر بەتاسەوە هەوڵی بونیاتنانی ئەڵمانیایەکی بەهێز و یەکانگیری دەدا، دەتوانین بڵێین هەتا ئەندازەیەکی زۆر لەم هەوڵەیدا سەرکەوتووبوو. لێرەوە بەڕوونی گرنگی (ئۆتۆی یەکەم) لە مێژووی (ئەڵمانیا) دەردەکەوێت و نازناوی مەزنیشی بەسەردا دادەبڕێت[1].

(ئۆتۆی یەکەم) سالانی سەرەتای فەرمانڕەوایەتییەکەی؛ بۆ لێدانی فەرمانڕەوا یاخیبووەکان تەرخانکرد، پاشان دەستیکرد بە ڕێکخستنی کاروباری ولاتەکەی. (ئۆتۆ) لە ڕامیاری ناوخۆییدا ڕێکارێکی تایبەتی پیادەکرد؛ ئەویش پیادەکردنی ڕامیارییەک یان شێوازێکبوو بۆ ڕێخۆشکردن بەرەو هەنگاوی دووەمی ڕامیارییەکەی، واتە بە قۆناغوەرگرتن و ڕێکاری کارەکانی. دەبینین سەرەتا نازناوی بە میرەکان بەخشی؛ بەمشێوەیە توانی دارودەستەیەکی زۆر لە (بلان) کۆبکاتەوە، ئەوەش مایەی دڵخۆشی ئەو بوو کە لە تاجلەسەرنانەکەیدا ئامادەبن و پشتگیری بکەن کە لە شاری (ئەکسین لاشاپیل) لە ئاهەنگێکی تایبەت لە لایەن (هیلەبرت)ی سەرۆکی ئەسقەفیەکانی ئەم شارە (تتویج) کرا[2].

ئەم تایبەتییە بەردەوام نەبوو؛ چونکە میرەکان لە هێز و لێهاتوویی (ئۆتۆ) دەترسان، بۆیە دەستیانکرد بە دانانی پیلان و نانەوەی ناکۆکی لەنێوان (ئۆتۆ و هێنری) برای و بەوجۆرە توانیان (هێنری) هەڵبگەڕێننەوە، بەلام ئەم پیلانەی شکستپێهێنا و سزای (هێنری) برای نەدا، هەروەها سزای میرەکانیشی نەدا، چونکە دەبووە مایەی دووبەرەکی و هەوێنی ڕووداو و پیلانی خراپ لە دواڕۆژدا. لێرەوە پێویستبوو لەسەر (ئۆتۆ) کە دەسەلات و توانای میرەکان پەکبخات، بۆ ئەم

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٨٦.

(٢) عبدالأمير محمد امين و: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٤.

مەبەستەش ڕێگایەکی تایبەتی گرتەبەر و شێوازێکی توندوتیژی بەکارنەهێنا، بەڵکوو شێوازێکی دیکەی گرتەبەر، ئەویش دامەزراندنێکی چەند دۆقیاتکی دیکە بوو، ئەوە بوو بنیاتیشیاننا و بەو کەسانەی بەخشی کە خزم و دۆستی نزیکی خۆی بوون، ئەم دۆقە نوێیانە بوون بە زۆرینە. دۆقیاتە یاخی یا ناڕازییەکان لە بەرامبەردا بوونە کەمینە، بەمشێوەیە توانی باری ناوخۆ یەکبخاتەوە[١].

هەروەها پتەوکردنی دەوڵەت و کەنیسە؛ ئەویش بە ڕاکێشانی ئەسقەفییەکان و قەشەکانی (ئەڵمانی) بەلای خۆیدا. بەمشێوەیە توانی سیستەمێکی فەرمانڕەوایی تێکەڵاو پێکەوە بنێت؛ کە لە پیاوانی ئایینی پێکهاتبوو، هەروەها لە ڕێگای کەنیسەوە توانی زیاتر وڵاتەکەی بخاتە ژێردەستییەوە. بەمشێوەیە توانی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی لەناوبەرێت و ئەڵمانیایەکی بەهێز و یەکگرتوو بنیادبنێت. (ئۆتۆی مەزن) ڕامیارییەکی تایبەتی بەرامبەر بە ئەسقەفەکان بەکارهێنا. لە لایەک بە هەموو شێوەیەک پشتیدەگرتن و هاوکاری دەکردن؛ لە لایەکی دیکەوە هەوڵیدەدا دەسەڵاتی پاشایەتییان بەسەردا بسەپێنێت، هەروەها زەوی و دەسکەوتێکی زۆری بە سەرۆکی ئەسقەفەکان دەبەخشی و لە هەندێک باریشدا دەسەڵاتی دادوەری پێدەبەخشین. لە ئەنجامی ئەم ڕامیارییەدا؛ ئەسقەفەکان لە ماوەی سەدەی دەیەمدا بوونە خزمەتکارێکی بێوێنە بۆ پاشا، هەر ئەوانیش لە کۆشکدا ئامادەدەبوون و زەوییەکانی شاهانەیان بەڕێوەدەبرد و لە کاتی گەشتەکانیدا شوێنی مانەوەیان بۆ دەڕەخساند و ڕۆڵی نێردراو و نوێنەرایەتییان لەگەڵ دەرەوەشدا بۆ دەبینی[٢].

## ڕامیاری دەرەوەی ئۆتۆی مەزن

سەبارەت بە ڕامیاری دەرەکی؛ (ئۆتۆ) سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لە ساڵی (٩٥٥ ز)دا هێرشی کردەسەر (ماجیار) و سەرکەوت بەسەریاندا، پیاوە ئایینییەکانیش توانیان هەندێکیان بێننە سەر ئایینی (مەسیحی)، لەوانە: پاشاکەیان بوو بە مەسیحی و بە (قەدیس ستیڤن) ناسرا، کە نزیکەی هەزار باجیاریشی لەگەڵدا بوون و ئەسقەفییەی جراننیان دامەزراند، هەروەها (ئۆتۆ) توانی پاشاکانی (دانیمارک و

---

(١) محمود سعيد عمران: أوروبا العصور الوسطى، ص٢٢٠.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٢٣.

ـوقـــی پۆڵـــەنـــدا و دۆقـــی بۆهیمیـــا) ناچاربکـــات دانیپێـــدابنێن وەک گەورەی
ـەرەبەگەکان[1].

ســاڵی (٩٥١ ز) ئۆتـۆ چـووە نـاو (ئیتاڵیـا) و وەک هەنگـاوێکی ڕامیارییەکـەی ئەولدری) خواست و بوو بە هاوسەری دووەمی، چونکە پێشتریش ژنێکی هەبوو بە ناوی (ئەدیس) کە ئینگلیز بوو. لە هەنگاوی دووەمدا لەگەڵ (لبرنگار) ڕێکەوت؛ هـەتـا لەسـەر میرنشـینییەکەی خـۆی بمێنێـت، بە مەرجێک پابەنـدی دەرەبەگایـەتی ئۆتۆ) بێت، بەڵام ئاڕاستەکان پێچەوانەی ویستەکانی (ئۆتۆ) دەرکەوتن، ئەوەش لە ئەنجامی ئەم هۆکارانە:

یەکەم/ میرەکانی (ئیتاڵیا) دژی ڕاسپاردەکەی (ئۆتۆ) وەستان و بەرەنگارییان کرد و دانیان بە (ئۆتۆ)دا نەنا.

دووەم/ لە هەمـان کاتـدا جـووڵانەوەیەکی یـاخیگەرانە لە (ئەڵمانیـا) دژی (ئۆتـۆ) ڕوویدا بە سەرکردایەتی (لۆدلف)ی کوڕی کە دۆقی (سوابیا) بوو؛ لەگەڵ زاواکەی کە ناوی (کونرادی سوور) بوو[2].

لێرەدا (ئۆتۆ) کەوتە نێوان دوو هەڵبژاردن؛ یان دەبـووایە نازنـاوی ئیمپڕاتۆر و تـاجی ئیمپڕاتـۆری هەڵبژێرێت و (ئەڵمانیـا) لەدەسـتبدات، یـاخود دەبـووایە نازنـاو و تاجی ئیمپڕاتۆری بە شێوەیەکی کاتی بەلاوەبنێت و بگەڕێتەوە ئەڵمانیا و بیخـاتەوە ژێردەسـەڵاتی خـۆی. (ئۆتـۆ) ڕێگەی دووەمیـانی هەڵبـژارد و گەڕایەوە (ئەڵمانیا) بـۆ بەرەنگـاربوونەوەی یـاخیبووا، کاتێـک سـەرقاڵبوون بە هاوکـاری (مەجەڕییەکـان) هێرش بکەنەسەر (ئەڵمانیا)[3].

(ئۆتـۆ) تـوانی یـاخیبوونی نـاوخۆیی دابمـرکێنێتەوە و (لـودلفی) سـزانەدا و لێـی بـووری؛ وەک چـۆن پێشـتریش لە (هێنـری) بـرای بووریبـوو. پاشـان ڕوویکـردە مەترسییە دەرەکییەکان و بەو مەبەستەش هێزەکانی کۆکردەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی (مەجەڕییەکان) و توانی سەرکەوتێکی گەورەیان بەسەردا تۆماربکات لە ساڵی (٩٥٥ ز). بەمشێوەیە (ئۆتۆ) دەرفەتی یەکخستنەوەی وڵاتەکەی بۆ ڕەخسا و (ئەڵمانیا) بوو بە بەهێزترین دەوڵەتی ئەورووپی. (ئۆتۆ) دەرەفەتێکی دیکەی بۆ ڕەخسا بۆ ئەوەی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٢١٩.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٨٨.

(٣) محمد الأمير محمد امين و: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٧.

تاجی ئیمپراتۆری وەربگرێت، ئەوەش لە ساڵی (٩٦١ ز) بوو کە (پاپا یوحەننای دووەم) بانگێشتیکرد بۆ پشتگیریکردنی دژی بەرەنگاربوونەوەیان. ئەم بانگێشتە تەواو جیاوازبوو لەگەڵ بانگێشتی یەکەم؛ چونکە ئەمجارەیان پاپا بانگێشتیکردەوە و ئەمەش پشتگیرییەکی بەهێزبوو بۆ (ئۆتۆ). دواتر هێرشی کردەسەر (ئیتاڵیا) لە ساڵی (٩٦٢ ز)دا بۆ گەڕاندنەوەی (مومتەلەکات)ی پاپا و پارێزگاریلێکردنی، لە پاداشتدا پاپا تاجی ئیمپراتۆرییەتی بەخشییە (ئۆتۆ)، بەڵام پەیمانی گەڕاندنەوەی سەروماڵی پاپای بەجێنەهێنا، بۆیە پاپا نیگەران و پەشیمانبوو لە (تتویج) کردنی (ئۆتۆ). پاپا بە پەردە؛ سکاڵای ئەوەی لە (ئۆتۆ) دەکرد کە پەیمانەکەی بەجێنەهێناوە[1]، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە (ئۆتۆ) بێتەوەسەر (ئیتاڵیا) و لە هەنگاوێکی دەگمەن لە مێژووی ئەورووپادا؛ (پاپا یوحەننای دوازدەهەم)ی لادا و قەدیس پەترۆس (پاپا لیۆی هەشتەم ٩٦٣-٩٦٥ ز)ی لە شوێنی دانا، بەڵام دوای گەڕانەوەی (ئۆتۆ) بۆ (ئەڵمانیا)؛ پاپا یوحەننای دوازدەهەم (لیۆ)ی لەکارخست و لە (ڕۆما) دەریکرد. ڕووداوەکان گۆڕانکاریان بەسەرداهات و ئاکامەکەی ئەوە بوو کە (پاپا بندکتی پێنجەم ٩٦٤-٩٦٦ ز) هەڵبژێردرا بە پاپا بەبێ ڕاوێژپێکردن و گەڕانەوە بۆ (ئۆتۆ)، ئەمەش وایکرد کە (ئۆتۆ) بگەڕێتەوە (ئیتاڵیا) و بانگێشتی بەستنی (مجمعی کنسی)ی کرد. لە ئەنجامدا (یوحەننای سیازدەهەم ٩٦٥-٩٧٢ ز) بە پاپا هەڵبژێردرا، بەڵام دۆخەکە بە ئارامی بەسەرنەچوو؛ بەڵکوو لە ساڵی (٩٦٦ ز) یاخیبوون دژی ئەم بڕیارەی سەروو لە (ئیتاڵیا) ڕوویدا و بووە هۆی ئەوەی کە (ئۆتۆ) بگەڕێتەوە سەر (ئیتاڵیا) و یاخیبوونەکە دابمرکێنێتەوە، هەروەها (یوحەننای سیازدەهەم) بگەڕێتەوە سەر کارەکەی. لەوکاتەدا موڵکەکانی پاپا تەنها (ڕۆما) و هەرێمی (سابینا) بوو، شوێنەکانی دیکەی (ئیتاڵیا) کەوتنەسەر ئیمپراتۆرییەتەکەی (ئۆتۆ). (تتویج) کردنی (ئۆتۆ) و پێش ئەویش (شارلەمان) لە لایەن پاپاوە؛ بوو بە نەریتێک لە لایەن پاپاکان کە ئەگەر پاشاکان لە لایەن پاپاوە دانیان پێدانەنرابێت؛ ئەوە شەرعییەتیان نییە. ئەمە بوو بە پاڵپشتێکی بەهێز بۆ کەنیسە دژی دەسەڵاتی دونیایی. (ئۆتۆ) لە ژیانی سەربازیدا سەرکەوتنێکی زۆری بۆ (ئەڵمانیا) بەدەستهێنا، توانی کۆمەڵە قەڵایەکی بەهێز لە خۆرهەڵاتی (سەکسۆنیا) و لەسەر سنووری (ئەڵمانیا و سلاڤییەکان) لەنێوان ڕووباری (ئەلبا و ئۆدە) دروستبکات. لە باکووریشەوە سنووری وڵاتەکەی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٩٠.

ـســەر هـەژماری (دانیمارکییەکـان) فراوانکـرد و (مارکـای نـویێ)ی دروسـتکرد کە
ـیـتا (مارک شیلز فیک)ە. هەروەهـا خـۆی سـەرکردایەتی هەڵمەتێکی سـەربازی بـۆ
ـسـەر سلاڤییەکانی (چیک) لە (بۆهیمیا و مورافیا) کرد. لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتەدا و
ـە ساڵی (٩٥٠ ز)دا چیکەکـان دانیـان بە دەسـەڵاتداریێتی (ئۆتـۆ) دانـا و بەڵێنیـان پێیدا
ـکە سـاڵانە سـەرانەی پـێ بـدەن. بەمشـێوەیە کـۆنتی (بۆهیمیـای سـلاڤی) خـرایە
چوارچێوەی وڵاتی ئەڵمانیاوە. مەزنترین دەستکەوتی سـەربازی (ئۆتـۆ) بریتیبوو لە
ـسەرکەوتنە یەکلاکەرەوەکەی بەسـەر (مەجەڕییەکـان) لە سـاڵی (٩٥٥ ز) لـە جەنگی
ـلیچفیلد)دا[١].

## دەستوەردان لە کاروباری ئیتاڵیا

(ئۆتۆ) خۆی بە بەتواناترین پاشای سەردەمەکەی دادەنا، وایدەبینی کە دەتوانێت ببێـتە جێگـرەوەی (شـارلەمان)، ئەمەش وایلێکـرد دەسـت لە کاروبـاری نـاوخۆیی (ئیتاڵیـا) وەربـدات. بـارودۆخی نـاوخۆی (ئیتاڵیـا) لەبـاربوو بـۆ ئەم دەسـتوەردانە؛ چونکە بە شـێوەیەکی گشـتی ئاسایشـی وڵات شـێوابوو. لە ناوەڕاسـت و بـاکووری (ئیتاڵیـا)دا پشـێوی ڕامیـاری بـاڵی بەسـەر وڵاتـدا کێشـابوو. وڵات بەسـەر چەنـد میرنشینێکی دەرەبەگی بچووکدا دابەشببوو. ناوچەکانی بـاکوور کە لە پاشماوەکانی سەردەمی (کـارۆلنجی) بـوو؛ تەنهـا بەنـاو ملکەچـی پاشـا بـوون. لە ڕۆماشـدا بنەماڵە ڕۆمـانییە ڕەسـەنەکان فەرمـانڕەوای شـار بـوون. باشـووری وڵاتـیش بەسـەر چەنـد دەوڵەتـۆکەیەکی نـیمچە سـەربەخۆی نـاکۆک لەگەڵ یەکـدا دابەشـبووبوو، وەک: (سبولیت، بتفنتو و... هتد)، ئیمپڕاتـۆرییەتی بیزەنتیش چەنـد مـوڵکێکی لە نـاوچەکەدا هەبوو. لەمکاتەدا کە بارودۆخی (ئیتاڵیا) بەگشـتی شـێوابوو؛ برنجری پاشـای ئیتاڵیـا (ئەدیلیدی) زیندانیکرد کە بێوەژنی یەکێک لە ڕکابەرە کۆنەکانی بوو، لە هەمان کاتدا کچـی کـۆنتی (بۆرگوونـدیا) بـوو، (کـونرادی) برایشـی یەکێـک بـوو لە شـوێنکەوتە نزیکەکـانی (ئۆتـۆ)، ئەوە بـوو (کـۆنراد) پەنـایبردەبەر (ئۆتـۆ) بـۆ ئـازادکردنی خوشکەکەی[٢].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٨٩.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٣٠.

(ئۆتۆ) لە ساڵی (٩٥١ز) بەرەو (ئیتاڵیا) کەوتەڕێ و توانی (ئەدیلیدی) ئازادبکات و پاشانیش بیخوازێت، برنجریش ئینتیمای خۆی بۆ دەربڕی، بەڵام شوێنکەوتەیەکی دڵسۆز نەبوو بۆ گەورەکەی. (ئۆتۆ) ناچاربوو جارێکی دیکە گرنگی بداتەوە بە (ئیتاڵیا)، لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان (برنجر و پاپا یوحەننای دوازدەهەم) ئاڵۆز بووبوو، پاپا داوای کۆمەکی لە (ئۆتۆ) کرد؛ ئۆتۆش لە ساڵی (٩٦١ ز) بەدەم داواکەی پاپاوە ڕۆشت، (ئۆتۆ) چووە ناو شاری ڕۆماوە و لە ساڵی (٩٦٢ ز) پاپا تاجی ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی) لەسەر (ئۆتۆ)نا؛ وەک ئەوەی پێشتر لەسەر (شارلەمان) نرا، لە ئەنجامی ئەم تاجلەسەرنانەشدا ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی پیرۆز) دەرکەوت و هەتا ساڵی (١٨٠٦ ز) فەرمانڕەوایەتیان بەردەوامبوو و درێژەیکێشا[١].

(ئۆتۆ) ڕامیارییەکی تایبەتی بەرامبەر بە پاپا پەیڕەوکرد، لە لایەکەوە دانی بە هەموو موڵکەکانی پاپادا دەنا؛ لە لایەکی دیکەشەوە هەرچەندە دانی بە سەربەخۆیی شاری (ڕۆما)دا نابوو، بەڵام جەختی لەسەر سەرپەرشتیاری خۆی بەسەر شارەکەوە دەکردەوە، ئەوەش لە ڕێی ئەو ڕاپۆرتانەوە کە پشکنەر (مفتش)ەکانی بۆیان بەرزدەکردەوە. کاتێک (ئۆتۆ) ئیتاڵیای بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ (ئەڵمانیا)؛ (پاپا یۆحەننا) لەگەڵ (ئەدلبرتی کوڕی برنجر) کەوتە پیلانگێڕان دژ بە (ئۆتۆ)، ئۆتۆش گەڕایەوە بۆ (ڕۆما) و پاپای لەکارخست و لە ساڵی (٩٦٣ ز) بڵاوکراوەیەکی تایبەتی دەرکرد. بەپێی ناوەڕۆکی بڵاوکراوەکە ئەو کەسەی دەبێتە پاپا پێش ئەوەی پۆستەکەی وەربگرێت و بە شێوەیەکی شێوازبەند ببێتە پاپا، دەبێت سوێندی پشتگیری بۆ ئیمپراتۆر بخوات، بەمشێوەیە دەسەڵاتی ئیمپراتۆر زاڵبوو بەسەر دەسەڵاتی ئایینیدا[٢]!

بارودۆخی ناوخۆی (ئیتاڵیا) جێگیرنەبوو، لە لایەکەوە پاپای لەکارخراو بەردەوامبوو لە چالاکینواندن دژ بە ئیمپراتۆر؛ لە لایەکی دیکەوە لە ساڵی (٩٦٥ ز) دوو شۆڕشی بەرفراوان لە (ئیتاڵیا) هەڵگیرسان. یەکێکیان لە (لۆمبادریا) کە دەکاتە باکووری وڵات و ئەوی دیکەشیان لە (ڕۆما)، بۆیە (ئۆتۆ) بۆ جاری چوارەم ناچاربوو بەرەو (ئیتاڵیا) بڕوات، هەتا شۆڕشەکان دابمرکێنێتەوە و بارودۆخی وڵات هێوربکاتەوە و بە شێوەیەکی تەواو (ئیتاڵیا) بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە. (ئۆتۆی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور اوسطى، ص٢١٩.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٩١.

ئیمپراتـۆر) پـاش (٣٧) سـاڵ لە فەرمـانڕەوایەتی؛ ئیمپراتـۆرییەتێکی فراوانـی وەک ئیمپراتـۆرییەتەکەی (شـارلەمان)ی پێکهێنـا. تـوانی ئـایینی (مەسـیحی) لەنـاو گەلە بتپەرستەکاندا بڵاوبکاتەوە. یارمەتی دامەزراندنی چەند میرنشینێکی سەربەخۆیدا لەناو چوارچێوەی قەوارەی (ئەڵمانیـا)، بـۆیە ئەڵمانیـا لەکـاتی مردنـی (ئۆتـۆ)دا بـە بەهێزترین وڵاتی ئەورووپا هەژماردەکرا[1].

## جێگرەوەکانی ئۆتۆی مەزن لە بنەماڵەی سەکسۆن

پـاش مردنـی (ئۆتـۆی مـەزن)؛ سـێ کەس لە بنەمـاڵەی (سەکسـۆنی) جڵـەوی فەرمانڕەوایەتییـان گرتەدەسـت، ئەوانـیش: (ئۆتـۆی دووەم، ٩٧٣-٩٨٣ ز) و (ئۆتـۆی سـێیەم ٩٨٣-١٠٠٢ ز) و (هێنـری دووەم ١٠٠٢-١٠٢٤ ز) بـوون، ئەم سـێ پاشـایە لەسەر هەمان ئەو ڕامیارییە ڕۆشتن کە (ئۆتۆی مەزن) بناغەی بۆ دانابوو.

### ئۆتۆی دووەم (٩٧٣-٩٨٣ ز)

دوای ئەوەی (ئۆتـۆی یەکەم) تەمەنـی بەرەو هەڵکشـان ڕۆشـت؛ بیـری لەوە دەکردەوە کە (ئۆتۆی دووەم)ی کوڕی لە شوێنی خۆی دابنێت، نەوەک دوای مردنی پاشـاگەردانی و نائـارامی وڵات بگـرێتەوە. ئەوە بـوو تـوانی (پاپـا یوحەننـای سیازدەهەم) ڕازی بکات بە بیرۆکەکەی. لە ساڵی (٩٧٦ ز) تتویجی کرد (ئۆتۆ) لە ڕێگای خواستنی (پیوڤانۆ)ی کچی ئیمپراتۆری کۆچکردوو (ڕوما نیوسنی بێزەنتی ٩٥٩-٩٦٢ ز). بەمشـێوەیە سـەرجەم موڵکـەکانی (بێزەنتـی) لە (ئیتاڵیـا)دا کەوتە ژێردەسـەڵاتی (ئۆتـۆ) لە سـاڵی (٩٧٢ ز)دا. بەمشـێوەیە تـوانی بیـرۆکەی یەکگرتنـی هەردوو ئیمپراتـۆرییەت جێبەجـێ بکـات. ئەو بیـرۆکەیەی کە (شـارلەمان) نەیتـوانی جێبەجێی بکات. لەگەڵ دەستبەکاربوونی (ئۆتۆی دووەم) دیاردەی یاخیبوون لەناو (دۆقەکـان) سـەریهەڵدایەوە، بەتـایبەتی لە (ڤاریـا و سـوابیا)، بەڵام (ئۆتـۆی دووەم) تـوانی هەموویـان دابمرکێنێتەوە و لەسەر ڕامیـاری بـاوکی ڕۆیشت، زۆر پشتی بە پیـاوانی ئـایینی دەبەسـت لە کاروبـاری وڵاتـدا، هەوڵـی زۆریـدا بـۆ بوژانـدنەوە و ڕێنسانسی زانست و وێژە، لە ڕامیاری دەرەکیدا کەوتە ململانێ لەگەڵ (فەڕەنسا)؛ دوای ئەوەی (فەڕەنسـا) هێرشـی کردەسـەر سـنوورەکانی (ئەڵمانیـا)، بەڵام زۆری

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢١.

نەبرد ئەو ململانێییە بە ئاشتی کۆتاییهات. مەترسییەکی دیکە لە باشووری (ئیتاڵیا لەنێوان میرەکان سەریهەڵدا، ئەمە سەرەڕای هێرشی (موسڵمانان) بۆ دوورگەی (سەقڵیە) و باشووری (ئیتاڵیا). (ئۆتۆ) هەتا مردنیش نەیتوانی چارەسەری ئەم گیروگرفتانە بکات[1].

### ئۆتۆی سێیەم (٩٨٣–١٠٠٢ ز)

(ئۆتۆی سێیەم) بە منداڵی فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست و بە لاویش کۆچی دوایی کرد، کاتێک فەرمانڕەوایی وەرگرت تەمەنی تەنها (٣) ساڵان بوو، بۆیە (سیوفانی بیزەنتی) دایکی بوو بە ڕاسپێردراوی و هاوشانی داپیرەی (ئەدلیدی لۆمباردی) و لەسەردەستی (گربرتی فەڕەنسی) پێگەیشت. ماوەی ڕاسپاردنی (ئۆتۆ) بۆ ماوەی (١٣) ساڵ بەردەوامبوو، لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا (ئۆتۆ) مافی ئەوەی هەبوو کە تەختی ئیمپڕاتۆری بگرێتەدەست. لە ساڵی (٩٩٦ ز) لەم قۆناغەدا (گربرت) داوای لە (ئۆتۆی سێیەم) کرد بە گواستنەوەی پایتەخت بۆ (ڕۆما) هەتا ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی) زیندووبکاتەوە و گێتی (مەسیحییەت) بخاتەوە ژێردەستی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی، بەڵام گەورەپیاوانی (ڕۆما) دژی ئەم بیرۆکەیە بوون و ڕازی نەبوون بکەونەوە ژێردەسەڵاتی بێزەنتی (لە شێوەی ئەڵمانیا) و کۆماری ڕۆمانییان ڕاگەیاند. (ئۆتۆی سێیەم) هەمیشە خەونی بە گرتنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانییەوە دەبینی لەژێر چاودێریکردنی خۆیدا. هاوکات زۆر سەرسامی ژیانی (بێزەنتی) بوو؛ ئەویش لەژێر کاریگەری دایکیدا، هەربۆیە کۆشکێکی مەزنی لە (ڕۆما) بونیاتنا لەسەر شێوازی کۆشکی (بێزەنتی)، زۆر لە ڕێورەسمەکانی ئەوێی بۆ لای خۆی گواستەوە، بەڵام (ئۆتۆ) ڕووەو (ئیتاڵیا) کشا و توانی جوداخوازەکان لەناوبەرێت و سەرکردەکەیان (کرسنتیووس) بکوژێت. لە ساڵی (٩٩٨ ز) و دوای مردنی (پاپا گریگۆری پێنجەم ٩٩٧–٩٩٩ ز)؛ (ئۆتۆگربرت)ی مامۆستای کردە پاپا لەژێر (ناوی

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٩٨.

ـلفستەری دووەم ٩٩٩-١٠٠٣ ز)، بەڵام (ئۆتۆ) زۆر نەژیا و لە تەمەنی (٢٢) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، واتە لە ساڵی (١٠٠٢ ز)[١].

### هێنری دووەم (١٠٠٢-١٠٢٤ ز)

کاتێک کە (ئۆتۆ) کۆچی دوایی کرد؛ هیچ میراتگرێکی بۆ تەختی پاشایەتی (ئەڵمانیا) بەجێنەهێشت، بۆیە (هێنری دووەمی دۆقی باڤاریا) کاندیدکرا بۆ تەختی (ئەڵمانیا). بەمشێوە فەرمانڕەوایی گواسترایەوە بۆ خێزانێکی دیکەی بنەماڵەی (سەکسۆنی). (هێنری) دەسەڵاتی بەسەر کەنیسەدا هەبوو؛ چونکە پیاوێکی ئایینی بوو، هەروەها پیاوانی ئایینی لە خۆی نزیککردنەوە و پشتی پێدەبەستن لە کاروباری کارگێڕی وڵاتدا. گرنگیدا بە جووڵانەوەی چاکسازی ئایینی کە (دێری کۆڵۆنی) سەرپەرشتی دەکرد. ئەوەی پەیوەندی بە ڕامیاری دەرەکییەوە هەبوو لە شەڕی بەردەوامدابوو لەگەڵ (سلاڤییەکان و پۆڵەندییەکان) و کۆتایی نەهات هەتا ڕێکەوتننامەی ئاشتی بەسترا، ئەویش بە دەستبەرداربوونی هەندێک زەوی بۆیان، هەروەها لە (ئیتاڵیا) نائارامی ڕوویدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دووجار بچێتەوە سەر (ئیتاڵیا)، واتە لە ساڵانی (١٠٠٤ ز) و (١٠١٣ ز). (هێنری) ماوەی (٢٢) ساڵ فەرمانڕەوایی کرد؛ ئەوە بوو لە ساڵی (١٠٢٤ ز) کۆچی دوایی کرد. بەمشێوەیە فەرمانڕەوایی بنەماڵەی (سەکسۆنی) کۆتاییهات کە توانییان ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی) زیندووبکەنەوە، هەروەها گرنگیاندا بە پیاوانی ئایینی بۆ کاروباری کارگێڕی، هەروەها توانیان دەسەڵاتی دەرەبەگەکان لەناوبەرن[٢].

(ئۆتۆی دووەم) توانی بەرگرییەکی باش لە شانشینەکەی بکات و گرنگییەکی زۆریشی بە باکووری (باڤاریا)دا، هەروەها هەوڵیدا کە باشووری (ئیتاڵیا) داگیربکات، بەڵام (ئۆتۆی سێیەم) کە دایکی (پیوفانۆ) شازادەیەکی (بیزەنتی) ئایینپەروەر بوو، زۆرتر حەزی لە چاکسازیکردن لە کڵێسا دەکرد. ئەوە بوو

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٩٦.
(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢٤.

ئامۆزاکەی خۆی بە ناوی (گریگۆری پێنجەم) کرد بە پاپا، لەپاش مردنیشی هاوڕێ و بەخێوکەرەکەی (سلفستری شەشەم)ی بۆ کورسی پاپایەتی بەرزکردەوە[1].

(ئۆتۆی سێیەم) هەمیشە خەونی بە گەڕاندنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانییەوە دەبینی لەژێر چاودێریکردنی خۆی و ئەو پاپایەی کە دایدنابوو. (ئۆتۆی سێیەم) بە هۆی دایکییەوە بە ژیانی (بیزەنتی) زۆر سەرسامبووبوو، هەربۆیە کۆشکێکی مەزنی لە (ڕۆما) و لەسەر شێوازی کۆشکی (بیزەنتی) دروستکرد و زۆر لە ڕێوڕەسمی ئەوێی بۆ لای خۆی گواستەوە. (هێنری دووەم) دوا پاشای (سەکسۆنەکان) بوو، لە سەرەتادا هەوڵێکی زۆری دا کە هەژموونی ئەڵمانیا بەسەر (ئیتاڵیا)دا بسەپێنێت، لەپاش سەرکەوتنی لەم کارەیدا؛ بەتایبەتی خۆی یەکلایی کردەوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری (ئەڵمانیا)، چونکە (ئۆتۆی دووەم و ئۆتۆی سێیەم) کاروباری ئەڵمانیایان پشتگوێخستبوو. (هێنری دووەم) بە هاوکاری پیاوانی ئایینی ئەڵمان و ئایینپەروەرانی خۆی، کە بە (قەشە هێنری) ناوبانگی دەرکردبوو، توانی گرنگی بە کاروباری ناوخۆیی (ئەڵمانیا) بدات. بە کۆچی دوایی (هێنری دووەم) کۆتایی بە دەسەڵاتی بنەماڵەی (سەکسۆنی) هات لە ئەڵمانیادا[2].

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ لوروبا العصور الوسطى، ص٤٣٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢٤.

# بەشی چواردەیەم

-ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی فرانکۆنیدا (١٠٢٤–١١٢٥ ز)
-کۆنرادی دووەم (١٠٢٤–١٠٣٩ ز)
-هێنری سێیەم (١٠٣٩–١٠٥٦ ز)
-هێنری چوارەم (١٠٥٦–١١٠٦ ز)
-ململانێی نێوان هێنری چوارەم و گریگۆری حەوتەم
-هێنری پێنجەم (١١٠٦-١١٢٥ ز)
-ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی هوهنشتاوفن (١١٢٥–١٢٥٤ ز)
-کۆنرادی سێیەم (١١٣٨–١١٥٢ ز)
-فریدریك بارباروسا (١١٥٢–١١٩٠ ز)
-فریدریکی دووەم (١٢١٢–١٢٥٠ ز)
-ئەڵمانیا لەپاش ساڵی (١٢٥٠ز)

## ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی فرانکۆنی -سالی- (١٠٢٤–١١٢٥ ز)

بە مردنی (هێنری دووەم) ساڵی (١٠٢٤ز)؛ دوا نوێنەری بنەماڵەی (سەکسۆنی) کۆتاییهات، بەڵام شازادە و دۆقەکان وڵات و دەسەڵاتی خۆیان هەر مابووەوە، بۆیە شازادەیەکیان لە بنەچەی (فرانکۆنی) هەڵبژارد بۆ تەختی ئیمپڕاتۆرییەت؛ ئەویش (کونراد) بوو کە لە لایەنی دایکییەوە دەگەڕایەوە سەر بنەماڵەی (سەکسۆنی)، بۆیە بە دەسبەکاربوونی کونراد؛ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی (سالی یان فرانکۆنی) دەسپێدەکات[1].

پاشاکانی بنەماڵەی (سەکسۆن) سەرکەوتووبوون لە داڕشتنی بنەما گرنگەکانی دەوڵەتی (ئەڵمانیا) لە هەمان کاتدا بیری ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی پیرۆزیان لەسەر شێوازە ئەڵمانییەکەی بووژاندەوە، لەگەڵ ئەم سەرکەوتنەدا؛ چەند هۆکارێکی دیاریکراو هەبوون کە کاریان بۆ لێکهەڵوەشانی پاشایەتی و ئیمپڕاتۆرییەتی پێکەوە دەکرد، وەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا ئەو هێزە ڕووخێنەرە سەرەکییە بریتیبوو لە دەرەبەگایەتی، لە ئیتاڵیاشدا ئەم هێزە هاوشێوەی (ئەڵمانیا) کاریگەری خۆی هەبوو، لە ماوەی هەردوو سەدەی یازدەیەم و دوازدەهەمدا لە باکووری (ئیتاڵیا)، چەند شارێکی نوێ دەرکەوتن و گەشەیانکرد و زیاتر هەوڵی سەربەخۆییان دەدا، بۆیە ئەمانیش بەربەستێکی دیکەی بەردەم پاشایەتی بوون لە (ئەڵمانیا). پاشا و ئیمپڕاتۆرە (ئەڵمانییەکان) دەیانتوانی بەرامبەر بە فەرمانڕەوا دەرەبەگی و شارە (ئیتاڵییەکان) ڕابوەستن، ئەگەر هێزێکی مەترسیداری دیکەی وەک کڵێسا نەبووایە[2].

پاشاکانی (سەکسۆن) توانیبوویان هەژموونی خۆیان بەسەر پاپادا بسەپێنن، بە شێوەیەک کە دامودەزگای ئایینی بووبووە پاشکۆیەکی پاشایەتی لە (ئەڵمانیا)دا. ئیمپڕاتۆر بە ئارەزووی خۆی پاپای دادەنا و لەکاریدەخست. کڵێسای (مەسیحی) لە سەدەی دوازدەهەمدا بە بزووتنەوەیەکی چاکسازی گرنگدا تێپەڕیکرد کە لە ئامانجە گرنگەکانی ئەم بزووتنەوەیە: پارێزگاریکردن بوو لە سەربەخۆیی کڵێسا و قەدەغەکردنی دەستتێوەردانی دەسەڵاتی کاتی لە کاروبارەکانیدا، بۆیە ململانێ لەنێوان پاپا و ئیمپڕاتۆر دەستی پێ کرد. لە گەرمەی ئەم ململانێیەدا کڵێسا توانی سوود لە فەرمانڕەوا دەرەبەگییە (ئەڵمانییەکان) وەربگرێت و بیانکاتە هاوپەیمانێکی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢٥.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٣٩.

باشی خۆی، ئەمە ئەو بارودۆخەبوو کە ڕووبەڕووی بنەماڵەی فرانکۆنی (سالی دەسەلاتدار بووەوە[1].

## کۆنرادی دووەم (١٠٢٤-١٠٣٩ ز)

(کۆنرادی دووەم) بە یەکێک لە بەهێزترین پاشاکانی (ئەڵمانیا) دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، کەسێکی دووربین و ڕامیاریزانێکی لێهاتووبوو، توانی بەتەواوی زاڵ ببێت بەسەر ئەسقەفە (ئەڵمانییەکان) و دەسکەوت و موڵکەکانیان سنووردار بکات، هەروەها هەوڵیدا سنوورێک بۆ دەسەلاتی خانەدانە مەزنەکان دابنێت. (کۆنرادی دووەم) هەر لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی دەسەلاتی میرەکان بووەوە، بە هەمان شێوازی پێشینەکانی خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکی کەم. (کونراد) هەندێک لە دەرەبەگە بچووکەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا و بوانیسپی میراتی بۆ جێبەجێکردن لەو زەوییانەی لەبەردەستیاندابوو. بەمشێوەیە سنوورێکی بۆ دەرەبەگە مەزنەکان دانا. هاوکات گرنگی دا بە پیاوانی ئایینی و پلەوپایەی شارستانی و ئایینی پێدان. بەمشێوەیە توانی نائارامی و پاشاگەردانی ناوخۆ لەناوببات، ئەویش بە پشتبەستن بە خانەدانە بچووکەکان؛ لە ڕێی پێدانی مافی میراتگری موڵکەکانیان و گواستنەوەی بۆ نەوەکانیان، ئەم ڕامیارییەش پایەی پاشای لە بەرامبەر خانەدانە مەزنەکان بەهێزکرد، بەلام لە ماوەیەکی دووردا بووە هۆی دروستبوونی چەند کێشەیەکی ترسناک بۆ پاشایەتی (ئەڵمانیا) کە زیاتر لاوازی دەسەلاتی ناوەندی و پارچەبوونی وڵاتی لێکەوتەوە[2].

یەکێک لە ڕامیارییەکانی دیکەی (کۆنرادی دووەم) بۆ لاوازکردنی هەژموونی خانەدانە مەزنەکان بوو کە بریتیبوو لە نەبەخشینی مافی میراتگری خانەوادەکان؛ واتە کە خانەوادە مەزنەکان کۆچی دواییان دەکرد، هیچ کەسێک لە بنەماڵەکەی شوێنی نەدەگرتەوە. ڕامیاری ناوخۆی (کونراد) چەند لایەنێکی جیای لەخۆگرتبوو لە (ئیتالیا، پۆڵەندا، بۆهیمیا، هەنگاریا و بۆرگوندیا). لە (ئیتاڵیا)دا کێشەکە هەر لە سەردەمی (شارلەمان) و بنەماڵەی (ساکسۆنی)دا هەبوو، دەسەلاتی (ئەڵمانیا) بەسەر (ئیتاڵیا)دا لە هەڵکشان و داکشاندا بوو، واتە پەیوەندی بە بەهێزی و لاوازی

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢٥.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٣٠٤.

ئەڵمانیاوە هەبوو، لەگەڵ کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بنەماڵەی (سەکسۆنی)؛ میرەکانی (ئیتاڵیا) هەتا ڕادەیەک لەژێر هەژموونی دەسەڵاتی (ئەڵمانیا) دەرچووبوون. هەروەک باسمانکرد (تتویج) کردن بەدەستی پاپاوە بوو، میرەکانی ئیتاڵیاش دژایەتی زۆری پاپایان دەکرد؛ بۆیە پێویستبوو لەسەر (کۆنراد) کە دەسەڵاتی میرەکان لەناوبەرێت، هەتا بە تاجی ئیمپڕاتۆرییەت بگات. لە ساڵی (١٠٢٦ ز) (کۆنراد) بەرەو ئیتاڵیا کەوتەڕێ؛ توانی دەسەڵاتی میرەکان لەناوبەرێت و ساڵی (١٠٢٧ ز) تاجی ئیمپڕاتۆرییەت بەدەستبهێنێت. دوای ئەوەی (پاپا یۆحەننای نۆزدەهەم ١٠٢٤-١٠٣٢ ز) تاجی کردەسەر، هەرچی پەیوەندی نێوان (ئەڵمانیا و پۆڵۆنیا) بوو؛ ئەوە ململانێیەکی درێژخایەن بوو، بەتایبەت دوای گەڕانەوەی (کونراد) لە ساڵی (١٠٢٧ ز) لە (ئیتاڵیا)دا، (پۆڵەندییەکان) توانیان چەند شارێکی هەرێمی (سەکسۆنیا) وێران بکەن. ئەم جەنگە بەردەوامبوو لەنێوانیاندا؛ واتە لەنێوان ساڵانی (١٠٢٨-١٠٣١ ز) و کۆتایی نەهات هەتا ئەوکاتەی کە ڕێککەوتننامەی ئاشتی بەسترا لەنێوان هەردوولایاندا. ئەوەی پەیوەندی بە بۆهیمیاوە هەبوو؛ ئەوانیش لە دەسەڵاتی (ئەڵمانی) یاخیبوون و (کۆنراد) هێزێکی سەربازی بۆ ناردن، توانی هێزی سەربازیان ئیفلیج بکات، بەڵام نەیتوانی کۆتایی بەو نائارامییە بهێنێت هەتا ساڵی (١٠٣٥ ز). (کۆنراد) هەمان ڕامیاری لە هەنگاریاش جێبەجێکرد، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە بۆرگووندیاوە هەبوو؛ توانی بیخاتە سەر موڵکەکانی خۆی، چونکە مافی شەرعی میراتگری هەبوو. لە کۆتا ساڵەکانی فەرمانڕەوایی (کونراد)دا، نائارامی و جوداخوازی دووبارە (ئیتاڵیا)ی گرتەوە. ئەمجارەیان پیاوانی ئایینی و بەتایبەت (ئەربرت) سەرۆکی ئەسقەفەکانی شاری (سیلانۆ) کە سەربەخۆیی ئەسقەفییەکان خۆی ڕاگەیاند و هەموو هەوڵەکانی سەربازی و ئاشتی (کۆنراد) نوشستی هێنا بۆ لەناوبردنی. (کۆنراد) لە ساڵی (١٠٣٨ ز) کۆچی دوایی کرد بەر لەوەی چارەسەری کێشەی (ئیتاڵیا) بکات، ئیدی (هێنری کوڕی کۆنراد) دەکرایە گەورەی هەرێمەکە. بەوشێوەیە لە کاتی مردنی باوکیدا (هێنری سێیەم) بووە گەورەی هەموو هەرێمە (ئەڵمانییەکان)؛ جگە لە (لۆرین و سەکسۆنیا)[١].

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٢٦.

## هێنری سێیەم (١٠٣٩-١٠٥٦ ز)

(هێنری سێیەم) دوای مردنی (کونراد)ی باوکی تەختی (ئەڵمانیا)ی گرتەدەست؛ بە کۆتا پاشای بەهێزی (ئەڵمانیا) دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، چونکە توانی سنوور بۆ دەسەڵاتی دەرەبەگە (ئەڵمانییەکان) دابنێت و دەسەڵاتی پاشایەتی لە هەموو بەشەکانی (ئەڵمانیا)دا بەهێزبکات، هەروەها توانی هەژموونی خۆی بەسەر کڵێسادا بسەپێنێت و خودی پاپاوییەتی کردە دەزگایەکی (ئەڵمانی)! لە ساڵی (١٠٤٦ ز)دا سێ پاپای ڕکابەری لەکارخست و پێنج پاپای (ئەڵمانی) بەدوای یەکدا دیاریکرد. لە ڕامیاری ناوەوە و دەرەوەشدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا و ئیمپراتۆرییەت گەیشتە لووتکەی سەربەرزی. لەبارەی ڕامیاری ناوخۆوە؛ کێشە و گرفتی ناوخۆ لە سەردەمی (هێنری سێیەم)دا زۆر نەبوو، بۆیە ڕوویکردە چاکسازی وڵاتەکەی کە لایەنی ئایینی دەروازەی ئەو چاکسازییەنەی بوو. لە ساڵی (١٠٤٣ ز) لێبووردنی بۆ ئەو کەسانە دەرکرد کە دژی وەستابوون، هەروەها داوای لە پێوەندەکانی کرد کە دەروونی خۆیان پاکبکەنەوە لە ڕق و قین و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە، هەروەها دیاردەی فرۆشتنی پلەوپایەی بۆ پیاوان ڕاگرت. لە ڕامیاری درەوەشدا؛ پەیوەندی هەبوو بە (ئەربرت) سەرۆکی ئەسقەفەکانی (سیلانۆ و پۆڵەندا و هەنگاریا و سلاڤییەکان) و دواتریش پاپا. (ئەربرت) لە ساڵی (١٠٤٠ ز) سەردانی (هێنری) کرد و وازی لە بیرۆکەی سەربەخۆیی هێنا و چووە ژێر ڕکێفی هێنرییەوە. لە (پۆڵەندا) بارودۆخەکە زۆر ماندووکەرنەبوو، چونکە شەڕی ناوخۆ (پۆڵەندییەکان)ی لاوازکردبوو، ئەمە سەرباری هێرشی (بۆهیمیا) کە هەرچی پەیوەندی بە بۆهیمیاوە هەبوو لە ساڵی (١٠٤١ ز) سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند. لە ساڵی (١٠٤٥ ز)دا (هێنری) هێرشیکردە سەر (سلاڤییەکان) و بەسەریاندا سەرکەوت، ئەوانیش وڵاتی خۆیان ڕاگەیاند و دانیان بە دەسەڵاتی (هێنری)دانا. هەرچی پەیوەندی بە پاپایەتییەوە هەبوو؛ ئەویش کڕین و فرۆشتنی لەسەربوو، (هێنری) بۆ ئەوەی سنوورێک بۆ ئەم پاشاگەردانییە دابنێت؛ هەربۆیە ڕووەو (ئیتاڵیا) چوو و لەوێ (مجمعی کنسی)ی بەست و تێیدا بڕیاردرا بە دانانی پاپایەکی نوێ، ئەویش (کلمنتی دووەم ١٠٤٧ ز) بوو کە تاجی ئیمپراتۆرییەتی کردەسەر (هێنری) و بوو بە ئیمپراتۆر، بەڵام (کامنت) پاش ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کرد. (هێنری) ئەمجارە

پاپایەکی دیکەی دانا؛ ئەویش (لیۆی نۆیەم ١٠٤٨-١٠٥٤ ز) بوو. دوای مردنی (لیۆ)؛ هێنری) پاپایەکی دیکەی دانا کە ئەویش (پاپا ڤیکتۆری دووهەم ١٠٥٤-١٠٥٧ ز) بوو، بەمشێوەیە (هێنری) دەسەلاتی تەواوی هەبوو بەسەر کەنیسەدا، هەتا سالی ١٠٥٦، ز) کە (هێنری سێیەم) کۆچی دوایی کرد. لەبەرئەوەی کورەکەی (هێنری چوارەم) تەمەنی (٦) سال بوو؛ لەژێر چاودێر (وصایە)یەکی درێژدا مایەوە، بۆیە کلێسا و خانەدانە مەزنەکان ئەم بارودۆخەیان قۆستەوە؛ هەتا دەسکەوتە لەدەستچووەکانیان بەدەستبهێننەوە، بەلام کاتێک ماوەی چاودێریکردنی بەسەرچوو؛ لە سالی (١٠٥٦ ز) بە شێوەیەکی کرداری دەسەلاتی گرتەدەست. کاتێک کە خانەدانەکان لە هەلگەرانەوەدا بوون؛ کلێساش جگە لەوەی سەرقالی چاکسازی بوو، خەریکی بەهێزکردنی دەسەلاتیش بوو لەسەر هەژماری دەسەلاتی پاشایەتی، بۆیە (هێنری چوارەم) دەبوو رووبەرووی بارودۆخێکی نارەحەت و ئالۆز ببێتەوە[1].

### هێنری چوارەم (١٠٥٦-١١٠٦ ز)

(هێنری چوارەم) تەمەنی (٤) سالان بوو کاتێک (تتویج) کرا، هەروەها تەمەنی (٦) سالان بوو کاتێک باوکی کۆچی دوایی کرد، دایکی و دووان لە ئەسقەفەکان راسپێردراوی فەرمی بوون هەتا سالی (١٠٥٦ ز). (هێنری) هەر لە سەرەتای دەسەلاتییەوە دووچاری کێشەی میرەکانی بووەوە؛ چونکە هەندێک لە میرەکان لە ماوەی راسپاردەیی (فترة الوصاية) دەرفەتیان قۆستەوە و دەسەلاتیان بەسەر هەندێک زەوی دەولەتدا گرتبوو، هەروەها هەندێک باجیان بە دەولەت نەدابوو؛ بۆیە (هێنری) بیریکردەوە بەر لەوەی میرەکانی دیکەش هەمان رامیاری پەیرەو بکەن؛ پێویستە سنوورێکیان بۆ دابنێت. ئەوە بوو خۆی ئامادەکرد بۆ سەرکوتکردنی فەرمانرەوایەتی هەلگەراوەکان. لە سالی (١٠٧٥ ز) جەنگی لە دژیان هەلگیرساند و زۆر بەتوندی مامەلەی لەگەلدا کردن، بەلام ئەم بارودۆخە هەتا سالی (١٠٨٨ ز) بەوشێوەیە درێژەیکێشا، لەم سالەدا (هێنری چوارەم) توانی بەتەواوی زال ببێت بەسەر ناوچەی یاخیبووەکاندا، بە هەمان شێوە پاپایەتیش ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ ئەوەی بوون و پایەی ئایینی خۆی، دوور لە دەسەلاتی عەلمانی بگێرێتەوە.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: أوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٣٠٩.

(گریگۆری حەوتەم ۱۰۷۳-۱۰۸۵ ز) کۆبوونەوەیەکی ئایینی لە (ڕۆما)دا گرێدا، لەو کۆبوونەوەیەدا چەند بڕیارێک سەبارەت بە چاکسازی بارودۆخی کڵێسا دەرکرا لەوانە: پاپا مافی دیاریکردنی پیاوانی ئایینی و سەرۆک دێرەکانی هەبوو. دەرکردنی ئەم بڕیارانە بە دەسپێکی ململانێی نێوان پاپا و (هێنری چوارەم) دادەنرێت، چونکە (هێنری) وەک ئیمپراتۆرێک بە مافی خۆی دەزانی کە پاپا دابمەزرێنێت، بەڵام لە ئەنجامی بڕیارەکانی ئەم کۆبوونەوە ئاینییەوە؛ (هێنری) بێبەشبوو لە دامەزراندنی بچووکترین پیاوی ئایینی لە پۆستەکانی کڵێسادا، ئەمەش تەواو پێچەوانەی نەریتی (ئەڵمانیا) بوو کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو ئیمپراتۆر پاپا و پیاوە ئایینییەکانی دادەمەزراند، بۆیە ئەم ڕەوشە بە ململانێیەکی چەکداری بێئەنجام کۆتایی پێ هات[1].

(هێنری) ویستی بە وتوویژ و ڕێگای دیپلۆماسیانە کۆتایی بەو بارودۆخە بهێنێت، بەڵام لەم هەوڵەیدا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا؛ ئەوە بوو (هێنری) بڕیاری لەکارخستنی (پاپا گریگۆری حەوتەم)ی دەرکرد، لە بەرامبەردا پاپا بڕیاری بێبەشکردن (الحرمان)ی بەرامبەر بە (هێنری) دەرکرد. ئەم بارودۆخە بەوشێوەیە مایەوە؛ هەتا (هێنری) لە دوای کۆبوونەوەی (بریکسن) لە ساڵی (۱۰۸۰ ز)دا بە شێوەیەکی کرداری توانی پاپا لەکاربخات و (پاپا کلمنتی سێیەم۱۰۸۰-۱۱۰۰ ز) لە شوێنی دابمەزرێنێت، لە بەرامبەردا پاپا لە ساڵی (۱۰۸٤ ز) تاجی لەسەر (هێنری)نا[2].ململانێی نێوان پاپایەتی و ئیمپراتۆرییەتی لەم قۆناغەدا بە توندوتیژترین جەنگی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێت، ئەم ململانێیە توانایەکی زۆری (هێنری چوارەم)ی بەهەدەربرد و تەواو لاوازیکرد، بۆیە خانەدان و فەرمانڕەوا ناوچەییەکانیش ئەم هەلەیان قۆستەوە، توانیان شۆڕش بەرپابکەن. لە هەمان کاتدا توانیان هەردوو کوڕەکەی هێنری (هێنری پێنجەم و کۆنراد) بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، بەمەش ململانێ کەوتە نێوان باوک و کوڕەکانییەوە. لە ئەنجامدا کوڕەکانی سەرکەوتنیان بەدەستهێنا و باوکیان گرت و لە دەسەڵات دایانماڵی و لەبری ئەو (هێنری پێنجەم) لە ساڵی (۱۱۰۵ ز) بوو بە پاشای (ئەڵمانیا)[3].

---

(۱) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٤٢.

(۲) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٥٤.

(۳) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣٠.

## ململانێی نێوان (هێنری چوارەم و گریگۆری حەوتەم)

شتێکی سروشتی بوو دوای ئەنجامدانی چاکسازییەکانی (کەنەسی) ململانێ و ناکۆکی لەنێوان ئیمپڕاتۆرییەت و پاپاوییەت ڕوودات. ئەو ململانێیەی کە ماوەیەکی زۆری خایاند و ئاکام و ئەنجامی گەورەی لەسەر کۆمەڵگای ئەوروپی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لێکەوتەوە، تەنانەت دوای سەدەکانی ناوەڕاستیش کاریگەری هەر مابوو. پاپا دەیویست دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێت و لە ڕێگەی ڕەوانییەوە هەنگاوی بۆ ئەم ئامانجەی دەنا، ئیمپڕاتۆریش لە گۆشەنیگای دەسەڵاتەوە دەیڕوانییە مافی فەرمانڕەوایی و دامەزراندنی پیاوانی ئایینی کە کۆمەڵگەی پشتی کارگێڕی دەوڵەت بوون، هەروەها پێویستبوو لەژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆردابن. یەکێک لەو ناکۆکییانە؛ ململانێی نێوان ئیمپڕاتۆر (هێنری چوارەم ١٠٥٦-١١٠٦ ز) و (پاپا گریگۆری حەوتەم) بوو. هۆکارەکانی ئەم ململانێیە ئاشکرا و زانراوە؛ بەڵام هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (هێنری) کاتێک بوو بە ئیمپڕاتۆر؛ تەمەنی تەنها (٦) ساڵان بوو، بۆیە دووچاری چەند گیروگرفتێکی ناوخۆی بووەوە لە سەردەمی ڕاسپاردەیی (الوصاية)دا. ئەمە (پاپا گریگۆری حەوتەم)ی زیاتر هاندا کە ڕووبەڕووی (هێنری) بووەستێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی (هێنری) پێگەشت؛ دەسەڵاتی گرتەدەست و ڕامیارییەکی توندوتیژانەی بەکاردەهێنا لە فەرمانڕەوایدا[1].

هەڵبەتە ئەمە دەبووە مایەی ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ (پاپا گریگۆری حەوتەم)، ئەوە بوو ئەم ململانێیە بە شێوەیەکی کاریگەرانە لە ساڵی ( ١٠٧٥ز)ددەستی پێ کرد، ئەویش کاتێک (هێنری چوارەم) بڕیاری دامەزراندنی سەرۆکی ئەسقەفی شارەکانی (میلانۆ، فرمۆ، سبرلتو)ی دەرکرد؛ پاپاش بەرامبەر ئەم هەنگاوەی (هێنری) بڕیاری بێبیریکردنی (هێنری) و لادانی لە پلەی پاشایەتیدا دەرکرد؛ ئەگەر لەو بڕیارانەی پەشیمان نەبێتەوە. ئیمپڕاتۆر بەرامبەر بەو کارەی (پاشا گریگۆری) لە (١/٢٤/ ١٠٧٦ ز)دا لە شاری (ورمز) کۆنگرەیەکی بەست کە زۆربەی ئەسقەفەکانی (ئەڵمانیا) بەشداریان تێیدا کرد. لەم کۆنگرەیەدا ئەسقەفییەکان پاپایان بەوە تاوانبارکرد کە دەستدەخاتە ناو کاروباری ناوخۆییەکانیان، هەروەها نامەیەکیشیان ئاراستەی (پاپا گریگۆری) کرد، سەرەتا بە ناوی: "بۆ برامان

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٥٦.

هیلدبراند" کە ناوی بنچینەیی خۆی بوو، هەروەها (هێنری چوارەم) نامەیەکی بۆ (پاپا گریگۆری) نارد کە بەمشێوەیە نووسرابوو: "لە (هێنری) پاشای شەرعی کە خوداوەند هەڵیبژاردووە؛ بۆ (هیلدبرانە) کە پاپا نییە، بەڵکوو ڕاهیبێکی نارەسەنە"! بە کورتی کۆنگرەی (ورمز) بۆ لادانی (پاپا) بوو. (پاپا) لە بەرامبەردا کۆنگرەیەکی ئایینی بەست، لە (٢/٢٢/ ١٠٧٦ ز) لە شاری (ڕۆما)دا بۆ وەڵامدانەوەی ئیمپڕاتۆر. لەم کۆنگرەیەدا بڕیاردرا بە لادانی ئیمپڕاتۆر لەسەرکار؛ چونکە لە کەنیسە یاخیبووە، هەروەها قەدەغەی هەموو جۆرە مامەڵەیەکی لەگەڵ (هێنری)دا کرد وەک پاشا. ئەم بڕیارەی (پاپا گریگۆری) وایکرد کە زۆر لە پیاوانی ئایینی (ئەڵمانی) بچنەپاڵ (پاپا گریگۆری)، لەم سۆنگەیەشەوە شازادەکانیش هەمان بڕیاریاندا[1]، هەربۆیە لە ساڵی ( ١٠٧٦ز) کۆنگرەیەکیان لە شاری (تریبوو بەست و بڕیاریاندا بە چوونەپاڵی (پاپا گریگۆری). بەمشێوەیە تای تەرازووی ململانێ بەلای (پاپا گریگۆری)دا شکایەوە؛ چونکە شازادەکان بڕیاریاندا ئەگەر (هێنری) نەتوانێت بڕیاری بێبەریکردنەکەی هەتا (١٠٧٧/٢/٢٢ ز) لەسەر خۆی لابدات؛ ئەوە ئەوان (هێنری) بە پاشا نازانن! پاپا بەم بڕیارە دڵخۆش بوو؛ بۆیە (هێنری) کاتێک خۆی لەم دۆخە نەرێنییە بینییەوە؛ بڕیاریدا بچێتە لای (پاپا گریگۆری) و داوالێبوردن بکات بەر لەوەی هەموو شتێکی لەدەسبچێت. ئەوە بوو (هێنری) بەرەو قەڵای (کانووسا) لە هەرێمی (توسکانیا) بەڕێکەوت کە پاپا تێیدا نیشتەجێبوو، دوای ئەوەی بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ لە سەرماوسۆڵەی زستاندا لەبەر دەرگای ئەم قەڵایە وەستا، ئینجا (پاپا گریگۆری) ڕێگای پێدا بچێتەلای. (هێنری) بە پێخاوسی و بە کڕنووشبردنەوە داوالێبووردنی لە (پاپا گریگۆری) کرد. (هێنری) نیازی ئەوەی نەبوو بە تەواوی ڕادەستی پاپا بێت؛ بەڵکوو ئەم کردارەی وەک تاکتیکێک وا بوو، بۆ ئەوەی خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ لێدان لە شازادە نەیارەکانی کە دووچاری ئەم دۆخەیان کردبوو. ئەوە بوو (هێنری) توانی لێبوردن بەدەسبهێنێت و ئینجا کەوتە لێدانی شازادەکان. هەرچەندە هەندێک لە شازادەکان ڕوویانکردە پاپا و بڕیاری بێبەریکردنیان بەدەسهێنا لە دژی (هێنری)؛ بەڵام (هێنری) لەوکاتەدا هێز و توانایەکی وای پەیداکردبووەوە کە ئەم بڕیاردانەی پاپا کاری تێنەکات وەک جاری

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا فى العصور الوسطى، ص٢٣١.

پێشـوو[1]! تەنـانەت پاپا بڕیاریـدا بە لادانـی (هێنـری چـوارەم) و دانـانی (ڕۆدۆلـف – دۆقی سولبیا) لە مارسی ساڵی (١٠٧٧ ز)؛ کەچی ئەم بڕیارە هیچ سوودی نەبوو و جێگـەی خـۆی نـەگرت. (ڕۆدۆلـف) نەیتـوانی بەرامـبەر (هێنـری) هـیچ بکـات؛ بـۆیە ململانێ و پاشـاگەردانی وڵاتـی گرتەوە و بـۆ مـاوەی (٣) سـاڵ بەردەوامبوو. (پاپـا گریگـۆری) لە سـاڵی (١٠٨٠ ز) بۆ جارێکی دیکە بڕیاری لەسـەرکارلادانی (هێنـری) دەرکرد، هەروەها لە خەڵکی حەرام و قەدەغەکرد کە گوێڕایەڵی (هێنری) بن، بەڵام ئەم هەمـوو بڕیـارە و دواتـر پاشـگەزبوونەوەیەی (هێنـری)؛ هێـزی بڕیارەکـانی نەهێشـتبوو. هاوکـات (ڕۆدۆڵـف) کـۆچی دوایـی کـرد. شـازادەکان (هیرمـان ئـاف سـالم)یان لە شـوێنی دانـابوو کە کەسـایەتییەکی بێهێـزی هەبـوو، ئەمەش زیـاتر یـارمەتی (هێنـری)دا. لە هەمـان کاتـدا پیـاوانی ئـایینی (ئەڵمـانی) کۆبوونەوەیەکیـان بەسـت لە (مینـز)، تێیـدا بڕیاردانـدا کە (پاپـا گریگـۆری) لە پاپـایی لابـدەن و (کلمنـت سـێیەم ١٠٨٠–١١٠٠ ز) بکەن بە پاپا، هەندێک لە پیاوانی ئـایینی ئیتاڵیاش پاڵپشـتی بڕیارەکەیان کرد[2]. کلمنت (هێنری چوارەم)ی کرد بە ئیمپڕاتۆر، (هێنـری) لە سـاڵی (١٠٨١ ز) بە فەرماندەیی لەشکرێکەوە هێرشی کردەسەر (ئیتاڵیا)، هەتا ساڵی (١٠٨٣ ز) بـەردەوامبوون لـە لەشکرکێشـی؛ بـەڵام نەیـانتوانی (ڕۆمـا) بگـرن. هاوکـات (پاپـا گریگـۆری) خـۆی لە قەڵای (سـانت ئەنگلـۆ) قـایمکردبوو؛ هانـای بـردەبەر (ڕۆبـرت گویسـکاردی سـەرۆکی نۆرمـاندییەکان) لە (ئیتاڵیـا). لێرەدا ئامـادەنەبوونی هێنرییـان بەهەل زانـی؛ هەربۆیـە هێرشـیان کردەسـەر (ڕۆمـا) و تاڵانیـانکرد و بەشێکیشـیان سـووتاند، بە شـێوەیەک نە (ڤانـداڵەکان) نە (گووتەکـان) وایـان بەسـەر ئەو شـارەدا نەهێنـابوو! دواتـر گەڕانەوە بـۆ شـاری (سـالرنۆ)، پاپـاش لەم کشـانەوەیەدا لەگەڵیاندابوو؛ بەڵام خەڵک بەگشتی ڕق و کینەی زۆریـان لە (نۆرماندییەکان) و پاپا پەیداکرد، ئەمەش هۆکارێکی ئەرێنی بوو بۆ (هێنری). بەمشـێوەیە پاپا لە مەنفاکەیدا مایەوە؛ هەتا لە مانگی مایۆی ساڵی (١٠٨٥ ز)دا کۆچی دوایی کرد[3].

---

(١) السيد الباز العريني: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٤٥٨.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٠٥.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣٢.

**(هێنری پێنجەم ١١٠٦-١١٢٥ ز)**

(هێنری پێنجەم) بە میرات تەختی پاشایەتی ئەڵمانیای بۆ مایەوە و لەنێوان ساڵانی (١١٠٦-١١٢٥ ز) فەرمانڕەوایەتی کرد، لەگەڵ وەرگرتنی پۆستی پاشایەتی؛ ململانێ و ناکۆکی پاپاشی بۆ مایەوە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (هێنری پێنجەم) چەندین پاپا دەسبەکاربوون کە سەرقاڵی جەنگە خاچییەکان بوون بۆ سەر گێتی (ئیسلامی)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مافانەیان لەیادنەچوو کە پاشاکان لێیان زەوت کردبوون بەگوێرەی تێڕوانینی خۆیان؛ بەتایبەتی بابەتی دووبارەبووەوەی ململانێیی. کاتێک (پاپا کالکتسی دووەم ١١١٩-١١٢٤ ز) تەختی پاپایی وەرگرت؛ ویستی ئەو ململانێیە یەکلایی بکاتەوە، چونکە ئەو ململانێیە لە بەرژەوەندی هیچ کامێکیاندا نەبوو، بەم هەناسەیەوە پاپا کۆنگرەی یەکلاکردنەوەی (ورمز)ی بەست لە ساڵی (١١٢٢ ز). بەگوێرەی ئەم کۆنگرەیە؛ پاپا مافی ئەوەی دەبێت کە پیاوانی ئایینی دابمەزرێت، بە پشبەستن بەوەی سەرۆکی کەنیسەیە. هاوکاتیش پیاوانی ئایینی کە پلەوپایەی علمانیان هەبوو لە دەوڵەتدا؛ پێویستە ملکەچی ئیمپڕاتۆر بن. ئەم کۆنگرەیە زیاتر لە بەرژەوەندی پاپادا بوو؛ چونکە تەنها ئەو پیاوە ئایینیانەی زەوییان وەرگرتبوو ملکەچی ئیمپڕاتۆر بوون، واتە هەموو پیاوانی ئایینی ملکەچی ئیمپڕاتۆر نەبوون. سەرەڕای ئەوەش ئەم کۆنگرەیە نەیتوانی ململانێی نێوان ئەم دوو لایەنە کۆتایی پێ بهێنێت کە ئامانجی سەرەکییان وەرگرتنی دەسەڵاتبوو لە ئەورووپادا[1]، بەتایبەتی دوای ئەوەی پاپا دەسەڵاتی فراوانبوو، ئەمەش لە ئەنجامی هەڵمەتەکانی خاچییەکان؛ چونکە پاپا داینەمۆ و بزوێنەری ئەم هەڵمەتانەبوو. ئەمانە لە لایەکەوە؛ لە لایەکی دیکەشەوە دەرەبەگەکانی (ئەڵمانیا) دەستیانکرد بە فراوانکردنی ناوچەکانیان، ئەمەش بووە هۆکارێک کە دەسەڵاتی دەرەبەگەکان فراوانتر بێت لەسەر هەژماری ئیمپراتۆری. بەڵام هەندێک لە دەرەبەگەکان چوونەپاڵ ئیمپڕاتۆر، ئەمەش بووە هۆکاری سەرەکی دروستبوونی (پارتی جبلین) کە لایەنگری ئیمپڕاتۆر بوون، هەروەها (پارتی جولفین) کە لایەنگری پاپا بوون[2].

---

(١) عبد الامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج/١، ص٢٠٦.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٥٥.

له سەردەمی (هێنری چوارەم)دا، لایەنی براوە لە ململانێی نێوان پاپایەتی و ئیمپراتۆریدا؛ خانەدانەکانی (ئەڵمانیا) و ئەسقەف و سەرۆکی دێرەکان بوون. ئەمانە سەرکەوتووبوون لە قۆستنەوەی لاوازی (هێنری پێنجەم) کە هەر خۆیان هێنابوویانە سەر تەختی پاشایەتی. بەمشێوەیە هێزی دەرەبەگایەتی لە (ئەڵمانیا) لە پەرەسەندندا بوو، لە هەمان کاتدا (هێنری) سەرکەوتووبوو لە کۆکردنەوەی هەموو هێزەکانی (ئەڵمانیا) و واژووکردنی ڕێکەوتن لەگەڵیاندا. بەمشێوەیە توانی هێز و شکۆ بۆ پاشای (ئەڵمانیا) بگێڕێتەوە و هێرش و مەترسییە دەرەکییەکانی (هەنگاریا و بۆهیمیا و پاپاوییەتی) ڕابوەستێت. (هێنری پێنجەم) لە جەنگەکانیدا دژ بە هەنگاریا و بۆهیمیا) توانی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، بەمەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پاپایەتی یەکلایی بووەوە[1]. ململانێی (هێنری پێنجەم) و دەسەڵاتی پاپاوی لەنێوان سالانی (١١١٠- ١١٢٢ز) بەردەوامبوو و درێژەیخایاند، هەرچەندە ڕێکەوتننامەی (ورمز) گرژی بارودۆخەکەی کەمکردەوە؛ بەڵام کۆتایی بە ململانێی نێوان پاپایی و ئیمپراتۆری نەهێنا. ئەو ململانێیەی کە لە بنەڕەتدا لەسەر ئەوە دروستبووبوو ئایا کامیان دەسەڵاتی باڵایە و کێ مافی دەسنیشانکردنی پیاوانی ئایینی هەیە. (هێنری پێنجەم) لە ساڵی ( ١١٢٥ز)دا کۆچی دوایی کرد، خانەدانەکانی (ئەڵمانیا) بیری میراتگری تەختیان خستەڕوو کە (لۆسەری دووەمی سەکسۆنی ١١٢٥–١١٣٨ ز) بە پاشای وڵات هەڵبژێردرا، بەڵام (لۆسەر) نەیتوانی (ئەڵمانیا) دوای ئەو ململانێ دووروودرێژە بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی، هەروەها (لۆسەر) کەسێکی پەسەندکراو نەبوو لە لای فەرماندەکانی سوپا کە لە بنەماڵەی (هوهنشتاوفن) بوون[2].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٠٨.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣١.

## ئەڵمانیا لە سەردەمی بنەماڵەی هوهنشتاوفن (١١٢٥-١٢٥٤ ز)

دوای مردنـــی (لۆســـەری دووەم) لە ســـاڵی (١١٣٨ ز)؛ دوو پیـــاوی بەهێـــز لە (ئەڵمانیا) دەرکەوتن: یەکەمیان (هێنری خۆبەگەورەزان) بوو کە دۆقی (سەکسۆنیا و باڤاریـا) بـوو. دووەمیـان (کـونرادی کـچەزای هێنـری چـوارەم) بـوو لە بنەمـاڵەی (هوهنشـتاوفن) کە بە نـاوی چیاییەکـانیش نـاودەبران و لە هەرێمـی (سـەکسۆنیا) نیشتەجێبوون. (هێنری) پیاوێکی بەهێز و بەدەسەڵات بوو، میرەکان لێی دەترسان. بە هەمـان شـێوە کەنیسـەش حسـابی تایبـەتیان بـۆ دەکـرد، بـۆیە لای هەردوولا خۆشەویست نەبوو! میرەکان (کونراد)یان وەک پاشا هەڵبژارد، لێرەدا کێشەی نێوان (هێنری و کونراد)؛ یـان هەردوو بنەمـاڵەی (لوفییەکـان و هوهنشـتاوفن) دەسـتی پـێ کـرد و پریشـکەکەی دای لە (ئیتاڵیـا و ئەڵمانیـا). لـە سـەروبەندەدا (هێنـری پێنجەم) کـۆچی دوایـی کـرد؛ بەبێ ئەوەی کوڕێـک لە شـوێنی خـۆی بـەجێبهێڵێـت و شـوێنی بگرێتەوە، بۆیە ململانـێ لەسـەر فەرمـانڕەوایەتی (ئەڵمانیـا) لەنێـوان دوو بنەمـاڵەی مـەزن دەسـتی پـێ کـرد، ئەوانـیش بنەمـاڵەی (هوهنشـتاوفن) لە (سـوابیا) و لایەنگرانیشیان کە بە (جبلینن) ناسرابوون. لە بەرامبەردا بنەماڵەی (گوڵفەر) یاخود کۆمەڵی (ولفین) لە هەرێمی (باڤاریا). پاش (٢٧) ساڵ لە ململانێی توندی نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە؛ بنەماڵەی (هوهنشتاوفن) جڵەوی فەرمانڕەوایەتی تـەواوی (ئەڵمانیـا)ی گرتەدەست، لە بەناوبـانگترین و یەکەمـین پاشـای ئەو بنەمـاڵەیە (فریـدریکی یەکەم) بوو کە بە (فریدریکی باربرووسا) ناوبانگی دەرکردبوو[١].

### کۆنرادی سێیەم (١١٣٨-١١٥٢ ز)

کێشـە و ململانێـی چەکـداری لەنێـوان (کـونراد و هێنـری)دا بە هاتنەسـەرتەختی (کۆنراد) دەسـتی پـێ کـرد. سـەرەتا (کۆنراد) تـوانی هەرێمـی (باڤاریـا) لە (هێنـری) زەوت بکات، هەروەها هەوڵیشیدا کە هەرێمی (سەکسۆنیا) بگرێت. (هێنری) لە ساڵی (١١٣٩ ز)دا کـۆچی دوای کـرد، بەڵام (سەکسـۆنییەکان) بە مردنـی (هێنـری) دەسبەرداری شـەڕی (کونراد) نەبوون، (هێنـری شـێر)ی کـوڕی (هێنری)یـان کـردە دۆقـی سەکسـۆنیا کە تەمەنـی (١٠) سـاڵ بـوو. ئەم ململانێـیە تـا سـاڵی (١١٤٢ز) بەردەوام بوو، لەو ساڵەدا ڕێککەوتن لە نێوان هەر دوو لادا بەسترا. ئەم ڕێککەوتنە

---

(١) عبدالقادر احمد الیوسف: العصور الوسطی الاوروبیة، ص١٤٦.

هەرێمی باڤاریای بۆ ولفییەکان گێڕایەوە، جگە لە سەکسۆنیا. بەم شێوەیە جەنگی ناوخۆی کۆتایی پێهێنا. (کۆنراد) ساڵی (١١٣٩ز) کەوتە ململانێ لەگەڵ پاپا ئەنۆسنتی دووەم ١١٣٠-١١٤٣ ز)، چونکە چەند بڕیاریکی دەرکرد بوو کە لە عیانەیانەوە، پاپا دەسەڵات سەرەکی هەیە بەسەر پیاوانی ئایینیدا، ئەوەش مەترسییەکی گەورەی لە ناوەوە و دەرەوە کردە سەر تەختی (کونراد)، بۆیە ڕێککەوتنی لەگەڵ ولفییەکان کرد، بۆ ئەوەی دژی پاپا بوەستێت، بەڵام کونراد ئەو دەسەڵاتەی نەبوو لە دژی پاپا بوەستێت. کۆنراد ویستی بوشستیەکان بەرانبەر بە پاپا و میرەکان بسڕێتەوە، بۆیە لە ساڵی (١١٣٠ – ١١٨٠ ز)دا هاوشانی پاشا لویسی حەوتەمی فەرەنسی، بەشداری لە هەڵمەتی خاچییەکان کرد، بەڵام ئەم هەڵمەتە نوشستی هێنا و کۆنراد گەڕایەوە ئەڵمانیا، ئەمەش بووە مایەی بەهێزبوونی میرەکان. کۆنراد لە ساڵی (١١٥٢ ز) کۆچی دوایی کرد[١].

### فریدریك باربارۆسا (١١٥٢-١١٩٠ ز)

کاتێک (کۆنراد) کۆچی دوایی کرد؛ ململانێ لەنێوان (چیاییەکان و ولفییەکان) لە لووتکەدا بوو. (کونراد) تەنها یەک میراتگری هەبوو؛ ئەویش (فریدریکی یەکەم) بوو. بە هاتنی (فریدریک) ئارامی ولاتی گرتەوە، چونکە (فریدریک کوڕی فریدریکی دۆقی سرایا) و برای (کۆنراد) بوو، دایکیشی کە ناوی (جوس) بوو؛ خوشکی (هێنری متکبر) واتە پووری (هێنری شێر) بوو، بۆیە دانانی (فریدریک) مایەی ڕەزامەندی هەردوو بنەماڵەکە بوو. (فریدریک) توانی ئارامی بۆ ولاتەکەی بگەڕێنێتەوە، هەروەها هەردوو دۆقییەتی (باڤاریا و سەکسۆنیا)ی گەڕاندەوە بۆ (هێنری شێر). (فریدریک) هەر لە سەرەتاوە چاوی بڕیبووە تاجی ئیمپراتۆرییەتی؛ بەڵام دەبووایە سەرەتا ئارامی بۆ ولات بگەڕێنێتەوە. دوای گەڕاندنەوەی ئارامی؛ هەلێکی باشی بۆ ڕێکەوت، ئەویش بانگێشتکردنیبوو لە لایەن (پاپا یوجین سێیەم ١١٤٥-١١٥٣ ز) بۆ یارمەتیدانی لە دژی خەڵکی (ڕۆما و نۆرماند)؛ بەرامبەر بە پاداشتکردنی تاجی ئیمپراتۆری، هەربۆیە (فریدریک) لە ساڵی (١١٥٤ ز) بەرەو (ڕۆما) چوو، بەڵام بەر لە گەشتی؛ (پاپا یوجین) کۆچی دوایی کردبوو، لەبری ئەو (هادریانی چوارەم ١١٥٤-١١٥٩ ز) بووبووە پاپا، لە کاتی ڕێوڕەسمی (تتویج) کردندا؛ (فریدریک) ئەوەی ڕەتکردەوە کە جڵەوەی ئەسپی پاپا بگرێت کە هەر وەک نەریتێک بوو، بۆیە

---

(١) محمود سعيد عمران: س. پ، ل٢٣٢.

پاپا (تتویج) کردنی (فریدریکی) ڕەتکردەوە! (٢) ڕۆژ گفتوگۆی توند لەنێوان پیاوانی ئیمپڕاتۆر و پاپادا بەردەوامبوو؛ هەتا بڕیاردرا دووبارە ڕیوڕەسمەکە نوێبکرێتەوە[1].
ئیدی (فریدریک) ڕازیبوو بەوەی جڵەوی ئەسپی پاپا بگرێت، ئینجا پاپا (فریدریک)ی (تتویج) کرد و هەرێمی (لومباردیا) بووە ناوچەی ژێردەسەڵاتی (فریدریک)، بەڵام هەندێک لە شارەکانی نەچوونە ژێر ڕکێفی (فریدریک) و ڕازی نەبوون بەو بڕیارە، بۆیە لە ساڵی (١١٥٨ ز) هێرشی کردە سەریان. (فریدریک) نیازی وا بوو کە دەسەڵات بسەپێنێت بەسەر شارە کەنار دەریاییەکانی (ئیتاڵیا)، هەروەها زاڵ ببێت بەسەر بازرگانی (ئیتاڵیا) لە دەریای سپی ناوەڕاستدا، بەڵام کێشەکە لەگەڵ پاپادا تازەبووەوە، کاتێک (فریدریک) دەسەڵاتی سەپاند بەسەر زەوییەکانی پاپادا؛ پاپا نیگەرانی دەربڕی، (فریدریک) گوێی بەمە نەدا، بۆیە پاپا بڕیاری بێبەریکردنی دژی (فریدریک) دەکرد، بەڵام (فریدریک) لە ڕامیاری خۆی پاشگەزنەبووەوە و گەمارۆی (میلانۆ)یدا و دوای (٣) ساڵ داگیریکردەوە و دواتریش سووتاندی! ئەم کارەی دەنگدانەوەیەکی نەرێنی لە (ئیتاڵیا) هێنایەکایەوە و شارەکانی دیکەش لە خۆیان ترسان، بۆیە هاوپەیمانییەکیان پێکەوەنا و ناونرا "کۆمەڵەی لۆمباردی (١١٦٨ ز)".
بەم هاوپەیمانییە توانیان بەرەنگاری (هێنری) ئیمپڕاتۆرییەت ببنەوە و چەندین سەرکەوتن تۆماربکەن؛ لەوانەش شەڕی (لینانۆ) لە ساڵی (١١٧٦ ز). لە ساڵی دواتر واتە (١١٧٧ ز) ڕێکەوتنی ئاشتی لەنێوان پاپا و (فریدریک) بەسترا و ناونرا ڕێکەوتنی (ڤینیسیا). بەپێی ئەم ڕێکەوتنە؛ شارەکانی (ئیتاڵیا) ئۆتۆنۆمیان بەدەستهێنا و هاوپەیمانی کوڕەکەی لە (لۆمباردی) نەمان. (فریدریک) دەسەڵاتی ناوی (ڕاسمی) بەسەر ئەو شارەدا پێسپێردرا. فردریک بارباڕووسا (فریدریکی ڕیش سوور) بە پاشایەکی (ئەڵمانی) جیاواز دادەنرێت لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا، باڵا بەرز و بەهێز و زیرەک بوو، باوەڕی تەواوی بە بیری ئیمپڕاتۆرییەتی هەبوو، بەرقەراربوونی ئاسایشی وڵاتی بە هۆکاری یەکەمی بەدیهێنانی خەونی ئیمپڕاتۆری دادەنا، لەسەر ئەو بنەمایە دەسپێشخەری ئاشتی لەگەڵ دوژمنەکانیدا (کۆمەڵی ولفیین) کرد، هەروەها (باڤاریا)ی بە (هێنری شێر) کە بەهێزترین فەرمانڕەوای (ئەڵمانیا) بوو بەخشی، لەگەڵ ئەوەشدا زەوی بە هەموو فەرمانڕەواکانی دیکەش بەخشی، هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ پاپادا باش ببێت. (فریدریک بارباڕووسا) لە ساڵی (١١٥٤ ز)دا بەرەو (ئیتاڵیا) ڕۆیشت، لەوێ تاجی ئیمپڕاتۆری لەسەرنرا و دواتر

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا فی العصور الوسطی، ج١/ ص٢٠٩.

ەرایەوە بۆ (ئەڵمانیا). لە ساڵی (١١٥٧ ز) کێشەیەکی توند لەسەر سەرچاوەی دەسەڵات لەنێوان لایەنگرانی ئیمپڕاتۆر و پاپادا دروستبوو[١].

لە یەکێک لە بۆنەکاندا لایەنگرێکی پاپا کە کاردیناڵ (ڕۆلاند) بوو، ئەم پرسیارەی وروژاند: "ئەگەر ئیمپڕاتۆر شەرعییەتی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی لە پاپاوە وەرنەگرێت؛ ئەوا لە کێی وەردەگرێت؟" ئەم پرسیارە ئیمپڕاتۆری تووڕەکرد و پاڵپێوەنا هەتا بڵاوکراوەیەکی گشتی دەربکات کە تێیدا هاتووە: "ئیمپڕاتۆر هێز و دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی لە بەزەیی و ویستی خوداوە سەرچاوەی گرتووە". پاپا لەم بوارەدا پاشەکشەیکرد؛ ئەوەشی ڕاگەیاند کە جگە لە هەڵەتێگەیشتنێک کە لەنێوانیاندا ڕوویداوە هیچی دیکە نییە. (فریدریک) لە ساڵی (١١٥٨ ز) جارێکی دیکە ڕوویکردە ناوچەکانی باکووری (ئیتاڵیا)؛ چونکە لەوکاتەدا چەند کۆمنیونات (فەرمانڕەوایەکی ناوچەیی) دروستبووبوون کە کاروباری خۆیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ بەڕێوەدەبرد. ئیمپڕاتۆر لە (ڕونساجیلیا) دانیشتنێکی گرێدا و تێیدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە؛ مافی ئیمپڕاتۆرە کە سەرپەرشتی کاروبارەکانی فەرمانڕەواییە ناوچەییەکانی باکووری (ئیتاڵیا) بکات. کاتێک شاری (میلانۆ) دژ بەم ڕامیارییە وەستا؛ ئیمپڕاتۆر هیچ سڵی لە ڕووخاندنی نەکردەوە[٢]. ئەم ڕامیارییەی ئیمپڕاتۆر لە باکووری وڵاتدا؛ (پاپا ئەدریانی چوارەم)ی ترساند و پێیوابوو ئامانجی ئیمپڕاتۆر هەرێمەکانی پاپاش دەگرێتەوە، بۆیە پاپا خێرا هاوپەیمانییەتییەکی لەگەڵ (سەقلیە) لە باشوور و شارەکانی باکووری (ئیتاڵیا)؛ا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیمپڕاتۆر پێکهێنا. پاپا لە ساڵی (١١٥٩ ز) کۆچی دوایی کرد، پاشان دووبەرەکی لەنێوان پیاوانی ئایینی لەسەر دیاریکردنی پاپا دروستبوو، بۆیە لە ناوخۆیاندا بوونە دوو کۆمەڵ. کۆمەڵێکیان دژ بە ئیمپڕاتۆر؛ کۆمەڵی بەرامبەریش لایەنگری ئیمپڕاتۆر بوون. نوێنەری کۆمەڵی یەکەم کە کاردیناڵ (ڕوناڵد) بوو بە ناوی (ئەسکەندەری سێیەم ١١٦٩-١١٨١ ز) ناسرا، نوێنەری ئیمپڕاتۆریش، (ڤیکتۆری چوارەم) بوو[٣].

ئیمپڕاتۆر ساڵی (١١٦٠ ز) لە (بافیا) کۆبوونەوەیەکی فراوانی بەست، بەڵام نوێنەری (پاپا ئەسکەندەری سێیەم) ئامادەنەبوو لەو کۆبوونەوەیەدا، ئەوە ڕاگەیەنرا کە (پاپا ڤیکتۆری چوارەم) پاپای ڕاستەقینەی گیتی مەسیحییەتە، بەڵام تێکڕای

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣٤.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الأوروبية، ص١٤٧.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى،ج١/ ص٢١٠.

وڵاتانی ئەورووپا (ئەسکەندەری سێیەم)یان بە پاپا دادەنا. (ئەسکەندەری سێیەم) هەوڵیدا بەرەیەکی یەکانگیر و بەهێز لە بەرامبەر ئیمپڕاتۆری (ئەڵمانی) پێکبهێنێت. ئیمپڕاتۆر لە ساڵی (١١٦٧ ز)دا (ڕۆما)ی داگیرکرد، بەڵام بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (تاعوون)؛ سوپاکەی ڕۆمایان چۆڵکرد و ڕوویانکردەوە ناوچەکانی باکوور. لە هەمان ساڵدا (ڤینیسییەکان) سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لە پێکهێنانی دەستەیەکی بەهێز لە شارە (ئیتاڵییەکان) بە ناوی (دەستەی لۆمباردی). کاتێک ئیمپڕاتۆر هێرشیکردنەسەر؛ کەچی تێکشکان. لە ئەنجامی ئەم جەنگەدا لە ساڵی (١١٧٧ ز) ئاشتینامەی (ڤینیسیا) لەنێوان پاپا و (ئەسکەندەری سێیەم) و ئیمپڕاتۆردا بەسترا. بەپێی ئەم ئاشتینامەیە کۆتایی بە جیاوازییەکانی نێوانیان هات، هەروەها (فریدریک بارباroوسا) بەشداری لە هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکان کرد لە (ئاسیای بچووک)، سەرئەنجام لە ڕێگەدا (بەرەو زەوییە پیرۆزەکان) پێشڕەویکرد، بەڵام لەناو ئاودا خنکا! بەمشێوەیە کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتی کەسایەتییەکی لێهاتووی مێژوویی (ئەڵمانیا) لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هات[1].

### فریدریك بارباroوسا و پاپا

(ئیتاڵییەکان) لایەنگری پارتی (گولفییەکان) بوون، ئەمەش وایکرد کە (فریدریک) ناچاربکات هێرشبکاتە سەر (ئیتاڵیا)؛ بۆ لەناوبردنی لایەنگرانی پاپا کە شارەکانی (لۆمبارد) نوێنەرایەتییان دەکرد. شەڕ ماوەیەکی زۆری خایاند؛ بەڵام دواجار لە ساڵی (١١٧٦ ز)دا (فریدریک) توانی شاری (ڕۆما) بگرێت. هەر لە هەمان ساڵدا (فریدریک) لە شەڕی (لینیانۆ) دۆڕا، ئەمەش وایکرد کە بە ناچاری دانوستان لەگەڵ پاپادا بکات، ئەمەش دوای ئەوەی داوای لێبووردن و لێخۆشبوون لە (پاپا ئەلکسندری سێیەم ١١٥٩-١١٨٤ ز) بکات. ئەوکاتە پاپا لە شاری (ڤینیسیا-بونودقیە) دادەنیشت، ئەوە بوو (فریدریک) چووە لای و داوای لێبوردن و بەزەیی لێی کرد، پاپاش داواکەی بەجێهێنا و دواتریش ڕێکەوتنێک لەنێوان هەردوولا بەسترا، لە ساڵی (١١٧٧ ز) کە بە ڕێکەوتننامەی (ڤینیسیا) ناسراوە. ئەو ڕێکەوتننامەیە هیچ شتێکی ئەوتۆی زیاتر نەبوو لە (تسویەی ورمز)، جگە لەوەی کە ئاشتبوونەوەیەک لەنێوان (فریدریک) و کۆمەڵەی شارەکانی (لۆمباردی) بۆ ماوەی (٦) ساڵ بەسترا، هەروەها ئاشتبوونەوەیەک لەگەڵ (ولیەمی دووەمی نۆرماندی) بۆ ماوەی (١٥) ساڵ

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣٥.

ـستړا[1]، جگه لەم دوو نموونەیەی باسمانکردن، نموونەی دیکەش زۆرن کە باس
ـە ململانێی نێوان دەسەلاتی ئایینی (پاپا) و دەسەلاتی دونیایی (پاشا) دەکات؛ خراپ
ـوی دەرکردبوو، ئەم ناوەش بۆیە پێی گوتراوە چونکە هەردەم خەریکی ڕابواردن
و نێربازی بووە و دەسەلات و فەرمانڕوایی (نۆرماندی) فەرامۆشکردبوو. هەر لە
ـەردەمی ئەودا موسڵمانانی ئەفریقا (تونس) توانیان دەسەلاتی (نۆورماندی) لە
ئەفریقادا کۆتایی پێ بهێنن، ئەمەش لە ئەنجامی شۆڕشێک بوو لە دژی
نۆرماندییەکان).

دوای مردنی (ولیەمی یەکەم)؛ (ولیەمی دووەم ١١٦٦-١١٨٩ ز) هاتە سەر تەختی
دەسەلات کە بە (الطیب-باش) ناوی دەرکردبوو. ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە
پاشاکانی (نۆرماندی) بە هۆی پەرۆشیان بۆ ڕابواردن و خۆشییەکانی ژیانیان
تەمەنیان کورتبوو، بۆیە (ولیمی دووەم) لە تەمەنی (٤٠)ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و
کەسیش نەبوو شوێنی بگرێتەوە، بۆیە کوڕێکی ناشەرعی (ڕۆجەری دووەم)یان هێنا
بە ناوی (تانکرد) بۆ فەرمانڕوایی (سەقلیە). هاوکات ئیمپراتۆری ئەڵمانی (هێنری
شەشەم) ئامۆزای (ولیەمی دووەم)ی خواست کە ناوی (کنستانس) بوو، ئەمەش
وایکرد کە (هێنری) بە هەموو توانایەکەوە لە هەوڵی ئەوەدا بێت، باشووری (ئیتاڵیا
و سەقلیە) یەکبخات لەژێر دەسەلاتی خۆیدا. بۆ ئەم مەبەستە هاوپەیمانی لەگەڵ
شارەکانی (پیزا و جەنەوا) بەست کە بازرگانییەکانیان کەوتبووە ژێردەسەلاتی
نۆرمانییەکانەوە. لە ئاکامدا (هێنری) بە فەرماندەی لەشکرێکی یەکجار گەورەوە
چووەسەر (سەقلیە) و بەرامبەر بە (پالێرمۆ)ی پایەتەخت وەستا، کاتێک خەڵکی شار
ئەم لەشکرە گەورەیان بینی؛ بڕیاریاندا دەرگایان بۆ بکەنەوە. بەمشێوەیە (هێنری)
بوو بە پاشای (سەقلیە). دواتر (فریدریک)ی کوڕی شوێنیگرتەوە کە تەمەنی تەنها
(٣) ساڵان بوو، کەچی لە دواتردا بوو بە بەهێزترین و ڕووناکبیرترین فەرمانڕەوای
ئەورووپی لە سەدەی سیازدەیەمدا[2].

### فریدریکی دووەم (١٢١٢-١٢٥٠ ز)

(فریدریکی دووەم) تاکە میراتگری (هێنری شەشەم) بوو، بەڵام (فریدریک)
ئەوکات تەمەنی تەنها (٣) ساڵ بوو، بۆیە پشێوی بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ هەموو
ناوچەکانی (ئەڵمانیا)ی گرتەوە. جارێکی دیکە دوو بنەماڵە دێرینەکە (ولف و

(١) عبدالامیر محمد امین: س- پ ج١/ ص٢١١.
(٢) عبدالامیر محمد امین و: س. پ، ج١/ ص٢١١.

هوهنشتاوفن) لەسەر دەسەلات کەوتنەوە ململانێی یەکدی. ولفییەکان (ئۆتۆف برنزیک)یان وەک پاشا دەسنیشانکرد و بە (ئۆتۆی چوارەم) ناسرا، بەڵام بنەماڵەی هۆهنشتاوفن فلیپی مەزنی سوابیا ١١٩٧-١٢٠٨ ز)یان وەک پاشا دەسنیشانکرد کە بە (فلیپی چوارەم) ناسرا. ئەم ململانێیە ماوەیەکی دوورودرێژی خایاند، (فەڕەنسا و ئینگلتەرا و پاپا) ڕۆڵێکی کاریگەریان بینی لە جۆشدانی ئاگری ئەو جەنگەدا، ئەم ململانێیە هەتا ساڵی (١٢٠٨ ز) زۆر بەتوندی درێژەیکێشا، لەم ساڵەدا بە هۆی مردنی (فلیپی چوارەم) بارودۆخەکە هێور بووەوە. (ئۆتۆی چوارەم) بە هاوکاری (پاپا ئەنوسنتی سێیەم ١١٩٨-١٢١٦ ز) فەرمانڕەوایەتی وڵاتی کرد. بەڵام کاتێک (فریدریک) پێگەشت؛ جارێکی دیکە ئاگری دووبەرەکی و جەنگی ناوخۆیی هەڵگیرسایەوە. لەم جەنگەدا پاپا پشتی (فریدریک)ی گرت؛ چونکە لە کاتی مردنی باوکیدا (فریدریک) لەژێر چاودێری پاپادا بوو، بۆیە (فریدریک) لەم جەنگەدا سەرکەوتنی بەسەر (ئۆتۆ)دا بەدەستهێنا[1].ئەگەر لە چەند دەستەواژەیەکی کورتدا پەسنی (فریدریک) بکەین؛ ئەوا دەتوانین بڵێین جەنگاوەرێکی لێهاتوو و ڕامیاریزانێکی ڕۆشنبیر بوو، بە ئەندازەیەک گرنگی بە هونەر و زانست دەدا کە ڕۆشنبیری و جەنگاوەرییەکەی تێپەڕاندبوو! زمانزانییەکەی وایلێکردبوو بە چەند زمانێک بدوێت و بگرە هۆنراوەشی پێدادەنان، لە هەمان کاتدا شارەزایی لە فەلسەفە و پزیشکی و ئەندازیاری لە ئاستێکی باشدابوو، لەگەڵ هاونیشتمانییەکانیشیدا بە گیانێکی دوور لە دەمارگیری مامەڵەی دەکرد و وەک یەک تەماشای دەکردن، ئەمە لە کاتێکدا (مەسیحی و موسڵمان و جوو) لەژێر دەسەڵاتیدا بوون! کەسایەتییەکی نوێخوازی هەبوو و حەزی بە نوێگەری دەکرد و لە بەرامبەردا دژی کۆنەپەرستە بێکەڵکەکان دەوەستایەوە، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە مێژوونووس (ماتپیو پاریز) لەبارەیەوە بڵێت: "ئەو سەرسوڕهێنەرە بوو کە گیتی گۆڕی و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی وروژاند"! بەڵام ئەم ئیمپراتۆرە لێهاتووە لە بواری ڕامیاریدا بەراورد بە هاوسەردەمەکانی شکستیهێنا و نەیدەتوانی لەو ڕووەوە ڕکابەرێکی باش بێت، هۆکاری ئەم شکستەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو بۆچوونە پێشکەوتنخوازانەی کە دەریبڕی و لە ژیانیدا کاری بۆ دەکرد. بۆچوونەکانی (فریدریک) لەگەڵ جیهانبینییەکانی کڵێسا کە (هۆنۆریسی سێیەم ١٢١٦-١٢٢٧ ز) و (گریگۆری حەوتەم ١٢٢٧-١٢٤١ ز) بوون نەدەگونجا. هۆکاری ڕاستەوخۆی ئەم بەریەککەوتنەش

---

(١) فشر: تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٢٥٤.

ـەگەڕایەوە بۆ لکاندنی (ئیتاڵیا و سەقڵیە) بە تەختی ئیمپراتورییەتەوە، بەڵام پاپایی و هەندێک لە شارە (ئیتاڵییەکان) بەم لکاندنە ڕازی نەبوون[١]!

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی ئەم ململانێیەی نێوان ئیمپڕاتۆر و پاپا دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی ئیمپڕاتۆر سەبارەت بە هەڵمەتی خاچییەکان، ئیمپڕاتۆر کەسێکبوو پێش شمشێر ژیری بەکاردەهێنا. ئیمپڕاتۆر بڕوای بە توندوتیژی نەبوو؛ لەبەرئەوە لە هەڵمەتی پێنجەمی خاچیدا دواکەوت، پاپاش بڕیاری بێبەشکردنی بۆ دەرکرد! هەربۆیە لە دوای هەڵمەتی پێنجەم؛ هەڵمەتی شەشەمی خاچی ڕێکخست، بە شێوەیەک کە لەگەڵ خواستەکانی پاپادا یەکینەگرتەوە، هەموو ئەمانە پێکەوە ئاکامێکی ترسناکی بۆ ئیمپڕاتۆر هێنایە پێشەوە[٢].

جارێکی دیکە (فریدریک) و پاپا دژ بە یەکدی وەستان؛ ئەمەش کاتێک ڕوویدا کە ئیمپڕاتۆر ویستی سەرلەنوێ کاروباری وڵاتەکەی ڕێکبخاتەوە، ئەنجوومەنە گشتییەکانی لە نوێنەرانی خانەدان و پیاوە ئایینییەکان و خەڵکی شارەکان پێکهێنا. ئەم سیستمە پەرلەمانییە پێشکەوتنخوازییە لە هیچ کایەیەکی ئەو ڕۆژگارەدا و لە ناخی هیچ کام لە پاپا و ئیتاڵییەکاندا جێگای نەدەبووەوە. ناکۆکی و ململانێی نێوان پاپا و ئیمپڕاتۆر هەتا مردنی ئیمپڕاتۆر لە ساڵی (١٢٥٠ ز) درێژەیکێشا، لەپاش مردنیشی هەر بە سەرسوڕمان و جیاوازییەوە باسدەکرا، هەندێک لە خەڵکی بە مەزن و بلیمەت ناویان دەبرد؛ هەندێکی دیکەش بە بێباوەڕ و زەندیق[٣]!

## ئەڵمانیا لە پاش ساڵی (١٢٥٠ز)

(ئەڵمانیا) پاش ساڵی (١٢٥٠ ز) و لە ماوەی هەر دوو سەدەی یازدە و دوازدەدا بە بەهێزترین دەوڵەتی ئەورووپا دادەنرێت، بەڵام لە سەدەی سیازدەدا ئەم بەهێزییەی بەرەو لاوازبوون چوو! لە هەردوو سەدەی چواردە و پازدەشدا کە (ئینگلتەرا و فەرەنسا) دەرکەوتنی پاشایەتی بەهێز و گەشەسەندنی دەسەڵاتی ناوەندییان بەخۆیانەوە بینی؛ لە (ئەڵمانیا) دەسەڵاتی پاشایەتی تەواو لاوازبوو و بە جۆرێک کە دەسەڵاتی ناوەندی تێدا ئیفلیج بووبوو. هۆکاری ئەم لاوازی و دواکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێک:

١. بەردەوامبوونی بنەمای هەڵبژاردنی پاشا لەبری بنەمای بۆماوەیی، ئەمەش گەورەترین کێشەی دەسەڵاتبوو لە (ئەڵمانیا)، چونکە بە مردنی پاشا ململانێ لەسەر

---

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٣٨.

(٢) فشر:تاريخ أوروبا العصور الوسطى، ص٢٥٥.

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ص٢٤٠.

تەختی فەرمانڕەوایەتی دەستی پێ دەکرد، هەروەها بە جەنگی ناوخۆیی ڕووخێنەر و ماڵوێرانکەر کۆتایی بە کێشەکە دەهێنرا.

٢. بەهێزی دەرەبەگایەتی لە (ئەڵمانیا) و هەروەها دەرکەوتنی زیاتری دەمارگیری خێڵایەتی لەسەر هەژماری دەسەڵاتی پاشایەتی؛ کە ئەمەش بە پێچەوانەی شێوازی دامەزراوەیی (فەڕەنسا و ئینگلتەرا) بوو.

٣.لە هەر دوو سەدەی دوازدەیەم و سیازدەیەمدا پاشاکانی (ئەڵمانیا) بە کاروباری ئیتاڵیاوە سەرقاڵبوون، بە جۆرێک کە کاروباری ناوخۆی ئەڵمانیایان فەرامۆشکردبوو.

٤.ململانێی نێوان پاشایەتی و پاپایەتی ماوەیەکی دوورودرێژی خایاند، لە هەموو جارێکدا پاشایەتی بە برینێکی سەختەوە لەم ململانێیە دەهاتە دەرەوە[١].

دوای مردنی (فردریک)؛ پشێویەکی (٣٣) ساڵی تەواوی (ئەڵمانیا)ی گرتەوە، بەڵام (ڕودڵف ئوف هابسبرگ) لە ساڵی (١٢٧٢ ز) توانی دەسەڵاتی وڵات بگرێتەدەست، هەروەها پارێزگاری لە یەکێتی (ئەڵمانیا) بکات و سەرلەنوێ کاروباری وڵات ڕێکبخاتەوە، ئەم بنەماڵەیە (بنەماڵەی ڕودڵف) توانیان لەوساتەوە هەتا جەنگی یەکەمی گیتی (١٩١٤-١٩١٨ ز) پارێزگاری لە فەرمانڕەوایەتی خۆیان بکەن بەسەر (ئەڵمانیا)دا. هەرچەندە (فریدریک) سەرکەوتنی تەواوی لە (ئیتاڵیا) بەدەستنەهێنا، بەڵام لە ناوچەکانی دیکەی ئەورووپا قەرەبووی کردەوە، توانی لە (هەنگاریا، پۆڵندا و بۆهیمیا) دەسەڵات بسەپێنێت، هەروەها دەسەڵاتی دانانی هەندێک لە پاپای ئایینیشی بەدەستهێنا. (فریدریک) ویستی دەسەڵاتی بەسەر دەرەوەی ئەورووپاشدا بسەپێنێت، بەمە ئیمپراتۆرییەتی دێرینیان زیندوو بکاتەوە، بۆیە بەشداری هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکانی کرد، هەربۆیە لە ساڵی (١١٩٠ ز) لە ڕێگای وشکانییەوە بەرەو (زەوییە پیرۆزەکان) هەنگاوینا، بە فەرماندەیی لەشکرێک کە ژمارەیان دەگەیشتە (١٠٠٠٠٠) جەنگاوەر و بە (ئاسیای بچووک)دا پێشڕەویانکرد. ئەم هەڵمەتە ڕیچاردی یەکەم (شێردڵ) پاشای ئینگلتەرا (فلیپ ئۆگستس) پاشای فەڕەنسا (فریدریک بارباروسا) و پاشای ئەڵمانیا بەشداریان تێداکرد، بەڵام (فریدریک) خەونەکانی نەهاتەدی؛ چونکە لە هەمان ساڵ و لە ڕووباری (سالف) کە دەکەوێتە هەرێمی (فیلیقیە) لە (ئاسیای بچووک) خنکا[٢].

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢١٨.

(٢) عبدالامیر محمد امین و: تاريخ أوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٢٢٠.

# بەشی پازدەیەم

-فەرەنسا پاش ڕێکەوتننامەی فردان
-دەرکەوتنی بنەماڵەی کاپیتە
-گەشەکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ماوەی سەدەی دوازدەیەمدا
-پەرەسەندنە ناوخۆییەکان
-پەرەسەندنە دەرەکییەکان
-فیلیپی دووەم (١١٨٠-١٢٢٣ ز)
-لویسی نۆیەم (١٢٢٦-١٢٧٠ ز)
-لویسی نۆیەم و جەنگی خاچییەکان
-فەرەنسا پاش لویسی نۆیەم
-فیلیپی چوارەم (١٢٨٥-١٣١٤ ز)
-کۆتایی دەسەڵاتی بنەماڵەی کاپیتە
-جەنگی سەد ساڵە
- هۆکارەکانی جەنگی سەد ساڵە
- جان دارك
- فەرەنسا لە کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەمدا
لویسی پازدەهەم (١٤١٦-١٤٨٣ ز)

## فەڕەنسا پاش ڕێکەوتننامەی فردان

### دەرکەوتنی بنەماڵەی کاپیتە

یەکێک لە گرنگترین ئەنجامەکانی ڕێکەوتننامەی (فردان) لە ساڵی (٨٤٣ ز)دا؛ دەرکەوتنی هەردوو دەوڵەتی (فەرەنگی خۆرهەڵات و فەرەنگی خۆرئاوا) بوو کە لە پاشاندا بە (فەڕەنسا و ئەڵمانیا) ناسران و ڕۆڵێکی کاریگەریان لە گۆڕەپانی ڕامیاری ئەورووپادا بینی. لەپاش ئەم ڕێکەوتننامەیە و لە ماوەی نێوان هەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمدا؛ پشێوی ڕامیاری سەرجەم ناوچەکانی ئەورووپای گرتەوە، ئەویش بە هۆی هێرشە کاولکارییەکانی (ڤاندالەکان) لە باکوورەوە بوو کە کردیانە سەر خۆرئاوای ئەورووپا. دەسەڵاتی پاشاکانی (کارۆلینجی) لەم دوو دەوڵەتەدا تەواو لاواز ببوو، ئەم بارودۆخە ناهەموارە وای لە ژمارەیەک (کۆنت) کرد کە زۆر بەهێزتر لە پاشای (کارۆلینجی) ڕووبەڕووی ئەو ڕەوشە نالەبارە ببنەوە[1].

(ئەدەو)ی گەورەی کۆنتی (پاریس) لە ساڵی (٨٨٦ ز) توانی بەرپەرچی هێرشەکانی باکوور بداتەوە، لە بەرامبەریشدا خانەدانەکانی (فەڕەنسا) دانیان بە تواناکانیدانا، هەروەها بە پاشای (فەڕەنسا) هەڵیانبژارد. نزیکەی سەدەیەک لە ململانێدابوو لەگەڵ پاشاکانی (کارۆلینجی). لەبەرئەوەی دەسەڵاتەکەی سەقامگیر نەبوو؛ لە ساڵی (٩٦٧ ز) یەکێک لە نەوەکانی (ئەدەو) بە ناوی (هیو کاپیت) توانی بچێتە سەر تەختی پاشایەتی. لێرەوە قۆناغێکی نوێ لە سەردەمی ئەم بنەماڵەیەدا سەریهەڵدا کە نزیکەی (٣) سەدە ئەم بنەماڵەیە فەرمانڕەوایەتی فەڕەنسایان گرتەدەست[2].

(فەڕەنسا) لە ساڵی (٩٨٧ ز) لە کۆمەڵە دەوڵەتێکی دەرەبەگی قەوارە جیاواز پێکهاتبوو، واتە بە هیچ جۆرێک خاوەن وڵاتێکی یەکگرتوو نەبوون، گرنگترینی ئەو دەوڵەتانەش کە دواتر فەڕەنسایان لێپێکهات بریتیبوون لە: (ئۆکۆتین، ئەنگوا، بلوا، بڕیتانی، برگوندیا، فلاندرز، مین، تولووز، نۆرماندیا، بوتوو). هەریەک لەم دەوڵەتە دەرەبەگیانە لە لایەن میرێکی دەرەبەگەوە فەرمانڕەوایەتی دەکران، لە ڕاستیشدا فەرمانڕەوایەتییەکی سەربەخۆیان هەبوو، خانەدانەکانی سنووری ژێردەسەڵاتی

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٢٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٠٧.

گوێڕایەڵی تەواویان دەکرد. بە هۆی ئەوەوە کە گەورە و دەرەبەگ و فەرمانڕەوای ڕاستەوخۆیان هەبوو؛ بە هەمان شێوە ئەوانیش شوێنکەوتەیی خۆیان بۆ پاشای (فەرەنسا) دووپات دەکردەوە، بەو پێوەری ئەوەی کە پاشا مەزن و دەرەبەگی باڵابوو لە فەڕەنسادا[1].

لە سەرەتادا فەرمانڕەوایەتی (کاپیتە) لەسەر نیازپاکی بەرامبەر دەرەبەگە شوێنکەوتەکانی (هەردوو دەستەکە؛ واتە چ پیاوانی ئایینی و چ دەرەبەگە دونیاییەکان) ڕاوەستابوو، چونکە دەسەڵاتێکی کرداری بەسەریاندا نەبوو! پاشای (فەڕەنسا) کاروبارەکانی وەکوو تێکرای میرە دەرەبەگەکانی فەڕەنسا وا بوو، بەڵام ئەوەی ئەمی لەوان جیادەکردەوە؛ بریتیبوو لە بوونی دەوڵەتێکی تایبەت بە پاشاکەوە کە بە (خاکی پاشایەتی) ناسرابوو، یاخود زۆرجار دوورگەی فەرەنساشی پێدەگوترا. ئەم دوورگەیە کەوتبووە ناوەڕاستی فەڕەنساوە و لە هەموو لایەکەوە بە دەوڵەتە دەرەبەگییەکان دەورەدرابوو، لە لایەنی ڕووبەر و دانیشتووانیشەوە؛ دوورگەکە لە زۆرینەی دەوڵەتە دەرەبەگییەکانی ناو (فەڕەنسا) بچووکتربوو[2].

واتە مێژووی (فەڕەنسا) لە ماوەی ئەو (٣) سەدەیەدا (نۆیەم و دەیەم و یازدەیەم)؛ مێژووی میرنشینە دەرەبەگییەکانە, لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتی بنەماڵەی (کاپیتە) لە ماوەی ئەو (٣) سەدەیەدا لاوازبوو؛ بەڵام چەند هۆکارێک هەبوو کە لە بەرژەوەندیاندابوو و هاوکاریکردن لە هێشتنەوەی دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لەسەر (فەڕەنسا)دا، گرینگترینی ئەو هۆکارانەش بریتیبوون لە:

١.ناکۆکی و ململانێی نێوان دەوڵەتە دەرەبەگییەکانی ناو (فەڕەنسا) کە بەردەوام هێزی دەمژین و لاوازی دەکردن، لە بەرامبەریشدا دەسەڵاتی پاشایەتی وەکوو هێزێکی ناوەندی مایەوە.

٢.دانانی نەریتی شازادەی جێنشین (ولایة العهد) هەر لە سەرەتای دەسەڵاتیانەوە؛ باوک لە ژیانیدا کوڕی گەورەی دیاریدەکرد کە لەگەڵ خۆیدا و لە فەرمانڕەوایەتیدا هاوبەشی بکات، لەپاش خۆشی دەسەڵات بگرێتەدەست. بەمشێوەیە

(١) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٥٦.

(٢) السيد الباز العريني: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٣٤٥.

بنەماڵەی (کاپیتە) توانیان هەتاوەکوو ساڵی (١٣٢٨ ز) پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆیان بکەن[١].

٣.خاکی پاشایەتی یاخود دوورگەی (فەڕەنسا) بە بەراورد لەگەڵ تێکڕای میرنشینە دەرەبەگییەکانی دیکە تایبەتمەندییەکی جیاوازی هەبوو، ئەویش بریتیبوو لە هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی. دوورگەی (فەڕەنسا) دەکەوێتە ناوەڕاستی فەڕەنساوە، واتە لەنێوان (سین و ئەللور)، شوێنێکی ستراتیژی هەبوو؛ چونکە لەسەر ڕێگای گرنگی بازرگانی نێوان دەریای (سپی ناوەڕاست و ناوچە ئینگلیزییەکان) بوو, بۆیە ئەم شوێنە بە دڵی (فەڕەنسا) دادەنرا. بنەماڵەی (کاپیتە) بۆ بڵاوکردنەوە و سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر هەموو ناوچە جیاوازەکانی وڵاتدا؛ هەرکاتێک بیانویستایە لێوەی دەردەچوون.

٤.کڵێسای (مەسیحی) بە هەموو سەنگێکییەوە لەپشت بنەماڵەی (کاپیتە) ڕاوەستابوون، تەنها دەسەڵاتی ئەوانیان بە دەسەڵاتی شەرعی لە (فەڕەنسا) دادەنا، وایان دەبینی کە سەرکەوتنی ئەوان یەکێتییەکی ڕامیاری لە وڵاتدا بەدیدێنێت، ئەم تێڕوانینەی کڵێساش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە پێیان وا بوو یەکێتی ڕامیاری بنەڕەتی یان یەکێتی ئایینییە لە دەوڵەتدا.

٥.سەرەڕای هەموو ئەو خاڵانەی باسمان لێوەکردن؛ بنەماڵەی (کاپیتە) لە لایەنی تیۆریشەوە پاشای (فەڕەنسا) بوون، پاشاش بەپێی نەریتی دەرەبەگی بە مەزنترین و باڵاترین کەسی چوارچێوەی دەوڵەت دادەنرێت, بۆیە پێویستە هەموو میرەکان هەرچەندە پلەیان بەرز بێت؛ ملکەچی بکەن و شوینکەوتەی بن. لە بارودۆخێکی گونجاویشدا پاشا دەتوانێت ئەو دەسەڵاتە بۆ کەتوارێکی بەرجەستەکراو بگۆڕێت[٢].

## گەشەکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ماوەی سەدەی دوازدەیەمدا

لە ماوەی سەدەی دوازدەیەمدا چەند گۆڕانکارییەکی ناوخۆیی و دەرەکی ڕوویدا و بارودۆخێکی گونجاوی بۆ چەسپاندن، بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی و فەرمانڕەوایەتی ناوەندی لە (فەڕەنسا) ڕەخساند. چەند پاشایەکی بەهێز و لێهاتوو دەرکەوتن و سوودیان لەو گۆڕانکاری و پەرەسەندنانە وەرگرت، دواتر قۆستیانەوە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٣٧.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٩٢.

بۆ بونیاتنانی یەکێتییەکی ڕامیاری بەهێز کە بووە بناغەیەکی بەهێز بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی پێشکەوتوو و یەکانگیر لە ئەورووپادا[1].

## پەرەسەندنە ناوخۆییەکان

لە سەدەی دوازدەیەم دەسەڵاتی بنەماڵەی (کاپیتە) لەسەر هەژماری دەسەڵاتی خانەدانە دەرەبەگییەکان شکۆمەندبوونی زیاتری بەخۆوەدی. (لویسی شەشەم ١١٠٨-١١٣٧ ز) یەکەم پاشای ئەو بنەماڵەیە بوو کە بەم ئاڕاستەیەدا هەنگاوینا. سەرەتای کارەکانیشی بە پاککردنەوە و نەهێشتنی پێگەی خانەدانەکان لە خاکی پاشایەتیدا دەستی پێ کرد. لە ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا توانی سەرکەوێت بەسەر هەموو خانەدانە دەرەبەگییەکان و ملی پێ کەچکردن بەرامبەر بە دەسەڵاتی پاشایەتی لەو خاکەدا. (لویسی شەشەم) هەر بە فەرمانڕەوایی وازی نەهێنا؛ بەڵکوو هەوڵیدا کە دەسەڵاتی بۆ ناوچەکانی دەرەوەی خاکی پاشایەتی فراوان بکات و پەلبهاوێژێت، ئەمە بووە ڕێگایەک و پاشاکانی پاش خۆشی هەمان ڕامیاریان پەیڕەوکرد. ئەو پەرەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی لەوکاتەدا لە (فەڕەنسا) ڕوویاندا؛ پاشاکانی (فەڕەنسا)ی هاندا کە بەرەو بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی هەنگاو بنێن، لەو پەرەسەندنانەش؛ گەشەکردنی شارەکان و بەهێزبوونی بازرگانی و دەرکەوتنی چینی بۆرژوازی بوون[2].

لە نیوەی دووەمی سەدەی دوازدەیەمدا؛ شارەکانی باکووری (فەڕەنسا) بوژانەوە و قەوارەی تایبەت بە خۆیان پێکهێنا. چینی بۆرژوازیش وەکوو چینێکی چالاک و کارای تازەدەرکەوتووی شارەکان، پاراستنی ئەو قەوارانەیان خستبووە ئەستۆی خۆیان، هەروەها دژ بە هەموو ئەو پشێویانەی کە خانەدان و دەرەبەگەکان دروستیاندەکرد ڕادەوەستان. بۆرژوازەکان داوایان لە پاشاکانی (فەڕەنسا) کرد کە هاوکاریان بکەن، پاشاکانیش دەیانزانی کە بەرژەوەندی هاوبەشیان لەگەڵ بۆرژوازەکاندا هەیە، ئەو بەرژەوەندیانەش لە زیادبوونی دەسەڵاتی ناوەندی؛ لەسەر هەژماری دەرەبەگەکان خۆی دەنواند، بۆیە پاشاکان وەڵامیاندانەوە و کۆمەکیان کردن. دەسەڵاتی شاهانە پێکای کە بۆرژوازێتی وەکوو

---

(١) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ج١/ ص١٩٢.

(٢) محمود سعید عمران: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ص٢٥٧.

هوپەیمانێکی خۆی هەڵبژارد، لەبەرئەوەی ئەم چینە گەشەیسەند و و چالاکبوو، هەروەها دەیتوانی بە پارەوپوول پشتیوانی لە پاشا بکات و دەسەڵاتی بەهێز بکات[1].

لەپاڵ دەرکەوتنی بۆرژوازێتیدا؛ پەرەسەندنی بازرگانی بووە هۆیەکی گرنگ بۆ بوژانەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە وڵاتدا، لە دیاردەکانی ئەو بوژانەوەیەش: زیادبوونی ئاڵوگۆڕی دراو بوو کە پاشاکان سوودێکی زۆریان لێ وەرگرت، بەم زیادبوونەی دراو؛ پاشایەتی توانی سوپایەکی تۆکمە و بەهێز دروست بکات، بەمەش لە پشتبەستن بە چەکدار و سوارەی خانەدانەکان ڕزگاری بوو. پاشا توانای دامەزراندنی کارمەندانی لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا هەبووە. بەمشێوەیە پاشا سەرکەوتووبوو لە پەرەپێدانی دامودەزگایەکی کارگێڕی گونجاو، بە پشتبەستن بەو کارمەندانەی کە توانا و لێهاتوویان هەبووە، هەرکاتێکیش پاشا پێویستی پێیان نەمایە؛ لەکاریدەخستن بەبێ ئەوەی هیچ گیروگرفتێکی بۆ دروستبکەن[2].

لە ساڵی (١١٧٣ ز) پەرەسەندنێکی بەرچاو لە ئەنجوومەنە دەرەبەگییەکاندا ڕوویدا، کۆمەڵەیەک هەبوو کە بنەڕەتەکەی دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی (کارۆلینجییەکان)، ئەم کۆمەڵەیە گەورە دەرەبەگە ئایینی و دونیاییەکانی لەخۆگرتبوو، لە هەندێک کاتدا لەگەڵ پاشادا کۆدەبوونەوە. ئەم کۆمەڵەیە لە پێکهاتە و دەسەڵاتەکانیدا بەرنامەیەکی ئاشکرای نەبوو؛ زۆرکات ئاستەنگێک بوو لەبەردەم گەشەکردنی دەسەڵاتی پاشایەتیدا، لە سەدەی دوازدەهەمدا گۆڕانکارییەکی گەورە بەسەر ئەو کۆمەڵەیەدا هات و لێرەشەوە دوو ئەنجوومەنی لێکەوتەوە:

**یەکەم/** ئەنجوومەنی شاهانە کە ئەرکەکەی بریتیبوو لە سەرنجدان لە کاروبارە گشتییەکان.

**دووەم/** پەرلەمان کە ئەرکی ئەمیش بریتیبوو لە سەرجدان کاروبارە دادوەرییەکان.

لە سەرەتادا هەردوو ئەنجوومەنەکە لە خانەدانەکان پێکهاتبوون، بەڵام بە شێوەیەکی قۆناغبەندی پاشا کارمەندی دیکەی دادەنا کە پەیوەندیداریێتیان بۆ چینەکانی دیکە هەبوو.

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٤١.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٤.

بەکورتی فەرەنسا لە سەدەی دوانزەهەمدا کۆمەڵێک گۆڕانکاری ناوخۆی گرنگی بەخۆوە دی، هەر لە چەسپاندنی دەسەڵات و هەژموون(هیمنە)ی پاشایەتی بەسەر زۆر شوێنی گرنگی دەوڵەتدا، پەرەسەندنی بازرگانی، دەرکەوتنی چینی بورجوازێتی و زیادبوونی دراو، ئەم گۆڕانکارییانەش زیاتر لە ڕاژەکردنی دەسەڵاتی پاشایەتیدا بوو[1].

### پەرەسەندنە دەرەکییەکان

لە ماوەی سەدەی دوازدەیەمدا؛ ئەو پەرەسەندنانەی دیکە کە پشکیان هەبوو لە بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندی و هەروەها پتەوکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی لە (فەڕەنسا)دا، بریتیبوو لە زیادبوونی هێزی پاشاکانی (نۆرماندیا) لە (ئینگلتەرا) و حەزە فراوانخوازییەکەیان لە زەوییەکانی (فەڕەنسا)دا. وەک لە پێشدا باسمان لێوەیکرد؛ (ولیەمی نۆرماندی یەکەم) گەورەی کۆنتی (نۆرماندیا) بوو، لە بنەڕەتیشدا شوێنکەوتەیەکی دەرەبەگی (Vasse) پاشای (فەڕەنسا) بوو، ئەویش بەو پێوەرەی کە فەرمانڕەوای هەرێمی (نۆرماندیا) بوو؛ نۆرماندیاش گرنگترین هەرێمی دەرەبەگی (فەڕەنسی) بوو. بەڵام (ولیەم) لەپاش داگیرکردنی (ئینگلتەرا) و لە ساڵی (١٠٦٦ز)دا بووە خاوەنی فراوانترین زەوی، هەربۆیە بەهێزی هەژموونەکەی لەچاو گەورەکەیدا کە پاشای (فەڕەنسا) بوو زۆر زیاتر بوو، تەنانەت وایلێهات بووە بەهێزترین فەرمانڕەوا لە خۆرئاوای ئەورووپادا، ئەمەش مەترسییەکی گەورەی بۆ پاشای (فەڕەنسا) و فەرمانڕەوا دەرەبەگییەکان لەو وڵاتەدا دروستکرد. لە بەرامبەردا (لویسی شەشەم) بە زیرەکی و لێهاتوویی خۆی توانی فەرمانڕەوا دەرەبەگییەکانی (فەڕەنسا) بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و لە مەترسی (نۆرماندییەکان) ئاگاداریان بکاتەوە[2]. مەترسی پاشاکانی (فەڕەنسا) لە سەردەمی (هێنری دووەم) زیادیکرد، بەتایبەت کە لە باوکییەوە کۆنتی (ئەنگۆ) و لە دایکیشییەوە (ماتیڵدا) بوو، موڵکێکی فراوانی لە (فەڕەنسا) بۆ مابووەوە کە: (نۆرماندیا، ئەنگۆ، مین، تۆرین)ی گرتبووەوە. (هێنری دووەم)؛ (ئەلینوری) میراتگری (ئۆکۆتینی) خواست، پاشان (ئۆکۆتین و کاسکۆنی) وەکوو ئەنجامێکی ئەم هاوسەرگیرییە خرانە سەر موڵکەکانی (هێنری

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ص٢٤٢.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٥.

دووەم). ئەگەر لە سەرەتای سەدەی سیازدەیەمدا چاوێک بە نەخشەی کارگێڕی فەرەنسا) بخشێنین؛ بۆمان دەردەکەوێت کە پاشای (ئینگلتەرا) سێیەکی زەوی فەرەنسا)ی لەژێردەستدایە، (هێنری دووەم) دەیویست کە هەموو خاکی (فەرەنسا) بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە. ئەم ڕامیارییە دوژمنکار و فراوانخوازییەی (هێنری دووەم)؛ بنەماڵەی (کاپیتەی) تووڕەکرد، ئەو مەیدانخوازییەی (هێنری دووەم) وەلامدانەوەی پاشاکانی فەرەنسای هێنایەکایەوە[1].

مەیدانخوازییەکە بەتەنها پاشای فەرەنسای نەگرتەوە؛ بەڵکوو تێکڕای فەرمانڕەوا دەرەبەگییەکانی وڵاتی گرتەوە، بۆیە پاشا هەموو هێزە جیاوازەکانی (فەرەنسا)ی کۆکردەوە و یەکیخستن لەژێر سەرکردایەتیکردنی خۆیدا دژ بەو دوژمنە هاوبەشە. (لویسی حەوتەم ١١٣٧-١١٨٠ ز) و جێگرەوەکەی (فیلیپی دووەم ١١٨٠-١٢٢٣ ز) سەرکەوتنێکی بێوێنەیان لەم بوارەدا بەدەستهێنا، لە بەرامبەریشدا فەرمانڕەوا دەرەبەگییەکان، ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ (لویسی حەوتەم) دژ بە (هێنری دووەم). (لویسی حەوتەم) پەنای بردە بەر ڕامیاری لێکترازانیان، واتە لەنێوان باوک لە لایەکەوە هاوسەرەکەی (ئەلینور) و کوڕەکانی (ڕیچارد و چۆن) لە لایەکی دیکەوە. ئەم هەوڵانەش لە کۆتاییدا سەریانگرت و ئەوە بوو (ئەلینور) ویستی پەنا بباتەبەر (فەرەنسا)، بەڵام (هێنری دووەم) پێشوەختە گرتی و خستییە زیندانەوە. لە ئەنجامی ئەم ڕووداوەشدا کوڕەکانی (هێنری) لە باوکیان هەڵگەڕانەوە، (لویسی حەوتەم) هەر بەمەوە نەوەستا؛ بەڵکوو سکۆتلەندییەکانیشی دژ بە (هێنری دووەم) بۆ شۆڕشکردن هاندا[2].

### فیلیپی دووەم (١١٨٠-١٢٢٣ ز)

(فیلیپی دووەم) کە بە (فیلیپی ئۆگستس)یش ناسراوە؛ بە بەتواناترین پاشای (فەرەنسا) لە سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێت، (فیلیپ) لە باوکی کاراتر و لێهاتووتربوو؛ ئەمەش بەتەنها لە دوورخستنەوەی مەترسییەکانی (هێنری دووەم) نەوەکانی لەسەر (فەرەنسا) خۆی نەدەنواند، بەڵکوو هەموو موڵکەکانی لەژێردەست دەرهێنان و بەتەواوی لە (فەرەنسا)ی وەدەرنان، هەروەها تێکڕای بەرە

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٩٣.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٥٨.

بەرگرییەکانی ناو (فەڕەنسا)ی یەکخست، توانی تۆوی ناکۆکی و دووبەرەکی لەناو بنەماڵەی دەسەڵاتداری ئینگلیزیدا بچێنێت، لە ئەنجامدا توانی لە هەموو ئەم هەولانەیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت.

(ڕیچارد) لە فەرمانڕەوایەتیدا شوێنی باوکی گرتەوە، بۆ بەشداریکردن لە جەنگی خاچییەکاندا ڕووی کردە زەوییە پیرۆزەکان، لە (عەککا) و لەگەڵ یەکێک لە سەرکردە خاچییەکاندا کە میری نەمسا (لیپولد) بوو نێوانیان تێکچوو، هەربۆیە لە گەڕانەوەیدا بۆ ئینگلتەرا (لیپولد) ئەوەی بە دەرفەت بینی و توانی (ڕیچارد) دەسگیربکات و ئازادی نەکرد؛ هەتا بڕی (١٥٠٠٠٠) مارکی لە بەرامبەریدا وەرنەگرت[(١)].

لەوکاتەدا کە (ڕیچارد) دەسگیرکرابوو؛ (فیلیپ ئۆگستۆس) ڕایگەیاند کە ئەو پاڵپشتی و دۆستایەتییە دەرەبەگییەی بۆ (ڕیچارد) هەیبوو هەڵیوەشاندووەتەوە، هەروەها بڕیاری داماڵینی ئەو موڵکانەیدا کە (ڕیچارد) لە (فەڕەنسا)دا هەیبوو. لە بەرامبەریشدا بەخشییەوە بە (جۆن)ی برای (ڕیچارد). جۆنیش سوێندی پابەندبوون و شوێنکەوتەیی دەرەبەگانی خۆی بۆ گەورەکەی (فیلیپ ئۆگستۆس) خوارد. بەمشێوەیە پاشای فەڕەنسا جارێکی دیکە توانی تۆوی دووبەرەکی لەنێوان بنەماڵەی دەسەڵاتداری (ئینگلتەرا) بچێنێتەوە. کاتێک کە (ڕیچارد) لە زیندان ئازادکرا؛ بە هاوکاری کۆنتی (فلاندرز) کە هاوپەیمانێکی بەهێزبوو جەنگێکی دژ بە (فیلیپ ئۆگستۆس)ی هەڵگیرساند، بەڵام (پاپا ئەنوستتی سێیەم) هاتە ناو ڕووداوەکەوە، وای لە لایەنە شەڕکەرەکان کرد کە ئاگربەست (هدنە)یەکی (٥)ساڵی مۆربکەن؛ لەپێناو بەردەوامبوونی جەنگی خاچییەکان لە زەوییە پیرۆزەکاندا.

لەو جەنگەدا کە لەنێوان (ڕیچارد) و هەندێک لە خانەدانەکانی باشووری (فەڕەنسا) ڕوویدا؛ بە سەختی بریندارکرا، هەر بە هۆی ئەو برینەشەوە بوو کە لە ساڵی (١١١٩ ز) کۆچی دوایی کرد! دوای خۆی؛ (جۆن)ی برای شوێنیگرتەوە. بۆ جارێکی دیکە ململانێ لەنێوان (فیلیپ ئۆگستۆس و جۆن) دەستی پێ کردەوە، بۆیە جەنگ لەنێوان (فیلیپ ئۆگستۆس و جۆن) بەرپابوو و لە ئەنجامدا (فلیپ) زنجیرە سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی بەدەستهێنا[(٢)].

---

(١) عبدالامير محمدامين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٥.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٥٩.

فیلیپ لە کارەکانیدا دوو ئامانجی سەرەکی هەبوو:

١. دەرکردنی یەکجارەکی (ئینگلیزەکان) لە خاکی (فەرەنسا).

٢. بەهێزکردنی دەسەڵاتی پاشایەتی و یەکخستنی (فەرەنسا) لە سایەی بنەماڵەی (کاپیتە)دا.

ئامانجی سەرەکی و ڕاستەوخۆی پڕۆژەکانی (فیلیپ) بریتیبوو لە (نۆرماندیا)، بۆیە لەپاش ساڵی (١٢٠٤ ز) توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەردا بسەپێنێت، لە پاشانیشدا (ئەنگۆ تۆرین، بوتوا، مین، بریتانی و کاسکونی) خستەسەر، هەتا لە ساڵی (١٢٠٦ ز)دا (فیلیپ) توانی بە تەواوی ئینگلیزەکان لە خاکی (فەرەنسا) وەدەرنێت[1].

ململانێی نێوان (فیلیپ ئوگستوس و جۆن) لێرەدا کۆتایی پێ نەهات؛ بەڵکوو لەپاش چەند ساڵێک بۆ جەنگێکی ئەورووپی گشتگیرتر گۆڕا. (جۆن) دەویست موڵکەکانی لە (فەرەنسا) بگەڕێنێتەوە ژێردەسەڵاتی، بارودۆخی ئەورووپاش یارمەتیدەرێکی باشبوو بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەی (جۆن)؛ چونکە هاوپەیمانی نوێی دەسکەوت. بەمشێوەیە بەرەیەک دەرکەوت کە پێکهاتبوو لە (ئۆتۆی ئیمپراتۆری ئەڵمانی) و کۆنتی (فلاندرز)، لە بەرامبەریشدا (فیلیپ ئۆگستوس و فردریکی دووەم) کێبڕکێیانبوو لەگەڵ (ئۆتۆی ئیمپراتۆر) لەسەر نازناوی ئیمپراتۆرییەتی! ئەوە بوو لەنێوان ئەم دوو بەرەیەدا جەنگێکی خوێناوی بە ناوی جەنگی (بوفین) ڕوویدا، لەم جەنگەدا (فەرەنسا) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا کە وێنەی کەمە لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەم سەرکەوتنەش لە ئەنجامی هاریکاریکردنی نێوان خانەدانە (فەرەنسییەکان) و پیاوە ئایینییەکان و دانیشتووانی شارەکان بەدیهات. جەنگی (بوفین) بە یەکجارەکی کۆتایی بە مەترسییەکانی (ئینگلتەرا) لەسەر (فەرەنسا) هێنا، بە هەمان شێوەش هەموو دەستێوەردانێکی (ئەڵمانی) لە کاروباری ناوخۆی (فەرەنسا) وەستاند، ئەمەش سەرەتایەک بوو بۆ زاڵبوون و پێشکەوتنی (فەرەنسا) بەسەر هەردوو دەوڵەتی (ئینگلتەرا) و ئیمپراتۆرییەتی (ڕۆمانی پیرۆز)دا. زۆر لە مێژوونووسان پێیان وایە کە هیچ

---

(١) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٩٤.

جەنگێکی دیکە نییە لە گرنگیدا هاوشێوەی جەنگی (بۆفین) بێت؛ تەنها جەنگی (واترلۆ) نەبێت کە لەپاش (٦٠٠) ساڵ ڕوویدا[١].

سەبارەت بە (ئەڵمانیا)؛ جەنگی (بوفین) کۆتایی بە سەردەمی (ئۆتۆ) هێنا، (فردریکی دووەم) شوێنی گرتەوە. سەبارەت بە ئینگلتەراش؛ (جۆن) ناچاربوو ملکەچی ویستی خانەدانەکان بێت و پەیمانی مەزنی مۆرکرد. دەربارەی فەڕەنساش؛ لەپاش چەند ساڵێکی کەم لە (بوفین)، هەلێکی لەباری بۆ (فیلیپ ئۆگستوس) ڕەخساند، هەتاوەکوو هەرێمی (تۆلۆز) لە باشووری (فەڕەنسا) بخاتەسەر موڵکەکانی، ئەم هەرێمەش لە لایەنی ئابوورییەوە بە دەوڵەمەندی خاکەکەی و پەرەسەندنی بازرگانی تێیدا ناوی دەرکردبوو، هەروەها بزووتنەوەیەکی ویژەیی و ڕۆشنبیری جیاواز لەم هەرێمەدا دەرکەوت[٢].

**لویس نۆیەم (١٢٢٦-١٢٧٠ ز)**

دەسەڵاتی پاشایەتی لە (فەڕەنسا) لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی (لویسی نۆیەم) یاخود (قەدیس لویس) گەیشتە ترۆپکی هێز و هەیبەت. (لویسی نۆیەم) بە منداڵی و لەژێر چاودێری دایکیدا دەسەڵاتی گرتەدەست، بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی نموونەی پاشای دادگەر و ئەسپسوارێکی ئازا و فەرمانڕەوایەکی خوداپەرست بوو، خاوەن چەند خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی چاک و باڵا بوو، نموونەیەکی باڵای (مەسیحییەت) بوو، ئەم نموونەییە بە شێوەیەک بوو کە پاپا (ئەنوسنتی سێیەم و ئەنوسنتی چوارەم)ی تێپەڕاندبوو. پێدەچێت (لویسی نۆیەم) ڕامیاریزانێکی مەزن و سەرکردەیەکی سەربازی لێهاتوو نەبووبێت؛ بەڵام پیاوێکی چاکبووە. بەخت یاوەری بوو لە جێبەجێکردنی بیروبۆچوونە نموونەییەکانیدا، چونکە بە میراتی دەوڵەتێکی بەهێزی بۆ مابووەوە. بەرقەرارکردنی ئاسایشی ناوخۆ و دەرەکی؛ لە گرنگترین خەسڵەتەکانی بوون. (لویسی نۆیەم) گرنگی زۆریدا بە پشکنین و چاودێریکردن (الرقابە)، پشکنەر و چاودێری بۆ هەموو بەشە جیاوازەکانی وڵاتەکەی نارد، بۆ ئەوەی چاودێری کارمەندەکانی بکەن و ڕاپۆرتی تێروتەسەل دەربارەی کار و کردارەکانیان بەرزبکەنەوە، هەروەها هەموو

---

(١) عبدالامیر محمد امین: تاریخ اوروبا، ج١/ ص١٦٨.

(٢) سعید عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطی، ج١/ ص٢٦١.

جەنگە ناوخۆییەکانی ناو (فەڕەنسا)ی قەدەغەکرد، دادگا سزایی و ڕمبازی (المحنه والمبارزه)یەکـانی وەسـتاند، سیسـتەمی دارایـی دامەزرانـد و کاروبـاری بـاجی ڕێکخست[1].

بەمشێوەیە بۆ یەکەمجار لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپادا مرۆڤ هەستی بەوە کرد کە میری دەزگایەک نییە بۆ چەوساندنەوە و ئەشکەنجەدان؛ بەڵکوو دەزگایەکە بۆ ڕاژەکردنی خەڵکی و پارێزەری مافەکانی مرۆڤە لە ژیاندا. لە گرنگترین دەستکەوتەکانی (لویسی نۆیەم) لە بواری ڕامیاری دەرەکیدا؛ بەستنی ڕێکەوتننـامەی (پـاریس) بـوو لەگەڵ پاشـای ئینگلـتەرا (هێنـری سـێیەم) لە سـاڵی (١٢٥٩ز)، بەپێی ئەم ڕێکەوتننـامەیە (هێنـری سـێیەم) وازی لە مـافە میراتگرییەکـانی خۆی لە (نۆرماندیا و ئەنگۆ و بوتوا و مین) هێنا بۆ (فەڕەنسـا)، لە بەرامبەر چەند سازشکردنێکی هەرێمایەتی کە (هێنری سێیەم) دەسیکەوت[2].

ڕێکەوتننامەی (پاریس) نموونەیەکی بەرچاوی زاڵبوونی ژیری و دانایەتی بوو بەسـەر گیـانە دەمارگیرییەکـەدا، هەروەهـا کۆتـایی بەو دوژمنـایەتییە دووروودرێژەی نێوان (فەڕەنسا و ئینگلتەرا) هێنـا کە ڕیشـەکەی دەگەڕایەوە بۆ سـەردەمی (ولیەمی یەکەم). بەمشـێوەیە ئاشـتی بـاڵی بەسـەر ئەم دوو دەوڵەتەدا کێشـا؛ هـەتـاوەکوو هەڵگیرسانی جەنگی (سەد ساڵە) لە ساڵی (١٣٣٧ ز) کاریگەرییەکەی مابوو، بەڵام لە دوای ئـەو جەنگـەوە جـارێکی دیکـە پەیوەنـدییەکانیان خـراپ بـوونەوە. لە مـاوەی ململانێی نێوان ئیمپراتۆری و پاپایەتیدا؛ (لویسی نۆیەم) بێلایەنانە وەستا، هەرچەندە ئیمپراتـۆر (فردریکـی دووەم) داوای لـێ کـرد کە نـاکۆکییەکە یەکلایـی بکـاتەوە؛ هەروەهـــا ئەوەشـــی ڕەتکـــردەوە کە کـــوڕەکەی (ڕۆبەرت) تەختـــی (ئەڵمانیـــا) وەربگرێت[3].

### لویسی نۆیەم و جەنگی خاچییەکان

(لویسـی نـۆیەم) بـڕوای بەوە زۆر بەهێزبـوو کە ئەو تـاجەی لەسـەریناوە لە بەخششەکانی خودایە، بۆیە ئەرکی سەرشانییەتی کە گوێڕایەڵی خودا بکات و بۆ

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٩.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٦١

(٣) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ص٢٦٢.

بەرزڕاگرتنی ناوی؛ بەشداری لە جەنگی پیرۆز لە خاکی پیرۆزدا بکات. هەربۆیە (لویسی نۆیەم) دوو هەڵمەتی خاچی دەست پێ کرد: یەکەمیان لە ساڵی (١٢٤٨ ز) و دووەمیان لە ساڵی (١٢٧٠ ز). دەتوانین بڵێین هەردوو هەڵمەتەکە بەتەواوی (فەڕەنسی) بوون نەک ئەورووپی، چونکە تەنها لە سوارە (فەڕەنسییەکان) پێکهاتبوون. چونکە خۆشەویستی و بەهێزی پەیوەستیان بە (لویس)ەوە و تامەزرۆییان بۆ ئەنجامدانی کاری پاڵەوانییەتی، هەروەها پەرۆشییان بۆ دەسکەوتی ماددی؛ پاڵنەری سەرەکی بوون کە هانیدان ئەم هەڵمەتە ئامادەبکەن[١].

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە دەبینین هەستی ئایینی و لەخوداترسانی ڕاستەقینە کاریگەرییەکی کاڵتری هەبوو لەچاو ئەو هۆکارانەی کە باسمانکرد. کەچی لە هەردوو هەڵمەتەکەدا تووشی شکستێکی گەورە بووەوە! پاش (٦) ساڵ لە تێکۆشان (١٢٤٨-١٢٥٤ز)؛ لەو ماوەیەدا (لویس) بەدیلگیرا. لە بەرامبەر پاشەکشەی (فەرەنگەکان) لویس ئازادکرا و گەڕایەوە بۆ (فەڕەنسا)، بەڵام سووربوو لەسەر ئامادەکردنی هەڵمەتی دووەم لە ساڵی (١٢٧٠ز) کە بە ئاراستەی (تونس) بوو ئەمجارەیان، بەڵام کارەکەی تەواو بەئەنجام نەگەیاند؛ چونکە نەخۆشکەوت و لە کۆتاییشدا بووە هۆی مردنی (لویس). (لویس) بەو شێوەیەی کە ئاواتەخواز بوو بمرێت؛ کۆچی دوایی کرد. واتە لە کاتێکدا کە لەپێناو ئایین و بیروباوەڕەکەیدا دەجەنگا. بە مردنی (لویس)؛ کۆتایی بەو پڕۆژە خاچییە هات کە هیچ کەسێک لە هاوسەردەمانی بەو دڵسۆزییەوە وەک ئەو گرنگییان پێی نەدا[٢].

### فەڕەنسا پاش لویسی نۆیەم

هەتاوەکوو سەردەمی کۆچی دوایی (لویسی نۆیەم)؛ ڕامیاری پاشاکانی (فەڕەنسا) لە بەدیهێنانی یەکێتی (فەڕەنسا) بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندی و شکۆمەندکردنی هێزی پاشایەتیدا خۆی دەنواند، هەروەها بەرپەرچدانەوەی ڕامیارییە فراوانخوازی و دوژمنکارییەکانی پاشاکانی (ئینگلتەرا) لە زەوییەکانی (فەڕەنسا) لە دەسپێکی بیر و کارەکانیان بوو، هەربۆیە پاشاکانی (فەڕەنسا) هەمیشە بە دوای هاوپەیمانێکدا دەگەڕان کە ئامانجی سەرەکیشیان پشتبەستنبوو

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ص٢٦٥.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٦٨.

بەو هاوپەیمانانە؛ بۆ دژایەتیکردنی پاشاکانی (ئینگلیز)، هەروەها پارێزگاریکردنی یەکێتی و سەلامەتی خاکی (فەڕەنسا)، بەڵام جێگرەوەکانی (لویسی نۆیەم) و بەتایبەت (فیلیپی سێیەمی کوڕی ١٢٧٠-١٢٨٥ ز) تەنها بەوەندەوە وازینەهێنا کە پارێزگاری لە وڵاتەکەی بکات؛ بەڵکوو ڕامیارییەکی فراوانخوازانەی گرتەبەر[1].

(فیلیپی سێیەم) یەکێک لە پاشا بەهێزەکانی سەردەمی خۆی بوو، ئەم بەهێزییەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو پلانە بەهێز و دانایییەی کە باوکی دانابوو، بە ئەندازەیەکی زۆریش لەژێر کاریگەری مامی (چارڵ ئەیخوی) بوو. لە سەردەمی ئەم پاشایەدا پانتایی موڵکەکانی تەختی شاهانە؛ لە ڕێی میرات و ژنخوازییەوە زیادیکرد. (بواتیە و تولۆز)ی بە میرات بۆ مایەوە، ئەمەش لە ڕێگەی هاوسەری کوڕەکەیەوە کە میراتگری وڵاتی (ناڤار و کۆنتی شامبینشی) بوو؛ دەسکەوت. (فیلیپی سێیەم) لەگەڵ پاپادا بەشداری لەو جەنگە سەربازییە کرد کە دژ بە (ئەراکون) لەسەر تەختی (سەقلیە) هەڵگیرسا، تێیدا سوپای (ئیسپانی) بە سەرکردایەتی (ئەراکون) توانیان بەسەر لەشکری (فیلیپی سێیەم) سەربکەون. لە کاتی پاشەکشەکردنی سوپای (فەڕەنسا)دا؛ (فلیپی سێیەم) کۆچی دوایی کرد[2].

### فیلیپی چوارەم (١٢٨٥-١٣١٤ ز)

(فیلیپی چوارەم) بە یەکێک لە پاشا هەڵپەرستەکانی (فەڕەنسا) دادەنرێت، باوەڕی زۆر بەهێزبوو بەوەی کە هەموو ئامرازێک بۆ پێکانی مەبەستەکەی بەکاربهێنێت و هەموو شێوازێکیش لەو پێناوەدا ڕەوایە بگیرێتەبەر. هەندێک لە مێژوونووسان پێیان وایە ناچاربوو بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندی ئەم شێوازە بگرێتەبەر، هەروەها هەموو ئەو کارانەی بۆ بەرژەوەندی (فەڕەنسا) ئەنجامداوە. (فیلیپی چوارەم) هەوڵی بوژاندنەوەی ئابووری (فەڕەنسا)یدا، کاریکی واشیکرد کە لەپاڵ کشتوکاڵکردندا، گرنگی بە بازرگانی و پیشەسازی بدرێت، کۆششی بۆ ئەوە دەکرد کە (فەڕەنسا) بگەیەنێتە سنوورە سروشتییەکەی خۆی. لە بەڕێوەبردنی وڵاتیشدا؛ پشتی بە یاساناسەکانی وەک (بیرفلوت و نۆکاریت) دەبەست، ئەم دوو یاساناسە بۆ جێبەجێکردن و خزمەتکردنی ڕامیارییەکانی پاشا؛ سڵیان لە هیچ شێوازێک

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٦٥.

(٢) عبدالقادر احمد اليوسف: العصور الوسطى الاوروبية، ص١٦٨.

نەدەکـردەوە، گەر شـێوازەکە پـێچەوانەی دابونەریـت و بەهـا کۆمەڵایەتییەکـانیش بـووایە! لەبەرئەوە (فیلیـپ) بە هاوکـاری ئەو دوو یاسـاناس و ڕامیاریزانـە تـوانی دادگای شاهنە بەسەر دادگا دەرەبەگییەکاندا بسەپێنێت و هاوکات زاڵ ببێت بەسـەر پاپایەتیـدا، تەنـانەت وای لە پاپاکـان کـرد لە (فەڕەنسـا) وەک نـیمچە زینـدانییەکیان لێبێت[1]!

هەنـدێک لە مێژوونووسـان ڕاڤەی ئەو ڕامیارییـە دوژمنکـارییەی (فیلیـپ) دژ بە پاپـایەتی و هێـزی سـوارەی پەرسـتگاکان و جـوولەکـان بەو شـێوەیە دەکەن کە بەردەوام پێویسـتی بە پـارەوپوول بـووە بـۆ ئەنجامـدانی پـرۆژە فراوانخوازییەکـان، بۆیە فەرمانی بەسـەر دەرەبەگەکانـدا دا، کە ئەوەی لەسـەریانە بەسـەریەکەوە بیدەن بە تەختـی پاشـایەتی. (فیلیپـی چـوارەم) لە سـاڵی (١٣٠٦ ز) فەرمـانی دەرکردنـی جوولەکانی لە وڵاتدا دەرکرد، دەرکردنی ئەم فەرمانە لە سـەرەوە و بە ڕووکەش بۆ ڕازیکردنـی ڕای گشـتی (کاسـۆلیکی) بـوو، بەڵام لە ڕاسـتیدا و لەژێـرەوە مەبەسـتی دەسبەسەرداگرتنی سەروەتەکەیان هەبوو! بەو جۆرەش لە ساڵی (١٣٠٧ ز) هەمـوو موڵکەکانی سوارەی پەرستگاکانی زەوتکرد، لە ساڵی (١٣١١ ز) فەرمـانی دەرکردنـی پیـاوە ئیتاڵییەکـان و سـەرفکردنی داراییەکـەیانی دەکـرد. لە گرنگتـرین کـارە کارگێڕییەکـانی (فلیپـی چـوارەم)؛ بانگێشـتکردنی چینـی (پیـاوە ئایینییەکـان و خانەدانەکـان و نـوێنەری شـارەکان) بـوو لەسـاڵی (١٣٠٢ ز) بـۆ پێکهێنـانی (ئەنجوومەنی چینەکان). بەمشێوەیە دەبینین لە لایەنی ڕامیارییەوە بۆ یەکەمجار دان بە چینـی ناوەنـددانرا. ئامـانجی سـەرەکی (فیلیپـی چـوارەم) لە گرێـدانی ئەم ئەنجـوومەنە؛ لە لایەکەوە بریتیبـوو لە بەدەسـتهێنانی لایەنگری گەل بـۆ خـۆی، لەو هەوڵەشیدا کە دژی پاپا (بونیفسـی هەشـتەم) ئەنجامیدەدا، لە لایەکی دیکەشـەوە بـۆ سەپاندنی باج بوو[2].

لەگەڵ ئەوەی کە (فلیپی چوارەم) ڕامیارییـەکی هەلپەرسـتانەی پەیڕەودەکـرد؛ لە هەمان کاتدا بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی (فەڕەنسـای نوێ) دادەنرێت. لە سـەردەمی (فلیپـی چـوارەم) فـەرمانڕەوایی (فەڕەنسـی) هێنـدە بەهێزبـوو کە لە توانـای دەرەبەگەکاندا نەما، هـەتا بەئاسـانی مەیدانخوازی لەگەڵدا بکەن. هەر لە سـەردەمی

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٦٦.

(٢) محمود سعيد عمران: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ص٢٦٦.

ئەمـدابوو کە وەک چـاوگ و یاسـا و دادگەری سـەرنج لـە پاشـایەتی دەکـرا. ئەم تێـڕوانینە هزرییـەش نەریتێکـی (ڕۆمـانی) و زینـدووکردنەوەی چەمـکە یاسـاییە (ڕۆمانییەکان) بوو کە سەرۆکی دەوڵەتی وەکوو دروشمێکی دادپەروەری و چاوگی دەسـەڵات سـەیردەکرد. لە دیـارترین ئەندێشـمەندەکانی یاسـا لە سـەردەمی فلیپـی چـوارەم (پیردیـوبس ١٢٢٥-١٣١٢ ز) بـوو کە ئەنـدامی ئەنجـوومەنی چینەکـان بـوو. چەنـد بۆچـوونێکی شۆڕشـگێڕانەی دەربـارەی پەیوەنـدی نێوان دەوڵەت و کڵێسـا و بالآیی یەکەمیان هەبوو، ئاماژەشی بە یەکسانی ژن و پیاو کردووە، هەروەها ئەوەی دەرخستووە کە پێویستە فەڕەنسا دەسەلآتی بەسەر کیشوەری ئەورووپـادا هەبێت، چەند بۆچوونێکی بێوێنەشی بۆ چۆنییەتی گێڕانەوەی زەوییە پیرۆزەکان هەبوو[١].

## کۆتایی دەسەڵاتی بنەماڵەی کاپیتە

پاش (فیلیپی چوارەم)؛ ئیدی دەسەلآتی ڕامیاری بنەماڵەی (کاپیتە) بەرەو کۆتـایی دەچـوو، لە دوای خـۆی؛ هەربۆیـە هەرسـێ کـوڕەکەی بەدوای یەکـدا جـڵەوی فەرمانڕەوایەتییـان گرتەدەست، واتـە هەریـەک لـە (لویسـی دەیەم ١٣١٤-١٣١٦ ز) و (چـارلی چـوارەم ١٣٢٢-١٣٢٨ ز)، هیـچ کـام لـەم پاشـایانە کوڕێکیـان لەپاش خۆیـان بەجێنەهێشت. بە مردنی (چارلی چـوارەم)،؛ کۆتـایی بە دەسـەلآتی بنەمـاڵەی (کـاپیتە) هـات، کە بـۆ مـاوەی (٤) سـەدە فەرمـانڕەوایەتی فەڕەنسـایان کـرد. بە شـێوەیەکی ئاسایی و بەبێ دروستبوونی هیـچ کێشـەیەک؛ (فیلیـپ دیفـالوا) بە پاشـای (فەڕەنسـا) هەڵبژێردرا و بە ناوی (فیلیپی شەشەم) تەختی شاهانەی گرتەدەست، چونکە (فیلیپی شەشەم) نزیکترین کوڕ بوو لە پاشای کۆچکردووەوە و برازاشـی بـوو. سـەبارەت بە شـوێنگرتنەوەی ژنـان بـۆ دەسـەلآتدارێتی؛ دابـونەریتی ولآت ئەو فەرمـانەی پـێ نەدەدرا[٢].

## جەنگی سەد ساڵە

بە شێوەیەکی گشـتی دەتـوانین بڵێین مێژووی (ئینگلـتەرا و فەڕەنسـا) لە مـاوەی هەردوو سـەدەی چـواردەیەم و پانزدەیەمـدا، بە بەهێزبـوونی دەسـەلآتی پاشـایەتی،

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٧٣.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٢٧٤.

لەگەڵیدا لاوازبوون و پووکانەوەی دەسەڵاتی دامودەزگا دەرەبەگییەکان جیادەکرێتەوە. ڕاستە چینی خانەدانەکان لە کۆمەڵگادا ون نەبوون؛ بەڵام دەسەڵاتیان لاوازبوو و موڵکەکانیان بەرتەسک ببووەوە، هەروەها بەهێزبوونی دەسەڵاتی پاشایەتی و پەرەسەندنی شارەکان، لە ماوەی ئەو دوو سەدەیەدا لە هەریەک لە (فەڕەنسا و ئینگلتەرا)؛ بوونە هۆی دەرکەوتنی چینێکی نوێی کارا لە کۆمەڵگادا، کە ئەویش بریتیبوو لە چینی بۆرژوازی. ڕۆژلەدوایڕۆژ ئەم چینە چالاکی ڕامیاری لە زیادبووندابوو، خەریکی پێکهێنانی بارێکی ئابووری پتەویش بوو کە ئەم دوو هۆکارە پێکەوە (واتە بەهێزبوونی دەسەڵاتی پاشایەتی لە لایەک، پەرەسەندنی چینی بۆرژوازی لە لایەکی دیکەوە) بوونە هۆی هەژاندنی قەوارەی خانەدان و لاوازکردنی هەژموونە ڕامیارییەکەی، هەروەها لێکهەڵوەشاندنی پایە کۆمەڵایەتییەکەی. لەم ڕووەوە لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی (ئینگلتەرا و فەڕەنسا)، هەردوو دەوڵەت لە ماوەی سەدەی دوازدە و سیازدەهەمدا نموونەیەکی فەرمانڕەوایەتی دەرەبەگایەتی بوون، بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەمدا بوونە نموونەی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتییەکی بەهێز. هەردوو دەوڵەت پێکەوە و زۆر بەخێرایی بەرەو پرۆسەی بەنەتەوەییبوونی دەوڵەت هەنگاویاندەنا، مەبەستیشمان لەمە؛ زیادبوونی هەستی نیشتمانپەروەرییە لە هەریەک لەم دوو دەوڵەتەدا[1].

لە (ئینگلتەرا) زمانی (ئینگلیزی) بووە زمانی شێوازبەندی دەوڵەت و شوێنی زمانی (فەڕەنسی) گرتەوە کە زمانی کۆشک و چینی باڵای کۆمەڵ بوو. بە هەمان شێوەش لە (فەڕەنسا) زمانی (فەڕەنسی) باڵی بەسەر هەموو وڵاتدا کێشا و زاڵبوو بەسەر زمان و شێوەزارە ناوخۆییەکاندا. بۆ خەملاندنی هەموو ئەو دیاردانەی کە باسکرا بۆ بیناکردنی داهاتوویان؛ دیاریکردنی ڕەوت و ئاڕاستەی ڕووداوەکان و تێپەڕاندنی سەدەکانی ناوەڕاست و چوونە ناو قۆناغێکی نوێی مێژووییەوە، جەنگێکی خوێناوی هاتەئاراوە کە بە جەنگی (سەد ساڵە) لە مێژوودا ناسراوە، ئەم جەنگە کە بە (جەنگی سەد ساڵە) ناوی دەرکردووە؛ نەک لەبەرئەوەی (١٠٠) ساڵ

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٧٣.

درێژەی کێشابێت، بەڵکوو لەبەر ئەو هۆکارانەی کە جەنگ لەپێناویاندا هەڵگیرسا؛ هەتاوەکوو نزیکەی (١٠٠) ساڵ کۆتایی پێنەهێنرا[١]!

## هۆکارەکانی جەنگی سەد ساڵە

هۆکارەکانی هەڵگیرسانی (جەنگی سەد ساڵە) زۆر و تیکپرژاون، هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمێکی دێرین؛ واتە بۆ سەردەمی داگیرکاری (ئینگلتەرا) لە لایەن نۆرماندییەکانەوە ساڵی (١٠٦٦ ز). بێگومان (ئینگلیزەکان) ئەم جەنگەیان هەڵگیرساند، ئێدواردی سێیەمیش بڵێسەکەی خۆشترکرد، ئەویش بە بەهانەی داواکردنی تەختی پاشایەتی (فەرەنسا)، ئەم بەهانەیەی کردە بەڵگەیەک بۆ ڕۆچوونە ناو جەنگێکی خوێناوی لە مێژووی هەردوو وڵاتدا، دەتوانین هۆکارەکان بەمشێوەیە دەستنیشان بکەین:

**یەکەم: دۆزی سکۆتلەندا:**

دۆزی (سکۆتلەندا) بە مەترسیدارترین کێشە دادەنرێت کە (ئینگلتەرا) بەدەستییەوە گیریخواردبوو، هەر لە سەردەمی داگیرکاری نۆرماندییەوە، (ئینگلیزەکان) دەیانویست پێگەی خۆیان لەوێدا برەوپێبدەن، بەڵام بەربەرەکانێی (سکۆتلەندییەکان) بەردەوام لە بەهێزبووندا بوو. (سکۆتلەندییەکان) بۆ بەردەوامبوونی خەباتیان دژ بە (ئینگلیزەکان)؛ یارمەتیان لە پاشاکانی فەرەنساوە وەردەگرت، بۆیە هاندان و کۆمەکیکردنی (سکۆتلەندییەکان) لە لایەن فەرەنساوە دژ بە (ئینگلیزەکان) بوو بە ڕامیارییەکی پیادەکراوی پاشاکانی فەرەنسا[٢].

لە کۆتاییدا و لە سەردەمی (ئێدواردی نۆرماندی)دا؛ (ئینگلیزەکان) توانیان هەژموونی خۆیان بەسەر (سکۆتلەندییەکان) بسەپێنن، بەڵام (سکۆتلەندییەکان) لە سەردەمی (ئێدواردی سێیەم) شۆڕشیان بەرپاکرد و پاشاکەیان (ڕۆبەرت بروس) شوێنکەوتەی خۆی بۆ پاشای (ئینگلتەرا) ڕەتکردەوە و توانیان شکستێکی مەزن تووشی سوپای (ئینگلیز) بکەن. (ئێدواردی سێیەم) ناچاربوو کە دان بە سەربەخۆیی (سکۆتلەندا)دا بنێت. لە خۆشبەختی (ئینگلیزەکان) دژەشۆڕشێک لە (سکۆتلەندا)دا،دژ بە (دیڤد برووسی کوڕی ڕۆبرت برووس) ڕوویدا. (ئێدواردی سێیەم) بەخێرایی بە

(١) فشر: تاريخ اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٥.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٥.

هانای شۆڕشگێڕەکانەوە چوو، هەربۆیە لە (هالْدن) ساڵی (١٣٣١ ز) توانیان (دیڤد برووس) تێکبشکێنن، ناچاریانکرد کە پەنا بباتە بەر (فەڕەنسا) و لەوێ مایەوە. (فیلیپی شەشەم) زۆر بەگەرمی پێشوازی لێی کرد، بەلاّم (ئینگلیزەکان) ئەم پێشوازەیان بە ئیهانەکردنی خۆیان دانا، مانەوەی دیڤد بروسیان لە (فەڕەنسا)دا، بە هەڕەشەیەکی بەردەوام دانا بۆ سەر دەسەلاّت لە (سکۆتلەندا)[1].

**دووەم:** یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی دیکە کە کاریگەری هەبوو؛ بوونی چەند ناوچە و موڵکێکی پاشاکانی (ئینگلیز) بوو لە خاکی (فەڕەنسا)دا، پاشاکانی (فەڕەنسا) زۆرینەی ئەو موڵکانەیان گەڕاندەوە ژێردەسەلاّتی خۆیان، بەلاّم چەند ناوچەیەکی وەک (گویم و کاسکۆنی) لە باشووری (فەڕەنسا)دا، هەر لەژێر دەسەلاّتی (ئینگلیزەکان) مابووەوە، هەروەها بەردەوام بانگەشەی مافی بوونی خۆیان دەکرد لە ناوچەکانی دیکەی (فەڕەنسا)دا، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی و بەردەوامبوو بۆ ناکۆکی نێوانیان، چاوگێکی گرنگی پێکداکێشانی هەردوولاش بوو[2].

**سێیەم/ دۆزی فلاندەرز**

کێشەی (فلاندەرز) زۆر لە کێشەی (سکۆتلەندا) دەچوو، (فلاندەرز) هەرێمێکی شاهانەی (فەڕەنسا) بوو، بەلاّم میرەکەی هەمیشە دەیویست خۆی دەسەلاّتی تەواوی هەبێت بەسەر هەرێمەکەدا، بە مەبەستی پاراستنی سەربەخۆیی رامیاری میرنشینەکەی، بەردەوام لەگەڵ پاشای فەڕەنسا (گەورە دەرەبەگەکەی) لە ململانێدابوو. هەروەک چۆن (سکۆتلەندییەکان) کۆمەکیان لە پاشاکانی (فەڕەنسا) وەردەگرت، بە هەمان شێوەش میرەکانی (فلاندەرز) کۆمەکیان لە پاشاکانی (ئینگلتەرا) وەردەگرت. ئامانجی پاشاکانی (ئینگلیز) لەم یارمەتیدانە؛ لێکهەڵوەشان و لاوازکردنی دەسەلاّتی پاشایەتی بوو[3].

ئەم کێشەیە کاتێک پەرەیسەند کە شارەکان گەشەیانکرد و چینی ناوەند دەرکەوت، هەروەها بازرگانی پەرەیسەند، شارەکانی هەرێمی فلاندەرزیش بە پیشەسازی ڕستن و چنین بەناوبانگ بوون، بەلاّم پشتیان بە کەرەستەی خاوی

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٧٥.
(٢) هەمان سەرچاوە.
(٣) فشر: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٦٦.

(ئینگلـتەرا) دەبەسـت، بـۆیە شـارەکانی (فلانـدەرز) سـووربوون لەسـەر پاراسـتنی سەربەخۆیی خۆیان. ئەوان لە دەسەلات و هەژموونی (فەڕەنسا) دەترسـان، چونکە ئەو هەژمـوونە لە لایەکەوە دەسـتکەوتەکانی دەخسـتنە مەترسـییەوە، لە لایەکـی دیکەشـەوە دەبـووە بەربەسـت لەبەردەم پەیوەنـدییە بازرگانییەکانیـان لەگەڵ (ئینگلتەرا)دا. (ئێدواردی سێیەم) بەردەوام لە هەوڵداندابوو، هەتا ئەوەی پیشەسازی ڕستن و چنین لەو شـارانەدا بەرەو نەمـان ببـات، هەروەهـا ئـاژاوە بـۆ (فەڕەنسـا) دروست بکـات، پـاڵیش بە دانیشـتووانی فلانـدەرزەوە بنێت، بـۆ شۆڕشـکردن دژ بە (فەڕەنسا). ئەوە بوو لەم هەوڵەیدا سـەرکەوتنی بەدەستهێنا. لە کـاتی سـەرقاڵبوونی پاشـای (فەڕەنسـا) بە یـاخیبوونی فلانـدەرزەوە؛ (ئێدوارد) جەنگی دژ بە (فەڕەنسـا) هەڵگیرساند[1].

## جان دارك

ژیانی (جان دارک) بووەتە چیرۆکێک لەسەر ئاستی گێتی و جێگای بایەخپێدانی خەڵکـی، بە شـێوەیەک باسـکراوە کە زیـاتر لە چیرۆکێکـی خەیـاڵی دەچێـت نەک ڕاسـتەقینە! ڕاستە بەتەنهـا (ئینگلیـزی) لە خـاکی (فەڕەنسـا) دەرنەکـرد؛ بەڵام چەنـد دەسکەوتێکی سەربازی بێوێنەی بەدەستهێنا. مرۆڤێکی یەکلاییکەرەوە نەبوو؛ بەڵام ڕۆڵە سـەرەکییەکەی لە یەک شـتدا دەردەکەوێـت، ئەویـش بـریتییە لە خەملانـدنی هەسـتی نیشـتمانپەروەری (فەڕەنسـی)، ئەمەش بە ئاشـکرا لەم دەسـتەواژەیەدا دەردەکەوێـت کە دەڵێـت: "هەر خـوێنێکی فەڕەنسـیم ببینیێـت کە ڕژابێـت؛ هەسـتم کردووە ئەوە خوێنی خۆمە و لێم دەچۆڕێت"[2]!

(جـان دارک) لە سـاڵی (١٤١٢ ز) لەدایکبـووە، کـچە جووتیـارێکی سـاکاربوو، لە گوندێکی بچووکی سەرسنووری (لۆرین) دەژیـا، ئەم نـاوچەیەش جەنگێکی توندی لـەنێوان (بۆرگوونـدییەکان و ئوریالینییەکـان)ی بەخـۆوەدی. (جـان دارک) ڕقـی لە (بۆرگوونـدییەکان) دەبـووەوە، چـونکە لەنـزیکەوە ئاگـای لەوەبـوو کە چەنـدان کارەساتیان بەسەر (فەڕەنسا)دا هێنابوو[3].

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى،ج١/ ص٤٨٠.

(٢) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٧٦.

(٣) محمد رفعت: معالم تاريخ العصور الوسطى، ص١٩٦.

(جـان دارک) ڕۆشـنبیر نەبـوو؛ بەڵام زیـرەک و وریـابوو، لە هەمـوو ئەمـانە گرنگتـریش؛ خـاوەن هەسـتێکی نیشـتمانی و توانـای سـەرکردایەتیکردن بـوو، ئـایینپەروەر و بـاوەڕێکی زۆریشـی بە کەسـایەتییە ئایینییەکـان هـەبوو، بەتـایبەتی (میکائیـل) و هەردوو (قەشـە کاسـرین و مارگرێـت). ئەوە بـوو (جـان دارک) خـۆی گەیانـدە لای (پاشـا چـارلی حەوتەم)؛ دەسـتوپێوەندی پاشـا زۆر سەرسـامبوون دەربـارەی ئەم کـچە لادێییەی کە وا پۆشـاکی پیـاوانی پۆشـیوە و بانگەشـەی ئەوە دەکـات کە دەنـگ لە نادیـارییەوە بـانگی دەکـات. (پاشـا چـارل) کـردییە سـەرۆکی هێزێکی بچووک کە لە پیاوان پێکهاتبوو، چەک و پێداویستی تەواوی بۆ تەرخـانکرد. لێرەوە دەرکەوتنی (جـان دارک)؛ ورەی فەرەنسییەکانی بەرزکردەوە و بە گیانێکی نوێوە سەرلەنوێ گەڕانەوە گۆڕەپانی جەنگ[1]. یەکەم سەرکەوتنیش کە (جان دارک) بەدەستی هێنا؛ شـکاندنی گەمارۆی (ئینگلیزەکان) بـوو، لەسـەر شـاری (ئۆرلیـان) لە سـاڵی (١٤٢٨ ز)دا، ئەم سـەرکەوتنە هێنـدە بـاوەڕی سـەربازەکانی (فەرەنسـا)ی پتەوکـرد، هـەتا ئەو ئەنـدازەیەی پێیـان وابـوو (جـان دارک) لە ئاسـمانەوە بـۆ سەرخستنیان نێردراوە، بەڵام بە هـۆی هاوکارینەکردنی (چارلی حەوتەم) لەگەڵیدا، هەروەهـا پێنەدانـی ژمـارەی سـەرباز و چەکی پێویسـت؛ (جـان دارک) ناچـاربوو بە هێزە کەمەکەیەوە بەردەوامی بە جەنگەکە بدات، لە ئەنجامدا بە دیلی کەوتەدەسـتی (بۆرگووندییەکان)؛ ئەوانیش دایانەدەست (ئینگلیزەکان)[2].

(جان دارک) بۆ ماوەی (٩) مانگ لە زینداندا مایەوە، پاشـان لە سـاڵی (١٤٣١ ز) بۆ دادگاییکردن لەبەردەم یەکێک لە دادگاکانی پشـکنیندا، بە تۆمەتی جادووگەری و هەڵگەڕاوەیی (هرطقة) لە ئایینی مەسیحی دادگایی کرا، دادگا بڕیـارێکی تاوانکارانەی بەرانـبەری دەرکـرد، لەبەرئەوەی کەسـێکی یـاخیبوو؛ (هەڵـگەڕایەوە، بـۆیە دەبێـت تونـدترین سزای بەسـەردا جێبەجێبکرێت). (جـان دارک) ڕەوانەی دادگـای شـارێکی (ئینگلیـزی) کرا و سـزای سـووتاندنی بەسـەردا سـەپێندرا، فەرمانەکەشـی لە شـاری (ڕوان)، لە سـاڵی (١٤٣١ ز)دا جێبەجێکـرا. بەمشـێوەیە (جـان دارک) سـووتێنرا کـە هێشتا (١٩) ساڵی تەمەنی تێنەپەڕاندبوو[3].

---

(١) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٨٠.

(٢) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٩١.

(٣) عبدالامير محمد امين و: تاريخ اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص١٨١.

ســـووتاندنی (جـــان دارک) لە لایەن ئینگلیزەکـــانەوە، زیـــاتر ڕق و کیـــنەی فەڕەنسییەکانی ورووژاند، ئەمە بووە هۆکارێکی دیکەی گەرمبوونی جەنگی نێوان هەردوو وڵاتـی (فەڕەنسـا و ئینگلـتەرا). سـاڵی (١٤٥٣ ز) (ئینگلیزەکـان) دواپـێگەی خۆیان لە (فەڕەنسا) کە (نۆرماندیا ) بوو لەدەستدا، بەمشێوەیە جەنگی (سـەد سـاڵە) کۆتـایی پێهـات. ئەوەی مـاوەتەوە بیڵێـین؛ جەنگـی (سـەد سـاڵە) وەکـوو جەنگێکـی دەرەبەگی دەستی پێ کرد، وەک جەنگێکی نەتەوەیی کۆتـایی پێ هـات! لە گرنگترین ئەنجامەکانی ئەم جەنگەش؛ جیاکردنەوەی سنووری کۆتـایی بـوو لەنێوان (ئینگلتەرا و فەڕەنسـا)دا، هـەروەها ورووژاندنی هەستی نیشتمانپەروەری لە هەردوولادا، ئەم جەنگە بەبێ ڕاگەیاندنی جەنگ دەستی پێ کرد و بەبێ بەستنی ڕێکەوتننامەیەک کۆتایی پێ هات[1].

## فەڕەنسا لە کۆتاییەکانی سەدەی پازدەیەمدا

جەنگـی (سـەد سـاڵە) بە سـەرکەوتنی فەڕەنسـا کۆتاییپێهـات، ئیـدی لەسـەر فەرمانڕەواکـان پێویسـتبوو هەوڵ بـدەن شـوێنەوارە خراپەکـانی جەنـگ بسـڕنەوە، پاشان سـەرلەنوێ وڵات بنیاتبنێنەوە و یەکێتی نیشـتمانی و بەهێزبوونی دەسـەڵاتی ناوەندی دەستەبەر بکەن. ئەرکی یەکەمی (فەڕەنسییەکان) بریتیبوو لە سنووردانان بـۆ هێـزی (بۆرگوونـدیا). مـەزنی بۆرگوونـدیا (جـۆنی ئـازا ١٤٠٤-١٤١٩ ز) بەتەنها فەرمانڕەوایی بۆرگوندیای نەدەکرد لەوکاتەدا؛ بەڵکوو بەشێک لە (لۆرین، فلاندەرز، زەوییە نزمەکـان- هۆڵەندا و بەلجیکا-)ی لەژێردەستدابوو. جێگرەوەکەشـی (فیلیپـی چاک ١٤١٩-١٤٦٧ ز) هەریەک لە (ناموور و لۆکسمبۆرگ)ی خستەسـەر وڵاتەکەی، بەمەش قەڵەمڕەوی خۆی لە (ترخت و لێک و کمباری) فراوانکرد[2].

ئامـانجی (فیلیپـی چـاک) و جێگـرەوەکەی (چـارل ١٤٦٧-١٤٧٧ ز)؛ دامەزرانـدنی دەوڵەتێکـی بەهێزبـوو لە ناوەڕاسـتی نێـوان هەردوو دەوڵەتـی (فەڕەنسـی) و ئیمپڕاتۆرییەتی (ڕۆمانی پیرۆز)دا. بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم ئامـانجە؛ دەستیکرد بە کڕینی زەوی نوێ لە (لۆرین و بەرزاییەکانی ئەلزاس). (چارل) گرنگییەکی زۆری بە

---

(١) سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا العصور الوسطى، ج١/ ص٤٩٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ج١/ ص٤٩٣.

کۆشک و هەموو دیاردە و ڕێوڕەسمە پاشایەتییەکەی دەدا، کۆمەڵێک سەربازی بە ڕازاوەترین شێوە تایبەتکرد بە دەورووبەری کۆشکەکەیەوە[1].

### لویسی یازدەهەم (١٤١٦-١٤٨٣ ز)

هەوڵی مەزنەکانی (بورگوندیا) و هەڵپەکانیان لە بەردەم (لویسی یازدەهەم)دا شکستیهێنا، چونکە (لویسی یازدەهەم) بە بەتواناترین پاشای (فەڕەنسا) و تەنانەت بەتواناترین پاشای ئەورووپای سەدەی پازدەهەم دادەنرێت! (لویسی یازدەهەم کوڕی چارلی حەوتەم) بوو، لەگەڵ بەتوانایی و لێهاتووییەکەیدا؛ کۆمەڵێک مرۆڤی بەناوبانگ و باش و بەتوانای لە دەوری خۆی کۆکردەوە کە زۆربەیان لە چینی گشتی بوون. ئەم پاشایە هەمیشە تێکەڵی ئەم چینە و دانیشتووانی شارەکان دەبوو، زیاتر گرنگی بەم چینە دەدا لە کۆمەڵدا، نەک بە چینی خانەدانەکان. (لویسی یازدەهەم) هەندێک ڕەفتاری زۆر نامۆ بوو؛ بەتایبەتی ئەو جلانەی کە دەیپۆشی، پیاوێکی بچووک و دەموچاو ناشیرین بوو، بەڵام زۆر زیرەک و دیپلۆماس و کارگێڕێکی لێهاتوو بوو، لە سەردەمی خۆیدا هاوتایەکی نەبووە[2]!

لە کاتێکدا مەزنی بۆرگووندیا (چارل) سویسرای داگیرکرد و لە ساڵی (١٤٧٧ ز)دا هەر لەوێدا کوژرا؛ (لویسی یازدەهەم) ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ تێکشکاندنی هەژموونی (بۆرگوندیا)، سەرکەوتنیشی بەدەستهێنا. هێشتا سەدەی پازدەهەم کۆتایی نەهاتبوو؛ هەرێم و میرنشینە دەرەبەگییەکان هەتا ئەندازەیەک سەربەخۆیی خۆیان هەبوو، هەموویان بە وڵاتی فەڕەنساوە لکێنرانەوە. (لویسی یازدەهەم) زۆر چاودێری بەرژەوەندی چینی بۆرژوازی دەکرد؛ بینی کە ئەم چینە زۆر بەهێزترە و چیدی پێویستی بە دامودەزگا دەرەبەگییەکان نەماوە، بەتایبەت (ئەنجوومەنی چینەکان). بە هاتنی ساڵی (١٥٠٠ ز)، پاشاکانی (فەڕەنسا) توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن، لە ملکەچپێکردنی هەموو فەرمانڕەوا دەرەبەگییەکان و دەسەڵاتیان بەسەر شارەکاندا سەپاند، بە ئەندازەیەکی بەرفراوان کڵێساشیان خستە ژێردەسەلاتی پاشایەتییەوە[3].

---

(١) عبدالامیر محمد امین و: تاریخ اوروبا في العصور الوسطی، ج١/ ص١٨٣.
(٢) هەمان سەرچاوە.
(٣) عبدالقادر احمد الیوسف: العصور الوسطی الاوروبیة، ص١٨٦.

# بەشی شانزەیەم

## دادگاکانی پشکنین

## لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

- ناساندنی و دەرکەوتنی پشکنین
- هۆکاری دەرکەوتنیان
- سەرەتاکانی دادگاکانی پشکنین
- پێکهاتەی دادگاکانی پشکنین
- تاقیکردنەوەی تۆمەبیار
- بەجێگەیاندنی سزا
- سزا دراوانی دادگاکانی پشکنین
- دادگاکانی پشکنین و مامەڵەیان لەگەڵ جووەکان
- دادگاکانی پشکنین و مامەڵەیان لەگەڵ موسڵمانان
- سزادانی مەسیحییە پڕۆتستانتەکان

## دادگاکانی پشکنین لە سەدەکانی ناوەڕاست

مێـژووی ئەورووپـای سـەدەکانی ناوەڕاسـت، لە چەنـد قۆنـاغێکی جیاوازیـدا مێژوویەکی تاریک و تێکسمڕاو لە ستەم و کوشتارو چەوساندنەوەیە، ئەمەش لە کـایە جیاوازەکـانی ژیـان و لە بەشـە جۆراوجۆرەکـانی نـاو ئەورووپـای ئەو سەردەمەدا بەدیدەکرێت، چ لە کایە کۆمەڵایەتی و رامیارییەکەدا، چ لە کایە ئایینی و بیروباوەڕییەکەدا، یاخود لە کایەی زانستیی و بوارەکانی پەیوەست بە پێشکەوتنی هزر و بیرکردنەوەی ناو ئەوروپای ئەو سەردەمە.

یەکێک لە پەڵە رەشەکانی ئەو ماوە مێژووییە کە ئەورووپای بۆ ماوەیەکی زۆر تووشی مەینەتی کرد، دامەزراندنی دادگاکانی پشکنین بوو لەسەر پێشنیاری پیاوانی ئـایینیی کڵێسـا و پشـتیوانیی ئیمپراتـۆر و دەسـەڵاتدارانی ئەوێ و پەیڕەوکردنـی لەلایەن هێزەکانی سەر بە دەوڵەت و دەسەڵات و ئیمپراتۆرییەت.

کاتێک شەپۆلێکی بیرکردنەوەی جیاواز لە بیرکردنەوەی نێو کڵێسا و تێڕوانینی نێو کۆشکی ئیمپراتۆریی لە ئەورووپادا پەیدا بوو و هەریەک لەو دوو دەسەڵاتە وەڵامێکی رازیکەریان پێ نەبوو بۆ ئەو بیرکردنەوە جیاوازانە، ناچار بیریان لەوە کـردەوە بە هەردوو شـێوازی سـەرکۆنەی ئـایینی و سـزادانی جەسـتەیی بەر بەو شـەپۆلە بگـرن، بـۆ ئەمەش کڵێسـا دەسـتی بـرد بـۆ بە (هەرتەقە) [1] ناسـاندنی ئەو کەسانی جیاواز لە بیرکردنەوەی کڵێسـا بیریـان دەکردەوە، دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریش پشتیواني هەر چەشنە سزادان و بێبەشکردن و کوشتنێکی ئەو هەرتەقانەی دەکرد، تەنـانەت هەڵگرانـی ئـایینی مەسـیحییەتیش خۆیـان بێـبەش نەبـوون لە مەینەتـی و ئەشکەنجەی دادگاکانی پشکنین و هەڵگرانی رێبازی پرۆتستانتی زۆرجار دەبوونە سووتووی نێو ئاگردانی دادگاکانی سەر بە کڵێسای کاسۆلیکی، کار گەیشتە ئەوەی ئـــاهەنگی جەمـــاوەریی ســـاز دەدرا بـــۆ ســـووتاندنی بە کـــۆمەڵی هەرتەقە و بیرجیاوازەکان و هەندێ جار خودی ئیمپراتۆر و رێبەرانی ئایيني مەسیحییەتیش ئامادەی ئەو مەراسیمانە دەبوون.

---

(١) - هەرتەقە لە بنەرەتدا وەرگیـراوی دەسـتەواژەی یۆنـانی (AIRESIS) بـوو کە واتـای رای تـایبەتی تاکەکەسـیی ناتەریب بە راوبۆچوونی پیاوانی کڵێسـای دەگەیاند. بروانە (د. بسـام اسـخیطة: قصـة محـاکم التفتیش في العالم، الطبعة الأولى، دار هیا، سنة ٢٠٠٠، ص ١٣).

## ناساندن و دەرکەوتنی دادگاکانی پشکنین

دەستەواژەی دادگاکانی پشکنین لە زمانی کوردیدا وەرگێڕاوی هەریەک لە دەستەواژە ئینگلیزی و فەڕەنسیەکانە کە دواتر وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبیی و لەوێشەوە بۆ سەر زمانی کوردیی، واتە سەرەتا ڕاستەوخۆ دەستەواژەکە لەو وشە سەرەکیە ئەورووپیەکەوە وەرگێڕانی بۆ نەکرا، بەڵکوو وەرگێڕانی دەستەواژەی عەرەبیەکەیە (محاكم التفتيش).

دادگاکانی پکشنین کە لە زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسیشدا دەستەواژەی (INQUISITION) بۆ بەکارهاتووە، وەرگیراوی وشەیەکی لاتینیە (INQUISITION) کە مەبەست پێی گەڕان و پشکنین و کنە و لێکۆڵینەوەیە، ئەم دادگایانە ئاستێک سەرووتر لە دادگا ئاساییەکانەوە بوون و لەلایەن قەشەیەکەوە سەرپەرشتیی دەکران کە خودی پاپا رایدەسپارد بەو ئەرکە هەتا لێپێچینەوەو سنووردانانی هەبێت بۆ ئەوانەی پێیان دەوترا هەرتەقە و لەرێ دەرچوو، زیاتریش مەبەست پێی لێپێچینەوەی ئەو کەسانە بوو کە لە بیروباوەڕ و بیرکردنەوەی کڵێسا لایاندەدا و را و بۆچوونی جیاوازیان دەبوو.[1]

بەشێوەیەکی گشتی دادگاکانی پشکنین لە ناوچە جیاوازەکانی ئەورووپادا وەک (ئیتاڵیا ، فەڕەنسا و ئیسپانیا ، پورتوگال) هەبوون، دواتریش لە ئەمریکای باشوور دامەزران، ئەمانە جەنگێکی سەختیان دژ بە هەموو ئەو کەس و تەنانەت دەسەڵاتانەش بەرپاکرد کە ناتەریب بوون بە بیروباوەڕیان.[2]

### هۆکاری دەرکەوتنیان:

جیاوازی لێکدانەوەکان بۆ مێژوو، جیاوازی دەرکەوتنی دادگاکانی پشکنینیشی لێکەوتۆتەوە، بۆ نموونە هەندێکیان بە هۆکاری ئایینی و رێگرتن لەلادان لێکیانداوەتەوە، مارکسیەکانیش پێیان وایە پاڵنەری بەرگریی لە دەرەبەگایەتی و جیاوازیی چینایەتی هۆکار بووە، بەڵام ئەوەی زیاتر روونە، پاراستنی بیروباوەڕی مەسیحییەتی کاسۆلیکی و سەرکوتکردنی نەیارەکانی بوو، چ لە دەرەوەی مەسیحییەت وەک جوولەکە و ئیسلام، چ لەناو مەسیحییەتدا وەک پرۆتستانتی

---

(١) - د. بسام اسخيطة: س،-پ ص ١٣.

(٢) - رمسيس عوض: من اوراق الحروب الصليبية و محاكم التفتيش في فرنسا، الطبعة الأولى، مكتبة الشروق الدولية، القاهرة، سنة ٢٠١٢، ص ٧.

وکڵێسا مەسیحییەکانی دی، بۆ ئەمەش هەوڵیدەدا پاراستنی بەرژەوەندییە چینایەتی و پادشاییەکان تێکەڵ بەم دۆسییەیە بکات.[1]

لە کۆتاییەکانی سەدەی دوانزەیەمدا نارەزایەتیەکی زۆر بەرامبەر بیر و بڕیاری کڵێسا لە ئەوروپادا پەیدابوو کە هاوارێک بوو بۆ رزگاربوون لە بیری کەهەنووتیی کڵێسا، هاودەم بەمەش شەپۆلێکی بیری ئایینی لە خۆرهەڵاتەوە هاودەم بە گەڕانەوەی خاچپەکان بۆ وڵاتەکانیان رووی لە جیهانی مەسیحیی ئەوروپا کرد، چ ئەوەی پەیوەست بوو بە بیرە ئایینیە فارسیە کۆنەکانەوە وەک مانەویی و مەزدەکی، چ وەک ئایینی ئیسلام کە رەخنەی لە پەیکەر و دەسەڵاتی باڵای پیاوانی ئایینی دەگرت، ئەمەش جۆرێک لە هەڵگەڕانەوەی لێکەوتەوە بەرامبەر بیری ئایینی کڵێسای ئەوروپا، لەوێوە دەست برا بۆ خوێندنەوەیەکی دیکە بۆ ئایینی مەسیحییەت، بۆ نموونە لە ساڵی (١١٧٠ز) دا بازرگانێک بە ناوی (بوتروس والدۆ) ژمارەیەک کەسی راسپارد بۆ وەرگێڕانی پەرتووک پیرۆز بۆ سەر زمانی لانجیکە لە باشووری فەرەنسادا بەکاردەهات، بەرەبەرە بیرێکی ئایینی جیاواز لە بیرکردنەوەی پیاوانی ئایینیی نێو کڵێسا سەریهەڵدا، بەرامبەر بەمەش مەسیحییەت هەوڵیدا بە زەبر بەر بەو لێشاوە بگرێت.[2]

## سەرەتاکانی دادگاکانی پشکنین

سەرەتاکانی دادگاکانی پشکنین بە جۆرێک لە سەربەخۆیی دەستیان پێکرد، واتە ئەو دادگایانە بەشێک نەبوون لە دەزگای دادوەریی وڵات، بەڵام دواتر بون بە بەشێک لە دەزگای دادوەریی وڵات و مامەڵەیەکی فەرمی ناو ئەو دەزگایان هەبوو، بەتایبەت ئەمە لە دادگاکانی پشکنینی ئیسپانیادا دەبینین.[3]

ئەگەرچی دادگاکانی پشکنین وەک دامەزراوەیەک لە سەدەی دوازدەیەمەوە دەرکەوتن، بەڵام پەیڕەوی کاری ئەو دادگایانە پێشینەیەکی پێشتری هەبوو، دەتوانین بڵێین درووستبوونی دادگاکانی پشکنین پێشتر بە چەند قۆناغێکی پێشەکیدا

---

(١) – د. بسام اسخيطة: س-پ، ص ٢٥.

(٢) – ول ديورانت: قصة الحضارة، ترجمة: د. زكي نجيب و آخرين، دار الجيل، (بيروت – ١٩٨٨)، ج١٦/، ص ٧٦.

(٣) – جوزيف بيريز: التاريخ الوجيز لمحاكم التفتيش بإسبانيا، ترجمه: د. مصطفى أمادي، الطبعة الاولى، (أبوظبى – ٢٠١٢)، ص ١٣١.

تێپەر بوو هەتا مۆرکێکی تەواو فەرمی وەرگرت، هەریەک لەو قۆناغانەش بەپێی کات و شوێن جیاوازییان هەبوو، وەک قۆناغی رووخانی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی هەتا سەدەی سیانزەیەم، قۆناغی دادگا پیرۆزەکان کە لەلایەن خودی پاپا و دۆمۆنیکان و فرەنسیسەکانەوە سەرپەرشتی راستەوخۆ دەکرا، قۆناغی داداگا پشکنینە میرییەکان کە لەلایەن خانەدان و پاشاکانەوە لەژێر چەتری کڵێسادا بەرێوە دەبرا، هەروەها دادگاکانی پشکنینی (ئیسپانی ، پورتوگالی ، فەرەنسی و ئیتالی)،[١] بەڵام لە سەرەتادا هەنگاوی یەکەمی کڵێسا سزادانی جەستەیی ئەو کەسانە نەبوو کە تاوانی لادانیان بەسەردا ساغ دەکرایەوە، بەڵکو بێبەشکردنیان بوو لە بوارە رۆحیە مەسیحیەکان، واتە سزادانێکی رەوانی و باوەرداری بوو، هەر پیاوێکی ئاینیش مافی ئەوەی هەبوو ئەم سزایە بەسەر هەر کەسێکدا بسەپێنێت، ئەم سزادانەش رەنگدانەوەی یاسایی و کۆمەڵایەتیشی هەبوو، ئیتر ئەو کەسە مافی میراتی نەدەما، تێکەڵاویی کۆمەڵگەی مەسیحیی لێ قەدەغە دەکرا، مافی گەواهیدانی لێ دەسەنرایەوە، تەنانەت هیچ مەسیحیەک نەدەبوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات و دەبوایە هەموان دەنگیان لێ دابرِیایە،[٢] دواتر بە تێپەربوونی کات لەبەرئەوەی ئەنجامی تەواوەتییان لەو جۆرە سزادانە وەرنەگرت، دەستیانبرد بۆ سزادانی جەستەیی هەر لە گرتن و ئەشکەنجەدانەوە هەتا کوشتن و لەناوبردن.[٣]

لە سەدەی چوارەم و لە ساڵی (٣٨٥) ی زاینیدا بریسیلیانی بیریاری ئیسپانیی لەلایەن ئیمپراتۆر (ماکسیمۆسەوە) بریاری گرتنی درا و دواتر لەسەر راوبۆچوونەکانی هاودەم بە ژمارەیەک لە شوێنکەوتەکانی سووتێنرا، ئەم حاڵەتەش لە سەردەمەکانی دواتری (سیۆدیۆسی دووەم) و (جستنیانیشدا) بە ناوی مەرگی هەرتەقەکانەوە بەردەوام بوو، بەڵام بارودۆخەکە بۆ دەسەڵاتی پاپایی کڵێسا زۆر جێی بایەخ نەبوو هەتا سەدەی یازدەیەم کە ئیتر بەرەبەرە بری جیاوازی بیریارانی ئەورووپا و کەسانی نامەسیحیی مەترسیی بۆ سەر بیروباوەریی مەسیحی دروستکرد، سەرەتاکەشی دەرکەوتنی بزووتنەوەی لەبیی بوو لە باشووری فەرەنسا کە بەدوایدا چەند بزاوتێکی دی دەرکەوتن و گۆرانی کۆمەڵایەتیی و

(١) - د. بسّام اسخيطة: م.س، ص ١٧ - ٢١.

(٢) - ول ديورانت: س-پ، ج١٦، ص ٤٧.

(٣) - د. بسام اسخيطة: س-پ، ص ١٧ - ٢١.

رۆشنبیریی و ئابووریشی لێکەوتەوە هەتا گەیشتە دەستبردن بۆ پرسە ئایینییەکان، ئەمەش نووسینەکانی (کۆمیدیای جودایی) دانتی و راوبۆچوونەکانی (بوترۆس ئەبیلارد) و (رۆجەر بیکۆنی) بەدوادا هات، ئەم دیوی رەخنەگرتن و هەوڵی گۆڕانکارییە ئایینی و هزرییە، وای لە کڵێسا کرد بیر لە دامەزراندنی رەسمیانەی دادگاکانی پشکنین بکاتەوە و بڕیاری سزادانی ئەو جۆرە کەسانە بدات و بە زەبری یاسا و سزادان ئەو هێرشانە بۆ سەر کڵێسا و مەسیحییەتی سەدەکانی ناوەڕاست رابگرێت، ئەم ئەرکەش بە پیاوانی ئایینی مەسیحییەت سپێردرا هەتا ئەرکی دەستنیشانکردنی کەسانی لادەر بگرنەئەستۆ.[1]

راجیاییەک لەنێوان مێژوونووساندا هەیە سەبارەت بە سەرەتای دەرکەوتنی دادگاکانی پشکنین، بۆ نموونە (سلۆسیری) مێژوونووسی ئەڵمانی پێی وایە لەنێوان سالانی (١١٩٨ز و ١٢٣٠ز) دا دادگاکانی پشکنین دەستیانپێکرد، کاتێک پاپا (ئینۆسنتی سێیەم) لە ساڵی (١٢٠٣ز) دا نووسراوێکی فەرمی نووسی بۆ سزادانی هەرتەقە مانەویەکانی لەنێو فەرەنسادا، بەلام (جاکی) مێژوونووسی فەرەنسی پێی وایە لەنێوان سالانی (١٢٢٧-١٢٢٩ز) دا دادگاکان پشکنین دامەزران، (شانونی) مێژوونووسی ئەمریکیش کە خۆی کەسێکی ئایینیە، پێی وایە لە سەردەمی پاپا (گریگۆری نۆیەمدا) دادگاکانی پشکنین دامەزران بەتایبەت لە ساڵی (١٢٣١ز) دا.[2]

نموونەی زەقی سەرەتاکانی دامەزراندنی دادگاکانی پشکنین دەگەڕێتەوە بۆ رووداوی ساڵی (١٢٢٩ز) کاتێک کڵێسا کۆبوویەوە بۆ جەختکردنەوە لە سزادانی هەرتەقە و لادەرەکان، هەرچەندە بەشێک لە پیاوانی ئایینی مەسیحییەت پرسەکەیان زۆر بەهەند وەرنەگرت، بەلام مکوڕبوونی بەشێکی دی لەوان، وایکرد یەکەمین دادگاکانی پشکنین دابمەزرێنرێن، بەدوای ئەوەدا کۆڕبەندەکانی سالانی (١٢٣٤ و ١٢٣٩ز) و (١٢٤٦ و ١٢٥٤ز) هاتن بۆ جەختکردنەوە لەسەر هەمان پرس.[3]

(فریدریکی دووەم) لە ساڵی (١٢٣٢ز) دا ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ ئەوپەڕی یارمەتیدانی کڵێسا و خستنەگەڕی سەرجەم دامەزراوەکانی دەوڵەت بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی پشکنین و سزادانی هەرتەقە و لادەران، مافیشیان پێ درابوو

---

(١) د. بشرى محمود الزوبعي: محاكم التفتيش الاسبانية، الجامعة المستنصرية، ص ١٩-٢٣.

(٢) - د. بسام اسخيطة: س-پ، ص ٢٢.

(٣) - رمسيس عوض: محاكم التفتيش، دار الهلال، ص ٧-١٣.

گومـان لە هەر کەسێک بکەن دەستگیری بکەن هەتـا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکرێت، پاش سەلماندنی پاکێتیەکەی ئینجا ئازاد بکرێت، ئەمەش لە سەردەمی (فریدریکی دووەمدا) بوون بە بەشێک لە یاسای فەرمی وڵات و نەریتی سیستەمی دەرەبەگایەتیی.[١]

## پێکهاتەی دادگاکانی پشکنین

ئەم دادگایانە بەشێوەیەکی فەرمی پشتیان دەبەست بە لێکۆڵەری گشتیی، بۆ نموونە (تورکیمادا) وەک لێکۆڵەری گشتیی دادگاکانی پشکنینی شانشینی قشتاڵە دەستنیشانکرا، دواتر بوو بە لێکۆڵەری گشتیی سەرجەم ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی گشتیی (فردیناند) و (ئیزابێلا)، هاوکات ئەنجومەنێکی دادگای پشکنین هەبوو کە پێی دەوترا (La Suprema) کە ژمارەیەک لە ئەندامانی ئەنجومەنی پادشایەتیشی لەخۆدەگرت، ئەوانەیان کە بەرپرس بوون لە دۆسیەی کاروباری ئاینی، دەسترۆییەکانی ئەم ئەنجومەنەش دیاریکراو نەبوون، بەڵکو پەیوەست بوو بە ئاستی بەهێزیی دادوەری گشتی و سنووردانان بۆ دەسەڵاتەکانیان.[٢]

سنووری دەسترۆیی دادگاکانی پشکنین هێندە زۆر بوو کە لە ئاستی لێپێچینەوەی کەسەکاندا نەوەستا، بەڵکو دەستیان دەبرد بۆ پشکنینی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و پەیوەندییەکانی وڵات و دەستبەسەرداگرتنی ئەو کتێبانەی لەگەڵ بیری مەسیحییەتدا نەدەهاتنەوە، بۆیە لە ئیسپانیادا پشکنینیان دەکرد بۆ کەشتیە بازرگانییەکان و هەر کتێبێک پێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆیان بوایە، رێیان لێ دەگرت، بەتایبەت هەر دەریاوانێک گومانی (لۆسەریی) بوونی لێ بکرایە، زۆر بە وردی پشکنین بۆ کەشتیی و شمەکە هاوردەکانی دەکرا، دواتر یەکەیەکی تایبەتی بۆ دروستکرا و دادگای گەڕۆکی دەریایی وەک لقێکی دادگاکانی پشکنین دامەزرا.[٣]

## تاقیکردنەوەی تۆمەتبار

ئەو کەسەی تۆمەتی هەرتەقەی ئاراستە دەکرا، سەرەتا دەستگیر دەکرا، دواتر بە چەند شێوەیەک سزا دەدرا هەتا بزانرێت ئایا تۆمەتەکە راستە یان نا:

---

(١) – ن.م، ص ١٥-١٦.

(٢) – جوزیف بیریز: س-پ، ص ١٣١ – ١٤١.

(٣) – ە-س ص ١٤٣.

**یەکەم:** ئاسنێکی سوورەوەکراو دەخرایە ناو دەستی تۆمەتبارەکە و نۆ چرکەیەک دەهێڵرایەوە، ئەگەر برینی بۆ دروست بوایە، ئەوە بەڵگە بوو بۆ ئەگەری تاوانباربوونی.

**دووەم:** ئاوی بەکوڵ دەکرا بەدەستیدا، ئەگەر هەتا ٣ رۆژ برین دەربکەوتایە، ئەوە وەک نیشانەیەکی خودایی تەماشا دەکرا بۆ سەلماندنی تاوانباربوونی کەسەکە.

**سێیەم:** تۆمەتبار دەخرایە ناو سەهۆلاوەوە، ئەگەر کەسەکە بکەوتایەتە ژێر ئاو، ئەوە بەڵگەی پاکێتی بوو، ئەگەریش سەری دەربکردایە، بەڵگەی تاوانباریی بوو.

**چوارەم:** پارووە نانێکی گەورە بە کێشی ئۆقیەیەک دەدرا بە تۆمەتبار، ئەگەر قووتی بدایە ئەوە بێتاوان بوو، ئەگەرنا دەبوو بە بەڵگەی تاوانباربوونی و پێیان وابوو تاوانەکانی هۆکارن بۆ ئەوەی نەتوانێت پارووەکە قووت بدات.

**پێنجەم:** پشکۆیەکی زۆر رادەخرا و چاوی کەسەکە دەبەسترا، ئەگەر کەسەکە بێتوانیایە بەبێ سووتان دەربازبێت، ئەوە بەڵگەی بێتاوانی بوو، ئەگەریش بسووتایە ئەوە دەبووە بەڵگەی تاوانباربوونی.[1]

هەر دادگایەکی پشکنین لەم کەسانە پێکدەهات:

دوو لێکۆڵەر

دوو سکرتێر

داواکارێکی گشتیی

ئەفسەرێکی پۆلیس

نوێنەرێکی پاپا

دەرگاوانێک

دادوەرێکی تایبەت بە شمەکە دەستبەسەرداگیراوەکان

پزیشکێک

نووسەر

هەموو ئەمانەش لەلایەن خودی لێکۆڵەری گشتییەوە دەستنیشان دەکران و تیایدا راوێژ بە ئەنجومەنی باڵای دادگاکانی پشکنین نەدەکرا.[2]

دواتر گوتەی تۆمەتبار وەردەگیرا، هەرچەندە پێشوەختە ئەو بڕیارە درابوو کە هەرکەس ئیشی بکەوێتە لای دادگاکانی پشکنین، تاوانبارە، ئیتر ئایا خۆی بەشێک

---

(١) - رمسیس عوض: س-پ، ص ٧.

(٢) - جوزیف بیریز: س-پ، ص ١٤٦.

بێت لە تاوانەکە، یان هاودەمی تاوانبارانە، بۆیە دەگمەن بوو لە بریارێکی سەخت و سزادان دەرباز ببێت، بەم چەشنە لە دادگایی کردنەکەدا زیاتر شرۆڤەی تاوانەکەی دەکرا، نەوەک راستی و ناڕاستیی تاوانەکەی.[1]

**بەجێگەیاندنی سزا:**

سزادان بەسەر هەموو ئەوانەدا جێبەجێ دەکران کە حوکمیان لەسەر دەدرا، بەگشتیش سزادانەکە بە سووتاندن بوون چونکە کڵێسا هەوڵی دەدا خوێن نەڕژێت، ئەم ئەرکەش لەلایەن خودی کڵێساوە جێبەجێ نەدەکرا، بەڵکوو دەسپێردرا بە لایەنی جێبەجێکاری سەر بە دەوڵەت.[2]

پاش ئەوەی بڕیاری سزادانی کەسەکان دەردەچوو، زۆرجار رۆژێک دەستنیشان دەکرا بۆ سزادانی کەسەکە، جاری واهەبوو سزادانەکە بە نهێنی بوو و کەسەکە لەسێدارە دەدرا یان بە یەکێک لە شێوازەکانی لەناوبردن لەناودەبرا، جاری وایش هەبوو بە ئاشکرا و بە ئامادەبوونی خەڵک ئەنجام دەدرا، دەبوو لە سەرەتادا کەسەکە دان بە تاوانەکەیدا بنێت و لەلایەنە ئیمانیەکەوە تەوبە بکات، ئینجا سزاکەی بەسەردا جێبەجێ دەکرا، مەبەستیش لێی چاوترسێنی خەڵکی تر و راگرتنیان بوو لە هەر ئەگەرێکی لادان لە بیروباوەڕی کڵێسا، هەندێ جاریش ئاهەنگی گەورەی بۆ سازدەدرا و رۆژانی یەکشەممە دەستنیشان دەکرا کە رۆژی پشوو بوو هەتا جەماوەرێکی زیاتر ئامادەییان هەبێت، جاریش هەبوو وەک ئاهەنگێک بۆ هاتن، یان ئامادەبوونی یەکێک لە پادشا و سەرکردە دیارەکان، ئاهەنگی سزادانەکە رێکدەخرا، وەک ئاهەنگی سزادانی ساڵی (١٥٢٨ز) لەکاتی سەردانی پادشا (شارلی پێنجەمدا) بۆ بلنسیە.[3]

## سزادراوانی دادگاکانی پشکنین

بەشێوەیەکی گشتی سزادراوانی دادگاکانی پشکنین بریتی بوون لە هەموو ئەوانەی تەریب بە بیرکردنەوەو بیروباوەڕی کڵێسای کاسۆلیکی بیریان

---

(١) - د. بسام اسخيطة: س-پ، ص ٦٦ -٧٠.

(٢) -ه-س، ص ٩١.

(٣) - جوزيف بيريز: س-پ، ص ١٩٦-١٩٩.

نەدەکردەوە، ئیتر لە بازنەی ئایینەکاندا بێت، وەک موسڵمانان و جووەکان، یان لەبازنەی مەزهەبیدا بێت، وەک (لۆسەریی) و (پرۆتستانت)، یاخود لەبازنەی زانستیدا بێت ئەو کاتەی بیردۆزەیەکی زانستیی پێچەوانەی دید و بیرکردنەوەی کڵێسا دەبوو.

## دادگاکانی پشکنین و مامەڵەیان لەگەڵ جوولەکەکان

جوولەکەکان لە دێرزەمانەوە لە ئەورووپا نیشتەجێ بوون، ئەوان لە ساڵی حەفتای زاینییەوە لەوێ بوون، کاتێک پەرستگای (ئۆرشەلیم) کاول کرا، هەزاران جوولەکە بە کۆیلە گیران و برانە ئەورووپا و لەوێ فرۆشران، بەڵام جوولەکە دەوڵەمەندەکان هەوڵی ئازادکردنەوەی ئەو کۆیلانەیان دا و دوابەدوای ئەوە لە چەند ناوچەیەکی جیاجیادا نشینگەی کۆبووەوەی جوولەکەکانیان پێکهێنا (جیتۆ)، لەوێ خوویان دەدایە پیشەی جیاواز و کاری دەستی و بازرگانیی و کڕینی زەویوزار، بەتایبەت لە ئیسپانیادا چڕبوونەوەی زیاتری جوولەکەکان بەدیدەکرا.[1]

بە هاتنی مەسیحییەت بۆ سەر کورسیی دەسەڵاتی ئەورووپا و سەپاندنی ئایینەکە لە خواستەوە بۆ زۆرەملێ، لە سەرەدەمی (ئیرفیحدا) جوولەکەکان ناچار کران بەوەی یان دەبێت ببن بە مەسیحی، یاخود لە ماوەی یەک ساڵدا وڵات جێبهێڵن، بەشێکی زۆر لە جوولەکەکان ناچار بوون بە رووکەش مەسیحیبوونی خۆیان رابگەیەنن، بەڵام بارودۆخەکە لەوە خراپتر بوو، بڕیارێکی سەختتر یەخەی جوولەکەکانی گرتەوە، کاتێک کۆڕبەندی (تولەیتیلە) لە سەردەمی (ئەخیکادا) بڕیاریدا هەرچی جوولەکەیەک لە وڵاتدا هەیە مامەڵەی کۆیلەی لەگەڵدا بکرێت و منداڵە جوولەکەکان لە باوک و دایکیان جیابکرێنەوەو بکرێنە مەسیحیی و پەروەردەیەکی مەسیحیانەیان بەسەردا زاڵ بکرێت.[2]

بارودۆخی جوولەکەکان لە ئەورووپادا بەردەوام لەوپەڕی خراپەدا بوو، لە ساڵی (١٢٣٠ز) دا بڕیار درا دەبێت هەموو جوولەکەیەک سێ یەکی داهاتی خۆی بدات بە

---

(١) – د. هدى درويش: أسرار اليهود المتنصرين في الأندلس، عين للدراسات، الطبعة الأولى (٢٠٠٨)، ص ٩.

(٢) – سناء عبداللطيف حسين صبري: الجيتو اليهودي، الطبعة الأولى، دار البشير، (جدة – ١٩٩٩)، ص ١٢٦ – ١٢٧.

دەوڵەت، دواتر لە ساڵی (١٢٩٠ز) دا بڕیار درا لە ماوەی سێ مانگدا جوولەکەکان لە بەریتانیا وەدەرنرێن، پێش دەرچوونیان لەو وادەیەدا، ماڵ و حاڵیان سووتێنرا، تەنانەت (٥٠٠) جوولەکە لە قەڵای (یورک) سووتێنران.[١]

لە ساڵی (١٣٩٠ز) دا لە ئەندەلوس جوولەکەکان هێرشی سەختیان کرایەسەر و کوشت و بڕێکی زۆر کران و لە ماوەی سێ مانگدا هەر جوولەکەیەک کە نەبووبوو بە مەسیحیی، ناچار کرا وڵات جێبهێڵێت، ئەگەرنا لەسێدارە دەدرا، دیاردەی لێکۆڵینەوە لە راستگۆیی بەمەسیحیبوونەکەشیان لەلایەن دادگاکانی پشکنینەوە سەرپەرشتیی دەکرا.[٢]

لە ساڵی (١٤١٢ز) دا شاژنەکاترین بڕیاریدا جوولەکەکان لە ناوچەیەکدا دابڕ بکرێن و جۆری جلوبەرگ و روخساریان جیاواز بێت لە کۆمەڵگە و بێبەشیش بکرێن لە پشە گرنگەکانی وەک پزیشکی و ئاسنگەریی و دارتاشی و بەرگدرویی و بازرگانی.[٣]

لە ساڵی (١٤٨١ز) دا هەڵمەتێک لە ئیسپانیا ئەنجامدرا بۆ لێکۆڵینەوە لەو جوولەکە بەمەسیحیبوانەی کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرا بە رووکەش بووبنە مەسیحی، لە ماوەی دوو ساڵدا حەوتسەد هەڵمەتی چالاکیی و لێپێچینەوەیان بەرامبەر گیرایەبەر و لەسێدارەدان و سووتاندنی ژمارەیەکی بەرچاوی جوولەکەکانی لێکەوتەوە.[٤]

لە ساڵی (١٤٨٣ز) دا دادگاکانی پشکنین کەوتنە کوشتوبڕی جوولەکەکان، ئەمجارەیان رەچاوی ئەو جوولەکانەشیان نەکرد کە بووبوون بە مەسیحیی، چونکە پێیان وابوو مەسیحی بوونەکەیان بە رووکەشە و لە بنەڕەتدا لەسەر ئایینی جوولەکایەتی خۆیان ماونەتەوە، (دە) ساڵ پاش ئەوە، تەنها جوولەکەیەک لە وڵاتدا مایەوە کە تەمەنی نەگەیشتبوویە (١٤) ساڵ، ئەوانیش دەبوو پەروەردەیەکی مەسیحیی وەربگرن، سەرجەمی جوولەکەکانی تر لە وڵات وەدەرنران.[٥]

---

(١) – س-پ، ص ١٣٠-١٣١.

(٢) د. خالد یونس عبدالعزیز الخالدي: الیهود في الدولة العربیة الإسلامیة في الاندلس، دار الأرقم (غزة – ٢٠١١)، ص ٦٥-٦٦.

(٣) -جوزیف بیریز: س-پ، ص ٢٢.

(٤) – س-پ، ص ٢٣.

(٥) - سناء عبداللطیف حسین صبري: س-پ، ص ١٢٩.

## دادگاکانی پشکنین و مامەڵەیان لەگەڵ موسڵمانان

پـاش ئەوەی ئیسـپانیا لەدەسـت موسـڵمانان سـەنرا، هەوڵ درا بە شـێوەیەکی ریشـەیی ئیسـلام و موسـڵمانان لەو وڵاتەدا نریشـەکێش بکرێن، ئەمەش دەرفەتێکی باش بـوو بۆ دادگاکـانی پشـکنین هەتـا رۆڵـی کـارای خۆیـان لەو مەیدانەدا بگێڕن، بەتـایبەت کەسـایەتیەکی وەک تورکویمـادا کە پیـاوێکی ئـایینی بـوو و داخ لەدڵ بـوو بەرامـبەر بە موسـڵمانان، هاوکـات دەسـەڵاتیش خۆشـحاڵ بـوو بەم کـارە، چـونکە وێڕای لەنـاوبردنی موسڵمانان و نەمـانی مەترسـیی لەسـەر دەسەڵاتەکەی، هاوکـات دەسـت دەگیـرا بەسـەر سـامانیاندا و سـامانەکەش دەخـرایەوە نێـو خەزێـنەی پادشایەتی، هەمان حاڵەتیش بەرامبەر بە جوولەکەکان دەگیرایەبەر، بەڵام بۆ ئەوان جۆرێک لە دەستشلکردنی تێدابوو بەهۆی ئەوەی جوولەکە ئـایینێکی داخراو بـوو و مـوژدەبەریی تێـدا نەبـوو، هەروەهـا پێشـتریش هێزێکـی سـەربازی و دەسـەڵاتێکی رامیارییان لەو ناوچەدا نەبوو.[1]

ئامـانجی دواتـری دادگاکـانی پشـکنین بە مەسـیحی کردنـی زۆرەملێیـانەی موسـڵمانان بـوو، ئەمەش پاکتـاوێکی ئـایینی بـوو کە بەرامـبەر بە مەسـیحیەکانیش دەگیرایەبەر، وەک پێشـتر باسـمان لێوەکرد، وەک دەبینین لە دەقی فەرمـی (فیلیپی سێیەمدا ١٥٩٨ - ١٦٢١ز) هاتووە (ئێوە چاک دەزانن کە من چەندین ساڵە چەندەها جۆر هەوڵم داوە بۆ ئەوەی مۆریسکیەکانی ئەمشانشینە بکەم بە مەسیحی).[2]

بەمەسـیحی نەبـوونی هەر موسـڵمانێک سـزای سـەختی بەدوادا دەهـات، ئەمەش خۆی لە دەقێکی فەرمی هەردوو پادشای مەسیحیی کاسۆلیکیدا خۆی دەبینیەوە کە تیایـدا هـاتبوو (مـادەم خـوای گەورە ئەم دوو پادشـایەی هەڵبـژاردووە بـۆ پـاککردنەوەی شانشـینی غەرنـاتە لە بێبـاوەڕان، بـۆیە بـوونی موسـڵمانان تیایـدا قەدەغەیە و هەرکەسیش سەرپێچی ئەمە بکات، سزاکەی یان کوشتنە، یان دەست دەگیرێت بەسەر ماڵ و سامانیدا)، ناچار موسڵمانانێک کە فریاکەوتن کۆچیان کردن رووەو مەغریـب، ئەوانەشـی کە لەوێ مـانەوە، موسـڵمانبوونی خۆیـان شـاردەوەو کەوتـنە ژێـر هەڕەشـەی بێڕەحمـانەی دادگاکـانی پشـکنینەوەو گومـان لە هەر موسـڵمانێک بکرایە بە موسـڵمانێتی مـابێتەوەو بە رووکەش بووبێـت بە مەسـیحی، سەرەتا بەند دەکرا، ئینجا دەست دەگیرا بەسەر سامانەکەیدا، دواتر لە بەندیخانەشدا

---

(١) - رمسيس عوض: من أوراق الحروب الصليبية و محاكم التفتيش في إسبانيا، ص ٧٣-٧٦.

(٢) - جمال يحياوي: سقوط غرناطة و مأساة الأندلسيين، دار الهممه، (الجزائر - ٢٠٠٤)، ص ٦٧.

جۆرەها ئەشکەنجەی سەخت دەدرا، دواتر کە بڕیاری کۆتایی دادگای لەبارەوە دەدرا، یەکێک لەم سێ بڕیارە دەبوو (بەندکردنی هەمیشەیی، دەستگرتن بەسەر هەموو ماڵ و سامانی و دەرکردنی لە وڵات، لەناوبردنی بە سووتاندن.[1]

لە ساڵی (١٥٠٢ز) دا بڕیاری (تەعمیدی) زۆرەملێ درا دژ بەو موسڵمانانەی لە ئەندەلوس دەژیان، واتە دەبوو منداڵەکانیان بە زۆر (تەعمید) بکرێن و هیچ بەخشین و سازشێکی تێدا نەبوو، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە و دڵنیابوون لە بەجێگەیاندنیشی، دادگاکانی پشکنین بە چڕی چاویان لەسەر موسڵمانە بەمەسیحی کراوەکان بوو.[2]

تەنها لە ئەندەلوسدا ئەو موسڵمانانەی بە بڕیاری دادگاکانی پشکنین سووتێنران، ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی (سی و دوو) هەزار کەس لە هەر دوو رەگەزی نێر و مێ، ئەو موسڵمانە ئەندەلوسیانەش کە لە دەست دەسەڵاتی مەسیحییەت رایانکرد، بەڵام لە راکردن دەرباز نەبوون و بە بڕیاری دادگاکانی پشکنین سووتێنران، ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی (بیست) هەزار موسڵمان، وێڕای سزادانەکانی تر کە نزیکەی (سێ سەد) هەزار موسڵمانی ئەو وڵاتە سزای سەختیان بەسەردا سەپێنرا، ئەم ژمارانە تەنها تایبەت بوون بە ناوچەیەکی وەک ئیسپانیاوە، ئەگەرنا لە کۆری وڵاتانی ئیسپانیا و هۆڵەندا و چەند ناوچەیەکی تر، تەنها بە سووتاندن لەلایەن دادگاکانی پشکنینەوە (سێ سەد) هەزار کەس سووتێنران و لەناوبران.[3]

تەنانەت دادگاکانی پشکنین دەستیانبرد بۆ دادگاییکردنی ئەو موسڵمانانەی کە مردبوون، پاش دادگاییکردنەکە، لە گۆڕەکەیان دەردەهێنرانەوەو تەرمەکەیان دەسووتێنرا.[4]

دەسەڵاتی دادگاکانی پشکنین تەنها لە سنووری بیروباوەڕی کەسەکان و سزادانیاندا نەدەوەستا، بەڵکو دەستیان دەبرد بۆ بوارە زانستیەکەش، بۆیە دەبینین لەژێر چاودێری کڵێسادا لە غەرناتە و دەوروبەری، سەرجەمی کتێب و نووسین و کتێبە پیرۆزەکانی موسڵمانان کۆکرانەوەو سووتێنران.[5]

---

(١) - علی محمد الصلابي: تاريخ دولتين المرابطين و الموحدين، الطبعة الثالثة، دار المعرفة (بيروت – ٢٠٠٩)، ص ٤٥٥.

(٢) - محمد رزوق: الأندلسيون و هجراتهم، أفريقيا الشرق، الدار البيضاء، ص ٦٢.

(٣) – ه‍-س، ص ٢٢.

(٤) - الصلابي: س-پ، ص ٢٨٣.

(٥) - محمد رزوق: س-پ، ص ٥٨.

شـێوازێکی تـایبەتی سـزادانی ژنـی موسـڵمان ئەوەبـوو کە ژنەکەیـان رووتـدەکردەوەو لە گۆڕسـتانێکدا دایانـدەنا و سـەریان دەخسـتە خـوار هەردوو ئەژنۆی و ئینجا دەیانبەستەوە بە ئاسنێکی داکوتراوەوەو قژیشیان بڵاودەکردەوە هەتا هەرکەس ببینێت وێنای جنۆکەی بۆ بکات، ئافرەتەکە بەو چەشنە جێدەهێڵرا هەتا شێت دەبوو یان لە برساندا دەمرد.[١]

دادگاکـانی پشـکنین بـۆ بەرگـرتن بە نەیارەکانیـان، جۆرەهـا سزای کوشندەیان داهێنا کە پێشتر زۆرێکیان بوونیان نەبوو، بۆ نموونە:

کورسیەکی ئاسنیان بۆ کەسی تۆمەتبار دادەنا و قاچیان بە رۆن چەور دەکرد، ئینجـا ئـاگر لەژێـر ئاسـنەکەوە هەڵـدەکرا هەتـا قـرچەی قـاچی تۆمەتبـارەکە دەهـات، تابووتێکیان دروستکردبوو کە چواردەوری بزمـارڕێژ کرابوو، تۆمەتبارەکەیـان تێدا دادەنا، هەر جووڵەیەکی بکردایە، بزمارەکان دەچوون بە لەشیدا.[٢]

دەست و قاچی تۆمەتبار دەبەسترایەوەو کڵاوێکی ئاسنینی دەکرایەسەر کە تەنها یەک کونی تێدا بوو، لە سەرەوە بە رێکی کونەکە دڵۆپە سەهۆڵاو بە تاوناتاوێک بەر سـەری دەکەوت، بەو شـێوە سـزا دەدرا هەتـا کەسـەکە تێکـدەچوو، تابووتێـک دروستکرابوو کە شوێنی کەسێکی تێدا دەبوویەوە، کەسەکەی تێدا دادەنرا، ئینجـا دەمـی تـابووتەکە دادەخرا کە چەقۆی تیژی پێوە جێگیر کرابوو، ئیتر جەستەکەی کەسەکە پارچەپارچە دەبوو، بە قولاپی تیژ و گەورە مەمکی ئافرەتیـان هەڵدەدڕی و رایاندەکێشا، بەشێکی زۆری ئەو ئامێرانە لە لایەن سوپای نـاپلیۆنەوە ئاشکرا کران، کاتێـک بڕیـاری هەڵوەشـاندنەوەی دادگاکـانی پشـکنینی دا و سـوپایەکی نـارد بـۆ لەکارخسـتنی، ئەوکـات لە دادگـاکە و بەندیخانەکانیـدا وردەکـارییەکی زۆری توندوتیژی و دڕندەیی دادگاکانی پشکنینیان بۆ ئاشکرابوو.[٣]

## سزادانی مەسیحیە پرۆتستانتەکان

تەنهـا جـوولەکە و موسـڵمانەکان نەبـوون کە تیـری دادگاکـانی پشـکنینیان بەرکەوتبێت، بەڵکو ئەو مەسیحیانەی رای جیاواز لە کڵێسـای کاسـۆلیکیان هەبوو، جۆرەهـا ئەشـکەنجە و لێپێچینەوەو لەناوچوونیـان تـووش بـوو، (ول دیورانـت) لەو

---

(١) - الصلابي: س-پ، ص ٢٨٣.

(٢) - محمد رزوق: س-پ، ص ٢٢٣.

(٣) - الصلابي: س-پ، ص ٢٩٢ -٢٩٣.

بارەیەوە دەڵێت: (ئەگەر بەراوردێک بکەین لەنێوان چەوساندنەوەی مەسیحیە گومڕاکانی نێو ئەورووپا لەنێوان ساڵانی (١٢٢٧ز) بۆ (١٤٩٢ز)، لەگەڵ چەوساندنەوەی مەسیحیەکان لەلایەن ڕۆمانەکانەوە لە سێ سەدەی یەکەمی پاش مەسیحدا، خێرا بڕیاری ئەوە دەدەین کە ئەوەی ڕۆمانەکان زۆر هێواشتر بووەو میهرەبانی زیاتری تێدا بووە لەوەی دووەم، ئەوانە دڕندانەترین مۆرکی نێو تۆماری هەموو مرۆڤایەتیی بوون، دڕندەییەک نیشان دەدەن کە لای هیچ دڕندەیەکی تر نموونە و هاوچەشنی بەدیناکەین).[1]

هەواداران و بانگخوازانی ڕێبازی (لۆسەریی) و (پرۆتستانتی) هەردەم لەژێر هەڕەشەی سزاکانی دادگاکانی پشکنیندا بوون، بۆ نموونە گرتنی (هرناندیز) بە تۆمەتی شوێنکەوتنی پرۆتستانتیی (مارتن لۆسەر)، ئەم حاڵەتە بەرەبەرە پەرەی سەند هەتا کار گەیشتە کوشتن و سووتاندنی پرۆتستانتیەکان، بۆ نموونە لە (٢١) ی مایۆی (١٥٥٩ز) دا (چواردە) پرۆتستانتی سووتێنران، لە (٨) ی ئۆکتبۆبەری هەمان ساڵدا (٢٦) پرۆتستانتی دیکەش بە بڕیاری دادگاکانی پشکنین سووتێنران.[2]

لە سەدەی حەڤدەیەمیشدا نموونەی دیاری هەوڵی سزادانی (گالیلۆ) لەپای بیردۆزە زانستیەکەی بەدیدەکەین کە دواجار ئەو زانایەی ناچارکرد لە بیردۆزەکەی پاشگەزببێتەوە، ئەگەرنا دوچاری سزای کوشتن دەبوویەوە.[3]

---

(١) - ول ديورانت:.س-پ، ج١٦، ص ١٠٦.

(٢) - رمسيس عوض: من اوراق الحروب الصليبية ومحاكم التفتيش في اسبانيا، ص ١٠٦ – ١١١.

(٣) - رمسيس عوض: أبرز ضحايا محاكم التفتيش، الهيئة المصرية العامة للكتب، سنة ٢٠٠٥، ص ١٢٣-١٢٥.

# بەشی حەڤدەیەم

## مێژووی جەنگە خاچییەکان

- خوێندنەوەیەکی مێژووی
- بارودۆخی خۆرهەڵات پێش هاتنی خاچییەکان
- دروستبوونی بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچییەکان
- ڕۆڵی عیمادەدین زەنگی لە پێکهێنانی بەرەی ئیسلامی
- ڕۆڵی نورەدین مەحمود لە پێکهێنانی بەرەی ئیسلامی
- ڕۆڵی سەلاحەددین ئەیوبی لە پێکهاتنی بەرەی ئیسلامی

# مێژووی جەنگە خاچییەکان

مێـژووی مرۆڤـایەتی هەر لە سـەرەتای دروسـتبوونی مـرۆڤەوە هەتـا ئەمـڕۆ ململانێی بەردەوامی نێوان خودی مرۆڤەکانی بەخۆوە دیوە و هەرجارەو هۆکارێ یان چەند هۆکارێ هەبوون هەتا ئەو ململانێیە ڕەگداکوتێ و بەردەوامی بەخۆوە ببینێ، بەرامبەر بەمەش بەردەوام خوای گەورە پەیامە ئاسمانیەکانی خۆی ناردووە هەتـا ببنە ڕاستکەرەوەی باری مرۆڤەکـان وڕێکخەری پەیوەنـدیەکانی نێوانیـان و تەواوکەری پەیـامی پێشــوو، بـۆیە لەم ڕووەوە ئـایینی مەسـیحیەت هــات وەک تەواوکەرێ بۆ جوولەکایەتی و ئیسلامیش وەک کۆتا ئایینی ئاسمانی و تەواوکەری گشـتی ئایینەکـانی پـێش خـۆی، بەڵام هەردەم ئـایینی پێشـوو هەوڵیـداوە بەرامـبەر ئایینی نـوێ بوەسـتێ، هەر لەم ڕوانگەشـەوە وەک قۆنـاغێکی مێژوویی مەسیحیەتی خۆرئـاوا بەهەردوو ڕەوتـی دژایەتـی قـووڵی مەسـیحیەت و ململانێـی دێرینـی خـۆرهەڵات و خۆرئـاوا و بە چەنـد هۆکـارێکی جیاجیـا هەڵمەتـی خاچییەکـانی دەستپێکرد تا بتوانێ لەلایەکەوە هەژموونی خۆی بەسـەر گێتی ئیسـلامیدا بسـەپێنێ و خاوەنداریێتی کڵێسـایی بۆ خـۆی بەرێت و لەلایەکی تریشـەوە خۆرهەڵات بکـاتە پاشکۆیەکی خۆرئاواو بیرۆکەی پاشـاو گەدایی خۆی بەسـەر خۆرهەڵاتـدا بسـەپێنێ چـونکە گەورەتـرین بەربەسـت بەڵکـو باشـتر وایە بڵێـین هەرەشـە بۆسـەر گێتـی مەسـیحیەت و خۆرئـاوا لەو کـاتەدا جیهـان و دەسـەڵاتی ئیسـلامی بـوو کە بە بزووتنەوەی فتووحـاتی چەکداری و هـزریش ڕۆژبەڕۆژ بەرەوپێشـچوونی بەخۆوە دەدی.

بەرامـبەر بەم هەڵـمەتە خاچییـانە بەرگریەکـی بەرچـاو لە گێتـی ئیسـلامیدا سەریهەڵد لە کاتێکدا خودی گێتی ئیسـلامی لە ململانـێ و نـاکۆکی نێوخۆییدا بـوو و دەسـەڵاتە خۆجێییەکـان یەکتریـان پەسـەند نەدەکـرد و خیلافەتـیش لە لاوازیدا بـوو، بەڵام کەسانێ لەو مەیدانەدا دەرکەوتن و توانییان ئەسپی خۆیان تاوبدەن و بەهـۆی دڵسـۆزی و لێبڕانیـان بـۆ سەرخسـتنی ئیسـلام و موسـڵمانان هەتاهەتـایە ناویـان لەبەرچاوانی خەڵک و لە پەڕە پرشنگدارەکانی مێژوودا بمێنێتەوە لەوانە (نورەدین مەحموودو عیمادەدینی زەنگی و سەلاحەدینی ئەیووبی و زاهیر بیبرسی) مەملووکی و چەندینی دیکە کە دواجار توانییان گێتی ئیسلامی لەو شاڵاوە خاچیانە بپارێزن و گورزێکی کوشندە بدەن لە گێتی مەسیحیەت و خۆرئاواش.

هاوکات لەمیانەی ئەو هەڵمەتانەدا بێزاری زۆری مەسیحیەکانی خۆرهەڵات بەرامبەربە خاچییەکان دەرکەوت و بزاڤی موژدەبەری مەسیحیەتیش تەمومژی زیاتر گرتی بەهۆی ئەو کارە کاولکاری و کوشت و بڕە بێبنەمایانەوە کە خاچییەکان ئەنجامیان دەدان، ئەو بابەتەش تا ئەمڕۆ هەر قسەی لەسەرە و وەک ڕەنگدانەوەیەکی نوێی ئەو بارە لەمڕۆدا کەسانێکی زۆر پێیان وایە سەرلەنوێ هاتنی خۆرئاواییەکان بۆ خۆرهەڵات بە گشتی و گێتی ئیسلامی بە تایبەتی درێژەپێدەری هەمان ئەو هەڵمەتە خاچیانەی، هێرش و پەلاماری خاچییەکان بۆ سەر خۆرهەڵات لە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکار و فاکتەری گرنگی تێکەڵ بە یەک بوو کە هانی دان بۆ ئەم شەڕە پیرۆزە، لەوانەش خراپی سیستەمی دەرەبەگایەتی و هەوڵدانی جوتیاران و کۆیلەکان بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی و هەژاری و بیرکردنەوە لە تالان و دەستکەوتنی سەرمایەی چاک لە خۆرهەڵاتی دەوڵەمەندا، باشترین بەڵگەش بۆ ئەو حاڵەتە بڕینی هەزاران کیلۆمەتر بوو بە بیانووی ڕزگارکردنی گۆڕی نادیاری مەسیح کە بۆ خۆی خۆرهەڵاتی بووە، ئەمە جگە لە بیانووی گێڕانەوەی (خاچی خاچان- صليب الصلبوت) کە مەسیحی لەسەر خاچ دراوە، هاوکات بەشداری کردنی دەیان میر و پاشا و خانەدان و پیاوە ئاینییەکانی خۆرئاوا لەگەڵ بازرگانەکانی ئیتاڵیا بۆ ئاسانکاری گواستنەوەی خاچییەکان لە ڕێگای دەریاوە بۆ خۆرهەڵات، جگە لە کاریگەری پاپا و کڵێسا لە وروژاندنی هەست و سۆزی ئەوروپییەکان، ئەمەش بۆ خۆی ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری هەبوو لە پڕوپاگەندەی دەروونی و کۆنترۆڵ کردنی مێشکیان بۆ جێبەجێ کردنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان، دوور لە بەرژەوەندیەکانی مەسیحیەت لە قاڵبی سیاسەتی دەرەوەدا، ئەمە لەلایەک و لە لایەکی دیکەوە پشێویی و نائارامی و ئاڵۆزی ناوچەکە بەهۆی جەنگ و ململانێی میرنیشینەکان لەناو خۆیاندا، و دەست تێوەردانی زلهێزەکان لە کاروباری دەسەڵاتی فاتمی و بێزەنتی، و لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی بە دەستی سەلجوقیە تورکەکان، جگە لە قەرامیتەکان کە لە تێکچوونی بارودۆخی خۆرهەڵاتی ئیسلامی (المشرق الأسلامی) ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، هەروەها نەبوونی سەرکردەیەکی بەهێز و بەتوانا بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دۆخە نائارامە لە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵمەتەکانی خاچییەکان بوون.

شەڕی خاچییەکان کە لە سەدەی (١٠)ی زاینیدا دەستی پێکرد، و لە سەدەی (١١) زاینیدا پەرەی سەند، بە لوتکەی زیندووکردنەوەی ئایینی و بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دادەنرێت.

هاوچەرخەکان ئەم شەڕە بە (شەڕی پیرۆز) و (ڕێگای حەج کردن) بۆ کڵێسای دوا ڕۆژ و (گۆڕی مەسیح) دادەنێن، ئەگەر ئەم شەڕە بە (شەڕی پیرۆز) دابنرێت دەبێ بەپێی بنەماکانی سەردەمی خۆی شی بکرێتەوە، کە گیانی ئایینی بەسەر ئەو سەردەمەدا زاڵ بووە، بەپێی ئەمەش گێتی کۆتایی دەسەڵاتێکی ئایینیەو، ڕێگایەکی نوێیە بۆ ئاسمان، و دەبێت ئەم ڕێگەیە ببڕدرێت بۆ گەیشتن بە خۆشی تەواو لە پێناو پاکردنەوەی مرۆڤ هەروەها شەڕی خاچییەکان بە سیاسەتی دەرەوەی پاپا دادەنرێت کە هەڵگرانی بیر وباوەڕی مەسیحیەتی ئاڕاستە کرد بۆ ئەو شەڕە گەورانەی لە دژی موسڵمانان ئەنجام دەدران، ئەگەر شەڕی خاچییەکان ڕێگایەکی نوێ بێت بۆ پاکردنەوەی ڕۆحی مرۆڤ، ئەوا بەپێی ئەم واتایە ئەم جەنگانە بە بیروباوەڕی (تۆبەکردن) گرێ دراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاسەتی دەرەکی بۆ کڵێسا دادەنرێت و شەڕی خاچییەکانیش گرێ دراوە بە پاکردنەوەی ئایینی، ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و ئارەزووەکانی دەناسرێت بە ئاستی خودای لە سیستەمی سوارچاکیش، سەرەڕای بیرۆکەی حەج کردن بە کاریگەی بزوتنەوەی (کلوینە) کە لە سەدەی (١٠)ی زاینیدا دەستی پێکرد، بەمەش ڕێڕەوی خاچییەکان زیاتر بووە و (بەیت ولمەقدیس) بوو بە ئامانجی خاچییەکان کە دەبوو بە کۆمەڵ و بە شێوەیەکی یەککگرتوو بۆی بڕۆن لە پێناو پاراستنیان، ژمارەی ئەو حاجیانەی بە سەرکردایەتی (ئوسقفی ماتینر) لە(ساڵی ٤٥٧ک/١٠٦٤ ز) ڕوویان کردە قودس نزیکەی (٧) حەوت هەزار کەس دەبوون، بەم شێوەیەش دەتوانرێت شەڕی خاچییەکان بە قۆناغێک لە قۆناغەکانی چاکسازی ئایینی لە ئەوروپا دابنرێت، ئەگەر سوارچاک ئاڕاستە بکرێت بۆ بەرگری لەسەر ئەوەی کەوا ڕەوایە، ئەوا سوارچاکی بە (کرۆکی) شەڕی خاچییەکان دادەنرێت، و ئەو سوارەی بە سەرپەرشتی و فەرمانی کڵێسا بەشداری شەڕی خاچییەکانی دەکرد حەز و ئارەزووە جەنگیەکانی تێر دەبوو، پێشیان وابوو بەتەواوی لە گوناهەکانیان پاک بوونەتەوە، لە ڕاستیدا پرۆسەی خۆ بەخت کردن لە لایەن هەردوو لاوە لە کاتی شەڕەکان بارودۆخێکی ڕەخساند بۆ ئەوانەی بڕوایان وابوو هەرگیز ناگەنە گێتی کۆتایی، تەنها بەو شەڕانە نەبێت کە لەسەر زەوی دەیکەن، هەروەها ناگەنە بەرهەم و ئارەزووی خودا پەرستی و شەهیدی تەنها بە

وەلامدانەوە نەبێت بۆ ئارەزوەکانی سروشت، سەرەڕای دوژمنایەتی کۆنی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا کە هەر بەردەوام بوو، بەلام بە شێوەیەکی نادیار و لە ژێر پەردەوە ماوەی (١٠٠٠) ساڵی خایاند.

لە کۆچکردنی پێغەمبەر (د.خ) لە مەککەوە بۆ مەدینە لە(ساڵی١ ک/ ٦٢٢ز) تا گەمارۆدانی شاری ڤیەننا لەلایەن تورکەکانەوە لە (ساڵی١٠٩٥ ک/ ١٦٨٣ز)، مەترسی داگیرکردنی موسڵمانەکان لەسەر ئەوروپا بەردەوام لەگوێی خەڵکی دەزرنگایەوە، لەم ڕووەوە شەڕی خاچییەکان بە وەلامدانەوەی خۆرئاوا دادەنرێت بەرامبەر مەترسیەکانی خۆرهەلات، و وای لە خۆرئاواکرد پەلاماری خۆرهەلات بدات و شانشینێکی لاتینی مەسیحی لەسەر کەنارەکانی ئاسیا دابمەزرێنێت، خاچییەکان ویستیان بەم هەڵمەتانەیان ئەوروپا لە مەترسی هێرشی موسڵمانەکان بپارێزن، بەلام دواتر لەسەر دەستی تورکەکان دووبارە دەستی پێ کردەوە.

هێرشی خاچییەکان هەلێکی باش بوو بۆ بەرقەرار بوونی هێمنی و ئاشتی لە ئەوروپا، لە ئەنجامدا شارەکانی خۆرئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دروست بوون، هەموو پەیوەندییەکانی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوا لە کاتی شەڕی خاچییەکاندا، بەشێوەیەکی دوژمنکارانە نەبووە، بەڵکو بەیت و لمەقدیس مەڵبەندی بە یەک گەیشتنی هەردوو شارستانیەتەکە بووە و لەسەر ئەم زەویەش تەنها خۆرهەلات زانست و زانیاری لە خۆرئاوا فێر نەبووە، بەڵکو ئەوەی خۆرئاوا لە خۆرهەلات فێر بووە زۆر زیاترە بووە، هەروەها ئەو شارستانیەتەی لە سەدەی (١٣)زدا لە ئەوروپا سەری هەڵدا تەنها بە هۆی پارێزگاری و چاودێری و پشتگیری شەڕی خاچییەکانەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی ئەو کەرەستانەوە بوو کە بە هۆی شەڕی خاچییەکان لە خۆرهەلاتدا هێنا بوویان. [١]

## خوێندنەوەیەکی مێژوویی

لە سەرەتای سەدەی (٥ک/ ١١ز) گێتی ئیسلامی ڕووبەڕووی هەڵمەتی خاچییەکان بوویەوە، کە ئامانجیان داگیرکردنی خۆرهەلات و دامەزراندنی دەزگای رامیاری و زەمینە ڕەخساندن بوو بۆ داگیرکردنی سەربازی و دەست بە سەرداگرتنی ئابووری ناوچەکە، ئەمەش بە وروژاندنی هەستی ئایینی وەک

---

(١) - بۆ زانیاری زیاتری بروانە (ئاراس فریق زەینەل:مێژووی جەنگە خاچییەکان) .

فـاکتەرێکی چەسـپاندنی دەسـەڵات، ئەم ڕاسـتیانەش لە هەڵمەتەکـانی خاچییەکانـدا دەردەکەون، بە تایبەت لە هەڵمەتی یەکەمی خاچییەکاندا، کە توانیان چوار میرنشینی خـاچی لە نـاوچەرگەی خـۆرهەڵاتی ئیسـلامیدا دابمەزرێـنن، ئەم هەڵـمەتە بەهـۆی وتـاری پاپـا (ئوریـانی دووەم)ەوە لە سـاڵی (٤٨٩ک/١٠٩٥ز) بە دوو بەش دەسـتی پێکرد بەشی یەکەم بە نـاوی هەڵمەتی گەلان کە ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو تـا هـاتنی بەشـی دووەم لە هەڵـمەتەکە لە سـاڵی (٤٩٠ک/١٠٩٦ز) کە بە هەڵمەتـی شـازادەکان ناسـراوە، و بە چـوار بەش بەرەو خـۆرهەڵات پێشـکەوتن بـۆ بە دەسـتهێنانی ئامانجەکانیان، لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتـانەدا چوار میرنشـینی خـاچی لە سـەر خـاکی موسڵمانان دامەزران و بۆ ماوەیەکی زۆر مانەوە.[١]

بە سەرهەڵدانی (عیمادەدین زەنگی)[٢] و رزگارکردنی شاری (رەهـا- ئورفە)[٣]لە ساڵی (٥٣٩ک/ ١١٤٤ز)دا سەرەتای قۆناغێکی نوێی ئەم ململانێیە بوو، کە توانی بۆ یەکەم جـار بەرەی ئیسـلامی لە نـاوچەکە یەکبخـات بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوەی خاچییەکـان و کـۆنترۆڵ کردنـی هەنـدێ شـوێن لە نـاوچەکە،[٤] لە دوای کـوژرانی (عیمـادەدین) لە سـاڵی (٥٤١ک/ ١١٤٧ز) (نـورەدین مەحمـود)[٥]ی کـوڕی دەسـەڵات وەردەگرێت و درێژە دەدات بە سیاسـەتی بـاوکی لە یەکبوونی بەرەی ئیسـلامی و ئاڕاسـتە کردنیـان بـۆ شـەڕی خاچییەکـان و رزگـارکردنی شـاری دیمەشـق،

---

(١) - رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ت- السيد الباز العريني، بيروت، لبنان، ج١/ص ١٦٩.

(٢) - عماد الدين زنكی: نـاوی (عمـاد الـدين زنكی بن قطب الـدين مـودود بـن عمـاد الـدين زنكـي) ناسـراوە بەخاوەنی شەنگار، لەپاش کۆچی دوایی (الملك الصالح اسماعيل) بوو بە والی (حلب)، سوڵتان سـەلاحەددين لە ساڵی (٥٧٩ک/١١٨٣ز) گەمارۆی شـاری (حلب)ی دا،پـاش مـاوەیەک عماد الدين زنكی ناچـار بـوو شـاری (حلب)ی دا بەدەستی سوڵتان سـەلاحەددین بەرامبەر (شـەنگار، نصيبين،خابور، الرقەوسروج). (ابن خلكان: س.پ، ج٢/ ل٣٣٠-٣٣١؛ابن تغری بردی: س.پ،ج٦/ ل١٤٤).

(٣) - الرها: (ئورفە)- ئەم شارە دەکەوێتە خۆرهەلاتی ڕوباری فورات، لە دەڤەری جەزیرەیە، نزیکەی (٢٤کم) لە شاری بەهاران (حەڕان) دوورە. (أبو الفداء: تقويم البلدان،٢٧٧؛ قدامـة بـن جعفـر: الخـراج و صـناعة الكتابـة، ص١١٣).

(٤) - أبـن القلانسـی: م،ن، ص٢٨٤؛ بـڕوانە: عمادالدين خليـل: عمـاد الـدين الزنكـی، ط١، الـدار العلميـة، بيـروت، ١٩٧١، ص٧١؛ د. الباز العريني: مصر في عصر الايوبيين، ط١، بيروت، ١٩٦٠، ص١٩.

(٥) - (نورالدين محمود) لەساڵی (٥١١ک /١١١٨ز) لەشاری حەڵەب لەدایک بووە، کوڕی (عماد الدين زنكی)ە، پـاش مردنـی بـاوکی سـاڵی (٥٤١ ک /١١٤٧ز) دەسـەلاتی وەرگرت، فەرمـانڕەوای (شـام و جەزیـرە و مصـر) بووە، بەپاشای چاکەخواز ناوبانگی دەرکردووە، هەروەها بەچاکترین و دادپەروەرترین پاشاکانی سـەردەمی خۆی دەژمێردرێت. (ابن الجوزی: المنتظم في تأريخ الملوك الامم، ج١٠/ ل٢٤٨-٢٤٩؛ سبط ابن الجوزی: مرآة الزمان في تأريخ الاعيان، ج٨/ ل٣٠٥،ابو شامة: الروضتين، ج١/ ل٢٢٧ -٢٢٩).

لەسـەردەمی ئەمـدا هەڵمەتـی دووەمـی خاچییەکـان لە نێـوان سـاڵانی(٥٤٠-٥٤٤ک/ ١١٤٥ز- ١١٤٩ز)دا،[١] بە سـەرکردایەتی ئیمپراتـۆری ئەڵمـانی(کونرادی سـێیەم) و (لویسی حەوتەم) پاشای فەڕەنسا و بە چاودێری پاپا (بجنیوسی سێیەم) دەستی پێکرد، چارەنووسی ئەم هەڵمەتە شکستێکی گەورە بوو بۆ خاچییەکان بە دەستی موسڵمانەکان،[٢] دواتر لەسەر دەست بەسەراگرتنی وڵاتی میسر ململانێ لەنێوان (نورەدین مەحمود) و(عموری یەکەم)سەری هەڵدا، ئەمەش لەپێناو دەسکەوتی مادی و مرۆیی و کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکە، میسر لە دوای دابڕانی بە دەستی خیلافەتی فـاتمی شـیعە مەزهەب بوژانـدنەوەی بەخـۆوەبینی، بەسـەرهەڵدانی (ئەسـەدەدین شێرکۆ)[٣] و وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لە سەردەمی خیلافەتی فاتمیەکان لە میسر سەرەتای قۆناغێکی تازە دەستی پێکرد.[٤]

لە دوای مردنی(ئەسـەدەدین شـێرکۆ) (سـەلاحەددینی ئەیـوبی) بـرازای لەسـەر گۆڕەپـانی رامیـاری و سـەربازی میسـر سـەری هەڵـدا و تـوانی دوای ڕووخانـدنی خیلافەتـی فـاتمی، دامەزرانـدنی دەوڵەتـی ئەیـوبی ڕابگەیەنێـت، و دەسـتی کـرد بە ڕێکخستنی کاروباری وڵاتـی میسـر، دواتـر لە شـەڕی (حەتین)دا لە سـاڵی (٥٨٢ک/ ١١٨٧ز) توانی گەورەترین سەرکەوتن لە مێژووی ئیسلام لە سـەدەکانی ناوەڕاستدا بە دەست بهێنێت، کە لە ئەنجامدا بۆ یەکەم جار بووبە هۆی ڕزگارکردنی (بەیت ولمەقدیس) لە دوای داگیرکردنی لە هەڵمەتی یەکەمی خاچییەکاندا، بەمەش قەوارەی

---

(١) - بڕوانە: أبن الاثير: الكامل في التأريخ، ج١١/ ص١٣١؛ أبو شامة: الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية، القاهرة، ١٢٨٧،ج١/ ص٦٩؛أبن القلانسي: م،ن، ص٣٠٤، عاشور: م.ن، ص٦٣.

(٢) - أبن الاثير: م،ن، ج٨ /ص٨- ٩؛أبن القلانسي: م،ن، ص٨٤- ٨٥؛ أبو شامة: م،ن، ج١/ ص١٣٣.

(٣) - ئەسەدەدین شیرکو: ناوی (شیرکو بن شادی بن مروان) وەزیری خەلیفە (العاضد)ی فاتمی بوو لە مصر، شێرکۆ بەواتای (اسد الجبال-شێری چیاکان) دێت، سەرکردایەتی سێ هەڵمەتی کرد بۆ وڵاتی مصر لە سـاڵی (٥٥٩ک/١١٦٤ز) کە بە هەلمەتـی یەکەمـی سـەر مصـر ناسـرا، و هەلمەتـی دووەم لە سـاڵی (٥٦٢ک/١١٦٧ز)، و سێیەم لە ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز)، شایەنی باسە تەنها دوو مانگ و پێنج ڕۆژ لە وەزارەت مایەوە و لە ٢٢ی جەمادی الاخرە ساڵی (٥٦٤ک/١١٦٨ز) کۆچی دوایی کرد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (عطا محی الدین: ئەسەددین شێرکۆ ژیاننامە و ڕۆڵی لە شەڕی خاچییەکاندا).

(٤) - رنسیمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٢/ ص ٦٠٠- ٦٠١.

رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووری خاچپییەکان لە خۆرهەڵات بە دەستی (سەلاحەددین) لەناوچوو.[1]

دوای ئەم شکستە خاچپییەکان بۆ مانەوەیان لە خۆرهەڵات بانگەشەیان کرد بۆ هەڵمەتێکی نوێ کە بە هەڵمەتی سێیەمی خاچپییەکان ناسراوە، و بەگەورەترین هەڵمەتی خاچی دادەنرێت لە نێو ئەو نۆ هەڵمەتەی بۆ گێتی ئیسلامی بە ئەنجامیان گەیاند، ئەم هەڵمەتە شێوە علمانیەتێکی لە خۆگرت بەهۆی بەشداری کردنی ئیمپراتۆری ئەڵمانی (فریدریک بارباروسا)[2] و هەردوو پاشا فەرەنسی (فیلیب ئوگستس)[3](ریتشارد شێردڵ)ی[4] ئینگلیزی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم هەڵمەتە کاریگەری پاپای لەسەر نەبووە، بەڵکو وێنەیەکی گۆڕی مەسیحیان دروستکرد کە بە دەستی سوارێکی موسڵمان شێواندرابوو،ئامانجیشیان لەم کارە وروژاندنی هەستی مەسیحیەکانی ئەوروپا بوو بۆ بە دەنگەوە هاتنی ئەم هەڵمەتە، خاچپییەکان بە مەبەستی ڕزگارکردنی شاری قودس بەدوو ڕێگا گەیشتنە ناوچەکە، لەشکری ئەڵمانی بەڕێگەی وشکانی و لەشکری فەرەنسی و ئینگلیزی لە ڕێگای دەریاوە، بەڵام دواتر ئامانجەکەیان گۆڕی بۆ داگیرکردنی عەککا، لەشکری ئەڵمانی

---

(١) - أبن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٦٤، ص٦٠-٧٢؛ بڕوانە: أبن الاثير: الكامل في التأريخ، دار صادر لبنان، بيروت، ١٩٦٦، ج٩/ص١٧٦- ١٧٩.

(٢) - فردریک باربارۆسا: لە پاش مردنی مامی (کۆنرادی سێیەم)سالی (٥٤٧ک/١١٥٢ز)، فەرمانڕەوایی ئەڵمانیای گرتە دەست، بە یەکێک لە بەهێزترین کەسایەتیەکان دادەنرێت کە دەسەلاتی ئەلمانیایان وەرگرتووە، لە سالی (٥٨٦ک/١١٩٠ز)، بەشداری لە هەلمەتی سێیەمی خاچپییەکان کرد، بەلام ئامانجەکانی نەهاتەدی، لە کیلیکیا خنکا و سوپاکەی لەناوچوو.(حامد زيان: الامبراطور فريدريك بربروسا و الحملة الصليبية الثالثة، ل١٢).

(٣) - فیلیب ئۆگستس: یان فیلیبی دووەم ن کە ناز ناوی (الفاتح یا الغازی) بوو کوڕی لویسی حەوتەمە، لەسالی (٥٦١ک/١١٦٥ز) لە شاری غینیس لە دایک بووە، و لە سالی (٥٧٦ک/١١٨٠ز) ببووە پادشای فەرەنسا، بەشداری هەلمەتی سێیەمی خاچپییەکان کرد بۆ ڕزگار کردنی قودس، شەڕی هەردوو پادشای ئینگلیترای کرد (هێنری دووەم و ریتشاردی شێردل)ی کوڕی و توانی سەربکەوێت بە سەریاندا، لە سالی(٦٢٠ک/١٢٢٣ز) کۆچی دوای کرد. (بسام العسلي: فن الحرب الاسلامي، ج٤/ل٢٢٣، پەراوێزی (١).

(٤) - ریتشارد شێردل: فەرمانڕەوای ئینگلترا بوو لە سالی (٥٨٥ک/ ١١٨٩ز) لە دوای مردنی باوکی (پاشا هێنری دووەم) کە لە سالانی (١١٥٨ز/ ١١٨٩ز) حوکمڕانی ئینگلترای دەکرد، زۆربەی سالانی حوکمی لە سەرکێشی سەربازی دەرەوە جێ لە هەلمەتی خاچپییەکان لە خۆرهەلات یان فەرەنسا،(بڕوانە: رنسيمان: ن،م، ص٧٥- ٧٦).

پێش گەیشتنی بۆ گەمارۆدانی شاری (عەککا)[1] لە ناو چوو، شەڕ لە ناوچەی عەککا ماوەی دوو ساڵی خایاند، دانیشتوانی شاری عەککا زۆر بێزار بوون و ناچار تەسلیم بوون، بەڵام هەڵمەتەکە بە ڕێککەوتنامەی (الرملە)[2] لە ساڵی(٥٨٨ک/١١٩٢ز) لە نێوان (سەلاحەددین) و (ریتشارد شێردڵ) کۆتای هات، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم هەڵمەتە لە بە دەستهێنانی ئامانجەکەی شکستی هێنا کە ئەویش داگیرکردنی بەیت ولمەقدیس بوو،[3] بەڵام ئەمە کۆتایی هەڵمەتی خاچییەکان نەبوو، بەڵکو بیریان لە هەڵمەتێکی نوێ کردەوە، بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆر (هێنری شەشەم) و بە هاوکاری و یارمەتی پاپا (انوسنتی سێیەم)، کە بە هەڵمەتی چوارەمی خاچییەکان ناسرا، ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە لە نێوان ساڵانی (٥٩٩- ٦٠١ک/١٢٠٢- ١٢٠٤ز) ڕوویدا، ئاڕاستەی ئەم هەڵمەتە بۆ ناوچە ئیسلامیەکان نەبوو، بەڵکو بە داگیرکردنی کەستەنتینیە کۆتایی هات، بەمەش گەورەترین کۆسپیان لە پێش موسڵمانەکان بە گشتی و سەلجوقیەکان بە تایبەت بۆ هێرش کردنە سەر ئەوروپا و داگیرکردنی لەناوبرد، ئەم هەنگاوە دواتر بوو بە بەڵایەکی گەورە بۆ سەر خاچییەکان و خودی پاپا و لاواز بوونی فاکتەری ئایینی و سەرهەڵدانی بەرژەوەندی رامیاری و بازرگانی، ئەمە جگە لە نەمانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی.[4]

لە ڕاستیدا هەڵمەتی خاچییەکان بۆ سەر ناوچە ئیسلامیەکان لە شێوەی هەڵمەتی بچووک و لە پێناو بەدی هێنانی ئامانجەکانیان بەردەوام بوو، لەوانە (هەڵمەتی منالانی خاچی) لە ساڵی (٦٠٩ک/١٢١٢ز)دا کە منالێک بە ناوی (شیفن) توانی (٥٠) پەنجا هەزار منال کۆبکاتەوە و لە مارسلیاوە بەڕێکەوت بۆ باشووری ئەفریقیا، ئەم هەڵمەتە نەک ئەنجامی نەبوو، بەڵکو هەواڵی منالەکانیش کەس نەیزانی،

---

(١) - (عكا) شارێکی کۆنە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای ناوەراست، سەر بە (فلسطين)ە لە سەرووی حەیفا. (ناصر خسرو: سفر نامه، ل٥٠-٥٢؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣/ ل٣٤٣-٣٤٤).

(٢) - (الرملة): شارێکی گەورە و مەزن بوو، دەکەوێتە باشوری خۆرهەلاتی (يافا) بەدووری (٢٢کم). (ناصر خسرو: س.پ، ل٥٤؛ياقوت الحموي: س.پ، ج٢/ ل٤٢١).

(٣) - أبن شداد: م.ن، ص١٢٣- ١٢٦؛ بڕوانە: أبن الاثير: م.ن،ج٩/ ص٢٠٧- ٢١٤؛ أبن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني ايوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٥٧، ج٢/ ص٣١٩- ٣٥٧؛ أبو شامة: م.ن،ج٢/ص١٥١- ١٥٦؛ المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق- محمد مصطفى، القاهرة، ١٩٣٩، ج١/ص ١٠٥، باركر: الحروب الصليبية، ت- الباز العريني، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٠، ص ٨٩؛ نظير حسان السعداوي: تأريخ الحربي المصري، مكتبة النهضة، القاهرة، ١٩٥٧، ص ٢٥٢- ٢٥٣.

(٤) - بڕوانە: أبن الاثير: م.ن،ج ١٢/ص ٢٨٩- ٣١٤؛ أبو شامة: م.ن، ص٧٦٩؛ رنسيمان: م.ن،ج ٢/ص ٢٣٣.

هەروەها لە ساڵی (٦١٤ک/١٢١٧ز) هەنگارییەکان لەسەر بانگەوازی پاپا (انوسنتی سێیەم) خۆیان ئامادەکرد و توانیان بگەنە شاری عەککا، بەلام هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێنا،[1] بە لاوازبوونی خاچپیەکان لە خۆرهەلات و نەبوونی کێشە و ململانێ لە نێوان بنەماڵەی ئەیوبی، بۆ ماوەیەک ئاشتی باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا، بەلام خاچپیەکان بە نهێنی خۆیان بۆ (هەڵمەتی پێنجەم) ئامادەکرد و ئەمجارە بیریان لە وڵاتی میسر دەکردەوە، چونکە داگیرکردنی میسر کلیلی کونترۆڵ کردنی وڵاتی شام بوو، ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە لە نێو ساڵانی (٦١٥-٦١٨ک/١٢١٨- ١٢٢١ز) لەسەر خاکی میسر ڕوویدا بە سەرکردایەتی (حنادی برین)، لە هەمانکاتدا پاشای حەبەشەش بانگەشەی دەکرد بۆ ڕووخاندنی قیبلەی موسڵمانان، خاچپیەکان لەم هەڵمەتەدا توانیان شاری (دمیاط) لە ساڵی (٦١٦ک/١٢١٩ز) داگیر بکەن و بەرەو شاری قاهیرە پێشکەون، بەلام کەوتنە ناو سێ گۆشەیەکی ئاویی، ئەمەش ناچاری کردن داوای دانوساندن بکەن، لەئەنجامدا لە ساڵی (٦١٨ک/١٢٢١ز) ڕێککەوتننامەیان واژۆکرد بۆ ماوەی(٨)هەشت ساڵ، بەمەش خاچپیەکان لە دمیاط کشانەوە و ئەم هەڵمەتە بێ ئەوەی هیچ ئامانجێک بپێکێ کۆتایی هات.[2]

سەرەڕای بەستنی پەیمانی نێوان خاچپیەکان و موسڵمانەکان، (حنادی برین) چوو بۆ ئیتاڵیا بۆ بانگەواز کردن و ئامادەکردنی هەڵمەتێکی نوێ، و چاوی کەوت بە پاپا (أنوسنتی سێیەم) و ئیمپراتۆر (فریدریکی دووەم) هەروەها سەردانی فەرەنسا و ئیسپانیای کرد و باسی بارودۆخی خاچپیەکانی خۆرهەلاتی بۆ کردن، لە کۆتاییدا ڕازی کردن بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی نوێ، ئەم هەڵمەتە کە بە(هەڵمەتی شەشەمی) خاچپیەکان ناسراوە بە سەرکردایەتی (فریدریکی دووەم) دەستی پێکرد، بەلام پێش دەست پێکردنی هەڵمەتەکە پەیوەندی نێوان (پاپا گریگوری نۆیەم) و (فریدریکی دووەم) تێکچوو، ئەمەش بووبە هۆی بێ بەش کردنی (فریدریکی دووەم) لە پارەکانی پاپا و کڵێسا، جیاوازی ئەم هەڵمەتە لەگەڵ هەڵمەتەکانی تری خاچپیەکان ئەوەیە (فریدریک) بە ڕێگای دیبلۆماسیەت و دانوساندن قەناعەتی بە مەلیک (کامل) کرد شاری (قودس)ی بەپێی ڕێکەوتننامەی ئاشتی نێوانیان لە ساڵی

---

(١) - عاشور: م.ن،ج٢/ ص٩٥٦- ٩٦٠.

(٢) - أبن الاثير: م.ن،ج ١٢/ص٣٥٠؛ أبو شامة: م.ن، ص١٠٩- ١١٠؛ باركر: م.ن، ص ١٠٩-١١٠.

(٦٢٦ك /١٢٢٩ز) تەسلیم بکات، بە مەرجێک فردیک هاوکاری خاچییەکان نەکات، ئەم هەنگاوە بۆ خۆی ڕای گشتی هەردوولای وروژاند و بەم ڕێککەوتننامە قایل نەبوون، (فریدریک) بەبێ شەڕ و خوێن ڕشتن توانی بەیت ولمەقدیسی دەسکەوێت، ناچار پاپا بڕیاری (بێبەشی) لەسەر هەڵگرت، دوای ئەم ڕووداوە ناوچەکە بۆ ماوەی (٣٥) ساڵ فەرامۆش کرا.[١]

هاوکات سەرهەڵدانی مەترسی (خەوارزمەکان) لە ناوچەکە بوو بەهۆی بەستنی هاوپەیمانی لە نێوان سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکان دژی (خەوارزمەکان)، دەست پێکردنی ململانێ لە نێو بنەماڵەی ئەیوبیەکان بووبە هۆی لاواز بوونیان لە ناوچەکەدا، دواتر لەسەر داوای ئەیوبیەکان خەوارزمەکان توانیان بەیت ولمەقدیس ڕزگار بکەن لە دەستی خاچییەکان، ئەمەش دوای پێشێل کردنی ڕێککەوتننامەی نێوانیان لەلایەن خاچییەکانەوە،[٢] ئەم ڕووداوە بووە بیانوویەک بۆ ئامادەکردنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ ڕزگار کردنی بەیت ولمەقدیس کە بە (هەڵمەتی حەوتەمی) خاچییەکان ناسرا، ئەم هەڵمەتە لەسەر داوای (بەگریکی قودس) و بە سەرکردایەتی پاشای فەڕەنسا(لویسی نۆیەم) بوو، کە بۆ ماوەی سێ ساڵ خۆی بۆ ئامادەکرد و لە ساڵی (٦٤٦ك/١٢٤٨ز) پاریسی بەجێ هێشت، هاوکات ئیمپراتۆر (فردریکی دووەم) بەنهێنی و لە ڕێگەی ناردنی چەند بازرگانێکەوە سوڵتانی موسڵمانانی لەم هەڵمەتە ئاگادارکردەوە کە نزیکەی (٥٠) هەزار دەبوون، و توانیان شاری (دمیاط) داگیر بکەن، بەڵام دواتر لە شەڕێکی گەورە موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو (لویس) بە دیلی گیرا، بەڵام ڕووداوی هەرە گرنگی ئەم هەڵمەتە کوشتنی مەلیک (تورانشاه)[٣] بوو بە دەستی (بیبرس البندقداری) لە ساڵی (٦٤٨ك/ ١٢٥٠ز)،

---

(١) - بڕوانە: أبن تغري البردي: م.ن، ج٦/ ص ٣١٥- ٣٢٥؛ المقريزي: م.ن،ج١/ص ٢٣٠- ٢٣٨، ص٢٥٨- ٢٩١؛ عاشور: م.ن،ج ٢/ص ٩٤٤- ١٠٠٨- ١٠٤٥؛ د. الباز العريني: م.ن، ص١٢٧- ١٣٢؛ د. خاشع المعاضيدي وأخرون، ص٢٠٧- ٢١٥.

(٢) - بڕوانە: المقريزي: م.ن،ج١/ص ٣٣٧؛ فؤاد الصياد: المغول في التأريخ، ص٢٤٩؛ رنسيمان: م.ن،ج ٣/ ص٥٢٨.

(٣) - (توران شاه): ناوی (توران شاه بن ايوب بن شادی، فخرالدين، شمس الدولة) بەواتای پاشای خۆرهەڵات، برا گەورەی سەلاحەددین بوو لە باوکەوە، لە شاری دمشق پەروەردە بوو، لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٤ز) لە هەڵکمەتێکدا سەلاحەددین لەگەڵا میرەکانی (بنو الرسول) ڕەوانەی ولاتی (اليمن)ی کرد، پاش دەست بەسەراگرتنی ناوچەکە ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ز) گەڕایەوە شام، لە ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ز)دا گەیشتە

بەمەش فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەیوبی لە وڵاتی میسر کۆتایی هات کە نزیکەی (٨١) هەشتا و یەک ساڵ حوکمڕانی ناوچەی شام و جەزیرە و میسر بوون و دەوڵەتی مەمالیک لە میسر لەسەر دەستی (بیبرس البندقداری) دامەزرا و خۆی بوو بە سوڵتانی میسر و شام لە ساڵانی (٦٥٨- ٦٧٦ک/ ١٢٦٠- ١٢٧٧ز).

بارودۆخی ناوچەکە بەو جۆرە نەمایەوە بەتایبەت لە دوای دەست پێکردنی هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بۆ ناوچەکە و داگیرکردنی شاری بەغدا لە ساڵی (٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز)، و دەست پێکردنی پرۆسەی تاڵان و وێران و کاولکاری، تا لە شەڕی (عەین جالوت) سوڵتان (قطز)ی سەرکردەی مەمالیک توانی لە ساڵی (٦٥٨ک/١٢٦٠ز) کۆتایی بە هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بهێنێت و پاشەکشەی بە مەغۆلەکان کرد بۆ شوێنەکانی خۆیان و یەکێتی نێوان میسر و شامی گێڕایەوە، ئەمەش بوو بەهۆی بەهێز بوونی بەرەی ئیسلامی و بەخشینی گیانێکی نوێ بە موسڵمانان، ئەمە جگە لە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە نێو مەغۆلەکان و دانانی کاریگەری لە سەریان بە شێوەیەک شێواز و ڕەفتاریان گۆڕی و لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە دەستیان کرد بە کارکردن لە دژی بنەماڵەی هۆلاکۆ.

شکستی(لویسی نۆیەم) لە هەڵمەتەکەی،[1] بووبە هۆی بیرکردنەوە لە هەڵمەتێکی نوێ لە ساڵی (٦٦٦ک/ ١٢٦٧ز) کە بە (هەڵمەتی هەشتەمی) خاچپییەکان ناسرا، بەڵام ئاڕاستەکەی ئەمجارە بۆ شام و میسر نەبوو، بەڵکو بۆ وڵاتی (تونس) بوو، لویس کە لەگەڵ (شارل انجو)ی برای کە پاشای صقلیە بوو لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز) گەیشتنە کەنارەکانی تونس و لە (مرسا الحجرەی) دابەزین، لە شاری قرطاجە کە شارێکی ڕووخاو بوو لە لایەن موسڵمانەکانەوە تووشی هێرش و پەلامار هاتن و نزیکەی (٥٠٠) خاچیان لێ کوژرا و بۆ ماوەی (٦) مانگ گەمارۆدران، ئەمەش بووبە

---

مصرو لەوێ کۆچی دوایی کرد. (سبط أبن الجوزي) دەڵێت: "خۆی بە موستەهەقتر دەزانی لە سوڵتان سەلاحەددین لە فەرمانڕەوایی، لەکاتی خەیاڵیدا هەندێک قسەی دەکرد، بۆیە سەلاحەددین دوری خستەوە بۆ وڵاتی (الیمن)". بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (مراه الزمان، ج٨/ ل٣٦٢؛ الخزرجي: العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، ج١/ ل٢٦؛ اليونيني: ذيل مرأة الزمان، ج١/ ل١٥.

(١) - بڕوانە: أبن واصل: م.ن،ج ٢/ص ٣٥٦- ٣٥٩؛ أبن تغری البردي: م.ن،ج ٧/ص ٤٧- ٨٠- ٢١١؛ أبو شامە: م.ن، ص٢٠٧؛ المقريزي: م.ن، ص٣٥٢- ٤٢٣- ٤٣١؛ رنسیمان: م.ن،ج ٣/ص ٥٣٦- ٥٣٧؛ العبادي: قيام دولة المماليك، القاهرة، ص١٢٢- ١٢٣؛ عاشور: م.ن،ج٢/ ص١٠٦٣- ١٠٦٦- ١٠٩٧- ١١٠٣؛ محمد مصطفى زيادة: حملة لويس التاسع على مصر، القاهرة، ١٩٦١، ص٨٩- ٩١.

هۆی بڕینی پەیوەندی خاچییەکان بە دەرەوە و لە ئەنجامدا نەخۆشی لە ڕیزەکانی سوپاکەیان بڵاوبوویەوە، بە مردنی (لویسی نۆیەم) ناچار بوون داوای دانوساندن لە موسڵمانان بکەن، و لە ساڵی (٦٦٩ک/ ١٢٧٠ز) ڕێککەوتنامەی ئاشتیان واژۆکرد بۆ ماوەی (١٥) ساڵ، بەمەش هەڵمەتی هەشتەمی خاچییەکان کۆتایی هات،[١] پاشان (هەڵمەتی نۆیەم) لە پاش مردنی (لویسی نۆیەم) ئامادەکرا بەهەمان شێوە بەڵام هیچ ئاکامێکی ئەوتۆی نەبوو، کۆتایی هاتنی زەنجیرەی هەڵمەتەکانی خاچییەکان بۆ سەر گێتی ئیسلامی، باشترین دەرفەت بوو بۆ مەمالیک بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتیان لە وڵاتی شام، کە نزیکەی (١٧١) ساڵ لە ژێر فەرمانڕەوایی خاچییەکاندا بوو، ئەمەش بوو بەهۆی ڕزگار کردنی (پێگەی الاکراد)[٢] و شاری تەرابلس و هەموو قەڵا و پێگەکانی دەوروبەری لە ساڵی (٦٨٩ک/ ١٢٩٠ز)، دوا شوێن کە سەنتەری سەرەکی خاچییەکان بوو شاری عەککا بوو، هەرچەندە (٨٠٠) سوار و (١٤) هەزار جەنگاوەر و (٢٥) هەزار حەجاج بەرگریان لێ کرد لە ساڵی (٦٩٠ک/ ١٢٩١ز) لە دەستی خاچییەکان ڕزگاری بوو، بەم شێوە بوونی خاچییەکان لە خۆرهەڵات بە دەستی موسڵمانان کۆتایی پێهات، کە نزیکەی (٢٠٠) ساڵی خایاند، هەڵمەتەکانی خاچییەکان بە گەورەترین ڕووداوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دادەنرێن و کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەبوو لەسەر هەموو بوارەکانی(رامیاری، ئابووری، سەربازی، شارستانی و کشتوکاڵی) لە هەردوو کۆمەڵگای خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتیدا. [٣]

## بارودۆخی خۆرهەڵات پێش هاتنی خاچییەکان

شەڕی خاچییەکان بە یەکێک لە ڕووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی ئیسلام و مێژووی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دادەنرێت و نزیکەی (٢٠٠) ساڵی خایاند، لەبەر ئەوە هەوڵدەدەین باسی بارودۆخی خۆرهەڵات بە گشتی و ناوچەی شام بە

---

(١) - بڕوانە: أبن تغری البردی: م.ن،ج ٧/ص١٤٣- ١٢٥١- ٢٩٢- ٢٩٣؛ المقریزی: م.ن،ج ١/ ص٦٣٦؛ رنسیمان: م.ن،ج ٣/ ص٥٠٢.

(٢) - پێگەی الاکراد (حصن الاکراد) قەڵایەکی بە هێز و پۆڵایینە دەکەوێتە سەر چیا، کە لە بەشی خۆرئاواوە، بەرامبەر شاری (حمص)ەوە، ئەو چیایەی (الجلیل) کە پەیوەندی بە لبنانەوە هەیە لە نێوان بعلبک و حمص (یاقوت الحموی: معجم البلدان، م.ن،ج٢/ ص١٥٢).

(٣) - بڕوانە: أبن تغری البردی: م.ن، ج٨/ ٥ص- ٦؛ المقریزی: م.ن، ج١/ ٧٦٥ص؛ عاشور: م.ن،٢ج/ ص١١٧٧- ١١٧٨.

تـــايبەت بكەيـــن، كە جێگـــای ململانـــێ و شـــەڕ و ئـــاژاوەی نێـــوان خـــيلافەت و میرنیشینەکان بوو، هەروەها باسی ڕا و بۆچوونی مێژوونوسان دەکەین لەبارەی گرنگترین هۆکارەکانی شەڕی خاچییەکان، لەوانەش هۆکارەکانی (ئایینی، ئابووری، ڕامیاری، کۆمەڵایەتی و مێژوویی)هتد.

دوو زلهێزی گەورە دەستیان گرتبوو بەسەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، یەکەمیان بیزەنتینەکان کە مەسیحی بوون و دووەم فاتمیەکان کە موسڵمانی شیعە بوون، لە نێوان ئەم دوو هێزەدا دەوڵەتی عەبباسی لە بەغدا کە سەلجوقیەکان دەستیان بە سەردا گرتبوو لاواز ببوو، ناوچەی شامیش پێش دەست پێ کردنی هێرشی خاچییەکان لە ڕووی رامیاری و ئابووری و ئایینیەوە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و ناهەمواردا بوو، چونکە لە لایەن چەند هێزێکەوە فەرمانڕەوایی دەکرا و بەردەوام ململانێ هەبوو لە نێوان میرەکانیاندا، بەمەش باشترین دەرفەت ڕەخسا بۆ خاچییەکان تا هێرش ببەنە سەر وڵاتی شام و میرنیشینی تێدا دامەزرێنن، خیلافەتی عەبباسی هەوڵی دەدا وڵاتی شام لە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیدا بمێنێتەوە، بەڵام میسر بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر فەرمانڕەوایی طۆڵۆنیەکاندا بوو،[1] لە ئەنجامی سەرهەڵدانی شۆڕشی (قبتی و عەرەبەکان) لە میسر خەلیفەی عەبباسی (مأمون) سوپایەکی لە خۆراسانیەکان دروستکرد و ڕەوانەی میسری کرد بۆ جێگیرکردنی هێمنی و ئاسایش، و کاروباری میسری دایە دەست (عەبدوڵڵای کوڕی تاهیر)، دواتر لە سەردەمی (خەلیفەمعتز) میسر درا بە (باباک بک) دوای ئەویش کوڕەزاکەی (ئەحمەدی کوڕی طوڵۆن) لە ساڵی (٢٥٤ک/ ٨٦٨ز) فەرمانڕەوایی میسری گرتە دەست، بەڵام لە ئەنجامی ململانێی نێوان قەرامیتەکان و طۆڵۆنیەکان، دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا لاوازبوو،[2] فەرمانڕەوایی میسر بۆ ماوەی (٣٠) سی ساڵ بە دەست خەلیفەی عەبباسیەوە بوو، لە هەمان کاتدا مەترسی فاتیمیهکان لە مەغریب پەرەی دەسەند، بۆیە خەلیفەی عەبباسی پێویستی بە بەر بەستێک هەبوو لە بەرامبەر فاتمیەکان، بۆ ئەم کارەش (محمد کوڕی طغج)ی لە ساڵی(٣٢٣ک/

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، جامعة الموصل، ص ٨١.

(٢) - نيكيتا ايليسيف: الشرق الاسلامى في العصر الوسيط، ترجمة: منصور ابوالحسن، دار الكتاب الحديث، بيروت، ١٩٨٦، ص٣١٨.

٩٣٥ز)دیاریکرد که نازناوی (الاخشید) بوو،[١] ئەم بنەماڵەیە لە خزمەتی خەلیفەی عەبباسیدا بوون، و توانیان تا هاتن و پەرەسەندنی دەسەلاتی فاتمیەکانکە شیعە مەزهەب بوون و بەناوی (فاتمیەی) کچی پێغەمبەر (د.خ) ناونرابوون فەرمانڕەوایی میسر بکەن، فاتیمیهکان لە سالانی (٢٦٧ک/ ٩٠٩ز تا ٥٦٧ک/ ١١٧١ز) واتە بۆ ماوەی سێ سەدە دەسەلاتدار و فەرمانڕەوای ناوچەکە بوون وخەریکی بانگەشەکردن بوون بۆ مەزهەبی شیعە،[٢] فاتمیەکان لەپێناو پاراستنی سنوری میسر لە هێرشی عەبباسیەکان و خاچییەکان، هەوڵیان دەدا وڵاتی شام داگیر بکەن، و بیکەنە سنوری سەربازی و بانگەشەی مەزهەبی شیعە،[٣] لەم کاتەدا بارێکی شێواو و پەرتبوون لە وڵاتی شام ڕوویدا بوو، گەلێک میرنیشین لەلایەن فەرمانڕەوا عەرەبەکانەوە پەیدابوو بوون، سەلجوقیەکان بەشی باکووری شامیان بەڕێوە دەبرد، و فاتمیەکانیش حوکمڕانی بەشی باشووریان دەکرد، ئەم پەشێوی و دابەشبوونە، چاکترین هەل بوو بۆ بیزەنتیەکان بۆ ئەوەی هێرش بهێننە سەر ناوچە کەناریەکانی وڵاتی شام،[٤] خاچییەکانیش بە مەبەستی ئایینی و ڕامیاری و قازانجی ئابووری و پاراستنی ڕێگای بازرگانی نێوان وڵاتانی ئەورووپا و خۆرهەلات بە تایبەت شاری ئەنتاکیا لەگەڵ وڵاتی شام چاویان بڕیبووە وڵاتی شام، هەروەها ئامانجێکی تریشیان ڕزگارکردنی خاکی پیرۆزی قودس بوو لە دەستی موسڵمانەکان کە شوێنی سەرهەڵدانی حەزرەتی مەسیح بوو،[٥] لەلایەکی ترەوە وڵاتی شام تووشی هێرشی (حەمدانیەکان) ببوو کە پایەختیان لە موصڵ بوو، و توانیان دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە حەلەب لە ساڵی (٣٣٣ک/ ٩١٤ز) دەسەلاتی (ئەخشیدیەکان) بخەنە مەترسیەوە، هەروەها ئەم وڵاتە جارێکی تر لە سەردەمی میر (ئەحمەد کوڕی ئەبی سەعید) لە ساڵی (٣٥٣-٣٥٧ک/٩٦٤-٩٦٧ز) تووشی هێرشی قەرامیتەکان هات و ئەخشیدیەکان نەیانتوانی بەرەنگاریان ببنەوە و شاری (رملە)یان داگیرکرد، بەم شێوەیە دەسەلاتی قەرامیتەکان لە کۆتایی

---

(١) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل٦٨.

(٢) – نیکیتا ایلیسیف:م.ن، ص٣٢١- ٣٢٥.

(٣) – د. درید عبدالقادر نوري: سیاسة صلاح الدین الایوبي، بغداد، ١٩٧٦، ص٤٩.

(٤) – محمد حمدی المناوی: الوزارة والوزراء في العصر الفاطمي، القاهرة، ١٩٧٠، ص ١٨٧.

(٥) – د. خاشع المعاضیدي وأخرون: م.ن، ص١٢.

فەرمـانڕەوایی ئەخشـیدیەکان گەیشـتە نـاوچەی شـام[1] ئەگەر سـەرنج بـدەین لەم ڕووداوانە تێبینـی ئەوە دەکەیـن کە بـارودۆخی شـام لە کۆتـایی دەسـەڵاتی ئەخشیدیەکان ئـاڵۆزو نائارام بووە، ئەمەش ببووە هـۆی زەمینە خـۆش کـردن بۆ بـانگەوازی فاتمیەکـان کە هێشـتا لە وڵاتـی مەغریـب بـوون،[2] کاتێـک فاتمیەکـان لە وڵاتـی میسـر جێگیـر بـوون و قاهیرەیـان کـردە پـایتەختی خۆیـان، دواتـر پێویسـتی ڕامیـاری و سـەربازی وای خواسـت کە هێـرش بـکەنە سـەر وڵاتـی شـام لەبەر ئەو هۆیانەی کە پێشـتر باسمان کـرد،[3] سـەرەڕای ئەم ڕووداوانە فاتمیەکـان نەیـانتوانی هەمـوو وڵاتـی شـام کـۆنترۆڵ بـکەن، هەرچەنـدە توانیـان شـاری دیمەشـق لە سـاڵی (٣٥٩ک/ ٩٦٩ز) بە سەرکردایەتی (جەعفەری کوڕی فەلاح) داگیر بـکەن، لەبەرئەوەی بەشـی بـاکووری شـام لە ژێـر دەسـەڵاتی حمدانیەکانـدا بـوو،[4] لە هەمـان کاتـدا فاتمیەکـانیش ڕووبەڕووی گەورەتـرین مەترسـی بـوونەوە ئەوانـیش قەرامیتەکـانی بەحرەین بوون، و ئامانجیـان دەسـت بەسـەراگرتنی هەمـوو ناوچەکـانی وڵاتـی شـام بوو.[5] لە دوای داگیر کردنی دیمەشق لە لایەن فاتمیەکـان لە سـاڵی (٣٥٩ک/ ٩٦٩ز) ململانێی نێوان قەرامیتەکانی بەحرەین و فاتمیەکـان دەستی پێکـرد، بە نەدانی بـاجی (جـزیە) لە لایەن فاتمیەکـانەوە بە قەرامیتەکـان کە پێشـتر لە ئەخشـیدیەکانیان وەردەگـرت و سـاڵانە بـڕی (٣٠٠) هەزار دینـار بـوو، وڵاتـی شـام لە قەرامیتەکـان ڕزگـاری بـوو، و کەوتە ژێـر فەرمـانڕەوای فاتمیەکـان، لە ئەنجـامی ئەم ڕووداوانەدا میری قەرامیتەکان (حەسەن کوڕی ئەحمەد) داوای یارمەتی و هاوکاری لە خەلیفەی عەبباسـی و میـری بـوەیهی کـرد لە دژی فاتحیەکـان، میـری بوەیهیەکـان بە پـارە و چەک هاوکـاری کـرد، بەڵام خەلیفەی عەبباسـی وەڵامـی نەدایەوە، هەروەهـا میـری بــوەیهی (عزالــدولە بەختیــار) داوای لە حمــدانیەکانیش کــرد بە پــارە یــارمەتی قەرامیتەکـان بـدەن، سـەرئەنجام توانیـان سـەرکەون بەسـەر سـوپای فاتیمیەکانـدا و دیمەشـق داگیـر بـکەن، بەمەش توانیـان گوتـاری هەینـی بـۆ خەلـیفەی عەبباسـی

---

(١) - سيدة كاشف: مصر في عهد الاخشيدين، ص٨٦.

(٢) - المقريزي: الخطط،ج ٣/ص٤٢.

(٣) - د. خاشع المعاضيدي: الحياة السياسية في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، بغداد،١٩٧٥، ص٢٢.

(٤) - أبن ظافر: الدول المنقطعة، ص٢٥.

(٥) - د. خاشع المعاضيدي: م.ن، ص٢٣.

بگێڕنەوە لە جیاتی فاتمیەکان.[1] قەرامیتەکان بەم سەرکەوتنە قایل نەبوون و بڕیاری هێرشی سەر میسریان دا، کە لە ئەنجامدا قەرامیتەکان تێکشکان، ئەمەش بووە هۆی لە دەستدانی وڵاتی شام لە ساڵی (٣٦١ک/ ٩٧١ز)دا. بەڵام بەهۆی دروست بوونی کێشە لە نێوان دانیشتوانی دیمەشق و سەربازەکانی خەلیفەی فاتمی کە مەغریبی بوون بارودۆخی ڕامیاری فاتمیەکان لە شام جێگیر نەبوو،[2] لە ئەنجامی ئەم کێشەیەش دەسەڵاتی فاتمیەکان لاواز بوو، ئەمەش دەرفەتی ڕەخساند بۆ (افتكين) کە فەرماندەیەکی تورک بوو لە شاری بەغداد و ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە دژایەتی کردنی فاتمیەکان ، (افتكين) توانی بە ژمارەیەک سەربازی کەمەوە ڕوو بکاتە شاری دیمەشق و لە ساڵی (٣٦٤ک/ ٩٧٤ز) داگیری بکات، لە هەمان کاتدا (جەوهەری صقلی)یش بە سوپایەکی گەورەوە ڕووی کردە شاری دیمەشق و بەرەنگاری یەک بوونەوە، لێرەدا گەمارۆی سەر (افتكين) پەرەی سەند، ئەمەش ناچاری کرد پەیوەندی بکات بە قەرامیتەکانی بەحرەینەوە بۆ بەدەست هێنانی هاوکاری دژی (جەوهەر)، لە ئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا (جەوهەری صقلی) داوای ڕێککەوتنی لەگەڵ کردن و خەلیفەی فاتمی لەم ڕووداوانە ئاگادار کردەوە، بەڵام خەلیفەی فاتمی بە ڕێککەوتنە قایل نەبوو، خۆی بە سوپایەکی گەورەوە هێرشی هێنایە سەر وڵاتی شام و توانی بزووتنەوەی (افتكيني توركی) و قەرامیتەکان لەناو ببات و دووبارە دەسەڵات وەربگرێتەوە لە شام.[3]

لەلایەکی ترەوە میرە عەرەبەکانی شام دژی فاتمیەکان وەستانەوە لەوانە (بنو الجراح) لە فەلەستین کە بنەماڵەیەکی عەرەبی سەر بە هۆزی (طی اليمانية) بوون و لەگەڵ قەرامیتەکان ڕێککەوتن لە ساڵانی (٣٦١ک/ ٩٧١ز) و (٣٦٣ک/ ٩٧٣ز)دا[4] بە هاوبەشی هێرش ببەنە سەر خاکی میسر، لە ڕاستیدا فاتمیەکانیش هەستیان بە کاریگەری و گرنگی ئەم هۆزە دەکرد، بۆیە هەوڵی جیدیان دەدا بۆ ئەوەی بیانکەنە هاوپەیمانی خۆیان لە دژی قەرامیتەکان، دواتر لەگەڵ فاتمیەکاندا ڕێککەوتن بە

---

(١) - أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، تحقيق: أمدروز، القاهرة،١٩٠٨، ص١.

(٢) - أبو شجاع: ذيل تجارب الأمم، ص٣٣٤؛ أبن القلانسي: م.ن، ص١١.

(٣) - أبن خلدون: العبر وديوان المبتدأ و الخبر ومن عاصرهم من ذوى السلطان الأكبر،بيروت،١٩٦١،ج ٤/ص ١٠٨.

(٤) - أبن بدران: تهذيب تأريخ أبن عساكر، ص٣٤؛ النويري: نهاية الارب، ج١٨/ص ٧٦.

مەرجێک مەزهەبی شیعە وەرنەگرن، ئەم هۆزە لە ساڵی (٣٧٠ک/٩٨٠ز) هەوڵیاندا دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان لە فەلەستین دوور لە فاتمیەکان دامەزرێنن، بەڵام ئەم هەوڵەیان بێ ئەنجام بوو تا لە ساڵی (٤٢٢ک/ ١٠٣٠ز) کۆتایان پێ هات،[١] (بنو مرداس) هۆزێکی تری عەرەبی بوون لە (بەنی کلاب)، ئەمانیش بوونە کۆسپ لە بەردەم فاتمیەکاندا لە باکووری وڵاتی شام،[٢] پاشان هۆزێکی عەرەبی تر کە بە (بنو عەقیل) ناسرا بوون سەریان هەڵدا و توانیان شاری موصل و جەزیرە داگیر بکەن، بە تێکچوونی بارودۆخی رامیاری حەلەب و باکووری شام بەهۆی ململانێی میرنیشینە عەرەبیەکان و خەلیفەی فاتمی،[٣] سەلجوقیەکان[٤] لەسەر گۆڕەپانی رامیاری سەریان هەڵدا، ئەویش بەدەست پێکردنی هێرشەکانیان و دواتر جێگیر بوونیان لە خیلافەتی عەبباسی دا، هاتنی سەلجوقیەکان فاکتەرێکی گرنگی لاوازبوونی فاتمیەکان بوو لە بەرامبەر هێرشی خاچییەکان، سەلجوقیەکان هەر لە سەرەتاوە هەوڵیان دەدا بۆ گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکانی خیلافەتی عەبباسی،[٥] و سیاسەتیشیان بە گشتی لەم ناوچەیەدا داگیرکردن و تاڵان و کاولکاری بوو، بە هاتنی سەلجوقیەکان بارودۆخی رامیاری ناوچەکە زیاتر ئاڵۆز بوو، ئەمەش بووبە هۆی ڕەخساندنی دەرفەت بۆ هێرشی خاچییەکان بۆ سەر ناوچە کەنارییەکانی وڵاتی شام، کوشتنی تاج دەوڵە(تتش)ی سەلجوقی لە ساڵی (٤٨٨ک/١٠٩٥ز) بە دەستی برازاکەی (برکیاروق) سەرەتای لەناوچوونی سەلجوقیەکان بوو لە وڵاتی شام، بەردەوامی ململانێی نێوان سەلجوقیەکان و فاتمیەکان لەسەر دیمەشق هۆکاری سەرەکی لاواز بوونی بەرەی ئیسلامی بوو لە بەرامبەر هێرشی خاچییەکاندا بۆ سەر وڵاتی شام.[٦]

---

(١) - مسكويه: تجارب الأمم، ص٤٠٢؛ امينة البيطار: امراء الدين بالشام، ص٦٦.

(٢) - أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٩/ ص٢١٠- ٢١١؛ أبن خلدون: هـ- س، ج٤/ص٥٨.

(٣) - أبن القلانسي: م،ن، ص٧٣- ٧٤؛ أبن العديم: تأريخ حلب، ج١/ ص٢٢٨- ٢٣٩.

(٤) - سەلجوقی: هۆزەیەکە لە تورکەکان لە پشتی ڕووباری نزیک (بخاری) دەژیان و ناویان لە پیرە گەورەیان وەرگیراوە کە "سلجوق" بوو و ببوونە موسڵمان وە خۆیان بە پارێزەری مەزهەبی سنی دادەنا و لە سەردەمی طغرلبک دەسەڵاتی سەربەخۆیان وەرگرت، (أبن تغری البردی: النجوم الزاهرة).

(٥) - أبن القلانسي: م.ن، ص٩٨؛ ابن العديم: هـ- س، ج٢/ص٢٣.

(٦) - بڕوانە أبن ميسر: أخبار مصر، ص٣٧- ٣٨؛ د. خاشع المعاضيدي: الاحوال السياسية في بلاد الشام، ص١٠٧.

## دروستبوونی بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچییەکان

لە سـەرەتای سـەدەی (٥ک/ ١١ز)دا گێتـی ئیسـلامی ڕووبەڕووی شـالاوی خاچییەکان بوویەوە، کە ئامانجیان داگیرکردنی خۆرهەڵات و دەستبەسەرداگرتنی ئابووری ناوچەکە بوو، ئەم ڕاستیە لە شالاوی یەکەمی خاچییەکاندا بەدی دەکرێت کە خـۆی لە دامەزرانـدنی چـوار میرنشـینی خـاچی لە نـاوجەرگەی خـۆرهەڵاتی ئیسلامیدا دەبینیەوە، سەرەتا موسڵمانەکان هەستیان بە مەترسی ئەم میرنیشینانانە و هـاتنی خاچییەکـان نەدەکـرد، دواتـر هەوڵیانـدەدا بەرەنگاریـان ببـنەوە، بەڵام هەوڵەکانیـان لە بەرامـبەر ئەم شـالاوە گەورەیەدا بـێ سـوود بـوو، سـەرئەنجام موسـڵمانان بە بەهێزکردنـی بەرەی نـاوخۆ و بەرەنگـاربوونەوەی داگیـرکەران بە درێژایی سەدەی (٥)ی کۆچی و نیوەی سەدەی (٦ک/١٢ز)توانیان خاکی وڵاتەکەیان لە دەستی خاچییەکـان ڕزگـار بکەن،[1] لە ڕاستیدا یەکەم هەوڵی موسڵمانان دژ بە خاچییەکـان لە سـاڵی (٤٩٠ک/ ١٠٩٦ز)دابـوو کاتێک موسـڵمانە تورکەکـان توانییـان (بطرس الناسک)[2] دەربکەن کە بانگەواز و پێشبینی دەکرد بۆ هەڵگیرسانی شەڕی خاچییەکـان، ئـاواتی پاپـا ئەوە بـوو خاچییەکـان بە سـەلامەتی بـگەنە شـاری کەستەنتینیە تا گەیشتنی سوپای نیزامی و فەرماندەکان و هەموو بە یەکەوە شەڕی موسڵمانان بکەن بۆ ڕزگارکردنی شاری قودس لە دەستی موسڵمانان.[3]

لە کۆتایی ساڵی (٤٩٠ک/ ١٠٩٦ز)دا خاچییەکان خۆیان بۆ هەڵمەتێکی گەورە بە فەرمانـدەیی (بطـر الناسـک و والتـر المفلـس) ڕێکدەخسـت ئەم هەڵـمەتە لە چینـی (خـانەدان، دەرەبەگ، جوتیـار، ڕێگـر،و دانیشـتوانی شـارە بچووکەکـان کە ژن و منداڵیشـیان) لەگەڵ خۆیـان هێنـابوو پێکهـاتبوو، ئەمـانە هەسـتی ئـایینی، و ئومێـدی گەیشتن بە خۆرهەڵات و دەستکەوتنی ئەو بەهەشتەی کە لە پێناویدا هـاتبون کۆی دەکردنەوە، خاچییەکان لە کاتی هاتنیان بۆ ئاسیای بچووک هەمـوو شـار و گوند و کێڵگەو ڕەزەباخ و ئاژەڵی دانیشتوانی ناوچەکەیان تالان و وێران دەکرد، بە تـایبەت دەوروبەری شـاری (نیقـیەی) پـایتەختی سـەلجوقیەکان لە سـەردەمی (قلـیج ئەرسـلان)دا، لەو کـاتەدا تیپێـک لە موسـڵمانەکان چـوو بـۆ شـەڕی خاچییەکـان، لەئەنجامدا خاچییەکـان هەڵهـاتن بـۆ قەڵای (اکسـیریگوردن)، موسـڵمانان سـەرچاوەی

---

(١) - رنسیمان: الحروب الصلیبیة، ج١/ ص١٦٩- ١٧٢.

(٢) - هەروەها ناوی "الصغیر یان شتو یان کیوکیو یان الزاهد"

(٣) - رنسیمان: م.ن، ص١٧٢.

ئاوی شارەکەیان گرت و وەک چەکێکی دەروونی بەکاریان هێنا، و ناچاریان کردن دوای هەشت ڕۆژ دەرگای قەڵاکە بکەنەوە بۆ موسڵمانان بە مەرجێک ژیانیان پارێزراوبێت،بەمەش سەرجەمیان بەدیل گیران و ڕاگوێزکران بۆ شارەکانی (حەلەب و ئەنتاکیا و خۆراسان)،[1]خاچییەکان لە ئەنجامی تێکشکاندنیان لە قەڵای (اکسیریگوردون) بڕیاری کۆبوونەوەیان دا و چاوەڕێ بوون (بطرس الناسک) بگاتە لایان، لەو کاتەدا سوپای موسڵمانان لە سەربازگەی (کیفیتون) لە نزیک قەڵای (اکسیریگوردن) خۆیان حەشاردا بوو،[2] خاچییەکان پێش گەیشتنی (بطرس الناسک) و بە بڕیارێکی هەڵەی (جفری بوریل) هێرشیان بردە سەر موسڵمانان، لەم هێرشەدا ژمارەی خاچییەکان (٢٠) هەزار دەبوو، موسڵمانانەکان لە نزیک گوندی (دراکون) بۆسەیان بۆ دانان، خاچییەکان لەبەر زۆری ژمارەیان و قەرەباڵغی و نەبوونی سەکردایەتیەکی یەکگرتوو کەوتنە ناو بۆسەی موسڵمانان و بە شێوەیەکی زۆر خراپ شکان و ژمارەیەکی بێ شوماریان لێ کوژرا، لەوانە (والتر المفلس وریتالد برایس وکولک اورلیان) تەنها (جفری بوریل) ڕزگاری بوو کە تاوانباری سەرەکی بوو لە شکستی گەورەی خاچییەکان بە دەستی موسڵمانەکان .[3]

بیزەنتەکان بۆ ڕزگارکردنی برا خاچییەکان هیچیان پێ نەکرا، هەر چەندە ئیمپراتۆر (ارکسیوس) بڕیاریدا بە گواستنەوەی هێزێکی گەورە لە سەربازەکانی لە ڕێگای کەشتیگەلی جەنگیەوە، بەڵام ڕووبەڕووی کۆمەڵێک ڕێکخستنی سەربازی ئیسلامی بوونەوە، ئەوەش بووبە کۆسپێک لە بەردەم هەڵگیرسانی شەڕی نێوانیان.[4]

شاڵاوی خاچییەکان بەرەو وڵاتی شام لە پەرەسەندندا بوو، لە هەمان کاتدا موسڵمانان بۆ دروستکردنی بەرەیەکی ئیسلامی بۆ ڕزگارکردنی شاری ئەنتاکیا لە دەستی خاچییەکان کۆبوونەوە،[5] سوپای موسڵمانان لە (مرج دابق) بە مەبەستی ڕزگار کردنی شاری ئەنتاکیا بە ڕێگای ڕووباری (العاص) کەوتنە ڕێ و لە سەرەتای جوڵانەوەکەیاندا تووشی هێزێکی بچووکی خاچییەکان هاتن و توانییان لە

---

(١) – رنسیمان: م.ن، ص١٨٩.

(٢) – د. خاشع المعاضيدي واخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٧٠.

(٣) – رنسیمان: م.ن، ص١٩١.

(٤) – ئاراس زەینەل، س- پ ل٧٥.

(٥) – أبن العديم: زبدة الحلب، ج٢/ ص١٣.

ناویـــان بەرن، لە دوای ئەم ڕووداوە ســـوپای ســـەلجوقیەکانی ئاســـیای بچـــووک پەیوەندییان کـرد بەم هاوپەیمـانیەتیەی موسـڵمانانەوەو توانییـان گەمـارۆی شـاری ئەنتاکیا بدەن و نەهێڵن بە هیچ شێوەیەک خواردەمەنیان بۆ بڕوات، ئەمەشیان وەک چەکێکی دەروونی دژ بە خاچییەکان بەکارهێنا، مـاوەی گەمـارۆکە (٣) سێ هەفتەی خایانـد، بـارودۆخی خاچییەکـان ڕووی لە خراپـی دەکـرد ناچـار فەرمانـدەکانیان بە نهێنی و لە ڕێگای (بەندەری سویدی)یەوە هەڵدەهاتن، لەم بـارودۆخەدا خاچییەکـان تووشـی بـارێکی دەروونـی واهـاتن لە هاتنیـان لە ئەوروپـاوە بـۆ خـۆرهەڵات بە مەبەسـتی ڕزگـارکردنی شـوێنە پیرۆزەکـان پەشـیمان بـوونەوە،[1] ئەوەی زیـاتر بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو، سەرەڕای ئەوەی ئیمپراتۆر (الکسیوس کومنین) بە سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە بۆ یارمەتی دانی خاچییەکان کەوتەڕێ، بەڵام دواتـر لە ترسـی هێرشـی سـەلجوقیەکان لە هەڵـمەتەکەی پەشـیمان بـوویەوە، ئەم هەڵوێسـتەی ئیمپراتـۆر بـووبە هـۆی مەترسـیەکی گەورە بـۆ سـەر خاچییەکـان، لە سـاڵی (٤٩٢ک/ ١٠٩٩ز)دا خاچییەکـان بە مەبەسـتی گرتنـی (بەیـت ولمەقـدیس) گەیشـتنە شـاری (صـیدا)، بەڵام بەرگـری کـارانی شـارەکە توانییـان شارەکەیان لە بەرامبەر هێرشـی خاچییەکاندا ڕزگاربکەن، خاچییەکـان دوای ئەوەی کێڵگە و رەزەباخەکانیان تاڵان کرد، لە ترسی موسڵمانەکان هەڵهاتن بۆ ناوچەکـانی نزیک شاری (صور)،[2] لە هەمان ساڵدا خاچییەکان لە شاری (رملە) نزیک بوونەوە، موسڵمانان (کڵێسای قدیس جورجی گەورە)یـان ڕووخاند، خاچییەکـان وایانـدەزانی ڕێگاوبـان و شـارەکان چـۆڵن و کەسـیان لـێ نیە، بـۆیە لە کـاتی هاتنیانـدا کەوتنە بۆسەی موسڵمانان، ئەمە بووبە هۆی کوژران و بەدیلگیرانی ژمارەیەکی زۆریان، لە ئەنجامی بەرگری کردنی موسڵمانان زۆر لە خاچییەکـان ناوچەکانیـان بەرەو شـاری یافا بەجێهێشت، بە هیوای گەڕانەوە بۆ ئەوروپا لە ڕێگای بەلەم یان پاپۆڕەوە.[3]

لە سەرەتای ساڵی (٤٩٣ک/ ١٠٩٩ز)دا هەواڵێک لە ناو سەربازگەی خاچییەکاندا بڵاوبوویەوە کە دەیوت سوپایەکی گەورەی موسڵمانەکان لە میسرەوە بەڕێوەیە بۆ ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس، بەمەش ترس چووە ناو دڵ و دەروونی سـەرکردە و فەرمانـدەکانی خاچییەکـان و توشـی بێهیـوایی بـوون ولە ترســی موســڵمانەکان

---

(١) - د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية،ج ١/ ص٢٠١.

(٢) - رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ج١/ ص٣٨٩.

(٣) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص٧٨.

هەڵـــدەهاتن، ئەمەش کـــاریگەری دەروونـــی ترســـناکی لەســـەر ســـەربازەکان دروستکرد،[1] لەو بارودۆخە پشێو و نائارامەی خاچییەکاندا (٦) شەش بەلەمیان کە لە(عصـــلان)ەوە بە تەنیشـــت شـــاری رمـــلەدا هـــاتبوون کەوتە بۆســـەی تیپێکـــی موسڵمانانەکانەوە، دوو بەلەمیان فەڕەنسی بوون بە سەرکردایەتی (ادیاکو)، چوار بەلەمەکەی تریان ئینگلیزی بوون، ئەم بەلەمانە کە خواردەمەنی و چەک و پەت و بزمـار و کەرەسـتەی گەمارۆیـان هەڵگرتبـوو لەلایەن موسـڵمانەکانەوە دەسـتیان بەسـەردا گیرا، لە هەمان کاتدا کەشتیگەلی میسری لە کەنارەکانەوە سـەریهەڵدا و توانی گەمارۆ بخاتە سەر شاری رملە، خاچییەکان بارودۆخیان تێکچوو و ئازار و ناڕەحەتی زۆریان چەشت، گەرمی کەش و هەوای ناوچەکە و کەمی ئاو کە بەشـی ئەو هەموو ئاژەڵەی نەدەکرد کە بە تالانی هێنابوویان، لەگەڵ زۆر بوونی بۆسـە و هێرشـی تیـپە ئیسـلامیەکان و دروسـتبوونی ململانێـی نێـوان خـودی سـەرکردە خاچییەکان، بوون بەهۆی ئەوەی هەندێک لە سەربازە خاچییەکان بۆ ڕزگارکردنی خۆیان لە مردنێکی چاوەڕوان کراو بە دەستی سوپای موسڵمانەکان وازبێنن لە ئایینی مەسیحی.[2]

لە ساڵی (٤٩٤ک/ ١١٠٠ز) بەپرسی دیمەشق توانی دەست بگرێت بەسەر کۆتا سوپای خاچییەکاندا کە خەریکی تالان و وێرانکردنی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئوردن و جۆلان بوون، مێژوونووس (ئیبن قلانسی) دەڵێت: لە ساڵی (٤٩٨ک/ ١١٠٤ز) بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی دژ بە خاچییەکان دروستبوو، کاتێک خاچییەکان هێرشیان بردە سەر تەرابلس، (فخر الملک بن عمار) بەرپرسی تەرابلس داوای یارمەتی لێکردن، بەرەی ئیسلامی کە لە بەرپرسی (ماردین ، موسڵ و حەلەب) پێکهاتبوو هاوکارییان پێشکەش کرد و خاچییەکان ئەم شەڕەیان دۆڕاند،[3] لە ساڵی (٤٩٩ک/ ١١٠٥ز)دا خاچییەکان لە ترسی هێرشی موسڵمانەکان پێگەیەکی بە هێزیان بۆ خۆیان دروستکرد، بەڵام هەوڵەکانیان لە بەرامبەر پەلاماری موسڵماناندا بێ ئەنجام بوو، هەروەها لە ساڵی (٥٠٠ک/ ١١٠٦ز) خاچییەکان کەوتنەوە بەر هێرشی موسڵمانەکان لە (طبریە وعەککا).[4]

---

(١) - رنسیمان: تأریخ الحروب الصلیبیە،ج ١/ ص٤٠٠.

(٢) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل٧٧.

(٣) - ذیل تأریخ دمشق: ص١٤٦- ١٤٨.

(٤) - هەمان سەرچاوە، ص١٥١.

له سالانی (٥٠٢- ٥٠٧ك/ ١١٠٨- ١١١٣ز) میر (مودواین انشتکین)ی موسڵ به مەبەستی ڕزگارکردنی (بەیت ولمەقدیس) که له لایەن خیلافەتی عەبباسی و دەسەلاتی سەلجوقیەوه داوای لێکرابوو، به هاوکاری (طغتکین)ی میری حەلەب و (ابلغازی بن ارتق) میری ناوچەی جەزیره،[1] پەلاماری ناوچەکانی ڕەهاو ئەنتاکیەی دا، هەرچەنده له سالی (٥٠٩ك/ ١١١٥ز)دا هەندێ له تیپه خاچییەکان هێرشیان برده سەر شاری (رفینه) و توانییان داگیری بکەن، بەلام (ظهیر الدین)ی بەرپرسی دیمەشق دوای کوشتارێکی زۆر له خاچییەکان و دەسکەوتێکی مادی چاک و گواستنەوەی دیلەکان بۆ دیمەشق توانی ڕزگاری بکاتەوه،[2] مێژوونووس (ئیبن قلانسی) سەبارەت به هەوڵ و چالاکی موسڵمانان دژ به خاچییەکان دەڵێ: (کاتێک خاچییەکان سوپایان کۆکردەوه بۆ داگیرکردن و تێکدان و تالانکردنی ناوچەی بیقاع، هەردوو سوپای (موسڵ و دیمەشق) پێکەوه هێرشیان بردەسەر خاچییەکان و زیانێکی زۆریان لێدان، به شێوەیەک خاچییەکان هەڵهاتن و هەموو شتێکیان بەجێهێشت)،[3] له سالی (٥١٢ك/ ١١١٨ز)دا خاچییەکان جارێکی دی خۆیان بۆ شەڕی موسڵمانەکان ئامادەکرد و بەرەو پێگه و قەلا و شارەکان چوون، بەرپرسی دیمەشق داوای له هاوپەیمانانی کرد له بەرامبەر هێرشی خاچییەکاندا هاوکاری بکەن.[4]

هەروەها له سالی (٥١٣ك/ ١١١٩ز)دا خاچییەکان سوپایەکی گەورەیان ئامادەکرد که ژمارەی سەربازانی نزیکەی (٢٠) هەزار سوارەو پیاده دەبوو، ئەمانه زۆر به چاکی خۆیان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسڵماناندا ئاماده کرد بوو، موسڵمانان له هەموو لایەکەوه گەمارۆیان دان و کەوتنه لێدانیان به تیر و شمشێر، هێندەی نەخایاند موسڵمانان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا، بەجۆرێک هەندێ له مێژوونوسان دەڵێن (چاکترین و گەورەترین سەرکەوتنی موسڵمانەکان بوو)،[5] هەروەها هێرشی خاچییەکان له سالی (٥١٨ك/ ١١٢٤ز)دا بۆ سەر شاری حەلەب

---

(١) - د. عبدالقادر اليوسف: علاقات بين الشرق والغرب، ص٩٤.

(٢) - أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص١٩٢.

(٣) - أبن القلانسي: هەمان سەرچاوه، ص١٩٧.

(٤) - ئاراس زەینەل: س-پ، ل٧٨.

(٥) - أبن القلانسي: م.ن.ص ٢٠١.

بەهۆی لێهاتوویی میر (سیف الدین البرسقی) بەرپرسی موسڵ تێکشکا،[1] مەترسی و هێرشی خاچییەکان بۆ سەر وڵاتانی شام و فەلەستین و جەزیرە تا ساڵی (٥١٩ک/ ١١٢٥ز) درێژەی کێشا، و هەوڵی موسڵمانەکانیش بۆ بەرگری کردن دژ بە خاچییەکان بەردەوام بوو،ئەمە بووبە هۆی بوژاندنەوەی هەستی موسڵمانان بە تایبەت لە سەردەمی (عیمادەدین زەنگی، نورەدین مەحمود و سەلاحەددین ئەیوبی) دا کە توانییان ئەم مەترسیە گەورەیە لە ناوچەکە دووربخەنەوە و لە هەمان کاتدا قەڵا و میرنیشینی خاچییەکانیش بگرن و گەورەترین بەرەی ئیسلامی دژ بە خاچییەکان دروستبکەن. [2]

## رۆڵی عیمادەدین زەنگی لە پێکهاتنی بەرەی ئیسلامیدا

پەرەسەندنی مەترسی خاچییەکان لە وڵاتی شام و جەزیرە بارودۆخێکی وای رەخساند، کە گیتی ئیسلامی لە ناوچەکەدا پێویستی بە بەرەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو هەبێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی خاچییەکان، کە هەموو گیتی ئیسلامیان خستبووە مەترسیەوە بە تایبەت لە سەرەتای سەدەی (٦ک/ ١٢ز)دا، پرۆژەی ئەم هاوپەیمانیەتیە دەگەرێتەوە بۆ (عمادەدین زەنگی) میری موسڵ،[3] کە دەست پێشخەر بوو لە دروستکردنی بەرەی ئیسلامی یەکگرتوودا، لە رێگای کۆکردنەوەی هێزی موسڵمانان بۆ ئامادەکردنی هێزی سەربازی دژ بە خاچییەکان،[4] عیمادەدین زەنگی حوکمڕانی ناوچەکانی (حەلەب ، حەران و موسڵ)ی دەکرد، و لە ناوچەی موسڵ (دەوڵەتی زەنگی)[5] دامەزراند، ناوچەکانی (جەزیرەی ئیبن عومەر[6]

---

(١) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل٧٩.

(٢) - أبن القلانسي: م.ن.ص ٢١٢.

(٣) - د. الباز العريني: مصر في عصر الايوبين، ط١، بيروت، ١٩٦٠، ص١٩.

(٤) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٧٢.

(٥) - زەنگیەکان: دەگەرێنەوە سەر (زنكي بن اق سنقر بن عبدالله بن الترغان) لەهۆزی "ساب یو"، ناوبانگیان دەگەرێتەوە بۆ باوکیان کەبە (قسيم الدوله) ناسرابوو، پیشەی (دەرگاوان – الحاجب) بوو لای سوڵتان (ملكشاه ی سلجوقی) هاوکات رۆڵی کاریگەری لەسەر رووداوە رامیاری و سەربازییەکانی دەوڵەتی سلجوقی هەبووە لەو سەردەمەدا. (ابن الاثير: الباهر، ل٤؛ خليل: عمادالدين زنكي، ل٣١؛ زامباور: معجم الانساب والاسرات الحاكمة فى التأريخ الاسلامي، ترجمة: زكى محمدحسن واخرون، ج١/ ل١١٥).

(٦) - شارێکە لە سەرووی موسل (٣ رۆژ رێگانیوانیانە)، (ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢/ص١٣٨).

نصيبين[١] و سنجاری[٢]) ڕزگار کرد و دواتر دەستی بەسەر (حەڕاندا) گرت و بەرەو شاری (ڕەها) بەڕێکەوت، بەڵام دوای ئەوەی زانی بارودۆخەکە بۆ شەڕ کردن گونجا و نیە ڕای گۆڕی و لە ڕووباری فورات پەڕییەوە بۆ شاری حەلەب و شارەکانی دیکەی وڵاتی شام، چونکە شاری ڕەها ببووبە بەشێک لە هاوپەیمانێتی نێوان فەرەنجیەکان و بیزەنتەکان. [٣]

(عیمادەدین زەنگی) لە ماوەی هاتنی بۆ وڵاتی شام توانی گەمارۆی شاری دیمەشق بدات، بەڵام بێ ئەنجام بوو، چونکە خاچییەکانی بەیت ولمەقدیس بۆ ڕزگاربوون لە مەترسی گەورەی بەرەی ئیسلامی کە (عیمادەدین زەنگی) سەرکردایەتی دەکرد هاریکاری یەکتر بوون. [٤]

لە ناوچەکەدا چەند میرنشینێکی ئیسلامی لاواز هەبوون کە سەرکردایەتیەکی یەکگرتوویان نەبوو بۆ سەرپەرشتی کردن و یەکخستنی دەنگ و هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر بە خاچییەکان، بۆیە عیمادەدین زەنگی بە لێهاتووی خۆی توانی لەو بارودۆخە ناسک و ناتەبایەی نێوان موسڵماناندا دوو هەنگاوی گەورە بنێت:

**یەکەم**- دروستکردنی بەرەیەکی ئیسلامی بە کۆکردنەوەی هێزە ئیسلامیەکان و سەرکردایەتی کردنی.

**دووەم**- لێدانی خاچییەکان.

بەمەش (عیمادەدین زەنگی) یەکەم سەرکردەی موسڵمانان بوو کە توانی بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی دروست بکات وبەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو بەرەو ڕووی مەترسی خاچییەکان ببێتەوە، پێشتر هەوڵەکانی (مودود التونتکین٥٠٢-٥١٨ک) و (الغازی الارتقی٥١٢- ٥١٨ک) و (اق سنقر البرسقی٥١٨- ٥٢٠ک)[٥] لە پێناوی دروستبوونی بەرەیەکی ئیسلامی و جێگیر بوونی شکستیان هێنا بوو، بۆیە (عمادەدین زەنگی) هێزی سەربازی بەکارهێنا لە دژی میرەکانی گێتی ئیسلامی کە لەگەڵ خاچییەکان دەستیان تێکەڵ کردبوو یان ئەوانەی بێ لایەن بوون، ئەمەش بۆ

---

(١) - شارێکە لە سەرووی جەزیرە لە نێوان موسڵ و شام، (یاقوت الحموي: م- ن، ج٢/ ص٢٨٨).

(٢) - لە شارەکانی جەزیرە (٣ ڕۆژ) ڕێگایە لەگەڵ موسڵ لە قورگی شاخەکانە، (یاقوت، م- ن،ج ٣/ص ٢٦٤).

(٣) - د. علیة الجنزوري: امارة الرها الصلیبیة، مطابع سجل العرب، القاهرة، ١٩٧٥، ص١٥٧.

(٤) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصلیبي، ص٧١.

(٥) - د. عماد الدین خلیل: عماد الدین زنکی، ط١، الدار العلمیة، بیروت، ١٩٧١، ص١٦٦.

دروستكردنی هاوپەیمانیەكی بەرگریكاری، (عیمادەدین زەنگی) بۆ سەركەوتنی ئەم پرۆژەیە، بیری لەوە دەكردەوە چۆن مەترسی و هێرش و پەلاماری خاچییەكان كەم بكاتەوە، سەرئەنجام بەرنامە و پلانی دانا بۆ هێرش بردنەسەر خاچییەكان لە وڵاتی شام و جەزیرە، شاری حەلەب گرنگیەكی تایبەتی هەبوو لەلای موسڵمانەكان و خاچییەكان، لەبەرئەوەی سەنتەری رامیاری ناوچەكە بوو، لە هەمان كاتدا هەڵكەوتێكی سەربازی و ستراتیژی هەبوو، ئەمە سەرەڕای ناوبانگی شارەكە لە بوونی سەروەت و ساماندا، بۆیە (عیمادەدین زەنگی) پلانێكی رێك وپێكی دانا بۆ دەست بەسەراگرتنی حەلەب و دەوروبەری تا ببێتە ناوجەرگی دەوڵەتی ئیسلامی و توانی بیخاتە ژێر ركێفی خۆی، هەروەها لەساڵانی (٥٢٣-٥٤٠ك/١١٢٨-١١٤٥ز) توانی هاوپەیمانی نێوان ئەرتەقیەكان و خاچییەكان تێك بدات، لە هەمان كاتدا شاری (نصیبین)ی كردە بنكەیەكی سەربازی لە ناوچەكەدا بۆ هێرشبردنە سەر خاچییەكان،[1] هەروەها هەوڵیدا دەسەڵاتی (بەنی ارتق) بڕوخێنێت، چونكە كۆسپ بوو لەبەردەم یەكبوونی ناوچەی موسڵ و جەزیرە و باكووری شامدا، توانی هەندێ شار و پێگەی سەربازیان داگیر بكات، (عیمادەدین زەنگی) هەوڵی دا شاری دیمەشق داگیر بكات، بەڵام میری شاری دیمەشق (موعینەدین افر) هاوپەیمانی لەگەڵ خاچییەكان بەست، بەوەش ئاوات و خەونی (عیمادەدین زەنگی) نەهاتەدی كە ئامانجی فراوانكردنی سنووری دەسەڵاتی رامیاری و سەربازی و ئابووری بوو لە دژی خاچییەكان.[2]

گرنگترین ڕووداوی مێژوویی لە ئاست سیاسەتی (عیمادەدین زەنگی) بەتایبەتی و سیاسەتی گێتی ئیسلامیدا بە گشتی، فەتح كردنی شاری رەها بوو لە ساڵی (٥٣٩ك/ ١١٤٣ز)، هۆكاری هێرشی بۆسەر شاری رەها ئەوەبوو (سوڵتان مەسعود) خۆی ئامادە كردبوو بۆ شەڕی (عیمادەدین)، سەرەڕای بیستنی هەواڵی هاوپەیمانی نێوان(سوڵتان مسعود) و (ارتقی رهوی) لە دژی ئەو، جووڵانەوەی خێرای (عیمادەدین زەنگی) بۆ سەر شاری رەها و توندی گەمارۆی (عیمادەدین) و هاندانی سەربازەكانی هۆكاری سەركەوتنی بوو كە توانییان لە دوای (٢٨) ڕۆژ گەمارۆدان

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٧٤.

(٢) - د. عماد الدين خليل: هەمان سەرچاوە، ص ٩٨- ١٣٨.

ڕەها فەتح بکەن،[1] (عیمادەدین زەنگی) بەفەتحکردنی شاری ڕەها لای سوڵتانی سەلجوقی و خیلافەتی عەبباسی پلە وپایەی زیاتر بەرز بوویەوە،[2] (عمادەدین زەنگی) فەرمانی دەرکرد بە کۆتایی هێنان بە کوشتن و بڕین، و داوای لە سەربازەکانی کرد سامان و ماڵی دانیشتوانی شارەکە بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان و هەموو دیلەکان ئازاد بکەن، پێشتریش (عیمادەدین زەنگی) بە مەسیحیەکانی ڕاگەیاند بوو کە بۆ ڕزگار کردنیان لە دەستی فەرەنجەکان هاتووە، نەک بۆ داگیرکردن و تالانی و کوشتن و بڕین، ئەم هەڵوێستەی (عیمادەدین زەنگی) وایکرد دانیشتوانی وڵاتی شام لە گرتنی ڕەهادا یارمەتی بدەن،[3] دەتوانین بڵێین شاری ڕەها یەکەم کۆسپی بەردەم یەکگرتنی موسڵمانان بوو، بە ڕزگارکردنی شاری ڕەها زەمینە ڕەخسا بۆ داگیرکردنی قەڵا و پێگە و شارەکانی خاچییەکان لە وڵاتی شام، بەمەش یەکێتیەک لە نێوان شام و جەزیرەی فورات دروست بوو، سەرەڕای گەڕانەوەی پەیوەندی نێوان موسڵ و حەلەب، فەتح کردنی شاری ڕەها دوو ئەنجامی گرنگی لێ کەوتەوە:

١. کۆنترۆڵکردنی ڕێگاوبانی نێوان شام و جەزیرە و عێراق و ئاسیای بچووک.

٢. ڕووخاندنی یەکەم قەوارەی رامیاری و ئایینی و ئابووری خاچییەکان لە خۆرهەڵات.

به کەوتنی شاری ڕەها جۆرە ترسێک لە ناو دەزگاکانی خاچی لە ئەورووپیدا بڵاوبویەوە و هەستیان بە مەترسی و ئاڵۆزی بارودۆخیان دەکرد لە ناوچەکانی جەزیرە و شام، چونکە لە دەستدانی شاری ڕەها لێدانێکی گەورە بوو بۆ بەرژەوەندیەکانیان، بۆیە بیریان لە هەڵمەتێکی نوێ کردەوە بۆ سەر خۆرهەڵات لەبەرئەوەی خاچییەکان هیچیان پێ نەدەکرا لە دژی (عیمادەدین زەنگی) تا هاتنی هێرشی دووەمی خاچییەکان.[4]

بێگومان تێکشکاندنی خاچییەکان لە شاری ڕەها بەرامبەر (عیمادەدین زەنگی) بووبە هۆی ڕوودانی هێرش و پەلاماری دووەمی خاچییەکان بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆرەکانی (فەرەنجە، ئەڵمان و ئینگلیز)، ئەم هێرشە کە لە سوارەی فەرەنج و

(١) - د. عليه الجنزوري: م.ن.ص/ ٣٠٤؛ محمود ياسين التكريتي: الايوبيون في شمال الشام والجزيرة، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨١، ص٣٧.

(٢) - أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٨٤.

(٣) - محمود ياسين التكريتي: هەمان سەرچاوە، ص٣٧.

(٤) - عماد الدين خليل: هەمان سەرچاوە، ص ١٥٤.

ئەڵمان و ئینگلیز پێکهاتبوو توانییان لەشکرێکی زۆر گەورە لە شاری قودس ئامادە بکەن، ئەم لەشکرە گەورەیە سەرەتا گەمارۆی دیمەشقیدا بەڵام بێ سوود بوو.

بە کوشتنی (عیمادەدین زەنگی) بە دەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی بە ناوی (بـرتقش)، لە سـاڵی (٥٤١ک/ ١١٤٧ز)دا، یەکەم زنجیـرەی هەوڵـدانی موسـڵمانان لە دروستکردنی بەرەی یەککگرتوو لە دژی خاچییەکان بۆ دەرکردنیان لە وڵاتی شام کۆتایی پێهات. [١]

دوای (عیمادەدین زەنگی)، (نورەدین مەحمودی) کوڕی دەسـەڵاتی گرتە دەست و شـاری حەلەبـی کـردە پـایتەختی خـۆی، لە سـاڵی (٥٤٩ک/١١٥٤ز)دا (نـورەدین مەحمود) شاری دیمەشقی بەبێ شەڕ ڕزگار کرد، بە ڕزگار کردنی شـاری دیمەشـق هیچ کۆسپێک نەما لە نێوان ناوچە زەنگیەکان و قودسدا. [٢]

## ڕۆڵی نورەدین مەحمود لە پێکهاتەی بەرەی ئیسلامی

(عیمادەدین زەنگی) لە دوای خۆی چوار کوڕی بەجێ هێشـت، ئەوانیش (سـیف الدین غازی) و (نـورەدین مەحمـود) (مەلیک عـادل) و (قطب الـدین مـودود) و (نصـر الدین) بوون، هەواڵی کوشتنی (عیمادەدین زەنگی) سوپاکەی کرد بەدوو بەشەوە، بە شێکیان بە فەرماندەیی (جمال الدین الاصفهانی) بەرەو شـاری حەلەب بەڕێکەوتـن و ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە دانانی (سیف الدین غـازی) لە سـەر شـاری موسـڵ، بەم شـێوەیە دەوڵەتـی زەنگـی بـوو بە دوو بەشـەوە، بەشـی خـۆرهەڵات کە کـوڕە گەورەکەی بە نـاوی (سـیف الـدین غـازی) فەرمـانڕەوایی دەکـرد، بەشـی خۆرئـاواش (نـورەدین مەحمـود) بەڕێـوەی دەبـرد،[٣] سـەرچاوە مێژوویەکـان بـاس لە سـەرەتای ژیانی نورەدین مەحمود ناکەن تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە کـاتی گەمـارۆدانی قەڵای (جعبر) و مردنی بـاوکی لەگەڵ بـاوکی بووە، هەروەهـا دەڵـێن (ئەسـەدەدین شـێرکۆ) ڕێگـای نیشـانداوە بـۆ وەرگرتنـی دەسـەڵات لە شـاری حەلەب دوای مردنـی بـاوکی، وەرگرتنـی فەرمـانڕەوایی حەلەب بـێ بنەمـا نەبـوو، چـونکە (نـورەدین محمـود) لە

(١) - أبن واصل: مفرج الكروب، ج١/ ص٩٩- ١٠٠؛ أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص٨٤- ٨٥.

(٢) - حسن حبشي: نوردين والصليبيون، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٤٨، ص١٤٠.

(٣) - أبن تغرى بردى: النجوم الزاهرة في اخبار ملوک مصر والقاهرة، ج ٥/ ص٢٧٩؛ د. سـعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية، القاهرة، ١٩٦٣، ص٦١١.

پرۆسەی بەڕێوەبردندا شارەزایی هەبووە، بەهۆی نزیکی لە میرنیشینە خاچییەکانی (ئەنتاکیا و تەرابلس) بارودۆخی (نورەدین مەحمود) لە شاری حەلەب باش نەبوو، هەروەها قەلا و پێگەکانی تری خاچییەکان لەو ناوەدا دامەزرا بوون، واتا شاری حەلەب هەردەم ئامانجێک بوو بۆ هێرشی خاچییەکان، بۆیە (نورەدین مەحمود) پێگەکانی خۆی بەهێز کرد بۆ وەستان لە دژی خاچییەکان، بۆ ئەم مەبەستەش چەند هەنگاوێکی رامیاری و دبلۆماسی و سەربازی نا، بۆ سەرکەوتنی ئەم ئامانجەش چەند میرێک هاوکاریان کرد لەوانەش (ئەسەدەدین شێرکۆ) و (نەجمەدین ئەیوبی) برای کە دەکاتە باوکی (سەلاحەددین ئەیوبی). سیاسەتی (نورەدین مەحمود) کۆمەڵێک شێوازی لەخۆگرت،[1] ئەم سیاسەتەش تێکەڵ و تەواوکەری ئەوەی دیکەیانە، بۆیە لە سەرەتای فەرمانڕەواییەوە هێرشی میری شاری ڕەهای بەرپەچ دایەوە و دووبارە شارەکەی گرتەوە، دوای ماوەیەکی کەم هێرشی میری تەرابلسی بەرپەرچ دایەوە و لە ناوچەکە دەریکردن، هاوکات (ئەسەدەدین شێرکۆ) توانی هێرشیان بکاتە سەر و زۆر بە خراپی بیانشکێنێ و تالانەکەشیان لێ بسێنێتەوە و ژمارەیەکی زۆریشی لێ کوشتن،[2] هاوکات خاچییەکان لە هەڵمەتی دووەمیاندا بۆ سەر ولاتی شام بە فەرماندەیی (کۆنرادی سێیەم) ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و (لویسی حەوتەم) پاشای فەڕەنسا بە لە شکرێکی (٥٠) هەزاریەوە گەمارۆی شاری دیمەشقیاندا،[3] ئەم ڕووداوانەو هەڵکەوتەی جوگرافی حەلەب وەک بنکەیەکی سەربازی و کارگێڕی، (نورەدین مەحمودی) ناچارکرد ئەرکی دژایەتیکردن و بەرەنگاربوونەوەی خاچییەکان لە ئەستۆ بگرێت، (نورەدین مەحمود) توانی لە درێژەی سیاسەت و تێکۆشانی دژ بە میر و سەرکردە موسڵمانەکانی ناوچەکە کە بەرژەوەندی خۆیان لە سەرووی بەرژەوەندی گەلەکانیان دانابوو، بەسەریاندا سەربکەوێت و دەسەلات لە ناوچەکانی ولاتی جەزیرە وەربگرێت، بەم شێوەیە سوپای موسڵ و حەلەب و سنجار بوونەوە بەیەک و تەنها شاری دیمەشق لە بەردەم نورەدیندا مابوو بیخاتە ژێر رکێفی خۆی، دیمەشق بە دەستی

---

(١) - أبن تغری بردی: النجوم الزاهرة في اخبار ملوك مصر والقاهرة، ج٥/ ص٢٨٠.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن.ص ٩٥.

(٣) - د. خليل ابراهيم السامرائي وأخرون: م.ن، ص ٣٢٢.

فەرمانڕەوایـانی (ال بـوری)[1] بـوو، (نـورەدین مەحمـود) دڵنیـابوو لەوەی شـەڕی خاچییەکانی پێ ناکرێت ئەگەر شـاری دیمەشـق لە ژێر کۆنترۆڵیدا نەبێت، بەتایبەت کە بێهێـزی و لاوازی بنەمـاڵەی (ال بـوری) بـوون ئەمە زەمینـەی ڕەخسـاند بـۆ خاچییەکان تا ناوچەکە بگرن و خراپەکاری بنێنەوە،[2] داگیرکردنی شـاری دیمەشـق، گرنگیەکی گەورە و لە ڕادە بەدەری هەبوو بۆ (نورەدین مەحمود)، لەبەر ئەوەی لە بەسـتنەوەی عێـراق و شـامدا هەڵکەوتێکـی جـوگرافی و سـتراتیژی گرنگـی هەبـوو، هەروەها دەکەوتە سەر ڕێگای بازرگانی نێوان (فورات ونیل)[3]، سـەرەڕای بوونی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان و کەرەستەی جەنگی، بەمەش گرتنی شاری دیمەشـق دەبوو بە خاڵی وەرچەرخان لە بەهێزکردنی سوپای (نورەدین مەحمود)دا لە ڕووی زیـادبوونی ژمـارەی جەنگاوەرەکـانی و دەسـتپێکردنی جیهـاد دژ بە خاچییەکـان،[4] (نورەدین مەحمود) نەیدەویست بە سیاسەتێکی توند وتیژانە و سیاسەتی سەربازی ڕاستەوخۆ شاری دیمەشق بگرێت، بەڵکو بەردەوام پێی خۆش بوو بۆ گەیشتن بە ئەنجـام سیاسـەتی نەرم ونیـانی بەکاربهێنێـت و کەمتـرین خـوێن ڕشـتن لە نێـو موسڵمانناندا ڕووبدات،[5] لە ڕاستیدا ئامانجی سـەرەکی (نـورەدین مەحمـود) پێکهـاتنی بەرەی ئیسلامی یەکگرتوو بوو لە دژی خاچییەکان، بۆیە دوای سێ سـاڵ بڕیـاری گەمـارۆدانی شـاری دیمەشـقیدا، خاچییەکـان بـاجێکی زۆریـان لە دانیشـتوان وەردەگرت، هەروەها نرخی شتومەک لە بازاڕەکانی دیمەشق لە توانای خەڵک زیاتر بەرز ببـوویەوە، لە ئەنجـامی تونـدی گەمـارۆکەی (نـورەدین مەحمـود) کە بەهـیچ شێوەیەک نەیدەهێشت خواردن بچێتە ناو شـاری دیمەشق و لاواز بوونی دەسـەڵاتی بنەمـاڵەی (بـوری) دەرفەت ڕەخسـا بـۆ (نـورەدین مەحمـود) تـا لە سـاڵی (٥٤٩ک/ ١١٥٤ز) لە دەرگای خۆرهەڵاتەوە بچێتە نـاو شـاری دیمەشـق و دوای چەند سـاتێک

---

(١) – د. دريد عبدالقادر: موقف اتابكية دمشق من الغزولبلاد الشام، مجلة اداب الرافدين، جامعة الموصل، ١٩٨٠، العدد١٠، ص١١٥– ١١٨.

(٢) – ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، القاهرة،ج١/ ص٦٩.

(٣) – ارنست باركر: الحروب الصليبيه، ص٥٠.

(٤) – د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م. ن، ص٩٦.

(٥) – عاشور: م. ن،ج٢/ص٦٦٣.

هەموو دەرگاکانی قەڵاکە کرانەوە و (مجیر الدین) ناچار خۆی دا بەدەستەوە، بەمەش هەموو شاری دیمەشق کەوتە ژێر کۆنترۆڵی (نورەدین مەحمود).[1]

دەتوانین بڵێین کەوتنی شاری دیمەشق بە دەستی (نورەدین مەحمود) یەکێکە لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی ئەو سەردەمە، کە بووبە هۆی بەهێزبوونی بەرەی ئیسلامی و لەبەرامبەردا لاوازبوونی خاچییەکان، بەمەش (نورەدین مەحمود) توانی بەربەستی نێوان حەلەب و بەیت ولمەقدیس نەهێڵێ،[2] هەروەها ئەو یەکێتەی کە لە وڵاتی شام لەسەر دەستی نورەدین مەحمود دروست بوو، وایلێکرد بیر لە یەکێتی نێوان میسر و شام و وڵاتی جەزیرەش بکاتەوە، بەڵام مردنی کۆسپێک بوو لە بەردەم ئەو خەونەیدا و دواتر لەسەر دەستی (سەلاحەددینی ئەیووبی) هاتەدی، (نورەدین مەحمود) دوای دەست بەسەراگرتنی شاری دیمەشق لە ساڵی (٥٤٩ک/١١٥٤ز) گرنگترین ئامانجی رامیاری بە دەستهێنا و دەرفەتی بۆ ڕەخسا بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجی دووەم کە بریتیبوو لە یەکێتی نێوان موسڵمانان و جیهاد کردن لە دژی خاچییەکان، ئەو پلانەشی بۆ دەرکەوت کە (بلدوینی سێیەم) پاشای بەیت ولمەقدیس لە کاتی فەتحکردنی شاری دیمەشق پەیڕەوی دەکرد،[3] نورەدین مەحمود توانی دەست بگرێت بەسەر قەڵا و پێگەکانی خاچییەکاندا لەوانە (تل باشر) و گەمارۆی (حارمی) دا، دواتر پەیمانی لەگەڵ واژۆکردن بۆ ماوەی ساڵێک بەڵام خاچییەکان ئەو ڕێکەوتنەیان پێشێل کرد، هەروەها (نورەدین مەحمود) لەگەڵ (ئەسەدەدین شێرکۆ) و هەندێ لە تورکەکان ڕێککەوتن لەسەر هێرشبردنە سەر (بانیاس) و گەمارۆیان داو بە مەنجەنیق،[4] لێیاندا تا لە ساڵی (٥٥٢ک/ ١١٥٧ز) داگیریان کرد،[5] لە ساڵی (٥٥٧ک/١١٦١ز) (نورەدین مەحمود) بە سوپاکەیەوە لە

---

(١) - أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص ٣٢٨؛ أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج١١/ ص١٣١.

(٢) - بروانە الشرق الاوسط والحروب الصليبية، ج١/ص٥٥٩- ٦٠٠.

(٣) - د. خاشع المعاضيدي: الحياة السياسية في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، ص٢٠٠، ارنست باركر: م. ن، ١٥٨.

(٤) - مەنجەنیق: ئامێرێکی ئاگر پەرژێنە، ئەیوبیەکان لە شەڕی شارەکان بەکاریان هێناوە، یان کە پێی دەوترا شەڕی شورا و گەمارۆ، وە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا وەکو تۆپی قورس دەناسرێتەوە...بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە (الطرسوسي: تبصره ارباب الالباب في كيفية النجاة في الحروب من الاسواء، تحقيق و نشر كلود كاهن، ل١٦- ١٨)

(٥) - أبن القلانسي: م. ن، ص٣٣٩- ٣٤٠.

حەلەبەوە کەوتەڕێ بۆ گەمارۆدانی قەڵای (حارم)، بەڵام دانیشتوانی قەڵاکە لەگەڵی ڕێکەوتن، بۆ ساڵی دواتر گەمارۆی (حصن الاکراد)دا و ناچاری کردن دژ بە خاچییەکان بدەنە پاڵی و هاوکاری بکەن، لەگەڵ ئەوەی (نورەدین مەحمود) دەیویست میسر لە فاتمیکان وەربگرێتەوە، بەڵام لە جیهادی دژ بە خاچییەکاندا شامی فەرامۆش نەکرد،[1] بەڵکو بەردەوام هاندەری بەرەی یەکگرتووی ئیسلامی بوو، بەرەی ئیسلامی سەرکەوتنیان بە دەستهێنا و لە دژی خاچییەکان و بەرپرسی (ئەنتاکیا و تەرابلس) یان گرت،[2] (نورەدین مەحمود) بە هاوکاری هێزەکانی بەرەی یەکگرتووی ئیسلامی هێرشی کردە سەر میرنشینی ئەنتاکیا، دوای لە ناوبردنی سوپای خاچییەکان توانی میر (ریموندی بواتیە) بکوژێت، موسڵمانان بە کوشتنی (ریموند) زۆر خۆشحاڵ بوون،[3] لە دوای داگیرکردنی ئەنتاکیا (جوسلینی دووەم) میری ڕەها هەوڵیدا بە هێرش بردنە سەر مەرعش بەشێک لە ئەنتاکیا وەربگرێت، بەڵام هێزەکانی (سوڵتان مەسعودی) سەلجووقی و (قرا ئەرسلان ارتقی) توانییان بە دیلی بیگرن و ڕەوانەی لای (نورەدینی) بکەن ئەویش لە حەلەب زیندانی کرد، ئەمەش گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ موسڵمانان،[4] بێگومان ئەم کارانە خاچییەکانی بێزار کرد و ترسی خستە دڵ و دەروونیان بە تایبەت دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی میرنیشن و خاچییەکانی (ئەنتاکیا و ڕەها) و کوشتنی میری ئەنتاکیا و بەدیلگرتنی میری ڕەها. [5]

(نورەدین مەحمود) سوپای سەربازی بۆ وڵاتی میسر نارد و هاوپەیمانیەتی بەرەی یەکگرتووی ئیسلامی دروستکرد، ئامانجی پەرتەوازە کردنی سوپای خاچییەکان و شەڕکردن بوو لە چەند بەرەیەکەوە جگە لە خەرج کردنێکی زۆر و دابەزینی ورەی سوپاکەیان، سەرەڕای مەترسی (نورەدین مەحمود) لە جێ بەجێکردنی ئەم پلانە و تێکشکانی بەرامبەر خاچییەکان کە هێشتا مەترسییان لەسەر

---

(١) - أبن الأثير: الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل، تحقيق د. عبداللطيف احمد طليمات، مطبعة الاستقلال الكبرى، القاهرة، ١٩٦٣، ص١١٦- ١١٧.

(٢) - د. خاشع المعاضيدى: الحياة السياسية، ص٢٠٤.

(٣) - أبن واصل: مفرج الكروب في أخبار بني ايوب، تحقيق د. جمال الدين شيال، القاهرة، ١٩٦٤،ج ١/ص ١٢١.

(٤) - د. خاشع المعاضيدي واخرون: م.ن، ص١٠٠.

(٥) - د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ص٦٢٦.

ولاتی شام مابوو، بەلام لە ساڵی (٥٦٠ك/ ١١٦٤ز) یەکەم هەڵمەتی نارد بۆ ولاتی میسر بە سەرکردایەتی (ئەسەدەدین شێرکۆ) کە یەکێک بوو لە فەرماندە جێ باوەڕەکانی، هاوکات (شێرکۆ) (سەلاحەددینی کوڕی نجمەدین ئەیوب)ی برازای لەگەڵ خۆی برد، لە لایەکی دیکەوە (نورەدین) ئەو هەلەی قۆستەوە کە خاچییەکان لە گۆڕەپانی میسر نزیک بوون و شامیان چۆڵ کرد بوو، بۆیە لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا هێرشی بردە سەریان.[1] دوای شەڕێکی سەخت لەگەڵ خاچییەکان سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا و بەهەزاران لە خاچییەکان کەوتنە بەر کوشتن و گرتن، هەموو ئەو میرانەی بەشداریان لەو شەڕەدا کردبوو گیران، لە پێشەنگی هەموویان (بوهیمند) میری ئەنتاکیا و (ریموندی سێیەم) میری تەرابلس و (جوسلینی سێیەم) و (هو هەشتەمی لوزجنان) و فەرمانڕەوای قلیقلیەی بیزەنتی، لە دوای ئەم سەرکەوتنە (نورەدین مەحمود) دەستی گرت بەسەر قەڵای (حارمدا)، بەوە ڕێگای بۆ چۆڵ بوو بۆ هێرشبردنە سەر ئەنتاکیا، بەلام ڕووی کردە (بانیاس)ی سەر بە شانشینی بەیت ولمەقدیس تا بیکاتە بنکەیەکی سەربازی بۆ خۆی،[2] لە هەمان کاتدا خاچییەکانی میسر بە فەرماندەیی (افلریک یەکەم) پاشای بەیت ولمەقدیس گەڕانەوە، و بارودۆخیان زۆر ئاڵۆز و ناهەموار بوو، بە تایبەت دوای داگیرکردنی قەڵای (حارم) لە میرنشینی ئەنتاکیا و (بانیاس) لە شانشینی بەیت ولمەقدیس لەلایەن (نورەدین مەحمود)ەوە کە دوو پێگەی سەربازی و ستراتیژی بوون بۆ ئەوان، سەرەڕای بەدیلگرتنی هاورێکانی، خاچییەکان بەرامبەر ئەم ڕووداوانە هیچیان پێ نەدەکرا، (نورەدین مەحمود) و (ئەسەدەدین شێرکۆ) لە ماوەی دوو ساڵی (٥٦١- ٥٦٢ك/١١٦٥-١١٦٦ز)دا بەردەوام خەریکی هێرش و پەلاماری لە ناکاو بوون بۆ سەر قەلا و پێگەکانی خاچییەکان و توانییان هێزی خاچییەکان بەتەواوی لاواز بکەن،[3] لە ساڵی (٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) (نورەدین مەحمود) لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کرد و وەسیەتی کرد کە کوڕەکەی (ملک الصالح اسماعیل) لە شوێنی بێت، بەلام بە پێچەوانەی ئەو وەسیەتە کەسێکی رامیاری و سەربازی ناودار و لێهاتوو لە شوێنیدا سەرکردایەتی گێتی ئیسلامی گرتە دەست

---

(١) - أبن ألأثير: الباهر، ص١٢٣.

(٢) - أبن الأثير: الباهر، ص١٣١، د. خاشع المعاضيدي: الحياة السياسية، ص٢٠٤.

(٣) - رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية،ج ٢/ ص٦٠٠- ٦٤٤.

ئەویش (سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەیوب)بوو، لە ڕاستیدا (نورەدین مەحمود) لە ڕووی رامیاری و سەربازیە وە پیاوێکی بەتوانا و جەنگاوەرێکی بە هێز و قارەمان بوو، مافی جەنگاوەرانی پێشێل نەدەکرد،[1] هاوکات پیاوێکی دادپەروەر و ڕاستگۆ بوو، لە پێناو ئایینی ئیسلام و یەکێتی ڕیزەکانی نێوان موسڵمانان هەوڵیدەدا.[2]

## ڕۆڵی سەلاحەدینی ئەیوبی لە پێکهاتەی بەرەی ئیسلامی

گۆڕانکاریەکانی گێتی ئیسلامی بە خێرایێکی زۆر و ئیجابی بۆ موسڵمانان بە گشتی و ئەهلی سوننە بە تایبەتی ڕوویاندەدا، چونکە کاروچالاکی (نورەدین مەحمود) تەنها لە وڵاتی شامدا کۆنەبوویەوە، بەڵکو هەنگاوی بۆ دەرەوەی شامیش هاویشت کە وەک ئاماژەمان پێکرد گرنگترینیان وڵاتی میسر بوو، هاوکات لە ئەنجامی پەناهێنانی وەزیری فاتمی (شاوەری سەعدی) هەلێکی چاکی بۆ ڕەخسا کە داوای لە (نورەدین مەحمود) کرد بیگەڕێنێتەوە پلەکەی خۆی(کە وەزیر بوو لە خیلافەتی فاتیمیدا)، بەرامبەر هەر مەرجێک کە (نورەدین مەحمود) دایبنێت وەک خاکی میسر و ملکەچ بوونی بۆ فەرمانی (نورەدین مەحمود)، ئەوە بوو نورەدین (ئەسەدەدین شێرکۆ)ی بۆ ئەم مەبەستە ڕەوانەی وڵاتی میسری کرد، ناوبرا و توانی کارەکەی جێ بەجێ بکات، بەڵام (شاوەر) لە جیاتی بەجێهێنانی پەیمانەکانی، خاچییەکانی هێنایە سەر (ئەسەدەدین شێرکۆ)، شێرکۆ توانی دوای شەڕێکی گەورە خاچییەکان دووربخاتەوە و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی،[3] لە ئەنجامی سیاسەتی نابەجێ و چەوتی (شاوەر) و (خاچییەکان) بەرامبەر بە دانیشتوانی میسر لەسەر فەرمانی (نورەدین مەحمود) (ئەسەدەدین شێرکۆ) دووبارە هێرشی بردەسەر میسر، لە ئەنجامدا لە ساڵی (٥٦٤ک/ ١١٦٨ز) توانی تەواوی میسر بگرێ، سەلاحەددینی ئەیووبی برازاشی بەشداری بەرچاوی هەبوو و هەر ئەویش (شاوەری سەعدی) کوشت، ئەسەدەدین بوو بە وەزیر بەڵام دوای ماوەیەکی کورت (ئەسەدەدین) کۆچی دوایی کرد و لە شوێنی ئەودا (سەلاحەددینی ئەیووبی) برازای بوو بە

---

(١) - رنسیمان: م.ن،ج ٢/ص٦٤٣- ٦٤٤.

(٢) - كلود كاهن: تأريخ العرب والشعوب الاسلامية، المجلد الاول، ترجمة- بدرالدين قاسم، ط١، دار الطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٣، ص٣٦٢.

(٣) - گۆڤاری هەزارمێرد: ژمارە (٥) ساڵی ١٩، سلێمانی، ص١٩٨.

وەزیر، سەلاحەددین توانی کۆتایی بە دەسەڵاتی فاتمیەکان بهێنێت و خیلافەتی عەبباسی لە میسر ڕابگەیەنێت، بەمشێوەیە گێتی ئیسلامی دووبارە یەکیگرتەوە و بەرەیەکی یەکگرتوو لە دژی خاچپیەکان دروست بوو،[١] دوای مردنی (نورەدین مەحمود) هەڵوێستی ڕامیاری سەلاحەددین بەرامبەر خاچپیەکان بریتی بوو لە نەرمی و ڕێککەوتن، چونکە سەلاحەددین هەوڵی ئەوەی دەدا بە تەواوی بەسەر خاچپیەکاندا سەربکەوێت تا بتوانێت دەوڵەتێکی بەهێز و یەکگرتوو دابمەزرێنێت، لەبەر ئەمەش بوو ڕێککەوتنی ئاشتی لەگەڵ خاچپیەکاندا واژۆکرد، لەگەڵ ئەمەشدا گەلێک پێکدادان لە نێوان (سەلاحەددین) و خاچپیەکاندا ڕوویدا،[٢] سەلاحەددین بەردەوام هێرشی دەبردەسەر شوێنە گرنگ و پتەوەکانی خاچپیەکان، هەندێک جار بە شێوەی کاتی و بۆ ماوەی کورت و بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن و پتەوکردنی ڕیزەکانیان، پەیمانی ڕێککەوتنی لەگەڵ خاچپیەکاندا دەبەست، تا بە تەواوی وڵاتی شام لە دەستی خاچپیەکان ڕزگار بکات، لە بەیت ولمەقدیس ئاژاوەیەک دروست بوو، ئەم ئاژاوەیە (میری کرک) دەیویست سوودی لێوەرگرێت، بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵی ئەوەی دەدا پەیمانی ڕێککەوتنی نێوان بەیت ولمەقدیس و سەلاحەددینی ئەیووبی بشکێنێ، ئەویش بە هێرش بردنە سەر کاروانێکی مەککە و تاڵانکردنی، هەروەها هەوڵی دەدا لە ڕێی دەریای سورەوە پەلاماری شاری مەدینە بدات، بەڵام هەندێک لەشکری دیمەشق بەریان لێگرت و شکاندنیان و ئەویش ناچار گەڕایەوە بۆ کرک.[٣]

دوا بەدوای ئەوەی خاچپیەکان پەیمانی ڕێککەوتنیان شکاند، (سەلاحەددین) دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن و بزووتنەوی خۆبەختکردن (حركة الجهاد)ی لە دژی خاچپیەکان ڕاگەیاند، هاوکات زەمینە ڕەخسا بۆ یەکێتی نێوان میسر و وڵاتی شام، ئەمەش بۆ خۆی مەترسیەکی گەورەی هەبوو لەسەر خاچپیەکان، چونکە سەلاحەددینی ئەیووبی و نورەدین مەحمود دەیانتوانی دەسەڵاتیان هەبێت بەسەر دەریای ناوەڕاستدا بە تایبەت دەست بەسەراگرتنی بەندەری ئەسکەندەریە و دمیاط،

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص١٥٠.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص١٦٥.

(٣) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م، ن، ص١٦٥.

و بەنـدەرەکانی کەنـاری وڵاتـی شـام،[1] ئەمەش هەسـتێکی ترسـناکی لای هێـزی خاچییەکـان دروسـت کـرد بەرامبەر بە ناوچەکـانی شـام، ناچـار (عمـوری یەکەم) پاشای قودس داوای یارمەتی و هاوکاری و فریاکەوتنی لە ئەوروپای خۆرئاوا کرد، بۆ ڕزگارکردنیان لەو بارودۆخە پشێوو نائارمەی تێی کەوتبون، هاوکات عموری یەکەم پەیمانەکەی لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتی (مانویل کوفین) تازە کردەوە، بەڵام ئەو چالاکی و جوڵانەوانەی خاچییەکان هیچ کاریگەرییەکی نەبوو لەسەر ورەی موسـڵمانان بەسـەرکردایەتی نـورەدین و سـەلاحەددین، کە بەردەوام هێرشـیان دەبردەسەر خاچییەکان. چەند ڕۆژێکی پێ نەچوو سەلاحەددین هێرشی بردەسەر (پێگەی شوبک)[2]ی خاچییەکان لە باشووری (بحر المیت) و گەمارۆی توندی لەسەر دانـان، هاوکـات نـورەدین هێرشـی بردەسـەر (حصـن کـرک)[3] بەم جۆرە هەردوولا ڕێکەوتن لە هێرشبردنە سەر هێزی خاچییەکان لە میسر و شام بە بەردەوامی،[4] شـایەنی باسـە (نـورەدین مەحمـود) و (سـەلاحەددین) لە شـەڕی خاچییەکانـدا ڕاستەوخۆ بە یەک نەگەیشتن، هەندێ لە مێژوونووسان بۆچوونیان وایە کە گوایە سەلاحەددین ترسی هەبووە نورەدین وڵاتی میسری لێ وەربگرێتەوە، ئەوەی ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت ئەوەیە سەلاحەددین دووجار لە شەڕی خاچییەکان لە نێوان وڵاتی شام و میسر بە تایبەتی لە پێگەی (الکرک والشوبک) کشایەوە، یەکەمیان لە سـاڵی (٥٦٧ک/ ١١٧١ز) کاتێـک هەواڵـی پـێ گەیشـت پاشـماوە و دارودەسـتەی فاتمیەکـان دورکەوتـنەوەی سـەلاحەددینیان بە دەرفەت زانیـوە تـا میسـر بگـرنەوە دەست، بۆیە سەلاحەددین گەڕایەوە بۆ وڵاتی میسر،[5] دووەمیان لە ساڵی (٥٦٨ک/

---

(١) - م. ن، ص١٥٠.

(٢) - شوبک: قەڵایەکی پۆڵاینە لە دەوروبەری شام لەنێوان (عمان و ایلة) نزیک الکرک. (یاقوت الحموي: س.پ، ج٣/ ل١٦١).

(٣) - الکرک: قەڵایەکی پۆڵاینە لە دیوی شام لە دەوروبەری (بلقاء) لە ناو چیاکانی (یاقوت الحموي: معجم البلدان، ج٤/ ل١٣١) ئێستا سەر بە ئوردنە.خاوەن شوێنێکی ستراتیژی گرنگ بوو، گرنگی ئەو شارە لەوەدا بوو کۆنترۆڵی ڕێگاکانی نێوان مصرو شام و حیجازی دەکرد، تاکە ڕێگا بوو کە ڕێبوار پیا دەڕۆیشت بۆ سوریاو حیجاز. (غوانمة: امارة الکرک الایوبیة، ل١٠٥).

(٤) - أبـن الأثیـر: الکامـل فـي التـأریخ، ج١١/ ص٣٧٣؛ أبـن شـداد، النـوادر السـلطانیة، ص٣٦، أبـو شـامة: الروضتین،ج١/ ص٣٠٦.

(٥) - البنداري: سنا البرق الشامي، تحقیق د. رمضان شنن، بیروت، ١٩٧١،ج ١/ ص١١٨.

١١٧٢ز) کاتێک هەواڵی نەخۆشی باوکی پێ گەیشت گەڕایەوە بۆ میسر بەڵام تا گەیشتەوە باوکی کۆچی دوای کرد بوو،[1] بارەکە دوای ڕووخانی فاتمیەکان ئەوەی لە سەلاحەددین دەخواست هەوڵ بدات خاچییەکان لە شام دەربکات، بەڵام نورەدین وەک سەلاحەددین بە چاکی بارودۆخی میسری نەدەزانی، چونکە (سەلاحەددین) سەرەتای دەسەڵاتی بوو لە میسر و مەترسی شۆڕشی هەبوو لە ناو میسر، هاوکات سەلاحەددین بیری لەوە دەکردەوە کە کاری یەکەمی پاراستنی وڵاتی میسربێ بۆ جێگیربوونی دەسەڵاتەکەی و دروستکردنی سوپایەکی بە هێز کە توانای پاراستنی میسری هەبێت، و شەڕی خاچییەکان بکات لە وڵاتی شام، لە دوای مردنی (نورەدین) لە ڕۆژی چوارشەممە (١١)ی شوال، سەلاحەددین بووبە سوڵتان لەسەر میسر و شام و بەرزاییەکانی عێراق و موسڵ، نورەدین لەدوای (١٢) ساڵ خەبات و تێکۆشان بۆ بەدیهێنانی ئامانجی یەکبوونی بەرەی گێتی ئیسلامی لە دژی خاچییەکان، توانی بگاتە ئامانجی خۆی و سەرکەوتنێکی مێژوویی بەدەست بهێنێت کە ئەویش ڕزگارکردنی قودس و کەنارەکانی وڵاتی شام بوو.[2]

---

(١) - أبن الأثير: الكامل فى التأريخ، ج١١/ ص٣٩٣.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص١٥١- ١٥٢.

# بەشی هەژدەیەم

- بەرپا بوون شەڕی خاچییەکان
- هۆکارەکانی شەڕی خاچییەکان
- هۆکاری رامیاری و کۆمەڵایەتی
- هۆکاری ئابووری
- هەڵمەتی یەکەمی خاچییەکان
- هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان
- هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکان
- هەڵوێستی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بەرامبەر سوپای ئەڵمان
- هەڵوێست و کاردانەوەی موسڵمانان
- هەڵوێستی سەربازگەی خاچییەکان
- سوپای فەرەنسی و ئینگلیزی
- هەڵوێستی موسڵمانان
- سوپای ئینگلیزی
- شەڕی عەککا
- هەڵمەتی چوارەمی خاچییەکان

## بەرپابوونی شەڕی خاچییەکان

(پاپا ئوریانی دووەم) لە ڕۆژی (٢٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٤٨٩ک/ ١٠٩٥ز) لە شاری (ئەلمبردوتت) لە باشووری فەڕەنسا وتارێکی پێشکەش کرد بە مەسیحیەکان، لەو وتارەیدا داوای لە مەسیحیەکان کرد شوێنەوارە پیرۆزەکان لە فەلەستین ڕزگار بکەن و لە ژێر دەستی موسڵماناندا دەری بهێنن، ئەم وتارەی (پاپا ئوریانی دووەم) کاریگەری زۆر بوو، بە تایبەت لە نێوان فەرەنج و نۆرماندییەکاندا، بۆ ئەم مەبەستە، هەزاران لە مەسیحیە توندڕەوەکان لەشکرێکیان دروستکرد و ڕوویان کردە کەستەنتینیە بۆ هێرش بردنە سەر وڵاتی شام، خاچییەکان ناکۆکی و دوو بەرەکی و دابەشبوونی ناوچەی موسڵمانەکانیان بە هەلزانی و هێرشیان هێنایە سەر کەنارەکانی ئاسیا و هەندێک لە شارەکانی باکووری شام، تا گەیشتنە بەیت ولمەقدیس و داگیریانکرد و دەستیان کرد بە کوشتن و بڕین و تاڵانی و وێرانکردنی، بەم جۆرە خاچییەکان میرنشینی خاچیان دامەزراند لە نێوان (عەقەبە و بیروت)دا، بە دامەزراندنی میرنشینی خاچییەکان موسڵمانەکان هەستیان بە مەترسی ئەم بارودۆخە نوێیە کرد، بۆیە دەستیان کرد بە دژایەتی و بەرهەڵستکاری خاچییەکان.[1]

### هۆکارەکانی شەڕی خاچییەکان

لە ئەنجامی ململانێ نێوان هێزە دەسەڵاتدارەکان بارودۆخی رامیاری (خۆرهەڵاتی ئیسلامی) بە تایبەت وڵاتی شام نا ئارام و نا هەموار بوو،[2] بەڵام تەنها بارودۆخی (خۆرهەڵاتی ئیسلامی) فاکتەر نەبوو لە زەمینە ڕەخساندن بۆ هەڵمەتی خاچییەکان، بەڵکو ئەو بارودۆخە (رامیاری ، کۆمەلایەتی ، ئابووری و ئایینیەی) کە ئەوروپای تێدا دەژیا هۆکار بوو بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم هەڵمەتانە بەرەو ناوچەکە،[3] بۆ نموونە فەڕەنسا ڕۆڵی کاریگەر و ڕاستەوخۆی هەبوو لە قۆناغی یەکەمی هەڵمەتی خاچییەکان، بەڵام هێزەکانی تری ئەوروپا وەک (ئینگلترا ، ئیسپانیا

---

(١) - د. سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا في العصور الوسطى، مكتبة النهضة المصرية، ١٩٥٨، القاهرة، ج١/ص٤٠٥؛د. قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، عالم المعرفة (١٤٩)، ١٩٩٠، الكويت، ص١٠٩.

(٢) - حسن حبشي: نورالدين والصليبيون، القاهرة، ١٩٤٨، دار الفكر العربي، ص١٨.

(٣) - د. سعيد عاشور: ن.م، ج١/ ص ١٧.

، ئەڵمانیا) خەریکی کاروباری ناوخۆی خۆیان بوون و دوور بوون لە بەشداری کردن و ڕێکخستنی بزووتنەوەی خاچییەکان، چونکە ئینگلترا تازە نورمانی ڕزگار کردبوو لە چارەکەی یەکەمی سەدەی (١١)ی زایین، ڕووبەڕووی هەندێ کێشە ببووەوەو پێویستیان بە چارەسەر هەبوو، ئەڵمانیاش بە هۆی شەڕی ناوخۆوە تووشی قەیرانێکی خراپ هاتبوو لەبەر ئەم هۆکارە بیری لە بەشداری ئەم بزووتنەوەیە نەدەکردەوە،[١] ئیسپانیاش بە هۆی شەڕەکانی دژی عەرەب لە ئەندەلوس دوورکەوتەوە لە بەشدارکردن لە هەڵمەتەکانی بزووتنەوەی خاچییەکان، بۆیە لەسەرەتادا ئەرکی خۆ ئامادەکردن بۆ گەورەترین شەڕی خاچییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کەوتە ئەستۆی فەرەنسیەکان.[٢]

هاوکات دید و بۆچوونی مێژوونوسان سەبارەت بە هۆکارەکانی هەڵمەتی خاچییەکان جیاوازە بە تایبەت سەرەتاکانی هەڵمەتەکە، هەندێکیان لایان وایە ئەم هەڵمەتانە بازنەیەکە لە بازنەکانی ململانێی کلاسیکی کۆنی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا، کە هەر لە سەردەمی فارس و یۆنانیەکانەوە سەری هەڵداوە، فاکتەری ئەم ململانێیانە ئەوەندەی شارستانی بووە ئەوەندە ئایینی نەبووە، و بە هۆی ململانێ نێوان دوو شارستانیەتی جیاوازی (خۆرهەڵات و خۆرئاوا) بووە.[٣]

هەروەها هەندێکیان لایان وابوو کە هێرشی خاچییەکان بۆ سەر ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، کۆتایی زنجیرەیەک کۆچی گەورەی ئەوروپیەکان بووە کە لە ئەنجامی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی دروست ببوو،[٤]بەڵام هەندێکی تر لایان وایە بزووتنەوەی خاچییەکان دەرچوونێکی گەورەیە، و لە ئەنجامی پرۆسەی بوژاندنەوەی ئایینی لە سەدەی (١١)ی زایینی لە خۆرئاوای ئەوروپا دەستی پێکرد، بە پەرەپێدانی پرۆسەی حەج کردن بۆ بەیت ولمەقدیس لەگەڵ گۆڕین و پێشخستنی شێوازی حەج کردن کە ببووە پرۆسەیەکی جەنگی.[٥]

بۆچوونێکی تر ڕزگاربوونی خاچییەکان لە بارودۆخ و نەهامەتیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کە تێدا دەژیان بە هۆکاری هێرشی خاچییەکان دادەنێن.[٦]

---

(١) - ارنست باركر: ن.م، ص٢٣- ٢٤.

(٢) - فشر: تأريخ اوروبا في العصور الوسطى، ت- محمد مصطفى زيادة، القاهرة، ١٩٦٩،ج ١/ص ١٨١.

(٣) - اسامة بن منقذ: كتاب الاعتبار، حرره فيليب حتى، برنستون، ١٩٣٠، ص٢٠.

(٤) - د. سعيد عاشور: ن.م،ج ١/ص ٢١- ٢٤.

(٥) - هەمان سەرچاوە: ج١/ ص٢٥.

(٦) - ارنست باركر: ن.م، ص٢٣.

بۆیه دەتوانین بڵێین هێرش و هەڵمەتی خاچییەکان لە ئەنجامی سروشتی بارودۆخی ئایدۆلۆجی و ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئایینی ئەوروپا سەری هەڵدا، بەرامبەر بە تێکچوونی بارودۆخی خۆرهەڵات بە تایبەت سەرهەڵدانی کێشە و ململانێ لە نێوان هێزەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی، لێرەدا گرنگترین فاکتەرەکانی هەڵمەتەکانی خاچییەکان بۆ سەر خۆرهەڵاتی ئیسلامی ڕوون دەکەینەوە.

### هۆکاری ئایینی

زۆر لە مێژوونووسان گرنگی زۆر دەدەن بە فاکتەری ئایینی لە هەڵمەتی خاچییەکان بۆ سەر ناوچەکانی خۆرهەڵات، بە ئامانجی ڕزگارکردنی گۆڕی مەسیح و خاکی پیرۆز لە دەستی موسڵمانان،[1] بێگومان فاکتەری ئایینی لە ڕواڵەتدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بۆ هێرشی خاچییەکان، چونکە مەسیحیە توندڕەوەکانی ئەوروپا فاکتەری ئاینییان کردە بەڵگەیەک بۆ هێرش هێنانە سەر وڵاتی شام، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ جار لە کاتی هێرشەکانیان هۆکاری ئایینی لاواز بوو بەڕادەیەک لە نێو ئاراستە (ڕامیاری ، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی) کۆمەڵگای نوێ وون دەبوو،[2] مەسیحیە توندڕەوەکانی ئەوروپا بیرۆکەیەکی وایان بڵاوکردەوە کە مەسیحیەکانی وڵاتی ئیسلامی بە دەستی فەرمانڕەوا موسڵمانەکان تووشی ئازار و ئەشکەنجە هاتوون، هاوکات پاپا ڕۆڵی هەبوو بۆ وروژاندنی هەست و سۆزی خەڵکی لە ناو کۆمەڵگای ئەوروپیدا، کە دەسەڵاتە بێ هێز و لاوازە رامیاریەکانی ئەوروپا زەمینەی بۆ ڕەخساند بۆ دەست تێوەردانی کاروباری رامیاری ناوخۆ و دەرەوەی وڵاتانی ئەوروپا،[3] هەروەها کاریگەری ڕاستەوخۆی پاپا هەبوو بەسەر چینە هەژار و نەدارەکانی ئەوروپا، چونکە پاپا و کڵێسا تاکە سەرچاوە بوون بۆ ئەوان کە حەزە (دەروونی)یەکانی هاوڵاتیانی بەدی دەکرد کە لە دەوڵەتە دەرەبەگایەتیەکان هیچ مافێکیان نەبوو. [4]

---

(١) - د.علية الجنزوري:امارة الرها الصليبية، ص١٥٧.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: ن.م، ص٢١.

(٣) - ارنست باركر: ن.م، ص١١٣.

(٤) - كرستوفر مونت: تكوين اوروبا، ت- محمد مصطفى زيادة، القاهرة، ١٩٦٧، ص٢٤٠.

ئەم کاریگەریە تەنها لەسەر چینی هەژارەکان نەبوو بەڵکو گەیشتە چینەکانی (سوارەکان، پیاوە خانەدانەکان)، دەرەبەگەکان" چونکە تاکە شوێن بوو بۆ لێبوردن لە گوناهەکانیان (تكفير عن الذنوب)، هاوکات کڵێسا زۆر سوودی لە دواکەوتنی شارستانیەتی ئەوروپای ئەو کاتە بینی بە هۆی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕ و دابو نەریتی ئایینی فرە خودایی،[1] لە میانەی ئەم هۆکارانە دەزگای کڵێسا ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لە بانگەواز کردنی هەڵمەتی خاچییەکان بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەت و ئامانجەکانی، هەندێ ئەم هۆکارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی سیستەمێکی دیاریکراو نەبوو بۆ هەڵبژاردنی پاپا، هەرچەندە دەبوو لە لایەن پیاوە ئاینیەکان و خانەدانەکان دیاری بکرێت، بەڵام زۆر جار ئیمپراتۆر ڕۆڵ و کاریگەری هەبوو لە هەڵبژاردنی پاپا وەک ئەوەی ئیمپراتۆر (ئوتووی سێیەم) سێ پاپای دامەزراند، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەزگای ئایینی مەسیحی تووشی لاوازی و لە ناوچوونی هیبەتی ئایینی هاتبوو لە ناو کۆمەڵگای ئەوروپیدا،[2] جگە لە تێکچوونی پەیوەندی نێوان کڵێسای خۆرئاوا و کڵێسای خۆرهەڵات بە شێوەیەکی کۆتایی لەساڵی (٤٤٦ ک/١٠٥٤ز). [3]

بەڵام سەرهەڵدانی سەلجوقی و پەرەسەندنی مەترسیان لەسەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی و تێکچوونی بارودۆخی ناوخۆی ئیمپرتۆریەت لە ساڵی (٤٦٦ ک/ ١٠٧٣ز) پاڵی نا بە ئیمپراتۆر (میخائیل ی حەوتەم) بە ناردنی نامە بۆ پاپا (گریگوری حەوتەم) بۆ یەک خستنی هەردوو کڵێسا و پێدانی هاوکاری لە ڕووی سەربازیەوە دژی مەترسی سەلجوقیەکان، بەڵام ئەم هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو،[4] هەروەها پرسی حەج کاریگەری خۆی هەبوو لە جوڵاندنی هەست و سۆزی ئەوروپیەکان بە بیانوی خراپی ڕەفتاری موسڵمانان بەرامبەر ئەوحاجیە مەسیحیانەی سەردانی بەیت ولمەقدیسیان دەکرد. [5] هەرچەندە هەندێ لە مێژوونووسانی ئەوروپی ئەوە دەسەلمێنن کە ژیانی مەسیحیەکانی وڵاتی ئیسلام زۆر چاکتر بوو لە ژیانی

---

(١) - فشر: ن.م، ج١/ ص١٢٨- ١٢٩.

(٢) - ویل دیورانت: قصة الحضارة، ت- محمد بدران، مصر، ١٩٦٥، م٤/ج٣/ ص٣٨٢.

(٣) - فشر: ن.م، ج١/ص ١٧٧- ١٧٩.

(٤) - ارنست باركر: ن.م، ص١٩؛ ویل دیورانت: ن.م، م٤/ ج٣/ص ٣٩٦.

(٥) - ارنست باركر: ن.م، ص٨١.

مەسیحیەکانی ئیمپرتۆریەتی بیزەنتی، لەگەڵ ئەمەشدا ڕەنگە لە ئەنجامی هۆکاری ئایینی تووشی هەندێ گیروگرفت هاتبن، بانگەوازی پاپا (ئوریانی دووەم) لە ساڵی (٤٨٩ ک/ ١٠٩٥ز) کاریگەری لەسەر بیروباوەڕی مەسیحیە ئەوروپیەکان هەبوو بۆ دەرچوونیان بەرەو خۆرهەڵات بە ئامانجی ڕزگار کردنی بەیت ولمەقدیس لە دەستی موسڵمانەکان، زۆر لە دانیشتوانی ئەوروپا لەبەر سادە و ساکاری یا بەهۆی حەز و ئارەزووی هەندێک بۆ ڕزگار بوون لە سزاکانیان لە ئەوروپا و بەدەستهێنانی دەسکەوتی رامیاری و مادی و قوتار بوون لە سیستەمی دەرەبەگایەتی چوون بەدەم ئەم بانگەوازەوە، بەڵام هەندێ لە گێڕانەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەوروپاییەکان لە ژێر ئاڵای (خاچ- صلیب) بە دروشمی (ئەمە ویستی خوایە) لە دژی موسڵمانان کۆبوونەوە.[١]

**هۆکاری رامیاری و کۆمەڵایەتی**

لە ڕاستیدا ئەم دوو هۆکارە بەهۆی سیستەمی دەرەبەگایەتی کە لە سەدەی (١٠- ١٢)ی زایینی لە ئەوروپا بڵاو ببووە و زۆر تێکەڵن و بە ئاسانی جیاناکرێتەوە، لە سەدەی "١٠"ی زایینی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئەوروپا نەما، پاشاکانی دانیمارک لە ساڵی (١٠٠٠) زایینی لە کەنارەکانی دەریای باکوور و دەریای بەڵتیق دوا دەسەڵاتیان دامەزراند، لە ساڵی (٤٦٨ ک/ ١٠٧٥ز) ئەو دەسەڵاتە بەرەو لە ناوچوون هەنگاوی دەنا، پێش ئەوان بە چەند سەدەیەک ئەو دەسەڵاتە لە فەڕەنسا و ئیتاڵیا لە ناوچوو بوون،[٢] سیستەمی دەرەبەگایەتی دەسەڵاتی ناوەندی لە ئەوروپا داماڵی بوو،[٣] چونکە سیستەمی دەرەبەگایەتی بە گەشترین قۆناغەکانی پەرەسەندنی هەنگاوی دەنا لەو کاتەی (شارلەمان) زەوی دەدا بەو پیاوانەی خزمەتی سوپای شارلمانیان دەکرد، هاوکات شەڕی ناوخۆ و هێزەکانی (فایکینگ) لە فەڕەنسا وایان کرد لە هەندێ خاوەن زەوی کە توانای بەرگریان نەبوو داوای یارمەتی و هاوکاری لە دەرەبەگەکان بکەن کە هێزی سەربازیان هەبوو بەرامبەر بەوەی لە خزمەتی

(١) - رنسیمان: ن.م، ج١/ ص١٥٤- ١٥٧؛ د. درید عبدالقادر نوری: سیاسة صلاح الدین الأیوبي، ص٥٢.

(٢) - فشر: ن.م، ص٨٤- ٨٥.

(٣) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: ن.م، ص٢٢.

ئەواندا بن، بەمەبەستی پارێزگاری کردنی (زەویەکانیان- ئەقطاعیات)ماوەی خزمەتی سەربازی (٤٠) ڕۆژ بوو جگە لەوەی دەرەبەگەکان زەویان دەدا بەو خێزانانەی لە زەوی و کێڵگەکاندا کاریان دەکرد، هەروەها لە پێناو زیادکردنی بەرهەمدا دەستیان کرد بە وشک کردنی زۆنگاوەکان و کێڵانی باخەکان و ئامادەکردنی بۆ کشتوکاڵ.[١]

بێگومان جوتیاران بە هۆی قۆرخ کردنی دەرەبەگەکان لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان بێ بەش بوون لە هەموو مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ، بۆیە جوتیار و کۆیلەکان بە دوای دەروازەیەکدا دەگەڕان بۆ ڕزگاربوون لە سیستەمی دەرەبەگایەتی، چونکە لە ژێر سایەی ئەو سیستەمەدا کە بچووکترین مافی ژیانی مرۆڤی تیادا نەبوو، لە ژیانێکی زۆر ناهەمواردا دەژیان و پابەند بوون بە گەورەکانیانەوە، لە هەمان کاتدا بێ بەش بوون لە بەرهەمی کێڵگەکانیان،[٢] بۆیە سەرهەڵدانی بانگەوازی هێرشی خاچییەکان چاکترین هەل بوو بۆ ڕزگاربوونیان لە دەستی دەرەبەگەکان، سەرەڕای مەترسیەکانی ئەم هێرشە، بەڵام بەلای ئەوان زۆر لە ژیانی جوتیاری و کۆیلەیەتی باشتر بوو، لە ڕاستیدا پاشماوەی نەرێنی سیستەمی دەربەگایەتی تەنها لە سەر چینی جوتیار و کۆیلە نەبوو، بەڵکو گەیشتە چینی دەربەگەکان خۆیان،[٣] چونکە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە میراتدا بە پشتاوپشت بوو تەنها کوڕی گەورە مافی وەرگرتنی میراتی هەبوو ئەوانی تر بێ بەش دەبوون لەم مافە، ناچار بە دوای شوێنی تردا دەگەڕان بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانیان و دەسکەوتنی زەوی کشتوکاڵی چاکتر لە خۆرهەڵات، هەر چەندە ئەم سیستەمە دۆخێکی ناهەمواری هێنابووە سەر کۆمەڵگای ئەورووپی بەڵام لە هەمان کاتدا سوودی زۆری هەبوو لە چاک کردنی زەوی و زار و دروستکردنی شارەکان بە مەبەستی فراوان بوونی دەسەلاتیان، هەروەها دروستکردنی هێزی سەربازی و ئامادەکردنی تیپی سوارەکان و گەشەکردنی باری ئابووری.[٤]

لە سەرەتای سەدەی (١١ز)دا کۆمەڵگای ئەورووپی سەرهەڵدانی هێزێکی نوێی بە خۆوە بینی ئەویش نۆرماندیەکان بوون، کە لە ساڵی (٢٩٩ ک/ ٩١١ز) لە دۆڵی

---

(١) - سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا في العصور الوسطى، ١٩٦١، ج٢/ ص٥١.

(٢) - ويل ديورانت: ن.م، م٤/ج ٣/ص ٤٢٢.

(٣) - رنسيمان: ن.م، ج١/ص ١٣٨.

(٤) - السيد الباز العريني: الشرق الأوسط والحروب الصليبية، ج١/ ص١٠٨.

(ڕووباری سین) نیشتەجێ بوون و دواتر ئەو شوێنە بە ناوی نۆرماندیا ناسرا، نۆرماندییەکان لە کاری دەریاوانی و بازرگانی چەتەیی و کۆنترۆڵ کردنی دەریای سپی ناوەڕاست و دەست پێکردنی پەیوەندی بە شارەکانی ئیتاڵیا و دورگەکانی بەریتانیا و دەریای ناوەڕاست و خۆرهەڵات ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو.(١)

هاوکات لە ڕۆما ململانێ لەسەر دەسەڵات لە نێوان بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەستی پێکرد و بەرژەوەندییەکانی گەل و نیشتمان و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتیان فەرامۆش کرد، و لە پێناو بە دەستهێنانی دەسکەوتی زیاتر بیریان لە زەوییە بەپیت و بەرەکەتەکان دەکردەوە، بۆیە دەبینین گەلێک لە میر و پاشاکانی ئەوروپا، لەوانە (فریدریک باربارۆسا) و (ریتشارد شێردڵ) و (فیلیب ئۆگستس) و (فریدریکی دووەم) و (لویسی نۆیەم) بەشداری شەڕی خاچییەکانیان کرد لە ترسی دەرکردنیان لە کڵێسا و دوورخستنەوەیان لە دەسەڵاتی وڵاتەکەیان لە لایەن پاپاوە، هەروەها گەلێک لە میرەکان بۆ مەبەستی فراوانکردنی ناوچە دەرەکیەکانیان بەشداریان دەکرد، ئەمە جگە لە مەبەستی جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیان، ئەگەر سەرنج بدەین لە فاکتەری رامیاری کە گرنگی سەرەکی هەیە لە هەڵمەتی خاچییەکان، دەبینین میر و پاشا بەشدار بووەکانی ئەوروپا لەم هەڵمەتانەدا لەسەر دەسکەوتەکان و پێشڕەوی کردنیان بۆ وڵاتی شام و دامەزراندنی میرنشینی خاچی و فەرمانڕەوای کردنی، بەردەوام لە ململانێدا بوون، بە ڕادەیەک هەندێ جار هاوپەیمانی هێزە ئیسلامیەکانیان دەکرد لە دژی برا خاچییەکانیان و بەرژەوەندیە رامیاریەکانیان لەم وڵاتەدا.

**هۆکاری ئابووری**

ئەم هۆکارە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لە بەرپابوونی زۆر لە شەڕ و هێرش و کۆچکردنەکان گرنگی گەورەی خۆی هەیە، هۆکاری ئابووری لە هۆکارە هەرە سەرەکیەکانی هەڵمەتی خاچییەکان بوو بۆ خۆرهەڵات، بە تایبەت کە کۆمەڵگای ئەوروپی لەوکاتەدا لە سایەی دڕندەترین سیستەمی دەرەبەگایەتیدا دەژیا و ئەم ژیانە هەموو کۆمەڵگای ئەوروپی گرتبووەوە، بە تایبەت بەشداربووانی

(١) - فشر: ن.م.ج ١/ص ١٣٠.

شەڕی خاچییەکان لە ساڵی (٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز)، خۆرئاوای ئەوروپا تووشی نەهامەتی لافاو و نەخۆشی و برسیەتی ببوو کە هاندەر بوو بۆ کۆچکردنی خەڵک لە زەوییەکانیان، خراپ بوونی گوزەرانی دانیشتوان و تێکچوونی ژێرخانی ئابووری لە ئەوروپا بە گشتی و فەرەنسا بە تایبەت،[١] بووە هۆی ئەوەی مەسیحیەکان هەوڵ بدەن ڕوو بکەنە وڵاتی شام بۆ ئەوەی لەو برسیەتی و ڕەش و ڕووتیە ڕزگاریان بێت و سەرچاوەی ژیانی باشتریان دەستکەوێت، هەروەها بە هۆی قەیرانی ئابووری و تێکچوونی بارودۆخی بازرگانی و کشتوکاڵی کە ڕووبەڕووی وڵاتانی ئەوروپا ببووەوە دانیشتوان لەبەر برسیەتی و قات و قڕی و بێکاری و چەوساندنەوە، پەنایان دەبردە بەر گژوگیا خواردن، ئەم هەموو هۆکارانە یارمەتی دەربوون لە بیرکردنەوەی خەڵکی بۆ کۆچ کردن لە پێناوی بە دەست هێنانی بژێویی ژیان و گەڕان بە دوای خۆش گوزەرانی.[٢]

هاوکات دروستکردنی بیرۆکەی ئەفسانەیی لای ئەوروپییەکان بەرامبەر دەرامەتە کانزایەکانی خۆرهەڵات، بۆ نموونە (جوانفیل) دەڵێت (دانیشتوانی دەوروبەری ڕووباری نیل ئێواران تۆڕ دەخەنە ناو ڕووبارەکە ڕۆژی دواتر پڕ بووە لە شتی بە نرخ و گران بەها کە هەمووی لە بەهەشتی زەوییەوە دەرچووە)، ئەمەش بۆ خۆی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر ئاوەزی کۆمەڵگای ئەوروپی، جگە لەوەی پاپا "ئوریانی دووەم" لە پەسنی شامدا دەڵێت (ماست و هەنگوینی تیا هەڵدەقوڵێ).[٣]

هەڵکەوتەی ئیستراتیجی و جوگرافی و بازرگانی ناوچەکە هۆکارێکی تر بوو بە هۆی بوونی بەندەرەکانی شام و دەریای ناوەڕاست و میسر و دەریای سوور و دەریای عەرەب بۆ هیند جگە لە کەنداوی فارس کە لە پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا گرنگی زۆریان هەبوو، هەروەها نەشونماکردنی شارە بازرگانیەکانی ئیتاڵیا و گەشەسەندنی بازرگانی لەگەڵ قوستەنتنیە و خۆرهەڵات کە گرنگترین بازنەی بازرگانی بوو لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا هۆکارێکی دیکەی ئەم هەڵمەتانە بوون.[٤]

---

(١) - رنسیمان: ن.م، ج١/ص ١٧٠- ١٧١.

(٢) - د. خاشع المعاضیدي واخرون: ن.م، ص٢٤.

(٣) - مذكرات جوانفیل: القدیس لویس، ت: حسن حبشي، مصر، ١٩٦٨، ص١٠٥.

(٤) - د. علیه الجنزوری: ن.م، ص ١٦٠.

هەروەهـا هەوڵەكـانی نورمـان بـۆ دەسـت بەسـەراگرتنی دورگەی صـقلیە لە ئەنـدەلس سـاڵی (٤٧٨ ک/ ١٠٨٥ز)، زەمینـەی ڕەخسـاند بـۆ نەشـونما كردنـی شـارە بازرگانیەكـانی ئیتاڵیـا وەک (بیـزا، جنـوە، ڤینیسـیا، امـالفی) بە شـێوەیەک توانیـان دەریای ناوەڕاست بە تایبەت بەشی خۆرئاوای كۆنترۆڵ بكەن.[1]

ئەگەر سـەرنج بدەین لە ڕووداوەكـان تێبینی ئەوە دەكەین زۆربەی هەرە زۆری هەڵمەتەكـان لە ڕێگـای گەشـتیەگەلە بازرگانیەكـانی شـارە كەنارییەكـانی ئیتاڵیـاوە ڕوویدەدا بە هەموو پێداویستیە جەنگیەكانەوە بەرامبەر بە لێخۆش بوونیان لە باجی بازاڕ و ئوتێل و شوێنە بازرگانیەكان بۆ ئاسان كردنی كاروباری بازرگانی، لێرەوە دەتوانین تێبینی ئەوە بكەین كە هێرشی خاچیەكان لە سەرەتاوە هۆكاری ئابووری زاڵ بوو بە سەریدا، چونكە زۆربەی هێرش بەرە خاچییەكان لە پێناو ڕزگاركردنی بەیت ولمەقدیس نەهاتوون بەڵكو بۆ گەڕان بە دوای پارە و دامەزراندنی میرنشینی نوێ هاتبوون، هەندێ جار ئەم ئامانجە دەبووە هۆی هەڵگیرسانی شـەڕی نـاوخۆ لە نێوانیاندا و لە یادكردنی ئامانجی پیرۆزیان لە ڕزگاركردنی قودس، بەڵام كـاریگەری ئابووری بە گشتی وەک كاریگەرییە رامیاری و كۆمەڵایەتیەكان، بە پەرژینی ئـایینی داپۆشرابوون.

بەم شـێوەیە وێنەیەكـی ڕوونمـان دەسـت دەكەوێـت لە هۆكـارە هانـدەرەكانی بزووتنەوەی خاچییەكان، كە كۆمەڵێک فاكتەری تێكەڵ بە یەک هەبوو لە پشت هاتنی خاچییەكان بۆ داگیركردنی خۆرهەڵات لە ژێر كۆمەڵێک بیانووی زۆر كە لە هەموو گرنگتـر و سـەرەكی تـر هۆكـاری ئـایینی بـوو، ئەمەش ڕۆڵ و كـاریگەری پاپـا دەردەخات لە ناو كۆمەڵگای ئەوروپادا بـۆ جێبەجێ كردنـی مەرامە رامیاریەكـانی لە ناو ئەوروپا و كۆنترۆڵ كردنی هەموو گێتی مەسیحی بە (ئیسـتغلال) كردنـی ئـایینی مەسیح، هەروەهـا سـەرهەڵدانی نورمانـدیەكان و كاریگەرییـان لەسـەر شارسـتانی، جـگە لە بـارودۆخی رامیـاری و كـۆمەڵایەتی خۆرئـاوای ئەوروپـی لە ئامـادەكردنی خەڵک كۆمەڵ بە كۆمەڵ بۆ دەرچوون بەرەو (فەردەوس- الجنە).

هاوكـات دەرەبەگەكـان و میرەكـان بە دوای شـوێنی تـازە دەگەڕان بـۆ پڕكردنەوەی ئارەزووەكانیان و دروستكردنی میرنیشینی رامیاری تازە لە نـاوچەكە، دوای ئەوەی ئەوروپا نەیتوانی ئاواتەكانیان بەدی بهێنێت بە تایبەت ژمارەیەكی زۆر

---

(١) - عاشور: اوروبا في العصور الوسطى، ج٢/ص ٣١١- ٣١٣.

جوتیار و کۆیله له کێڵگەکانیان دەژیان و پێداویستیان پڕ نەدەکردەوە، بۆیە پێویستیان بە شوێنی نوێ هەبوو بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانەی کە تێی کەوتبوون، هەروەها شارە بازرگانیە نوێیەکان دەرکەوتن کە ئامانجەکانیان کۆنترۆڵ کردنی بازرگانی نێو دەوڵەتی و دەست بەسەراگرتنی هەموو دەروازەکانی بوو، سەرەڕای ئەوەی هۆکارەکان جیاواز و تێکەڵ بوون بەڵام لە پێناو داگیر کردنی خۆرهەڵاتی ئیسلامی و جێبەجێ کردنی مەرامەکانیان هەموو هۆکارەکان یەکانگیر بوون.(١)

## هەڵمەتی یەکەمی خاچییەکان

شەڕی خاچییەکان تەنها بە قۆناغێکدا تێنەپەڕی بەڵکو بە درێژایی دوو سەدە بەردەوام بوو، شالاوەکان سەرەتا لە لایەن خەڵکەوە دەستیانپێکرد، و هۆکاری ئایینی کاریگەری خۆی هەبوو، بەتایبەت وتارەکەی (پاپا ئوریانی دووەم) کە لە ڕۆژی (٢٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٤٨٨ک/١٠٩٥ ز) لە شاری (ئەلمبردوتت)ی باشووری فەرەنسا پێشکەشیکرد بۆ مەسیحیەکان، لەو وتارەیدا داوای لە مەسیحیەکان کرد شوێنەوارە پیرۆزەکان لە فەلەستین ڕزگار بکەن و لە ژێر دەستی موسڵمانەکان دەریان بهێنن، ئەم وتارەی (پاپا ئوریان) زۆر کاریگەربوو، بەتایبەت لەنێو فەرەنج و نۆرماندییەکاندا، بۆ ئەم مەبەستە هەزاران کەس لە مەسیحیە توندڕەوەکان لەشکریان دروستکرد و ڕوویانکردە کەستەنتینیە بۆ هێرش بردنە سەر وڵاتی شام، خاچییەکان ناکۆکی و دووبەرەکی و دابەشبوونی ناوچەیی موسڵمانەکانیان بە هەلزانی و هێرشیان هێنایە سەر کەنارەکانی ئاسیا و هەندێک لە شارەکانی باکووری شام، تا گەیشتنە بەیت ولمەقدیس و داگیریانکرد، بە داگیرکردنی بەیت ولمەقدیس دەستیانکرد بە کوشتن و برین و تاڵان و وێرانکردنی، بەم جۆرە موسڵمانان هەستیان بە مەترسی ئەم بارودۆخە نوێیە کرد، و دەستیان کرد بە دژایەتی و بەرهەڵستکاری خاچییەکان.(٢)

ئەم هەڵمەتەش بە هەڵمەتی خاچی یەکەم یان جەنگی یەکەمی خاچییەکان یان هێرشی یەکەمی خاچییەکان ناسرا خەڵکێکی زۆر لە ئەوروپا خۆیان بۆ ئامادەکرد لە شالاوێکی گەورەدا، خاچییەکان لە کاتی ڕێکخستنی هەڵمەتەکەیان بوونە دوو

---

(١) – بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (ئاراس زەینەل): مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل ١٠٩-١١٠ .

(٢) – د. سعيد عبدالفتاح عاشور: اوروبا في العصور الوسطى، ج١/ ص٤٠٥.

بەشـەوە، بەشـی یەکەم نـاونرا بە هەڵمەتـی یـا شـاڵاوی گەلان یـان گشـتی، بەشـی دووەمیش ناونرا بە (هەڵمەتی شازادەکان).[1]

## شاڵاوی شازادەکان

ئەم هەڵمەتە بەشی دووەمی شاڵاوی یەکەمی خاچییەکان بوو، کە بە شێوەیەکی زۆر باش خۆیان بۆ ئامادە کرد بوو، لە کاتێکدا شـاڵاوی گشتی لە خەڵکی خـراپ و هەژار پێکهـاتبوو، پێکهـاتەی شـاڵاوی شـازادەکان هەمەجـۆر بـوو لە دەرەبەگ و هەندێ لە میرەکان، هەریەک لەمانە ئاڕاستە و سیاسـەتێکی تـایبەتی خۆیـان هەبـوو، بۆیە ئەم شاڵاوە لە کرۆکی خۆیدا بریتی بوو لە کۆمەڵێک بۆچوونی جیاوازی دژ بە یەک لە هەموو بوارەکانـدا،[2] هـاتنی ئەم سـوپا گەورەیە لای ئیمپراتـۆریەتی بیزەنتـی جێـی سـەرسـوڕمان بـوو، چـونکە پێـی وابـوو هێزێکـی بچـووک دێـت و پێشـتر وا ڕاهـاتبوو هێـزی خاچییەکـان لە ژێر دەسـەڵاتی بیزەنتەدا بمێنێتەوە، بـۆیە نەیتـوانی قایل نەبێت بە هاتنی ئەم سوپایە بۆ ناو ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی[3].

کـۆمەڵەی یەکەمـی ئەم شـاڵاوە بە فەرمانـدەیی میـر (جـودفری) و بـراکەی میـر (بلدوین) بوو، لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی دیکەی میرەکان، هەڵمەتی (جودفری) یەکەم هێرشی خاچییەکـان بـوو کە بتوانێت بە شـێوەیەکی ڕێکوپێک لە کۆتـایی مـانگی ذی الحجە ساڵی (٤٩٠ک/ ١٠٩٦ز)بگـاتە سـنوری ئیمپراتـۆریەتی بیزەنتـی، لێرەوە پرسـی (باسوخواسی) خـاچی لە مێژووی دەوڵەتـی بیزەنتیدا دەسـتی پێکرد و بوویە هـۆی واژۆکردنی ڕێکەوتننامەیەک لە نێوان هەردوولادا، بەو پێیە دەبوو خاچییەکان لە ناو سنوری ئیمپراتۆریدا واز لە کاری چەتەیی و دزی و تاڵانی بهێنن، بەرامبـەر بەوەی ئیمپراتۆری بیزەنتی پێداویستیان پێشکەش بکات تـا دەگەنە گـۆڕەپانی شـەڕی دژ بە سـەلجووقیەکان، لە مـانگی نیسـانی سـاڵی (٤٩١ک/١٠٩٧ز) ئیمپراتـۆری بیزەنتـی فەرمانی دەرکرد بە گواستنەوەی (جـودفری) و سـوپاکەی بـۆ کەنـارە دەریاییەکـانی ئاسیا تا کاتی گەیشتنی سوپاکانی تر[4].

---

(١) – د. خاشع المعاضیدی واخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص٣١.

(٢) – د. خاشع المعاضیدی واخرون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٣٢.

(٣) – د. قاسم عبده قاسم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٢١.

(٤) – سعيد عاشور: الحركة الصليبية، ج١/ص ١٤٥– ١٤٧.

پاش ماوەیەک هەڵمەتی ڕێکخراوەیی دووەم بە فەرماندەیی ئیمپراتۆر (بوهمیند نورماندی) هات، کە سەرکردایەتی سوپایەکی گەورەی کرد بەرەو خۆرهەڵات بە هاوڕێیەتی خوشکەزاکەی (میرتنکرد) و ژمارەیەک لە میرەکانی نۆرماند لە باشووری ئیتاڵیا و صقلیە، ئەم هەڵمەتە لە ساڵی (٤٩١ک/١٠٩٧ز) گەیشتە کەستەنتنیە و چوویە ژێر فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆری بیزەنتی، لە هەمان ساڵدا سوپاکەیان گواستەوە بۆ کەنارەکانی ئاسیا لە تەنیشت سوپای (جودفری)، کۆمەڵەی سێهەم بە فەرماندەیی میر (ریموندی چوارەم) کە سەرکردایەتی خاچییەکانی هەرێمی (بروفانسی) دەکرد گەیشتە نزیک شاری کەستەنتنیە، وەک میرەکانی پێش خۆی ملکەچی خۆی نیشاندا بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئیمپراتۆر لە وەرگرتنی فەرماندەیی و سەرکردایەتی باڵای خاچییەکان،[1] هەروەها کۆمەڵەی چوارەم کە لە خاچییەکانی فەڕەنسا بە فەرماندەی میر (روبرت کوڕی ولیم الفاتح) پێکهاتبوو گەیشتە کەنارەکانی بسفۆرو بە هەمان شێوەی میرەکانی پێش خۆی ملکەچی خۆی نیشاندا بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی، دوای ئەوە لە گەرووی بسفۆر پەڕینەوە بۆ ئاسیای بچووک و گەیشتن بە خاچییەکان کە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ هێرشبردنە سەر شاری نیقیە.[2]

لە ڕاستیدا شاڵاوی خاچییەکان هەر لە سەرەتاوە ناکۆکی و ناتەبایی نێوانیانی پێوە دیار بوو، سەرەڕای نەبوونی سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو، ئەمەش ببووە هۆی دابەشبوون و تێکچوونی خاچییەکان لە نێوان خۆیاندا، لەو کاتەدا ئیمپراتۆری بیزەنتی هەوڵی ئەوەی دەدا کە ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ خۆی تا وای لێکردن دان بنێن بە دەسەڵاتیدا، و پەیمانی گەڕانەوەی هەموو ئەو زەویانەیدا کە پێشتر سەلجووقیەکان داگیریان کردبوو، بۆیە خاچییەکان لە کەستەنتینیەوە بەرەو وڵاتی شام بەڕێکەوتن، هەموو هێزەکانی خاچییەکان دوای ئەوەی کەستەنتنیەیان بەجێهێشت، لە نزیک شاری ئەزمیر کۆبوونەوە لەو کاتەدا (بطرس الناسک) و پاشماوەی هەڵمەتی گشتی پەیوەندییان پێوەکردن، خاچییەکان هەموو بەیەکەوە

---

(١) - سعيد عاشور: الحركة الصليبية،ج ١/ص ١٥٣- ١٥٦.

(٢) - ئاراس زەینەل: س-پ، ل١١٧.

لەسەر ئەوە ڕێکەوتن هێرش ببەنە سەر شاری نیقیە، لەبەرئەوەی مەڵبەندی میری سەلجوقی (قلج ارسلان) بوو، بەڵام لەو کاتەدا خۆی لە شارەکە نەبوو.[1]
لە ساڵی (٤٩٠ك/١٠٩٦ز) خاچپیەکان گەیشتنە شاری نیقیە و گەمارۆیان لەسەر توند و بەهێزکرد، هەرچەندە میر(قلج ارسلان) کۆمەڵێکی نارد بۆ بەرگری کردن، بەڵام بێ ئەنجام بوو، لەو کاتەدا موسڵمانان بارودۆخیان بە دەست گەمارۆی خاچپیەکانەوە زۆر خراپ بوو، بۆیە لە ژێرەوە و بە نهێنی نوێنەریان نارد بۆ لای ئیمپراتۆری بیزەنتە کە ئامادەن شارەکەیانی بدەنە دەست بە مەرجێک ڕێگابدەن بە دەرچوونی خۆیان و ماڵ و مناڵیان، ئیمپراتۆر بە داواکەیان قایل بوو، بەمەش لە ساڵی (٤٩١ك/ ١٠٩٧ز) دەست گیرا بەسەر شاری نیقیەدا، شاری نیقیە یەکەم شار بوو کە خاچپیەکان و بیزەنتەکان دەستیان بەسەردا گرت[2].

خاچپیەکان بەردەوام بوون لە پێشکەوتنیان لە خاکی سەلجووقیەکانی ڕۆم لە ئەسیای بچووکدا، لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی (٤٩١ك/١٠٩٧ز) شاری (نیقیەییان) بەجێهێشت و بوون بە دوو بەشەوە و بڕیاریاندا لە (چورلیوم) یەک بگرنەوە، تێهەڵچونیان لەگەڵ میری سەلجوقی لە شەڕێکی زۆر بە هێزدا بوو، تیایدا سەلجووقیەکان تێکشان و خاچپیەکان دەسکەوتی چاکیان بەرکەوت، هەروەها بەرەو باشوور بەڕێکەوتن بێ ئەوەی لەلایەن سەلجووقیەکان هیچ بەرگریەکیان تووش بێت تا گەیشتنە دەشتەکانی (قونیە)[3] کە زۆر بەپیت و بەرەکەت بوو، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا هێزەکانی سەلجوقی لە بەرامبەریان کشابوونەوە و دەرفەتیان بۆ ڕەخساندن بۆ داگیرکردنی شاری (هرقلە)، لەوێ بوونە دوو تیپ، یەکەمیان بە فەرماندەیی میر (بلدوین) و میر (تنكرد) بوو ئاڕاستەکەیان ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ئەسیای بچووک تا (کیلیکیە و طرسوس) بوو، بەڵام تیپی دووەم کە لە زۆربەی هەرە زۆری خاچپیەکان پێکهاتبوو لە سەرووی هەموویانەوە نوێنەری پاپا و میر (جودفری و بوهمیند و ریمون)بوون ئاڕاستەکەیان بەرەو (ئەنتاکیا) بوو،(بلدوین) و تیپەکەی ڕێگای خۆرهەڵاتیان گرت بە مەبەستی داگیرکردنی

---

(١) - ابو الفداء: المختصر، ج٢/ص٢١٠؛ عبدالعزيز سالم: طرابلس الشام، ص٧٧.
(٢) - ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ص١٣٤؛ ابو المحاسن: النجوم الزاهرة، ج٥/ص١٦٠.
(٣) - قونیە: شارێکی تورکیە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەسیای بچووک و سەلجوقیەکان کردیانە پایتەختی خۆیان لە وڵاتی ڕوم کاتی فەتح کردنی ساڵی (٤٧٧ك/ ١٠٨٤ز) (بڕوانە: كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ت- بشير فرنسيس وكوركيس عواد، بغداد، ١٩٥٤، ص ١٧٢).

شاری(ڕەها)، زۆربەی خاچییەکان ڕوویانکردە شاری ئەنتاکیا کە لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (٤٩١ک/ ١٠٩٧ز) ببووە جێگای سەرەکیان کە لەلایەن میر (یانجی سبان)ەوە فەرمانڕەوایی دەکرا کە لە سەلجووقیەکانی عێراق و شام بوو،[١] خاچییەکان دوای سەرکەوتنیان و دەست بەسەراگرتنی ئەسیای بچووک و وڵاتی شام توانییان چەند میرنشینێک دابمەزرێنن، لەوانە (میرنشینی ڕەها، میرنشینی ئەنتاکیا، میرنیشنی تەرابلس و میرنیشینی بەیت ولمەقدیس).[٢]

لێرەدا دەتوانین بڵێین بەشی کۆتایی شاڵاوی یەکەمی خاچییەکان گەمارۆدانی شاری قودس بوو بۆ ماوەی (٥) هەفتە لە ساڵی (٤٩٣ک/١٠٩٩ ز)دا، لە هەمان ساڵدا توانییان شاری قودس بگرن و تیایدا کوشتارێکی یەکجار زۆریان ئەنجامدا و تەنها فەرماندەی فاتمی (افتخار الدولە) و هەندێ لە پیاوەکانی ڕزگاریان بوو، لەو بارودۆخە هەستیارەدا خاچییەکان لە کڵێسای قیامەت کۆبوونەوە بۆ بەجێ هێنان یان ئەنجامدانی (نوێژی سوپاس)، بەم شێوەیە قەوارەی خاچییەکان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی جێگیر بوو، یەکەم کاری خاچییەکان لە قودس پاککردنەوەی شار بوو لە تەرمی کوژراوەکان کە هەموو شاری داگیر کردبوو، لەگەڵ ڕیشەکێشکردنی موسڵمانان بە هەموو جۆرێک، دواتر مشت و مڕ لەسەر ئەوەی کێ لە قودس فەرمانڕەواییان بکات سەریهەڵدا، چونکە خاچییەکان کاتێک لە ساڵی (٤٩٠ک/١٠٩٦ ز) ئەوروپایان بەجێ هێشت بیریان لەوە نەکردبوویەوە دوای داگیرکردنی قودس لە دەستی موسڵمانەکان چی بکەن، لە هەمان کاتدا پاپا ئوربیانی دووەم پێش بیستنی داگیرکردنی قودس کۆچی دوایی کرد، بە بێ ئەوەی هیچ سیستەمێک دیاری بکات بۆ بەڕێوەبردنی شاری قودس، بەڵام لە کۆتاییدا ڕێککەوتن لەسەر هەڵبژاردنی (جودفری البوبونی) لە ژێر ناونیشانی (حامی حریم المقدس) بۆ بەڕێوەبردنی شاری قودس بەم شێوەیە لە ئەنجامی سەرکەوتنی هەڵمەتی یەکەم، دروست کردنی سێ میرنیشین و شانشینێک بەدەست هات.[٣]

---

(١) - ابن القلانسي: ذيل تاريخ دمشق، ص١٣٤؛ أبن الجوزي: المنتظم، ج٩/ ص١٠٥؛ كارل بروكلمان: تأريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة، بنية امين فارس ومنير البعلبكي، بيروت، ص٣٤٥- ٣٤٦.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص،٣٥.

(٣) - د. قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص،١٣٠.

شالاوی یەکەمی خاچییەکان بە دوو قۆناغ تێپەڕی، یەکەمیان سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام دووەم جگە لەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا هاوکات شێوە ڕێکخستنێکی بەخۆیەوە بینی، و توانییان هەموو ئەو ناوچانە داگیر بکەن کە پیایدا تێپەڕ بوون، لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتەدا کاری دزی و چەتەیی و تاڵان و وێرانی نەک لە ناو خاکی موسڵماناندا بەڵکو لە هەرێمەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیشدا زۆر بوو، گرنگی ئەم هەڵمەتە لەوەدایە شاری قودس داگیرکرا و لە دەست موسڵمانەکان دەرهێنرا کە مێژووی دەسەڵاتی ئیسلامی لەو ناوچەیەدا دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی دووەم خەلیفەی راشدی (عومەری کوڕی خەتاب) (ر.خ) (ساڵی ١٥ک)، هەروەها توانییان لە ئەنجامی ناکۆکی و ململانێی نێوان میرە عەرەبەکان و نەبوونی سەرکردەیەکی بەتوانا و لێهاتوو بۆ سەرکردایەتی کردنی بەرەی ئیسلامی و بەرگریکردنی لە خاکی موسڵمانان دژ بە هێرشی خاچییەکان سێ میرنشین و شانشینێک لە ناو خاکی موسڵماناندا دابمەزرێنن.

## هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان

ڕزگارکردنی شاری ڕەها لە دەستی خاچییەکان لە ساڵی (٥٣٩ک/ ١١٤٤ز) بە دەستی عیمادەدین زەنگی دوای (٢٨) ڕۆژ گەمارۆدان هەنگاوێکی بەرچاو بوو، بەمەش یەکەم قەوارەی رامیاری و ئایینی و ئابووری و کۆمەڵایەتی خاچییەکان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا کۆتایی هات، ئەمە ڕووخانی قەڵایەکی دەروونی گەورە بوو لەسەر خاچییەکان، هاوکات لێدانێکی گەورە بوو بۆ بەرژەوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا، ئەمە بۆ خۆی هۆکارێکی گرنگ بوو لە بیرکردنەوە بۆ هەڵمەتێکی تر بۆ سەر خۆرهەڵات، خاچییەکان لە دژی عیمادەدین زەنگی هیچیان پێ نەدەکرا تا هاتنی هێرشی دووەمی خاچییەکان.[1]

لە ڕاستیدا ئەم شارە پەیوەندییەکی کەلتوری بە سەرەتای مەسیحیەتەوە هەبوو، بە ڕووخاندنی دوای کەمتر لە (٥٠) پەنجا ساڵ لە دەست بەسەراگرتنی بەدەستی (بلدوين البويونی) ڕەشبینی لای خاچییەکان دروست کرد، بەڵام لای گێتی ئیسلامی پێچەوانەی خاچییەکان بوو، چونکە سەرکەوتنی موسڵمانان بە

---

(١) – أبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٩/ ص ٨– ٩؛ أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص ٢٧٩.

سەرکردایەتی عیمادەدین زەنگی فاکتەری سەرەکی بوو لە هاندان و یەکخستنی هەموو توانا و چالاکی موسڵمانان لە دژی خاچییەکان، لە ڕووی سەربازیەوە کەوتنی شاری ڕەها بە دەستی موسڵمانان دەستکەوتێکی گەورە بوو، چونکە دۆڵی فورات بوون ناوچەیەکی ئیسلامی، هاوکات ناوچەیەکی گرنگ بوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی هەموو ڕێگا و بانەکانی نێوان باکووری شام و عێراق و جەزیرە و ئاسیای بچووک.[1]

لە خۆرئاوای ئەوروپا جۆرێک لە غەم و مەترسی لە ناو خەڵک و دەزگاکانیان بڵاببوویەوە و هەستیان بە مەترسی و ئاڵۆزی بارودۆخیان کرد لە ناوچەکانی جەزیرە و وڵاتی شام، سەرەڕای ئەو بارودۆخە پشێو و نائارامە، هیچ لەو سەرکردە ئەوروپیانە هەوڵی هەڵمەتێکی خێرای خاچییان نەدا، بەڵکو هەستان بە ناردنی شاندێکی فەرەنجی بۆ لای پاپا (بجینیوسی سێیەم) (٥٤٠-٥٤٨ک/ ١١٤٥-١١٥٣ز) کە ماوەیەکی کەم بوو دەسەڵاتی پاپەوی وەرگرتبوو، هاوکات وەفدێکی ئەرمەنی هانایان بۆ پاپا و پاشاکانی ئەوروپا هێنا بوو بۆ گێڕانەوەی شاری ڕەها، لە نێوان سالانی (٥٤٠-٥٤٤ک/١١٤٥ - ١١٤٩ز) ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە دەرکەوتن کە لە مێژووی شەڕی خاچییەکاندا بە هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان ناسرا،[2] بێگومان تێکشانی خاچییەکان لە شاری ڕەها بەرامبەر (عیمادەدین زەنگی) ببووە هۆی ئەم پەلامارە بە سەرکردایەتی (کونرادی سێیەم) ئیمپراتۆری ئەڵمان و (لویسی حەوتەم) پاشای فەڕەنسا بۆ ناوچەکە لە کۆتایی ساڵی (٥٤٢ک/١١٤٧ز) و سەرەتای ساڵی (٥٤٣ک/١١٤٨ ز) کە دواجار چارەنووسیان دۆڕاندنێکی گەورە بوو بە دەستی موسڵمانان و پاشای فەڕەنسا بە شێوەیەکی زۆر سەیر لە دیلی و کوشتن ڕزگاری بوو ئەمەش لە دوای تێکشکانی سوپاکەی.[3]

لە ڕاستیدا کەوتنی شاری ڕەها قۆناغی یەکەمی لە ئاسۆی ئیسلامی و سەرکەوتنەکانیان تەواوکرد و بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە داتەپینی خاچییەکان لە هەڵمەتی دووەمیان دەبینین کە ئامانجیان گێڕانەوەی دەسەڵات و قەوارەی

---

(١) - د. قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، ص ١٣٧.

(٢) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل١٢١.

(٣) - أبن القلانسي: ذيل تأريخ دمشق، ص٢٩٧- ٣٠٠.

خاچییەکـان بـوو لە خـۆرهەڵات،[1] خاچییەکـان بـۆ یەکەم جـار هەسـتیان کـرد بە مەترسی بارودۆخیان لە خۆرهەڵات، بۆیە بانگەوازیـان بۆ هەڵمەتێکی نوێ دەکرد، بەڵام لە هەمـان کـات و لەو بـارودۆخە ناسـکەدا هاوکـاری یەکتریـان نەدەکـرد، جوسلین هەوڵیدا کە (تل باشر) بکاتە بنکەی خۆی و تێکچوونی لەگەڵ (ریموند)ی میری ئەنتاکیا و دەرچوونی لە ژێر دەسـەڵاتی ئەوی خستەڕوو، هاوکات ڕقی بوو لە هاوپەیمانیەتی (جوسلین)، بەڵام بڕیاریدا یارمەتی لە بیزەنتەکان وەربگرێت بۆیە لەلای ئەوانەوە بەڕێکەوت، هاوکات ئەوان خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ شـەڕ لەگەڵ تورکەکـان و وەڵامـی ئەویـان نەدایەوە و ئەویـش بە لاوازی لە بەردەسـتیان مایەوە،[2] دەتوانین بڵێین کەوتنی شانشینی ڕەهای خاچی بەرهەمێکی گەورە بوو بۆ ڕزگارکردنی میرنشینی (عیمادەدین زەنگی) کە بەردەوام لە مەترسیدا بوو، بەڵام لە دوای ئەو ڕووداوەوە دڵنیابوون. [3]

ئەم سـەرکەوتنە دەرفەتـی ڕەخسـاند بـۆ (عیمـادەدین زەنگـی) بـۆ دەسـت بەسـەراگرتنی پـێگەی خاچییەکـان لەو دەوروبەرە و کـۆنترۆڵ کـردن و دەسـت بەسـەرداگرتنی هەمـوو شـمەکی دوژمـن لە نـاوچەکەدا، هەروەهـا لە ئەنجـامی ئەم سـەرکەوتنەدا کۆمەڵێـک نازنـاوی لە عەبباسـیەکان و سـەلجوقیەکان وەرگـرت،[4] خاچییەکـان بـۆ مانەوەیـان لە خـۆرهەڵات هەمـوو هێـز و تواناـیـان خسـتەگەڕ بـۆ کـۆکردنەوەی هێزەکانیـان دژ بە (نـورەدین مەحمـود) کە گەورەتـرین هێـز بـوو لە نـاوچەکەدا لە دژی خاچییەکـان، (نـورەدین مەحمـود) بەم سـەرکەوتنەوە نەوەسـتا، بەڵکـو بە سـوپاکەیەوە بەرەو بـاکوور بەڕێـکەوت و تـوانی دەسـت بگرێـت بەسـەر هەمـوو وڵاتـی ئەنتاکیـا لە خـۆرهەڵاتی ڕووبـاری (أورنـت)، هەروەهـا لە سـاڵی (٥٤٢ک/١١٤٧ز) ناوچەکانی (ارناح و کرلاتا و بیلاط و سرقوت) کەوتنە بەر هێرشـی نـوردەین مەحمـود[5] ناچـار خاچییەکـان لە سـاڵی (٥٤٣ک/ ١١٤٨ز) گەورەتـرین سـوپایان ئامـادەکرد بـۆ گۆڕەپـانی جەنـگ و شـاری دیمەشـقیان گەمـارۆدا لە

---

(١) - رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ج٢/ ص ٤٦٧.

(٢) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل١٢٣.

(٣) - أبن الأثير: الباهر في التأريخ، تحقيق، عبدالقادر أحمد طليحات، القاهرة، ص٦٩.

(٤) - وەکو "الانير المظفر، ركن الاسلام، عمدة السلاطين، زعيم صيوشن المسلين، ملك الامراء، امير العراقيين والشام"، أبن القلانسي: م.ن، ص،٢٨٤.

(٥) - رنسيمان: هەمان سەرچاوە، ص٣٩٢.

چوارچێوەی هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان، (معین الدین انر) ی فەرمانڕەوای دیمەشق چاوەڕوانی ئەوە نەبوو مەبەستی ئەم سوپایە داگیر کردنی شاری دیمەشق بێت، بەڵام کاتێک ئەم ڕاستیەی بۆ دەرکەوت داوای یارمەتی لە هەموو میرەکانی هەرێمەکانی دەوروبەری کرد بۆ ناردنی سەربازەکانیان، هاوکات داوای یارمەتی لە (نورەدین مەحمود) کرد، هێزی خاچییەکان سەرەتا لای (منازل العساكر) نیشتەجێ بوون کە دەکەوتە دوری (٤ میل) لە باشووری دیمەشق، سوپای خاچییەکان پەلەیان کرد لە پێشکەوتنیان بۆ گوندی (المنره) لەبەر هەبوونی ئاو لەو گوندەدا، سەرەتا سوپای موسڵمانان هەوڵیاندا نەهێڵن خاچییەکان لەوە زیاتر پێشڕەوی بکەن، دواتر لە ئەنجامی تێهەڵچوونی هەردوولادا خاچییەکان هەندێ سەرکەوتنیان بە دەستهێنا و توانیان شارەکە داگیر بکەن، موسڵمانان ناچار بوون شەڕی (عصابات- سەرکێشی) ئەنجام بدەن، بۆ ڕۆژی دواتر شەڕ لە نێوانیاندا پەرەی سەند و هاوکاری و یارمەتی بۆ موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە دەهات، خاچییەکان ناچار بوون بکشێنەوە بۆ دەشتاییەکانی شورای خۆرهەڵات، دوا بەدوای ئەو ڕووداوە سوپای موسڵمانان هێرش و پەلاماریان بۆ سەر خاچییەکان تازەکردەوە، خاچییەکان بەناچاری هەنگاوی بەرگری کردنیان گرتەبەر بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانەی تێیکەوتبوون، بەڵام سوارە موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان دەکردە سەر سوپای خاچییەکان و تیربارانیان دەکردن، بە شێوەیەک هەموو لەناو یەک شڵەژان و ناچار بوون بە تێکشکاوی بگەڕێنەوە بۆ بنکە سەربازییەکانیان، بەهۆی زۆری کوژراوەکانی خاچییەکانەوە بۆنی تەرمەکان هەموو دەشتەکەی گرتبوو،[1] بارودۆخی خاچییەکان لە وڵاتی شام زۆر خراپ بوو، سەرەڕای کوژرانی (عیمادەین زەنگی) بە دەستی یەکێک لە خزمەتکارەکانی بە ناوی (برتقش) لەساڵی (٥٤١ک/ ١١٤٧ز)،[2] (جوسلین) لە دووەم هەوڵیدا لە هێرش بردنەسەر شاری ڕەها بە مەبەستی دەرهێنانی لە دەستی (نوردەین مەحمود) شکستی هێنا، جەنگاوەرانی هەردوولا (موسڵمانان و خاچییەکان) چاوەڕوانی هاتنی بەشی کۆتایی سەربازانی هەڵمەتی دووەم بوون، بەڵام (لویسی حەوتەم) گیرۆدەی

---

(١) - أبو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية،ج١/ص١٢٣.

(٢) - أبن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، ص ٩٩- ١٠٠؛ أبن القلانسي: م.ن، ص٨٤- ٨٥.

پڕوپاگەندەی پەیوەندی خۆشەویستی نێوان (اليانور الاكوتيانيه) ی خێزانی و میری ئەنتاکیا (ريموند) بوو، بەم هۆیەوە (رەهای) لەیادچوو و پەیوەندی کرد بە سوپای (کونرادی سێیەم) لە فەڵەستین و بڕیاری هێرشیاندا بۆ سەر شاری دیمەشق لە بری ڕزگارکردنی شاری رەها، لە ئەنجامدا زۆر بە خراپی تێکشکان، ئەمە بوو بە هۆی گەڕانەوەی کونراد بۆ ئەڵمانیا، هەروەها (لويسيش) لە ساڵی (٥٤٤ک/١١٤٩ز) گەڕایەوە.

لە ئەنجامی ئەم هەڵمەتەدا ژمارەیەکی زۆری خاچییەکان لەناو چوون، لەوەش زیاتر بڕێکی زۆر چەک و تەقەمەنیان لە دەست دا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم سوپا گەورەیە ئامانجی سەرەکی خۆی بیرچێتەوە، و لە بەرامبەر هێرشی موسڵمانان نەیانتوانی بۆ ماوەی چوار ڕۆژ بەرگری بکەن، ئەمەش بە گەورەترین ئیهانە دادەنرێت بۆ ڕێز و شکۆی خاچییەکان کە دەیانوت سواری خاچی نادۆڕێت، هاوکات هیوا و ئومێدی نوێی دا بە گیتی ئیسلامی،[1] (نورەدین مەحمود) بەرپرسی حەلەب و (معين الدين انر) بەرپرسی دیمەشق ڕێککەوتن هاوکاری و یارمەتی یەکتر بدەن بۆ ڕاوە دوونانی خاچییەکان لە ئەنجامی دۆڕانیان لە شام لە ساڵی (٥٤٤ک/ ١١٤٩ز)دا، سوپای ئیسلامی دەستی کرد بە تێکدانی قەڵای (العريمه) کە لە ژێر دەسەڵاتی خاچییەکاندا بوو، هەروەها بنکەی هێرش و پەلاماری خاچییەکان بوو، تا لەگەڵ خاکە کە ڕێک بوو، هاوکات موسڵمانەکان توانیان زۆرێک لە خاچییەکان لە نێوانیاندا (برتراند بچووک) کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی خاچییەکان لەگەڵ خوشکەی بەدیلی بگرن، دواتر بران بۆ شاری حەلەب و (١٢) ساڵ لە زینداندا مانەوە.[2]

بەم شێوەیە هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان کۆتایی هات هەرچەندە ئەم هەڵمەتە پاپاو قدیس (برنارد) پیلانیان دانا بوو، و دوو گەورە پاشای ئەورووپا سەرکردایەتیان دەکرد، و دانیشتوانی ئەورووپا هیوایەکی زۆریان بە سەرکەوتنی ئەم هەڵمەتە بوو، بەڵام هەڵمەتەکە شکستی هێناو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو بە دیل گیرا کە لە نێو دیلەکاندا میرێک هەبوو، تێکچوونی پەیوەندی نێوان خاچییەکانی ئەورووپا و بیزەنتەکان و بە پێچەوانەوەی ئەوانەوە یەکبوونی ریزەکانی موسڵمانان

---

(١) - رنسيمان:. هەمان سەرچاوە، ص٤٥٧.

(٢) - أبن القلانسي: م.ن، ص٣٠٩- ٣٢١؛أبو شامه: م.ن، ص١٤٩- ١٥١.

لە نێو خۆیاندا کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر باری دەروونی خاچییەکان لە کاتی شەڕکردندا.

ئۆباڵی شکستهێنانی هەڵمەتی دووەمی خاچییەکان دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردە و فەرمانـدەکانیان بە هـۆی ململانـێ و تێکچـوونی پەیوەنـدی نێوانیـان،[1] جـگە لە دەرکەوتنـی (نـورەدین مەحمـود) لە سـاڵی (٥٤٦ک/ ١١٥١ز) کە ڕۆڵێکـی گەورەی هەبوو لە بەرگری کردنی هێرش و پەلاماری خاچییەکان و چوونە ناوچەی (راس الماء). [2]

(نـوردەین مەحمـود) سـەرکردایەتی سـوپای ئیسـلامی کـرد و لە نـاوچەی (عـين الجر) لە دەشتی بیقاع و نزیک لە دیمەشق دابەزی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خاچییەکان، هاوکـات دەرکەوتنـی گەشـتیگەلی میسـری لە کەنارەکـان هانـدەرێک بـوو بـۆ نـوێ بـوونەوەی شـەڕ لەگەڵ خاچییەکـان، ئەم گەشـتیگەلیە پـڕ بـوو لە هێـز و چەک و تەقەمەنی و لە (٧٠) حەفتا بەلەمی جەنگی بە هەمـوو پێداویسـتیەکانیەوە پێکهـاتبوو، گەشتیگەلی میسر هێرشـی کـردە سـەر خاچییەکان، دوای تێکشـکاندنیان ژمـارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بەدیل گرتن، کەشتیگەلی میسر هەرچیـان هـاتەڕێ سـوتاندیان و بەلەمێکـی زۆری خـاچی و بیزەنتیـان دەسـتکەوت، دوای ئەم سـەرکەوتنە بەرەو شـاری عەککـا بەڕێکەوتـن، موسـڵمانان بەهەمـان شـێوەی (یافـا) شـاری (عەککا)یـان ڕزگـار کـرد، دوا بەدوای ئەوە موسـڵمانان هێرشـیان بردەسـەر (صـيدا ، بيـروت ، تەرابلـس) و توانیـان زەرەرێکـی تونـد بـدەن لە دوژمـن، لە ئەنجـامی ئەو هەمـوو سەرکەوتنەی کە کەشتیگەلی میسری بە دەسـتی هێنـا، (نورەدین مەحمـود) بڕیاریـدا سـەردانیان بکـات، چـونکە خزمەتێکـی گەورەیـان پێشکەشـکرد لە تێکشـکاندنی خاچییەکانـدا،[3] دوای دوو سـاڵ لە دۆڕانـدنی خاچییەکـان (بلـدوين) پاشـای بەیـت ولمەقدیس بڕیاریدا هێرش بکـاتە سـەر شـاری عەسقەلان و توانی سـوپایەکی زۆر گەورە بە هەمـوو پێداویسـتیە جەنگیەکـانی ئەو سـەردەمە ئامـادە بکـات، شـاری عەسقەلان یەکێک بـوو لە بە هێزتـرین پێگە سـەربازیەکانی کەنـاری دەریـا، سـوپای خاچییەکان بۆ ماوەی چەند مانگێک گەمارۆیاندا، هەرچەنـدە گەشـتیگەلی میسـری بە هانایـانەوە هـاتن و هەمـوو چەک و تەقەمەنـی و خـواردنێکی پێگەیانـدن، بەڵام لە

(١) - رنسيمان: م.ن، ص٤٦٢.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي واخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص١١٨.

(٣) - أبن القلانسي: هەمان سەرچاوە، ص٣١٤.

ئەنجامی هەڵەی یەکێک لە موسڵمانان لە چوونی بۆ سوتاندنی بورجی خاچییەکان، ئاگری ئەو بورجە پەرەی سەند و گەیشتە شاری عسقلان، و کەلێنی خستە شورای شارەکە، هەندێ لە سوارە خاچییەکان هاتنە ناو عەسقلان و هەرچەندە ئەوان کوژران، بەڵام بەردەوام بوونی گەمارۆکە لە سەریان بووە هۆی داگیرکردنی لە لایەن خاچییەکانەوە، بەمە خاچییەکان شاری عەسقەلانیان کردە ناوەندی دژایەتی کردنی موسڵمانان لە میسر و شام و جەزیرەی فوراتی.[١]

## هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکان

داگیر کردنی وڵاتی شام لە لایەن خاچییەکانەوە نزیکەی سەدەیەکی خایاند، ئەوان لە بارێکی بە هێز و هێرشی بەربڵاودا بوون، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە (نورەدین مەحمود) زەنگی سەرۆکایەتی گێتی ئیسلامی وەرگرت و هەوڵ و کۆششی دەدا لە پێناو گۆڕینی تەرازووی هێزەکانی نێوان هەردوو لادا، بەم جۆرە نورەدین مەحمود بەرەی ئیسلامی لە باری بەرگریەوە گۆڕی بۆ هێرشبردن، و خاچییەکانی کردە ئامانجی هێرشەکانی،[٢] (نورەدین مەحمود) پێی وابوو هەرگیز ناتوانرێت بەرەی ئیسلامی بخرێتە ئاستی هێرش بردن گەر یەکێتی وڵات بەدی نەیەت، بۆ سوود وەرگرتن لە سەرچاوە مادی و مرۆییەکان لە پێناو خزمەتکردنی جیهاددا، نورەدین مەحمود پاش ئەوەی توانی یەکێتی نێوان میرنشینەکانی (جەزیرە ، موسڵ و وڵاتی شام) بەدی بهێنێت، بوو بە خاوەن هێزێکی هێرشبەر کە لە ڕێگەیەوە توانی مەترسی بۆ میرنیشینەکان دروست بکات و ئەو میرنیشینانەی دەکەوتنە باکووری شامەوە سنورداریان بکات بە جۆرێک نەوێرن بە تەنها لە دژی بجەنگن،[٣] (نورەدین مەحمود) بڕیاریدا وڵاتی میسر بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، لەگەڵ (املریک) کەوتبووە ململانێ بۆ گرتنی میسر، چونکە (نورەدین مەحمود) پێی وابوو هەر لایەک دەستبگرێت بەسەر میسردا، دەبێت بە براوەی جەنگ دوا جاریش نورەدین مەحمود توانی دەست بگرێت بەسەر میسردا و بیخاتە سنوری دەوڵەتە

---

(١) - رنسیمان: هەمان سەرچاوە، ص٥٤٥.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربى والغزو الصليبى، ص١٧٦.

(٣) - خاشع المعاضيدي: الحياة السياسية في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، بغداد، ١٩٧٥، ص٢٠٠.

یەکگرتووەکەیەوە،[١] نورەدین مەحمود لەم هەنگاوەیدا چەند ئامانجێکی سەرەکی هەبوو، گرنگترنیان:

١. سوود وەرگرتن لە سەرچاوە ماددی و مرۆییەکان بۆ بەهێزکردنی بەرەی گێتی ئیسلامی.

٢. دوورخستنەوەی خاچییەکان لە میسر بۆ ئەوەی نەتوانن سود لە سەرچاوە گەورەکانی وەربگرن بۆ بە هێزکردنی خۆیان.

٣. ژیاندنەوەی گۆڕەپانی بزووتنەوەکانی باشوور کە لە ماوەی کۆتایی سەردەمی فاتمیەکاندا فەرامۆش کرابوو، بە مەبەستی ناچارکردنی دوژمن بۆ ئەوەی لە چەند لایەکەوە شەڕ بکات، بەم جۆرەش هێزەکانی لە سنورەکانی جەنگدا دابەش دەبن دواجار لاوازیش دەبن،[٢] لەو کاتەی کە (نورەدین مەحمود) خۆی بۆ هێرشێکی توند دژ بە خاچییەکان و دەرکردنیان لە وڵاتدا ئامادەکرد، پاش ئەوەی توانی یەکێتی رامیاری لە میسر و شامدا بینا بکات کۆچی دوایی کرد، لە پاش (نورەدین مەحمود) (سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی) هاتە گۆڕەپانی ڕووداوەکان و لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو کاری دەکرد، ماوەی دەسەڵاتەکەی بە درێژبوونەوەی دەسەڵاتی نورەدین مەحمود دادەنرێت، توانی بە ئازایەتی و ئەزموونیەوە وەک هەنگاوێکی سەرەتایی یەکێتی وڵات بگەڕێنێتەوە، هاوکات کاریکرد بۆ ئەوەی خاچییەکانی ناوچەی باشووری وڵاتی شام لەناو ببات[٣]. سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی کاریکرد بۆ بە هێزکردنی بەرەی ئیسلامی و ئامادەکردنی بۆ جەنگێکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ خاچییەکاندا، بە جۆرێک سەرکەوتنی هێزی موسڵمانانی تیادا مسۆگەر بێت، بۆیە کاریکرد بۆ دروستکردنی بارودۆخێکی لەبار تا خاچییەکانی گەیاندە دۆڵی (حەتین)، لە ساڵی (٥٨٣ک/ ١١٨٧ز) شەڕێکی گەورە و بەر فراوان لەم دۆڵەدا ڕوویدا لە نێوان لەشکرەکەی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی و لەشکری خاچییەکاندا، لەپاش کوشتارێکی زۆر، لەشکری سەلاحەددینی ئەیوبی سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا لە دەرئەنجامە گرنگەکانی ئەم جەنگە لە ناوبردنی سوپای خاچییەکان و نەهێشتنی شانشینی بەیت ولمەقدیس و دروستبونی مەترسیەکی

---

(١) – د. قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، عالم المعرفة (١٤٩) الكويت، ١٩٩٠، ص ١٤١.

(٢) – د. قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوە، ص١٤١.

(٣) – رانسیمان: تأريخ الحروب الصليبيه، ج ٢/ص ٦٤٣.

گەورە بوو لە سەر تەواوی خاچپیەکان لە خۆرهەلاتدا،[1] خاچپیەکان پێیان وابوو ئەگەر بیانەوێت پاش شەڕی حەتین لە خۆرهەلاتدا بوونیان هەبێت ئەوا دەبێت ئەوروپا بە زووترین کات هەلمەتێکی نوێیان بۆ بنێرێت، بۆیە چەند نێردراوێک گەڕانەوە ئەوروپا و باسی بارودۆخ و بەسەرهاتی خاچپیەکانیان کرد لە خۆرهەلات و وتیان مانەوەیان پەیوەستە بە گەیشتنی هێز، یەکێک لە نێردراوەکان سەرۆکی (اسقفیە صور) بوو کە بە (صوسیس) ناو دەبرا، نێردرا بۆ لای پاپا و پادشاکانی ئەوروپا بۆ ئەوەی مەترسی بارودۆخی خاچپیەکان باس بکات، ئەمەش کاریگەری باشی هەبوو، چونکە پاپا و پادشاکانی ئەوروپای خۆرئاوا قایل بوون بە دەرکردنی بڕیارێک بە ناردنی هەلمەتێکی نوێی خاچپیەکان بۆ خۆرهەلات و ڕزگارکردنی شاری قودس لە دەستی موسلمانان، یەکەم هێز کە گەیشت ئەو هێزە بوو کە پادشای صقلیە (ولیەمی دووەم) ناردبووی کە لە (٣٠٠) سوار پێک هاتبوو،سەرەڕای زۆری هەولەکان بۆ بە خێرایی ناردنی سوپا بەلام هەلمەتەکە زۆر درەنگ کەوت، هێزەکانی فەڕەنسا و ئینگلتەرە تا هاوینی سالی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) نەکەوتنە ڕێ، هەردوو سوپاکە لە (٥٨٦-٥٨٧ک/١١٩٠- ١١٩١ز) وەرزی زستانیان لە دورگەی صقلیە بردەسەر،[2] بەلام سوپای ئەلمانیا کە بەهێزترینیان بوو بە سەرکردایەتی (ئیمپراتۆر فریدریک باربارۆسا) لە (٥٨٥ک/ ١١٨٩ز) بەرەو خۆرهەلات کەوتەڕێ بۆ بەشداری کردن لە هەلمەتی سێیەمی خاچپیەکان، بەمجۆرە سوپای سێ ولاتی گەورە و بەهێزی ئەوروپای خۆرئاوا بە سەرکردایەتی پادشاکانیان بۆ فریاکەوتنی خاچپیەکان لە خۆرهەلات و گەڕاندنەوەی شاری قودس بۆ ژێر رکێفی خۆیان پێشکەوتن، سوپاکانیش بەمجۆرە بوون:

١. سوپای ئەلمانیا- بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆر- فریدریک باربارۆسا.
٢. سوپای فەڕەنسا- بە سەرکردایەتی پادشا- فیلیب ئۆکستس.
٣. سوپای ئینگلیزی- بەسەرکردایەتی پادشا- ریتشارد شێردل.

ئەم سوپایانە هێزی هەلمەتی سێیەمی خاچپیەکانیان پێکدەهێنا، لەبەر ئەوەی سوپای ئینگلتەرە و فەڕەنسا لە یەک کات و لە یەک تەوەرەوە هاتن کە ئەویش ڕێگەی دەریایی بوو، یەک سوپای گەورەیان پێکهێنا، ئەوە بەشی یەکەم بوو، بەشی

---

(١) - رانسیمان: هەمان سەرچاوە، ج ٣/ص ٦٨.

(٢) - د.سعید عبدالفتاح عاشور:الحرکة الصلیبیة،ج٢/ص٨١٢.

دووەم سوپای ئەڵمانی بوو کە لە وشکانیەوە هاتن و کاریان تەنها گەڕان و بەدواداچوونی ئەو ڕێگە و بانانە بوو کە بەشی یەکەمی سوپاکە (فەڕەنسا و ئینگلتەرە)ی پێدا دەهات لەو ناوچانەی هاوسنووری وڵاتی ئیسلامی بوو تا دەگەیشتن بە خاچییەکانی عەککا.[1]

(فریدریک باربارۆسا) سەرەنجی زۆر لە مێژوونووسانی هەموو سەردەمەکانی ڕاکێشاوە، لەبەرئەوەی پیاوێکی زۆر ئازا و لێهاتوو و هاوکات سوار چاکی سەردەمی خۆی بووە، جگە لە قارەمانی و جوامێری لە ڕادەبەدەر و ئارەزوومەندی بۆ شەڕ و حەز بە سەرکێشی کردن، لەگەڵ خەڵکدا بە بیرو بۆچوونی خۆی نەک بە یاسایەکی وشک دادپەروەر بوو، لەو بارەیەوە مێژوونوس نیشر دەڵێت (لە دوای شارلەمان ئەڵمانیا پاشای وای لە بە توانایی و فەرمانڕەوایی بە هێز و دڵ نەرمیدا بەخۆوە نەبینیوە)،[2] ئەمانە لە کەسێتی (باربارۆسادا) بەدیدەکران بۆیە بە نموونەی سەرکردە و سوارچاکی ئەو سەردەمە ناودەبرا، لە هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکاندا سوپای ئەڵمانی کە گەورەترین سوپا بوو بەرەو خۆرهەڵات کەوتە جووڵە و بە باشی مەشق و خۆڕێکخستنی خۆی کرد بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆری ئەڵمانی (فریدریک باربارۆسا )و بە هاوکاری کوڕی دووەمی (فریدریک) میری سوابیا، (باربارۆسا) لە هەڵمەتی دووەمدا بەشداری کردبوو، بۆیە ئاکامەکانی هەڵمەتی دووەم کاریگەری لە سەری دروستکردبوو، سوپاکەی لە وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەڵاتدا لە لایەن دانیشتوانی گوندەکان و چەتە بلغار و حزبەکانەوە ڕووبەڕووی ناڕەحەتی بووەوە، کاتێ سوپاکەی گەیشتە ئەدەنە لەوێ تا کۆتایی مانگی مارسی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) مایەوە، پاشان بە هاوکاری پاپۆڕەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی پەڕیەوە بۆ وشکانی ئاسیا.[3]

## هەڵوێستی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بەرامبەر سوپای ئەڵمان

یەکەم پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆری ئەڵمانی و بیزەنتی (اسحاق ئەنجیلیوس) ئەو کاتە بوو کە ئیمپراتۆری ئەڵمانی هەستا بە کۆکردنەوەی سوپا، بەمجۆرە

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص ١٧٧.

(٢) - د. اسمت غنيم: الدولة الايوبية والصليبيون، دار المعرفة، القاهرة، ١٩٨٨، ص٤٧.

(٣) - ه- ١- ل، فشر: تأريخ اوروبا "العصور الوسطى" ق١، ت- السيد الباز العريني وسيد مصطفى زياده، دار المعارف مصر، القاهرة، ص١٨٧.

ئیمپراتـۆری بیزەنتـی بـاڵوێزێکی نـارد بـۆ ئەڵمانیـا بـۆ ئەوەی بەیەکەوە پەیمانێـک ببەسـتن و کـار بکەن بـۆ پەڕینەوەی سـوپای ئەڵمانیـا بە خـاکی بیـزەنتەدا،[1] لەگەڵ ئەوەشـدا بیزەنتیەکـان هەسـتی دوژمنکاریـان بەرامـبەر ئەڵمانەکـان هەبـوو، ئەویـش لەبەر ئەم هۆیانە:

١. بە تێڕوانینی بیزەنتەکان بۆ نازناوی ئیمپراتۆری لە دوای (شارلەمان) لە ساڵی (٨٠٠ز)کە لە لایەن پاپا (لیوی سێیەمەوە) کرا بە ئیمپراتور، کەسی تر ئیمپراتـۆر نیە تەنها ئیمپراتۆری بیزەنتە نەبێت.[2]

٢. هاوپەیمانی نێوان ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی (فریدریک باربارۆسا) و نۆرمانەکانی صقلیە کە دوژمنی ئیمپراتوریەتی بیزەنتە بوون.[3]

٣.هاوپەیمـــانی بیزەنتەکـــان لەگەڵ (ســـەلاحەددیندا)، لە بەرئەوەی بیزەنتەکـــان چاویان بڕیبووە ئەوەی سەلاحەددین پاش دەرکردنی خاچییەکان جێگە پیرۆزەکانی شاری قودسیان بداتێ.[4]

٤. هەڵوێسـت وەرگـرتن لە (فریـدریک باربارۆسـا) کـاریگەری زۆری هەبـوو لە ڕەفتاری کاتی هەڵمەتی سێیەمیدا.[5]

لە ئەنجامدا ئیمپراتۆری بیزەنتی کەسێکی نارد بۆ لای سەلاحەددینی ئەیوبی بۆ ئەوەی هەواڵـی گەیشـتنی هێـزی ئەڵمـانی بـۆ ئەدەنەی پـێ ڕابگەیەنێـت، هەروەهـا پەیمانیدا بە سەلاحەدین نەهێڵێت سوپای ئەڵمانیا تێپەڕێت بۆ ئەنادۆڵ، بەڵام بەهێزی سوپای ئەڵمانیا بیزەنتیەکانی ناچار کرد تا وشکانی ئاسیا هاوکاری سوپاکە بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتۆری بیزەنتـی قۆناغەکانی جموجـۆڵی هێزەکانی ئەڵمانیـای بە بەردەوامـی بە سـەلاحەددین دەگەیانـد،[6]هەرچەنـدە بـۆ خەمڵانـدنی هێـزی سـوپای ئەڵمانیا هەموو سەرچاوەکان کۆکن لەسەر زۆری و کامڵی و بە هێزی و مەشـق و ڕێکخسـتنی سـوپای ئەڵمانیـا، بەڵام سـەرچاوەکان لەسـەر ژمـارەی سـوپاکە ڕا جیـاوازن، هەنـدێک لە سـەرچاوەکان بە (١٠٠- ٣٠٠) هەزار سـەرباز خەمڵانـدویانە،

---

(١) - رانسیمان: هەمان سەرچاوە، ج٣/ص٢٣.

(٢) - د. اسمت غنیم: هەمان سەرچاوە، ص ٤٨.

(٣) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ص ٨١٣

(٤) - د. عاشور: م.ن،ج ٢/ص ٨١٣

(٥) - أبو شامة: الروضتین في اخبار الدولتین النوریة والصلاحیة، ج٢/ص١٥١.

(٦) - رانسیمان: م.ن،ج ٣/ص٣٢؛ عاشور: م.ن،ج ٢/ص٨١٢.

بەلام زۆربەی سـەرچاوەکان بە (١٠٠-١٥٠) هەزار دەیخەملێـنن، ئەمەش خەملاندنێکی پەسەندکراوە.[١]

پاش ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا بە تەواوی پەڕینەوە بۆ کەناری خۆرهەلاتی دەردەنیل، لە کۆتایی مانگی مارسی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) بە هاوکاری بیزەنتەکان گەیشتنە وشکانی، لەگەڵ چەند گۆڕانکاریەکدا، بەهەمان ڕێگەدا ڕۆیشتن کە هەڵمەتی دووەمی خاچییەکانی پێیداتێپەڕ بوو، ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەو بەشەی ڕێگەکەیە کە خاکی سوڵتانی سەلجوقیە ڕۆمەکان بوو، ئەم ڕێگەیە لە پاش دەردەنیلەوەیە لە کەناری دەریاوە کە خاکی ڕومە بیزەنتیەکانە،[٢]دەست پێدەکات تا دەگاتە شاری ئەفیسوس لە باشووری شاری ئەزمیر، دانیشتوانی ناوچەکە لەبەر رق وکینە هێرشیان دەبردە سەر بەشی کۆتای سوپاکە،[٣]ئەمەش وایکرد ئیمپراتۆر فردریک لە دژیان چەند هەنگاوێ بنێ و سزایان بدات، سەرباری ئەو هێرشانەی ڕووبەڕووی بووەوە هێزەکە بەردەوام پێش دەکەوت، ئەمەش بەهۆی سەرکەوتنی تەواوی بەسەر هێزی سەلجوقیەکاندا کە نەیانتوانی ڕێگە بگرن لە هێزەکانی ئەڵمانیا، سەرکردەکانی سەلجوقیە ڕۆمەکان چەند نەخشە و پلانێکیان دانا بۆ هێرش بردنەسەر سەرگەردانەکان (ئەوانەی هاتبوون و داوای خواردنیان دەکرد)، هەرچەندە نەخۆشی بلاو بویەوەو چەندین زیانی گەورەی بە سوپای ئەڵمانی گەیاند، لەگەڵ ئەوەشدا سوپاکە بەردەوام بوو لە پێشکەوتنیدا تا گەیشتە شاری قونیەی پایتەختی دەوڵەتی سەلجوقیە ڕۆمەکان، لەوێدا ڕووبەڕووی هێزەکانی (قطب الدین ملکشای) دووەمی کوڕی سوڵتان (قلج ئەرسەلانی دووەم) بوونەوە،شەڕێکی قورس لە نێوانیاندا ڕوویدا، تیایدا هێزەکانی ئەڵمان لە (٥٨٦ک/ ١١٩٠ز) توانیان هێزی سەلجوقیەکان بشکێنن و بچنە شارەکەوە،ماوەیەکیش لەوێ مانەوە و هێزەکەیان دووبارە ڕێکخستەوە و پاش (٥) ڕۆژ بەجێیان هێشت و بەرەو (قرمان) چوون و توانییان بگەنە ئەوێ، لە (قرمان) هێزەکە بە نێو دۆڵ و گەروەکانی شاخەکانی تۆرۆسدا تێپەڕ بوو، بەبێ ئەوەی ڕووبەڕوی هیچ بەرەنگاربوونەوەیەک

(١) - د. اسمت غنیم: م.ن، ص٤٩.
(٢) – عاشور: س-پ، ج٢/ص٨١٢ .
(٣) – ئاراس زەینەل: س-پ، ل٢١٥.

بێتەوە،[1] پاشان بەرەو باشوور کەوتەڕێ هەتا لە مانگی حوزەیران چووە ناو دەشتی سلۆڤیا کە دەکەوێتە کەناری باکوری دەریای سپی ناوەڕاست، لێرەدا ئیمپراتۆر (فریدریک باربارۆسا) لەگەڵ هێزە تایبەتەکەیدا پێش سوپاکەی کەوت و بەرەو شاری سلوقیە بەڕێکەوت تا گەیشتە ڕووباری (کالیکادنوس)، کاتێ ویستی بپەڕێتەوە تیایدا نوقم بوو پاش ئەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا چوونە ناو ناوچەی ئەرمنینیای بچووکەوە (کە دانیشتوانەکەی ئەرمەن بوون و خزمەتی کارگێری زۆریان بەو شوێنە کردبوو)،[2] مێژوونوسان باس لەو ترس و دڵە ڕاوکێیە دەکەن کە تووشی موسڵمانان بوو، کاتێک موسڵمانەکان بیستیان ئیمپراتۆر بەربەرۆسا بە سەرکردایەتی زیاتر لە (١٠٠) هەزار خاچی بۆ ڕزگارکردنی شاری قودس گەیشتوەتە ئەرمینیا، (سەلاحەددین) بۆ خۆی تووشی بارێکی دەروونی خراپ هات، ئەوکات بڕیاریدا بە ڕووخاندنی شورای (طبریە، یافا ، ارنون ، قیساریە ، صیدا و جبل) و گواستنەوەی دانیشتوانەکەی بۆ شاری بەیروت.[3]

(باربارۆسا) لە کاتی پەڕینەوەی لە دەریای (کالیکادنوس) لە ئەرمینیا خنکا، لەم بارەیەوە چەند گێڕدراوەیەک هەیە هەندێکیان دەڵێن (لە کاتی پەڕینەوەیان خۆی هەڵداوەتە ناو ئاوەکە چونکە زۆر گەرمای بووە)، بەڵام رای دووەم دەڵێت (ئەسپەکەی فڕێی داوەتە ناو ئاوەکە و بەربەرۆسا جل وبەرگی جەنگی لە بەردا بووە کە زۆر قورس بوون بەو هۆیەشەوە خنکاوە)، بەڵام گێڕانەوەی سێیەم دەڵێت (لە کاتی مەلەکردن خنکاوە)،[4] بە هەرحاڵ مردنی خاڵێکی گرنگ بوو بۆ سەر دەروونی موسڵمانان، پاش مردنی ئیمپراتۆر کوڕەکەی بەناوی (فردریک) کە پێشتر میری (سوابیا) بوو سەرکردایەتی سوپاکەی گرتە ئەستۆ، ئەو سوپایەی بڕوای بە سەرکردایەتی ئیمپراتۆر (فریدریک باربارۆسا هەبوو)، ئەو هەموو ماوەیەی بڕی هەر لە کاتی هاتنیان تا مردنی ئیمپراتۆری ناوبراو، بەڵام جگە لە بەرگری کردنی سەرما و گەرما و هیلاکی و نەخۆشی و برسێتی تا ئەو کاتە نەگەشتبوونە ئامانجەکەیان[5].

---

(١) - أبن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال، القاهرة، ١٩٧٥،ج ٢/ص ٣١٩

(٢) - د. اسمت غنيم: هەمان سەرچاوە، ص٥٠

(٣) - ابن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، ص ١٢٣.

(٤) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە، ص،ج ٢/ ص٨١٨

(٥) - رانسيمان: م.ن،ج ٣/ص ٤١.

هەمـوو ئەم هۆكـارانە پـێكەوە ورەی سـەركردەی نـوێی ڕووخانـد و نەیتـوانی دەسـەڵاتی بەسـەر ئەم سـوپا ماندوەدا بشـكێت، بۆیە دەبینین هەندێ لە میرەكانی لەگەڵ سـەربازەكانیان گەڕانەوە بـۆ ئەوروپـا،[1] بەم شـێوەیە سـوپای ئەڵمـانی كەم بووەوە، هەندێكیشیان لە سلوقیە بەجێمـان،[2] میری نـوێ سـەركردایەتی پاشماوەی ئەو سـوپایەی كـرد و بەرەو وڵاتـی (شـام) ڕۆیشـت بـێ ئەوەی بیـر لە خـواردن و پێداویسـتی ئەم سـوپایە بكـاتەوە، ئەمەش بـوو بە هـۆی برسـێتی و بڵاوبـوونەوەی نەخۆشی و كەمبوونەوەی ژمارەیـان،[3] پێش ئەوەی میر فردریک پێشڕەوی بكـات بەرەو ئەنتاكیا هێزەكەی دابەشكرد بۆ سێ گروپ هەتا بە ئاسانی ڕێ ببڕن، كاتێک گروپی یەكەم بە ژێـر قەڵای بەفراسـدا تێپەڕین هێـزی موسـڵمانان هێرشـیان كـردە سـەریان و (٢٠٠) سـەربازیان لـێ گـرتن، دواتـر نامەیـان نـارد بـۆ وڵاتـی شـام كە سـوپای ئەڵمانیـا هێـزی سـوارەی زۆر كەمە، هاوكـات برسـێتی و نەخۆشـی بـوو بە بەشـیان و هـیچ توانایەكیـان نەمـا، هەروەهـا چەكیشـیان كەم بـوویەوە، ئەمەش بـۆ خۆی چاكترین هاندان بوو بۆ ورەی موسڵمانان، پاش گەیشتنی هەواڵ بە میرەكانی شام هێزێكیان ڕەوانە كردە سەریان و ژمارەیەكی زۆریان لـێ كوشـتن و (٥٠٠)یـان لــێ گــرتن، لەو كــاتەدا ســوپای ئەڵمــان كەوتەڕێ بەرەو شــوێنێک كە پێــدەوترا (مینان)،[4] لەوێ فەرماندەكەیان توشی نەخۆشیەكی سەخت هـات كە بـووە ڕێگـر بـۆ پێشڕەوی زیاتری سوپاكە، هەروەها خراپی بـارودۆخی سـوپاكەی وایكـرد كە خـۆی و پاســەوانە تایبەتەكـانی و نـزیكەی (٧٠) سـوار لەگەڵ چەنـد تیماركەرێكـدا بەرەو ئەنتاكیـا بـڕۆن و لەوێ بمێـننەوە تـا چـاک دەبێـتەوە، بـۆ ئاسـانكردنی ڕۆیشـتنی ســوپاكەی هەســتا بە دابەشــكردنی بــۆ ســێ بەش، پاشــان یەک لە دوای یەک كەوتـنەڕێ،[5] پـاش ئەوەی گەیشـتنە نزیـک ڕووبـاری (عاصـی) لە ناویانـدا پەتـا بڵاوبـوویەوە كە بـوویە هـۆی زیـانێكی زۆر،[6] ئەمە وایكرد نەتـوانن بگەنە ئەنتاكیـا، پـاش ئەوەی (فریـدریک) چـاک بـوویەوە بە سـوپاكەیەوە كە نـزیكەی چەنـد هەزار سەربازێک دەبوو گەیشت.

---

(١) - عاشور: س-پ،ج٢/ص٨١٩.

(٢) - رانسیمان:س-پ،ج٣/ص٤٢.

(٣) - د. درید عبدالقادر: سیاسة صلاح الدین في مصر والشام والجزیرة، ص٣٢٥.

(٤) - ابو شامە: هەمان سەرچاوە،ج ٢/ص ١٥٦.

(٥) – ئاراس زەینەل: س-پ ، ل٢١٨.

(٦) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ص ٨١٨.

## هەڵوێست و کاردانەوەی موسڵمانان

هەواڵی سوپای خاچییەکان بەردەوام دەگەیشتە سەرکردە ئیسلامیەکان، بەتایبەت ئەو بەشەی کە لە سوپای ئەڵمانی پێکهاتبوو کە پێش بەشی دووەم کەوتبووە ڕێ و لە وشکانیەوە دەستی بە جوڵە کردبوو، زۆری ئەم سوپایە کاریگەری هەبوو لەسەر هەردوولا (خاچییەکان و موسڵمانان) لە ناوچەی عەککا، چونکە لە لایەکەوە ورەی خاچییەکانی بەرزکردەوە لە لایەکی ترەوە کاریگەری هەبوو لەسەر بیرکردنەوەی سەرکردە و جەنگاوەرە ئیسلامیەکان، بەڵام باوەڕی سەرکردایەتی ئیسلامی و توانا و وزەی ناوچەی ئیسلامی وایکرد بالانسی خۆی لەدەست نەدات و لەسەر هەڵوێستی خۆی بمێنێتەوە و هەموو توانایەکی بخاتەگەڕ بۆ بەرگری کردن لە ناوچە ئیسلامیەکان لە خۆرهەڵات،[1] هاوکات موسڵمانان هەستیان بە مەترسی هێرشی خاچییەکانیان دەکرد لە هێرش هێنانە سەر وڵاتی شام کە لە دوو لاوە ئەگەری هێرش بردنە سەری هەبوو:

١. بەرەی باکوور- ئەو بەرەی سوپای گەورەی ئەڵمان هێرشی بۆ دێنێ، بۆیە دەسەڵاتی ئیسلامی هەستی بە مەترسی بارودۆخی میرنیشینە ئیسلامیەکانی باکووری وڵاتی شام کرد ئەگەر بێتو سوپای ئەڵمانی بگەنە ئەو ناوچە.

٢. بەرەی خۆرئاوا- ئەویش بەرەی دەریایە کە هەردوو سوپای فەڕەنسی و ئینگلیزی بە و ئاڕاستەیە دەڕۆن، لەگەڵ ئەوەشدا مەترسی ئەم تەوەرە وەک تەوەرەی یەکەم هێندە نەبوو.[2]

سوڵتان (سەلاحەددین) پاش بەراوردکردنی هێزی هەردوولا گەیشتە ئەو ئاکامەی بارودۆخی ئیسلامی ترسناکە ئەگەر وڵاتی شام لە دوو لاوە ڕووبەڕووی هێرش ببێتەوە،چونکە لەم بارەدا پێویست بوو هێزە بەرگریکارانی لە زیاتر لە بەرەیەکی جەنگدا دابنرێن، بەمەش هێزی موسڵمانان لە هەموو خاڵەکاندا لاواز دەبوون لە بەرئەوە پێویست بوو لەم بارودۆخەدا هێزی گەورەی ئیسلامی سەر بەسنوری (سەلاحەددین) کۆبکرێتەوە و پەیوەندی بکرێت بە هێزە موسڵمانەکانی ترەوە و داوای یارمەتیان لێ بکەن[3].

---

(١) - د.درید عبدالقادر نوری:س-پ،ل٣٢٥.

(٢) - د. نظير حسان سعداوي: التأريخ الحربي المصري، ص٢٥٢- ٢٥٣.

(٣) - محمود ياسين احمد: الايوبيون في شمال الشام والجزيرة، ص٢٥٧.

چـونکە ئەگەر ئەم سـوپایە پـێکەوە کۆنەبونـایەتەوە ئەوا هێـزە خاچییەکـان بە ڕێژەیەکی بەرچاو بەسـەر هێزی ئیسـلامیەکاندا سـەردەکەوت، لێرەوە مەترسـیەکی گەورە هەبـوو لەوەی خاچییەکـان بتـوانن ئەو ناوچـانەی لە شـەڕی حەتینـدا لە دەستیاندا بوو بیهێننەوە ژێر رکێفی خۆیان، سـەرکردایەتی ئیسـلامی توانـای خۆی لەسـەر بنەمـای گفتوگۆ کـردن و سروشـتی نـاوچەکە و هێز و چەکی هەردوولا و کەش و هەوا بینـا دەکرد... لەگەڵ ئەوەشـدا زۆرجار چەند هۆکارێک دێنە پێشـەوە هەرگیـز لەبەرچـاو نەگیـراون و کاریگەرییـان دەبـێ لەسـەر ئاکـامی شـەڕ و بە ئاڕاستەیەکی تردا دەیبەن،[١] ئەم بارەش لای هێزی ئیسلامی مەترسیدار بوو چونکە دەترسا لە گەیشتنی هێزی گەورەی ئەڵمـانی کە بەرەو وڵاتـی شـام بەڕێ کەوتبوو، ئەگەر چی بە هۆی لەبەرچاو نەگرتنی هەندێ هۆکار ژمارەیەکی کەمیان گەیشـتن،[٢] و ئاکامی هەڵمەتەکە بە تەواوی گۆڕا، لەسـەر ئەم بنەمـایە سـەرکردایەتی ئیسـلامی چەند هەنگاوێکی نا بۆ بەرەنگار بوونەوەی دۆخەکە:

١. سوڵتان سەلاحەددین هەستا بە ناردنی چەنـد سـیخوڕێ بـۆ نـاوچەی ئەنادۆڵ بـۆ چـاودێری کردنـی پێشـکەوتنی سـوپای ئەڵمـانی و نـاردنی هەواڵ سـەبارەت بە بـارودۆخی کـارگێڕی و جەنگیـان،[٣] ئەمە جـگە لە و زانیاریـانەی لە سـەرچاوەی دیـکەوە پێـی دەگەیشـت ئەویـش ئیمپراتـۆری بیزەنتـی بـوو کە هاوپەیمـانی لەگەڵـدا هەبوو، هەروەهـا میرە ئەرمەنەکان کە ڕقیـان لە هێزەکانی ئەڵمانیا بوو، بەمجۆرە سوڵتان سەلاحەددین بە تەواوی بەئاگا بوو لە جموجۆڵی سوپای ئەڵمانی.

٢. پاش ئەوەی سوپای ئەڵمانیا گەیشتە ئەنادۆڵ سوڵتان سـەلاحەددین هەسـتا بە ناردنی قازی(ئیبن شداد) بۆ لای میرنیشینی جەزیرە و دەوروبەری تـا مەترسـیداری بارودۆخەکەیـان پێ ڕابگەیەنێت، دواتـر نـاردی بـۆ لای خەلـیفەی عەبباسـی تـا لەو قەیرانە ئاگاداری بکاتەوە.

٣. سـوڵتان سـەلاحەددین فەرمانـدەکانی کـۆکردەوە بـۆ وەرگرتنـی ڕاو و بۆچوونیان سەبارەت بە هێرشبردنە سەر هێزە ئەڵمانیەکان پێش هاتنیان بۆ عەککا، بەڵام لەبەر لاوازییان بڕیاریاندا ئەم هێرشە ئەنجام نەدەن.[٤]

---

(١) - د. اسمت غنیم: م.ن، ص٥٢.

(٢) - رانسیمان: م.ن.ج ٣/ص٤٢.

(٣) - د. دردید عبدالقادر: س-پ، ل٣٢٥.

(٤) - أبن الأثیر:م.ن.ج٩/ص٢٠٧.

٤. گەڕانەوەی هێزی ئەو میرنیشینانەی کە سوپای ئەڵمانی پیا تێپەڕ دەبێت بۆ بەرگری کردن و خەریک کردنی سوپای ئەڵمانی تا عەککا لەو قەیرانە ڕزگار دەبێت.[١]

## هەڵوێستی سەربازگەی خاچپیەکان

هێزی خاچپیەکان بە هۆی هێرشی بەردەوامی هێزە موسڵمانەکانەوە باری کارگێڕییان تێکچوو، لە بارودۆخێکی زۆر پشێوو ناهەمواردا بوون، هاوکات بە تەواوبوونی زستانی ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) هێزە موسڵمانەکان بارودۆخیان زۆر چاک بوو، بە تایبەت دوای گەڕانەوەی هێزەکانیان بۆ گەمارۆدانی هێزە ئەڵمانیەکان، هەروەها تێکچوونی کەش و هەوای ناوچەکە بویە ڕێگر لە گەیشتنی کەشتیگەلی خاچپیەکان بۆ شاری عەککا و تەنها ژمارەیەکی کەمیان توانییان بگەن،[٢] سەرکردە موسڵمانەکان توانییان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانیان و هاوکاری کردنی گەمارۆدراوەکان بە پێشکەشکردنی خواردەمەنی و تەقەمەنی هەندێ بەلەم ڕەوانەی عەککا بکەن، بەڵام سەبارەت بە خاچپیەکان لە زستانی ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) بارودۆخیان زۆر بە خراپی تێکچوو بە شێوەیەک برسێتی و نەخۆشی ڕووی کردبووە سەربازگەکانیان، ئەمەش بووە هۆی مردنی زۆر لە سەربازەکانیان، سەرەڕای کوشتارێکی زۆر لە ڕیزی خاچپیەکان، بەڵام بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و برسیەتی هۆکارێکی زۆر گرنگ بوو بۆ تێکچوونی باری دەروونی سوپای خاچپیەکان[٣].

هەرچەندە لە لایەن سوپای فەڕەنسی و ئینگلیزیەوە یارمەتی و هاوکاریان بۆ دەهات، بەڵام سەرنەکەوتنی هێرش و پەلامارەکانیان بۆ سەر شاری عەککا بۆ خۆی خاڵی گرنگ بوو لە تێکچوونی بارودۆخی کارگێڕیان و بڵاوبوونەوەی برسێتی و نەخۆشی، هەرچەندە لەو بارودۆخەدا سوڵتان (سەلاحەددین) نەخۆش کەوت،بەڵام لەگەڵ فەرماندە و سەرکردەکانی کۆبوونەوەی کرد بۆ هێرشبردنە سەر خاچپیەکان، (سەلاحەددین) پابەند بوو بە ڕا و بۆچوونی سەرکردەکانی بە

---

(١) - أبن شداد: م.ن، ص ١٢٦.

(٢) - رانسيمان: م.ن، ص،ج٣/ص٦٨.

(٣) - محمود ياسين:م.ن، ص٢٥٨.

پەلەنەکردن لە هێرشبردنە سەر خاچییەکان، بۆ ئەوەی هەموویان لە بەرامبەر شاری عەککا کۆببنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی بەدەست بهێنن، چونکە موسڵمانان لە سەرکەوتندا بوون و بە پێچەوانەوە خاچییەکان لە شکستدا بوون و ئەمەش باشترین هەل بوو بۆ موسڵمانان،[1] هاوکات لە ڕێی دەریاوە کەشتیەکی خاچی گەیشتە ناوچەکە کە (٣٠٠) ژنی زۆر جوانی ئەوروپی تێدا بوو، (عماد الکاتب) زۆر بە جوانی باسی ئەم بابەتە دەکات، خاچییەکان ئەوەیان وەک چەکێکی دەروونی لە دژی موسڵمانان بەکارهێناو لە نزیک سەربازگەی موسڵمانان نیشتەجێ بوون، هاوکات هەندێکیان چوونە ناو شاری عەککا بۆ بڵاوکردنەوەی خراپە و بەرەڵڵایی و سەرنج ڕاکێشانی گەنجان و لاوان تا توانای شەڕیان نەبێت، چونکە ئەو کاتە شەڕ لەسەر هێز بوو، ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیە کە خاچییەکان لە جەنگدا دژی موسڵمانان (جنس)یان بەکارهێناوە.[2]

## سوپای فەڕەنسی و ئینگلیزی

بەشی دووەمی سوپای خاچییەکان پێکهاتبوو لە هەردوو سوپای فەڕەنسی بە سەرکردایەتی پاشا (فیلیب ئۆگستس) و سوپای ئینگلیزی بە سەرکردایەتی پاشا (ریتشارد شێردڵ)، هەردوو سوپا لە هاوینی ساڵی (٥٨٦ک/١١٩٠ز) لە بنکە سەرەکیەکانیانەوە لە ڕێی دەریاوە بەڕێکەوتن، سوپای فەڕەنسی لە جەنەوە و، سوپای ئینگلیز لە مرسلیاوە بەڕێکەوتن، هەردوولا لە دورگەی (صقلیە) یەکیانگرتەوە، سەرەڕای بوونی جیاوازی و ململانێ و ناکۆکی نێوانیان بەهۆی ئەو قەیرانەی لە خۆرهەڵات تێی کەوتبوون، بەڵام بۆ ماوەیەکی کاتی هەموو ئەو کێشانە خرانە لاوە، هەردوو سوپا لە دورگەی (صقلیە) زستانیان بەسەر برد، چونکە کەش و هەواکەی خۆش بوو،[3] لە ئەنجامی ئەم مانەوەدا کە نزیکەی (٦) شەش مانگی خایاند زۆر لە سەربازەکانیان ڕیزی سوپاکانیان بەجێهێشت بۆ خۆ گەیاندن بە شاری عەککا، بە تایبەت ئەندامانی سوپای فەڕەنسی، سەرهەڵدانەوەی کێشە

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص ١٧٨.

(٢) - الفتح القسي في الفتح القدسي، ص٢٢٨- ٢٢٩.

(٣) - د. عاشور: م.ن،ج ٢/ ص٨٣٠.

کۆنەکانی نێوان پاشاکانیان بوو بە هۆی کێشە و ململانێی نێوان سەربازەکان،[1] هاوکات کردەوەکانی ریتشارد بوونە هۆی ئەوەی (فیلیب ئوگستس) دورگەکە بەجێ بهێڵێت و لەگەڵ سوپاکەی بەرەو عەککا بەڕێکەوێت، لە کۆتایی مانگی ئازاری ساڵی (٥٨٧ک/١١٩١ز)دا (فیلیپ ئۆگستس) و سوپاکەی گەیشتنە شاری (صور)،[2] دواتر لەگەڵ میری ئەو شارە (کونراد) بە سوپایەکی چەند هەزار کەسیەوە کە بە (٦)شەش کەشتی گوێزرانەوە خۆیان گەیاندە سەربازگەی خاچییەکان لای شاری عەککا، خاچییەکان چاوەڕوانی ژمارەیەکی لەوە زیاتریان دەکرد.[3]

گەیشتنی پاشا (فیلیب ئۆگستس) بۆ سەربازگەی خاچییەکان لە ڕووی دەروونیەوە کاریگەری زۆری لەسەر شەڕکەرەکانی هەردوولا هەبوو،[4] بە تایبەت لەسەر خاچییەکان کە زۆر ورەیان بەرزبوویەوە، هاوکات کاریگەری سلبی لەسەر دەروونی سوپای موسڵمانان هەبوو چ ئەوانەی لە ناو شارەکە بوون یان دەرەوە، (فیلیب) دوای گەیشتنی بۆ سەربازگەی خاچییەکان ویستی ئەو هەلە بۆ خۆی بقۆزێتەوە و پێشنیاری کرد تا کاتیان بەشەڕ کردن لەگەڵ موسڵمانانی دەرەوەی شار نەکوژن، بەڵکو هێرش بەرنە سەر شاری عەککا و داگیری بکەن، ئەمەش هاندانێکی دەروونی چاک بوو بۆ خاچییەکان کە لەو ماوەدا بەرامبەر موسڵمانان زۆر شەڕیان دۆڕاندبوو، بۆیە هەموو کەرەستەکانی گەمارۆیان ئامادەکرد بۆ لێدانی شاری عەککا، بەشە و و ڕۆژ بەبێ وەستان کەوتنە پڕکردنەوەی خەندەقەکەی نێوانیان بە لاشەی کوژراوەکانیان و ئاژەڵەکان، بەڵام هێزی بەرگری عەککا نەیدەهێشت ئەو کارە سەربگرێت و کەوتنە چاککردنی خەندەقەکە.[5]

## هەڵوێستی موسڵمانان

سوڵتان (سەلاحەددین) لەگەڵ سەربازەکانی کەلە ناوچەی (شغرعم)ی باشووری (تل الفخار) بوون، بە هۆی ئەم هۆکارانەوە باری دەروونی سەربازەکانی زۆر خراپ بوو.

---

(١) - ارنست باركر: الحروب الصليبية، ص٨٩.

(٢) - د. قاسم عبده قاسم: م،ن، ص١٤٥.

(٣) - أبن واصل: هەمان سەرچاوە، ص،ج ٢/ص ٣٤٩.

(٤) - د. خاشع المعاضيدي واخرون: م،ن، ص١٧٩.

(٥) - نظير حسان سعداوي:م.ن، ص ٢٥٣.

١. پاشای فەرەنسی گەیشتە سەربازگەکانی خاچییەکان.
٢. درێژخایەنی ماوەی شەڕەکان و دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە شوێنەکانی خۆیان.
٣. هاتنی وەرزی زستان و خۆئامادە نەکردن بۆ ئەم وەرزە لە لایەن موسڵمانەکاوە.

ئەمەش (سەلاحەددینی) ناچار کرد ڕێ بدات بە هەندێکی لە هێزەکانی هەتا بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان هەتا هاتنی وەرزی بەهار و خۆئامادەکردن بۆ جیهاد، گرنگترین ئەم هێزانە هێزەکانی (میرنیشینی موسڵ، میرنیشینی جەزیرە و میرنیشینی سنجار) بوون،[1] بێگومان ئەم هێزانە ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو، چونکە بڕبڕەی پشتی سوپای (سەلاحەددین) بوون، هاوکات جەنگاوەری بە توانا و لێهاتوویان هەبوو، سەرەڕای ڕێکخستنی ڕیزەکانیان، سەلاحەددین هەموو ڕۆژ لەگەڵ هێزەکانی دەچوو بۆ شەڕی خاچییەکان و خەریککردنیان بە مەبەستی دورکەوتنەوەیان لە شاری عەککا،[2] بەڵام هەوڵەکانی بێ ئاکام بوو، بۆیە بڕیاریدا بە گواستنەوەی هێزەکانی بۆ (تل کیسان) بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە گۆڕەپانی جەنگ، هەروەها سەلاحەددین فەرمانیکرد بە میری بەیروت (اسامە مستحفط) هەتا لە دەریاوە ڕێ بە خاچییەکان ببڕێت، لەگەڵ چوونەناو دەریا تووشی (٥) کەشتیگەل بوو کە سوپای ئینگلیزی دەگواستەوە بۆ شاری عەککا، لە شەڕێکی گەورەدا موسڵمانان توانییان دەستبگرن بەسەر هەموو سەرباز و شمەکی گەشیتگەلەکەدا، ئەو هێزانەش کە گەڕابوونەوە شوێنەکانیان لە سەرەتای وەرزی بەهاردا لە هەموو لایەکەوە دووبارە پەیوەندیان کرد بە سوپای سوڵتان سەلاحەددینەوە، بەم شێوەیە بەرەی تێکۆشانی موسڵمانانەوە بە سەرکردایەتی (سەڵاحەددین) بەهێزتر بوو.[3]

## سوپای ئینگلیزی

دوای بەرێکەوتنی سوپای فەرەنسی، (ریتشارد شێردڵ) بەرامبەر ڕای گشتی مەسیحی شەرمەزار بوو، چونکە چاوەڕوان دەکرا پێش هەموویان بگاتە وڵاتی

---

(١) - المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق، محمد مصطفى زيادة، القاهرة، ١٩٣٩، ج١/ص ١٠٥.
(٢) - أبن الأثير: الكامل،ج ٩/ص ٢١٣.
(٣) - ابن واصل: هەمان سەرچاوە، ج ٢/ص ٣٤٩- ٣٥٠.

شـام، بـۆیە ناچـار بـوو لە مـانگی نیسـانی (٥٨٦ک/١١٩٠ز)دورگەی صـقلیە بەجـێ بهێڵێـت و لە دورگەی (قبـرص) دابەزێ و تـوانی داگیـری بکـات، بەمەش شـاری عەککـای لە بیرکـرد، دوای چەنـد ڕۆژێـک وەفـدێک گەیشـتە دورگەکە کە چەنـد سەرکردەیەکی تێدابوو، لە سەروو هەموویانەوە پاشا (جای لوزجنان) کە نوێنەری بەرەی ئۆپۆزسیۆن بـوو لە دژی میـر (کونراد مونتغیرات) میـری صـور کە لەگەڵ (فیلیـپ ئوگسـتس) بە مەبەسـتی بـردنەوەی لایەنگـری ریتشـارد ڕێکەوتبـوو، [١] بەم شێوەیە بەرەی خاچپیەکان بە ڕووکەش بوون بە دوو بەشەوە بۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجەکانیـان، بەڵام لە ژێـرەوە بـۆ بەدیهێنـانی بەرژەوەنـدیەکانیان یەک بـوون، سـوپای (ریتشـارد شـێردڵ) لە (٢٥) بەلەم پێکهـاتبوو لە سـاڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی (١٠) هەزار جەنگاوەر، لە ڕاستیدا گەیشتنی (ریتشـارد) کـاریگەری گەورەی هەبـوو لەسـەر ورەی خاچپیەکـان، هاوکـات بـارێکی دەروونـی قورسی لەسەر موسڵمانان دروست کرد. [٢]

## شەڕی عەککا

خاچپیەکـان لە دژی شـاری عەککـا هەمـوو شـێوازێکی جەنگیـان بە کارهێنـا، بە مەنجەنیـق و کبـاش بە شـەو و بە ڕۆژ لێیـان دەدا، بەڵام هـیچ ئاکـامی نەبـوو، بـۆیە بیریان لە ڕێگەیەکی نوێ کردەوە ئەویش دروستکردنی تەپۆڵکەی خۆڵی جووڵاو بـوو بـۆ پێشـڕەوی کـردن بەرەو شـاری عەککـا، ئەم ڕێگـایە سـەرکەوتوو بـوو و کـاریگەری ڕاستەوخۆی هەبـوو لەسـەر بەرگریکـارانی عەککا و بەرگریکـاران هـیچ شێوازێکیان نەبوو بۆ بەرپەرچدانەوەیان، [٣] خاچپیەکان بە گەشتنی سوپای ئینگلیز هەندێ هێرشیان کردەسەر موسڵمانان، بەڵام سـەرکەوتوو نەبوون، (سـەلاحەددین) هێرشـی دەبـردە سـەر سـەربازگەی خاچپیەکـان بـۆ دورخسـتنەوەیان لە گەمـارۆی شـاری عەککـا، بەڵام بە هـۆی گەرمـی نـاوچەکە هەردوو لا لە بەرەکـانی جەنـگ کشـانەوە، دوای مـاوەیەک خاچپیەکـان دووبـارە هێرشـیان بـردە سـەر هێـزی موسـڵمانان بەڵام بێ ئاکـام بـوو، لەو کـاتە "ریتشـارد شـێردڵ " فێڵـی لـێ کـردن بە

(١) - رانسیمان: م.ن، ج٣/ص ٩١.
(٢) - أبن الأثیر: الكامل، ج٩/ص ٢١٣.
(٣) – ئاراس زەینەل: س-پ ، ل٢٢٨.

ناردنی نوێنەر بۆ لای سەلاحەددین و دوای چەند ڕۆژێک لە کشانەوەی موسڵمانان خاچییەکان لای باکوورەوە لە کەناری دەریاوە هێرشیان کردەسەر شاری عەککا، کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتە سەلاحەددین دووبارە هێرشی کردە سەریان و شەڕ لە نێوانیاندا تا ئێوارە بەرپابوو دواتر هەردوولا کشانەوە،[1]بەهۆی زۆری ژمارەی خاچییەکان بە تایبەت لە دوای هاتنی (ریتشارد شێردڵ) و لاوازی بەرگری شاری عەککا و درێژخایەنی گەمارۆی شارەکە، هاوکات سەرکردە موسڵمانەکان بۆ دروخستنەوەی خاچییەکان لە شاری عەککا هیچ کارێکیان لە دەست نەدەهات، بەم شێوەیە بارودۆخی بەرگریکارانی شاری عەککا بەرەو خراپی هەنگاوی دەنا بە تایبەت دوای زۆربوونی ژمارەی خاچییەکان و شەڕ کردن لە دوو بەرەی جیاواز، بۆیە تای هێز بە لای خاچییەکاندا بوو، [2]جگە لە گەمارۆی شاری عەککا کە دوو ساڵی خایاند لە (٥٨٥- ٥٨٧ک/١١٨٩-١١٩١ز)دەبینین موسڵمانان لەسەر دەستی خاچییەکان تووشی قەیرانێکی خراپ هاتن، هەرچەندە (فیلیب ئۆگستس) پێش هاتنی (رتیشارد) بۆ ناوچەکە کەرەستەکانی گەمارۆی ئامادەکرد، بەڵام نەیتوانی لەو بارودۆخە ناسکە دەرچێ کە پێویستی بە سەرکردایەتی لێهاتوو و بەتوانا هەبوو بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەم قەیرانە کە نزیکەی دوو ساڵی خایاند تا هاتنی (ریتشارد شێردڵ) کە هەموو خەسڵەتەکانی سەرکردەی تێدابوو، هەر بە هاتنی توانی سەربازگەی خاچییەکان کۆنترۆڵ بکات و ببێتە سەرکردەی یەکەمی شەڕی عەککا، لە هەنگاوە یەکەمەکانی کە دوای بینینی هەڵوێستی گشتی لە هەردوولا بیری لێ کردەوە بە تایبەت دوای بەرگری کردنی موسڵمانان بۆ ماوەی دوو ساڵ بڕیاریدا بە:

١. توند و درێژکردنەوەی گەمارۆی سەر بەرگریکارانی شاری عەککا.

٢. هاندانی هێزی خاچییەکان بۆ شەڕکردن دژ بە بەرگریکارانی شاری عەککا بە هەموو هێز و توانایەکیانەوە.

سەرەتا بۆ سوود وەرگرتن لە کات و بێزارکردنی موسڵمانان کە ماوەی دوو ساڵ بوو لەو ناوچەکەدا شەڕیان دەکرد، ریتشارد ڕێگای گفتوگۆی لەگەڵ

---

(١) - أبن شداد: م.ن، ص١٦٢- ١٦٤.

(٢) - د.دريد عبدالقادر:س-پ،ل٣٢٩.

(سەلاحەددین) گرتەبەر، ریتشارد ئەمەی وەک چەکێکی دەروونی دژ بە موسڵمانان بەکارهێنا، هاوکات هێزە دەریاییەکانی هەموو ڕێگە دەریاوانیەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو، (ریتشارد) توانی بە بیانووی دانوستان و واژۆکردنی ڕێککەوتنامەی نێوان هەردوولا سەرکردایەتی گشتی موسڵمانان هەڵخەڵەتێنێت، (ریتشارد) بە گەیشتنی بۆ سەربازگەی خاچییەکان وەفدی نارد بۆ لای (سەلاحەددین) بە مەبەستی دانوستان، دوای چەند ڕۆژێک بە بیانوی نەخۆشی خۆی شاردەوە،[1] و تا مانگی تەمووزی ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) پەیوەندی پێوە نەکردن وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد مانەوەی ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە لە بەرژەوەندی (ریتشارد) بوو، چونکە دانیشتوان و بەرگریکارانی شاری عەککا لە درێژە کێشانی ئەم جەنگە بێزار بوون، هاوکات یارمەتی و هاوکاری بەردەوام دەگەیشتە ناوچەکە و لە خزمەتی (فیلیپدا) بوو بۆ هێرشبردنە سەر شاری عەککا، بەڵام (ریتشارد) قایل نەبوو بە بەشداری کردنی سوپای (فیلیب) لەم هێرشەدا،[2] فەرەنسیەکان هێرشێکی بە هێزیان بردەسەر شاری عەککا و توانییان کەلێنێ بکەنەوە، هەرچەندە موسڵمانان بەرپەچیان دانەوە و (١٥٠)یان لێ کوشتن،[3] بەڵام دانیشتوانی شاری عەککا تووشی حاڵەتێکی دەروونی خراپ هاتبوون، ناچار سەلاحەددین بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانە بڕیاریدا پەلاماری خاچییەکان بدات، هێزەکەی ئاگادار کردەوە لە بەردەوام بوونی هێرش و پەلامار، و بە شەویش هەڵمەتی دەبرد بۆ سەر سەربازگەی خاچییەکان،[4] دوا بە دوای ئەم بارودۆخە سوڵتان (سەلاحەددین) دوا ڕاپۆرتی شاری عەککای پێگەشت، تیایدا هاتبوو بەهۆی تێکچوونی بارودۆخیانەوە چیتر توانای بەرگرییان نەماوە، لە دوای (٨) ڕۆژ لەم کارە و تێکشاندنی هێرشی فەرەنسیەکان، (ریتشاردی) ئینگلیزی ئەو هەلەی بۆ خۆی قۆستەوە و کەوتە هێرش بردنە سەر شاری عەککا، بەڵام هێرشەکەی سەرکەوتوو نەبوو. [5]

---

(١) – ئاراس زەینەل: س–پ ، ل٢٣٠.

(٢) - عماد الكاتب: م،ن، ص٢٥٣.

(٣) - رانسيمان: م،ن،٣ج/ص ٩٦.

(٤) - عماد الكاتب:هەمان سەرچاوە، ص٢٥٤.

(٥) – ئاراس زەینەل: س–پ ' ل٢٣٠.

دوای ئەوەی فەرماندەکانی شاری عەککا بە تایبەت هەردوو میر (بها ، الدین قراقوش) و (سیف الدین بن مشطوب) لە چالاکیەکانی سەلاحەددین بۆ ڕزگار کردنی شاری عەککا و لەناو بردنی لەشکری خاچپیەکان بێ هیوا بوون، بیریان کردەوە لە بە دەستەوەدانی شارەکە بەپێی چەند مەرجێکی بەجێ، بۆئەم مەبەستە پەیوەندیان کرد بە (فیلیبی) فەڕەنسیەوە،[1] (ئیبن مشطوب) چوو بۆ بینینی (فیلیب) و وژاوکردنی ڕێککەوتننامە، بەڵام (فیلیب) لە ترسی فەرماندەکانی تری خاچپیەکان نەیتوانی لە گەڵیدا ڕێککەوێت، بۆیە(ئیبن مشطوب) بەبێ ئەنجام گەڕایەوە شاری عەککا،[2] سەرەڕای شکستی ئینگلیزەکان بەرامبەر شاری عەککا، بەڵام لە ناو شاری عەککا حاڵەتێکی دەروونی خراپ خەڵکەکەی داگرتبوو، زۆر لە میرەکان بە شەو هەڵدەهاتن، بۆیە سەرکردایەتی بەرگری شاری عەککا پەیوەندی کرد بە میر (کونراد) میری صور بۆ بە دەستەوەدانی شاری عەککا، لە ساڵی (٥٨٧ک/ ١١٩١ز) هەردوولا بەم شێوەیە ڕێککەوتن:[3]

١. بەدەستەوەدانی شاری عەککا بە هەموو شتێک کە تیایدایە وەک (بەلەم، چەک... هتد).

٢. پێدانی (٢٠٠) هەزار دینار بۆ خاچپیەکان و (١٤) هەزار دینار بۆ میر (کونراد)ی میری صور لە لایەن موسڵمانەکانەوە.[4]

٣. ئازادکردنی (١٥٠٠) دیلی خاچی کە لە ناو شاری عەککا بەندکرابوون.

٤. گێڕانەوەی (خاچی خاچان) بۆ خاچپیەکان، بەرامبەر بەوەی دانیشتوان و سەرباز و فەرماندەکانی شاری عەککا ژیانیان پارێزراو بێت، بە نوێنەرێک ئەم مەرجانەیان ڕەوانەی لای (سەلاحەددین) کرد ئەویش زۆر بە توندی بەرپەرچی دایەوە و پێی قایل نەبوو، هاوکات ئاڵای خاچپیەکان بەسەر شواری عەککادا شەکاوە بوو و ئەویش هیچی پێ نەدەکرا تەنها ڕازی بوون بەو بارە نەبێت کەببوو بە ئەمری واقع، گرتنی شاری عەککا دوای دوو ساڵ گەمارۆدانی بوو لەلایەن خاچپیەکانەوە، کە لەوماوەیەدا دانیشتوانەکەی بەرگری زۆریان کرد و لە بارودۆخێکی زۆر ناهەموار و ئاڵۆزدا بوون، لە ئەنجامی ئەم گەمارۆیەدا بە

---

(١) - أبن واصل: م.ن، ص،ج ٢/ ص٣٥٧.

(٢) - أبن خلدون: تأريخ أبن خلدون، مؤسسة جمال للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩،ج ٥/ص ٣٥٢.

(٣) - د. عاشور: م.ن،ج ٥/ص٣٢٥.

(٤) - أبن الأثير: الكامل،ج ٩/ص ٢٠٤.

هەزاران خاچی کوژران و بریندار و دیل بوون، ئەمە جگە لە نەخۆشی و برسێتی کە لە ناو ڕیزەکانی سوپای خاچییەکاندا بڵاوببووەوە، بۆ ئەم شەڕە تەنها ئەڵمانەکان لەشکرێکی(١٥٠)هەزار کەسیان هێنابوو بەڵام هیچیان لێ نەگەڕانەوە.[١]

لە ڕاستیدا کەوتنی شاری عەککا بەڵایەکی گەورەبوو بۆ سەر موسڵمانان کە بۆ ماوەی دوو ساڵ هەموو هەوڵ و توانایەکیان خستەگەڕ بۆ بەرگری کردن لەم شارە، بەڵام دەرئەنجامەکەی شکست و دۆڕان بوو بۆ موسڵمانان، بەم شێوەیە شاری عەککا گەڕایەوە باوەشی خاچییەکان و بوو بە پێگەیەکی زۆر گرنگ بۆ خاچییەکان لە ناوچەی خۆرهەڵات و دەریای سپی ناوەڕاستدا بۆ هێرش بردنە سەر موسڵمانان، ئەم شارە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر کۆنترۆڵی خاچییەکاندا مایەوە، هاوکات دەتوانین بڵێین خاچییەکان بە گشتی و دوو پاشا و ئیمپراتۆرێک لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجەی لە پێناویدا هاتبوون کە ئەویش ڕزگارکردنی (بەیت ولمەقدیس) بوو شکستیان هێنا، چونکە لە بنەڕەتدا ئەم هەڵمەتە بۆ ئەو ئامانجە هاتبوو نەک بۆ گرتنی شاری عەککا.[٢]

هەڵمەتی سێیەمی خاچییەکان وەک هەڵمەتی یەکەم نەبوو و زۆریش جیاواز بوو، چونکە ئەم جارە بە هاندانی پاپا و لە ژێر کاریگەری ئایینی نەهاتبوون، بەڵکو لە لایەن دەسەڵاتی علمانیەوە هەڵمەتەکە ڕێکخرابوو ئیمپراتۆری ئەڵمانی و هەردوو پاشای فەڕەنسی و ئینگلیزی سەرکردایەتیان دەکرد، بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستی علمانیەتی ئەم هەڵمەتە ئەوەیە هەردوو پاشای فەڕەنسی و ئینگلیزی کەوتنە وەرگرتنی باج لەو کەسانەی کە بەشداری شەڕی موسڵمانانیان نەدەکرد هەتا ببێتە داهاتێکی چاک بۆ بەردەوام بوون و سەرکەوتنی هەڵمەتەکە، ئەمەش فاکتەرێکی زۆر بە هێز بوو لە هەڵسانی خەڵکێکی زۆر بۆ بەشداری کردن لەم هەڵمەتە بۆ نەدانی ئەو باجەی کە بە باجی (دەی سەلاحەددین) ناسراوبوو،، هەرچەندە موسڵمانان بۆ ماوەی دوو ساڵ بەرگرییان کرد، بەڵام بەهۆی درێژی ماوەی شەڕەکە و نەرمونیانی سەلاحەددین بەرامبەر فەرماندەکانی و بەکارهێنانی فێڵ لە لایەن (ریتشارد شێردڵ)ەوە بۆ دانوسان وەک چەکێکی دەروونی و بۆ سود

وەرگرتن لەکات، هەموو ئەمانە یارمەتیدەربوون بۆ ئەوەی شاری عەککا بە هەموو شمەکە مادی و جەنگی و مرۆییەکانەوە بکەویتە دەست خاچییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا خاچییەکان نەیانتوانی ئەو ئامانجەیان بەدەست بهێنن کە بۆی هاتبوون، ئەویش ڕزگارکردنی شاری قودس بوو.[1]

## هەڵمەتی چوارەمی خاچییەکان

## (٥٩٩- ٦٠١ك/ ١٢٠٢- ١٢٠٤ز)

خۆرهەڵاتی ئیسلامی ئامانجی سەرەکی هەڵمەتەکانی خاچییەکان بوو، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لە ڕێڕەوی ڕووداوەکان تێبینی ئەوە دەکەین ئەم هەڵمەتە لە بیرۆکەی ڕاستەقینەی خۆی لایدا کە لە ژێر پەردەی ئاینی مەسیحی بۆ ڕزگارکردنی قودس لە دەستی موسڵمانان خۆی دەنواند، بەڵام ئەوەی تایبەتە بە هەڵمەتی چوارەمی خاچییەکان ئەوەیە خاچییەکان بە سەرۆکایەتی ئیمپراتۆری ئەڵمانی (هێزی شەشەم) تا بەهاری ساڵی (٥٩٧ک/١٢٠٠ز) بە هاوکاری و یارمەتی پاپا (انوسنت سێیەم) بە تایبەت لە فەرەنسا خۆیان بۆ ئەم هەڵمەتە ئامادەکرد، و بە ئامانجی داگیرکردنی وڵاتی میسر و دواتر وڵاتی شام بەڕێکەوتن، خاچییەکان ئەوەیان لا ڕوون بوو کە داگیرکردنی وڵاتی میسر تەنها بە ڕێگای دەریا دەبێت، بۆیە لەگەڵ فەرمانڕەوای شاری ڤینیسیا ڕێککەوتن بۆ ئاسان کردنی گواستنەوەی سوپاکەیان، هاوکات فەرمانڕەوای (ڤینیسیا) پێشوازی لێکردن، بەو مەرجەی (٨٥ هەزار مارک) و نیوەی دەسکەوتەکانیان لەو شوێنانەی کە داگیری دەکەن بۆ شاری (بندقیە) بێت،[2] بەڵام ئەم هەڵمەتە ڕێگاکەی گۆڕی بۆ کەستەنتنیە لەبەر ئەم هۆیانە:

١. ڕق و کینەی خاچییەکان بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کە لە کاتی هاتنیان بۆ وڵاتی شام یارمەتی نەدان.[3]

٢. ئارەزووی (بندقیە) لە دەستکەوتنی دەستکەوتی بازرگانی لە خۆرهەڵات، بە تایبەت دوای ڕووخانی گەرەکی (بندقیە) لە (کەستەنتینە) لە ساڵی (٥٦٧ک/١١٧١ز) و لە دەستدانی هەندێ دەستکەوت.

٣. بوونی هەندێ کێشەی کۆنی نۆرماندیەکان لە کەستەنتنیە.

---

(١) - بۆ زانیاری بڕوانە(ئاراس فریق زینل:جەنگی دەروونی لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا).

(٢) - د. اسمت غنیم: م،ن، ص٥٧.

(٣) - د. سعید عبدالفتاح عاشور: الحرکة الصلیبیة، ج٢/ ص ٩٣٤.

٤. ئارەزووی پاپا لە کۆنترۆڵ کردنی ئەو بارودۆخە کە لە دوای ڕووخاندنی کڵێسای خۆرهەڵاتی لە کەستەنتینیە دروست ببوو.

٥. خاچییەکان لەوە دڵنیابوون کە ناتوانن (٨٥ هەزار مارک) کۆبکەنەوە بۆ (بندقیە) کە پێشتر پەیمانیان پێدابوون.[١]

بەمشێوەیە خاچییەکان لە جیاتی شاری قودس بەرەو شاری کەستەنتینیە بەڕێکەوتن و توانییان لە نیسانی ساڵی (٦٠١ک/١٢٠٤ز) داگیری بکەن، سەرەڕای ئیجابیەتی ئەنجامی ئەم کارە لە دەستکەوتەکانی، هاوکات بەڵایەکی گەورە بوو لەسەر پاپا و بزووتنەوەی خاچییەکان، چونکە جڵەوی شەڕی خاچییەکان لە چوارچێوە ئاینیەکەوە دەرچوو بۆ بەرژەوەندیەکی رامیاری و بازرگانی ڕووت.[٢]

لە ڕاستیدا خاچییەکان ئەوەیان لە یادچوو هێرشیان کردووەتە سەر وڵاتێکی مەسیحی سەرەڕای جیاوازی مەزهەبی، لە ئەنجامی ئەم هێرشەیاندا ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەم شارەیان کوشت، جگە لە کاری تاڵانی و وێرانی کە تەنانەت کڵێسا و دێرەکانیشی گرتەوە تا ئەو ڕادەی دانیشتوان دەیانگوت (خۆزگە کەوتنی کەستەنتنیە بە دەستی موسڵمانەکان بوایە نەک بە دەستی خاچییەکان)، بە تایبەت دوای بینینی ئەنجامی فەتحی قودس و شێوەی رەفتاری سەلاحەددین و موسڵمانان لەگەڵ دانیشتوانی قودس.[٣]

خاچییەکانی وڵاتی شام چاوەڕوانی گەیشتنی هەڵمەتی چوارەمیان دەکرد بۆ ئەوەی پەیمانەکەیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا هەڵوەشێننەوە چونکە ئەوە نەریتیان بووە(شەڕکردن لەگەڵ موسڵمان) لە گەڵ ئەوەی پاشا("عموری دووەم) بە پەرۆش بوو لەوەی هەستی موسڵمانان بریندار نەکات،[٤] بەڵام هەندێ لە خاچییەکان کە لە کۆتایی ساڵی (٥٩٩ک/١٢٠٢ز) و سەرەتای ساڵی (٦٠٠ک/١٢٠٣ز) گەیشتنە شاری عەککا، بوونە هاوپەیمانی (سواری الداویە)و بە سەرکردایەتی پیاوە ئایینیەکان، بەرەو (جبلە واللاذقیة) کەوتنەڕێ، دواتر نوێنەریان نارد بۆ لای میر (مەنسووری ئەیبوبی) میری (حماە) بۆ ئەوەی ترس بخەنە دڵیانەوە و ورەی دابەزێنن بەوەی (٦٠) شەست هەزار جەنگاوەری خاچی بەڕێوەیە بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانان لە

---

(١) - سعید عاشور:س-پ،ج٢/ص٩٣٥.

(٢) - ارنست بارکر: الحروب الصلیبیة، ت- السید الباز العریني، بیروت، ص٩٨- ١٠١.

(٣) - هەمان سەرچاوە، ص ١٠٣- ١٠٤.

(٤) - عاشور: هةمان سةرضاوة،ج٢/ص٩٣٥.

ولاتـی شـام، بەڵام مەنسـووری ئەییـوبی وەڵامـی نـوێنەری (داویەی) دایەوە کە موسڵمانان نارۆخێن و شەڕ کە هات گەڕانەوەی نیە، بۆیە خێرا سوپای ئامادەکرد و بەرەو "اللاژقیە" پێشکەوتن و توانی شکستێکی گەورە تووشی خاچپیەکان بکات و دوای کوشتارێکی زۆر لێیان دیلەکانیان بهێنێت بۆ شاری (حماە)،[1] بەڵام دواتر مەلیک (عموری دووەم) هێرشی کردە سەر کەشتیگەلی موسڵمانان کە لە میسرەوە هاتبوو بۆ ولاتی شام و توانی دەست بەسەر هەموو شتومەکەکانیدا بگرێت کە نرخەکەی بە (٦٠) هەزار دینار دەخەملا، هەروەها توانی هێرش بکاتە سەر چەند ناوچەیەکی ئیسلامی بە تایبەت ڕێگەی نێوان (عەککا و طبریە) و توانی کۆنترۆڵی بکات، بەمەش دەسکەوتێکی زۆری ماددی بەدەستهێنا، بەم ڕووداوانە "مەلیک عادل" ئەوەی لا ڕوون بوویەوە کە (عموری دووەم) پەیمانەکەی نێوانیانی پێشێل کردووە، بۆیە نامەی نارد بۆ هەموو ولاتانی ئیسلامی کە جەنگاوەرانیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی خاچپیەکان،[2] بەڵام شەڕی گەورە لە نێوانیان ڕووینەدا، چونکە هەردوولا دڵنیا بوون لەوەی هەڵمەتی چوارەمی خاچپیەکان بەڕێوەیە، هاوکات مێژوونووسی فەرەنسی گروسیە دەڵێت (مەلیک عادل) نەیویست بۆ ئەو شەڕە بچووکە هێزەکەی لەگەڵ (عموری دووەم) ماندوو کات، بەڵکو خۆی ئامادە دەکرد بۆ شەڕی هەڵمەتی نوێ،[3] کە هەواڵی هاتنی ئەم هەڵمەتە گەیشتە ولاتی شام هەمووان گومانیان وابوو دوای دەرچوونیان لە کەستەنتینیە دەگەنە ولاتی شام لەبەرئەوەی هیوا و ئاواتی خاچپیەکـان بـوو، بەڵام ئەو خەونەی خاچپیەکـان بەدی نەهـات،[4] دوای ئەوەی (مەلیک عموری دووەم) دڵنیا بوو لەوەی هەڵمەتی چوارەم ناگاتە ولاتی شام بەڵکو لە کەستەنتینیە جێگیر بووە، بە خێرایی هەستا بە بەستنی پەیمانێ لەگەڵ (مەلیک عـادل)، (مەلیـک عـادل) حەزی لەو جـۆرە ڕێککەوتنـامەیە بـوو،[5] بە تـایبەت لەو بارودۆخە ناسکەی کە دەوڵەتەکەی پێدا تێ دەپەڕی، هاوکات نەیدەتوانی سیاسەتی توندوتیژ بەرامبەر خاچپیەکان بە کاربهێنێت، بۆیە ئەم جۆرە ڕێککەوتنەی پێ باش

---

(١) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصلیبي، ص٢٠١.

(٢) - عاشور: هەمان سەرچاوە، ج٢/ ص ٥٤٢.

(٣) - أبن الأثیر: الكامل في التأریخ، بیروت، ١٩٦٦،ج ١٢/ ص ٢٨٩.

(٤) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٢٠١.

(٥) - ئاراس زەینەل: س-پ ،ل٢٤٠.

بوو کە لەسەر بنەمای لێبوردنی ئایینی و بەرژەوەندی بازرگانی هاوبەش بێت،[1] بەم شێوەیە ڕێکەوتننامەی نێوان هەردوولا نوێ کرایەوە، و خاچییەکان زۆر سودیان لە دەستکەوتی ئەم ڕێکەوتننامەیان وەرگرت،[2] سەرەڕای ئەوەی ماوەی ئاشتی نێوان موسڵمانەکان و خاچییەکان بە شێوەیەکی گشتی بە هێمنی و ئارامی بەڕێوە چوو، بەڵام هەندێ شەڕی بچووک لە نێوانیان ڕوویدا، لەوانە لە تەمووزیساڵی(٦٠٤ک/١٢٠٧ ز)دا (مەلیک عادل) هێرشی کردە سەر شاری تەرابلس وتوانی پێگەی (القلیعات) ڕزگار بکات و بە شێوەیەکی زۆر توند گەمارۆی شاری تەرابلس بدات، لە ئەنجامدا ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان (مەلیک عادل و میر بوهیمدنوی چوارەم) واژۆ کرا، بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەیە (میر بوهیمدنوی چوارەم) دیاریەکی زۆریدا بە (مەلیک عادل) جگە لە ئازادکردنی (٣٠٠) دیل بەرامبەر بە ڕازی بوونی مەلیک عادل بە ڕێککەوتننامەکە.[3]

شایەنی باسە هەڵوێستی موسڵمانان لە وڵاتی شام زۆر گەرم و گوڕ بوو، هیچی لە ڕۆژانی سەرەتاکانی شەڕی خاچییەکان کەمتر نەبوو، چونکە زیاتر لە (٣٠) هەزار جەنگاوەری موسڵمانان لە دیمەشق و شارەکانی دیکەی وڵاتی شام، خۆیان بۆ جیهاد کردن لە پێناوی خوا و ڕزگارکردنی ناوچەکە لە خاچییەکان ئامادەکردبوو' لە گرنگترین ئەنجامەکانی ئەم هەڵمەتە:

١. هەڵمەتی چوارەم بەڵایەکی گەورە بوو بۆ سەر خاچییەکان و دەسەڵاتی پاپا،بەهۆی لاواز بوونی فاکتەری ئایینی و سەرهەڵدانی بەرژەوەندی رامیاری و بازرگانی.[4]

٢. ئەم هەڵمەتە هیچی بۆ خاچییەکانی خۆرهەڵات پێشکەش نەکرد، تەنها کێشە و ئاژاوە و باوەڕ نەبوون بە هاوپەیمانەکانیان نەبێت، زۆرێک لە میرە خاچییەکان بە مەبەستی دروستکردنی چەند (دوقیەک) بۆ خۆیان لە شاری کەستەنتنیە نیشتەجێ بوون.[5]

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٢٠٢.

(٢) - د. سعيد عاشور: س-پ، ج٢/ ص ٩٤٦.

(٣) - أبن الأثير: هەمان سەرچاوە، ج١٢/ ص ٣١٤.

(٤) - ابو شامة: ذيل الروضتين، القاهرة، ١٩٤٧، ص٦٩- ٧٠.

(٥) - ابو شامة: ذيل الروضتين، القاهرة، ١٩٤٧، ص٦٩- ٧٠؛ د. عاشور: م.ن.ج ٢/ ص ٩٤٨.

٣. دەست بەسەراگرتنی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لە لایەن خاچییەکان، بوو بەهۆی بە هێزبوونی سەلجوقیەکانی رۆم لە ناوچەکەدا و توانیان هەندێ ناوچە کۆنترۆڵ بکەن.[١]

٤. ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بۆ ماوەی چەند سەدەیەک پارێزەری دەرگای خۆرهەڵاتی ئەوروپی بوو لە دژی هەر پێشکەوتنێکی موسڵمانان، بە کەوتنی ئەم ئیمپراتۆریەتە کۆسپ لە ڕێگەی پەلاماری موسڵمانان بۆ سەر ئەوروپای خۆرهەڵات نەما.[٢]

هەڵمەتی مناڵان و هەنگاریەکان

پێش ئەوەی باس لە هەڵمەتی پێنجەمی خاچییەکان بکەین، ئاماژە بۆ دوو هەڵمەتی دیکەی بچووکی خاچییەکان دەکەین، یەکەمیان کە لە مێژووی شەڕی خاچییەکاندا بە هەڵمەتی مناڵانی خاچییەکان ناسراوە لە ساڵی (٦٠٩ک/١٢١٢ ز)دا بوو،دووەمیان هەڵمەتی هەنگاریەکان بوو لە ساڵی (٦١٤ک/١٢١٧ز)دا، سەرەتا مناڵێکی تەمەن (١٢) دوانزە ساڵ کە ناوی (ستیفن)بوو لە فەرەنسا وای ڕاگەیاند کە مەسیح (ع) نامەی پێ داوە تا لەگەڵ مناڵانی خاچییەکان بۆ خۆیان هەڵمەتێک بکەن و خوا لەگەڵیان دەبێت،[٣] هاوکات دەریای ناوەڕاست لەت دەبێت و بەیت ولمەقدیس ڕزگار دەکەن، نزیکەی (٥٠) هەزار مناڵ لە فەرەنسا لە دەوری کۆبوونەوە، کەشتیەکان لە بەندەری مرسیلیاوە بەڕێکەوتن، لەو کاتەوە هیچ کەس هەواڵی نەزانیون، هەندێک دەڵێن گەیشتنە باکووری ئەفریقیاو لە بازاڕی کۆیلەکان فرۆشران و هەندێکیان بران بۆ شارە ئیسلامیەکان،[٤] بەڵام هەڵمەتی هەنگاریەکان کە پاپا (انوسنتی سێیەم) بانگەشەی بۆ دەکرد، و هەندێ لە ئەڵمان و قوبروسیەکانی تێدابوو، توانییان بگەنە شاری عەککاو دواتر بەرەو شاری (بیسان) بەڕێکەوتن، هەندێ هێرشیان کردە سەر شاخەکانی لوبنان، بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو، ناچار گەڕانەوە بۆ ئەوروپا، بەوە ئەم هەڵمەتەش ئاکامی خۆی نەپێکا و شکستی هێنا.[٥]

---

(١) - بارکر: هەمان سەرچاوە، ص١٠٣.

(٢) - رانسیمان: تأريخ الحروب الصليبية، ت- السيد الباز العريني،ج ٢/ ص٢٣٣.

(٣) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج ٢/ ص٩٠٠.

(٤) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە، ص، ج٢/ص ٩٥٤- ٩٥٦.

(٥) - م،ن، ج٢/ ص ٩٥٦- ٩٦٠؛ د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص٢٠٣.

# بەشی نۆزدەیەم

- هەڵمەتی پێنجەمی خاچییەکان
- گرنگترین هۆکارەکانی ڕووخانی شاری (دمیاط)
- هەڵمەتی شەشەمی خاچییەکان
- خوارزمەکان و گێڕانەوەی بەیت و لمەقدیس
- هەڵمەتی حەوتەمی خاچییەکان
- مەترسی مەغۆلەکان لە وڵاتی شام
- جەنگی عەین جالوت
- ئەنجامەکانی جەنگی عەین جالوت
- هەڵمەتی هەشتەمی خاچییەکان
- کۆتایی خاچییەکان لە خۆرهەڵات
- ڕزگار کردنی ئەنتاکیا
- هەڵوێستی خاچییەکان
- ڕزگارکردنی بێگەی (کوردەکان)
- ڕزگارکردنی (طرابلس)
- ڕزگارکردنی شاری عەککا
- هەڵمەتی نۆیەمی خاچییەکان
- ئەنجامەکانی جەنگە خاچییەکان

## هەڵمەتی پێنجەمی خاچییەکان

دوای شکست هێنانی هەڵمەتی چوارەمی خاچییەکان لە گەیشتن بە وڵاتی شام، لە ژێر سایەی پەیماننامەی نێوان (مەلیک عادل و مەلیک امالریک)دا ئاشتی و ئارامی باڵی کێشابوو بەسەر ناوچەکەدا، خاچییەکان لە خۆرهەڵات زۆر لاوازببوون و بە هیچ شێوەیەک بیریان لە سەرکێشی نەدەکردەوە، مەلیک عادلیش لەو ماوەیەدا خەریکی ڕێکخستنی کاروباری ناوخۆیی و پتەوکردنی پایەی دەوڵەت بوو،[1] هەروەها لە ڕووی بازرگانیشەوە لە سایەی ئەو ڕێککەوتنامەدا پەیوەندی بازرگانی نێوان موسڵمانەکان لەگەڵ بازرگانە (بوندوقیەکان) پەرەی سەند،[2] بەڵام خاچییەکان لە ژێرەوە خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هەڵمەتێکی نوێ و پیلانی داگیر کردنی میسریان دانابوو، چونکە فەرماندە و سەرکردەکانی خاچییەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی داگیرکردنی میسر دەبێتە کلیکی وڵاتی شام، هەروەها دەیانوت میسر سەری مارەکەیە و گەنجینەی هێزە ئیسلامیەکانە لە وڵاتی شام لە ڕووی مادی و مرۆییەوە، لەبەرئەوەی میسر وڵاتێکی بەرفراوان و دەوڵەمەندە،[3] بیرۆکەی هەڵمەتی چوارەم هەر بۆ ئەو مەبەستە بوو کە دواتر پیلانی هەڵمەتی پێنجەمی بۆ دارێژرا بەمەبەستی داگیرکردنی وڵاتی میسر و دواتر وڵاتی شام و گەمارۆدانی موسڵمانان، بۆیە بەرەو میسر بەڕێکەوتن.[4]

لەو ماوەیەدا (حنا برین) پاشای میرنشینی خاچی (بەیت ولمەقدیس) لە بارەگاکەی لە شاری عەککا بوو، (چونکە قودس ڕزگار کرابوو و سەنتەری خاچییەکان لە وڵاتی شام لە شاری عەککا بوو)، لە کۆتایی ساڵی (٦١٤ک/١٢١٧ز) خاچییەکان کۆمەڵ کۆمەڵ لەسەر بانگەوازی پاپا (انوسنت سێیەم) و جێگرەکەی دوای خۆی (هونریوسی سێیەم) دەهاتن، بەڵام ئەو کۆمەڵانە بۆ ئەم هەڵمەتە بەس نەبوون تا پاشا (حنا) لە (٢٧)ی ئایاری ساڵی (٦١٥ک/١٢١٨ز) بەرەو شاری (دمياط) بەڕێکەوت، لە ڕاستیدا ئەم هەڵمەتە ئامانجی دەست بەسەراگرتنی بیروباوەڕی موسڵمانان بوو، ئەویش نەک تەنها لە میسر و شام بەڵکو لە هەموو نیمچە دورگەی

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٢٠٣.

(٢) - السيد الباز العريني: الشرق الادنى في العصور الوسطى "الاوربيون"، بيروت، ١٩٦٧، ص ١٢٠.

(٣) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ ص ٩٦١- ٩٦٣.

(٤) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص ٢٠.

عەرەبیدا، چونکە مەلیک (حنا) لەگەڵ نەجاشی پاشای حەبەشە بۆ لێدانی موسڵمانانی حیجاز و ڕووخاندنی (کەعبە) ڕێککەوتبوو.[١]

لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی (٦١٥ک/١٢١٨ز) کەشتیە خاچپیەکان گەیشتنە ڕێژگەی دمیاط و لە بەشی خۆرئاوای نیل لە بەرامبەر شارەکەدا کە پێگە و شوراکانی زۆر بە هێز بوون دابەزین،[٢] دواتر خاچپیەکان هەڵەی خۆیانیان زانی، چونکە دەبوو لە خۆرهەڵاتی نیل بەرامبەر (دمیاط) دابەزن، بەم شێوەیە بۆ پەڕینەوە کاتێکی زۆریان لە دەست چوو، لەو ماوەدا موسڵمانان توانییان پێگەکانیان بەهێز بکەن و داوای یارمەتی بکەن، (مەلیک کامل) ی ئەیوبی کە لە جێی (مەلیک عادلی) باوکی حاکمی میسر بوو، زۆر بە خێرایی خۆی گەیاندە گۆڕەپانی جەنگ و فەرماندەیی سوپای موسڵمانانی کرد، و هێرشی کردەسەر خاچپیەکان و توانی بە سەریاندا سەربکەوێت، لە بەرامبەردا خاچپیەکان بورجێکی بە هێز و گەورەیان لە دار دروست کرد لەسەر دوو بەلەم کە لە نێوانیاندا پرد و حاملات هەبوو، توانییان لە ناو ئاوەکەدا بجوڵێن و بورجی موسڵمانان تێکشکێنن کە یەکێک بوو لە پێگە دەریایە گرنگەکانی پارێزگاری شاری (دمیاط) لە ڕووی دەریاوە،[٣] بەم شێوەیە ڕێگە لە بەردەم خاچپیەکاندا واڵا بوو بۆ هێرشبردنە سەر شارەکە لە دەریا و وشکانیەوە، ئەم کارە (٣) سێ مانگی خایاند و هەواڵی ئەم سەرکەوتنە گەیشتە خاچپیەکانی خۆرئاوای ئەوروپی، بۆیە بە فەرمانـدەی (الکاردنیال بلاگیوس) هاوکارییان بۆ هات، کاردینال لە مانگی ئەیلولی ساڵی (٦١٥ک/١٢١٨ز) گەیشتە میسر و بووبە نوێنەری پاپا و سەرکردەی باڵای خاچپیەکان لە بەرەی میسر،[٤] هەرچەندە بەرگریکارانی شاری (دمیاط) خۆڕاگر و ئازا بوون و بۆ ماوەی (٩) مانگ بەرگرییان کرد، هاوکات جموجووڵی سەربازی لە بەرەی شامدا دژی خاچپیەکان بەمەبەستی خەریک کردنیان و دوورخستنەوەیان لە میسر کە مەلیک (معظم ئەیوبی) پێی هەستابوو بەردەوام بوو،[٥] بەڵام خاچپیەکان توانییان لە (٥) تشرینی دووەمی ساڵی (٦١٦ک/١٢١٩ز)دا شاری (دمیاط) داگیر بکەن و خەڵێکی

---

(١) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج٢/ ص ٩٦٥.

(٢) - المقریزي: السلوک لمعرفة دول الملوک، ج١/ ص١٨٨.

(٣) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص٢٠٤.

(٤) - هەمان سەرچاوە، ص ٢٠٤.

(٥) - ابو شامە: هەمان سەرچاوە، ص ١٠٩- ١١٠؛ د. عاشور: هەمان سەرچاوە، ج٢/ص ٩٦٩- ٩٧١.

زۆری لـێ بکـوژن و بگرن،مزگەوتەکانیـان کـردە کڵێسـا و تیپەکانیـان نـارد بـۆ دێهاتەکـانی دەوروبەری (دمیـاط) بـۆ داگیـر کـردن و کوشـتن و تـاڵان و وێـران کردنیان.[1]

### گرنگترین هۆکارەکانی ڕووخانی شاری (دمیاط)

١. زۆری ژمـارەی خـاچپە هێـرش بەرەکـان، هاوکـات مەزنـی ئەو هاوکاریـانەی دەگەیەنرانە خاچپییەکان.

٢. پشـێوی و نائـارامی لە لایەن عەرەبەکـانی دەلتـاوە، کە لە کـاتی هەڵمەتـی خاچپییەکان بۆ دەلتاو پێش داگیرکردنی شاری (دمیاط) خەریکی کاری سەرکێشـی و چەتەیی بوون.

٣.مردنـــی (مەلیـــک عـــادلی) بـــرای ســـەلاحەددین لە (٣١)ی ئـــابی ســـاڵی (٦١٥ک/١٢١٨ز) و دابەش بوونی شانشین لە نێوان کوڕەکانیدا، ئەم هۆکـارانە ڕێگر بوون لە پێش خستنی بەرەی ئیسلامی لە دژی خاچپییەکان.

٤. مەترســی نــاوخۆیی کە لە کــاتی بەرەنگــاربوونەوەی خاچپییەکــان لەســەر سنووری (دمیاط) تووشی (مەلیک کامل) هات، چونکە (ئیبن مشطوب) بە مەبەسـتی لادانی (کامل) و دانانی (فائز)ی برای لە شوێنی پیلانێکی گێڕا لە نـاو سـەربازگەی (کاملدا)، ئەمەش کـاریگەری ڕاسـتەوخۆی هەبوو لەسـەر ورەی (کامل) و بەرگـری کردنـی و دابەشـبوونی سـوپاکەی و دواتـریش هەڵهـاتنی تـا گەیشـتنی (مەلیـک المعظـم)ی ئەیـوبی لە شـامەوە و گێڕانەوەی(کامـل)بۆ شـوێنی خـۆی و بەدیلگرتنـی (ئیبن مشطوب)، ئەمە گرنگتـرین هۆکـار بـوو بـۆ پەڕینەوەی خاچپییەکـان لە نیـل و دەست بەسەراگرتنی شاری (دمیاط).[2]

بەم شێوەیە شاری (دمیاط) کە بنکەیەکی بازرگانی کەم وێنەبوو کەوتە دەسـتی خاچپییەکـان، هاوکـات موسـڵمانان بەهـۆی سـەرهەڵدانی مەغۆلەکـان کە خـۆرهەڵاتی ئیسلامییان داگیر کردبوو تووشـی قەیرانێکـی سـەخت هـاتبوون، موسـڵمانان کەوتنە بەر مەترســی نێــوان دوو هێــزی ترســناک ئەویــش خاچپییەکــان لە خۆرئــاوا و مەغۆلەکان لە خۆرهەڵاتدا بـوون، بە هەرحـاڵ خاچپییەکـان لە دوای (دمیـاط) بڕیـاری

---

(١) - أبن الأثیر: هەمان سەرچاوە، ١٢ج/ ص ٣٥٠.

(٢) - أبن تغری البردی: النجوم الزاهرة ج ٦/ ص ٢٣٠؛ المقریزی: هەمـان سـەرچاوە، ج١/ ص١٩٦- ١٩٧، د. عاشور: هەمان سەرچاوە، ٢/ ص٩٧٢- ٩٧٣.

داگیرکردنی قاهیرەیان دابوو، بەم هۆیەش هەموو بانگەوازەکانی (مەلیک عادلیان) بۆ ڕێکەوتن و کشانەوە لە میسر بەرامبەر هەندێ دەستکەوت لە وڵاتی شام بەرپەرچ دەدایەوە، خاچییەکان لە دوای گەیشتنی یارمەتیێکی زۆر لە ئەورووپاوە بەرەو قاهیرە بەڕێکەوتن، [1] و چوونە ناو سێ گۆشەیەکی ئاوی، لە خۆرهەڵاتی دەریاچەی (منزلە) و لە خۆرئاوا لقێکی (دمیاط) و لە باشوور دەریای (بچووک)، لە شەوی یەکی ئابی ساڵی (٦١٨ ک/١٢٢١ز)دا لەو خاکەدا لافاو هەڵسا سەرەڕای گەرمی کەش و هەوا، ناوچەکە نغرۆ بوو لە ئاوی نیل، بۆیە خاچییەکان بەم بارودۆخەیان نەدەزانی، [2] موسڵمانان بەم بارودۆخە زۆر دڵخۆش بوون، (مەلیک کامل) بە خێرایی سوپای کۆکردەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی خاچییەکان لە باکوری (شربین) تا ڕێگەی گەڕانەوەی خاچییەکان بۆ شاری (دمیاط) ببڕێت، هاوکات فەرمانیدا بە بڕینی هەموو بەنداوەکان، چونکە ئاوەکان زۆر زیادیان کردبوو، خاچییەکان هەستیان نەدەکرد تا هەموو دەوروبەریان کەوتە ژێر ئاو،کاتێ ویستیان بگەڕێنەوە بۆ شاری (دمیاط)، موسڵمانان ڕێگەکەیان لێ بڕیبوون، [3] بەم شێوەیە بارودۆخی خاچییەکان لە دەلتای نیل تێکچوو و هیچیان لە پێش نەماو ناچار ڕازیبوون بە ڕێککەوتن لەگەڵ مەلیک کامل، ئەوەبوو لە (٢٨) ئابی ساڵی(٦١٨ ک/١٢٢١ز) داوای ڕێکەوتنیان کرد(کە پێشتر پێ ڕازی نەبوون) و قایل بوون بە کشانەوە لە (دمیاط) و خاکی میسر، بە مەرجێک لەم قەیرانە بە سەلامەتی ڕزگاریان بێت، [4] (مەلیک کامل) زۆر بە خێرایی وەڵامی خاچییەکان بۆ میسر، بۆیە پەلەی کرد لە بۆ ڕزگارکردنی شاری (دمیاط) لە داگیرکردنی خاچییەکان بە ڕێککەوتن قایل بوون بە مەرجێک بارمتە لە پاشاکانیان ڕەوانە بکەن، بۆ جێ بەجێ کردنی داواکەی کامل، خاچییەکان (٢٠) لە پیاوانیان ڕەوانەی لای کامل کرد، لە نێوانیاندا پاشا (حنا) هەبوو، بەمشێوەیە لە (٧) ئەیلولی ساڵی (٦١٨ک/١٢٢١ز) خاچییەکان لە شاری (دمیاط) دەرکران، دوا بەدوای ئەوە خاچییەکانی خۆرئاوا بەرەو ئەورووپا بەڕێکەوتن، دوای ئەوەی پاشاکەیان لەگەڵ (مەلیک کامل) پەیماننامەیەکی بۆ ماوەی (٨) ساڵ واژۆکرد، بەم شێوەیە هەڵمەتی پێنجەمی خاچییەکان شکستی هێنا و

---

(١) - المقریزی: هەمان سەرچاوە،ج ١/ ص٢٠٣.

(٢) - هەمان سەرچاوە،ج ١/ ص٢٠٧.

(٣) - ابو شامة: هەمان سەرچاوە، ص١٢٩ ؛عاشور، م.ن، ج٢/ ص ٩٨٢.

(٤) - أبن تغری بردی: م.ن، ٦ج/ص ٢٤١.

بەیتولمەقدیس لە داگیرکردنی خاچپیەکان ڕزگاری بوو، و بێ ئەوەی هیچ ئامانجێک بپێکن لە (دمیاط) دەرکران.[1]

لە ڕاستیدا ئەم دوو هەڵمەتە هەر لە سەرەتای بانگەشە کردنیانەوە لە لایەن پاپاوە بۆ ڕزگارکردنی شاری قودس، لەبەر ڕق وکینەی کۆنی نێوان ئەوروپاییەکان و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لە کاتی هەڵمەتەکانیان بۆ خۆرهەلاتی ئیسلامی بە شێوەیەکی چاک هاوکاری یەکییان نەدەکرد، بۆیە هەڵمەتی چوارەم لە قوستەنتنیە مایەوە و توانییان هەندێ(دوقیات)بۆ خۆیان دروست بکەن، جگە لە کاری تالانی و وێرانی و بێزاری دانیشتوانی ئەم شارە بە دەستی خاچپیەکان، بەجۆرێک پێیان خۆش بوو لە لایەن موسڵمانانەوە داگیر بکرایە نەک خاچپیەکان، هەروەها هەڵمەتی منالان و هەنگاریەکانیش هیچ ئەنجامێکی نەبوو، دواتر هەڵمەتی پێنجەم دەستی پێکرد بۆ داگیرکردنی وڵاتی میسر، چونکە لە ڕووی مادی و مرۆییەوە وڵاتێکی دەوڵەمەند بوو، پێان وابوو ئەگەر میسر داگیر بکەن، ئەوا دەتوانن زۆر بە ئاسانی وڵاتی شام کۆنتڕۆڵ بکەن، ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەوەیە کە هەڵمەتی خاچپیەکان لە چوارچێوەی ئاییني خۆی دەرچوو و چووە بەرگی رامیاری و بازرگانی و بەرژەوەندیەکانیانەوە، هاوکات بەرەی ئیسلامی تووشی لاوازی هاتبوو و بە هەموو شێوەیەکی ڕێککەوتن قایل دەبوو، چونکە دانیشتوانی ناوچەکە لە شەڕ بێزار ببوون و بنەماڵەی ئەیوبیش ناکۆکی کەوتبووە نێوانیان.

## هەڵمەتی شەشەمی خاچپیەکان

سەرەڕای بەستنی پەیمانی ئاشتی نێوان پاشای خاچی(حنابرين) و پاشا (کامل) کە پێشتر باسمان لێوەکرد، پاشا (حنابرين) لە پایزی ساڵی (٦١٩ک/١٢٢٢ز)دا ڕۆیشت بۆ ئیتاڵیا و چاوی کەوت بە پاپا (انوسنتی سێیەم)، هاوکات ئیمپراتۆری ئەڵمانی (فریدریکی دووەم)ی بینی و باسی بارودۆخی خاچپیەکانی لە وڵاتی شامدا دوای شکست هێنانی هەڵمەتی پێنجەم بۆ کردن، هەروەها سەردانی فەڕەنسا و ئیسپانیای کرد و هانی پاشاکانی دا بۆ پەلە کردن لە ناردنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ ڕزگارکردنیان لەو قەیرانە،[2] بەڵام پێش ئەوەی باسی هەردوو هەڵمەتەکە بکەین باس لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەم دوو هەڵمەتە دەکەین ئەوانیش:

---

(١) – المقريزي: م.ن، ص ٢٠٨، د. عاشور: م.ن، ٢ج/ ص٩٨٣؛ بارکر: م.ن، ص ١٠٩- ١١٠.
(٢) – د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية، ج ٢/ ص٩٩٤.

١. هۆکاری ئایینی: ئەم هەڵمەتە زیاتر بە هۆی کاریگەری پاپا (انوسنتی سێیەم) و (گریگوری نۆیەمەوە) بوو، کە بانگەشەیان دەکرد بۆ دەستپێکردنی هەڵمەتێکی نوێی دژ بە موسڵمانان و ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس، بێگومان ڕۆڵی ئایینی لە هەموو هەڵمەتەکاندا کاریگەری ڕاستوخۆی هەبووە لەسەر خاچییەکان، بە تایبەت بانگەشەکانی پاپا کاریگەری لەسەر دڵ و دەروون و باوەڕی خاچییەکان دادەنا لە خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد لە پێناو خواوەند و ڕزگارکردنی قودسی پیرۆز و دەرکردنی بێ باوەڕەکان و دەسکەوتنی پلەوپایەی بەرز لە دوا ڕۆژدا، بۆیە ڕۆڵی ئایینی پاپا لە هەڵمەتەکاندا ڕوون و ئاشکرا بوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی و پێشکەوتن بەرەو خۆرهەڵات.

٢. هۆکاری ئابووری: ئەم هۆکارە هیچی لە هۆکاری ئایینی کەمتر نەبووە، بەڵکو کاریگەری ڕاستەوخۆشی هەبووە لەسەر میرەکان و دانشتوانی خۆرئاوا، چونکە بارودۆخی ئابووری خۆرئاوا بە گشتی خراپ بوو، هاوکات میرەکان ئامانجیان بەدەست هێنانی دەستکەوتی زیاتر و دروستکردنی دوقیاتی تازە بوو، سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەورووپاش فاکتەرێکی گرنگ بوو، چونکە میراتی تەنها بۆ کوڕی گەورە بوو و ئەوانی دی لەو میراتە بێ بەش دەبوون، هەروەها پەرەسەندنی بازرگانی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بە تایبەت لە ماوەی بەستنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی نێوان هەردوولادا بەدیکرا، ئەمەش هەندێ جار دەبووە کێشەی نێوان خودی میرەکان لەسەر دەسکەوتی زیاتر.

٣. هۆکاری رامیاری: زۆربەی پاشاکان پەلەیان دەکرد لە هاتنیان بۆ خۆرهەڵات، بەڵام لەم هەڵمەتەدا کاریگەری رامیاری یەکجار گەورەبوو، چونکە فردریک لە دوای بێ بەشکردنی لە بەرەکاتی کڵێسا لەلایەن پاپاوە، زۆری لا مەبەست بوو ئەم هەڵمەتە سەربکەوێت و بە سەربەرزی بگەڕێتەوە بۆ ئەورووپا لە پێناو پاراستنی پلەوپایەی ڕامیاری و سەربازی لە دژی پاپا و کڵێسا، سەرئەنجام سەرکەوتنەکانی (فریدریک) بووە هۆی ئەوەی پاپا بڕیاری حرمانی لەسەر هەڵگرێت، واتە میرو پاشاکانی ئەورووپا چەند مەبەستیان ئەوە بوو لە خۆرهەڵات دەستکەوتیان هەبێت ئەوەندە زیاتر دەسەڵاتی ئەورووپایان لا گرنگ بوو.[١]

---

(١) – ئاراس فەریق زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل ٢٥١-٢٥٢.

لە ئەنجامی کۆبوونەوەی پاپا لەگەڵ پاشاکانی خۆرئاوا، ئیمپراتۆر (فریدریک) پەیمانی بە پاپا دا خۆی ئەم هەڵمەتە ئەنجام بدات، بەڵام پێش گەیشتنی ئەم هەڵمەتە بۆ وڵاتی شام، کێشەیەکی گەورە دروست بوو لە نێوان پاپای نوێ (گریگوری نۆیەم) و ئیمپراتۆر (فریدریک) و بووبە هۆی (بێبەشی) ئیمپراتۆر لە بەرەکاتی کڵێسا، بڵاوبوونەوەی هەواڵی ئەم بڕیارە دواخرا کە مەبەستی پوچەڵ کردنەوەی هەڵمەتی ئیمپراتۆر و بەفیڕۆدانی ماندوبوونەکەی بوو لە گەیشتنی بۆ وڵاتی شام، هاوکات لەو ماوەیەدا جۆرە نزیکبوو نەوەیەک لە نێوان (مەلیک کامل و ئیمپراتۆر فریدریک) لە گۆڕینەوەی باڵوێزدا ڕوویدا، هەروەها دەڵێت گوایە مەلیک کامل داوای یارمەتی و هاوکاری لە ئیمپراتۆر فردریک کردووە لەترسی دەوڵەتی خوارزمی و براکەی (مەلیک معظم) بۆ دەست بەسەراگرتنی دەوڵەتی ئەیوبی پرسی پێ دەکرد، لەو کاتەدا خاچپییەکان لە جوڵان و چالاکی و خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵمەتێکی نوێ بەردەوام بوون کە ئەویش (هەڵمەتی شەشەمە)، (مەلیک کامل) باڵیۆزی خۆی (فخرالدین) نارد بۆ لای ئیمپراتۆر و داوای یارمەتی لێکرد، لە هەمان کاتدا ئیمپراتۆر (بیراردوا)ی باڵیۆزی ڕەوانەی میسر کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر دوولا ئارەزووی ئاشتیان هەبووە نەک شەڕ کردن، بەڵام لە سەربازگەی هەردوولادا خەڵکانێک هەبوون باوەڕیان وابوو تەنها شمشیر بڕیاری کۆتایی دەدات.[1]

لە ڕۆژی (٢٨) تەمووزی ساڵی (٦٢٤ک/١٢٢٨ز)دا ئیمپراتۆر لە وڵاتی شام دابەزی، ئاڵای خاچی هەڵنەکرت چونکە پاپا ئاڵاکەی لێ سەندبوویەوە، بۆیە ئارمی داڵێکی هەڵکرت،[2] لە ڕاستیدا ئیمپراتۆر (فریدریک) یەکێک بوو لەو سەرکردانەی خاچپییەکان کە موسڵمانانیان خۆش دەویست، هەروەها لە نێو ئەو شەش زمانەی کە دەیزانی یەکێکیان زمانی عەرەبی بوو، هاوکات حەزی بە هونەر و وێژە هەبوو، لە شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانان زۆر دڵ گەرم نەبوو، تەنها ئامانجی ئەوە بوو کڵێسا لێ ڕازی بێت، ئەو دەرفەتە چاکەیشی بۆ ڕەخسا کاتێک (مەلیک کامل) پەیوەندی پێوەکرد،[3] ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوانیاندا سەیر نەبوو، چونکە هەندێ جار (فریدریک) پرسیاری (ئەندازیاری، دانایی، بیرکاری)ی بۆ دەنارد بە مەبەستی

---

(١) - جوزيف جاي ديس: الزنديق الاعظم، القاهرة، د/ت، ص ٣٥٠.

(٢) - هەمان سەرچاوە، ص ٣٦٠.

(٣) - المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، ج ١/ ص ٢٥٨- ٢٥٩.

وەڵامــدانەوەی لە لایەن مەلیــک کــامیلەوە، ئەویــش وەڵامەکەی بــۆ دەنــارد،[1] بەم شێوەیە ئیمپراتۆر (فریدریک) هات بۆ وڵاتی شام و بیری لە شەڕ کردنی موسڵمانان نەدەکــردەوە، بــاوەڕی وابــوو کە دەگەنە ڕێککەوتــن و پێــی وابــوو ڕێککەوتــن زۆر چــاکترە لە شــەڕکردن، چــونکە شــەڕ زۆر قــورس دەکەوت لەســەریان، جگە لەوەی ســوپای ئیمپراتــۆر ئەوەنــدە نەبــوو بــۆ شــەڕ کــردن لە خــاکی بێگــانە، هاوکــات ســەرکردایەتی بەرەی ئیســلامی بە دەســتی یەکێــک بــوو کە زۆر لەگەڵ بیروڕاکــانی دەگونجا،[2] بە هەرحاڵ ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بۆ ئیمپراتۆر نەمایەوە لە وڵاتی شــام و تووشــی بــێ هیــوایەک بــوو بە تــایبەت لە دوای مردنــی (مەلیــک معظــم) و ســەقامگیر بــوونی بــارودۆخی بنەمــاڵەی ئەیــوبی، بە شــێوەیەک کامــل پێویســتی بە یــارمەتی ئیمپراتــۆر فردریــک نەمــا کە لەو پێنــاوە هــاتبوو بــۆ وڵاتــی شــام، بەڵام لە ڕاستیدا (فریدریکی دووەم) لە هاتنی بۆ وڵاتی شام تەنهــا مەبەستی یارمەتی کامل نەبــوو، ئەوەنــدەی مەبەســتی دەســت بەســەراگرتنی شــاری قــودس و چــوونە نــاو کڵێســـای (قیـــامە) و ڕاگەیانـــدنی ئیمپراتـــۆریەتی خـــۆی بـــوو، بەمەش گەورەتـــرین ســەرکەوتنی بە دەست دەهێنا بەسەر دوژمنەکانی پاپا و کڵێسا، کە ئاواتەخوازبوون لە شکست هێنانی هەڵمەتەکەی، لەبەرئەوە ئیمپراتۆر هەمــوو شێوازێکی گرتەبەر لە پێناوی گەیشتن بە ئامــانجەکەی،[3] بۆیە ئیمپراتــۆر دیــاری زۆر بە نرخــی بــۆ مەلیک کامل ڕەوانە دەکرد، هاوکات ئەوەی پێ ڕاگەیاند بەدەستەوەدانی قودس بۆ ئەو زۆر گرنگە، چونکە شەڕ کردنی لەگەڵ موسڵماناندا هیچ بەرژەوەندیەکی تێدا نیە و هــیچ نیەتێکی نیە بۆ داگیرکردنــی خــاکی موســڵمانان، بەڵکو مەبەســتی ئەم هەڵمەتە تەنهــا پاراستنی کەرامەتیەتی لای خاچپیەکان و جێگیر کردنی دەسەڵاتیەتی لە خۆرئــاوا کە بە هۆی دژایەتی پاپاوە جێ لەق بووە،[4] بەڵام (مەلیک کامل) زۆر بە جوانی وەڵامی دایەوە و پێی ڕاگەیاند کە بارودۆخ گۆڕاوە و پێویستی بە یارمەتی ئەو نەماوە، بۆیە پێویســت ناکــات قــودس لە دەســتی خــۆی دەربکــات و هەســتی موســڵمانان برینــدار بکات،[5] لەو کاتەدا بارودۆخی ئیمپراتۆر ئەوەندەی دیکە لە وڵاتــی شــام تێکچــوو بە

---

(١) - هەمان سەرچاوە، ج١/ ص٢٣٢.

(٢) - جوزیف جای دیس: هەمان سەرچاوە، ص ٣٦٧.

(٣) - د. عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ص١٠٠٨؛ جوزیف جای دیس، م.ن، ص ٣٦٩.

(٤) - المقريزي: هەمان سەرچاوە،ج ١/ ص ٢٣٠.

(٥) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە، ج٢/ص١٠٠٩.

تایبەت لە دوای هاتنی گەردەلولێکی بە هێز لە دەریای ناوەڕاست و نغرۆکردنی کۆمەڵێک کەشتیگەل کە خواردنیان هەڵگرتبوو، لە لایەکی دیکەوە سوپای پاپا شانشینی صقلیەیان داگیرکرد، هاوکات پیاوانی پاپا هەواڵی مردنی ئیمپراتۆر (فریدریکیان) لە ناو خەڵکیدا بڵاودەکرەوە،[1] بەمەش ئیمپراتۆر هیچی لە پێش نەماوە تەنها پەلەکردن لە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی نەبێ، بەڵام گەڕانەوەی ئیمپراتۆر بە تێکشکاوی بارو دۆخەکەی ئەوی قورس تر دەکرد، بۆیە پەنای بردە بەر پاڕانەوە لای مەلیک کامل، بەم شێوەیە (من خزمەتکار و کۆیلەی تۆم، لە فەرمانی تۆ دەرناچم، خۆت دەزانی کە گەورەترین پاشای دەریام، پاپا و پاشاکانی ئەوروپا بە توانا و شارەزاییم دەزانن، ئەگەر بە شکستی بگەڕێمەوە لایان ئەوا حورمەتم دەشکێت، ئەم قودسە باوەڕی خەڵکە، ئەگەر سوڵتان قایل بێت بە وەرگرتنی ئەو وڵاتەو سەردانی خەڵک ئەوا چاکەیەکە لەوەوە)[2]، سەرئەنجام ڕێککەوتننامەی ئاشتیان واژۆ کرد لە نێوانیان بۆ ماوەی (١٠) دە ساڵ لە (١٨) شوباتی ساڵی (٦٢٦ک/١٢٢٩ز) بەم مەرجانە:

١. شاری قودس بۆ خاچییەکان بێت، بەو مەرجەی پێگەی سەربازی تێدا دانەنێن، مزگەوتی (عومەر) لای هەیکەلی (سولەیمان) بە دەست موسڵمانانەوە بێت و نەصاریەکان ئازاد بن لە چوونە ناوی بۆ پەرستن.

٢. ناصریە بۆ خاچییەکان بێت بە مەرجێک موسڵمانان لە چوون بۆ بەیت لەحم ئازاد بن.

٣. هەندێ شاری کەناری وەک صیدا بۆ خاچییەکان بن بە مەرجێک پێگەی تێدا نەکەنەوە.

٤. ئیمپراتۆر (فریدریک) پەیمانیدا لە ماوەی ئەو ڕێککەوتننامەدا چیتر یارمەتی و هاوکاری خاچییەکان نەکات لە کاتی هێرشیان بۆ سەر (مەلیک کامل).[3]

ڕای گشتی موسڵمانان بەم ڕێککەوتنامە سلبی بوو زۆریان پێ ستەم بوو،[4] (مەلیک کامل) هەوڵی دەدا موسڵمانان هێور بکاتەوە بە بیانووی ئەوەی بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە تەنها کڵێساکانی داوە بە خاچییەکان و (مزگەوتی ئەقسا) و ئاڵای

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٢٠٩.

(٢) - د. عاشور: م.ن، ج ٢/ ص١٠١٠.

(٣) - جوزيف: ه- س، ص٣٧٤، المقريزي: م.ن،ج ١/ ص ٢٣٠.

(٤) - السيد الباز العريني: الشرق الادنى في العصور الوسطى، ص ١٢٧.

ئیسلام لەوێ بۆ والی ئیسلامە،[1] بەڵام موسڵمانان سوور بوون لە هەڵوێستیان بەرامبەر (مەلیک کامل) ودەیانووت (مەلیک کامل) بەرامبەر ئیسلام و شاری قودس کە پێشتر سوڵتان (سەلاحەددین) فەتحی کردووە ناپاکە، ئیمپراتۆر کەزانی شەرمەزاری بۆ (مەلیک کامل) دروستکردووە، نامەیەکی بە باڵیوز (فخرالدین)دا نارد بۆ مەلیک کامل و تیایدا داوای لێبوردنی لە مەلیک کامل کرد چونکە ئەگەر لەبەر پلەوپایەی ئەو نەبوایە سوڵتان لەلای موسڵمانان شەرمەزار نەدەبوو،[2] هەڵوێستی خاچییەکانیش هیچی لە موسڵمانان کەمتر نەبوو، چونکە دەیانوت ئەم سەرکەوتنە بە پارانەوە بەدەست هاتووە نەک بە شمشێر، ئەوەشیان بەسوکایەتی بۆ کەرامەتیان دەزانی، بە تایبەت کە موسڵمانان لە قودس شوێنی زۆریان بەدەستەوە بوو، هاوکات (الداویە والاسبتاریە) هەموو کارەکانی ئیمپراتۆریان ڕەتکردەوە، چونکە لە ڕەحمەتی پاپا دەرکرا بوو، بەم شێوەیە خاچییەکان بە گشتی نرخی گرتنی قودسیان بەبێ خوێن ڕژان نەزانی.[3]

لە ڕۆژی (١٧/ ٥/ ١٢٢٩ز) سەرەڕای قایل نەبوونی پاپا، ئیمپراتۆر چووە شاری قودس و لە ڕۆژی دواتر وەک ئیمپراتۆر خۆی نیشاندا، دواتر سەردانی بەیت ولمەقدیسی کرد و ڕەفتارکردنی بە شێوەیەک بوو لای موسڵمانان جێگای سەرسوڕمان بوو، ئەویش بە دەرکردنی یەکێک لە قەشەکان کە ویستی بچێتە (مزگەوتی ئەقسا) و هەڕەشەی لێکرد کە نابێ بێ پرسی موسڵمانان بچێتە ئەو شوێنە و وتی ئێمە خزمەتکاری سوڵتان کاملین و بەم کەنیسانە چاکەی لەگەڵ کردووین و دەبێت کەس ئەو سنورە نەبەزێنێت،[4] هەروەها لە کاتی هاتنی بۆ (مزگەوتی ئەقسا) بانگبێژی مزگەوت نە بانگیدا و نە قورئانی خوێند، (فریدریک) ئەم کارەی پێ ناخۆش بوو و پێی گوتن بۆ لە پێناوی من واز لە مەراسیمی خۆتان دەهێنن، ئەگەر ئێوە بێن بۆ لای ئێمە ئەوا بە هیچ شێوەیەک قایل نابم بە واز هێنان لە لێدانی زەنگی کڵێسا، بۆیە هەندێک پارەی نارد بۆ بانگدەرەکە هەتا لە کارەکەی بەردەوام بێت، هەروەها سەردانی شوێنی موسڵمانانی دەکرد و ڕێزی لە هەستیان دەگرت، بۆ نموونە لە کاتی چوونە ناو مزگەوت وەک نەریتی موسڵمانان (پێڵاوی)

---

(١) - د. خاشع المعاضيدي: م.ن، ص ٢٠٩.

(٢) - السيد الباز العريني: هەمان سەرچاوە، ص ١٢٧.

(٣) - د. عاشور: هەمان سەرچاوە،ج ٢/ص١٠١٣.

(٤) - المقريزي: هەمان سەرچاوە،ج ١/ ص ٢٣١.

لەپێ دادەکەند، بەمەش (فریدریک) لای موسڵمانان خۆشەویست بوو،[1] ئیمپراتۆر لە دوای گەشتەکەی گەڕایەوە شاری عەککا، و هەواڵی تێکچوونی بارودۆخی پێگەیشت کە پاپا هێزەکانی لە دژی (فریدریک) ئامادەکردووە، بۆیە بە خێرایی گەڕایەوە بۆ ئیتاڵیا، پاپا ناچار بوو بڕیاری (حرمانی) لەسەر هەڵگرێت و دانبنێ بە دەستکەوتەکانی لە خۆرهەڵاتدا، ئەویش لە چوارچێوەی ڕێککەوتنامەی (سان جرمانو)دا لە ساڵی (٦٢٨ک/١٢٣٠ز)،[2] لە ماوەی گەڕانەوەی ئیمپراتور(فریدریک) بۆ ئەوروپا بە هۆی ململانێی نێوان پاشاکان و پیاوانی ئاینی و میرەکانی ئەوروپا بارودۆخی خاچییەکان لە خۆرهەڵات تێکچوو، بارەگایان لە عەککا وەک خۆی مایەوە و شاری قودس شارێکی ئایینی بوو، خۆرئاوای ئەوروپی بۆ ماوەی (٣٥) ساڵ خەریکی کێشەی ناوخۆیی خۆیان بوون و هیچ گرنگیان بە شانشینی خاچی لە خۆرهەڵات نەدەدا و لەو ساڵانەدا بێ پاشا مایەوە،[3] لە بەرامبەردا ئەیوبیەکان وریا بوون لەوەی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی خاچییەکان نەبنەوە، چونکە مەترسی هەرە گەورەیان هێزی خوارزمی بوو،نەک خاچییەکان، ئەم هێزە هەڕەشەی لە خیلافەتی عەبباسی دەکرد لە بەغدا، ئەمەش پاڵنەر بوو بۆ ئەوەی ئەیوبیەکان کێشە ناوخۆیەکانیان بیرچێت و لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقیەکانی ڕۆم (علاء کیقباد الاول)دژی(جلال الدین الخوارزمی)ببنە هاوپەیمان،[4] ئەم هاوپەیمانیەی (ئەیوبی و سەلجوقی) لە تێکشکاندنی هێزی خوارزمەکان لە ئابی ساڵی (٦٢٨ک/١٢٣٠ز) لە شەڕێک لە نزیک ئازەربایجان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کە ژمارەیەکی زۆری هێزی خوارزمی تێدا کوژرا و (جەلالەدین) هەڵهات بۆ ناوچەی ئازەربایجان، لە دوای ئەو ڕووداوە دەوڵەتەکەی هەڵوەشایەوە، ئەم هاوپەیمانیەی نێوان (ئەیوبیەکان و سەلجوقیەکان) دەبوایە زیاتر پەرەی بسەندایە، بەڵام سەلجوقیەکان دەرفەتی نەمانی خوارزمیەکانیان قۆستەوە بۆ ململانێی ئەیوبیەکان لەسەر دەسەڵاتی (خلاط، رەهاو حەڕان)، ئەیوبیەکان بە سەرۆکایەتی مەلیک کامل کۆبوونەوە بۆ بەرپەرچدانەوەیان،[5] بەڵام بەهۆی جیابوونەوەی میری(حمص و دیمەشق) مەلیک

---

(١) - جوزیف: هەمان سەرچاوە، ص ٣٨٣.

(٢) - د. عاشور: اوروبا في العصور الوسطى،ج ١/ ص٤٠٧.

(٣) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م،ن، ص ٢١٢.

(٤) - المقريزي: هەمان سەرچاوە،ج ١/ ص ٢٣٨.

(٥) - د. عاشور: الحركة الصليبية، ج٢/ ص ١٠٣٠.

کامل بە ناچاری گەڕایەوە بۆ میسر، بەم شێوە لە ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ز)دا (حەڕان و ڕەها) کەوتنە دەستی سەلجوقیەکان، مردنی مەلیک کامل هەڕەشە بوو بۆ جیابوونەوە و ڕووخاندنی دەوڵەتی ئەیوبی، و بووبە هۆی ململانێیەکی ترسناکی نێوان کوڕەکانی (عادلی بچووک) و (صالح ئەیوب)، ئەم ململانێ یە پەرەی سەند و زۆربەی بنەماڵەی ئەیووبی گرتەوە و هەرکام پەنایان دەبردە لای خوارزمەکان دژ بە یەکدی، ئەمەبوو بەهۆی هاتنی خوارزمەکان و گەلەکۆمەکردنیان لە وڵاتی شام.[١]

**خوارزمەکان و گێڕانەوەی بەیت ولمەقدیس**

ڕێککەوتنی نێوان ئیمپراتۆر (فریدریک) و سوڵتان کامل کۆتایی نەهاتبوو، لە ساڵی (٦٣٧ك/١٢٣٩ز) پاپا هەستا بە بانگەشەکردن بۆ هەڵمەتێکی نوێ، ژمارەیەکی زۆری سوارە فەڕەنسیەکان وەڵامیان دایەوە و بە فەرماندەیی (پیبوتی چوارەم) مەلیک فاغاری چوون بەدەم بانگەوازەکەیەوە، ئەم هەڵمەتە لە ساڵی (٦٣٧ك/١٢٣٩ز) گەیشتە شاری عەککا و لەوێ خاچییەکان لە دەوری کۆبوونەوە بۆ دەست بەسەراگرتن و کۆنترۆڵ کردنی قودس،[٢] بەڵام (ناصر داودی ئەیوبی) فەرمانڕەوای ئوردن پێش خاچییەکان کەوت بۆ قودس بەمەبەستی دەرکردنی خاچییەکان لەو شارە، کە بە چاکردنەوەی شورا و پێگەکانی قودس پەیمانەکەیان پێشێل کرد بوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت خاچییەکان بۆ داگیرکردنی شاری قودس پێشتر خۆیان ئامادەکرد بوو، بەڵام خاچییەکان کاتێک هەواڵی بارودۆخی شاری قودسیان پێ گەیشت بڕیاریاندا میسر داگیر بکەن و دواتر ڕوو بکەنە شاری دیمەشق، بەمەش موسڵمانان ناچار دەبن قودسیان تەسلیم بکەن.[٣]

بەشێکی زۆری خاچییەکان بەرەو عەسقلان چوون بۆ دەست بەسەراگرتنی کاروانێکی موسڵمانان کە خواردنی هەڵگرتبوو، دواتر بەرەو غەزە بەڕێکەوتن و تووشی موسڵمانان هاتن و لە شەڕێکی گەورەدا (١٨٠٠) خاچی کوژران و هەندێ فەرماندەیان بەدیل گیران و (٢٥٠) دیلیان ڕەوانەی میسر کران،[٤] ئەیوبیەکان ئەم سەرکەوتنەیان نەقۆستەوە بۆ ڕێکخستنەوە و یەکخستنەوەی ڕیزەکانیان بەڵکو

---

(١) – السيد العريني: الشرق الادنى في العصور الوسطى، ج١/ ص١٢٧– ١٣٢.

(٢) – د. خاشع المعاضيدي: م.ن، ص ٢١٣.

(٣) – المقريزي: م.ن،ج ١/ص٢٩١.

(٤) – د. عاشور: الحركة الصليبية، ج ٢/ ص ١٠٣٥.

چوونەوە ناو کێشە و ململانێی نێوان خۆیان، کە بە لادانی مەلیک عادلی دووەم و دانانی (صالح نجم الدین ئەیوب) لە شوێنیدا لە ساڵی (٦٣٩ک/١٢٤٠ ز) کۆتایی هات، (صالح ئیسماعیل) فەرمانڕەوای دیمەشق ئەم پلانەی زۆر پێ ناخۆش بوو، بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی پەنای بردەبەر خاچییەکان دژی ئەیوبیەکان وداوای هاوکاری لە خاچییەکان کرد بەرامبەر بە پێدانی شاری (قودس ، طبریە ، عەسقلان و نیوەی صیدا) و هەموو بەشە کەنارییەکان،[1] موسڵمانان بەم کارەی (صالح) نیگەران بوون و هەندێکیان وتاری هەینی و دوعایان لێ بڕی، هەروەها بەرگریکارانی ئیسلامی قایل نەبوون بەدەستەوەدانی پێگەی (شقیق ارنون) بە خاچییەکان و مەلکەچی فەرمانەکانی (صالح ئیسماعیل) نەبوون، ناچار (صالح) خۆی هات بۆ گەمارۆدان و پێدانی قەڵاکە بەخاچییەکان،دوای داگیرکردنی قەڵاکەو سزادانی بەرگریکارانی ناوی، صالح قەڵاکەی تەسلیم بە خاچییەکان کرد،[2] بە هۆی هاوکارییەکانی خاچییەکانەوە، (صالح ئیسماعیل) توانی بارودۆخی ناوچەی شام کۆنترۆڵ بکات، بەڵام دوای سەرکەوتنی بەسەر (صالح ئەیوب) لەنزیک غەزە و جوڵانەوەی بەرەو میسر بەمەبەستی داگیرکردنی ئەم بارودۆخە گۆڕا، لەو کاتەدا هێزی شام لە (صالح ئیسماعیل) جیابوونەوە و بۆ شەڕی خاچییەکان چوونە بەرەی برا میسریەکانیان و توانییان لە شەڕێکی گەورەدا زیانێکی قورسیان پێ بگەیەنن و کۆمەڵێکیان بەدیلی ڕەوانەی میسر بکەن،[3]ئەمە بوویە مایەی گەڕانەوەی (پیبوتی چوارەم) بە شکست خواردوی بۆ ئەوروپا و هاتنی (ریتشارد کورنول) برای (هێنری سێیەمی) پاشای ئینگلترا، دوای چەند مانگێک بێ بە دەست هێنانی هیچ ئامانجێک گەڕایەوە تەنها پێگەی عەسقەلانی چاک کرد، هەرچەندە (صالح) ئەوەی پێ ڕاگەیاند کە ڕێزی ڕێککەوتننامەی نێوانیان دەگرێت بەڵام بێ ئاکام بوو،[4] لە ڕاستیدا مەترسی گەورە لەسەر وڵاتی شام لەو سەردەمەدا ململانێی نێوان میرەکانی بنەماڵەی ئەیوبی بوو، ئەم ململانێ یانە بەڕادەیەک سەرقاڵی کردبوون قودس و بەرژەوەندی موسڵمانانیان لە بیر چوو بوویەوە و پاراستنی

(١) - أبن تغری البردی: النجوم الزاهرة ج٦/ص ٣٢٢.

(٢) - المقریزی: م.ن، ج١/ ص٣٠٨.

(٣) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٣١٤.

(٤) - د. خاشع المعاضیدي وأخرون: م.ن، ص ٣١٤.

بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەبەرچاو بوو، لە ئەنجامی ئەم ململانێیەدا خاچییەکان چوونە پاڵی (مەلیک صالح) فەرمانڕەوای دیمەشق، هاوکات (صالح ئەیوب) فەرمانڕەوای میسر لە ساڵی (٦٤٢ک/١٢٤٤ز) داوای یارمەتی و هاوکاری لە خوارزمەکان کرد، ئەوکات (١٠) دە هەزار پیاوی خوارزمی گەیشتنە وڵاتی شام و (گبریە و نابلس) یان گرت و زۆر بە ئاسانی شاری قودسیان فەتح کرد، لە (١١)ی تەمووزی ساڵی(٦٤٢ک/١٢٤٤ز) خاچییەکانیان ناچار کرد شارەکە بەجێ بهێڵن، دوای ئەوەی (ناصر داود) حاکمی ئوردن داوای لێکردن کە ڕێگەیان پێ بدەن، شەش هەزاریان بەرەو شاری یافا چوون و تەنها (٣٠٠) کەسیان گەیشتن، دوای ئەوەی خوارزمەکان پلانێکیان بۆ گێڕان و زۆربەیان لێ کوشتن،[١] بەم شێوەیە قودس گەڕایەوە دەستی موسڵمانان و هیچ سوپایەکی خاچی هەوڵی داگیرکردنی نەدا تا هاتنی جەنگی گێتی یەکەم (١٩١٤- ١٩١٨ز)، بەڵام خاچییەکان لەگەڵ هاوپەیمانەکەیان (صالح ئیسماعیل) هێزیان کۆکردەوە و بەرەو وڵاتی میسر دژی (صالح ئەیوب) پێشڕەوییانکرد، هاوکات خوارزمەکان کەوتنە دوایان و توانییان لە شەڕێکی گەورەدا لە غەزە (٣٠) هەزاریان لێ بکوژن و هەزار دیلیان بەرەو وڵاتی میسر ڕەوانە بکەن،[٢] ئەنجامەکانی ئەم شەڕە وەک شەڕی (حەتین) بەڵایەکی گەورە بوو بۆ سەر خاچییەکان، بە شێوەیەک مێژوونوسی فەڕەنسی(گروسیە) بە (حەتینی دووەم) ناوی دەبات، سەرکەوتوان لەم شەڕەدا کەوتنەدوای هەڵهاتووان تا شاری عەککا، دواتر (صالح ئەیوب) سزای فەرماندە موسڵمانەکانیدا کە هاوکاری خاچییەکانیان کردبوو، (دەست بەسەراگرتنی سامانی (داود) فەرمانڕەوای کرک و بەدەستەوەدانی دیمەشق و دەرچوونی صالح ئیسماعیل بە هەندێ پارە و پێگەی نزیک)[٣] بەم شێوەیە دەوڵەتی ئەیوبی بە سەرکردایەتی (صالح ئەیوب)یەکڕیزی وەرگرتەوە و دەسەڵاتی بەسەر وڵاتی میسر و دیمەشق و بەیت ولمەقدیسدا فراوان بوو.[٤]

---

(١) - د. عاشور: الحركه الصليبيه،ج ٢/ص ١٠٤٢- ١٠٤٥.

(٢) - أبن تغرى البردى: م.ن،ج ٦/ ص ٣٢٣؛ د. خاشع المعاضيدي: م،ن، ص ٢١٥.

(٣) - هەمان سەرچاوە، ج٦/ ص ٣٢٤- ٣٢٥.

(٤) - د. خاشع المعاضيدي وأخرون: هەمان سەرچاوە، ص ٢١٥.

## هەڵمەتی حەوتەمی خاچییەکان

لە دوای دەرکردنی خاچییەکان لە بەیت ولمەقدیس لەسەر دەستی خوارزمەکان، (بگریقی قودس) نوێنەری نارد بۆ خۆرئاوای ئەورووپی تا بانگەشەیان بکات بۆ ئامادەکردنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس لە وڵاتی شام، ئەم بانگەشە لە لایەن پاشای فەڕەنسی (لویسی نۆیەم) قبوڵ کرا، لویس تووشی نەخۆشی مەلاریا هاتبوو لە کۆتایی ساڵی(٦٤٢ک/١٢٤٤ز) و پەیمانیدا ئەگەر چاک بێتەوە سەرکردایەتی ئەم هەڵمەتە دەکات، لویس زۆر توندڕەو بوو بۆ خاچییەکان و یەکێک بوو لە بەناوبانگترین ناوی تۆمارگای قدیسین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە (کۆنگرەی لیون) کە لە ساڵی (٦٤٣ک/١٢٤٥ز) بەسترا بڕیاری ئەم هەڵمەتە درا بە پاڵپشتی پاپا (انوسنتی چوارەم) کە (صکوکی غفرانی) پێ بەخشین، ئەمەش بۆ خۆی کاریگەری دەروونی زۆری هەبوو لە سەریان،[1] لویسی نۆیەم بۆ ئەم هەڵمەتە سێ ساڵ خۆی ئامادەکرد بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم هەڵمەتە فەڕەنسی بوو، لە (١٢)ی ئابی ساڵی (٦٤٦ک/١٢٤٨ز) پاریسی بەجێ هێشت و پێش گەیشتنی بۆ میسر هەواڵی خۆی و هەڵمەتەکەی بە نهێنی و لە ڕێگەی ئیمپراتۆر (فریدریکی دووەم) گەیشتە سوڵتانی ئەیوبی (صالح ئەیوب)، (فریدریک) هاوڕێ و خۆشەویستی (سوڵتان کامل) بوو ئارەزووی لە شەڕی موسڵمانان نەبوو، هاوکات نەیدەتوانی بە ئاشکرا ناڕەزایی خۆی پێشان بدات دژی ئەم هەڵمەتە، بۆیە هەستا بە ناردنی شاندێکی خاچی بە جل وبەرگی بازرگانە موسڵمانەکان بۆ ئاگادارکردنەوەی (صالح ئەیوب) لە ئامانجی خاچییەکان لەم هەڵمەتەدا، بەمەش موسڵمانان توانیان یەدەگەکانی خۆیان ئامادە بکەن.[2]

لە ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی (١٩ی مانگی صفر ساڵی ٦٤٧ک/ ٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٢٤٩ز) (لویسی نۆیەم) بەخۆی و هێزەکەی کە نزیکەی (٥٠) هەزار دەبوو گەیشتە بەرامبەر شاری (دمیاگ) و بینی بەرگری کارانی ئیسلامی بە فەرماندەی (فخرالدین) چاوەڕوانن، لەسەر کەنارەکانی دەریا شەڕێکی گەورە بەرپابوو و خاچییەکان توانیان سەرکەوتن بە دەست بهێنن بەسەر موسڵماناندا، (فخرالدین) بەشە و کشایەوە بۆ دیوی خۆرهەڵاتی ڕووباری نیل لای شاری

---

(١) - محمد مصطفى زيادة: حملة لويس التاسع على مصر، القاهرة، ١٩٦١، ص ٨٩- ٩٠؛ د. عاشور: الحركة الصليبية،ج٢/ ص١٠٥٢.

(٢) - أبن تغرى البردي:م.ن.ج ٧/ص٢١١؛ محمد مصطفى زيادة، م.ن، ص٩١.

(دمیاگ)، له ڕۆژی دواتر لەوێش کشایەوە بۆ باشوور له (شموم طناح)، دانیشتوانی (دمیاط) زۆر ترسان له گەمارۆ و شەڕ و کوشتن، بۆیه ناچار بوون شارەکەیان بەبێ بردنی هیچ شتێک بەجێ بهێڵن، هاوکات (ئیبن واصل) گلەیی له (فخرالدین) و سەربازەکانی کرد له بەجێ هێشتنی شاری (دمیاط) و ترسانی خەڵکی ئەو شاره له گەمارۆ و کوشتن و برسێتی وەک جاری یەکەم،[1] بەم شێوەیه شاری (دمیاط) چۆڵ بوو له بەرگریکاران و دانیشتوان، خاچپیەکان زۆر به ئاسانی و بەبێ شەڕ چوونه ناو شاری (دمیاگ) و مزگەوتەکانیان کرده کەنیسه و بگرێکیان لێ دانا، ئەم ڕووداوه گەورەترین بەڵا بوو له مێژووی ئەم شارەدا، مەلیک (صالح ئەیوب) بەرگریکارانی سزادا و هەندێکیانی له سێدارەدان،[2] (لویسی نۆیەم) بەم سەرکەوتنەی له شاری (دمیاط) که بەبێ شەڕ به دەستی هێنا زۆر له خۆی بایی بوو، بۆیه هەستا به ناردنی نامه بۆ سوڵتان (صالح ئەیوب) و تیایدا ئیهانەی سوڵتانی کردو داوای خۆ بەدەستەوەدانی لێکرد، کاتێک ئەم نامه گەیشته سوڵتان که نەخۆش بوو زۆری پێ ناخۆش بوو، بۆیه هێزی له سەرباز و اعراب کۆکردەوە و بارەگای سەربازیی له مەنصوره دانا و فەرمانیدا به وەڵامدانەوەی (لویسی نۆیەم) وشکستپێهێنانی بەرامبەر موسڵمانان،[3] سوڵتان (صالح ئەیوب) بەرامبەر خاچپیەکان مایەوە و هەندێ جار تیپه سەربازیەکانی دەنارده سەریان،[4] بەڵام نەخۆشی زۆری بۆ هێناو له (١٥)ی شعبانی ساڵی (٦٤٧ک / ١٢٤٠ز) کۆچی دوای کرد،[5] له دوای خۆی کوڕەکەی (معظم تورانشاه) بووبه سوڵتان له میسر، هەرچەنده هەواڵی مردنی سوڵتان شاردرایەوە، بەڵام هەواڵەکه گەیشته خاچپیەکان، بۆیه ویستیان سوود لەم دەرفەته وەربگرن بۆ هێرش بردنەسەر شاری قاهیره له ڕێگای دەلتاوە، بەڵام دەریای (اشمسوم) ڕێگر بوو له پێش خاچپیەکان بۆ گەیشتن به شاری مەنصوره که سەنتەری کۆبوونەوەی هێزه ئیسلامیەکان بوو، ئەمەش خاڵێکی گرنگ بوو بۆ موسڵمانان بۆ لێدانی خاچپیەکان و کۆسپ خستنه ڕێگەیان له پێشکەوتن بەرەو قاهیره و زیانێکی زۆریان پێ گەیاندن[6].

---

(١) - أبن واصل: مفرج الكروب، ج ٢/ ص٣٥٦.

(٢) - د. عاشور: الحركة الصليبية،ج ٢/ ص ١٠٦٣.

(٣) - محمد مصطفى زيادة: م.ن، ص ٢٦٨.

(٤) - المقريزي: السلوك،ج ١/ص٣٣٧.

(٥) - أبن واصل: م.ن، ج٢/ ص ٣٥٩.

(٦) - المقريزي: السلوك، ج١/ ٣٤٧.

سەرەڕای ئەو بارودۆخە خاچپیەکان بەردەوام بوون لە پێشکەوتن، بەڵام کەوتنە ناو سێ گوشەیەک لە لقی (دمیاط) و دەریای (اشمسوم) و موسڵمانانی مەنصورە، خاچپیەکان توانیان لە (سلمون) بە ڕێبەری هەندێ دانیشتوانی ئەو شارۆچکە کە موسڵمانان نەبوون بپەڕنەوە،[1] زۆربەری سوپای خاچپیەکان بەڕێوە بوون بۆ شاری مەنصورە، سەرئەنجام شەڕێکی گەورە و سەخت لە نێوان هەردوولا ڕوویدا و موسڵمانان سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا بە سەرکردایەتی مملوک (بیبرس البندقداری) کە دواتر بووبە سولتانی میسر و شام لە سالانی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) – (٦٧٦ک/ ١٢٧٧ز)،[2] بەم سەرکەوتنە موسڵمانان دەریای اشموسیان کۆنترۆڵکرد، (لویسی نۆیەم) کاتێک ویستی بگەڕێتەوە بۆ دمیاگ هەواڵی ئەوەی پێ گەیشت کە موسڵمانان ڕێگەی گەڕانەوەیان لێ گرتوەو دەستیان بەسەر ئەو کەشتیانەدا گرتووە کە خواردن و کەرەستەی جەنگی بۆ خاچپیەکان هەڵگرتبوو،[3] بەم شێوەیە (لویسی نۆیەم) خۆی بەگەمارۆدراوی و لاواز بینی، بۆیە بە ناچاری داوای دانوستان و ڕێککەوتنی لە سوڵتان(المعظم تورانشاه) کرد، بەڵام سوڵتان تورانشاه داواکەی ڕەتکردەوە، کۆتای خاچپیەکان لە (فارسکور) توشی شکستێکی گەورەبوون بە دەستی موسڵمانەکان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو بە دیلگیران و (لویسی نۆیەمیش) لە نێو دیلەکاندا بوو، بە دیلی هێنایانە قاهیرە، (تورانشاه) ڕێزی لێگرت دواتر ئازادی کرد بە مەرجێک لە شاری (دمیاط) بکشێنەوە و شەڕی موسڵمانان نەکەن بەم شێوەیە ڕێککەوتنی ئاشتیان ئیمزا کرد بۆ ماوەی (١٠) دەسالّ.[4]

شایەنی باسە سوڵتان (معظم تورانشاه) لە ڕۆژی (٢٧) محرمی ساڵی (٦٤٨ک/ ١٢)ی ئایاری ساڵی (١٢٥٠ز) بە دەستی مملوکی (بیبرسی البندقداری) فەرماندەی سوپاکەی کوژرا، بەمە سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر کۆتایی هات و کەوتە دەستی ممالیک، بەڵام وڵاتی شام بە دەستی (مەلیک ناصری ئەیوبی) مایەوە، کاتێک بە هەواڵی ڕووداوەکانی میسری زانی، حەلەبی بەجێ هێشت و چووە ناو شاری

---

(١) – د. عاشور: الحركة الصليبية،ج ٢/ص ١٠٦٨.

(٢) – د. خاشع المعاضيدي:م.ن، ص٢١٩.

(٣) – المقريزي: السلوك، ج١/ ٣٥٣.

(٤) – هەمان سەرچاوە، ج١/ ص ٣٤٧ ؛ د. عاشور: م.ن،ج ٢/ ١٠٦٦.

دیمەشق و دەستی بەسەرداگرت،[1] بەم ڕووداوانە ممالیک توانیان ببنە پێگەیەکی بە هێز لە بەرامبەر مەترسی مەغۆلەکان و خاچییەکان لە وڵاتی شام و میسر.[2]

**مەترسی مەغۆلەکان لە وڵاتی شام**

گێتی ئیسلامی لە سەدەی (٧ک/ ١٣ز) دووچاری هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان هات و کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر مێژووی موسڵمانانی ناوچەکە، ئەمەش لە ئەنجامی وێران و تاڵان کردنی شارە ئیسلامیەکان و داگیر کردنی شاری بەغداد ساڵی (٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز)،[3] بێگومان داگیرکردنی بەغدا، هێرش و پەلاماری وڵاتی شامی بەدواوە بوو، ململانێی نێو خۆیی یارمەتیدەر بوو بۆ بەردەوام بوونی شەڕی خاچییەکان، لەو کاتەدا(لویسی نۆیەم) گەڕایەوە وڵاتی شام لە دوای ئازادکردنی لە موقعەی مەنصور پەیمانەکەی پێشێل کرد و هەستا بە کۆکردنەوەی خاچییەکان و هێرش بردنەسەر شارە ئیسلامیەکانی وەک (نابلس و صور)، هەر بەمەوە نەوەستا بەڵکو ببووە هاوپەیمانی بزووتنەوەی ئیسماعیلیە (الحشیشیە) لە لایەک و مەغۆلەکان لە لایەکی تر،[4] بەو هیوایەی وڵاتی شام کۆنترۆڵ بکات و بە هاوکاری مەغۆل میسر داگیر بکات، هەروەها ئەرمەنەکانی نصاری بە فەرماندەیی (هیتوم)ی پاشای ئەرمینیای بچووک ببوونە هاوپەیمانی هۆلاکۆ بۆ ڕزگارکردنی بەیت ولمەقدیس لە دەستی موسڵمانان،[5] بەم شێوەیە مەترسی مەغۆلەکان لەسەر خاچییەکان نەبوو لە وڵاتی شام، بەڵکو خاچییەکان هیوایان زۆر بوو بە هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان، چونکە پێیان وابوو ئامانجەکانیان بەدی دەهێنێت، لەبەر ئەم فاکتەرە(لویس نۆیەم) عەککای بەجێ هێشت بۆ فەرەنسا لە (٢٥)ی نیسانی ساڵی (١٢٥٤ز)، ئەمەش دوای ئەوەی دڵنیا بوو لە بەرژەوەندی خاچییەکان بە شێوەیەکی گشتی لە وڵاتی شام.[6]

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٧ک/ ١٢٥٩ز) سوپای مەغۆل بە سەرکردایەتی (هۆلاکۆ) لە ئازربیجان بەڕێککەوتن بۆ وڵاتی شام و تیپەکانی ئەرمەنی نصاری

---

(١) - العبادي: قيام دولة المماليك، القاهرة، ص ١٢٢- ١٢٣.

(٢) - د. خاشع المعاضيدي:م.ن، ص ٢٢٠.

(٣) - فؤاد الصياد: المغول في التأريخ، ص ٢٤٩- ٢٨٧.

(٤) - د. عاشور: الحركه الصليبيه، ج٢/ ص ١٠٩٧- ١١٠٠.

(٥) - الصياد: م.ن، ص٢٩١- ٢٩٢.

(٦) - د. عاشور: الحركه الصليبيه،ج ٢/ ص ١١٠٣.

چوونه ژێر فەرماندەی (هۆلاکۆ)، سەرەتا گەمارۆی شاری (میافارقین) یاندا له (دیاربەکر)،[١] به بیانووی ئەوەی قسیسیکی (یعقوبیان) کوشتووە، مەلیک کامل (محمد بن مظفر بن عادل) قایل نەبوو بە بەدەستەوەدانی (میافارقین) و بۆ ماوەی دوو ساڵ بەرگریان لەم شارە کرد، بەڵام لەکۆتاییدا لەبەر نەمانی خواردن و کەرەستەی جەنگی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و مردنی دانیشتوانی شارەکە، تەسلیم بوون و کامل دەستگیرکرا و گۆشتیان لە گیانی بڕی و بووە هۆی مردنی و کەلەکەی بەرمێک هەموو وڵاتیان پێ گەڕاند،[٢] ئەمەش ئەوە دەگەێنێت کە وڵاتی شام و موسڵمانان تووشی هێرشی خاچییەکان هاتن لە ژێر پەردەی پەلاماری مەغۆلەکان، و پیلانیان دانابوو بۆ داگیرکردنی بەیتولمەقدیس و ناوچەی رەها و دەکردنی لە دەستی موسڵمانان و دواتر دانی بە نصاریەکان،[٣] لە دوای داگیرکردنی میافارقین بەرەو ماردین بەڕێکەوتن، دوای گەمارۆدانی بۆ ماوەی (٨) مانگ و بە پیلانێک دژی مەلیک (سعید ئەیوبی) شارەکەیان داگیر کرد لەوکاتەدا مەغۆلەکان هەندێ شارو پێگەی ناوچەکەیان داگیر کرد لەوانە نصیبین، هاوکات شارەکانی (حران) و (رەها) رادەست بوون، بەڵام (سروج) کە بەرگریان کرد دانیشتوانەکەی ئیبادەکرا، هەروەها (منبج) و شارەکانی تری وڵاتی شام داگیرکرا، هاوکات مەلیک (معظم تورانشاه) بڕیاری ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆلەکانیدا لە شاری حەلەب، بەڵام شارەکە بەهۆی گەمارۆی توندی مەغۆلەکان و خیانەتی ناوخۆ توانای بەرگری نەما، بەم شێوەیە لە ساڵی (١٢٦٠ز) حەلەب کەوتە دەستی مەغۆلەکان و هێرش بەران کۆشتارێکی زۆریان لێکردن، جگە لە بەدیل گرتنی (١٠٠) هەزار ژن و منداڵ، زۆربەیان لە بازاڕەکانی شام و ئەرمینا فرۆشران، نصاریەکان تووشی هیچ کێشە و زەرەرێک نەهاتن، تەنانەت مزگەوتی حەلەب بە دەستی (هیپومی) ئەرمینی سوتێنرا،[٤] هیچ شارێک لە پێشیان نەما تەنها دیمەشق نەبێت، لەوێش مەلیک نصاری ئەیوبی هەڵهات بۆ غەزە، لەبەرئەوە دانیشتوانەکەی ناچار بوون شارەکەیان بەدەستەوەدا هەر چەندە قەڵای شارەکە بۆ ماوەی (٤٠) رۆژ بەرگری کرد، بەڵام سودی نەبوو، بە هەمان شێوەی شارەکە لە لایەن مەغۆلەکان و نصاری ییەکان

(١) – د. خاشع المعاضيدي وأخرون: م.ن، ص٢٢١.
(٢) – الصياد: م.ن، ص ٣٩٢.
(٣) – هەمان سەرچاوە، ص ٣٩٢.
(٤) – ابن تغرى البردي: م.ن،ج ٧/ ص٤٧؛ المقريزي: السلوك،ج ١/ ص٤٢٣.

خۆرهەڵات، تووشی تالآن و وێران هات جگە لە کاری تالآنی و وێرانی داگیرکەران (عرق) یان بردە ناو مزگەوتی ئەیوبیەکان و هەندێ مزگەوت یان گۆڕی بۆ کەنیسە.[1]

### جەنگی عەین جالووت

لە تشرینی دووەمی ساڵی (٦٥٧ک/١٢٥٩ز) وڵاتی میسر لە ژێر فەرمانڕەوایی مەمالیکدا بوو بە سەرۆکایەتی (قطز) کە لە ڕووی سەربازی و ڕامیاری، دەسەڵاتی زۆر بە هێز بوو،ببووە تاکە سەرکردە لە وەستان بەرامبەر بە مەغۆلەکان و هێرش بردنە سەریان و ڕزگارکردنی ناوچەکە لە دەستیان واتە تاکە هیوای موسڵمانان بوو، قگز نامەی نارد بۆ مەلیک ناصری ئەیوبی بەوەی جێگرێتی و داوای لێکرد هاوپەیمان بن لە دژی مەغۆلەکان لە پێناو ڕزگار کردنی وڵاتی ئیسلام[2].

خاچییەکان لە شاری عەککا بوون بۆیە (قطز) هەوڵیدا لە گەڵیان ڕێککەوێت بەوەی لە پشتەوە هێرش نەکەنە سەر موسڵمانان لەبەرامبەردا بەڵێنی پێدان، ئەگەر سەرکەوت بەسەر مەغۆلەکاندا ئەوا ئەسپەکانیان بە هەرزان پێ دەفرۆشێت.[3]

هۆلاکۆ نامەیەکی زۆر توندی بۆ(قطز) ڕەوانەکرد کە بێ هیچ کۆت و بەندێک خۆی ڕادەست بکات ئەگینا لە دانیشتوانی عێراق و شام خراپتری بەسەر دێت، بەڵام (قطز) نامەکەی هۆلاکۆ کاری تێ نەکرد و نەخەڵاتا بەو جەنگە دەروونیەی (هۆلاکۆ)، بۆیە فەرماندەکانی کۆکردەوە بۆ بڕیاردان بە شەڕی مەغۆلەکان و ڕزگارکردنی موسڵمانان، یەکەم کار کەکردی نوێنەری (هۆلاکۆ)ی لەسێدارەدا بۆ وەڵامدانەوەی شەڕ بە کرداری نەک بە دەروونی، هەروەها موسڵمانانی کۆکردەوە و لە وتارەکەیدا پێ ڕاگەیاندن (من بۆ تێکۆشان لە پێناوی خودا دەڕۆم، ئەوەی تێدەکۆشێت با لەگەڵ من ئامادە بێت، ئەوەی تێکۆشان ناکات با بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە)، ئەم وتارە زۆر کاریگەر بوو لە ڕووی دەروونی بەسەر موسڵمانان هاوکات لە ورەی جەنگاوەرانی بەرزکردەوە بۆ شەڕکردنی مەغۆلەکان،[4] فاکتەرێکی دیکەی دەروونی بۆ بەرزبوونەوەی ورەیان گەشتنی نامەی (صارم الدين ازبک بن عبدالله الاشرفی) کە دیل بوو لای مەغۆلەکان لە کاتی پەلاماری وڵاتی شام

---

(١) - رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبيه، ج٣/ ص ٥٢٨.

(٢) - ابن تغری البردی: م.ن، ج٧/ ص ٨٠. الصياد، م.ن، ص٢٩٦.

(٣) - رنسيمان: م.ن.ج ٣/ ص ٥٣٦.

(٤) - المقريزی: السلوک.ج ١/ ص٤٣٠.

دواتـر قایـل ببـوو بەکـارکردن لە خزمەتیـان، ئەوەی لە نـامەکە ڕوون کـردەوە کە ئامانجی مەغۆلەکان چیە هاوکات نوسـیبوی ژمارەیـان کەمە و ئەو هێزە نین لێیـان بترسـن،[1] بەم شـێوەیە (قطـز) لە میسـرەوە بە نـاو خـاکی خاچییەکـان لە تەنیشـتی شـاری عەککـا وە بەڕێـکەوت وگەیشـتە نێـوان نیسـان و نـابلس لە (١٥ ڕەمەزانـی ٦٥٨ک/ ١٢٦٠)، لە موقعەی (عین جـالوت) بە مەغۆلەکان گەیشـتن و شـەڕێکی زۆر گەورە و قـورس لە نێوانیـان ڕوویـدا کە پێشـتر مەغۆلەکان شـەڕی وایـان بە خۆوە نەبینـی بـوو لە وڵاتـی ئیسـلامدا، مەغۆلەکـان لە هەمـوو لایەکەوە گەمـارۆدران بە شـێوەیەک(قطز) هـاواری دەکـرد و دەیگـوت (وا اسـلاماه)،[2]ئەو ڕۆژە تەواو نەبـوو هەتا هەموو مەغۆلەکانیان کوشت و سەرکردەکەیان (کیتوبوقا) بە دیلی گیراو دواتر لەسەر فەرمانی سـوڵتان کوژرا،[3] موسڵمانان بەم سـەرکەوتنە زۆر دڵخۆش بـوون چـونکە باوەڕیـان نەدەکـرد بتـوانن سـەربکەون بەسـەر مەغۆلەکانـدا، هەواڵـی ئەم سـەرکەوتنە لە وڵاتـی شـام بڵاوبـوەوە و ببـووە هـۆی هەڵهـاتنی سـەرکردەی مەغۆلەکان بە تایبەت لە شاری دیمەشق لە ترسـی پەلامـاری موسڵمانان، هەروەها هاوکارەکانیـان تووشـی سـزای خـراپ هـاتن بە دەسـتی موسـڵمانان لە ئەنجـامی خیانەتەکانیان.[4]

**ئەنجامەکانی جەنگی عەین جالوت**

١. مەترسی پێشـکەوتنی مەغۆلەکان بۆ خـاکی میسر وەسـتا، دوای تێکشکاندنی هێزەکانیان لە وڵاتی شام، بەمەش میسر و وڵاتـی مەغرب لە پەلامـاری مەغۆلەکـان ڕزگاریان بوو، چونکە هەموو پێشکەوتنێکیان لە ناو برد.

٢. گەڕانەوەی یەکێتـی لە نێـوان (میسـر، شـام و ممالیـک) فەرمـانڕەوا بـوون لە وڵاتی میسر.

٣. هێزی سەرەکیان لە خۆرهەڵات مایەوە.

٤. سـەرکەوتنی موسـڵمانان لە (عەیـن جـالوت) گیـانێکی نـوێی پـێ بەخشـین لە ململانێ کردنی نصاری و بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە نێو مەغۆلەکان، لە ئێران مەغۆلەکـان تـا ڕادەیەک ببوونە موسڵمان و ئـایینی ئیسـلام ببووە ئـایینی ڕەسـمی

---

(١) - ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، ص ٢٠٧.

(٢) - المقريزي:سلوک،ج١/ص٤٣١.

(٣) - الصياد: م.ن، ص ٣١١.

(٤) – ئاراس فەریق زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٧٣.

دەوڵەتــی مەغــۆل لە ئێــران و فــاکتەری یــارمەتی دەربــوو لە نەمــانی میرنیشــنی خاچییەکان لە خۆرهەلات.

٥. پەیوەنـدی نێوانیـان جێگیـر بـوو و هەردوولا هاوپەیمـانی بـوون دژی دوژمنـی هاوبەشیان و بنەماڵەی هۆلاکۆ.[1]

تێکشکانی خاچییەکان لە هەڵمەتی پێنجەم ببووە هـۆی بیرکردنەوە لە هەڵمەتێکی نوێ دژی خۆرهەلات، بەڵام کێشە لە نێو خۆیان دروست بوو بە تایبەتی نێوان پاپا و (فریدریک) و ببووە هۆی بێبەش کردنی (فریدریک) لە بەرەکاتی کەنیسە، هاوکات لە لایەن پاپاوە بانگەشەکرابۆ هەڵمەتێک دژی (فریدریک)، بەڵام لە هەمـوو گرنگتـر و سـەیر تـر ئەوە بـوو بێڕشـتنی خـوێن سـوڵتان کامـل بەیـت ولمەقدیسـی تەسـلیم بە (فریـدریک) کـرد، دوای ئەو هەمـوو سـاڵە لە خەبـات و جیهـاد و خـوێن ڕشـتن بە مانـدوبوونی سـوڵتانی سـەلاحەددین لە بە دەسـت هێنـانی ئەو سـەرکەوتنە گەورە بەسـەر خاچییەکـان و ڕزگـارکردنی قـودس، زۆر بە ئاسـانی (فریـدریک) قودسـی دەسـکەوت، ئەمەش بـووە مـایەی نیگەرانـی موسـڵمانان بە شـێوەیەکی گشـتی لەبەر ئەو فـاکتەرانەی باسـمان لێـوەکرد، هاوکـات خاچییەکـان ئەم سـەرکەوتنەیان پـێ ناخۆش بوو چونکە دەیانوت بە شمشێر ڕزگار نەکراوە، بەڵکو بە پاڕانەوە دەستیان کەوتـووە، بەڵام مـاوەی ڕێککەوتنـی نێوانیـان بـۆ مـاوەی (١٠) دە سـاڵ دەرفەتێکی چاک بوو بۆ خاچییەکان لە خۆ ئامادەکردنیـان بۆ هەڵمەتێکی نوێ لە دوای مردنی مەلیک کامل و تێکچوونی بارودۆخی نێو بنەماڵەی ئەیوبی لە ناوچەکانی (جەزیـرە ، شـام و میسـر)، بە سـەرهەڵدانی مەغۆلەکـان لە دژی گێتـی ئیسـلامی هاوپەیمانیـان لەگەڵ بەستن بۆ داگیرکردنی وڵاتە ئیسلامیەکان، ئەمەش بوو بەهـۆی زیـاتر بـوونی کاری تاڵان و وێران و کوشتن و بڕین و بەدیل گرتن، بەڵام بە سەرهەڵدانی ممالیک و ڕووخاندنی دەوڵەتی ئەیوبی بە تایبەتی لە دوای کوشـتنی تورانشـاە و وەرگرتنـی دەسـەلات لە شـام و میسـر لە لایەن ممالیـک و تێکشـکاندنی مەغۆلەکـان لە شـەڕی (عین جالوت) و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسـلام لە نێو مەغۆلەکـان و هەڵگەڕانەوەیـان لە خاچییەکان، خاچییەکـان نەیـانتوانی قـودس ڕزگـار بکەن تـا جەنگی گێتـی یەکەم (١٩١٤- ١٩١٨).

---

(١) - رنسیمان: هەمان سەرچاوە،ج ٣/ ص ٥٣٧.

خاچییەکان دوای شکست هێنانیان لە هەڵمەتی شەشەم و حەوتەم و دەرکەوتنی مەترسی مەغۆلەکان لە خۆرهەڵات و تێکچوونی بارودۆخیان لە ناوچەی شام، هاوکات بە هێز بوونی ممالیک و فراوان بوونی دەسەڵاتیان و گێڕانەوەی یەکێتی لە نێوان شام و مصر، ئەم جارە ئاڕاستەی هەڵمەتەکەیان گۆڕی بەرەو خۆرئاوای عەرەبی لە جیاتی (بیت المقدس) ئەویش وڵاتی تونس بوو.[١]

## هەڵمەتی هەشتەمی خاچییەکان

(لویسی نۆیەم) دوای تێکشان و شکست هێنانی لە هەڵمەتی حەوتەمی خاچییەکان بۆ سەر مصر و ناوچەی شام گەڕایەوە فەڕەنسا، لە ماوەی مانەوەی لە خۆرهەڵات کە چوار ساڵی خایاند نەیتوانی هیچ کارێک بۆ خاچییەکان بە ئەنجام بگەیەنێت، بەتایبەت سەقامگیرکردنی بارودۆخی شانشینی (بیت المقدس).[٢]

دوای ئەوەی (لویسی نۆیەم) ناوچەی شامی بەجێ هێشت، بەرەی ئیسلامی خەریکی بەرەنگاری هێرش و پەلاماری مەغۆلەکان بوو کە هەموو ناوچەکانیان داگیرکرد بوو، سەرەڕای ئەنجامدانی کاری تاڵان و وێران و کاولکاری و کوشتاری بێ ئامان، بە شێوەیەک بەرەی ئیسلامی نەیتوانی هەڵوێستی کۆتایی خۆی بەرامبەر خاچییەکان بە ئەنجام بگەیەنێت، لەو ماوەیەدا کێشە و ململانێی نێو خۆیی لە نێو پاشماوەی خاچییەکاندا سەری هەڵدا و بووبە گرنگترین فاکتەر بۆ لە ناوچوونی شانشینی (بیت المقدس) و کۆتایی پێ هێنانیان لە خۆرهەڵات.[٣]

لە ساڵی (٦٦٦ک/ ١٢٦٧ز) لویسی نۆیەم بیری لە هەڵمەتێکی نوێ کردەوە، بەڵام ئاڕاستەکەی بەرەو وڵاتی شام و مصر نەبێت، بەڵکو شوێنێکی تری دەستنیشان کرد، وڵاتی (تونس)بوو بە ئامانجی ئەم هەڵمەتە نوێیە، میر "شارل انجو" برای لویس کە پاشای صقلیە بوو ئەم بیرۆکەی ڕەتکردەوە، چونکە کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبوو لەسەر پەیوەندی بازرگانی نێوان صقلیە و تونس، لە کۆتاییدا شارل ناچار بوو لەگەڵ براکەی بەشداری لەم هەڵمەتەدا بکات لە ژێر کاریگەری ئەم هۆکارانە:

١. ملکەچی و پشتگیری کردنی بۆ (لویسی نۆیەمی) برای.

---

(١) – رنیسمان: س-پ، ج٣/ ص٥٣٧.

(٢) - ارنست بارکر: الحروب الصليبية، ترجمة السيد الباز العريني، بيروت، ١٩٦٧، ص١٢٢.

(٣) - قاسم عبدة قاسم: ماهية الحروب الصليبية، عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٠، ص١٥٩.

٢. شوێن کەوتنی هەڵهاتووە نەیارەکانی کە لە تونس بوون، ئەوانەی لە ئەنجامی وەرگرتنی دەسەلات لە دورگەی صقلیە لەلایەن (شارل)ەوە ڕوویان کردبووە تونس.

٣. ناچار کردنی تونسیەکان لە دانی باج بە دەسەلاتدارانی(صقلیە)کە پێشتر بە ئەباگرەی ئەڵمانیایان دەدا.[١]

لە ڕاستیدا ئەم هەڵمەتە بە پێچەوانەی هەڵمەتەکانی تری خاچییەکان بۆ یەکەم جار ئاڕاستەکەی بەرەو ولاتێکی خۆرئاوای عەرەبی بوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خاچییەکان بەتەنها مەبەستیان داگیرکردنی خۆرهەلاتی ئیسلامی نەبووە، بەڵکو ئامانجیان داگیرکردنی تەواوی گێتی ئیسلامی بووە، ئەمەش بەهۆی ململانێی ئایینی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت کە کەنیسەی کاسۆلیکی پاڵپشتی بوو.[٢]

لە کۆنگرەی (کلیرمونت) لە ساڵی (٤٨٨ک/ ١٠٩٦ز)دا پاپا هاندەری بیرۆکەی درێژەدان بەشەڕ بوو لە دەرەوەی ئەوروپا، ئەمەش بۆ خۆی مەبەست و سیاسەتی دەرەوەی پاپا بوو بۆ داگیرکردنی گێتی ئیسلامی لە ژێر ئالای مەسیحیەت، کاریگەری ئایینی لەسەر دانیشتوانی ئەوروپا لە پێشوازی کردنی ئەم شەڕانەدا کە نزیکەی ٢٠٠ ساڵی خایاند بەئاشکرا دیاربوو.[٣]

(لویسی نۆیەم) دەیویست شکست و دۆڕاندنەکانی لە میسر و ولاتی شام بەسەرکەوتنێک لە داگیرکردنی ولاتێکی خۆرئاوای عەرەبیدا قەرەبوو بکاتەوە، ولاتی تونس لەبەر نزیکی لە کەنارەکانی ئەوروپا و بۆچوونی هەڵە، بەوەی کە فەرمانڕەوای تونس مەیلی بۆ لای مەسیحیەکان هەیە و کەسێکی لاوازە، وای لە لویس کرد ولاتی تونس هەڵبژێرێت و بیکات بە ئامانجی هەڵمەتە نوێکەی، بە تایبەت دوای ئەوەی براکەی میر (شارل انجلو) ببووە فەرمانڕەوای دورگەی (صقلیە) و بووبە بنکە و پشتی هێزەکانی لەم هەڵمەتەدا، لویس پێی وابوو ئەگەر بێت و ولاتی تونس داگیر بکات ئەوا بارودۆخی جوگرافی و ماددی زەمینە دەرخسێت بۆ ئەنجام دانی هەڵمەتێک بۆ سەر ولاتی مصر.[٤]

---

(١) - سعید عبدالفتاح عاشور: الحرکە الصلیبیە، القاهرە، ١٩٦٣، ج٢/ص١١٧٧.

(٢) – ئاراس زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٧٧.

(٣) - ناوی أبو عبداللە محمد المستنصر باللە الحفصي (١٢٤٩- ١٢٧٧)، بڕوانە(زامباور: معجم الانساب، ترجمة زکي محمد وأخرون، القاهرة، ١٩٥١- ١٩٥٢، ص)١١٥.

(٤) - سعید عبدالفتاح عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٢٢٨.

هێزەکانی هەڵمەتی هەشتەمی خاچییەکان بە فەرماندەیی (لویسی نۆیەم) کۆبوونەوە و ژمارەیان بە نزیکەی (٤٠) چل هەزار دەخەمڵێنرا، کە پێکهاتبوون لە:

١/ (٦) شەش هەزار سوار.

٢/ (٣٠٠٠٠) سی هەزار سەربازی پیادە.

٣/ (٣٠٠) سێ سەد بەلەمی گەورە و بچووک.[1]

ئەم هێزانە لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز)دا لە دەریاوەو بە ئاڕاستەی کەنارەکانی تونس بەڕێکەوتن، کاتێک هەواڵی ئەم سوپا گەورەیە گەیشتە سوڵتانی تونس (المستغرابی زکریا)، ئەویشبەخێرایی هەستا بە وەرگرتنی کۆمەڵێک ئیجرائاتی بەرگری کردن لە ناوچەکە بەم شێوەیە:

١. فەرمانی بە کەشتیگەلی (تونسیدا) بۆ چاودێری کردنی جموجۆڵی دوژمن و ناردنی زانیاری سەرەتایی دەربارەی جموجۆڵەکانیان.

٢. فەرمانی دەرکرد بۆ هەموو شارەکان بۆ خۆ ئامادەکردن و چاکردنی پێگە کەنارییەکان پێش گەیشتنی هێزی دوژمن.

٣. ناردنی نوێنەر بۆ هەموو هەرێمە ئیسلامیەکان لە (ئەندەلوس) و باکووری ئەفریقیا و ئاگادارکردنەوەیان لە هاتنی ئەم هەڵمەتە، هاوکات داوای یارمەتی لێکردن بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی خاچییەکان[2].

دوای گەیشتنی هێز و یارمەتی لە هەرێمە ئیسلامیەکانەوە، سوڵتان لەگەڵ فەرماندەکانیدا کۆبویەوەو بڕیاری پێویستیاندا، ئەنجامی ئەم دانیشتنە دوو بۆچوونی لێ کەوتەوە ئەوانیش:

١.لەدەریادا ڕووبەڕووی خاچییەکان ببنەوە و تێکیان بشکێنن و ناچاریان بکەن پێش ئەوەی بگەنە وشکانی بگەڕێنەوە.

٢. ڕێگە بدەن بە خاچییەکان لە کەنارەکاندا دابەزن دواتر گەمارۆیان بدەن لە وشکانیدا و لەناویان ببەن، بیانووی ئەم ڕێگایە ئەوە بوو ئەگەر بێت و لە دەریادا لێیان بدەن ئەوە ڕوو دەکەنە بەندەرەکانی تر کە هێزی بەرگری چاکی لێ نییە، بۆیە چاکتر وایە ڕێگەیان بدەن لە بەندەری (قرطاجنه) دابەزن، ئەمە دوای ئەوەی

---

(١) - أبن خلدون: تأريخ أبن خلدون، مؤسسة جمال للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩، ج٦/ ص ٩٢.

(٢) - عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٧٨.

هەواڵگرەکان فەرماندەکانیان ئاکادار کردبوویەوە لەوەی کە خاچپیەکان لە بەندەری (قرطاجنە)دابەزن، لەکۆتاییدا سوڵتان بەم پێشنیارە ڕازی بوو[1].

لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٧٠ز) هێزەکانی خاچپیەکان کە دابەش ببوون بۆ سەر حەوت کۆمەڵ لە بنکەکانیان لە صقلیە و سردینیا بەرەو تونس بەڕێ کەوتن و ئامانجیان (مرسی الحضرە) بوو لە شاری قرطاجنە، لە مانگی تەممووزی ساڵی (٦٦٨ک/١٢٧٠ز) گەیشتنە کەنارەکانی ئەو شارە بەبێ ئەوەی هێزی موسڵمانان ڕووبەڕوویان ببنەوە، خاچپیەکان هێزەکانیان لە شارێکی کۆنی ڕووخا ودا دابەزند و هەوڵی چاککردنی پێگە و شوراکانیاندا، هاوکات موسڵمانانیش هەستان بە دابەش کردنی هێزەکانیان بۆ حەوت بەش بە فەرماندەیی یەکێک لە سەرکردەکانی (موحدین)، دوای بینینی بارودۆخی خاچپیەکان لە ناوچەکە، سەرکردایەتی بەرەی ئیسلامی لە نیوە شەودا بڕیاری هێرشیدا و شەڕ لە نێوان هەردوولا بەرپابوو، لە ئەنجامدا (٥٠٠) خاچی کوژران و موسڵمانان کشانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، هاوکات هێزەکانی خاچپیەکان لە شوێنێکی تەسکدا گەمارۆدران و هیچ پەیوەندیەکیان بە دەرەوە نەما، تەنها لە ڕێگای دەریاوە پەیوەندییان بە بنکەکانیان لە (سردینیا و صقلیەوە) مایەوە، خاچپیەکان لەم بارودۆخەدا تا شەش مانگ مانەوە، ئەمەش بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە ڕیزی سوپاکەیان،[2] و لەئەنجامدا هەڵوێستی کارگێڕیان تێکچوو بەتایبەت لە دوای مردنی (لویسی نۆیەم)، بەمەش خاچپیەکان ئارەزووی بەردەوام بوونی شەڕیان نەما لەگەڵ موسڵمانان، بۆیە ناچار بوون داوای دانوساندن بکەن، دوای دانوساندنێک لە نێوان هەردوولا لە ساڵی (٦٦٩ک/ ١٢٧٠ز) ڕێککەوتننامەی ئاشتی یان واژۆ کرد بۆ ماوەی (١٥) ساڵ،[3] بەم شێوەیە هەڵمەتی هەشتەمی خاچپیەکان بە سەرکردایەتی (لویس نۆیەمی) پاشای فەڕەنسا کۆتایی هات، دوای ئەم هەڵمەتە خاچپیەکانی خۆرهەڵات بێ هیوا بوون لە گەیشتنی هەڵمەتێکی نوێ بۆ خۆرهەڵات و ڕزگارکردنیان لەو قەیرانەی تێیدا بوون[4].

---

(١) - خاشع المعاضيدي وأخرون: الوطن العربي والغزو الصليبي، ص ٢٣٦.

(٢) - ستيفن رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ترجمة: السيد الباز العريني، بيروت، ١٩٦٧، ج٣/ ص٥٠٢.

(٣) - أبن خلدون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٦/ ص ٢٩٤.

(٤) - رنيه گروسيه: الحروب الصليبية (صراع الشرق والغرب)، ترجمة: أحمد ايبش، دار قتيبة، ط١، ٢٠٠٢، دمشق، ص ٩٢.

## کۆتایی خاچییەکان لە خۆرهەڵات

خاچییەکـان لە خـۆرهەڵات زۆر لاواز و بـێ توانـا بـوون، ئەگەر موسـڵمانان خەریکـی چارەسـەکردنی هێـرش و پەلامـاری مەغۆلەکـان نەبوونـایە، پێشـتر لە خۆرهەڵات کۆتاییان پێ دەهێنان، بەڵام هێرشی مەغۆلەکان مانەوەی خاچییەکانی لە خۆرهەڵاتدا درێژە پێدا، تێهەڵچوون و شەڕی نێوان موسڵمانان و خاچییەکان دوای تێکشـکانی مەغۆلەکـان لە شـەڕی (عەیـن جـالوت) لە سـاڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) لە سەردەمی سـوڵتان (رکن الـدین بیبـرس) سـەری هەڵدایەوە،[١] سـوڵتان(بیبرس)دوای ئەوەی بارودۆخی وڵاتەکەی سەقامگیر کرد، بە فەرماندەی هێزێکی گەورە لە وڵاتـی مصر بەرەو وڵاتی شام بەڕێکەوت، کاتێک سـوڵتان و هێزەکەی گەیشـتنە نـاوچەی (یافا) گەمارۆیاندا، دوای ئەوەی هێزی خاچییەکان نەیانتوانی بەرگری بکەن ناچار شـارەکەیان بەجـێ هێشـت و هەڵهـاتن، هێـزی موسـڵمانان بەبـێ شـەڕ چـوونە نـاو شـارەکە، خاچییەکـان داوای دڵنیابوونیـان کـرد لە سـوڵتان، دوای دڵنیابوونیـان لە پەیمـانی سـوڵتان قەڵای شـارەکەیان بەجـێ هێشـت و لە ڕێگـای دەریـاوە گەڕانەوە شاری (عەککا)، دواتر سوڵتان بڕیاریدا قەڵاکە بڕوخێنن، لە دوای تەواو بوونی ئەم کارە بەرەو پێگەی (شقیف) بەڕێکەوتـن و توانیان داگیری بکەن، هاوکـات سـوڵتان (بیبـرس) دوای ئەوەی هێـزی بەرگـری لە (شـقیف) دانـا هێزێکـی نـاردە سـەر (الباشورە) و ڕزگاری کرد، دواتر هێزێکی تری ناردە سـەر (دمشـق) و (طرابلس)، ئەم هێزە بەرەو پێگەی (کوردان)[٢] بەڕێکەوت و گەمارۆیاندا، دواتر ئەم هێزە پێگەی (الاکراد)ی بەجێ هێشت و (حمص) و (حماە وافامیە)ی ڕزگار کرد.[٣]

## ڕزگارکردنی ئەنتاکیا

هێـزی موسـڵمانان لە سـاڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز)[٤] لە نـاوچەی (امـامیە)وە بەرەو شاری (ئەنتاکیا) بەڕێکەوتن، دوای گەیشتنی ئەم هێزە، سوڵتان سوپاکەی کردە سێ بەشەوە و هەر بەشێکیان ئەرکی خۆی هەبوو:

---

(١) - عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٨٦.

(٢) - (حصن الاکراد) قەڵایەکی بە هێز و پۆڵایینە دەکەوێتە سـەر چیا، کە لە بەشـی خورئاواوە، بەرامبەر شـاری (حمـص)ەوە، ئەو چیایەی (الجلیل) کە پەیوەنـدی بە لبنـانەوە هەیە لە نێوان بعلبک و حمـص (یاقوت الحموی: معجم البلدان، ج٢/ ص١٥٢.)

(٣) - خاشع المعاضیدي وأخرون: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٣٥- ٢٣٦.

(٤) - أبن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج٧/ ص ١٤٣.

١. بەشی یەکەم- ئاراستەکەیان بەرەو بەندەری (سویدیە) بوو، ئەرکیان برینی هەموو ئەو ڕێگاوبانانە بوو کە شاری ئەنتاکیای بە دەریا دەبەستەوە.
٢. بەشی دووەم- ئاراستەکەیان بەرەو باکوور بوو بۆ برینی ڕێگای نێوان (ئەنتاکیاو قیلقیە) بۆ ئەوەی هیچ یارمەتیەکیان پێ نەگات.
٣. بەشی سێیەم- کەبەشی گەورەی هێزەکان بوو بە فەرماندەی سوڵتان خۆی، ئەرکی هێرش بردنەسەر شاری ئەنتاکیا و ڕزگارکردنی بوو[١].

(الكند سطبل سيمون) فەرماندەی خاچییەکان بوو لە شاری (طرابلس)، بڕیاری دا سەرکردایەتی سوپایەک بکات بۆ لێدانی هێزە ئیسلامیەکان و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەدەرەوەی شارەکە، بەڵام هێزی موسڵمانان توانیان سەرکەوتن بەسەر خاچییەکاندا بە دەست بهێنن و فەرماندەکەیان بەدیل بگرن،[٢] دواتر موسڵمانەکان لە (٤) ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) هەستان بە هێرشێکی گشتی بۆ سەر شواری شارەکە، دوای کوشتارێکی زۆر توانیان کەلێنێک بکەنە شورای شارەکە و لەوکەلێنەوە بچنە ناو شاری ئەنتاکیا، بەم شێوەیە یەکەم میرنشینی خاچییەکان لە خۆرهەڵاتی ئیسلامی دوای (١٧١) ساڵ فەرمانڕەوایی کۆتایی هات ئەمەش گەورەترین شکست بوو بۆ خاچییەکان و بووبە سەرەتای نەمانیان لە خۆرهەڵات.[٣]

### هەڵوێستی خاچییەکان

کەوتنی شاری ئەنتاکیا بە دەستی موسڵمانان دەنگ دانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە ئەوروپا، بەڵام بێ هێزی و لاوازی بزووتنەوەی خاچییەکان لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا، بە تایبەت (فەرەنسا ، ئەڵمانیا و ئینگلتەرا) بووبە هۆی ئەوەی وەڵامدانەوەی خاچییەکان و بەتایبەت پاپا کە پێشتر بانگەشەی دەکرد بۆ ڕزگارکردنی (بيت المقدس) لە خۆرهەڵات زۆر لاواز بێت، ئەم قەیرانە پاشا (اراجون جیمسی یەکەمی) هەژاند، بۆیە بە کەشتیگەلێکی گەورە و بە هێزەوە لە ساڵی (٦٦٨ک/ ١٢٦٩ز) لە (بەرشەلۆنە)وە بەئاراستەی خۆرهەڵات بەڕێکەوت، لە ڕێگەدا ئەم کەشتیگەلە تووشی گەردەلولێکی بە هێز هات، ناچار هەندێ لە کەشتیەکان

---

(١) - عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٩٤.
(٢) - رنسيمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٥٨.
(٣) - أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٣.

گەڕانەوە بۆ بەرشلۆنە، ئەو کەشتیانەی مانەوە لەگەڵ هەردوو کوڕی پاشا لە کۆتایی ساڵی (٦٦٨ک/١٢٦٩ز) گەیشتنە شاری (عەککا) و زۆر دڵ گەرم بوون بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسڵمانان، هاوکات (مەلیک ڤاهر بیبرس)یش گەیشتە ناوچەی عەککا،[1] بیبرس بەشێکی زۆری هێزەکەی لە ناوچەکە حەشاردابوو، تەنها هەندێ هێزی لە بەرامبەر شاری عەککادا ئاشکرا کرد کە ژمارەیان دەگەیشتە (٣) سێ هەزار سەرباز، لێرەدا تەکنیکێکی سەربازی بەکارهێنا بۆ چەواشە کردنی خاچییەکان بۆ دەرچوون و شەڕکردن لەگەڵ موسڵمانەکان لە دەرەوەی شاری عەککا، لەم بارودۆخەدا هێزی خاچییەکان گەیشتە شاری عەککا و فەرماندەکانی ئارەزووی شەڕی موسڵمانەکانیان هەبوو، بۆیە بڕیاری شەڕیاندا، بەڵام فەرماندەکانی خاچییەکان لە شارەکە ڕێگر بوون لە بەردەم دەرچوونیان لە شاری (عەککا) بۆ ئەوەی نەکەونە ناو بۆسەی موسڵمانەکانەوە وەک چۆن پێشتر تیپێکی فەرەنسی کەوتبووە بۆسەی موسڵمانەکانەوە، ناچار ئەم هێزە گەڕایەوە ئەورووپا و هیچ ئاکامێکی نەپێکا، هاوکات بارودۆخی خاچییەکانی خۆرهەڵات بەرەو ئاقارێکی خراپ هەنگاوی دەنا.[2]

**ڕزگارکردنی پێگەی (کوردەکان)**

(ڤاهر بیبرس) لە ساڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) بە سەرکردایەتی هێزێکی گەورە لە شاری قاهیرەوە کەوتە ڕێ بۆ شاری دیمەشق، دوای گەیشتنی ڕایگەیاند کە ئامانجی ئەم هەڵمەتەی پێگەی (کوردەکان)ە، بۆ ئەم مەبەستە پلانێکی داناو هێزەکەی دابەشکرد بۆ دوو بەش، بۆ ئەوەی دوژمن ئاڕاستەکەی نەزانێت، بڕیاریدا هەردوو هێزەکە بە دوو ڕێگای جیاوازدا بەڕێ بکەون و دواتر لە شوێنێکی دیاریکراودا یەک بگرنەوە، بەشی یەکەمی ئەم هێزە بە فەرماندەی خۆی بوو، بەشی دووەمی بە فەرماندەی کوڕەکەی (پاشا سعید) بوو،[3] هێزەکان لە ساڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) لە دمەشق کەوتنە جوڵە و ئامانجە سەرەتاییەکانیان هێرش و پەلاماردانی پێگە و قەڵاکانی (جبله، اللاذقية، المرقب ،عرقه ،مرقيه ،القلعيات ،صافيتا والمجدل) بوو، دواتر ئەم هێزانە بەرەو پێگەی کوردەکان کەوتنەڕێ و گەمارۆیاندا و دەستیان

---

(١) – ئاراس زەینەڵ: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٨٣.

(٢) – رنسیمان: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٦٧.

(٣) – أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٥٠

کرد بە هێرش و پەلاماری ئەم پێگەیە و لە سێ هێرشی گەورەدا توانیان شوراکانی پێگەکە ڕزگار بکەن و تەنها قەڵاکە لە پێشیان مایەوە، هاوکات دانیشتوانی ناو قەڵاکە ئەم هێزەیان بینی داوای خۆ بە دەستەوە دانیان کرد، بەم شێوەیە لە ڕۆژی (٢٣)ی شعبانی ساڵی (٦٥٩ک/ ١٢٦٠ز) قەڵاکەیان دایە دەستی پاشا (الطاهر بیبرس)، دوای ئەوەی (ظاهیر بیبرس) بارودۆخی ناو قەڵاکەی کۆنترۆڵ کرد، ترس چووە دڵ و دەروونی خاچپیەکان و ناچار داوای ڕێککەوتنیان کرد،[١] پاش دانوساندن هەردوولا ڕێکەوتننامەی ئاشتییان واژۆکرد بۆ ماوەی (١٠) ساڵ و (١٠) مانگ و (١٠) ڕۆژ،[٢] دوا بەدوای ئەم ڕێککەوتننامەیە هێزە موسڵمانەکان بەرەو پێگەی (ابن عەککار) لە باکووری شاری (طرابلس) کەوتنەڕێ و گەمارۆیاندا، لە ئەنجامدا دانیشتوان و بەرگریکارانی قەڵاکە دوای دەرچوونی خاچپیەکان خۆیان دابە دەستەوە، دوای گرتنی ئەم قەڵایە هێزی موسڵمانەکان بە سەرۆکایەتی سوڵتان (بیبرس)پەلاماری شاری (طرابلس) یان دا و دانوساندن لە نێوان میری ئەم شارە و پاشا (ظاهر بیبرس) دەستی پێکرد، لە ئەنجامدا ڕێککەوتنێکیان ئیمزاکرد بۆ ماوەی (١٠) ساڵ، دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ شاری دیمەشق بە مەبەستی گرتنی پێگەی (القرین) کە دەکەوتە نزیک شاری (صفد)، ئەم هێزە توانیان گەمارۆی پێگەکە بدەن، ناچار بەرگریکارانی پێگەکە داوای دڵنیابوونیان کرد، دوای وەرگرتنی دڵنیایی بەرگریکارانی قەڵاکە خۆیان دابە دەست موسڵمانەکانەوە، پاشا (ظاهر بیبرس) فەرمانیدا شورای پێگەکە بڕوخێنن، دوای ئەوە هێزەکانی بەرەو (مصر) بەڕێکەوتن، لەکاتی گەڕانەوەیاندا لە نزیک شاری (عەککا) سەربازگەیان دانا و سوڵتان تەماشای ناوچەی (عەککا)ی دەکرد، دواتر لە ساڵی (٦٧٠ک/ ١٢٧١ز) کەوتەڕێ بۆ مصر دوای ئەوەی هێزەکە گەیشتە نێوان (قیساریە وارصوف) لەوێ سەربازگەیان دامەزراند و دەستیان کرد بەهێرش بۆ سەر شاری عەککا، دوا بە دوای ئەو هێرشانە فەرماندەی خاچپیەکان داوای دانوساندنیان کرد، لەئەنجامدا پەیمانێکیان واژۆکرد بۆ ماوەی (١٠) ساڵ و (١٠) مانگ.[٣]

لە (٢٢)ی ڕەمەزانی ساڵی (٦٧٦ک/ ١٢٧٧ز) پاشا (ظاهر بیبرس البندقداری) کۆچی دوایی کرد، بە مردنی بەرەی ئیسلامی چالاک ترین سەرکردەی ئەو

---

(١) - رنیە گروسیە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٢.

(٢) - أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٥١.

(٣) - المقریزي: السلوک لمعرفة دول الملوک، ج١/ ص ٦٣٦.

سەردەمەی لە دەستدا، بیبرس توانی لە ماوەی سەرکردایەتی کردنی بەرەی ئیسلامی مەترسی مەغۆلەکان لە ناوچەکەدا نەهێڵێت، هاوکات توانی کۆمەڵێک شار و پێگە و قەڵا ڕزگار بکات، لەوانە (قیساریە، ارصوف، صفد، طبریە، یافا، الشقیف، انطاکیە، بغراس، القصیر، حصن الاکراد، عەککا، القرین، صافیتاو مرسیە)، چەند شوێنێکی تریش لە ئەنجامی ڕێککەوتنی لەگەڵ خاچییەکاندا، بەهاوبەشی بەڕێوەیان دەبرد لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردبوون ئەوانیش (المرقب، بانیاس و انطرس) بوون، لە دوای خۆی کوڕەکەی سوڵتان (سعید ناصر الدین محمد) کە نازناوی (برکە خان) بوو شوێنی گرتەوە، بەڵام هیچ ڕۆڵێکی نەبوو لە ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی رامیاری و سەربازی ناوچەکە، لە دوای ئەویش مەلیک (عادل)ی برای دەسەڵاتی وەرگرت، بەڵام لە هەمان ساڵدا لە دەسەڵات دەرکرا، دوای ئەو لە ساڵی (٦٧٨ک/ ١٢٧٩ز)[١] سوڵتان (منصور سیف الدین قلاوون الالفی) دەسەڵاتی وەرگرت، لە ئەنجامی جێگیر نەبوونی دەسەڵات میرنیشینی دیمەشق بە سەرکردایەتی میر (شمس الدین سنقر الاشقر) کە جێگری مەلیک (ظاهر) بوو لە دیمەشق لە میسر جیابوویەوە، سوڵتان (منصور) لە ساڵی (٦٧٩ک/ ١٢٨٠ز) هێزێکی ئامادەکرد و بەرەو دیمەشق بەڕێکەوت، ئەم هێزە توانی یەکێتی نێوان میرنشینی دیمەشق و مصر بگێڕێتەوە، بەمەش بەرەی ئیسلامی گەڕایەوە دۆخی خۆی، دوای ئەم ڕووداوە هێزەکانی سوڵتان قلاوون لە ساڵی (٦٨٣ک/ ١٢٨٤ز) گەیشتنە پێگەی (المرقب) و گەمارۆیاندا، دوای ئەوەی هێزەکەی سوڵتان بەمەنجەنیق هێرشیان کردە سەر پێگەکە، بەرگریکارانی پێگەکە خۆیان دا بەدەستەوە، ئەم هێزە دوای ئەوەی (مرقب)شیان لە دەستی خاچییەکان ڕزگار کرد، گەڕانەوە قاهیرە.[٢]

**ڕزگارکردنی (طرابلس)**

لە دوای پرۆسەی ڕزگارکردنی ناوچەکان، (قلاوون) بڕیاری دەکردنی خاچییەکانی لە شاری (طرابلس)دا، بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی (٦٨٨ک/ ١٢٨٩ز) لە شاری قاهیرەوە بەرەو دیمەشق و لە وێشەوە بۆ شاری تەرابلس بەڕێکەوت، هێزەکانی (قلاوون) کاتێک گەیشتنە کەناری شارەکە بە دانانی مەنجەنیق (ئاگر پەرژین) گەمارۆیاندا و خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرش و پەلامار، دوای ئەوەی شەڕ

(١) - أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩٢.
(٢) - قاسم عبدة قاسم: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٦٠

دەستی پێکرد توانیان بچنە ناو شارەکە و دەستی بەسەردا بگرن، دوای گیرانی شارەکە قەڵا و پێگەکانی دەوروبەری بە بێ شەڕ کردن خۆیاندا بە دەستەوە،[1] دوای ئەم ڕووداوانە هێزی موسڵمانان لە سەرەتای ساڵی (٦٨٩ک/ ١٢٩٠ز) گەڕایەوە بۆ میسر.

دوای ڕووخانی میرنشینی تەرابلس کێشە و ململانێ لە نێوان (بیزا و جنوا) دەستی پێکرد، ئەم ململانێ یە پەرەی سەند تا گەشتە بەرپابوونی شەڕ لە نێوانیاندا، و گەشتیەکانیان خەریکی شەڕ بوون، ئەمەش باشترین دەرفەت بوو بۆ موسڵمانان بۆ هێرش بردنە سەر خاچییەکان، بۆیە سوڵتان فەرمانیدا بە میر (حسام الدين گرنگای) بەندەری (اللاذقية) کە دوا شار بوو بە دەستی خاچییەکانەوە ڕزگار بکات.[2]

لە دوای کەوتنی تەرابلس خاچییەکان ترس باڵی کێشا بە سەریاندا و بەناچاری لە هەندێ شوێنی وەک (بیروت و جبله)کشانەوە،[3] دوای ئەوەی سوڵتان (قلاوون) گەڕایەوە بۆ دیمەشق لە لایەن مەلیک (هێنری دووەم) پێشوازی لێکرا کە داوای ڕێککەوتنی دەکرد و ڕازی بوو بە تازەکردنەوەی پەیمانەکەی نێوانیان، کە لە هاوینی ساڵی (٦٨٨ک/١٢٨٩ز)دا بۆ ماوەی (١٠) ساڵ و (١٠) مانگ مۆریان کردبوو، دانیشتوانی (جنوا) کاتێک ئەم هەنگاوەی میر (هێنری دووەم)یان بینی، لەگەڵ سوڵتان پەیمانی برایەتییان واژۆکرد بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوان هەردوولا، بەمەش هەندێ ئیمتیازاتی بازرگانیان لە (ئەسکەندەرییە) دەسکەوت، بەم شێوەیە ئاشتی باڵی کێشایەوە بەسەر پەیوەندی نێوان موسڵمانانەکان و خاچییەکان، کاروانە بازرگانیەکانی هەردوولا بە دڵنیاییەوە و بەبێ هیچ ڕێگرییەک هاتووچۆیان دەکرد٬ بەڵام (ڤینیسییە)کان بەرامبەر بەم کارە نیگەران بوون.[4]

**ڕزگارکردنی شاری عەککا**

ئاشتی نێوان موسڵمانان و خاچییەکان بەردەوام نەبوو، ئەویش بە هۆی ئەوەی خاچییەکان ئەو پەیمانەیان پێشێل کرد کە لەگەڵ موسڵمانەکاندا واژۆیان کردبوو،

---

(١) – رنيه گروسيه: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٣

(٢) – أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩٣.

(٣) – عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١١١٩.

(٤) – ئاراس زەينەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٨٨.

ئەمەش لە دوای گەیشتنی هێزێکی خاچی بۆ شاری (عەککا)، ئەم هێزە کە لەشاری (ڤینیسییا)ەوە لە هەموو ڕوویەکەوە ئامادە کرابوو، مەبەستی تێکدانی ئمتیازاتی بازرگانی (جنوا)بوو کە لە مصر دەستییان کەوتبوو، ئەم هێزە بە گەیشتنی بۆ ناوچەکە هەستا بە هێرش و پەلاماردانی جوتیارە موسڵمانەکان لە ناوچەکانی نزیک شاری عەککا، هەروەها بازرگانە موسڵمانەکان لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ شاری (ئەسکندەرییە) کە بە مەبەستی بازرگانی چوو بوون بۆ شاری (عەککا) بە دەستی ئەم هێزە کوژران، ئەم ڕووداوانە سوڵتانی نیگەران کرد، ناچار خاچییەکان وەفدێکیان ناردە لای سوڵتان و داوای لێبوردنیان کرد، بۆ سەلماندنی نیازپاکی خاچییەکان سوڵتان داوای رادەستکردنی تاونبارانی کرد، بەڵام خاچییەکان وەڵامیان نەدایەوە ئەمەش بووبە هۆی تێکچوونی ئاشتی نێوان هەردوولا، بۆیە سوڵتان فەرمانی شەڕیدا، بۆ ئەم مەبەستە هەستا بەخۆ ئامادەکردن و پلانێکی سەربازی دارشت بۆ بەرەنگاربوونەوەیان بەم شێوەیە:

١. دانانی سەربازگەیەک لە دەرەوەی شاری قاهیرە، لای مزگەوتی(التبن) وەک بنکەیەکی سەربازی.

٢. داوای لە جێگرەکەی کرد لە دیمەشق خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات، سوڵتان دوای ئەوەی خۆی بۆ شەڕ ئامادەکرد بڕیاری دەرچوونیدا، بەڵام پێش ئەوەی بەڕێبکەوێت نەخۆشی زۆری بۆ هێنا و لە ساڵی (٥٨٩ک/ ١١٩٣ز)دا کۆچی دوایی کرد، بەم شێوەیە ژیانی ئەم فەرماندە لێهاتووە تەواو بوو، لەوکاتەدا خاچییەکان تەنها (عەککا، صور، صیدا و عقلیت) یان بەدەستەوە مابوویەوە.[١]

لە دوای مردنی (قلاوون) کوڕەکەی کە ناوی میر (اشرف خلیل) بوو شوێنی گرتەوە، لەو کاتدا خاچییەکان وەفدێکی تریان ناردە لای سوڵتانی تازە بۆ ڕاگرتنی شەڕ و داوای لێبوردنیان کرد، لەو کارەی پێشوویان بەڵام سوڵتان (اشرف خلیل) بە داواکانی خاچییەکان قایل نەبوو، بەڵکو هەواڵی نارد بۆ وڵاتی شام تا لای شاری عەککا ئامادە بن،[٢] بۆ جێ بەجێکردنی ئامانجەکەی باوکی لە گەمارۆدانی عەککا و شەڕ کردن لەگەڵ خاچییەکان، هێزەکانی سوڵتان توانیان گەمارۆی عەککا بدەن،

---

(١) – عاشور: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢٢ .

(٢) – ئاراس زەینەل: س–پ، ل٢٩٠ .

دوای ئەوەی بە مەنجەنیق هێرشیان کردەسەر شارەکە، توانیان کەلێنێک بکەنە شوراکانی شارەکەوە.[1]

سەرکردایەتی خاچییەکان پێیان وابوو تێکشکانیان لە شەڕی عەککا دەبێتە کۆتایی خاچییەکان لەناوچەکەدا، لەبەرئەوە هەموو هێزەکانیان لە ناو شاری عەککا کۆکردەوە بۆ بەرگری کردن لەشارەکە، ژمارەی هێزەکانیان لە ناو شاری عەککا نزیکەی (٨٠٠) سوار و (١٤) هەزار جەنگاوەر و (٢٥) هەزار لە حەجاج و دانیشتوان و خۆ بەختکار دەبوو.[2]

بۆ پاڵپشتی کردنی خاچییەکان لە ساڵی (٦٩٠ک/ ١٢٩١ز) پاشای قبرص (هێنری دووەم) لەگەڵ هێزێکی پێکهاتوو لە (٢٠٠) سوار و (٥٠٠) پیادە و بڕێکی زۆر کەرەستەی جەنگی گەیشتە شاری عەککا، بە گەیشتنی ئەم هاوکارییانە ورەی خاچییەکانی شاری عەککا بەرز بوویەوە، (هێنری دووەم) کاتێک تێبینی بارودۆخی هەردوولای کرد، بۆی دەرکەوت دۆخی خاچییەکان خراپە، لەبەرامبەردا موسڵمانان ساز و ئامادەن بۆ شەڕ کردن، بۆ دەربازکردنی خاچییەکان لەو قەیرانە (هێنری دووەم) پەنای بردە بەر سیاسەتی ڕێککەوتن لەگەڵ سوڵتان (اشرف خلیل)، بەڵام دوای ئەوەی هەوڵەکانی بێ سوود بوون و نەیتوانی هیچ پێشکەوتنێک بە دەست بهێنێت، لەگەڵ هێزەکانی گەڕایەوە بۆ (قبرص).[3]

گەڕانەوەی (هێنری دووەم) و هێزەکەی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر باری دەروونی خاچییەکان کە بە هۆیەوە ورەیان دابەزی، دوای ئەم دۆخە ترسناکەی خاچییەکان هێزە موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە خۆیان ئامادە کرد بۆ جیهاد و ڕزگارکردنی شاری عەککا، هاوکات هێزەکانی (سیف الدین)یش لە (تەرابلس) ەوە پەیوەندییان کرد بەهێزەکەی سوڵتانەوە، هێزی مصریەکان کە(٧٢) مەنجەنیقیان هێنابوو،[4] لە هەموو لایەکەوە دامەزران و لە ماوەی چوار ڕۆژدا توانیان گەمارۆی شاری عەککا بدەن،[5]دوای گەمارۆدان و لێدانی بەردەوام لەلایەن موسڵمانەکانەوە، هێزی موسڵمانان خۆیان ئامادەکرد بۆ دەست پێکردنی پرۆسەی

---

(١) - أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨/ ص٥.

(٢) - عاشور: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١١٢٤.

(٣) - أبن تغري بردي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٨/ ص٦.

(٤) – ئاراس زەینەل: مێژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٩١.

(٥) - المقريزي: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٧٦٥.

پەلامـار، دوای ئەوەی سـوڵتان (اشـراف خليـل) بڕیـاری هێرشـیدا، توانیـان بەرەو شوراکانی شاری عەککا پێشکەون، بەڵام پێشتر خاچییەکان لە ژێر کاریگەری لێدانی موسڵمانەکاندا بەجێیان هێشـتبوو بەمەش موسـڵمانەکان توانیـان لەماوەیەکی کەمـدا شـاری عەککـا ڕزگـار بکەن، خاچییەکـان تەنهـا هەندێ قوللەیـان بە دەسـتەوە مـابوو ئەوانـیش سـواری (الداويـة و الأسـبتارية)ی لێـی بـوو، هێـزە موسـڵمانەکان توانیـان گەمارۆی ئەوانیش بدەن، ناچار داوای دڵنیابوونیان کرد، بەڵام لە ئەنجامی ڕەفتاری هەنـدێ لە هێـزە ئیسـلامیەکان دووبـارە گەڕانەوە نـاو قولەکانیـان و جـارێکی تـر موسڵمانان گەمارۆیان دانەوە، دووبارە سوڵتان ئەمـانی پێدان و شـاری (عەککا)یـان بەجێ هێشت، بەمەش موسڵمانەکان پرۆسەی ڕزگارکردنیان تەواوکرد، سـوڵتان لەو کـاتەی شـاری (عەککـا)ی گەمـارۆدا بـوو هێزێکی بە فەرمانـدەی (علـم الـدين سـنجر الصـواي الجاشـنكير) نـارد بـۆ شـاری (صـور) بـۆ بڕینـی ڕێگـای عەککـا و نـاردنی زانیـاری لەسـەر جموجـۆڵی خاچییەکـان، بە کەوتنـی شـاری (عەککـا) شـاری (صـور) داوای دڵنیـابوونی کـرد، دوای وەرگرتنـی دڵنیـایی بەبـێ شـەڕ خۆیـان دا بەدەسـت هێزی موسڵمانەکانەوە، دواتر شوێنەکانی تری ناوچەی شام ڕزگار کرا، (علـم الـدين سنجر) توانی شاری (صيدا)ش ڕزگار بکات، هەروەها سوڵتان فەرمانیدا بە تێکدانی قەڵای (جبيـل)، دواتـر بەرەو شـاری (انطرسـوس) بەڕێکەوتـن و بە هەمـان شـێوە ڕزگاریان کرد، بەم سەرکەوتنانە گێتی ئیسلامی ڕزگاری بوو لە مەترسی و شەڕ و هێرش و پەلامار و هەڵمەتی خاچییەکـان، کە بۆ مـاوەی (٢٠٠) سـاڵ گێتـی ئیسـلامی تووشی قەیرانێکی خراپ کردبوو، لە خوێن ڕشتن و دەردەسەری و ئاوارە بـوون و تـالان و وێـران و کاولکـاری، جگە لە کوشـتارێکی زۆری هەردوولا (موسـڵمانان و خاچییەکان). [١]

## هەڵمەتی نۆیەمی خاچییەکان

بە کۆتاییهـاتنی شـالاوی هەشـتەمی خاچییەکـان بە مردنـی (لويسـی نـۆیەم)، (بيبرس پێنجەم) بوو و دوای ئەو خۆی بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی هەڵمەتەکەی ئامـادە نەکرد و بۆ جـاری دووەم بەرەو تەرابلـوس چـوو، بەڵام (بۆهيمونـدی) میری ئەوی

(١) - رنيە گروسيە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٤.

داوای ئاشتی کرد و سولتانیش بەوە ڕازیبوو، چونکە شالاویکی نویی خاچی بەسەرکردایەتی میر ئیدوارد هات و گەیشتە عەککا، ڕیککەوتنی نیوان (بیبرس) (بۆهیموندیش) بۆ ماوەی دەساڵ بوو، (سولتان بیبرس) هیرشی بردە سەر عەککا کە (هیۆی سییەمی گەورە) و دوژمنی سەرسەختی ئیسلام و خاوەن چاوچنۆکی خاچی بەرپرسی بوو، خاچییەکان ئەوییان کردبوویە بنکەیەک تا لەوێوە هەنگاو بنێن و بگەن بە ولاتی شام (لەوکاتەی دەچوونە ناو دەریاوە)، بەلام کەشتیگەلی ئیسلامی بە هۆی گەردەلولیکی دەریاییەوە تیکشا.ئەرمەنیەکان دوای جەنگی (ملازگرد) کیلیکیایان بە جیهیشتبوو، کاتیک سەلجوقیەکان لە ئاسیای بچووک ئەوییان بە جیهیشت، ئەرمینیەکان لەوێ دەوڵەتی ئەرمینیای بچووکیان دامەزراند کە بەردەوام پاڵپشتیکی خاچییەکان بوو، بۆیە (بیبرس) هیرشی بردە سەر، ئەو دەوڵەتە لە دژی (بیبرس) دەوەستاو پاڵپشتی خاچییەکانی دەکرد و نەیدەهیشت تەختەو ئاسن بچیت بو میسر،[1] (بیبرس) بەسەریدا سەرکەوت و ژمارەیەک لە سەرکردەکانی بەدیلگرت، لەوانە کوڕی (هیسومی یەکەم) ئیدی ئەودەوڵەتە لەوەو بەدوا لاواز بوو. تیبینی ئەوەدەکریت ئەو دەوڵەتانەی (بیبرس) هاوپەیمانی لەگەل بەستبوون پاڵپشتی خاچییەکان نەبوون ئەوەش واتای هاوپەیمانی بوو، چونکە ئەگەر بڕوانینە دەوڵەتی ڕۆمانی خۆرئاوا هەمیشە پاڵپشت و هاندەری خاچییەکان بوو، کاتیک فەرەنسی و ئینگلیزەکان سەرکردایەتی شالاوی هەشتەم و نۆیەمی خاچییەکانیان دەکرد نیمچە بیلایەنی نواند.چونکە یەکەمیان بەڕیبەری (لویسی نۆیەمی) پاشای فەرەنسا بوو و دووەمیش بەسەرکردایەتی (ئیدواردی) سەرکردەی ئینگلیزی بوو، کاتیک سولتان (مەنسور قلاون) بوو بە فەرمانڕەوا (مەرقەب) و دەوروبەری قەتعکرد و میری خاچی تەرابلوسیش لیی ترساو لەسەر خواستی سولتان بینا نزیکەکانی ویرانکرد، سولتان مەنسور قلاونیش چوو بۆ دیمەشق و لەوێوە بۆ تەرابلوس و گەمارۆی داو گرتی، لە کاتیکدا بەدریژایی ئەو ماوەیە لە دەست خاچییەکاندا مابوویەوە.قلاوون بڕیاریدا عەککا بگریت، بەلام پیش ئەو کۆچی دوایی کرد، کاتیک (ئەشرف سەلاحەددین خەلیلی) کوڕی هاتە سەر دەسەلات لە میسرەوە بەرەو عەککا چوو سەربازانی دیمەشق و تەرابلوس و حەممای

---

(١) – ئاراس زەینەل: میژووی جەنگە خاچییەکان، ل٢٩٣.

کـۆکردەوە و فەتحیـانکرد و خاچییەکـان لە ڕێـگەی دەریـاوە ڕایـانکرد، ئەشـرف لەچوارچێوەی ئەو هەرێمانەدا توانی (صیدا و صور)یش بگرێت.پاشان نوێنەری خۆی لەسەر دیمەشق و بەیروت دانا، دواتر (ترجبیل و تەرسوسی) کەوتە دەست، خاچییەکان لە کەناراوەکان و وڵاتی شامدا هیچ شوێنەوارێکیان نەما، دواتر هێرشی بردە سەر ڕۆم و هێزێکی نارد بۆ کیسرەوان چونکە مەسیحیەکانی ئەو ناوچەیە پاڵپشتی مەسیحیەکانی دیکە بوون.(١)

## ئەنجامەکانی جەنگە خاچییەکان

هێرش و پەلاماری خاچییەکان بۆ سەر خۆرهەڵات، لە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکار و فـاکتەری گرنگـی تـێکەڵ بە یەک بـوو کە هـانی دان بـۆ خـۆ ئامـادەکردن بـۆ ئەم شـەڕە پیـرۆزە، لەوانەش خراپـی سیسـتەمی دەرەبەگـایەتی و ویسـت و هەوڵـدانی جوتیاران و کۆیلەکان بۆ ڕزگاربوون لە برسێتی و هەژاری و بیرکردنەوە لە تاڵان و دەستکەوتنی سەرمایەی زۆر لە خۆرهەڵاتی دەوڵەمەندا، باشترین بەڵگەش بۆ ئەو حـاڵەتە بڕینـی هەزاران کیلـۆمەتر بـوو بە بیـانووی ڕزگـارکردنی گـۆڕی مەسـیحی نەزانـراو کە بە خـۆی لەبنەڕەتـدا خـۆرهەڵاتی بـووە و هـیچ پەیوەنـدییەکی بە خۆرئـاواوە نەبـووە، ئەمە جـگە لە بیـانووی گێـڕانەوەی (خـاچی خاچـان- صـلیب الصلبوت) کە مەسیحی لەسەر خاچ دراوە، هاوکات بەشداری کردنی دەیان میر و پاشـا و خـانەدان و پیـاوە ئاینییەکـانی خۆرئـاوا لەگەڵ بازرگانەکـانی ئیتاڵیـا بـۆ ئاسـانکاری گواسـتنەوەی خاچییەکـان لە ڕێگـای دەریـاوە بـۆ خـۆرهەڵات، جـگە لە کاریگەری پاپا و کڵێسا لە وروژاندنی هەست و سۆزی ئەوروپیەکان، کە ئەمەش بۆ خۆی ڕۆڵێکی زۆری بینی لە پڕوپاگەندەی دەروونی و کۆنترۆڵ کردنی مێشکیان بۆ جێبەجـی کردنـی بەرژەوەنـدییە تایبەتیەکـانی خۆیـان دوور لە بەرژەوەنـدیەکانی مەسیحیەت لە قالبی سیاسەتی دەرەوەدا، ئەمە لەلایەک و لە لایەکی تر پشێوی و نائارامی و ئاڵۆزی ناوچەکە بەهۆی ناڕێکی میرنیشینەکان لەناو خۆیاندا، و دەست تێـوەردانی زلهێزەکـان لە کاروبـاری دەسـەڵاتی فـاتمی و بیزەنتـی، هەروەهـا لاوازبوونی خیلافەتی عەبباسی بەدەستی سەلاجقە تورکەکان، جگە لە قەڕامیتەکان

(١) - جفری برۆن:پوختەی مێژووی ئەورووپا، و.نهاد جلال حبیب الله،چاپی یەکەم،٢٠٠٩،ل ٢٦٨-٢٦٩.

که لە تێکچوونی بارودۆخی خۆرهەڵاتی ئیسلامی (المشرق الاسلامی) ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، هاوکات نەبوونی سەرکردەیەکی بەهێز و بەتوانا بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەودۆخە نائارامە لەگرنگترین هۆکارەکانی هەڵمەتەکانی خاچییەکان بوون.

لەم بارودۆخە نائارام و ئاڵۆزو پڕ پشێوییەی کە لەناوچەکەدا ڕوویدا بوو بەتایبەت لە میسر و وڵاتی شام، سەرکردەیەکی بەتواناو لێهاتوو دروست بوو، سەرەڕای ئەوەی لە نەتەوەی عەرەب نەبوو، توانی بەرەی ئیسلامی یەکبخات و هێز و ئومێد بۆ موسڵمانان بگێڕێتەوە و پاش سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر خاچییەکاندا گەورەترین شانازی بۆ ئیسلام و موسڵمانان و نەتەوەی کورد تۆمار بکات، بەڕادەیەک دۆست و دوژمنەکانی گەواهی لێهاتویی و گەورەیی و کارامەیی دەدەن، ئەو سەرکردە گەورەیەش سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبیە.

سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی یەکێکە لە کەسایەتیە هەرە گرنگ و بەناوبانگەکانی مێژووی ئیسلام و شەڕی خاچییەکان، ئەم ناوە لە کۆتایی سەدەی (٦)ی کۆچی و (١٢)ی زایینی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی هەژاند، و کەسایەتیەکەی گێتی ئیسلام و خۆرئاوای ئەوروپی داگیرکرد، وەک سەرکردەیەکی بە توانا و لێهاتوو جێگای شانازی هەموو موسڵمانان و، هاوکات جێگای مەترسی خاچییەکان بوو، سەلاحەددین خاوەن مێژوویەکی پڕشنگدار و پڕ لە سەرەوورییە، جگە لەوەی کە گەورەترین و ناودارترین سەرکردەی مێژووی کورد و ئیسلام بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ڕەنگە کەسێک تا ئێستا لە مێژووی ئیسلام بە ئەندازەی سەلاحەددین کاریگەری نەبوو بێت لە پاراستن و یەکخستنی ڕیزەکانی بەرەی ئیسلامی و ڕووبەڕووبوونەوەی گەورەترین مەترسی لەسەر خۆرهەڵاتی ئیسلامی.

ئاشکرایە شەڕ و هەڵمەتی خاچییەکانیش بە ئامانجی ڕزگارکردنی میرنشینە مەسیحیەکانی خۆرهەڵات بوو لە دەستی موسڵمانەکان، بەمەش خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ڕووبەڕووی بزووتنەوەی داگیرکاری بویەوە لە لایەن خۆرئاوای ئەوروپای مەسیحیەوە، بە شێوەیەک پێشتر هیچ وڵاتێک یان ناوچەیەک هەڵمەتی لەم شێوەیەی بە خۆیەوە نەبینیو و، هەوڵیاندا لە ژێر پەردەی ئایین هەموو مەرامەکانیان جێبەجێ بکەن.

لەڕاستیدا پاپا خودی خۆی هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی خاچییەکان بوو، بە هۆی ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە سەرووی بەرژەوەندییە گشتیەکانی مەسیحیەتەوە دادەنا، و لە ژێر پەردەی ئایینەوە مەرامە رامیاریەکانی خۆی جێبەجێ دەکرد، هاوکات لە پێناوی پاراستنی پلەوپایەی دونیایی خۆی کاری دەکرد نەک بۆ ئەو دواڕۆژەی کە لە ڕواڵەتدا بانگەشەی بۆ دەکرد.

شەڕی خاچییەکان لە ناوەڕۆکەوە شکستی نەهێنا چونکە ئەم شەڕانە بە هەڵمەتی داگیرکاری خۆرئاوای مەسیحی بۆ خۆرهەڵات کۆتایی نەهات، بەڵام بە دەست بە سەراگرتنی خۆرهەڵاتی ئیسلامی بەسەر خۆرئاوا لەو کاتەی سەلجوقیەکان لە شاری (نیقیە) نیشتەجێ بوون، بە سەرەتای کۆتایی هاتنی هەڵمەتی خاچییەکان دادەنرێت، ئاشکرایە کە مەسیحیەکان لە دوای سەدەی (١٣ز) لە خۆرهەڵات ڕوویان لە کەم بوون و لاوازی دەکرد، بەڵام پێش ئەوکاتە هەموو ئەوروپا و بەشێک لە ئاسیا و فەلەستین پەیڕەوی ئایینی مەسیحیان دەکرد، چونکە چالاکیەکی بە هێزی بانگەوازی مەسیحیەت لە ناوچەکەدا هەبوو، ئەم چالاکیەش شەڕی خاچییەکانی لێکەوتەوە.

لەئەنجامە گرنگەکانی شەڕی خاچییەکان گەشەکردنی شارەکانی ئەوروپا و ڕووخاندنی سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو، ئەو سیستەمەی کە میرات تەنها بۆ کوڕی گەورە بوو، ئەمەش ئەنجامی دروست بوونی چەند میرنیشینێکی خاچی بوو لە خۆرهەڵات ئەوانیش شانشینی بەیت ولمەقدیس و شانشینی قوبرس و ئیمپراتۆریەتی لاتینی لە قوستەنتنیە بوون، ئەمە جگە لە سەرهەڵدانی چەند دەزگایەتی ئایینی سەربازی وەک (الاسبتاریە، الداویە، الفرسان الیتوتون) و سەرهەڵدانی بیرۆکەی جیهاد لە پێناوی خواوەند و گەیشتن بە ئامانجی گەورە لە دواڕۆژ دا، دواتریش هەنگاویان نا دەزگا جەنگیەکان بگۆڕن بۆ کۆمەڵی بازرگانی بەمەش بوونە خاوەن (بانک، گەشتیگەل و زەوی وزار).

شارە بازرگانیەکانی ئیتاڵیا ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو لە بەکارهێنانی ئەم شەڕە پیرۆزە بە مەبەستی بە دەستهێنانی دەسکەوتی مادی بۆ خۆیان و گەشەپێدانی بازرگانی لەگەڵ ناوچەکانی خۆرهەڵات، بە تایبەت لە دوای ئەوەی شارەکانی ئیتاڵیا دەیان گوت (ئێمە چ سودێک لە شەڕی خاچییەکان دەبینین، لە دوای تێکدانی بنکە دەریاییەکان لە ئەنجامی شەڕی ئەوروپیەکان لەگەڵ خۆرهەڵاتدا) ئەم شارانە هەستان بە بەستنی دەیان پەیماننامەی بازرگانی لەگەڵ دوژمنانی خۆرئاوا لە پێناو

